# شۆڕشی ئەیلوول

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا







وریا ڕەحمانی




# شۆڕشی ئەیلوول

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا

وریا ڕەحمانی




# شۆڕشی ئەیلوول

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا

وریا رەحمانی

ناوی کتێب: شۆڕشی ئەیلول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا

ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: وریا رەحمانی

بابەت: مێژوویی

دیزاینی بەرگ: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-باسم رەسام

دیزاینی تێکست: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٣

چاپخانە: تاران-ئێران

تیراژ: (١٥٠٠) دانە

نرخ: (١٥٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٨٧٩١)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

# پێرست

# پێشەکی وەرگێڕ

## پەیوەندی ئەمریکا و شۆڕشی کوردستان چۆن دەستیپێکرد؟

ساڵی ١٩٦٢ واتا هەر لە رۆژەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول، رێبەرایەتی شۆڕش هەوڵیدا لەگەڵ دەوڵەتی ئەمریکا پەیوەندی بگرێت و بەردەوام نوێنەری دەنارد بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد، تاران و بەیروت بۆ ئەوەی ئەمریکا پشتیوانی لە دۆزی کورد بکات و یارمەتی بزووتنەوەی کورد بدات. مەلا مستەفا بارزانی هەمیشە دەیگوت من ١٢ ساڵ لە سۆڤیەت ژیاوم، بەو ئەنجامە گەیشتووم کێشەی کورد لە ئەجینداى دەوڵەتی سۆڤیەتدا نیە، هەربۆیە دەمەوێت زیاتر هەوڵ بۆ لۆبیکردن لەگەڵ ئەمریکا بدەم[1].

لە ساڵی ١٩٦٢ تا ١٩٧٢ ئەمریکا پێداگری لە سەر ئەوە دەکرد کە کێشەی کورد کێشەی ناوخۆیی عێراقە و نەیەویست بە هیچ شێوەیەک لەو کێشەیەدا دەستێوەردان بکات. ئەمریکا دەیەویست کێشەکە لە رێگای دانوستان و بە شێوەی ئاشتیخوازانە لە نێوان دەوڵەتی بەغداد و رێبەرایەتی کورددا چارەسەر بێت و مۆچیاری دەوڵەتی بەغدادی دەکرد دان بە مافی کورددا بنێت و رێکەوتننامەکانی لەگەڵ کورد جێبەجێ بکات بەڵام لە هەمان کاتدا پێیباشتر بوو دەوڵەتی بەغداد بەردەوام بەسەر کێشەی کورددا زاڵ بێت.

---

[1] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان، ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا لە پەیامێکدا بۆ یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی لە ٢ی نیسانی ١٩٦٣ رادەگەیەنێت:

**"ئێمە دەمانەوێت کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی نوێی عێراق وتووێژ بکەن. ئەگەر ئەم وتووێژانە سەرنەکەوێت، بەرژەوەندی ئێمە ئەو کاتە باشتر دەپارێزرێت کە دەوڵەتی عێراق بتوانێت کوردەکان کونترۆڵ بکات نە ئەوە کە شۆڕشی کورد ئەوەندە سەربکەوێت کە ببێتە هۆی دەستێوردانی سۆڤیەت یا ئێران لە کێشەکەدا"[٢].**

هاوکات ئەمریکا جارناجار گوشاریشی دەخستە سەر شای ئێران بۆ ئەوەی یارمەتی بزووتنەوەی کورد نەدات چونکە پێیوابوو کە سەرکەوتنی بزووتنەوەی کورد سەقامگیری ناوچە تێکدەدات و ئاسایشی هاوپەیمانەکانی واتا تورکیە و ئێران دەخاتە ناو مەترسییەوە. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە پەیامێکدا بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق لە ٦ی گوڵانی ١٩٦٥ رادەگەیەنێت:

**"سیاسەتی ئێمە بەردەوام ئەوە بووە کە راپەڕینی کورد مەسەلەیەکە کە تەنها پەیوەندی بە عێراقەوە هەیە و ناردنی چەک و سەرباز(لە لایەن ئێرانەوە بۆ کوردەکان) بۆ ئەوەی گوشار بخاتە سەر دەوڵەتی عێراق، دژی ئامانجی ئێمەیە کە سەقامگیربوونی ناوچەیە. سەرکەوتنی کورد لە عێراق لە ئاستی واقیعدا زۆرترین زیانی بۆ سەقامگیری تورکیا هەیە و بە قازانجی یەکپارچەیی خاکی ئەم دوو وڵاتە (ئێران و تورکیا) نییە"[٣].**

پاش مردنی جمال عبدالناسر لە ١٩٧٠ و پاشەکشەی بریتانیا لە کەنداوی فارس لە ١٩٧١، حیزبی بەعس لە عێراق هەوڵیدەدا ببێ بە پێشەوای جیهانی عەرەب و پێش

---

٢- پەیامی بەرپرسی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، واشنگتۆن، ٢ی نیسانی ١٩٦٣، نهێنی.

[٣] پەیامی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق، واشنگتۆن، ٦ی گوڵانی ١٩٦٥، نهێنی.

لە باڵادەستی ئێران لە کەنداو بگرێت. ئێرانیش دەیویست ئەو بۆشایی دەسەڵاتە پڕ بکاتەوە کە بە هۆی پاشەکشەی بریتانیا لە ناوچە دروست ببوو. ئێران هەوڵیدەدا عێراق لاواز و ناسەقامگیر بکات هەربۆیە یارمەتی بزووتنەوەی کوردی دەدا و هاوکات داواشی لە ئەمریکا دەکرد یارمەتی کورد بدات. ڕێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلوول هیچ متمانەیەکی بە شا نەبوو و نیگەرانی خیانەتی ئێران لە داهاتوودا بوو، هەر بۆیە دەیەویست ئەمریکا بکەوێتە ناو مەسەلەکە بۆ ئەوەی پشتیوانی زلهێزی جیهان بۆ دۆزی کورد بەدەست بهێنێت و لە داهاتوودا بە تەنیا نەمێنێتەوە.

ڕێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلوول ساڵی ١٩٧٢ گوشارەکانی لە سەر شا و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا چڕتر کردەوە بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئەمریکا لەگەڵ کورد پەیوەندی بگرێت و یارمەتی سیاسی و سەربازی بە بزووتنەوەی کورد بدات. ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی کورد بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئەمریکا قانع بکات یارمەتی بە کورد بدات هەوڵیدا مەسەلەی هاوپەیمانی سۆڤیەت و عێراق و مەترسیەکانی ئەو هاوپەیمانیە بۆ ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ناوچە زەق بکاتەوە. لە ئەنجامدا هەرچەند کە ئەمریکا وەک ڕابردوو پێداگری لە سەر دەستێوەرنەدان لە کێشەی کوردی عێراقدا نەدەکرد و لەگەڵ نوێنەرانی بزووتنەوەی کورد دادەنیشت بەڵام هەتا حوزەیرانی ١٩٧٢ لەگەڵ بزووتنەوەی کورد پەیوەندی فەرمی دانەمەزراند و یارمەتی بە شۆڕشی کورد نەدا.

ساڵی ١٩٧٢ ڕژێمی عێراق بۆ گەیشتن بە ئامانجە زیادەخوازەکانی پەیماننامەی دۆستی و هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت واژۆ کرد. زیادبوونی دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق و پەرەسەندنی توانا سەربازی و سیاسیەکانی عێراق، ئێران و ئیسراییل و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای نیگەران کرد چونکە ئەو مەسەلەیە دەبوو بە هەڕەشە بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە کەنداوی فارس و بەتایبەت دەبوو بە هەڕەشەیەک بۆ ئاسایشی ئێرانی هاوپەیمانی ئەمریکا، کەوابوو لە ئاداری ١٩٧٢ کە نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەمریکا و هێنری کیسینجێر، جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی سەردانی ئێرانیان کرد شا داوای لێکردن یارمەتی بزووتنەوەی کورد بدەن بۆ ئەوەی دەوڵەتی ناوەندی عێراق بەردەوام لاواز

بێت و نەتوانێت کێشە بۆ ئێران ساز بکات. سەرۆکی بەشی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) لە پەیامێکدا بۆ بەڕێوەبەری گشتی CIA لە ١٢ی حوزەیرانی ١٩٧٢ ئاماژەی بەوە کردوە کە:

"شای ئێران لەوە نیگەرانە کە عێراق ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و ئەمەش مەترسیە بۆ ئاسایشی ئێران و بەرژەوەندیەکانی ئێران و وڵاتانی ڕۆژئاوایی لە کەنداوی فارس. کەوابوو شا هەوڵ بۆ ئەوە دەدات کاریگەری سۆڤیەت لە سەر ئێران بگەیەنێتە کەمترین ئاستی خۆی و لەم پەیوەندیەدا شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە باشترین شت ئەوەیە کە بزووتنەوەی کورد بەهێز رابگیردرێت بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە خەباتەکەی دژی رژیمی بەعسی بەغداد بدات"[٤].

نیکسۆن و کیسینجێر بەم هوکارانەی خوارەوە دەیانەویست دەوڵەتی عێراق لاواز بکەن:

١- خۆماڵیبوونی (بەنەتەوەییکردنی) کومپانیای نەوتی عێراق بە پشتیوانی سۆڤیەت، بە زەرەری بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا بوو. ٢- ئەمریکا لە دەستدرێژییەکانی عێراق لە کەنداوی فارس نیگەران بوو و پێیوابوو کە عێراق بە نوێنەرایەتی سوڤیەت ئەم دەستدرێژییانە ئەنجام دەدات. ٣- کێشە ناوخۆیەکانی عێراق و لاوازبوونی دەوڵەتی عێراق دەبوە هۆی بەهێزتربوونی دۆستان و هاوپەیمانانی ئەمریکا بەتایبەت ئێران و ئیسرائیل ٤- یارمەتی ئەمریکا، دەسەلاتی شیوعیەکانی نێو بزووتنەوەی کوردی لاواز دەکرد.

پاش گەڕانەوەی نیکسۆن و کیسینجێر بۆ ئەمریکا، شا گوشارەکانی لە سەر کیسینجێر زیاتر کرد بۆ ئەوەی راستەوخۆ لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی کورد دابنیشێت و گوێ بۆ داخوازیەکانیان بگرێت و یارمەتی بزوتنەوەی کورد بدات.

---

[٤] تیلیگرام لە لە لایەن سەرۆکی بەشی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا لە ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) بۆ بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)، واشینگتۆن، ١٢ی حوزەیرانی ١٩٧٢، نهێنی.

سەرەنجام دەوڵەتی ئەمریکا رازی بوو و لە تەموزی ١٩٧٢ نوێنەرانی شۆڕشی ئەیلوول ( دۆکتۆر مەحمود عوسمان و خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی) بە ماوەی ١٠ رۆژ بەفەرمی لەگەڵ پایەبەرزترین کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەمریکا (لەوانە بەڕێوەبەری CIA) دانیشتن و بە باشترین شێوە بارودۆخی کورد و کاریگەری کێشەی کورد لە سەر هاوکێشەکانی عێراق و ناوچەیان شی کردەوە و هەوڵیاندا مەسەلەی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراق و گوشارەکانی سۆڤیەت لە سەر رێبەرایەتی کورد بۆ پەیوەستبوون بە بەرەی نیشتمانی عێراق زەق بکەنەوە و ئەمریکا ئاگادار بکەنەوە کە ئەو مەسەلەیە بەرژەوەندی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەتەواوی دەخاتە ناو مەترسیەوە.

لەو دانیشتنانەدا نوێنەرانی شۆڕشی کوردستان داواکاریەکانیان بۆ یارمەتی سەربازی و مادی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد خستەڕوو و دەوڵەتی ئەمریکاش ئەو داواکاریەی قبووڵ کرد و بۆ یەکەم جار پەیوەندی فەرمی و راستەوخۆی ئەمریکا لەگەڵ بزووتنەوەی کورد دەستی پێکرد. ئەم پەیوەندیە لەرادەبەدەر نهێنی بوو. هەر لە دانیشتنی یەکەمدا کاربەدەستانی ئەمریکا راشکاوانە بە نوێنەرانی کوردیان راگەیاندبوو:

**"نهێنیپارێزی مەرجی سەرەکی ئەم پەیوەندیەیە و ئەگەر ئەم نهێنییە نەپارێزرێت، پەیوەندییەکە ئاڵۆز دەبێت. یارمەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان دەبێ بەوپەڕی نهێنیپارێزی و ئاسایشی ئیداری و فیزیکی ئەنجام بدریت بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا حاشای لێبکرێت. ئێمە لە کاتی گفتوگۆی زۆرتر لەگەڵ نوێنەرانی بارزانی دەبێ چاوەڕوانیەکانیان لە ئاستی واقیعدا قبووڵ بکەین و ئەوەندە یارمەتییان بدەین کە پاشان بتوانین حاشای لێبکەین و مۆچیاریان بکەین هیچ کردەوەیەک ئەنجام نەدەن کە ببێتە هۆی ئەوەی بەربەرەکانیەکی نێونەتەوەیی بێتە ئاراوە".**[٥]

---

[٥] یادداشتنامەی دانیشتنەکانی کاربەدەستانی ئەمریکا و نوێنەرانی شۆڕشی کورد لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا،٥ی تەموزی ١٩٧٢، نهێنی، هەستیار.

به مه‌به‌ستی دڵنیابوون له‌وه‌ی که ئه‌م شاڵاوه بێ هیچ ره‌خنه و کێشه‌یه‌ک سه‌رده‌که‌وێت، سه‌رۆک کۆماری ئه‌مریکا میکانیزمه چاودێرییه ئاساییه‌کانی پشتگوێ خست. کۆنگرێس، وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه و ته‌نانه‌ت باڵوێزی ئه‌مریکا له عێراق ئاگایان له‌و پرۆژه‌یه نه‌بوو. سه‌رۆک کۆمار و وه‌زیری ده‌ره‌وه له‌وه دڵنیا بوون که به فه‌رمی هیچ زانیارییه‌ک ده‌رباره‌ی پرۆژه‌که دزه ناکاته ده‌ره‌وه. ئه‌م پلانه ئاگای له سه‌ره‌نجامه گرنگ و جیدییه‌که‌ی خۆی هه‌بوو، یه‌کێ له ئاڵۆزترین و نهێنیترین شاڵاوه نهێنیه سه‌ربازی و سیاسیه‌کانی مێژووی ئه‌مریکا بوو، پلانێک بوو که له رێگای ره‌وته جێکه‌وتووه‌کانی بریارپدانی ناو سیاسه‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکادا نه‌خرابووه به‌رباس و بریارپی له سه‌ر نه‌درابوو.

## ئامانجی ئەمریکا لە یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد چی بوو؟

لە یادداشتنامەی دانیشتنەکانی کاربەدەستانی ئەمریکا و نوێنەرانی شۆڕشی کورد لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، کاربەدەستانی ئەمریکا زۆر راشکاوانە ئاماژەیان بەوە کردوە کە:

"روونە کە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکان و دۆستەکان و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەیە کە رژێمی ئێستای عێراق لاواز بکرێت و تەنانەت بڕوخێت ئەگەر ئەم ئامانجە بێ پەرەسەندنی ناکۆکییەکان لە ئاستی نێونەتەوەییدا بەدیبێت. کاریگەرترین و دڵنیاترین ئامرازەکانی گەیشتن بەم ئامانجە تەیارکردن و پشتیوانیکردن لە کوردەکانە بۆ ئەوەی بتوانن بەردەوام دژایەتی رژێمی عێراق بکەن. کوردستان ئێستا تەنها شوێنێکە کە بووە بە کەندو کۆسپ لە سەر رێگای زاڵبوونی تەواوی سۆڤیەت بە سەر عێراقدا. ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کە ئەگەر شۆڕشی کورد هەڵبگیرسێتەوە رژێمی بەعس لەوانەیە ناچار بێت داوای پشتیوانی زۆرتر لە سۆڤیەت بکات و ئەگەر ئێمە پشتیوانی لە کوردەکان نەکەین و لە ئاکامدا بزووتنەوەی کورد لەناوبچێت کوردەکان ناچار دەبن پەیوەست بن بەو بەرە نیشتمانییە کە سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکات و لە ئەنجامدا رژێمی بەعس دەتوانێت بێ هیچ تەنگ و چەڵەمەیەک سیاسەتی دەستدرێژیکارانەی خۆی لە ناوچە درێژە پێبدات. لە نێوان ئەم دوو رێگایەدا، رێگای

باشتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە مەترسییەکانی زیندوومانەوەی بزووتنەوەی کورد قبوڵ بکەین"[٦]

هەم ئەمریکا و هەم شا دژی سەرکەوتنی کورد بەسەر دەوڵەتی عێراق بوون بۆ نموونە لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ کە هێزەکانی عێراق سەرقاڵی شەڕی ئیسرائیل بوون دەرفەتێکی باش رەخسا بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگە هێرش بکاتە سەر هێزەکانی عێراق و سەرکەوتنی یەکلاییکەرە بەدەستبێنێت بەڵام ئەمریکا رێبەرایەتی شۆڕشی کوردی لە ئەنجامدانی ئەو هێرشە دڵسارد کردەوە. هێنری کیسینجێر لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

" لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ واتا ٩ رۆژ دوای هەڵگیرسانی شەڕی ئیسرائیل و عەرەبەکان پەیامێکی بەپەلەمان لە لایەن بارزانییەوە بەدەست گەیشت کە تێیدا نووسیبووی دەیەوێت هێرش بکاتە سەر هێزەکانی عێراق لە دەشتەکاندا. ویلیام کۆلبی، سەرۆکی CIA دژی پێشنیارەکەی بارزانی و بەرفراوانبوونی شەڕ راوەستا. شاش پشتیوانی لە بۆچوونەکانی کۆلبی کرد و وتی کوردەکان ئەوەندە چەکوچۆڵیان نیە کە بتوانن بەتایبەت لە دەشتەکاندا شاڵاوی سەربازی ئەنجام بدەن. ئیسرائیلیەکان لەوە دەترسان کارتی کوردیان بەتەواوی لە کیس بچێت. منیش لەگەڵیان هاوڕا بووم، کەوابوو لە ١٦ی تشرینی یەکەم بە رەزامەندی نیکسون، سەرۆک کۆماری ئەمریکا ئەم پەیامە نارد بۆ بارزانی" ئێمە ئەو پێشنیارەی ئیسرائیل بە باش نازانین"، پەیامەکەش هەر ئەو رۆژە گەیشتە دەستی بارزانی. جگە لەوە هەر بڕیارێکی دیکەمان بدایا دەبوە هۆی لەناوچوونی کوردەکان و هیچ یارمەتیەکی بە ئیسرائیل نەدەدا"[٧].

---

[٦] یادداشتنامەی دانیشتنەکانی کاربەدەستانی ئەمریکا و نوێنەرانی شۆڕشی کورد لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا،٥ی تەموزی ١٩٧٢، نهێنی، هەستیار.

[7] Henry A. Kissinger, “Tragedy of the Kurds,” in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

له ئاداری ١٩٧٤ ڕێبەرایەتی شۆڕشی کورد دەیەویست هێرش بکاتە سەر بنکەکانی نەوتی کەرکووک بەڵام ئەمریکا پەشیمانی کردنەوە. کیسینجێر دەربارەی ئەو مەسەلەیە دەڵێت:

"بارزانی پێشنیاری کردبوو کوردەکان هێرش بکەنە سەر دامەزراوە نەوتیەکانی کەرکووک. ئیمەش لە ١٨ی ئادار ئەو پێشنیارەمان ڕەت کردەوە چونکە نەمانەویست قەیرانی وزە قوڵتر بکەینەوە"[٨].

تەنانەت لە ئابی ١٩٧٤ شا پێشنیاری کرد هێزەکانی ئێران بچنە ناو خاکی کوردستانی عێراق بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بەڵام کیسینجێر ئەو بیرۆکەیەی پێباش نەبوو. کیسینجێر لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

" لە ٢٦ی ئابی ١٩٧٤ واتا چەند ڕۆژ دوای بەدەسەڵاتگەیشتنی جیراڵد فۆرد سەرۆک کۆماری نوێی ئەمریکا، من بە سەرۆک کۆمارم وت شا لەم ڕۆژانەی دواییدا پێیڕاگەیاندووین کە دەیەوێت سەربازەکانی ئێران بنێرێتە ناو خاکی عێراق. من سەبارەت بەو بیرۆکەیە هۆشداریمدا بە سەرۆک کۆمار کە کارێکی وا زۆر مەترسیدارە و شەڕێکی بێ کۆتایی هەڵدەگیرسێنێت، سەرۆک کۆماریش لەوە زیاتر لە سەری نەچوو" [٩].

شا بەردەوام بانگەشەی ئەوەی دەکرد لە بەر ئەوە یارمەتی بە گەلی بندەستی کورد دەدات چونکە کوردەکان ئاریایی ڕەسەنن و هاوڕەگەزی ئێرانیەکانن بەڵام ئەوە تەنها بەشیکی بچووک لە مەسەلەکە بوو. بۆ نموونە لە تشرینی دووەمی ١٩٧٤ شا لە وەڵامی برژنێڤ، سەرۆک کۆماری سۆڤیەت کە پرسیار دەکات بۆ ئێران چەکوچۆڵ دەدات بە کورد، دەڵێت:

"ئەو پرسیارەی جەنابتم پێسەیرە. ئێوە خۆتان هەمان شت لە باکووری ڤیەتنام دەکەن بەڵام بە تۆزێ جیاوازییەوە. دەوڵەتی عێراق کوردەکان بە کۆمەڵ دەکوژێت و

---

[8] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

[9] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

**پێشکەوتووترین چەکەکان دژیان بەکار دەهێنێت و دەیەوێت بە تەواوی لە ناویان بەرێت. کوردەکان ئەو جۆرە چەکە پێشکەوتویانە نیە. جگە لەوەش (دەوڵەتی) باکووری ڤیەتنام، باشووری ڤیەتنامی داگیر کردوە بەڵام ئێوە هێشتا یارمەتیان دەدەن. ئێران یارمەتی گەلێکی چەوساوە دەدات بەڵام ئێوە یارمەتی هێزێکی چەوسێنەر دەدەن".**[10]

باڵوێزی سۆڤیەت لە تاران رۆژی ٢٧ی نیسانی ١٩٧٤ سەردانی شا دەکات و گلەو گازندەی ئەوە دەکات کە هەندێ لە رۆژنامەکانی ئێران لایەنگری لە کوردەکان دەکەن و پشتیوانی لە خەباتی کورد دژی دەوڵەتی عێراق دەکەن. شاش لە وەڵامدا دەڵێت: **"کوردەکان لە رووی رەگەزەوە برای ئێرانیەکانن و شتێکی سروشتیە کە ئێرانیەکان پشتیوانی لە کوردەکان بکەن کاتێک کە ببینن سەرکووت دەکرێن. کوردەکان ئەمدوایانە لەگەڵ هێرشی کۆمەڵکوژی عێراق رووبەڕوو بوونەتەوە و نەتەنها هەندێ لە رۆژنامەکان بەڵکوو هەموو رۆژنامەکانی ئێران پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن و دەبێ پشتیوانیشیان لێبکەن".**[11]

بەڵام شا لە سەروبەندی ناکۆکییەکەی ئێران و عێراقدا نە وەک گەلێکی بندەست بەڵکوو وەک ئامرازێک سەیری کوردی دەکرد. بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی بە تەواوی نهێنی کۆشکی سپی، رۆژی هەینی ٢٧ی تەموزی ١٩٧٣ شا، هێنری کیسینجێر، راوێژکاری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، هارۆلد سەندێرز، بەرپرسی ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، ریچارد هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران و ئەردەشیر زاهیدی، باڵوێزی ئێران لە ئەمریکا لە کۆشکی بلێر لە ئەمریکا کۆبونەتەوە. لە میانەی گفتوگۆکانیاندا دەربارەی مەسەلەی ئیسرائیل

---

[10] تیلیگرام لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ نووسینگەی پەیوەندیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پەکین (چین)، ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤، نهێنی

[11] تیلیگرام لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە، ٢٩ی نیسانی ١٩٧٤، نهێنی

و عەرەبەکان کیسینجێر ئاماژەی بە هەڕەشەکانی عێراق لە ئوردون کردوە و شاش وتویەتی:

" لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا کارتی کوردمان بەدەستەوەیە. هەم ئێران و هەم ئەمریکا دەبێ تۆزێ زیاتر یارمەتی کوردەکان بدەن. ئێستا دەوڵەتی بەعس لاوازە. من راشکاوانە بە کوردەکانم وتوە لە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی عێراقدا بەشداری نەکەن. هەروەها بە کوردەکانم وتوە ئیدی لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی سۆڤیەت یان عێراق دانەنیشن بەڵام ئەگەر دەمانەوێت کوردەکان لەو پەیوەندیەدا بە قسەمان بکەن دەبێ پارەی زیاتریان بدەینێ. هێڵمز پشتیوانی لە قسەکانی شا کردوە و کیسینجێریش بە هێڵمز و شای وتوە بەگوێرەی پرەنسیپەکان لەو پەیوەندیەدا هەنگاو هەڵبگرن" [١٢].

ئەمریکاش هەمان خوێندنەوەی لە کورد هەبوو و وەک ئامرازێک بۆ لاوازکردنی پێگەی عێراق لە زیادەخوازییە ناوچەییەکانیدا سەیری کوردی دەکرد. نە ئەمریکا و نە ئێران لەگەڵ چارەسەربوونی کێشەی کورددا نەبوون هەر بۆیە لە ئاداری ساڵی ١٩٧٤ کە پارتی دیموکراتی کوردستان گەڵاڵە پێشنیارەکەی خۆی بۆ ئوتونومی کوردستان بڵاو کردەوە، دەوڵەتی ئەمریکا بە تەواوی دژی پلانەکەی رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان وەستا و بەپێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە قەڵەمیدا و سەبارەت بە ئاکام و ئەنجامەکانی ئەو پلانە هۆشداریدا. ژنیراڵ سکۆکرافت، جێگری هینری کیسینجێر بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا و یەکێ لە بەرپرسانی ئاژانسی هەواڵگری ناوندی ئەمریکا (CIA) لە پەیامێکدا بۆ ریچارد هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران دەڵێت:

"پلانی مەلا مستەفا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئوتونومی، بارودۆخەکە وا ئاڵۆز دەکات کە ئیدی نەتوانین بەشێوەی شاراوە کۆنترۆلی بکەین. ئەو

[12] Source: National Archives, Nixon Presidential Materials, NSC Files, Box 138, Kissinger Office Files, Kissinger Country Files, Middle East, Kurdish Problem Vol. I, June '72 - Oct. '73. Top Secret; Sensitive, EXCLUSIVELY EYES ONLY, WHITE HOUSE/ memorandum of conversation, Friday, July 27, 1973, 5:00 p. m.

باروdۆخه ناچارمان دەکات بەشێوەی ئاشکرا پێداویستیەکانی بارزانی دابین بکەین و ئەو کاتە نهێنیپاریزی مومکین نابێت، کەوابوو هاوسەنگی سیاسی تیکدەچێت".

ژنێراڵ سکۆکرافت لە درێژەی پەیامەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە گەلاڵەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئوتونومی کوردستان لەگەڵ بەرژەوەندی ئێران ناتەبایە و بە شێوەیەکی زۆر راشکاوانە ئامانجی ئەمریکا و ئێران لە یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد دەدەبڕێت و دەڵێت:

"ئایا شا بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی خودموختاری کوردی رازی دەبێت؟ قازانجی شاش هەر وەک خۆمان لەوەدایە کە بارودۆخی عێراق هەروا لە بنبەستدا بێت و دەوڵەتی بەعس لە ئەنجامی پێداگریکردنی کوردەکان لە سەر نیمچە ئوتونومیەک، بە تەواوی لاواز بێت. هەتا ئێستا نە شا و نە خۆمان نەمانویستوە کە کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق بە شێوەیەک لە شێوەکان چارەسەر بێت یانی بەو شێوەیە کە یا کوردەکان داواکاریەکانی دەوڵەتی عێراق قبووڵ بکەن یا دەوڵەتێکی کوردی خاوەن ئوتونومی (بەتایبەت دەوڵەتێک کە خۆی وا نیشان بدات کە زمانحاڵی عەرەبەکانیشە) دابمەزرێت".[١٣]

دوابەدوای ئەوە هێنری کیسینجێر (وەزیری دەرەوە و یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی) پەیامێک دەنێرێت بۆ ریچارد هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران و پێیڕادەگەیەنێت:

"ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جارێکی دیکە دووپاتی دەکاتەوە کە راگەیاندنی پێشوەختی ئوتونومی لە لایەن کوردەکانەوە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و ئێران ناکات. بەرژەوەندی ئەمریکا لەوەدایە کە:

---

[١٣] پەیام لەلایەن ژنێراڵ سکۆکرافت لە ئاژانسی هەواڵگری ناوندی ئەمریکا (CIA) بۆ هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، ٢٥ی ئاداری ١٩٧٤، نهێنی، هەستیار.

١- کوردەکان بەردەوام دەربارەی ئەو مافانەی کە دەوڵەتی بەغداد بە فەرمی ناسیویەتی، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق وتوویژ بکەن.

٢- دەستی دەوڵەتی ئێستای عێراق هەر بەم شێوەیە بە بەستراوی بمێنێتەوە بەڵام عێراق پارچە پارچە نەبێت.

٣- عێراق بۆ هەمیشە پارچەپارچە نەکەن چونکە ئەگەر هەرێمێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێت ناتوانێت لە رووی ئابوورییەوە خۆی بەخێو بکات و بەرژەوەندی ئێران و ئەمریکا لەوەدا نیە کە پەیوەندیە باشەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق (کە لە ژێر دەسەڵاتی رێبەرایەتیەکی مودیرندا بێت) بۆ هەمیشە بپچڕێنن.

٤- پشتیوانیکردن لە دەوڵەتێکی کوردی لە درێژخایەندا (بەو شێوە بەرفراوانەی کە بارزانی داوای دەکات) لەوە زیاتر ناتوانێت بە شاراوەیی بمێنیتەوە. هەروەها بەلەبەرچاوگرتنی جەوهەری بەرژەوەندیەکانمان، ئێمە پێمانوایە کە ناتوانین لە داهاتوودا لەو برە پارەیە کە ئێستا بۆ کوردەکان تەرخانمان کردەوە، زیاتر تەرخان بکەین. ئەگەر ئێمە ئێستا ئەوە قبووڵ بکەین کە کوردەکان ئۆتونومی رابگەیەنن، ناڕاستەوخۆ خۆمان پابەند دەکەین کە پشتیوانی لە کوردەکان بکەین و ئاکام و ئەنجامەکانی ئەو پشتیوانیە قبووڵ بکەین و خۆمان بخەینە ناو بەرەبەرەکانیەکی ئاشکرای درێژخایەن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، لە کاتێکدا کە ئێمە پێمانوایە بەربەرەکانیکردنی ئاشکرا لەگەڵ عێراق خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و ئێران ناکات و لە درێژخایەنیشدا بە قازانجی کوردەکان نابێت"[١٤].

---

[١٤] پەیامی هێنری کیسینجێر (یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی) بۆ باڵوێزی ئەمریکا لە تاران، ٢٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣، نهێنی، هەستیار. هێنری کیسینجێر لە کتێبەکەیدا (ساڵانی بووژانەوە) بانگەشەی ئەوە دەکات کە کاتی خۆی بە هێلمزی وتوە کە ناوەرۆکی ئەم پەیامە بە مەلا مستەفاش رابگەیەنێت بەڵام ناچێتە خانەی عەقڵەوە ئەم بانگەشەیەی راست بێت چونکە ناوەرۆکی ئەم پەیامە دژایەتی ئەمریکا لەگەڵ ئامانجەکانی بزووتنەوەی کورد

هەروەها لە دانیشتنێکی بەتەواوی نهێنی لە نێوان جیراڵد فۆرد، سەرۆک کۆمار، هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوە و ژینیراڵ برێنت سکۆکرافت، یارمەتیدەری جێگری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی لە کۆشکی سپی لە ٢٦ی ئابی ١٩٧٤ کیسێنجێر دەڵێت:

"کوردەکان درێژە بە شەڕی پێشمەرگایەتیانە لە عێراق دەدەن. ئەگەر دەستی عێراق نەبەسترێتەوە، دەتوانێت زیاتر هەڕەشە لە دۆستانی ئەمریکا بکات. مەترسییەکە ئەوەیە کە خەباتی کوردەکان هەڵبوەشێتەوە. سەرۆک کۆمار جێراڵد فۆرد لە کیسینجێر پرسیار دەکات ئایا کوردەکان جێگای متمانەن؟ کیسێنجێر لە وەڵامدا دەڵێت بەڵێ".[١٥]

---

نیشان دەدات. هەروەها لە دەقی خودی بەڵگەنامەکەدا هیچ ئاماژەیەک بەوە نەکراوە کە ئەو مەسەلەیە بە مەلا مستەفاش رابگەیەنن. وەرگێڕ

[15] – Gerald R. Ford Presidential Library, Kissinger - Scowcroft West Wing Office Files, Box No.19, Kurds, Memorandum of Conversations , The White House, August 26 1974, top secret, sensitive.

## ئەمریکا چەندە یارمەتی شۆڕشی کوردستانی دا؟

ریچارد نیکسۆن، سەرۆک کۆمار، هێنری کیسینجێر، راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆک کۆمار(کە چەند مانگ دواتر بوو بە وەزیری دەرەوە)، ریچارد هێڵمز[١٦]، بەڕێوەبەری CIA و ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت[١٧]، یارمەتیدەری کاروباری سەربازیی سەرۆک کۆمار و جێگری بەرپرسی کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی لە تەموزی ١٩٧٢ شالاوی یارمەتی نهێنی ئەمریکا بە شۆڕشی کوردیان وەگەڕ خست.
یارمەتییە مادی و سەربازییەکانی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد لە ئابی ١٩٧٢ دەستی پێکرد. CIA بوو بە بەرپرسیاری سەرەکی بەڕێوەبردنی ئەم شالاوە، وەزارەتی دەرەوە هیچ دەستێکی تێدا نەبوو. ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٢ تا ١٩٧٥، نزیکەی ١٦ ملیون دولاری بۆ کورد خەرج کرد کە زۆر کەمتر بوو لەو بڕە پارەیە کە بۆ سەرکەوتنی کورد پێویست بوو(٣٠٠ ملیون دولار بە وتەی کیسینجێر).

---

[١٦] ریچارد هێڵمز ساڵی ١٩٦٦ تا ١٩٧٣ بەڕێوەبەری CIA بوو. ساڵی ١٩٧٣ تا ١٩٧٧ بوو بە باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران و بە هاوکاری و ڕێنوێنی راستەوخۆی شا پلانی یارمەتیدانی کوردی جێبەجێ کرد. هێڵمز دۆستی زۆر نزیکی شا بوو و پێشوازی لە ڕێکەوتننامەی جەزاییر کرد. ریچارد هێڵمز ساڵی ٢٠٠٢ لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

[١٧] ژنیراڵ برێنت سکۆکرافت، یارمەتیدەری کاروباری سەربازیی سەرۆک کۆمار ریچارد نیکسۆن، جێگری بەرپرسی کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی(کیسینجێر)، راوێژکاری کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆک کۆمار جیراڵد فۆرد و جۆرج بوش بوە و ئێستا یارمەتیدەری باراک ئۆباما بۆ هەڵبژاردنی تیمی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکایە. وەرگێڕ

یارمەتییەکانی ئەمریکا ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوەوە و کەمکەم بوو بە شتێکی سەمبولیک (ڕەمزی). شا هەوڵیدەدا خۆی ئەم کەموکوڕییە قەرەبوو بکاتەوە و هاوکات بەردەوام داواشی لە ئەمریکا دەکرد زیاتر یارمەتی کورد بدات بۆ ئەوەی کوردەکان ناچار نەبن دەست لە خەباتەکەیان دژی بەعس هەڵبگرن و پەیوەست نەبن بە بەرەی نیشتمانی عێراق کە لە شیوعیەکان و بەعسیەکان پێکهاتبوو.

پاش دەستپێکردنی هێرشی هەمەلایەنەی عێراق بۆ سەر کورد لە ئاداری ۱۹۷٤ ڕێبەرایەتی شۆڕشی کورد گوشارەکانی لەسەر شا چڕتر کردەوە بۆ ئەوەی زیاتر یارمەتیان بدات. شاش پێداگری لە سەر ئەمریکا دەکرد یارمەتیەکانی بە کورد زیاد بکات. هاوکات کاربەدەستانی ئیسرائیلیش نیگەرانی زاڵبوونی سوپای عێراق بەسەر کورددا بوون و لە ئاکام و ئەنجامەکانی ئەو مەسەلەیە دەترسان، بۆیە بەردەوام پێشنیاریان دەخستە بەردەم ئەمریکا بۆ گەیاندنی چەکوچۆڵی دژە تانک و دژەفڕۆکە بە هێزی پێشمەرگە و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگە فێر بکەن چۆن ئەو چەکە پێشکەوتوانە بەکاربێنن.

هێنری کیسینجێر دەربارەی چۆنیەتی دەستپێکردنی یارمەتیەکانی ئەمریکا بە کورد و بەردەوامبوونی ئەو ڕەوتە دەڵێت:

**" لە ۱ی ئابی ۱۹۷۲ نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەمریکا فەرمانی شاڵاوی نهێنی بۆ یارمەتیدانی کوردەکانی واژۆ کرد. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا مانگانە ۲٥۰ هەزار دۆلاری بۆ یارمەتیدانی ڕاستەوخۆ بە کورد بۆ ساڵی ۱۹۷۳ و دوو ملیۆن دولاری دیکەی بۆ دابینکردنی چەک و تەقەمەنی بۆ کوردەکان تەرخان کرد کە بە گشتی دەبوو بە ٥ میلیۆن دولار لە ساڵدا. شاش لەوە زیاتر یارمەتی کوردی دا، کەوابوو کۆی گشتی یارمەتییەکانی ئەمریکا، ئێران، ئیسرائیل و بریتانیا بە کوردەکان گەیشت بە یەک ملیۆن دولار لە مانگدا. بەڵام بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی شەڕی سارد[18]، یارمەتییەکی زۆر نەبوو.**

---

[18] شەڕی سارد ئەو ململانێ و دوژمنایەتییە سیاسی، ئابووری، سەربازی و ئیدوئولۆژیکیە بوو کە لە نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات (بە سەرکردایەتی سۆڤیەت) و بلۆکی ڕۆژئاوا (بە سەرکردایەتی ئەمریکا) لە

پاش ئەوە کە پەیوەندییەکانی عێراق و سۆڤیەت زیاتر پەرەیسەند و شەڕی کورد و سوپای عێراق بەرفراوانتر بوو و کوردەکان زیاتر پێویستیان بە یارمەتی بوو، من لە ٢٩ی ئاداری ١٩٧٣ پشتیوانیم لە پێشنیارێکی CIA کرد بۆ ئەوەی یارمەتییەکانمان بە کورد زیاتر بکرێت. پێشنیارم کرد بە هۆی ئەوەی عێراق بووە بە داردەستی سەرەکی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و رژێمی عێراق بە رێبەرایەتی سەدام حوسەین درێژە بە پشتیوانیکردن لە رێکخراوە ترۆریستییەکان دەدات و تەنگ و چەڵەمە بۆ رەوتی گفتوگۆکانی ئاشتی ئیسرائیل و فەلەستین درست دەکات، یارمەتییەکانمان بە کوردەکان بۆ ٥ ملیۆن دولار لە ساڵدا زیاد بکرێت. شاش بەڵێنیدا ساڵانە ٣٠ ملیۆن دولار یارمەتی کورد بدات و درێژە بە ناردنی چەک و تەقەمەنی بۆ کورد بدات، بە تایبەت تۆپی دوورهاوێژ. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە بەرفراوانبوونی شەڕ هۆشداریمدا بە سەرۆک کۆمار و پێشنیارم کرد بە بارزانی رابگەیەنین کە ئێمە و شا لە سەر ئەوە هاوڕاین کە کوردەکان تەنها تا ئەو رادەیە بچنە پێش کە بتوانن خۆیان بپارێزن. شاڵاوی نهێنی یارمەتیدانی کورد لە ساڵی یەکەمدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا".[١٩]

هێنری کیسینجێر هەروەها ئاماژە بە گوشارەکانی شا و ئیسرائیل بۆ زیادکردنی یارمەتییەکانی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد دەکات و دەڵێت:

"ساڵی ١٩٧٤ کە هێرشی عێراق بۆ سەر کوردەکان دەستی پێکرد بارزانی بەردەوام داوای لێدەکردین بەپەلە یارمەتیەکانمان زیاد بکەین. شاش پشتیوانی لە داواکاریەکانی بارزانی دەکرد بەڵام CIA دژی بوو، بۆ نموونە لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ کۆلبی، سەرۆکی CIAپێیڕاگەیاندین کە یارمەتییەکانی پێشوومان بە

---

ئارادابوو بێ ئەوەی دەست ببەن بۆ شەڕی راستەقینە (شەڕی گەرم). شەڕی سارد پاش شەڕی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد و پاش لێدوانەکەی کارتێر، سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٨(و بە باوەڕی هەندێ لە پسپۆڕان لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ پاش لەیەک هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت) کۆتایی پێهات. وەرگێڕ

[19] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

کوردەکان تەواو بووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژی ئەوە بوو یارمەتییەکان بە کوردەکان زیاد بکەین چونکە مەترسی ئەوەی لێدەکەوتەوە کە مەسەلەکە ئاشکرا بێت.

لە ٢٦ی ئابی ١٩٧٤، سەرۆک کۆمار فۆرد گەڵاڵەیەکی پەسەند کرد کە من و سیمشا دینیتز(باڵوێزی ئیسرائیل لە ئەمریکا - وەرگێڕ) بە ماوەی چەند حەوتوو تاوتوێمان کردبوو بۆ ئەوەی ئەو چەکە سۆڤیەتیانە بنێرین بۆ کوردەکان کە ئیسرائیل لە کاتی شەڕی ساڵی ١٩٧٣دا دەستی بەسەردا گرتبوو لەبەرامبەردا بە هەمان رێژە چەکی ئەمریکایی بدەین بە ئیسرائیل. لە کۆتاییدا بڕی ٢٨ ملیۆن دولار چەکی سۆڤیەتمان نارد بۆ بەرەی شەڕی کورد. لە ١٩٧٣ و ١٩٧٤ ئێمە بە گشتی نزیکەی ٢٠ ملیۆن دولار یارمەتی کوردەکانمان دا و زیاتر لە یەک تەن و ٢٥٠ هەزار کیلۆ چەکمان نارد بۆیان. ئێران دەیتوانی سەرجەم پێداویستیەکانی کوردەکان دابین بکات و CIA پێشنیاری کرد کە ئەگەر بڕیارە لەوە زیاتر یارمەتی کوردەکان بدرێت، ئێران دەبێ ئەوە بکات. بەڵام ئەگەر شا یارمەتیەکانی لەو ٥٧ ملیۆن دولارە کە وەئەستۆی گرتبوو زیاتر بکردایا لەگەڵ هەمان ئەو کێشەیە رووبەڕوو دەبووەوە کە ئیسرائیل لەگەڵی رووبەڕوو بوو یانی سوپای خۆی لاواز دەکرد مەگەر ئەوە کە ئێمە بە هەمان رێژە چەکوچۆڵمان بدایە بە ئێران کە کۆنگریسیش بەوە رازی نەدەبوو.

دوای ١١ی ئاداری ١٩٧٤ و گرتنەوەی ناوچەکان لە لایەن عێراقەوە شا هۆشداریدا کە بنکەوتنی کوردەکان دەبێتە هۆی زیاتربوونی دەسەڵاتی عێراق و سۆڤیەت لە ناوچە و دەبێتە هەڕەشە بۆ کەنداو و ئێران. ئیسرائیلیش گوشاری دەخستە سەرمان کە زیاتر پشتیوانی لە کوردەکان بکەین. گۆڵدا مایێر(سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل- وەرگێڕ) بە شێوەیەکی تایبەت چەند جار ئەوەی لە گوڵانی ١٩٧٤ لای خۆم باس کرد".[٢٠]

هینری کیسینجێر هەروەها ئاماژە بە جیاوازبوونی ئامانجی رێبەرایەتی کورد، شا، تورکیە، ئیسرائیل و CIA و تەنگوچەڵەمەکانی یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد لە ساڵی ١٩٧٤ دەکات و لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

---

[20] Henry A. Kissinger, “Tragedy of the Kurds,” in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

" له ١٦ی ئاداری ١٩٧٤ بارزانی ئیستراتژییەکی پێشنیار کرد و وتی لەم دوو ڕێگایە یەکێکیان قبووڵ بکەن: ١٨٠ ملیۆن دولار یارمەتیمان بدەن بۆ ئەوەی بگەین بە ئۆتونومی تەواو یان ٣٦٠ میلیۆن دولارمان بدەنێ بۆ ئەوەی بوار بۆ سەربەخۆیی کوردستان ئامادە بکەین"[21]. شا و تورکیە هیچکامیان لایەنگری ئەو جۆرە ئۆتونومیە نەبوون کە بارزانی داوای دەکرد و ئەمریکاش لە باروودۆخێکدا نەبوو کە بتوانێ ئەو پارەیە دابین بکات. ئەو پارەیە کە بارزانی داوای دەکرد زۆر زۆر زیاتر بوو لە بودجەی سەرجەم ئەو شاڵاوە نهێنیانە کە ئەمریکا لە ئەستۆی گرتبوو و دڵنیابووین کە کۆنگرێس ئەو پارەیە تەرخان ناکات. دەمانزانی هەوڵدان بۆ قەناعەتپێهێنانی شاش لەو پەیوەندیەدا بێ ئەنجامە.

داواکاریەکەی بارزانی لەگەڵ شەپۆلی ناڕەزایەتی کۆلبی، سەرۆکی CIA ڕووبەڕوو بوەوە و بەردەوام هۆشداری دەدا کە نابێ ئەمریکا لەوە زیاتر یارمەتی کوردەکان بدات بەڵام بۆچوونەکەی کۆلبی واقعبینانە نەبوو. سەرجەم پسپۆڕان هاوڕا بوون کە یارمەتیەکانی ئێمە بە کوردەکان ئەوکاتە تەنانەت لە بواری بەرگریشدا بەشی کوردەکانی نەدەکرد. من وەک ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆمدا داوام کرد یارمەتیدانی کوردەکان زیاد بکرێت و داوام لە ڕیچارد

---

[21] باڵوێزی ئەمریکا لە تارانیش لە پەیامێکدا بۆ کونسولخانەی ئەمریکا لە ئورشەلیم لە ١٤ی ئاداری ١٩٧٥ ئاماژەی بەوە کردوە کە شا پێش ئەوەی تاران بەرەو جەزایر بەجێبێڵێت، پەیامێکی لەلایەن ژنراڵ بارزانیەوە بەدەست گەیشتوە کە تێیدا بارزانی وتوویەتی ئەگەر زیاتر یارمەتی نەدرێن، خەڵکی کورد کۆمەڵکوژ دەبێت. ژنراڵ بارزانی هەروەها بە شای وتوە هێزی پێشمەرگە پێویستی بە پێشکەوتووترین چەکوچۆڵ و پشتیوانی سەربازی زیاتری ئێران هەیە، کەوابوو یا دەبێ لەو پەیوەندیەدا یارمەتی کورد بدرێت یان ڕێگەیان پێبدرێت سەربەخۆیی خۆیان ڕابگەیەنن بە هەمان شێوە کە قوبرس سەربەخۆیی ڕاگەیاندوە". بەڵام دۆکتۆر مەحمود عوسمان بە وەرگێڕی وت بارزانی هیچکات داوای جیابوونەوەی لە عێراق نەکردوە و بەردەوام هەوڵی ئەوە بووە کە کێشەی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا چارەسەر بکرێت. لەوانەیە شا ئەوەی وەک پاساوێک بۆ ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ سەدام بەکارهێنابێت. وەرگێڕ

هێڵمز و برێنت سکۆکرافت کرد پێشنیارێک لەو پەیوەندیەدا ئامادە بکەن. لە سەرەتای نیسانی ١٩٧٤ هێڵمز و سکۆکرافت پێشنیاریان کرد یارمەتیەکانی ئەمریکا بە کوردەکان دووقات بکرێت و لە ئەنجامدا یارمەتیەکانی ئەمریکا بە کوردەکان لە ٥ بۆ ٨ میلیۆن دولار زیادی کرد و یەک میلیۆن دولاریش بۆ ئاوارەکان تەرخان کرا. شاش رازی بوو رێژەی یارمەتیەکانیَ بە کورد لە ٣٠ میلیۆن دولار بۆ ٧٥ میلیۆن دولار لە ساڵدا زیاد بکات. ئیسرائیل و بریتانیاش برێک یارمەتیان لە ئەستۆ گرت"[٢٢].

کیسینجێر هەروەها وێڕای ئاماژەکردن بە جیاوازبوونی تێڕوانینی رێبەرایەتی کورد، شا و CIA سەبارەت بە گەڵاڵە پێشنیارکراوەکەی خۆی بۆ یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد، دەربارەی هۆکارەکانی جێبەجێنەبوونی گەڵاڵەکە دەڵێت:

"سەرجەم لایەنەکان لە سەر ئەو بەرنامەیە هاوڕا بوون بەڵام شرۆڤەکانیان جیاواز بوو. CIA لە جێبەجێکردنی بەرنامەکە پاشەکشەی کرد و شا دەیەویست کوردەکان لە بەرگریدا بن و بارزانیش دەیەویست بە سەر عێراقدا سەربکەوێت لە کاتێکدا کە سەرچاوەی پێویستی بۆ بەرگریکردن لە خۆی نەبوو. کێشەی ئیستراتژیەکەی کۆلبی (سەرۆکی CIA) ئەوە بوو کە لە ناو کۆمیتەکانی کۆنگرێسدا گیری دەکرد. کێشەی ئیستراتژییەکەی بارزانی لەوەدا بوو کە بە شەڕێکی بەرەیی جێبەجێ دەبوو نە بە شەڕی پێشمەرگایەتی. کێشەی ئیستراتژییەکەی کۆشکی سپی و ئێران لەوەدا بوو کە دەیانگوت ئوتونومی کورد بەمزوانە لەگەڵ بنبەستی هەمیشەیی رووبەڕوو دەبێتەوە و لەرێگای شالاوی نهێنییەوە چارەسەر نابێت. رەفتاری کوردەکانیش وای لێمان کردبوو نەزانین بەراستی پێویستیان بە چییە چونکە جارجار دەیانگوت بارودۆخمان خراپە و جارجار دەیانگوت باشین. بۆ نموونە لە ٢٧ی تەموزی ١٩٧٤ شا داواکاریەکی بەپەلەی بارزانی نارد بۆمان کە داوای یارمەتی کردبوو بەڵام چەند هەفتە دوای ئەوە بارزانی پێشنیاری کردبوو کوردەکان هێرش بکەنە سەر دامەزراوەکانی نەوتی کەرکووک.

---

[22] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

**له هاوینی ١٩٧٤ کۆمەڵێک قەیرانی جیهانی روویدا کە ئێمەی بە خۆوە سەرقاڵ کرد و ئێمە کاتمان نەبوو بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سیستماتیک بیروبۆچوونەکان دەربارەی کوردەکان هەڵبسەنگێنین بەڵام ئەگەریش کاتمان هەبوایا پێموانیە لەوە باشترمان بکردایا. ئەگەر ئێمە ساڵی ١٩٧٢ شاڵاوە نهێنیەکەمان دەستپێنەکردایا کوردەکان زۆر زووتر لەوە شکستیان دەهێنا".**[٢٣]

له پاییزی ١٩٧٤ ئەمریکا و شا یارمەتییەکانیان بە رێژەیەکی بەرچاو زیاد کرد بەڵام سەرجەم یارمەتییەکە نەگەیشتە دەستی کورد و بەتایبەت رێکەوتننامەی جەزاییر کۆتایی بەو یارمەتیە هێنا کە ئەمریکا بەرنامەی بۆ داڕشتبوو. بۆ نموونە ئەمریکا دەیەویست چەند رۆژ پێش لە نسکۆی شۆڕش یارمەتیەکانی بە بزووتنەوەی کورد زیاتر بکات و بە شوێن کاناڵێکدا دەگەڕا بۆ ئەوەی چەکوچۆڵی سەربازی لە رێگای ئێرانەوە بگەیەنێتە دەستی کورد بۆ ئەوەی کورد درێژە بە شەڕەکەی لەگەڵ عێراق بدات بەو ئامانجە کە عێراق بەردەوام لاواز و سەرقاڵ بێت و نەتوانێت کێشە بۆ ئیسرائیل درست بکات. لە دانیشتنێکی نێوان هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوە و یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، ژێنیراڵ برێنت سکۆکرافت، جێگری یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، سیمشا دینیتز، باڵوێزی ئیسرائیل لە ئەمریکا و مەردخای شالێف، وەزیری دەوڵەتی ئیسرائیل لە کۆشکی سپی لە ٥ی شوباتی ١٩٧٥ واتا یەک مانگ پێش لە رێکەوتننامەی جەزاییر یارمەتیەکانیان بە کورد دووقات کرد. لەو دانیشتنەدا ژنێراڵ سکۆکرافت وتوویەتی:

**"گونجاوترین رێگا بۆ یارمەتیدانی کوردەکان ئەوەیە کە بڕی ٢٨ میلیۆن دولار بە سەر بودجەی ساڵی داهاتودا زیاد بکەین. کۆشکی سپی ٢٨ میلیون دولار بەسەر ئەو بڕە یارمەتیەدا زیاد دەکات کە لەوانەیە بکرێت لە بوروکراسی ئەمریکادا پاشکۆ بخرێت. بۆ هەوڵدان بۆ زیادکردنی ئەو بڕە پارەیە هەر لە ئێستاوە ئامادەکاری**

[23] Henry A. Kissinger, “Tragedy of the Kurds,” in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

دەکرێت. بۆ چۆنیەتی کڕینی ئەو پێداویستییانە (کە ئیسرائیل هەمیشە لە ئورووپا دەیکڕێت) تەنیا ڕێگاچارە ئەوەیە کە داوا لە شا بکەین ئەو کارە جێبەجێ بکات. ئەم بڕە یارمەتیە بەشێک لە ٢٨ ملیون دولارەکە دەبێت"[٢٤].

[٢٤] دانیشتنی گفتوگۆکان لە کۆشکی سپی، ٥ی شوباتی ١٩٧٥، بە تەواوی نهێنی، هەستیار، کتێبخانەی سەرۆک کۆمار جیراڵد فۆرد، ئۆفیسی کیسینجێر – سکۆکرافت.

## شا و سەدام چۆن لە جەزاییر ڕێکەوتن؟

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ دەوڵەتی عێراق هەوڵە دیپلۆماتیکەکانی دەستپێکرد بۆ ئەوەی لە ئێران نزیک بێتەوە بەڵام ئێران بە چاوی گومانەوە سەیری ئەو نزیکبوونەوەیەی عێراقی دەکرد و وەکوو پێویست بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق هەنگاوی هەڵنەدەگرت. هاوکات نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بەردەوام داوای لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەکرد پێشوازی لە ئاساییبوونەوەی پەیوەندیەکانی عێراق و ئێران بکات و گوشار بخاتە سەر شا بۆ ئەوەی ناکۆکیەکانی لەگەڵ عێراق چارەسەر بکات و یارمەتییەکانی بە بزووتنەوەی کورد بپچڕێنێت. لە ساڵی ١٩٧٤ کاربەدەستانی ئێران و عێراق چەند جار وتووێژیان کرد بەڵام وتووێژەکان هیچ ئەنجامێکی نەبوو چونکە ئێران پێداگری لە سەر مەسەلەی شەتولعەرەب کرد و عێراقیش بەوە رازی نەدەبوو.

هاوکات شا درێژەی بە پشتیوانیکردن لە کورد دەدا و تا مانگی شوباتی ١٩٧٥ بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت بەڵام لە کۆتایی مانگی شوبات و سەرەتای ئاداری ١٩٧٥ شا دڵنیا بووەوە کە سەدام ئامادەیە لە سەر شەتولعەرەب لەگەڵ ئێران ڕێکبکەوێت و تەنانەت عێراق لە سۆڤیەت دوور بخاتەوە. سەرەنجام بە ناوبژیوانی و پێداگری سەرۆک کۆماری جەزاییر لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ لە میانەی کونفرانسی OPEC لە جەزاییر، ئێران و عێراق ڕێکەوتننامەیەکیان واژۆ کرد. ئەگەر چاوێک بە ڕۆژژمێری ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٧٤دا بخشێنین بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە تا مانگی شوباتی ١٩٧٥ شا نەیویستوە لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت و کۆتایی بە یارمەتیدانی بزووتنەوەی کورد بهێنێت:

دوای هێرشە بەرفراوانەکەی هێزەکانی سەدام حوسەین بۆ کوردستان لە ئاداری ١٩٧٤ یارمەتیەکانی شا بە کورد زیاتر بوو. لە ١٨ی ئاداری ١٩٧٥ مەلا مستەفا بارزانی و دۆکتۆر مەحمود عوسمان سەردانی شایان کرد و داوایان لێکرد لە رووی مادی و سەربازییەوە زیاتر یارمەتیان بدات. رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان پێشنیارەکانی خۆی دەربارەی چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئۆتونومی کورد بە شێوەی نووسراو تەسلیم بە شا کرد و وردەکاریەکانی بودجەی پیویست بۆ بەشی ئیداری، بەرگری، پەروەردە و تەندرستیی خستەڕوو و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ساڵانە لانیکەم پێویستیان بە ٦٠ میلیۆن دیناری عێراق (نزیکەی ١٨٠ میلیۆن دولار) هەیە[٢٥]. شا بەڵێنیدا زیاتر یارمەتیان بدات و هەوڵیدا ئەمریکا و ئیسرائیلیش رازی بکات یارمەتیەکانیان بە کورد زیاتر بکەن.

هاوکات دانیشتنەکانی ئێران و عێراق بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان بەردەوام بوو بەڵام هیچ ئەنجامێکی نەبوو. لە ١٣ی نیسانی ١٩٧٤ شا لە کاتی قسەوباس لەگەڵ وەزیری دەربار، باسی دەستپێکردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتیکەکانی ئێران و عێراق دەکات و دەڵێت پێموانیە ئەنجامی هەبێت بەڵام بەهەرحاڵ پەیوەندیمان هەبێت باشترە.

لە ٢٥ی تەموزی ١٩٧٤ مەلا مستەفا بارزانی دەچێت بۆ سەردانی شا کە لە باکووری ئێران دەبێت و داوای یارمەتی زیاتر بۆ شۆڕشی کوردستان دەکات. مەلەک حوسەین، پادشای ئوردونیش هەر هەمان رۆژ سەردانی شا دەکات بۆ ئەوەی دەربارەی پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق گفتوگۆ بکەن. پاش کۆبوونەوە لەگەڵ مەلک حوسەین، شا بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**" هەر ئێستا برۆ بە باڵوێزی ئەمریکا بڵێ کاربەدەستانی میسر پێماندەڵێن لەوانەیە دەسەڵاتدارانی عێراق رێچکەی سیاسی خۆیان بگۆڕن و لەگەڵ برا عەرەبەکانیان لە**

---

[٢٥] تیلیگرام لە هێلمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران بۆ ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی، ٢٠ی ئاداری ١٩٧٤، بەپەلە، نهێنی

**یەک چوارچێوەدا سیاسەت بکەن. ئێمە (یانی من و مەلک حوسەین) ئەم بانگەشەمانە قبووڵ نییە و پێمانوایە کە کاربەدەستانی عێراق بۆیە ئەو قسەیە دەکەن چونکە بە دەست کێشەی کوردەوە دەناڵێنن و لە سەر ئەو کێشەیە ناکۆکی لە نێوان کاربەدەستانی عێراقدا درست بووە و پاش ئەوە کە لەو کێشەیە رزگاریان بوو، خێرا درێژە بە سیاسەتی پێشوویان دەدەن. ئێمە داوا لە ئەمریکا دەکەین لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە و کاتێک بینییان ئێمە راست دەکەین خۆیان مەسەلەکە بۆ کاربەدەستانی میسر باس بکەن بۆ ئەوەی میسریەکان پێیانوانەبێت کە کێشەکە لە ئێمەوەیە".**[26]

لە ٢ی ئابی ١٩٧٤ محمد ئەشرەف مەروان، نوێنەری میسر پەیامێکی ئەنوەر سادات، سەرۆک کۆماری میسر دەدات بە شا. شا بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**" میسر و عەرەبستانی سعودی دەیانەوێت پێمانبڵێن کە عێراق دەیەوێت کەمکەم خۆی لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت بهێنێتە دەرەوە. ئەڵبەتە ئەمریکاش ئەوەی پشتڕاست کردوەتەوە بەڵام زۆر بە پارێزەوە یانی قسەی ئەمڕۆ و دوێنێ نییە".**

لە ٨ی ئاب تا ٢٥ی ئابی ١٩٧٤ لێژنەی نوێنەرایەتی ئێران و عێراق بە ماوەی ١٧ رۆژ لە ئیستانبول دەربارەی پەیوەندییەکانی ئەو دوو وڵاتە و بەتایبەت چارەسەرکردنی کێشەی شەتولعەرەب وتووێژ دەکەن بەڵام وتووێژەکان هیچ ئەنجامێکی نابێت[27].

لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ شا بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**"بەداخەوە عێراقیەکان شکستێکی گرانیان سەپاندوە بە سەر کوردەکاندا بەڵام ئێمە تۆپی دوورهاوێژ و موشەکی دژە تانکمان بۆ ناردوون. پێموابێ تا چەند رۆژی دیکە پاشەکشە بە عێراقیەکان بکەن بەڵام بەهەرحاڵ روسەکانن کە کوردەکان شکست دەدەن نە عێراقیەکان.**"[28]

---

[26] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

[27] دکتر اسفر جعفری ولدانی، کانونهای بحران در خلیج فارس، چاپ دوم ١٣٧٧، تهران، سازمان انتشارات کیهان.

[28] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

له ٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ شا بە وەزیری دەربار دەڵێت لە ناخی دڵەوە زۆر خەمبارە چونکە هێزەکانی عێراق زەبرێکی زۆر گرانیان وەشاندوە لە کوردەکان. لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤ شا بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**"لە کاتی سەردانەکەم بۆ سۆڤیەت، کاربەدەستانی سۆڤیەت ئامۆژگاریان کردم لەگەڵ عێراق رێکبکەوم. منیش وتم عێراقیەکان خۆیان بە میراتخۆری ئیمپراتۆری بریتانیا دەزانن (مەبەستم سنووری شەتولعەرەب بوو کە بریتانیا هێڵی تالوێگی نەکرد بە سنوور و کەنارئاوی ئێمەی کرد بە کەنارئاوی هاوبەش). تا لەم مەسەلەیە پاشەکشە نەکەن بەهیچ شێوەیەک لەگەڵیان رێکناکەوین".**

لە ٢٥ی تشرینی دوەمی ١٩٧٤ شا بە باڵوێزی ئەمریکا دەڵێت:

**" خۆشبینییەکانی ئێوە و میسر سەبارەت بە بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست راست دەرنەچوو، بێ گومان ئەم هاندانە هاندانێکی کۆمونیستییە. جگە لەوەش وەزیری بەرگری سۆڤیەت ئێستا چووە بۆ عێراق و برژنیڤیش (سەرۆک کۆماری سۆڤیەت - وەرگێڕ) وتوویە لە داهاتوویەکی نزیکدا سەردانی عێراق دەکات. کەوابوو خۆشبینیەکانی ئێوە و میسر و عەرەبستانی سعودی سەبارەت بە بارودۆخی عێراق بە بڕوای من راست نییە، بە تایبەت کە برژنێڤ زۆر بە راشکاوی باسی بارودۆخی کەنداوی فارسی کردوە، هەڵوێستی ئێوە سەبارەت بەم هەڕەشانە چییە، لە بەرامبەر هەڕەشەکان رادەوەستن یان نا؟"[29]**

لە ٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ شا باسی پشتیوانی سۆڤیەت لە عێراق دەکات و بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**"بەرژەوەندی سۆڤیەت لەوەدایە پشتیوانی لە عێراق بکات، ئێمەش دەبێ کاری خۆمان بکەین. بەڵام بەهەرحاڵ بە تۆپی دوورهاوێژ زەبرێکی ئەوەندە توندمان لە هێزەکانی عێراق وەشاند کە پێموانیە بوێرن ئێدی هێرش بکەنە سەر کوردەکان. هێزەکانی عێراق نە بە موشەک و نە بە فڕۆکە نەیانتوانی تۆپخانەی کوردەکان (یانی**

---

[29] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

**تۆپخانەی خۆمان) لە کار بخەن. بارودۆخی سەربازی هێزەکانی عێراق زۆر خراپە مەگەر ئەوە کە روسەکان راستەوخۆ دەستێوەردان بکەن. بە باڵوێزی ئەمریکا بڵێ فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی سۆڤیەت لە عێراقە و بەڵێنی هەموو جۆرە یارمەتیەکی داوە بە عێراق، با ئەمریکا ئاگادار بێت"[30].**

٤ رۆژ دوای ئەوە واتا لە ٦ی کانوونی یەکەم شا فەرمان بە ساواک دەدات ئەگەر هەست دەکەن کە کوردەکان ناتوانن لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە و ئەگەری ئەوە هەیە پاشەکشە بکەن، تۆپە دوورهاوێژەکانمان بکێشنە دواترەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی عێراق. لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ باڵوێزی ئەمریکا لە شا پرسیار دەکات ناوبژیوانی مەلک حوسەین لە نێوان ئێران و عێراق بە کوێ گەیشت، شاش لە وەڵامدا دەڵێت بە مەلک حوسەینم وتوە کە عێراقیەکان دەبێ دەست لە میراتی بریتانیا (یانی شەتولعەرەب)[31] هەڵگرن ئەگەرنا بە هیچ شێوەیەک لەگەڵیان رێکناکەوین. لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ شا بۆ مەلک حوسەین روونی دەکاتەوە کە تا کێشەی شەتولعەرەب چارەسەر نەبێت بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ عێراق رێکناکەوێت. لە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥ شا بە وەزیری دەربار دەڵێت:

**" لە پێرشەوەوە بەرفێکی زۆر لە کوردستانی عێراق باریوە و چەند دانە تۆپی دوورهاوێژمان لە ناو بەرفدا گیری کردوە. ئەوەندە سەربازی عێراقی کوژراون کە بە**

---

[30] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

[31] مەبەستی ئەو پەیماننامەیەیە کە ساڵی ١٩٣٧ بە گوشاری بریتانیا لە نێوان ئێران و عێراقدا واژۆ کرا و ئێران بەوە رازی بوو کە بە قازانجی عێراق دەست لە شەتولعەرەب هەڵبگرێت. لە ١٦ی نیسانی ١٩٦٩ شا بە پشتیوانی ئەمریکا رایگەیاند ئێران ئەو رێکەوتننامەیە جێبەجێ ناکات و سەرەنجام لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ لە جەزایر، عێراق ئیمتیازی شەتولعەرەبی دا بە ئێران بۆ ئەوەی شا دەست لە پشتیوانیکردن لە بزووتنەوەی کورد هەڵگرێت. لە ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ واتا دوو مانگ دوای کۆچی دوایی شا لە میسر، سەدام حوسەین رێکەوتننامەی جەزاییری دڕاند و بەو بیانوو هێرشی کردە سەر ئێران کە شەڕی ٨ ساڵەی ئێران و عێراقی لێکەوتەوە. ئەوەش دەستکەوتی رێکەوتنەکەی شا و سەدام بوو لە جەزاییر. وەرگێڕ

ئەژمار نابێت. کوردەکان کە خەریک بوو رایاندەکرد ئێستا ورەیان بەرز بوەتەوە بەلاَم سەریازەکانمان وەک شێر شەڕ دەکەن".

لە ٥ی کانونی دووەمی ١٩٧٥ وەزیری دەرەوەی ئێران و عێراق لە ئیستانبوول پێکەوە وتووێژ دەکەن بەلاَم وتووێژەکانیان هیچ ئەنجامێکی نابێت چونکە وەزیری دەرەوەی عێراق پێداگری لە سەر شەتولعەرەب وەک بەشێک لە کیانی ولاَتەکەی دەکاتەوە.[٣٢]

لە ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥ بالوێزی ئێران لە پاریس پەیامێک دەنێریت بۆ شا و دەلێت سەرۆک وەزیرانی فەرانسە وتویەتی دەتوانێت لە نێوان ئێران و عێراقدا ناوبژیوانی بکات بەتایبەت کە سەدام حوسەین لە پاریس دەرباز دەبێت. شا دەلێت بە سەرۆک وەزیرانی فەرانسا بلێ ناوبژیوانی مەکەن تەنها مۆچیاری سەدام بکەن.

لە ١ی ئادار ئەشرەف مەروان، راوێژکاری سادات، سەرۆک کۆماری میسر سەردانی بەغداد دەکات و سەدام حوسەین پێیدەلێت ئامادەیە لە سەر مەسەلەی شەتولعەرەب لەگەل شا رێکبکەوێت بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا ئێران ئێدی یارمەتی کوردەکان نەدات. ئەشرەف مەروان رۆژی ٢ی ئادار واتا ٤ رۆژ پێش لە رێکەوتنی جەزایير لە تاران سەردانی شا دەکات و پێیدەلێت سەدام حوسەین ئامادەیە عێراق لە بازنەی سۆڤیەت بکشێنێتەوە ئەگەر ئێران ئەو گوشارە سەربازیە لە سەر عێراق لا ببات کە عێراقی ناچار کردوە لەگەل سۆڤیەت رێکبکەوێت.[٣٣]

لە ٣ی ئادار رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان زانیاری ئەوەی بەدەست دەگات کە لەوانەیە ئێران و عێراق لە جەزایير رێکبکەون بۆیە هەست بە مەترسی دەکات و داوا دەکات چاوی بە شا بکەوێت بەلاَم شا پێیاندەلێت راوەستن تا لە جەزایير دێمەوە.

---

[٣٢] دکتر اصغر جعفری ولدانی، بررسی تاریخی اختلافات مرزی ایران و عراق، چاپ سوم ١٣٧٦ تهران، دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی وزارت امور خارجه

[٣٣] تیلیگرام لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ کونسولخانەی ئەمریکا لە ئورشەلیم، ١٤ی ئاداری ١٩٧٥ نهێنی، بەپەلە

له ٦ی ئاداری ١٩٧٥ له میانه‌ی کونفرانسی OPEC له جه‌زاییر، ئێران و عێراق رێکه‌وتننامه‌یه‌کیان واژۆ کرد و ده‌ستبه‌جێ پاش ئه‌وه ئێران سه‌رجه‌م یارمه‌تییه‌کانی به شۆڕشی کورد پچڕاند و چه‌ند رۆژ پاش ئه‌وه سوپای عێراق ده‌ستی به هێرشێکی به‌رفراوان و توند کرد. کورده‌کان که له‌لایه‌ن شا و ئه‌مریکاوه به ته‌نیا هێڵرابوونه‌وه، نه‌یانده‌توانی له به‌رامبه‌ر دێوه‌زمه‌ی کوشتوکوشتاری عێراق رابوه‌ستن و ناچار بوون بچنه ئێران.

## شا دەربارەی ڕێکەوتننامەی جەزاییر و چارەنووسی شۆڕشی کورد چی بە مەلا مستەفا بارزانی و هاوڕێیانی وت؟

پاش گەڕانەوە لە جەزاییر شا هەر کە ڕۆژی ٦ی ئادار لە فڕۆکەکە دێتە خوارەوە و پێش ئەوەی بگاتە کۆشکەکەی، فەرمان دەدات بە خێرایی سەرجەم یارمەتیە سەربازی و مادیەکانی ئێران بە کوردەکان رابوەستێت.

ژنراڵ نەسیری، سەرۆکی SAWAK شەو دەچێتە لای ڕێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان لە تاران و پێیان دەڵێت:

**"بیستومانە عێراق موشەکی وای لە سۆڤیەت کڕیوە کە ٩ مەتر درێژە، هیچتان ناهێڵن و قڕتان دەکەن. دۆکتۆر مەحموود عوسمان دەڵێت ئێمە فێرە مردن بوین، لەو شتانە ناترسین. نەسیری لە وەڵامدا دەڵێت دۆکتۆر مەحمود، خاوەن شکۆ(شاهەنشاە) هیچ کەیفی بە قسەکانی تۆ نەهاتوە. ژنراڵ نەسیری لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت من هاتووم شتێکتان پێڕابگەیەنم. ئێرانی شاهەنشاهی بەسەدان هەزار دولار یارمەتی شۆڕشی داوە، بە چەک و سەربازی خۆشمان هاتوینە یارمەتیتان. پەنجا هەزار گولە تۆپمان لە داوێنی چیای زۆزک تەقاند و سەنگەرمان بە عەرەبەکان بەجێهێشت، پێشمەرگە نەچوون سەنگەرەکان داگیر بکەن، یارمەتیدان بە ئێوە جگە لە زەرەر و زیان بۆ ئێران هیچ بەهرە نادات. شا لەگەڵ سەدام ئاشت بوەتەوە و لە ئەمڕۆ بەولاوە هێزەکانی خۆمان دەکێشینەوە، ئێوەش دەبێ تەسلیمی بەعس بن. ئەگەر بێنە ئێران پەناتان دەدەین، دەنا ئەگەر هەر شەڕ بکەن لێتان**

**دەدەین و یارمەتی بەعس دەدەین. ئەوە پەیامی شاهەنشاهم پێڕاگەیاندن، خۆتان بیری لێبکەنەوە".**[34]

لە ٨ی ئاداری ١٩٧٥ وەزیری دەربار، ئەسەدوڵڵا عەلەم سەردانی شا دەکات. وەزیری دەربار سەبارەت بە روانگەکانی شا بۆ رێکەوتن لەگەڵ سەدام حوسەین لە جەزاییر دەڵێت:

**"خاوەن شکۆ فەرمووی لە دوو کاری باوکم زۆر دڵگران و زیز بووم: یەکەم درێژکردنەوەی رێکەوتننامەی نەوت و دووەم مەسەلەی شەتولعەرەب کە لەوانەیە رۆژێ لە رۆژان ببایە بە عەیب و و ئیراد بۆ بنەماڵەی پەهلەوی. شوکر بۆ خوا کێشەی نەوتم بە شێوەی بنەڕەتی چارەسەر کرد و رێوشوێنەکانی شەتولعەرەبیشم لە جەزاییر هەڵوەشاندەوە. ئەڵبەتە لە کردەوەدا ١٢ ساڵە ئێمە هیچ رێزێکمان لەو رێوشوێنانە نەگرتوە بەڵام دیسانیش پێمخۆشنەبوو رێکەوتننامەکە بمێنێت و شوکر بۆ خوا سەریشکەوتم".**

وەزیری دەربار هەروەها سەبارەت بە روانگەکانی شا دەربارەی چارەنووسی شۆڕشی کوردستان و ئامانجە نەتەوەیەکانی کورد دەڵێت:

**"پرسیارم لە خاوەن شکۆ کرد ئەی چارەنووسی کوردەکان بە چی دەبێت؟ فەرمووی بە سەرۆکی "ساواک"م وتووە بە کوردەکان بڵێت ئەگەر بیانەوێت بێنە ئێران مێوانی ئێمە دەبن و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بەخێویان دەکەین".**[35]

---

[34] چێشتی مجێور، هەژار موکریانی، چاپی پاریس، ١٩٩٧، لاپەڕەی ٥٥٣-٥٥٤. شایانی ئاماژەپێکردنە کە مامۆستا هەژار خۆی لەو دانیشتنەدا ئامادە بووە. وەرگێڕ

[35] شا ئەو بەڵێنەی خۆیشی جێبەجێ نەکرد چونکە پاش هاتنی شەپۆلی ئاوارەکان بۆ ئێران، رژێمی شا دەستی کرد بە ئەزیەتدانی ئاوارەکان و بە هەموو شار و شارۆچکەکانی ئێراندا ( لە باشوور تا باکوور و لە رۆژهەڵات تا رۆژئاوا) بڵاوی کردنەوە و رۆژبەرۆژ گوشارەکانی لە سەر ئاوارەکان زیاتر کرد. رژێمی شا تەنانەت رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستانیشی خستە ژێر گوشار و لە یەک جودای کردنەوە. وەرگێڕ

پرسـیارم کـرد ئەی مەسـەلەی ئوتونـومی و ئامانجەکـانی کوردەکـان بە چـی دەبێـت؟ خـاوەن شـکۆ فەرمـووی: هـیچ. کوردەکـان کە زۆر شکسـتیان لە عێـراق دەخـوارد و خۆیشـیان بـاش دەزانـن ئەگەر ئـێمە نەبـاین لە بەرامـبەر هێرشـی هەمەلایەنەی عێراقـدا ١٠ رۆژ نەیانـدەتوانی بەربەرەکـانی بـکەن. کوردەکـان دەتـوانن چـی بڵـێن؟ سـەدام حوسـەین لە چاوپێکەوتنەکەمـان لە جەزاییـر کە ٤ کـاتژمێری خایانـد دەیـوت "چەنـد جـار تەنهـا هەنگاوێکمـان مـابوو بـۆ ئەوەی بە یەکجـاری بەسـەر کوردەکانـدا سـەربکەوین بەڵام تـۆپ و سـەربازەکانی ئێـوە نەیهێشـت سـەربکەوین. ئێـوە لاوە هەرە باشـەکانی ئێمەتـان کۆمەڵکـوژ کـرد". کەوابـوو کوردەکـان کە بـاش دەزانـن تواناییـان نیـیە چـی چاوەڕوانیەکیـان لە ئێمە هەیە؟

منـیش وتـوم ئەی قوربـان چـی بە قسـە و بانگەشـەکانیان لە داهـاتوودا بکەیـن؟ خـاوەن شـکۆ فەرمـووی ئەو پرسـیارە لە جێـی خۆیـدایە و شـایانی بیرلێکـردنەوەیە بەڵام مـن هـیچ بە دووری نـازانم کە عێراقیەکـان (کە دەرگـایەکی پەیوەنـدییان لەگەڵ ئـێمە کـردوەتەوە) نەیانەوێـت بەتەواوی لە شـەڕی سیاسـەتە دەرەکییەکـان، بەتـایبەت سـۆڤیەت خۆیـان رزگـار بـکەن. دەبـێ سـەیر بکەین بزانن چی دەبێت.

وتم ئاخر پارساڵ دەوڵەتی عێراق ئامادەبوو ئوتونومی بدات بە کوردەکان بەڵام جەنابتان بە کوردەکانتان فەرموو قبوڵی مەکەن، ئەوانیش بە دڵی جەنابتیان کرد. خاوەن شکۆ فەرمووی هەم کوردەکان و هەم عێراقیەکان باش دەزانن کە ئەوە راست نەبوو، عێراق دەیەویست کوردەکان تێکبشکێنێت".[٣٦]

لە ١٠ی ئاداری ١٩٧٥ مەلا مستەفا بارزانی وەک دوایین هەوڵ نامەیەکی نارد بۆ هینری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و ئاماژەی بەوە کرد کە:

[36] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

"ئێمە هەمیشە باوەڕیمان بە چارەسەربوونی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکان، لەوانە ناکۆکییەکانی نێوان ئێران و عێراق هەیە بەڵام بەهەرحاڵ دڵمان پڕ لە خوێنە کە دەبینین ئەنجام و ئاکامی راستەوخۆی ئەو ڕێکەوتنە، تێکشکانی بێ وێنەی خەڵکی نەپارێزراوی ئێمەیە چونکە ئێران سنوری خۆی داخستوە و دەوڵەتی عێراق گەورەترین هێرشی دژی ئێمە دەستپێکردوە کە ئێستاش بەردەوامە. گەلەکەمان و بزووتنەوەکەمان بە شێوەیەک کە کەس ناتوانێت باوەڕ بکات تێکدەشکێندرێت و هەموو کەس بێدەنگە.

جەنابی وەزیری دەرەوە، ئێمە پێمانوایە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە رووی ئەخلاقی و سیاسیەوە لەبەرامبەر گەلەکەمان بەرپرسیارە چونکە ئێمە باوەڕمان بە سیاسەتی وڵاتەکەی ئێوە کردبوو. داواتان لێدەکەین هێرشی عێراق رابوەستێنن و دەوڵەتی ئێران رازی بکەن لەم کات و ساتە مێژووییە خەمبار و دڵتەزێنەدا یارمەتی خەڵکەکەمان بدات. ئێمە بە دڵگرانییەوە چاوەڕوانی وەڵام و کردەوەی خێرای جەنابتانین و دڵنیاین کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەم کات و ساتە هەستیار و چارەنووسسازەدا بێدەنگ نابێت". [٣٧]

بەڵام کیسینجێر هیچ وەڵامێکی بەو داواکاریە نەدایەوە و کاتێک کە کۆنگرێس کۆمیتەیەکی بە ناوی "کۆمیتەی پایک" بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی چونیەتی دەستێوەردانی نهێنی ئەمریکا لە شۆڕشی کورد پێکهێنا و داوای روونکردنەوەی لە هێنری کیسینجێر کرد، دوایین وەڵامی کیسینجێر ئەوە بوو کە کاری شاڵاوی نهێنی نابێ لەگەڵ کاروباری ئایینی و مرۆڤدۆستانە تێکەڵ بکرێت.

رۆژی ١٠ی ئاداری ١٩٧٥ هینری کیسینجێر نامەیەکی ساردی نارد بۆ شا و بێ ئەوەی پیرۆزبایی ڕێکەوتنەکەی جەزاییری لێبکات، پێیراگەیاند:

---

[٣٧] تیلیگرام لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە، ١٠ی ئاداری ١٩٧٥، نهێنی

"سەبارەت بە کێشەی کورد، شتێکی ئەوتۆم نیە بە سەر ئەو بۆچونانەدا زیادی بکەم کە لە کاتی دوایین دیدارە دووبەدووەکەماندا پێموتی."[38]

لە ١١ی ئاداری ١٩٧٥ وەزیری دەربار سەردانی شا دەکات و ناڕاستەوخۆ پێیدەڵێت دەبوایا شا زیاتر بۆ چارەنووسی کوردەکان هەوڵیدابایا چونکە رەخنەی زۆری دەربارەی قوربانیکردنی بزووتنەوەی کورد هاتوەتەسەر. وەزیری دەربار لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

"دەربارەی کوردەکان و عێراق وتم رادیۆکانی عێراق سووکایەتیمان پێدەکەن و دیسان دەستیان کردوەتەوە بە پرۆپاگەندا دژی ئێمە. خاوەن شکۆ زۆر پێیسەیر بوو. وتم مەسەلەی دیکە ئەوەیە کە لەوانەیە سۆڤیەت هەوڵ بدات لەرێگای سوریەوە کوردەکان بخاتە ژێر رکێفی خۆی. خاوەن شکۆ فەرمووی سوریە توانای ئەوەی نییە. وتم بەهەرحاڵ رۆژنامەکانی رۆژئاوا و خودی کوردەکان تێکرا دەڵێن کە ئێمە مامەڵەمان بەسەریانەوە کردووە. خاوەن شکۆ فەرمووی تا ئەبەد کە نەماندەتوانی سوپای ئێران لەوێ جێگیر بکەین و شەڕ بکەین. وتم بەهەرحاڵ ئێمە کە پێشتر رێوشوێنەکانی شەتولعەرەبمان تێکدابوو، لەوانەیە بمانتوانیبا زیاتر بۆ چارەنووسی کوردەکان هەوڵمان بدایا چونکە وادیارە لە ٤٨ کاتژمێری رابردوودا سوپای عێراق بە شێوەیەکی بێبەزەییانە کوردەکان تێکدەشکێنێت سەرەڕای ئەوەی کە ئاگربەستیان راگەیاندووە. خاوەن شکۆ ئیدی هیچی نەفەرموو".[39]

---

[38]–مەبەستی ئەو دانیشتنەیە کە لە ١٨ی شوباتی ١٩٧٥ لە نێوان خۆی و شادا لە زوریخی سوئیسرا بەڕێوەچووە. لەو دانیشتنەدا کیسینجێر مۆچیاری شای کردبوو لەگەڵ سەدام رێکنەکەوێت چونکە ئەگەر خەباتی کوردەکان کۆتاییپێبێت دەوڵەتی عێراق بەهێز دەبێت و کێشە بۆ ئیسرائیل دروست دەکات. هەربۆیە ئەم پەیامەی کیسینجێر بۆ شا زۆر ساردە و پیرۆزبایی لە شا نەکردووە. ئەسەدوڵا عەلەم وەزیری دەربار لەو پەیوەندییەدا دەڵێت پەیامەکەی کیسینجێر ئەوەندە سارد بوو کە شا وتی پێویست ناکات وەڵامی بدەنەوە و سپاسی بکەن. عەلەم هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە کیسینجێر رێکەوتنەکەی جەزاییری پێناخۆش بوو. وەرگێڕ

[39] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

**ڕۆژی ١٢ی ئاداری ١٩٧٥ مەلا مستەفا بارزانی و هاوڕێیانی بۆ دوا جار چاویان بە شا دەکەوێت[٤٠]. شا بە ڕێبەرایەتی کورد دەڵێت:**

**" ئێوە ئەم دوایانە بوونە بارگرانی بۆ من و هەر چی شەڕەکە توندتر دەبوو ئێوە دەهاتنە دواوە و شەڕەکەتان لە سنووری ئێران نزیکتر دەکردەوە. من لە بەر بەرژەوەندی وڵاتەکەم لەگەڵ عێراق ڕێکەوتووم چونکە ئەوە سەدام لە پەیوەندی لەگەڵ شەتولعەرەبدا بۆ منی کردوە نوری سەعیدیش بۆی نەکردووم. عێراق بەڵێنیداوە ڕێکەوتنەکە جێبەجێ بکات. دوو لایەن کە ڕێکدەکەون لایەنی سێیەم زەرەر دەکات کە ئێوەن. ئەوە شەڕە، ئەوە ژاپۆن، ئەوە ئاڵمانیا لە شەڕدا شکستیان هێنا."[٤١]**

**دۆکتۆر مەحمود عوسمان لەو قسانەی شا تورە دەبێت و بە شا دەڵێت:**

**" ئێوە بە ئێمەتان وت هاوکاریتان دەکەین تا مەسەلەکەتان چارەسەر دەبێت بەڵام ئێستا ئێوە لە سەر حیسابی ئێمە لەگەڵ سەدام ڕێکەوتوون، ئێوە ئێمەتان فرۆشت، ئەوە دژی قسە و بەڵێنەکانی خۆتانە، ئێوە زەرەر دەکەن کە کورد بە سەدام دەفرۆشن، ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ کوردستان چی بە خەڵکەکەمان بڵێین؟ ژاپۆن و ئاڵمانیا تا ئاخر ڕۆژ شەڕیان کرد بەڵام ئێمە لە پشتەوە شکاوین، ئێوە ئێمەتان شکاند. بەڵام دڵنیا بن ئێمە درێژە بە خەباتەکەمان دەدەین و کوردی هەموو پارچەکانی کوردستانیش پشتیوانیمان لێدەکەن و ئەم لێدانەی ئێمە دەبێتە هۆی ئەوەی خەبات لە پارچەکانی دیکەی کوردستان زیاتر بێت".[٤٢]**

---

[٤٠] ئەسەدوڵا عەلەم، وەزیری دەربار لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو ڕۆژە کە بڕیاربوو شا چاوی بە مەلا مستەفا بارزانی بکەوێت، شا زۆر بێزار و خەمگین بوو چونکە پێیخۆش نەبوو چاوی بە مەلا مستەفا بکەوێت. مەبەستی عەلەم ئەوەیە شا خیانەتی لە مەلا مستەفا بارزانی کردبوو بۆیە شەرمی دەکرد چاوی پێبکەوێت. وەرگێڕ

[٤١] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان، ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

[٤٢] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان، ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

شا لەو قسانەی دۆکتۆر مەحمود عوسمان زۆر تورە دەبێت و دەڵێت:

**" لەوەزیاتر لە سەری مەڕۆ، من بڕیاری خۆم داوە، هیچ بۆ باس و موناقشە نەماوە، لە رۆژانی داهاتوودا کاربەدەستانی عێراق دێنەلام دەبێ بڕیاری ئێوەیان پێڕابگەیەنم، ئێوە رێکەوتنەکەتان قبوڵە یا نا ؟ شەڕ دەوەستێنن یا نا؟ ئێوە سێ رێگاتان لە پێشە: رێگای یەکەم ئەوەیە وەرنە ئێران، ئێمە وەرتاندەگرین و پێشوازیتان لێدەکەین. رێگای دووەم ئەوەیە بڕۆن لەگەڵ سەدام رێکبکەون و کێشەکەتان لەگەڵ عێراق چارەسەر بکەن. رێگای سێیەم ئەوەیە بڕۆن درێژە بە خەباتی خۆتان بدەن بەڵام ئێمە سنورەکانمان بە تەواوی دادەخەین و هیچ چەشنە یارمەتییەکتان نادەین"**[٤٣] .

کاتێک کە لای شا دێنە دەرەوە مەلا مستەفا بارزانی بە هاورێیانی دەڵێت ئێمە درێژە بە خەباتی خۆمان دەدەین. بارزانی و هاورێیانی ١٢ی ئاداری ١٩٧٥ دەگەرێنە بۆ کوردستان و بە تێکرا بڕیاریان وادەبێت درێژە بە شەڕ لەگەڵ عێراق بدەن.

لە ١٤ی ئاداری ١٩٧٥ ریچارد هێلمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران سەردانی وەزیری دەربار دەکات. وەزیری دەربار لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

**"باڵوێزی ئەمریکا باسی کوردستانی کرد و وتی رێکەوتنی جەزاییر سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ شاهەنشا بەڵام ئەی چارەنووسی کوردەکان بە چی دەبێت؟ هێرشە دڵرەقەکانی عێراق بۆ سەر کوردەکان نابێتە هۆی زیزبوونی شاهەنشا؟ وتم ئەڵبەتە کە خاوەن شکۆ لەو هێرشانە زیزە بەڵام دەبوایا چیمان بکردایا؟ ئەمانە (کوردەکان) شکستیان خواردبوو، لە راستیدا سوپای ئێمە بوو کە شەڕی دەکرد. ئەفسەرەکان و هێزەکانمان ١٠٠ دانە تۆپی دوورهاوێژ و موشەکی دژەتانک و دژە فرۆکەیان لەوێ ئیدارە دەکرد و ئێستا دەبێ ئەم تەقەمنیە لەوێ ئاگر تێبەردەین چونکە دەرفەتی ئەوەمان نیە بیانگەرێنینەوە. جگە لەوەش کوردەکان بەردەوام داوای یارمەتیان**

---

[٤٣] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان، ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

دەکرد و دەیانگوت خەریکە لەناو دەچین. چۆن دەکرا شوێنێکی وا رابگرین؟. ئەڵبەتە دنیا ئاگاداری ئەم وردەکاریانە نییە، هەر بۆیە تۆمەتی ئەوە دەخەنە پاڵمان کە وەفامان بۆ کوردەکان نەبووە.

جگە لەوەش گریمان کوردستان سەربەخۆیی بەدەستهێنابا چی قازانجێکی هەبوو بۆ ئێمە؟ ئەگەر زەرەری یەکلاییکەرەوەی نەبایا هیچ قازانجێکیشی بۆمان نەبوو. زیاتر لە ساڵێکە کوردەکان ئێدی نەیاندەتوانی لەبەرامبەر عێراقدا رابوەستن، ئێمەبووین کە دەمانپاراستن. ئێدی هیچ هۆکارێک نابینین کە ئەم هەموو پارەیە بۆ شەڕی کوردەکان خەرج بکەین و ئاوارەکانیان کە ۳۰۰ هەزار کەس دەبن بەخێو بکەین و ئەم هەموو پارەیانە بۆ خەرج بکەین. دنیا ئاگاداری ئەم وردەکاریانە نییە بۆیە ئیرادمان لێدەگرن. بەڵام چونکە ناتوانین شتەکان روون بکەینەوە، بێدەنگی لێدەکەین. باڵوێزی ئەمریکا وتی ئەم سەختگیریەی عێراق بۆ خۆیشیان خراپە. وتم ئەوە ئێدی رێگاچارەی نییە. لەوانەیە لە ئەنجامدا کوردەکان بە شێوەی گریلایی و بەربڵاو ئەزیەتی عێراق بدەن بەڵام ئەوەش دیسان هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە. لەوانەشە ژمارەیەکی زۆریان رابکەن بۆ ئێران کە ئێمە وریاندەگرین."[٤٤]

لە ١٧ی ئاداری ١٩٧٥ وەزیری دەربار دیسان سەردانی شا دەکات. شا گلەیی ئەوە دەکات کە رۆژنامە ئەمریکییەکان رەخنە لە ئێران دەگرن و تۆمەتباری دەکەن کە خیانەتی لە بزووتنەوەی کوردی کردوە و پشتی کوردی شکاندووە. وەزیری دەربار لەو پەیوەندییەدا دەڵێت:

"خاوەن شکۆ فەرمووی دەربارەی مەسەلەی کوردەکان، رۆژنامەکانی ئەمریکا و رۆژئاوا بەگشتی زۆر ئەزیەتی ئێمەیان دا و تۆمەتی ئەوەیان خستەپاڵمان کە وەفامان بۆ کوردەکان نەبووە، ئێمەش بەداخەوە بە هۆکاری فەنی و سیاسی ناتوانین مەسەلەکەیان بۆ روون بکەینەوە. وتم هیچ گرنگ نییە قوربان، مەگەر خودی ئەم

---

[44] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

ئەمریکیانە نەبوون کە ڤییەتنامیەکان و کامبوجیەکانیان فەوتاند. چی وەڵامێکیان هەیە بیدەنەوە؟.

پاشان کۆمەڵێک راپۆرتی "ساواک"م نیشانی خاوەن شکۆ دا کە لە هەمویاندا دوای ئەوە کرابوو کاتی هاتنی کوردەکان لە عێراق بۆ ئێران درێژ بکرێتەوە چونکە ژن و منداڵیان لەگەڵدایە و لەم ماوە کورتەدا ناتوانن بگەن بە ئێران. وتم مەلا مستەفا بارزانی زۆر نیگەرانی خەڵکەکەیەتی. خاوەن شکۆ فەرمووی بڵێن پێشمەرگەکان زووتر بێنە ئێران، عێراق کە کاری بە سەر ژن و منداڵیانەوە نییە. وتم ئەوە راستە قوربان بەلام تێگەیاندنی کوردەکان ئاسان نییە، تەنانەت ناتوانین تێیانبگەیەنین کە دەست لە ژن و منداڵەکەیان هەڵگرن. خاوەن شکۆ فەرمووی دەتوانین بیانخەینە ژێر چەتری پاراستنی (رێکخراوی) نێونەتەوەیی خاچی سور و هەرواش دەکەم. وتم لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ شێوەیەک ناکرێت ئەو ناوە بچەسپێنین بە کوردەکانەوە. خاوەن شکۆ فەرمووی بەهەرحاڵ هیچ رێگای دیکەمان نییە و ناتوانین رێکەوتنەکەی ئێستامان (لەگەڵ عێراق) پێشێلبکەین".[٤٥]

لە ١٨ی ئاداری ١٩٧٥ سەرکردایەتی سیاسی و سەربازی شۆڕشی کوردستان لە حاجی عومران کۆدەبێتەوە. لە کۆبونەوەکەدا مەلا مستەفا بارزانی دەڵێت:

"دەورووبەرمان گیراوە، ئێران و عێراق رێککەوتوون، ئەمریکا و سۆڤیەتیان لەگەڵە، OPECیان لەگەڵە، ئێمە بە تەنیا هیچمان پێناکرێت. من رام ئەوەیە بۆ ماوەیەک بچینە ئێران و پاش ئەوە کە پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق تێکچوو(کە بە بروای من تێکیشدەچێت) بگەڕێینەوە بۆ عێراق و درێژە بە خەباتی خۆمان بدەین چونکە لەم بارودۆخەدا ئەگەر شەڕ بکەین خوێن بێ کەڵک دەڕژێت و خەڵک بێ ئەنجام دەکوژرێت".

---

[45] The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

پاشان بۆچونەکەی مەلا مستەفا دەخرێتە دەنگدان و زۆربەی ئامادەبوانی کۆبوونەوەکە دەنگ بە بۆچوونەکەی بارزانی دەدەن.[٤٦]

دەیڤید کۆرن، لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە خۆی جارێک بە شێوەی فەرمی لەگەڵ نوێنەری شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٧٤ دانیشتبوو، لە وتارە تێروتەسەلەکەیدا بە ناوی "دوایین ساڵەکانی ژیانی بارزانی" ئاماژە بەوە دەکات کە:

"باس لەوە دەکرێت لە ١٢ ئادار تا ١٨ی ئادار شا دوو پەیامی ناردوە بۆ بارزانی بەڵام ناوەرۆکی ئەو پەیامانە دیار نیە، ئایا لەو پەیامانەدا شا هەڕەشەی لە کوردەکان کردوە و گوشاری خستوەتە سەریان کە درێژە بە شەڕ نەدەن؟ ئایا ئەمریکا دەستێوەردانی کردوە و کوردەکانی لە درێژەدان بە خەباتەکەیان دڵسارد کردوەتەوە؟".[٤٧]

وەڵامی ئەو پرسیارانە دیار نین بەڵام مەلا مستەفا بارزانی ڕۆژی ٢٠ی ئادار واتا دوایین ڕۆژی شۆڕشی ئەیلوول بە جیم هۆگلەند، دۆستی کورد و هەواڵنێری ڕۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست"ی وتووە لە ئەنجامی گوشاری ئێراندا فەرمانی بە پێشمەرگەکان داوە چەکەکانیان دابنێن بۆ ئەوەی لەوە زیاتر خوێن بێ کەڵک نەڕژێت.[٤٨]

جیم هۆگلەند کە تەنها ڕۆژنامەنووسی ئەمریکایی بووە کە تا دوایین ساتەکانی شۆڕشی ئەیلوول لای بارزانی بووە دەربارەی دوایین ساتەکانی شۆڕشی کورد دەڵێت:

"ئەو ڕۆژە کە سەدام و شا لە جەزاییر خەریکی گفتوگۆ بوون من لەوێ بووم و هەردوویانم بینی. زانیم کە خەریکن ڕێکدەکەون بۆیە دەستبەجێ گەڕامەوە بۆ کوردستانی عێراق بۆ ئەوەی بارزانی ببینم. شەوی ١٩ لەسەر ٢٠ی ئادار بارزانی لە حاجی عومران وتی خەبات کۆتایی پێهاتوە و کەس (لەوانە ئەمریکا) پشتیوانیمان

---

[٤٦] دیمانەی وەرگێڕ لە گەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان،١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

[47] Korn، David A. The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994

[٤٨] تیلیگرام لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی، ٢٢ی ئاداری ١٩٧٥.

لێناکات. بارزانی پێیوتم تاوانی گەلی کورد چیە کە هەموو دەوڵەتەکان بونەتە دژی. هەروەها وتی پێمخۆش نیە بڵێم ئێران خیانەتی لێکردووین بەڵام ئێران و عێراق لە سەر حیسابی ئێمە بۆ بەرژەوەندی خۆیان ڕێککەوتوون. بارزانی داوای یارمەتی سیاسی و مرۆڤدۆستانەی لە زلهێزەکان بەتایبەت ئەمریکا کرد بۆ ئەوەی کورد تووشی کۆمەڵکوژی نەبێت.

ڕۆژی ٢٠ی ئادار واتا دوایین ڕۆژی شۆڕشی کورد پاش کۆبوونەوە لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕۆژنامەنووسانی بیانی، بارزانی منی کێشایە سووچێک و وێڕای ئەوەی داوای لێکردم پەیامەکەی بگەیەنم بەدەستی کاربەدەستانی ئەمریکا، وتی ئەمریکا پشتی تێکردووین. بارزانی وتی لە ژێر گوشاری ئێراندا فەرمانی بە پێشمەرگەکان داوە چەک دابنێن. بارزانی هەروەها وتی کاربەدەستێکی باڵای SAWAK لە دانیشتنێکی نهێنی لە بارەگای سەرکردایەتی لە حاجی عومران پێوتووم یان دەبێ تەسلیمی عێراق بن یان ئێران، هیچ ڕێگای دیکەتان نییە. کاتەکە زۆر هەستیار بوو و نەدەکرا زیاتر لە سەر ئەو مەسەلەیە بڕۆین چونکە تانکەکانی عێراق لە حاجی عومران نزیک دەبوونەوە بۆ ئەوەی بدەن لە بارەگای سەرکردایەتی بارزانی. بەهەر حاڵ مەلا مستەفا لەو کەسانە نەبوو کە لە هەڕەشەی شا بترسێت یان لە هەڵوێستەکەی پاشگەز بێتەوە بەڵکوو مەبەستی ئەوە بوو کە بە هۆی ئەوەی شا ئێدی چەکی قورس و دژەفڕۆکە نادات بە کورد، پێشمەرگە ناتوانێت بەو چەکوچۆڵە سووکانە کە هەیەتی لە بەرامبەر سپای دڕندەی عێراق ڕابوەستێت و ناتوانێت پێش لە کۆمەڵکووژی خەڵکی سیڤیل بگرێت، بارزانی لە کۆمەڵکوژی خەڵک بەدەستی سپای عێراق دەترسا".[٤٩]

---

[٤٩] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ جیم هۆگلەند، پاریس، ١٠ی تەموزی ٢٠١٢.

## ئایا ئەمریکا دەستی هەبوو لە رێکەوتننامەی جەزاییردا؟

ئەمریکا ئاگاداری هەوڵەکانی عێراق بۆ نزیکبوونەوە لە ئێران بوو و دەیزانی کە کتوپڕ پاش ئەوە کە شا و سەدام رێکبکەون، شا کۆتایی بە هەموو یارمەتیەکانی بە بزووتنەوەی کورد دەهێنێت بەڵام پێشبینی ئەوەی نەدەکرد ئێران و عێراق بەو زوانە و بەو شێوەیە لەناکاو رێکبکەون. ١٨ رۆژ پێش لە رێکەوتنی جەزاییر، شا لە سوئیس باسی ئەوەی بۆ کیسینجێر کردبوو کە ئەگەر لە جەزاییر کاربەدەستانی عێراق ببینێت لەوانەیە لەگەڵیان وتوێژ بکات بەڵام بە کیسینجیری نەوتبوو ئەگەری ئەوە زۆرە لەگەڵ سەدام رێکبکەوێت. کیسینجیریش هۆشداری بە شا دابوو کە لەگەڵ عێراق رێکنەکەوێت چونکە بەڵێنەکانی سەدام جێگای متمانە نین و ئەگەر شەڕی کورد و عێراق کۆتایی پێبێت دەوڵەتی عێراق بەهێز دەبێت و کێشە بۆ ئیسرائیل دروست دەکات و دەسەڵاتی سۆڤیەت زیاتر دەبێت.

پێش لە رێکەوتننامەی جەزاییر نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد (کە ئاگاداری پەیوەندی کورد و ئەمریکا و یارمەتیەکانی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد نەبوو) بەردەوام داوای لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەکرد پێشوازی لە ئاساییبونەوەی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق بکات و شا رازی بکات کۆتایی بە یارمەتیدانی کورد بهێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمریکا هیچ بەرنامەیەکی نەبوو بۆ ئەوەی داوا لە شا بکات لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت چونکە ئەمریکا دەیەویست شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق بەردەوام بێت. کیسینجێر هەرچەند کە بە سەرکەوتنی کورد بەسەر عێراقدا رازی نەبوو بەڵام لە ئەگەری سەرکەوتنی دەوڵەتی

عێراق بەسەر کوردیشدا نیگەران بوو چونکە ئەو مەسەلەیە بە قازانجی ئەمریکا نەبوو.

هێنرى کیسینجێر لە کتێبەکەیدا بە تێروتەسەلی باسی چۆنیەتی ڕێکەوتنەکەی شا و سەدام دەکات و بانگەشەی ئەوە دەکات کە بە هیچ شێوەیەک دەستی لە ڕێکەوتنەکەدا نەبوە و قەد پێشبێنی ئەوەی نەکردوە کە شا بەو شێوەیە لەناکاو لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت و پشت لە کورد بکات[٥٠]. کیسینجێر دەڵێت:

**"لە سەرەتای ١٩٧٥ هاوکات لەگەڵ ئەوەی سوپای عێراق بەردەوام لە ناوچەی کوردنشین پێشڕەوی دەکرد شا بێ ئەوەی پێشتر ئاگادارمان بکاتەوە لە ناکاو بڕیاریدا هەموو شتێک تێکبدات. شا قەد دژایەتی بڕیارە جۆراوجۆرەکانی ئێمەی بۆ یارمەتیدانی کوردەکان نەکردبوو کە لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بووبێت کە لەوە ترسابێت ئەگەر دژایەتی بڕیارەکانمان بکات پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکا تێکبچێت کە ئاسایشی وڵاتەکەی لە سەر بنەمای ئەو پەیوەندییە بوو. بەڵام پچڕانی یارمەتیەکانی ئەمریکا بە ناوچەی هیندوچین لەو کاتە هەستیارەدا لەوانەیە شای زۆر هاندابێت کە وڵاتەکەی نەخاتە ناو مەترسی شەڕێکی ئاشکرا لەگەڵ عێراق، یا سنورە درێژەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت نەخاتە ناو مەترسییەوە بێ ئەوەی کۆمەڵێک گارانتی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وەربگرێت چونکە ئێمە لە بارودۆخێکدا نەبووین کە ئەو گارانتیە بدەین بە شا. کەوابوو شا بڕیاریدا پاشەکشە بکات.**

**لە دانیشتنێکدا لەگەڵ من لە زوریخ لە ١٨ی شوباتی ١٩٧٥ (١٨ ڕۆژ پێش لە ڕێکەوتننامەی جەزاییر - وەرگێڕ) شا بۆ یەکەم جار پێیڕاگەیاندم کە دەیەوێت لەگەڵ سەدام حوسەین وتوویژ بکات. من ئەوەم وەبیری شا هێنایەوە کە خۆت بەردەوام دەتگوت هەڵوەشانەوەی خەباتی کورد**

---

[٥٠]-سەرجەم بەڵگەنامەکان نیشان دەدات کە ئەو بانگەشەیەی کیسینجێر ڕاستە کە دەڵێت دەستی لە ڕێکەوتننامەی جەزاییردا نەبوە و پێشبینی ئەوەی نەکردوە شا و سەدام بەو زووانە ڕێکبکەون. وەرگێڕ

سەراسەری ناوچە ناسەقامگیر دەکات. هەروەها هۆشداریمدا بە شا کە بەڵێنەکانی سەدام بۆ ئەوەی باش لە هەرێمی کوردستان هەڵسوکەوت بکات هیچ بایەخێکی نییە و بە هۆی ئەوەی سۆڤیەت پاشەکشەی ئێران بە نیشانەی لاوازبونی رۆژئاوا دەزانێت، لەوانەیە ماجەراجوویی سۆڤیەت تەنانەت لەو بەرەیەدا زیاتریش بێت.

پاشان لەو پەیوەندییەدا بە فۆرد، سەرۆک کۆمارم راگەیاند:

"لە وەلامی دەستپێشخەریەکی دەوڵەتی عێراقدا، شا دەیەوێت لەگەڵ دەسەلاتداری یەکەمی عێراق واتا سەدام حوسەین دابنیشێت. شا وتی ناتوانێت هەرێمێکی کوردنشینی خاوەن ئۆتونومی قبوولّ بکات کە لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ناوەندی کومونیستی عێراقدا بێت. شا لەوە نیگەرانە کە دەوڵەتی عێراق کۆمەڵێک خراپکاری لە سەر سنووری ئێران و عێراق ئەنجام بدات کە ببێتە هۆی ئەوەی کێشەی کورد ببێت بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی و ببێت بە ئەجیندای ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتوەکان کە شا ئەوەی بە هیچ شێوەیەک پێباش نییە. بە کورتی وەسوەسەی ئەوە کەوتوەتە دڵی شا کە دەربارەی کوردەکان لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت بەلام لەوە دڵنیا نیە کە ئەوە زۆر مومکین بێت. هاوکات شا دەیەوێت درێژە بە پشتیوانیکردن لە کوردەکان بدات".

بۆچوونەکانی من راست بوو. بە هۆی ئەوەی خەباتی کوردەکان نەدەکرا ئیدی بە شێوەی شالاوی نهێنی بەردەوام بێت، پێویست بوو ئێران بە پشتیوانی ئەمریکا بە ئاشکرا لە کێشەی کوردەکاندا دەستێوەردان بکات. ئەو کارەش پێویستی بە بەکارهێنانی دوو فەیلەقی سپای ئێران و تەرخانکردنی سالانە ٣٠٠ میلیۆن دولار بوو.

لە ٢٢ شوباتی ١٩٧٥ واتا ماوەیەکی کورت پاش دیدارەکەم لەگەڵ شا، بە دینیتز (باڵوێزی ئیسرائیل لە ئەمریکا - وەرگێڕ)م راگەیاند:

"شا لەو دەستکەوتانە دەترسێت کە کوردەکان بەدەستیان هێناوە. لەوانەیە شا دەست بە وتووێژ لە گەڵ عێراق بکاتەوە ئەگەر لە دانیشتنی OPEC چاوی پێیان بکەوێت و پێکەوە رێکبکەوون لەبەرامبەر ئەوەدا کە ئێران پشت لە بارزانی بکات. من بە توندی هۆشداریمدا بە شا کاری وا نەکات".

شــا بە منــی نەوت کە ئەگەری ئەوە زۆرە لەگەڵ ســەدام رێکبکەوێــت و بەوە رازی بێــت دەســەڵاتی هەرێمــی کوردنشــین بە تەواوی بکەوێــتە دەســتی عێــراق. هەر بــۆیە منــیش درێــژەم بە تەشــویقکردنی بــارزانی دەدا. بــۆ نمــونە بــارزانی نــامەیەکی نــارد بــۆم و داوای کردبــوو چــاوی پێمبکەوێــت. منــیش لە ٢٠ی شوباتی ١٩٧٥ وەها وەڵامی داواکاریەکەی بارزانیم دایەوە:

"زۆر خۆشــحاڵ بــووم کە پەیــامەکەی ٢٢ی کــانوونی دووەمــی ١٩٧٥ی جەنــابتم بەدەســت گەیشــت. مــن ستایشــی دەوڵەتــی ئەمریکــا بە ئێــوە و گەلەکەتــان رادەگەیەنــم و دەسخۆشــی لە هەوڵە قارەمانانەکانتــان دەکەم. ئەو گیروگرفتــانە کە ئێــوە لەگەڵــی رووبەڕوون، زۆر دژوارە. مــن هەڵســەنگاندنەکەی ئێــوە دەربــارەی بــارودۆخی سیاســی و ســەربازی زۆر بەرز دەنــرخێنم. دڵنیــابن کە پــایەبەرزترین کاربەدەســتانی دەوڵەتــی ویــلایەتە یەککگرتووەکــانی ئەمریکــا زۆر بەجــدی ســەرنج بە پەیــامەکەی جەنابتــان دەدەن چــونکە ئەو مەســەلەیە بــۆ ئــێمە گرنگە. ئەگەر بتانەوێت نــوێنەرێکی بــاوەڕپێکراو بنێــرن بــۆ واشــینگتۆن بــۆ ئەوەی زانیــاری زیــاتر دەربــارەی بارودۆخەکەتــان بــدات بە دەوڵەتــی ویــلایەتە یەککگرتووەکــانی ئەمریکــا، ئــێمە شــانازی پێــدەکەین و بە خۆشــحاڵیەوە پێشوازی لێدەکەین".

نــزیکەی دوو هەفــتە دوای ئەوە لە ٦ی ئــادار لە کاتێکــدا کە خــۆم ئامــادە دەکــرد ســەفەری رۆژهەڵاتــی ناوەڕاست بــکەم شا تووشی سەرســوڕمانمی کــرد و رایگەیانــد لەگەڵ ســەدام رێکەوتــوە و لە بەرامــبەردا واز لە کوردەکــان دەهێنێــت. شــا ســنووری وڵاتەکەی داخســت و لە بەرامــبەر ئیمتیــازی شەتولعەرەبدا سەرجەم یارمەتیەکانی بە کورد راوەستاند.

پــــاش ئەوە کە ڕێکەوتنـــــی شــــا و ســـــەدام ڕاگەیەنـــدرا، ڕۆژی ٩ی ئــــادار مەسەلەکەم بە تێروتەسەلی بـۆ ئیسـحاق ڕابین (ســەرۆک وەزیرانــی ئیســرائیل- وەرگێڕ) باس کرد و پێموت:

" شا لە زوریخ بە شێوەیەکی گریمانەیی دەربارەی ئەگەری ڕێکەوتن لە گەڵ سەدام قسەی کرد و پێوتم ئەگەر لە جەزاییر سەدام ببینم... شا تەنها وەک بۆچونێک باسی ئەوەی بۆم کرد کە چی ڕوودەدات ئەگەر لەگەڵ سەدام ڕێکبکەوێت. من زۆر بەجدی بە شام وت کە بیرۆکەی ڕێکەوتن لەگەڵ سەدام بیرۆکەیەکی خراپە، بەتایبەت نابێت متمانە بەو دڵنیاییدانەوەیەی عێراق بکات کە ناهێڵێت هیچ کومونیستێک لە هەرێمی ئۆتونومی کوردنشین هەبێت"[٥١].

لە ١٠ی ئــادار تیلیگرامێکــی ســاردم نــارد بـــۆ شـــا و پێمــوت کردەوەکـــانی پشتڕاســت نــاکەمەوە و پێمــوت کە گومــانم لەوەدا هەیە بگەیــت بەو قازانجــانەی کە خۆت داناوە پێیان بگەیت. بە "شا"م وت:

" سەبارەت بە کێشەی کورد، شتێکی ئەوتۆم نیە بە سەر ئەو بۆچونانەدا زیادی بکەم کە لە کاتی دوایین دیدارە دووبەدووەکەماندا پێموتی. ڕوونە کە ئێوە مافی خۆتانە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەتان بڕیار بدەن. سیاسەتی ئێمە بەردەوام ئەوەیە کە پشتیوانی لە ئێران وەک دۆستێکی نزیک و وەفاداری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بکەین. ئەڵبەتە من بەپەرۆشەوە سەیری پەرەسەندنی پەیوەندیەکانی ئێران – عێراق و سیاسەتی عێراق لە ناوچەکەتان بە گشتی و سۆڤیەت بە تایبەتی دەکەم"[٥٢].

کاربەدەستانی CIA لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران لەو بڕیارەی شا بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ سەدام توڕە و خەمگین بوون بەڵام هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران پێشوازی لەو بڕیارەی شا کرد و ڕێکەوتنەکەی ئێران و عێراقی بە هەنگاوێکی ئەرێنی لە قەڵەمدا چونکە لە ڕوانگەی ئەوەوە ڕێکەوتنەکە دەبوە هۆی سەقامگیربوونی ناوچە.

---

[51] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

[٥٢] تیلیگرام لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران، ١٠ی ئاداری ١٩٧٥، نهێنی.

هێڵمز پێیوابوو کیسینجێریش پێشوازی لە ڕێکەوتنەکەی شا و سەدام دەکات و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد وەزارەتی دەرەوە لەو هەنگاوەی شا بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق پێشوازی بکات بەڵام بەپێچەوانەوە هێنری کیسینجێر لە بڕیارەکەی شا توڕە بوو چونکە پێیباشتر بوو خەباتی کوردەکان درێژە بکێشێت بۆ ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە خۆیانەوە سەرقال بکەن بەو ئامانجە کە دەوڵەتی عێراق نەتوانێت کێشە بۆ ئیسرائیل دروست بکات[٥٣].

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی بە تەواوی نهێنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا لە کۆشکی سپی لە ڕۆژی ٢٨ی ئاداری ١٩٧٥ کە سەرۆک کۆمار، وەزیری بەرگری، سەرۆکی ستادی هێزە سەربازیە هاوبەشەکانی ئەمریکا، وەزیری خەزێنەداری و سەرۆکی CIA تێیدا بەشدار بوونە، هێنری کیسینجێر وتویەتی:

**"من تەییدی ئەو ڕەفتارە دڵڕەقە ناکەم کە ئێران و عێراق بە چارەنووسی کوردیان کرد بەڵام باشی ڕێکەوتنەکەی ئێران و عێراق لەوەدا بوو کە بارودۆخێکی خولقاند کە عێراق ئیدی پێویستی بە سۆڤیەت نەما. من هیوادارم کە سەرجەم وڵاتانی عەرەبی لە سۆڤیەت دوور بکەنەوە و لە ئەمریکا نزیک بینەوە."[٥٤]**

بە گوێرەی بەڵگەنامەیەکی نهێنی کۆشکی سپی، هینری کیسینجێر لە ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥ واتا ٩ مانگ دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول، لە باڵوێزخانەی عێراق لە فەرانسا لەگەڵ سەعدون حەمادی، وەزیری دەرەوەی عێراق و فەلاح مەهدی، باڵوێزی عێراق لە فەرانسە کۆبوەتەوە. لە کۆبوونەوەکەدا کیسینجێر بە وەزیری دەرەوەی عێراق دەڵێت:

**"ئێمە و ئێوە چەند ساڵە پەیوەندیمان پێکەوە نییە بەڵام دەبێ هەر لە ئێستاوە ناکۆکیەکانمان چارەسەر بکەین و پەیوەندیمان پێکەوە هەبێت. حەمادی بە**

---

[53] Korn، David A. The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994

[54] -Source: Gerald R. Ford Presidential Library, Kissinger - Scowcroft West Wing Office Files, Memorandum of Conversations، national Security Council meeting ،The White House Friday, March 28, 1975, top secret, sensitive.

کیسینجێر دەڵێت بۆ ئەمریکا چەکی بە بزووتنەوەی کورد لە باکووری عێراق داوە؟.
کیسینجێریش لە وەڵامدا دەڵێت ئێمە واماندەزانی کە ئێوە داردەستی سۆڤیەتن، کەوابوو دژی ئەو سیاسەتە نەبووین کە ئێران لە ناوچە کوردنشینەکانی عێراق پەیڕەوی دەکرد بەڵام ئێستا کە ئێوە و ئێران ناکۆکیەکانتان چارەسەر کردوە، ئێمە هیچ هۆکارێک نابینین کە درێژە بەو سیاسەتە بدەین، ئێستا ئێمە بە شێوەیەکی مەعقولانەتر سەیری ئەو مەسەلەیە دەکەین و بە داردەستی"سۆڤیەت"تان نازانین.
"حەمــاد"یش دەڵێــت ئــێمە پەیوەنــدیمان لەگەڵ ســۆڤیەت هەیە و چەک لە ســۆڤیەت دەکــڕین و لەوانەیە ســاڵی داهــاتوو پەیماننــامەیەکی ئــابووری لەگەڵ ســۆڤیەت واژۆ بکەیــن کەوابــوو ئەوە دەبێــتە هــۆی ئەوەی کە ئێــوە دیســان دەســتێوەردان لە کاروبــاری عێــراق بــکەن و پشــتیوانی لە بــزووتنەوەی کــورد بــکەن بــۆ دابەشــکردنی عێــراق چــونکە کوردەکــان دەیانەوێــت عێــراق دابەش بــکەن، ئــێمە وڵاتێکــی بچــووکین، دەبــێ ئاگامــان لە خۆمــان بێــت، چــی زەمانەتێک هەیە کە هەمان ڕەفتاری پێشوو دووپات نەکەنەوە؟
کیسینجێر لە وەڵامدا دەڵێت با ڕابردوو لەبیر بکەین، بەرژەوەندی ئێمە ئێستا لەوەدا نیە پشتیوانی لە کوردەکان بکەین. حەمادی لە کۆتاییدا دەڵێت دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم کێشەی کوردە بۆ ئێمە زۆر گرنگە و مەسەلەیەکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ ئێمە. کیسینجیریش دەڵێت سەبارەت بە کێشەی کورد بێخەم بن، دڵنیا بن کە نە ئێستا و نە لەداهاتوودا ئێمە هیچ چالاکیەک ئەنجام نادەین کە دژی یەکپارچەیی خاکی عێراق بێت."[٥٥]

[٥٥] کۆشکی سپی، یادداشتنامەی گفتوگان، گفتوگۆی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق، چوارشەمە،١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥، کاتژمێر ١٢:٢٠ تا ١٨:١٣، باڵوێزخانەی عێراق لە پاریس، نهێنی.

## بۆ ئەمریکا لە بەرامبەر نسکۆی شۆڕشی کورد بێدەنگ بوو؟

پاش ڕێکەوتننامەی جەزاییر، ئەمریکا هیچ بەرنامەیەکی نەبوو بۆ ئەوەی شا لە بڕیارەکەی پەشیمان بکاتەوە یان یارمەتی کورد بدات چونکە پەیوەندی کورد و ئەمریکا هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە لە سەر پێداگری یەکجار زۆری شا لە سەر کیسینجێر درست ببوو و ئەمریکا چەند جار ئەو ڕاستیەی بە ڕێبەرایەتی کورد ڕاگەیاندبوو. هەروەها قازانجی ڕێکەوتننامەی جەزاییر بۆ ئەمریکا لەوەدا بوو کە عێراقی لە سۆڤیەت دوور دەخستەوە و ئەوەش بۆ ئەمریکا زۆر گرنگ بوو چونکە یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی یارمەتیدانی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد ئەوە بوو کە عێراق کەوتبوە ژێر دەسەلاتی سۆڤیەت و ببوو بە داردەستی سۆڤیەت لە ناوچەدا.

کیسینجێر لە وەلامی ئەو پرسیارە گرنگەدا کە پاش ڕێکەوتنی ئێران و عێراق، بۆ ئەمریکا دەستێوەردانی لە مەسەلەکەدا نەکرد و یارمەتی کوردی نەدا دەلێت:

"**کاتێک کە خەباتی کورد هەلوەشایەوە، جموجۆڵە باوەکان دەستی پێکرد بۆ ئەوەی چۆن ئەو ڕەخنانە کە هاتبوە سەرمان کەم بکرێتەوە. کۆلبی (سەرۆکی CIA) یەکەم کەس بوو کە وەدەنگ هات. لە ١٣ی ئادار کۆلبی داواکارییەکی تورەی بارزانی بەکارهێنا بۆ ئەوەی ئەمریکا ڕاستەوخۆ یارمەتی بارزانی بدات. کۆلبی نووسیبووی بە هۆی ئەوەی یارمەتیەکانی ئەمریکا بە کوردەکان لەڕێگای ئێرانەوە جێبەجێ کراوە، ئێستا کە خەباتی کورد هەلوەشاوەتەوە، هەرچەشنە یارمەتیدانێکی ڕاستەوخۆ بە کوردەکان ئیدی جێگای داکۆکی نییە. کۆلبی گومانی بە نیسبەت ئەوە دەربڕیبوو کە شا کە کۆتایی بە یارمەتیدانی بارزانی هێناوە بیەوێت خۆی بکات بە قۆچی قوربانی ئەمریکا. کۆلبی لە سەر ئەوە سوور بوو کە دەبێ داواکاری کوردەکان کاتێک کە من**

له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گەڕامەوە تاوتوێ بکرێت. کۆلبی له ڕێگای زانیارییە هەواڵگریەکانیەوە کە بۆی دەهات زۆر باش دەیزانی کە تا کاتی گەڕانەوەی من لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، تاوتوێکردنی داواکاریەکەی کوردەکان زۆر درنگ دەکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا کۆلبی پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە بە هۆی ئەوەی کوردەکان ئەوەندە بە ئیحساساتەوە هەڵسوکەوت دەکەن و دەرک بە بارودۆخەکە ناکەن، CIA یارمەتییەکەی مانگی ئاداریان پێبدات. تەنانەت ئەندامانی CIA لە ناوچەش (مەبەستی ئێرانە - وەرگێڕ) لەگەڵ ئەم هەڵوێستە نابەجێیەی کۆلبی بوون. ئەندامانی CIA تا ئەو کاتە دژی ئەوە بوون کە ئەمریکا لەوە زیاتر یارمەتی کوردەکان بدات، لانیکەم دژی ئەو یارمەتیە بوون کە کۆلبی بۆ کۆشکی سپی پێشنیاری کردبوو بەڵام کاتێک کە سەدام هێرشێکی هەمەلایەنەی کردە سەر کوردەکان، نوێنەرانی CIA لە ناوچە لەناکاو کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو تراژیدیایە کە لە دەوروبەریاندا ڕوویدەدا.

کاتێک کە لە سەفەرەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووم ئەندامانی CIA بەردەوام داواکاری بەپاڕانەوەی ڕێبەرایەتی کوردیان دەنارد بۆم و کاتێک کە من وەڵامم نەدایەوە بەدوای ئەوەدا کۆمەڵێک یادداشتی ناڕەزایەتیان بۆ ناردم. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە ساڵی پێشتر لەوە سەرەڕای دژایەتیکردنەکانی CIA، لە ئەنجامی گوشارەکانی مندا یارمەتیەکانی ئەمریکا بە کوردەکان زیادی کردبوو. هۆکاری ئەوەی من وەڵامی داواکاریەکانی کوردەکانم نەدایەوە ئەوە بوو کە هیچم لەدەست نەدەهات بیکەم و کارمەندانی CIA (لە ئێران) زۆر باش دەیانزانی کە ئێستا کە سنووری ئێران داخراوە، یارمەتیدانی کوردەکان بە شێوەی فریاگوزاری ئیمکانی نییە."[٥٦]

کیسینجێر هەروەها دەربارەی ئەوەی بۆ ئەمریکا داوای لە شا نەکرد درێژە بە یارمەتیدانی کورد بدات دەڵێت:

---

[56] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

"هەندێ لە ڕەخنەگرەکانمان دەڵێن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردەکان دەبوایا هەڕەشەمان لە شا کردبایا کە یارمەتیەکانی بە کوردەکان نەپچڕێنێت بەڵام چۆن دەمانتوانی پێداگری لە سەر هاوپەیمانێکی زۆر نزیکی خۆمان بکەین شاڵاوێکی سەربازی دەستپێبکات لە کاتێکدا کە کۆنگرێسی ئەمریکا ئەو هاوپەیمانانەی ئەمریکای بە تەنیا هێشتبوەوە کە مەرگ بەسەریانەوە دەسوڕایەوە؟.

شا بڕیاری خۆی دابوو و ئێمە هەڵێنجاندنێکی گونجاومان نەبوو و هیچ ستراتژییەکیشمان نەبوو بۆ ئەوەی شا لە بڕیارەکەی پەشیمان بکەینەوە. لە رووی مرۆڤدۆستیەوە، کردەوەکەی شا بێ بەزەیانە بوو و جێگای داکۆکی نەبوو بەڵام لە روانگەی ئاسایشی ئێرانەوە، بڕیارێکی دەرکپێکراو بوو هەرچەند مرۆڤی دەئێشاند. تەنیا رێگای رزگارکردنی کوردەکان ئەوەبوو کە ئێران بە ئاشکرا دەستێوەردان لە کێشەکەدا بکات و ئەوەش ٣٦٠ میلیۆن دولاری دەویست (هەروا کە بارزانی لە ١٩٧٤دا ئاماژەی پێکردبوو). ئەوکاتە ئەمریکا لە هیندوچین گیری خواردبوو و بە خەیاڵیشیدا نەدەهات بیر لە کردنەوەی بەرەیەکی دیکەی شەڕ بکاتەوە و بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کۆنگرێس دژی شتێکی وا هەڵوێستی دەگرت تەنانەت پشتیوانی سیاسی لە کوردیش جێگای شک و گومان بوو."[٥٧]

کیسینجێر لە کۆتاییدا دەربارەی هەڵوەشانەوەی خەباتی کورد دەڵێت:

"قەیرانی کورد بە شێوەیەکی خەماوی کۆتایی پێهات. تراژیدیای کورد زۆرتر مێژوو و جوگرافیا دروستی کردووە بەڵام بەهۆی جیاوازییە نەتەوەییەکانی ئێمە ئەم تراژیدییە زۆرتر بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرەڕای گرنگیدان بە ئۆتۆنومی گەلان، هیچ پەرۆشییەکی بۆ ئۆتۆنۆمی کوردەکان نەبوو بەڵام ئێستا پاش تێپەڕبوونی ٢٠ ساڵ، باوەڕم بە کۆمەڵێک ئاڵترناتیف هەیە کە ئەو کاتە ئێمە

[57] Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* (New York: Simon and Schuster.)

**نەمانگرتەبەر. بەڵام بۆ خەڵکی کورد کە قوربانی هەمیشەیی مێژوون، ئەم قسەیەی من دەردێکیان لێ دەوا ناکات." ٥٨**

[58] Henry A. Kissinger, “Tragedy of the Kurds,” in *Years of Renewal* , New York: Simon and Schuster.)1999

## بەرپرسیارێتی نسکۆی شۆڕشی کوردستان لە ئەستۆی کێیە؟

کۆمیتەی پایک کە کۆنگرێسی ئەمریکا بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی شاڵاوە نهێنییەکانی ئەمریکا پێکیهێنابوو، لە بەشی کۆتایی راپۆرتەکەی خۆیدا لە کانوونی دووەمی ١٩٧٦ ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە ئەو رەفتارە کە ئەمریکا لەگەڵ شۆڕشی کورد کردوویەتی تەنانەت لە چوارچێوەی شاڵاوی نهێنیشدا کارێکی زۆر خراپ بوە[٥٩].

بە وتەی جۆرج لنسۆفێسکی رێککەوتننامەی جەزایر کە ئەمریکا پێی رازی بوو، بۆ ناسیونالیستە کوردەکان جۆرێک یالتا بوو[٦٠]. ئارتوور تۆرنیر دەڵێت رێککەوتننامەی جەزایر کتێبی وانەیەکە کە نیشان دەدات چۆن وڵاتانی گەورە بۆ بەرژەوەندی خۆیان خەڵکی هەژار دەکەن بە قوربانی[٦١].

لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەمریکا بە هۆی ئەو مەسەلەیە سەرزنش بکرێت. هەندێ کەس ئەم سیاسەتەی ئەمریکا بە خیانەت دەزانن بەڵام ئەمریکا هیچ ئیلتیزامێکی بەرامبەر بە کورد نەبووە تا بڵێین خیانەتی لە کورد کردووە، ئەمریکا هیچ بەڵێنێکی بە کورد

---

[59] -Pike Report, 19 janury 1976, republished in The village voice, New York, 23 february 1976.

[٦٠] – لە ١١ی شوباتی ١٩٤٥ کونفرانسێک لە یالتا بەڕێوەچوو کە سەرۆک وەزیرانی بریتانیا و سەرۆک کۆماری سۆڤیەت و ئەمریکا تێیدا بەشداریان کرد و کۆمەڵێک شەرتومەرجی گرانیان سەپاند بە سەر ئەو وڵاتانەدا کە شەڕی جیهانی دوەمیان دۆڕاندبوو، بەتایبەت ئاڵمانیا. مەبەستی نووسەر لێرە ئەوەیە کە پەیماننامەی جەزایر بە هەمان شێوەی کونفرانسی یالتا کۆمەڵێک ئاکامی زۆر خراپی بۆ کورد بەدواوە بوو.

[61] –Arthur Campbell Turner, “Kurdish Nationalism,” in Ideology and Power in the Middle East: Studies in Honor of George Lenczowski, edited by Peter J. Chelkowski and Robert J. Pranger, (Durham: Duke University Press, 1988), p. 408.

نەدابوو، ئەمریکا هەر لە دانیشتنی یەکەمدا لە تەمووزی ١٩٧٢ زۆر راشکاوانە بە نوێنەرانی شۆڕشی کوردستانی راگەیاندبوو کە ئەمریکا لە سەر داواکاری شا یارمەتی بزووتنەوەی کورد دەدات و پێداگری یەکجار زۆری ئەمریکا لە سەر نهێنیپارێزی مەسەلەکە نیشانی دەدا کە ئەو پەیوەندییە پەیوەندییەکی کاتی و تاکتیکییە و هەموو ئانوساتێک ئەگەری ئەوە هەیە هەڵبوەشێتەوە. رێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان متمانەی بە شا نەبوو بەڵام یارمەتیدانی ئەمریکای بە زەمانەتێکی ئەخلاقی بۆ شۆڕشی کورد دەزانی و خۆی بۆ ئەگەری رێکەوتنی ئێران و عێراق و پچڕانی یارمەتییەکانی ئەمریکا و شا ئامادە نەکردبوو.[٦٢]

لە راستیدا هیچ کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد شا بەو شێوەیە لەناکاو لەگەڵ سەدام رێکبکەوێت و بزووتنەوەی کورد هەڵبوەشێتەوە. دژمنایەتی ئێران و عێراق و ئاستی یارمەتیەکانی شا بە شۆڕشی کورد ئەوەندە زۆر بوو و پەیوەندییەکە ئەوەندە چووبوە پێش کە نە رێبەرایەتی کورد، نە ئەمریکا، نە ئیسرائیل و نە هیچ وڵاتێکی دیکە پێشبینی ئەوەی نەدەکرد شا لەگەڵ سەدام رێکبکەوێت. رێکەوتنی شا و سەدام، کاربەدەستانی ئەمریکا، ئیسرائیل و سەرجەم وڵاتانی ناوچە، تەنانەت خودی کاربەدەستانی ئێرانیشی سەرسام کرد. ئەسەدوڵڵا عەلەم، وەزیری دەرباری ئێران و یەکەم کاربەدەستی نزیک لە شا کاتێک کە هەواڵی رێکەوتنەکەی بیست سەری سوورما. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاربەدەستانی ئێران رێکەوتنی جەزاییریان بە سەرکەوتنێکی نیشتمانی و یەکێ لە سەرکەوتنە گەورەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لەقەڵەمدا.[٦٣]

یەک مانگ پێش لە نسکۆی شۆڕشی کوردستان، هینڕی کیسینجێر و باڵوێزی ئیسرائیل لە ئەمریکا گەڵاڵەیەکیان پەسەند کردبوو بۆ ئەوەی ٢٤ ملیۆن دولار

---

٦٢- دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دوکتۆر مەحمود عوسمان، ١ی تشرینی دووەمی ٢٠١١، هەولێر.

63 The Diaries of Asadollah Alam, volume VI, edited by Alinaghi Alikhani, IBEX Publishers, Bethesda, Maryland, USA

یارمەتی کورد بدەن بەڵام ڕێکەوتنە لەناکاوەکەی جەزاییر هەموو پلانەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلی تێکدا.

ڕێبەرایەتی کورد متمانەی بە شا نەبوو بەڵام متمانەی بە ئەمریکا هەبوو چونکە پێیوابوو کە ئەمریکا وڵاتێکە لەوە گەورەترە کە خیانەت لە نەتەوەیەکی بچووک وەک کورد بکات. ڕێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلوول دەستێوەردانی ئەمریکا لە کێشەی کوردی بە زەمانەتێکی ئەخلاقی و سیاسی دەزانی بۆ ئەوەی ئەگەر هات و ڕۆژێک شا ویستی پشتیان تێبکات، گەلی کورد نەبێت بە قوربانی تۆڵەسەندنەوەی ڕژێمی عێراق. هەروەها هەم شا و هەم میسر بەڵێنیان بە کورد دابوو کە ئەگەر بێت و ڕۆژێ ئێران و عێراق ڕێکبکەون ئەو ڕێکەوتنە لە سەر حیسابی کورد نەبێت[٦٤]. بەڵام شا مرۆڤێکی دەمدەمی مەزاج بوو، ئەمڕۆ قسەیەکی دەکرد بەیانی لە قسەکەی پەشیمان دەبووەوە، کەسیش نەیدەتوانی پێیبڵێت بۆچوونەکەت هەڵەیە.

هیچ گومان لەوەدا نیە ڕێبەرایەتی شۆڕشی کورد ئاگاداری ئەوە بوو کە ئێران و عێراق دەیانەوێت ڕێکبکەون بەڵام پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە ئەو ڕێکەوتنە بەوزوانە جێبەجێ بێت و کتوپڕ ئێران پشت لە بزووتنەوەی کورد بکات. ڕێبەرایەتی شۆڕشی کوردستان زانیاری ئەوەی بەدەست گەیشتبوو کە شا لە جەزاییر لەگەڵ سەدام وتووێژ دەکات هەربۆیە لە کۆتایی مانگی شوبات سەردانی ئێرانی کرد و داوای کرد لەگەڵ شا دیدار بکات بەڵام شا وتبووی پاش گەڕانەوەم لە جەزاییر دەتانبینم، مەبەستی ئەوە بوو کە نیگەران مەبن، من لەگەڵ عێراق ڕێکناکەوم. شا بە تەمای ئەوە بوو لە جەزاییر لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق وتووێژ بکات بەڵام دڵنیا نەبوو لەگەڵ سەدام ڕێکبکەوێت چونکە قەد متمانەی بە سەدام نەبوو و هەروا کە پاشان بە باڵوێزی ئەمریکای ڕاگەیاند یەکێ لە ناخۆشترین کاتەکانی ژیانی ئەو کاتە بوە کە بە وتەی خۆی تروریستێک وەک سەدامی لەباوەش گرتووە.

لە دانیشتنی ڕۆژی یەکەم لە جەزاییر، شا و سەدام ڕێکنەکەوتن و شا نەیەویست درێژە بە گفتوگۆکانی لەگەڵ سەدام بدات بەڵام بومیدیەنی سەرۆک کۆماری جەزاییر

---

[٦٤] دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ جیم هۆگلەند، پاریس، ١٠ی تەموزی ٢٠١٢.

جارێکی دیکە هاتە لای شا و پێداگری کرد و پێیوت سەدام ئامادەیە لەگەڵی ڕێکبکەوێت و لە کۆتاییشدا ڕێککەوتن.[٦٥] مەسەلەی شەتولعەرەب بۆ شا مەسەلەیەکی ئیستراتژیک بوو و دەیەویست بە هەموو شێوەیەک ئەو پوانە لە عێراق وەربگرێت چونکە هەروا کە بە باڵوێزی ئەمریکای ڕاگەیاندبوو ڕەزاخانی باوکی دوو هەڵەی گەورەی کردبوو کە ئەو هەردوویانی قەرەبوو کردبووەوە (یەکەم نیشتمانیکردنی نەوتی ئێران و دووەم وەرگرتنی پوانی شەتولعەرەب). هەروەها شا (بەو شێوەیە کە بە باڵوێزی ئەمریکای وتوە) بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە ئەگەر شەڕی کورد و عێراق بەردەوام بێت ئەگەری ئەوە زۆرە کە ئێرانیش بکێشرێتە ناو شەڕەکە و کێشەی کورد ببێ بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی[٦٦]. سەدام حوسەینیش بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە ئەگەر کۆتایی بە خەباتی کورد نەهێنێت بەوزوانە ڕژێمی بەعس دەڕوخێت هەر بۆیە مانگێک مۆڵەتی دا بە سوپای عێراق کۆتایی بە خەباتی کورد بهێنێت و خۆیشی بە شای ڕاگەیاند بێ شەرت و مەرج ئامادەیە لەگەڵی ڕێکبکەوێت بۆ ئەوەی ئێران ئیدی یارمەتی بزووتنەوەی کورد نەدات.

پاش ڕێکەوتنەکەش، بەرژەوەندی ئەمریکا لەوەدا نەبوو کە یارمەتی کورد بدات. بارودۆخی نێونەتەوەیی ئەمریکا لەو قۆناخەدا خراپ بوو، دەوڵەتە داردەستەکەی ئەمریکا لە ڤییەتنام شکستی هێنابوو و بە وتەی خودی کیسینجیر بەهاری ١٩٧٥ خراپترین کات و سات بۆ هاوپەیمانەکانی ئەمریکا بوو. ناکۆکیەکانی وەزارەتی دەرەوە، CIA و کۆنگرێس گەیشتبوە ئەوپەڕی خۆی و هەموو ئەمانە دەستیدا بە دەستی یەکەوە بۆ ئەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا نەتوانێت یارمەتی کورد بدات و لە ئەنجامدا بزووتنەوەی کورد هەڵبوەشێتەوە.

---

[٦٥] پەیامی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ کونسولخانەی ئەمریکا لە ئورشەلیم، ١٤ی ئاداری ١٩٧٥، نهێنی، بەپەلە.

[٦٦] پەیامی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ کونسولخانەی ئەمریکا لە ئورشەلیم، ١٤ی ئاداری،١٩٧٥، نهێنی، بەپەلە.

بۆ تێگەیشتن لەو هەڵسوکەوتەی ئەمریکا لەگەڵ بزووتنەوەی کورد لەو قۆناغەدا دەبێ ئەو راستیەمان لەبەرچاو بێت کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە پەیوەندی لەگەڵ ئۆتۆنۆمی لە جیهانی سێیەم و لەوە زیاتر لە پەیوەندی لەگەڵ بزووتنەوە سەربەخۆخوازەکان چەند لایەنێکی هەیە. ئەم لایەنانە لە هەر دوو بواری سیاسی و ئاکادمیکدا هەتا رادەیەکی زۆر وەڕاست دەگەڕێت. هانس مورگێنسۆ، هێنری کیسینجێر و رئالیستەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە روانگە زاڵەکانی ئەمریکا بەنیسبەت سیاسەتەکانی جیهانی سێیەم، زۆر بە قازانجی جیهانی سێیەم نەبووە و زۆربەی جاران لەگەڵ دژایەتیکردنی بەرچاوی ئامانجی بزووتنەوە ئازادیخوازە نەتەوەییەکان بەرەورووبووەتەوە. سیاسەتی ئاشکرای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەمیشە ئەوە بووە کە ئۆتۆنۆمی مافی گەلانی بندەستی جیهانە بەڵام بەهەرحاڵ روون نییە ئەم مافە چ کەسانێک دەگرێتەوە. ئەم سیاسەتە قەد لە خزمەت ئامانجی بزووتنەوە رزگاریخوازەکاندا نەبووە، بەڵکوو لە خزمەت بەرژەوەندییە یەکلاییکەرەوە نەتەوەییەکانی ئەمریکادا بووە.

ناکۆکی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت لە کاتی شەڕی سارد، وای لە ئەمریکا کرد سیاسەتێکی نهێنی بەنیسبەت هەموو بزووتنەوە نەتەوەییەکانی جیهانی سێیەم و بەتایبەت بەنیسبەت پشتیوانیکردن لە ئۆتۆنۆمی کوردەکانی عێراق بگرێتە بەر. ئۆپەراسیونی نیمچە سەربازیی نهێنی زۆربەی جاران پێویستی بە شەڕگەلی شاراوە و درێژخایەن هەیە. لەم شەڕانەدا دابینکردنی چەک و تەقەمەنی و هەروەها دابینکردنی یارمەتی پێویست بۆ راپەڕیوەکان لە ئەستۆی ویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. لەم ئۆپەراسیونانەدا ئەمریکا وەک نوێنەری خۆی سەیری راپەڕیوەکان دەکات و بەم شێوەیە ئەمریکا لە دەستێوەردانی راستەوخۆ لە کێشەکەدا کە پێویستی بە بەهایەکی گرانتر هەیە، دووری دەکات. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەستۆیەتی پشتیوانی لە هاوپەیمانان و دۆستەکانی بکات و ئەم ئەرکە پێویستی بە ئۆپەراسیونی نهێنی بۆ رزگارکردنی دۆستان لە کێشە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان دەکات. لەم شاڵاوانەدا خێرایی و نهێنیپارێزی، هۆکارێکی

یەکلاییەکەرەوەیە بۆ سەرکەوتن لە هەلومەرجە هەستیارەکاندا، کەوابوو CIA دەبێ پێش لە هەموو شتێک ڕێگەپێدراو بێت ئەم مەسەلەیە لە خەڵک بشارێتەوە. ئەم جۆرە دەستێوەردانانە لە خزمەت بەهێزترکردنی سیاسەتی ڕیالیستی دەرەوەی ئەمریکادایە. ڕاگرتنی هاوسەنگی دەسەلات، بیری یەکەم و مەرجی سەرەکی ئەم سیاسەتەیە.[٦٧]

---

67 Meho, Lokman I. The Kurdish Question in U.S. Foreign Policy: A Documentary Sourcebook. Westport, CT: Praeger Publishers, 2004.

## پاش نسكۆی شۆڕش، ئەمریكا چۆن لەگەڵ ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی كورد هەڵسوكەوتی كرد؟

دوابەدوای نسكۆی شۆڕشی كوردستان، پەیوەندیەكانی كورد و ئەمریكا بەتەواوی پچڕا. لەگەڵ ئەوەشدا مەلا مستەفا بارزانی تا دوایین ساتەكانی ژیانی دەستی لە هەوڵەكانی نەكێشا بۆ ئەوەی سەرنجی كاربەدەستانی ئەمریكا بەرەولای كێشەی كورد رابكێشێت.

مەلا مستەفا بارزانی مانگی ئابی ١٩٧٥ بۆ تەداوی پزشكی و خستنەڕووی كێشەی كورد سەردانی ئەمریكای كرد. بارزانی دەیەویست لە رێگای كۆمەڵێك لە ئەندامانی دەستڕۆیشتووی كۆنگرێس كە دۆستی كورد بوون، بەتایبەت سناتۆر هینری جەكسۆن و جۆرج مینی، سەرۆكی AFL-CIO مەسەلەی كورد بخاتەڕوو. بارزانی هەروەها هیوادار بوو كە بتوانێ لەگەڵ هینری كیسینجێر دیدار بكات بەڵام هەم شا و هەم كیسینجێر نەیانەویست لەوە زیاتر خۆیان بە كێشەی كوردەوە سەرقاڵ بكەن و زۆریش نیگەرانی ئەوە بوون كە رێبەرایەتی كورد وردەكاریەكانی پەیوەندی كورد و بزووتنەوەی كورد و یارمەتیەكانی ئەمریكا بە شۆڕشی كورد ئاشكرا بكات، هەر بۆیە شا كارمەندێكی SAWAKی لە تاران لەگەڵ مەلا مستەفا نارد بۆ ئەوەی لە ئەمریكا چاودێری بە سەر هاتوچۆكانی مەلا مستەفا و هاوڕێكانی بكات. هەر لە سەرەتای گەیشتن بە ئەمریكاش كاربەدەستانی CIA جموجۆڵەكانی بارزانیان خستە ژێر

چاودێری و لە هەموو شوێنێک لەگەڵی بوون و تەنانەت دەزگای بەدزی گوێگرتنیان لە شوێنی ژیانی مەلا مستەفا بارزانی دانابوو[٦٨].

پاش گەیشتن بە ئەمریکا وەکوو یەکەمین هەوڵ مەلا مستەفا بارزانی چەند جار داوای کرد لەگەڵ هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دیدار بکات بەڵام کیسینجێر قبووڵی نەکرد و سەرەنجام دوای پێداگریەکی زۆر، مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٥ جێگرەکەی خۆی واتا "جۆزیف سیسکۆ"ی نارد لەگەڵ مەلا مستەفا دیدار بکات. سیسکۆ بە شەو چووەتە شوێنی ژیانی مەلا مستەفا بارزانی و لەوێ لەگەڵی دیداری کردوە. مەلا مستەفا بە توندی لەگەڵ سیسکۆ قسەی کردوە و ناڕەزایەتی خۆی بە نیسبەت شێوەی رەفتاری دەوڵەتی ئەمریکا دەربڕیوە. مەلا مستەفا هەروەها بە سیسکۆی وتوە قەد متمانەی بە شا نەبوە بەڵام پێیوانەبوە کە ئەمریکا وا بە بزووتنەوەی کورد بکات. سیسکۆش لە وەڵامدا وتویەتی دەوڵەتی ئەمریکا تەنها لە سەر داواکاری شا یارمەتی کوردەکانی داوە و ئێستاش بە داوای شا کۆتایی بەو یارمەتیانە هێناوە. سیسکۆ هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە کە ئەمریکا هیچ دەستێکی لە ریکەوتننامەی جەزاییردا نەبوە. لە کۆتایی دیدارەکەدا سیسکۆ بەڵێنی هیچ یارمەتیەکی بە بارزانی نەداوە بەڵام وتویەتی داواکاریەکانی دەگەیەنێتە دەستی کیسینجێری وەزیری دەرەوە[٦٩].

مەلا مستەفا لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٥ لە ئەنجامی گوشاری CIA و پێداگری شا و سەرەڕای خواستی خۆی گەڕایەوە بۆ ئێران و پاش ماوەیەک داوای کرد بۆ درێژەدان بە تەداوی پزشکی بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا بەڵام نە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و نە شا نەیانەویست مەلا مستەفا بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. دواتر لە مانگی حوزەیرانی ١٩٧٦ لە ئەنجامی گوشارێکی زۆری محمد دۆسکی لە سەر وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ڤیزای هاتنەوە بۆ ئەمریکا درا بە بارزانی. محمد دۆسکی

---

68 - A. Korn، David، The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994.

69 - A. Korn، David، The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994.

هەڕەشەی لە سیدنی سۆبیر، جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کردبوو ئەگەر ڕێگە بە بارزانی نەدەن بۆ تەداوی پزشکی بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا، چیرۆکی خیانەتەکانی ئەمریکا بە بزووتنەوەی کورد دەدات بە ڕاگەیاندنە گشتیەکان. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش قبوڵی کردوە بەڵام بە مەرجێک کە سەرجەم تێچونە مادیەکانی مانەوەی بارزانی لە ئەمریکا لە ئەستۆی خودی بارزانی بێت و بارزانی بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ڕاگەیاندنە گشتیەکان قسە نەکات و ڕاگەیاندننامەی سیاسیش دەرنەکات و چالاکی سیاسی ئەنجام نەدات. ئەمجارەش پاش ماوەیەک CIA و SAWAK هەوڵیاندا قەناعەت بە بارزانی بێنن بگەڕێتەوە بۆ ئێران بەڵام بارزانی بە هیچ شێوەیەک قبووڵی نەکرد. سەرەنجام گوشارەکانی دەوڵەتی ئەمریکا و شا لە سەر بارزانی بۆ بەجێهێشتنی ئەمریکا کەم بوەوە بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا وەکوو پێویست هاوکاری هاتن و چووینی بارزانی بۆ دەرەوەی ئەمریکا نەدەکرد و CIAش پەیوەندیەکانی بارزانی بە توندی خستبوەوە ژێر چادێری و نەیدەهێشت بارزانی بە ئازادی لەگەڵ ڕاگەیاندنە گشتیەکان قسە بکات[٧٠].

هاوکات لە بەرەبەرەی دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق، گوشارەکانی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە سەر وەزارەتی دەرەوە پەرەیسەند بۆ ئەوەی پێش لە چالاکیەکانی مەلا مستەفا بارزانی بگرێت و تەنانەت ئەو بیرۆکەیەی خستەڕوو کە ئەگەر دەوڵەتی عێراق پێداگری بکات، دەوڵەتی ئەمریکا مەسەلەی تەسلیمکردنەوەی بارزانی بە عێراق تاوتوێ بکات.

بەڵام سەرەڕای هەموو گوشارەکانی وەزارەتی دەرەوی ئەمریکا و CIA، مەلا مستەفا بارزانی سەرەڕای جێگیرنەبوونی بارودۆخی تەندرستی هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی سەرنجی ئەندامانی کۆنگرێس بەرەولای بارودۆخی دژواری کورد رابکێشێت و لەگەڵ سیناتۆر جەکسۆن، سیناتۆر پرۆکزماییێر، جۆرج مینی و کۆنگریسمەن ستێفان سولارز

---

70 - A. Korn، David، The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994.

دیداری کرد و سەرەنجام لە ژێر گوشاری ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆنگرێس، دەوڵەتی ئەمریکا مافی پەنابەری دا بە ژمارەیەکی بەرچاو لە ئاوارە کوردەکانی عێراق.

لە بەهاری ١٩٧٧ رۆبێرتا کۆهین، بەڕیوەبەری کۆمەڵەی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ (کە بەهێزترین و ناسراوترین رێکخراوی داکۆکی لە مافی مرۆڤ لە ئەمریکا بوو) مەلا مستەفا بارزانی بانگهێشت کرد لە ئۆفیسەکەی خۆی لە نیویۆرک سەردانی بکات. بارزانی چیرۆکی هەڵسوکەوتی ئەمریکا لەگەڵ بزووتنەوەی کورد و گوشارەکانی ئەمریکا لە سەر خۆی و هاوڕییانی لە ئەمریکا و سنووردارکردنی مافی ئازادی رادەربڕینی خۆی لە لایەن ئەمریکاوە گێڕایەوە بۆ کۆهین. کۆهین لەو رەفتارەی ئەمریکا زۆر توڕە بوو و دەستبەجێ کەوتە هەوڵدان و ژمارەیەک لە رۆژنامەنووسانی هێنایە نوسینگەکەی بۆ ئەوەی لەگەڵ بارزانی دیمانە بکەن. دوابەدوای بڵاوبوونەوەی ئەو راپۆرتانە، شەپۆلی شەرمەزارکردنی سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە بزووتنەوەی کورد، بەتایبەت هەڵسوکەوتی هینریٚ کیسینجێر دەستی پێکرد و لە بەرامبەریشدا وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ناڕەزایەتی خۆی بە نیسبەت ئەو هەڵمەتەی بارزانی و رۆبێرتا کۆهین، دەربڕی بەڵام بەهەرحاڵ ئیدارەی ئەمریکا گۆڕابوو و هینریٚ کیسینجێر ئیدی وەزیری دەرەوە نەبوو[71].

بارودۆخی تەندرستی مەلا مستەفا بارزانی لە مانگی شوباتی ١٩٧٩ رووی لە خراپی کرد. بارزانی بە هاورێکانی وتبوو دەیەوێت لە کوردستان بمرێت. هاورێیانی بارزانی کەوتنە هەوڵ بۆ ئەوەی بیگەڕێننەوە بۆ کوردستانی ئێران بەڵام بەهۆی ئەوەی بارودۆخی تەندرستی بارزانی جێگیر نەبوو، کومپانیە فرۆکەوانیەکە کە بلیتی سەفەری بۆ بارزانی دابین کردبوو داوای کردبوو کەپسولی ئۆکسیژن بۆ بارزانی دابین بکرێت و ئەو رێوشوێنە پزشکیەش چەند رۆژ کاتی دەویست، هەربۆیە سەفەرەکەی بارزانی دوا کەوت. پاشان بارزانی گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی جۆرج واشینگتۆن و پاشنیوەڕۆی رۆژی ١ی ئاداری ١٩٧٩ کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەی گوازرایەوە بۆ

---

71 - A. Korn، David، The Last Years of Mustafa Barzani, , *Middle East Quarterly*, June 1994.

ئێران (چەند ڕۆژ پاش ڕووخانی ڕژێمی شا) و ڕۆژی ٥ی ئادار لە نێو ئاپۆڕایەکی زۆری خەڵکدا لە شاری شنۆ لە کوردستانی ئێران بە خاک سپێردرا[٧٢].

کۆنگرێسمەن پرۆکزمایر، لە دانیشتنی ئەنجوومەنی نوێنەران لە ٧ی ئاداری ١٩٧٩ دەڵێت:

" دەمەوێت ئاماژە بە کۆچی دوایی ژنەراڵ مستەفا بارزانی بکەم کە بە ماوەی ٤٠ ساڵ بۆ ئازادی گەلەکەی خەباتی کرد. سێ ساڵ پێش جارێکیان ژنەراڵ بارزانی داوای کرد لە نووسینگەکەمدا بمبینێت. بارزانی بە نەرمی و ڕاشکاوانە قسەی دەکرد و دەیگوت یەکێ لە گەورەترین بێ هیوابییەکانی ژیانی ئەو کاتە بووە کە سیاسەتی ئەمریکا لە لایەن کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گۆڕاوە و بووەتە هۆی سەرکوتی خوێناوی ڕاپەڕینەکەی دژی دەوڵەتی عێراق. بارزانی داوای یارمەتی بۆ ئاوارە کوردەکان کرد و پاشان ڕۆیشت.

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، داستانی دەوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕاپەڕینی کورد، داستانێکی ناخۆشە و یەکێ لە خراپترین نموونە ژئۆپلۆتیکییەکان و کایە سیاسییەکانی نێوان حکومەتەکان و نەتەوەکانە. کاتێ کە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، ئێمە یارمەتیمان بە ڕاپەڕینی کورد دا و کاتێ کە وەزیری دەرەوە، کیسنجێر هەستی بەوە کرد دەبێ هاوپەیمانییەک لەگەڵ شای ئێران مۆر بکات (کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتر نیگەرانی سنوورەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەکەی دەبوو)، ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ناکاو یارمەتییەکانی پچڕاند. خەڵکی کورد دەوری "سەرباز"یان لەم کایەی شەترەنجەدا گێڕا. کاتێ کە وەزیری دەرەوە، کیسینجێر دەڵێت "ناهێڵێت نیگەرانی بۆ مافی مرۆڤ بە سەر سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا زاڵ بێت"، دەبێ بیر لە خەڵکی کورد بکاتەوە کە چارەکە سەدەیەک

---

[٧٢]- پاش ئازادی کوردستانی عێراق، لە ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٣ تەرمی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ تەرمی ئیدریس بارزانی گوازرایەوە بۆ گوندی بارزان و لەوێ بە خاک سپێردرا. وەرگێڕ

**خەباتیان کردووە بۆ سەربەخۆیییەک کە سەرەتا ئەنجامێکی باشی بۆ وێنا دەکرا بەڵام لە ئاکامی رێکەوتنێکی دیپلۆماتیکی خێرا لەپشت پەردەوە خنکێندرا.** [٧٣]

---

[73] - National archives, records, (Senate), March 7, 1979 , pp. 4133-34], THE DEATH OF GEN. MUSTAFA BARZANI.

## ئەم بەڵگەنامانە چیمان پێدەڵێت؟

هیچ گومان لەوەدا نیە کە شۆڕشی ئەیلوول یەکێ لە قۆناخە هەرە گرنگ و کاریگەرەکانی مێژووی هاوچەرخی کوردستان پێکدەهێنێت بەڵام سەرچاوەی سەربەخۆ و بێ لایەن دەربارەی رەهەندە ناوخۆیی و نێونەتەوەییەکانی ئەو شۆڕشە مەزنە لە نێو کتێبخانەی کوردی کەمە. هەمووومان ئاگاداری ئەوەین کە ئەمریکا لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوول لە پەیوەندیدا بووە و یارمەتیداوە بەڵام نازانین ئەو پەیوەندیە چۆن دەستیپێکردوە و چۆن کۆتاییپێهاتووە. ئەم کتێبە ئەو بۆشاییە پڕ دەکاتەوە چونکە بەڵگەنامەکان تێڕوانین و سیاسەتی دەوڵەتی عێراق، وڵاتانی ناوچە و بەتایبەت ئەمریکا سەبارەت بە گەلی کورد، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد و رێبەرایەتی شۆڕشی کوردمان بە روونی پێنیشان دەدات و گەلێ لە هاوکێشە شاراوە ناوخۆیی، ناوچەیی و نێونەتەوەیەکانی شۆڕشی ئەیلوولمان بۆ ئاشکرا دەکات. ئەم بەڵگەنامە زۆر بە روونی دەریدەخات پەیوەندی کورد و ئەمریکا لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول چۆن بوە و ئەوان چۆن سەیری شۆڕشیان کردوە و مەبەستیان لە پەیوەندیەکەیان لەگەڵ شۆڕش چی بووە.

خوێنەر پاش خوێندنەوەی ئەم بەڵگەنامانە بۆی دەردەکەوێت کە شۆڕشی ئەیلوول یەکێ لە گەورەترین بزووتنەوە رزگاریە نیشتمانیەکانی جیهان بوە و جگە لەوەی کە بەتەواوی وڵاتی عێراقی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردوە و هەموو پەیوەندیە سیاسی و نێونەتەوەیەکانی دەوڵەتی عێراقی خستوەتە ژێر تەوژمی خۆی، یەکێ لە کاریگەرترین شۆڕشەکان لە ئاستی ناوچە و جیهانیشدا بوە و کاری کردوەتە سەر هاوکێشەکانی ناوچە و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی. ئەوە شتێکی کەم نیە کە شۆڕشی نەتەوەیەکی

بندەست، گەمارۆدراو و بێ دەرفەت لەو هەلومەرجە دژوار و هەستیارەدا بتوانێ جێگای خۆی لە نێو هاوکێشە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکاندا بکاتەوە و نوێنەرانی ئەو شۆڕشە بتوانن لەگەڵ پایەبەرزترین کاربەدەستانی ئەمریکا دابنیشن و یارمەتیان لێوەربگرن و لە ململانێ ناوچەیی و نێونەتەوەیەکان بۆ بەرەوپێشبردنی دۆزی کورد کەڵک وەربگرن.

پەیوەندییەکانی کورد و ئەمریکا لە قۆناخی ١٩٧٢-٧٥ هەرچەند کە لاپەڕەیەکی ناخۆشی مێژووی دیپلوماسی کورد پێکدەهێنێت و بوو بە نموونەی مامەڵەی خراپی زلهێزێک لەگەڵ نەتەوەیەکی بندەست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک ئەنجامی بۆ کورد بە دواوە بوو. لەو قۆناخەدا بۆ یەکەمجار کێشە کوردی عێراق بوو بە ئەجێندای سەرۆک کۆمار، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و بەرپرسی CIA و نوێنەرانی بزووتنەوەی کورد توانیان لەگەڵ کاربەدەستانی پایەبەرزی ئەمریکا دابنیشن و بە شێوەی دیپلوماسیانە داواکاریەکانیان بخەنەڕوو و چۆنیەتی مامەڵەکردن و هەڵسوکەوت لەگەڵ زلهێزی جیهان تەجروبە بکەن. کەوابوو پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا لە قۆناخی ١٩٧٢-٧٥ بوو بە وانەیەک بۆ ئەوەی ڕێبەرایەتی کورد لە قۆناخەکانی دواتردا بە شێوەیەکی واقعبیناتەتر لەگەڵ ئەمریکا هەڵسوکەوت بکات.

ئەم بەڵگەنامانە دەریدەخات کە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان خاوەن کەسایەتیگەلێکی شارەزا، بلیمەت و لێهاتوو بوە و ڕێبەرایەتی ئەو شۆڕشە لە هیچ هەوڵێک بۆ بەرەپێشبردنی دۆزی نەتەوەی کورد لە ئاستی نێونەتەوەییدا درێغی نەکردوە و سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردستان (نەتەنها لە عێراق بەڵکوو لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیش) پشتیوانیان لەو شۆڕشە کردوە و بە شۆڕشی خۆیان زانیوە.

## دەربارەی چۆنیەتی کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بەڵگەنامەکان

لە کۆتایی ساڵی ۲۰۱۱ سەردانی ئارشیڤخانەی نیشتمانی ئەمریکام لە واشینگتۆن کرد و کۆمەڵێک بەڵگەنامەی نهێنی ئەمریکام دەربارەی کێشەی کورد، بەتایبەت کوردستانی عێراق دۆزییەوە. دەستبەجێ دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامانەی کە دەربارەی شۆڕشی ئەیلوول بوون و بەم شێوەیە کە دەیبینن خستمە بەر دەستی خوێنەران.

وەرگێڕانی بەڵگەنامە زۆر لە وەرگێڕانی دەقی ئاسایی زەحمەتترە چونکە زانیاریەکانی نێو بەڵگەنامە لە نێوان دوو کەسدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت کە خۆیان باش ئاگاداری بابەتەکەن بەڵام هەموو شتەکان بە راشکاوی باس نەکەن. ئەزموونی پێشترم لەگەڵ وەرگێڕانی بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکا[٧٤] زۆر یارمەتیدام بۆ ئەوەی لە کۆمەڵێک لە زانیارییە باسنەکراوەکانی ئەم بەڵگەنامانە تێبگەم و بە زمانێکی سادە و کوردیانە بەڵگەنامەکان وەرگێڕان بکەم.

وتارێکی سیاسەتمەدار و دیپلۆماتێکی ئەمریکاییشم وەرگێڕان کردوە و بە سەر کتێبەکەدا زیادم کردوە. ئەم وتارە باشترین سەرچاوەیە بۆ زانینی وردەکاریەکانی

---

[٧٤] کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، دوو بەرگ، بەرگی یەکەم(کوردستانی عێراق-٨٥٠ لاپەڕە) بەرگی دووەم(کوردستانی ئێران و تورکیە-٧٥٠ لاپەڕە)، ئامادەکردنی لوقمان محۆ، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە وریا رەحمانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩.

ژیانی مەلا مستەفا بارزانی لە ئەمریکا. وتارێکی زۆر تێروتەسەلە و بێلایەنانە نوسراوە.

لەگەڵ زۆربەی ئەو کەسانەی کە ناویان لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە (بە کورد و ئەمریکاییەوە) دیمانەم کردووە بۆ ئەوەی بیروڕای ئەوانیش وەربگرم بۆ ئەوەی راستییەکان زیاتر دەربکەوێت. هەروەها سەیری سەرچاوە پەیوەندیدارە فارسی و ئینگلیزییەکانم کردوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان بەراوردیان بکەم.

لە پەراوێزی بەڵگەنامەکاندا ئاماژەم بە هەندێ زانیاری پەیوەندیدار بە ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان کردوە کە لەوانەیە بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە مەسەلەکە یارمەتی خوێنەر بدات. هەروەها هەوڵمداوە لە پەراوێزەکاندا کورتەیەک لە ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە بخەمەڕوو کە پەیوەندییان بە بابەتی بەڵگەنامە سەرەکیەکەوە هەیە. هەندێ بەڵگەنامەشم وەرگێڕان نەکردوە کە شتێکی نوێیان تێدا نەبوە و ناوەرۆکەکەیان دووپاتکردنەوەی بابەتی بەڵگەنامەکانی دیکە بوە (بەتایبەت ئەو بەڵگەنامانە کە باسی بارودۆخی ئاوارەکانیان لە ئێران کردوە).

لە هەندێ لە بەڵگەنامەکاندا، بەتایبەت ئەوانەی ساڵی ١٩٧٢ ناوی کەسایەتییەکان و کۆمەڵێک مەسەلەی زۆر نهێنی و تایبەت بەهۆی هەستیاربونی بابەتەکە لەلایەن پسپۆڕانی ئارشیڤخانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە رەش کراوەتەوە و ئەگەر وەرگێڕ لە شوێنێکدا ناوی کەسایەتییەکان یا ناوەرۆکی بابەتە رەشکراوەکەی زانیبێت لە پەراوێزدا ئاماژەی پێکردوە. ئەوەشمان لە بیر بێت کە بە هەمان شێوە کە ئەمریکا پاش تێپەڕبوونی نزیکەی ٤٠ ساڵ هێشتا ناوەرۆکی هەندێ لە بەڵگەنامەکان بە هۆی مەسەلەی بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی رەش دەکاتەوە، ئێمەش دەبێ لە هەموو لێکۆڵینەوە و نووسینێکدا بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانیمان لەبەرچاو بێت و شتێک بڵاو نەکەینەوە (هەرچەند لەوانەیە راستیش بێت) کە خەسار لە ئاسایشی نەتەوەیی و بەرژەوەندی نیشتمانیمان بدات. کەوابوو لەوانەیە هەموو بەڵگەنامەیەک بۆ بڵاوکردنەوە نەبێت هەرچەند کە لەوانەیە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕبووبێت و بووبێت بە بەشێک لە مێژووش.

راستە ئەمە بەڵگەنامەیە بەڵام مەرج نییە هەرچی وتبێت راست و درست بێت. بەڵگەنامە هەڵەشی تێدایە و روانگە و حەزی شەخسی و بەرژەوەندی نەتەوەیی و نیشتمانی کاری لەسەر دەکات و بەتایبەت ئەو شتانەی کە لە زمانی کەسانی دیکەوە باس دەکرێن لەوانەیە وەک خۆی وانەبن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو شتانە کە لە بەڵگەنامەکاندا ئامارژەیان پێدەکرێت راستن و خوێنەر دەتوانێت زۆربەی راستیە شاراوەکانیان تێدا ببینێت.

وریا رەحمانی
ARBABA380@GMAIL.COM

# دوایین ساڵەکانی ژیانی مەلا مستەفا بارزانی لە ئەمریکا[٧٥]

## دەیڤید کۆرن[٧٦]

[٧٥] ناوی ئەم وتارە "دوایین ساڵەکانی ژیانی مستەفا بارزانی"یە بەڵام بە هۆی ئەوەی زیاتر باسی ژیانی بارزانی لە ئەمریکا دەکات وەرگێڕ ناوی وتارەکەی کردوە بە "دوایین ساڵەکانی ژیانی مەلا مستەفا بارزانی لە ئەمریکا". ئەمەش سەرچاوەی وتارەکەیە:
The Last Years of Mustafa Barzani، David A. Korn ،Middle East Quarterly ، June 1994

[٧٦] دەیڤید کۆرن، سیاسەتمەدار و دیپلۆماتێکی ناسراوی ئەمریکایە. ساڵی ١٩٧٢ تا ١٩٧٥ بەڕێوەبەری نوسینگەی کاروباری وڵاتانی باکووری جیهانی عەرەب بوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و چەند جاریش لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی ئەیلوول گفتوگۆی کرد. کۆرن لە ١٩٧٥ تا ١٩٧٧ کونسولی گشتی ئەمریکا بوو لە شاری کەلکەتەی هیند، لە ١٩٧٨ ئەندامی ستافی داڕشتنی سیاسەتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، لە ١٩٧٨ تا ١٩٨١ بەڕێوەبەری نووسینگەی کاروباری عەرەب-ئیسرائیل لە وەزارەتی دەرەوە و لە ١٩٨٦ تا ١٩٨٨ باڵوێزی ئەمریکا بوو لە وڵاتی تۆگۆ. کۆرن ١٢ کتێبی دەربارەی سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە وڵاتە جۆراوجۆرەکان بڵاو کردوەتەوە. وەرگێڕ

(کوردەکان) کە چەک و پارەیان لە ئێمە وەردەگرت، کۆمەڵێکی ئێتنیکی راپەڕیو بوون کە بۆ ئۆتۆنۆمی شەڕیان دەکرد لە وڵاتێکدا کە هاوسنووری وڵاتێکی هاوپەیمانمان بوو[٧٧]... ئەو بەڵگانە کە لە دەستی کۆمیتەدان[٧٨] بە روونی دەریدەخەن کە سەرۆک کۆمار، دکتۆر کیسنجێر و وەزارەتی دەرەوە هیوای سەرکەوتنی کوردەکانیان نەدەخواست. ئەوان پێیان باشتربوو کە کوردە راپەڕیوەکان تەنها تا ئەو ئاستە بەهێز بن کە دژایەتی (عێراق) بکەن و سەرچاوەکانی وڵاتی (عێراق) بە فیڕۆ بدەن کە دراوسێی هاوپەیمانەکەمان بوو. ئەو سیاسەتەی ئێمە تەنانەت لە چوارچێوەی شاڵاوی نهێنیشدا کارێکی باش نەبوو.

برگەیەکی راپۆرتی لێژنەی هەواڵگری کۆنگرێسی ئەمریکا کە لە ١٦ی نیسانی ١٩٧٦ لە (رۆژنامەی) "ڤیلیج ڤۆیس" دا بڵاوبوەوە.

٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٣ نزیکترین شت بوو لە جەژنی سەربەخۆیی بۆ کوردەکانی عێراق کە هەتا ئێستا لەم ئاستە ناسکە سەربەخۆییە رانەگەیەندراوەدا دەژین. کوردەکانی عێراق لەلایەن رژێمی بەعس لە بەغداد گەمارۆدراون، تورکیای دراوسێیان بە ئەستەم تەحەمولیان دەکات، لە هەموو دنیادا قەدەخەکراون و تەنانەت لە لایەن پارێزەرە ئەمریکایی و ئەوروپاییەکانیشیانەوە تەریکخراون؛ بێ نان، بێ وزە، بێ دوا و ودەرمان و گرفتاری هەموو جۆرە ناخۆشییەک[٧٩].

---

[٧٧] مەبەستی لە وڵاتی هاوپەیمان، ئێرانە. وەرگێڕ

[٧٨] مەبەستی لە کۆمیتە، کۆمیتەی پایکە کە کۆنگرێسی ئەمریکا بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی شاڵاوە نهێنیەکانی ئەمریکا لە کۆمەڵێک لە وڵاتان، لەوانە شۆڕشی ئەیلول پێکیهێنابوو. وەرگێڕ

[٧٩] ئەم وتارە لە ساڵی ١٩٩٤ نووسراوە، ئەوەش کە باسی دەکات بارودۆخی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٣و- ١٩٩٤دایە. وەرگێڕ

سەرباری هەموو ئەمانە، کوردەکانی عێراق لەو ڕۆژەدا لە سەرجەم گوند و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی ئاهەنگ بگێڕن. ڕوفاتی مەلا مستەفا بارزانی، ئەو پیاوەی لە دەیەکانی پێشتردا سەرکردایەتی خەباتەکەیانی کردبوو، بەسەربەرزی و لە ڕێوڕەسمێکدا لەودیو سنوورەوە لە ئێرانەوە گواسترایەوە بۆ ئەوەی لەو وڵاتەدا بە خاک بسپێردرێت کە شەڕی لەپێناو ئازادکردنیدا کردبوو.

بارزانی لەناو کوردەکاندا کەسایەتییەکی ئەفسانەیی بوو، ژیانی ببوە ئەفسانە و داستان. هەرچەند بە مەلا مستەفا ناوبانگی دەرکردبوو بەڵام قەد مەلا نەبوو، کەسێک بوو کە بۆ جەنگاوەری و سەرکردایەتی شەڕ لەدایک بوو و پەروەردەکرا. شۆڕشەکەی، چالاکییە چەکدارییەکانی، ١٢ساڵ دەربەدەرییەکەی لە ڕوسیا، گەڕانەوە سەرکەوتوانەکەی بۆ عێراق و خەباتە دوور و درێژەکەی بۆ مافی کورد- نەک هەر لە عێراق بەڵکو لە تورکیا، ئێران، سوریا، یەکێتی سۆڤیەت و تەنانەت لە دەرەوەش لە ئەوروپا و ئەمریکا - هەستێکی سەربەرزی و شانازیبەخۆکردنی وای بەخشی بە کوردەکان کە پێشتر نەیانبوو. بارزانی گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرز بەڵام پێگەی خۆی باش هەڵنەسەنگاندبوو، ئەوەبوو کەوت. ئەو بزووتنەوەیە کە بارزانی بنیاتینا و زیاتر لە ٤٠ ساڵ خەباتی کرد ڕووخا و خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەموو شتێکیان لەدەستدا.

گەڕانەوە سەرکەوتوانەکەی بارزانی بۆ کوردستانی عێراق دوای مردنی، کۆتایی ئەو گەشتە بوو کە یەکەم هەنگاوی لە ڕۆژێکی گەرمی سەرەتای مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٥ لە فڕۆکەخانەی "جان ئێف کنیدی"[80] لە نیویۆرکەوە دەستی پێکردبوو. گەیشتنی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان بە فڕۆکەیەکی ئێرانی لە تارانەوە لەو ڕۆژەدا نهێنی و لەژێر چاودێریدا بوو. بارزانی و سێ کەس لە هاوڕێکانی لە فڕۆکەیەکی Boeing 747 دا لە باشترین شوێنی فڕۆکەکە جێگەیان بۆ گیرابوو و وەک ئەوانی دیکەی ناو فڕۆکەکە

---

80 "John F Kennedy"

توشی لێپرسینەوە و ڕێوشوێنەکانی کۆچ و یاسای فڕۆکەخانە نەبوون، هەر کە لە فڕۆکەکە دابەزین لە لایەن دوو پیاو بە جلوبەرگی فەرمییەوە پێشوازیان لێکرا. ئەو دوو پیاوە ئەمریکایی بوون و میوانەکانیان بەرەو ئۆتۆمۆبیلێکی ڕەشی بێ ناونیشان برد کە لە نزیک فڕۆکەکە وەستابوو و بەخێرایی لە دەروازەیەکی تەنیشتی فڕۆکەخانە بەرەو ناو شاری نیویۆرک دەرچوون.

بارزانی دەلەنگی و لەسەرخۆ دەڕۆیشتەڕێوە بەڵام ماندوویی گەشتەکەی پێوە دیار نەبوو. جلوبەرگەکەی جوان لەبەری نەدەوەستا، بۆینباخەکەشی (کراوات) خراپ بەسترابوو، هەموو نیشانەکان دەریدەخست کە ئەمە جلوبەرگی ئەو نییە و ئەو کەسانەش کە بە دەوریدان خەڵکە ئاساییەکەی جاران نین. بەڵام لەتەمەنی ٧٢ ساڵیشدا و بەو ئێش و ئازارەشەوە کە هەیبوو، کەسایەتییەکی سەرنجڕاکێشی پێشاندەدا. ئەوە کە بارزانی سەرنجڕاکێش کردبوو بەژن و باڵای نەبوو چونکە باڵای زۆر بەرز نەبوو بەڵام ناوشانی لە ڕادە بەدەر پان بوو و ئێسکە زل و ماسوولکەی پەلەکانی تواناییەکی فیزیکی گەورەی پێدابوو. سەرە زلەکەی، بە قژە تەنکە ڕەش و سپییەکەیەوە بە سەر باڵا چوار شانەکەیدا ڕاوەستابوو. لووتێک وەک دەندووکی هەڵۆ بە ڕوویەوە بوو و برۆیەکی ئەستوور بەسەر چاوەکانییەوە بوو کە دەتگوت ئاگرێکی بەتین ڕوونیان دەکاتەوە. لە ڕاستیدا چاوەکانی بوو کە لە یەکەم بینیندا سەرنجی مرۆڤی ڕادەکێشا. هەموو ئەو هەواڵنێرانە کە ساڵانێک ڕێگەی مەترسیداریان گرتبووەوە بەر و سەردانی بارەگای بارزانییان لەچیاکاندا کردبوو، دەربارەی ڕووناکییە لە ڕادە بەدەرەکەی چاوی بارزانی شتیان نووسیبوو.

سێ کەس هاوڕێی بارزانی بوون لە گەشتەکەیدا، کۆنە دۆستێک و دوو پیاوی لاو کە هەردوویان تەمەنیان لە سی ساڵ زیاتر بوو، یەکێکیان کوردێکی یاریدەدەری بارزانی

بوو و ئەوی دیکەیان ئێرانییەک بوو[81]. دوای مانەوە یەک شەوەکەیان لە نیویۆرک بەیانییەکەی سواری فڕۆکە بوون بۆ مینیاپۆلیس[82] و لەوێشەوە بۆ رۆچێستەر، مینیسۆتا[83] و لە کلینیکی مایۆ[84] جێگیر بوون. بارزانی نەخۆش بوو، نەخۆشییەکەشی کوشندە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هیوادار بوو، هەر ئەو هیوادارییەش بوو کە رایکێشابوو بۆ ئەمریکا.

## راپەڕینی کورد، ساڵی ۱۹۷٤- ۱۹۷٥

پێنج مانگ پێشتر واتا لە ئاداری ۱۹۷٥ خەباتی کورد بە شێوەیەکی کوتوپڕ و دڵتەزێن هەرەسی هێنابوو. رێک ساڵێک پێشتر لەوە لە ئاداری ۱۹۷٤ بارزانی داوای لە کوردەکانی عێراق کردبوو دەستبەرن بۆ چەک. رژێمی عەرەبی بەغداد چەند جار هەوڵی ترۆرکردنی بارزانی دابوو کە دوو هەوڵیان نیمچە سەرکەوتوو بوون. بارزانی بڕوای بەوە نەمابوو عێراق بیەوێت رێککەوتنامەی ئاداری ۱۹۷۰ جێبەجێ بکات کە لەگەڵ سەدام حوسێن تکریتی، جێگری سەرۆک کۆماری عێراق دەربارەی ئۆتۆنۆمی کورد واژۆی کردبوو. بارزانی لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنی ۷۰ ساڵی تێپەڕاندبوو بەڵام جارێکی دیکە بڕیاریدا شەڕ بکاتەوە، وادەردەکەوت بڕیارێکی ژیرانە بێت چونکە بارزانی سەرکردەیەکی بێ هاوتای کوردەکانی عێراق بوو و هەتا ئاستێکیش بە ئاشکرا لەلایەن شای ئێرانەوە، محمد رەزا پەهلەوی پشتگیریی دەکرا. لەوەش گرنگتر ئەوەبوو هەستی دەکرد پشتگیری نهێنی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی

---

[81] ئەو سێ کەسە بریتیبوون لە دۆکتۆر شەفیق قەزاز، چاودێرێکی ساواک بە ناوی ئەمانی و عەلی خەلیل، پێشمەرگەی کۆنی شۆڕشی ئەیلول کە لە کاتی رۆیشتنی مەلا مستەفا بارزانی بۆ سۆڤیەتیش لەگەڵیدا بوو.(دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر شەفیق قەزاز، ۳ی ئەیلوولی ۲۰۱۲).

[82] Minneapolis

[83] Rochester, Minnesota,

[84] کلینیک بە بنکەی تەندروستی دەوترێت کە لە نەخۆشخانە بچوکترە. کلینیکی مایۆ( Mayo Clinic) ئەو بنکە تەندروستیە بوو کە مەلا مستەفا لەوێ تەداوی بۆ دەکرا. وەرگێڕ

ئەمریکاشی هەیە، پارمەتییەکە لەسەر بڕیاری نهێنی خودی ریچارد نیکسۆن و هێنری کیسینجێر دەستپێکردبوو. نیکسۆن سەرۆک کۆماری ئەمریکا بوو و کیسینجێر راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بوو کە دواتر بوو بە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا.

کوردەکانی عێراق بێ دوودڵی بەرەوپیری داواکەی بارزانییەوە هاتن. عەشیرەتە کوردەکان چوونە ریزی بارزانیەوە، ئەفسەرە کوردەکان سوپای عێراقیان بەجێهێشت، کارمەندە کوردەکان لە بەغداد، کەرکوک و موسڵ وازیان لە کارەکانیان هێنا، خوێندکارانی زانکۆ و قوتابیان پۆلەکانی خوێندنیان بەجێهێشت. هەموویان یان بوونە پێشمەرگەی بارزانی یان لە هەر رێگەیەکەوە کە لەدەستیان دەهات کاریان بۆ ئامانجەکەیان دەکرد. خێزانەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو بۆ شاخ. سەدان هەزار ژن، منداڵ و پیرەژن و پیرەمێرد ناوچە ئازادە کوردییەکانیان قەرەباڵغ کرد و کشان بۆ ئێرانیش. بە ورەیەکی بەرزەوە هاتبوون، ئەوەندە بڕوایان بەو پیرە سەرکردە جەنگاوەرە واتا مەلا مستەفا بارزانی هەبوو کە زۆربەیان لەو بڕوایەدابوون لەماوەی ٦ مانگدا دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لە شاخەکانی باکووری عێراق لەدایک دەبێت. لە ماوەی ١٥ ساڵی دوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەت لە ١٩٥٨، بارزانی رۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبوو، لە نەیارە کوردەکانی زیرەکتر بوو، لە گۆڕەپانی شەڕدا سوپای عێراقی رسوا کردبوو، یەک لەدوای یەک رژێمەکانی بەغدادی ملکەچی گفتوگۆ کردبوو. بۆ دەبێ ئەمجارەیان جیاواز بێت؟

بەڵام جیاوازییەک هەبوو، دەوڵەتی عەرەبی بەغداد لەکاتێکدا کە بانگەشەی ئاشتبونەوەی لەگەڵ کورد دەکرد، خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد. رژێمی بەغداد سوپای عێراقی بە بڕێکی زۆر تۆپ و تانک و فڕۆکەی جەنگی و بۆمبهاوێژ تەیار دەکرد. ئەو یارمەتیانە کە بارزانی لە دۆستەکانی وەریگرتبوو هاوتای ئەوە نەبوو کە سۆڤیەت بۆ عێراقی دەنارد. لەلایەن شاوە بارزانی پارەی بۆ دەهات، پارەیەکی باش و بڕێک چەکوچۆڵ بەڵام ئەو چەک و تەقەمەنیە قەد بەشی کوردەکانی نەدەکرد. هێزەکانی بارزانی تەنها تفەنگیان هەبوو— کە هەندێکیان هی سەردەمی شەڕی جیهانی یەکەم

و تەنانەت پێش لەوەش بوون — ڕەشاش، هاوەنی بچووک و ئەم دوایانەش کەمێک چەکی دژە تانک.

ئیسرائیل، دۆستی سەردەمی کۆن، مەشقی سەربازی پێدەکردن و هەندێک چەکی پێدەدان. ئەمریکاییەکان ڕاستەوخۆ پارەیان دەدا بە بارزانی بەڵام زۆر کەمتر بوو لەوەی ئێران، پارەی هەندێک چەکیشیان دەدا کە ئێران دابینی دەکرد بۆ بارزانی. کەم و زۆربونی یارمەتیەکانی ئەمریکا بۆ بارزانی گرنگ نەبوو، بۆ بارزانی گرنگ ئەوەبوو کە ئەمریکا یارمەتیانی دەدا و بارزانی ئەوەی بە گارانتییەک دەزانی بوو بۆ ئەوەی ڕۆژێک نەبێت کە شای ئێران لەناکاو پشتیان تێبکات.

ئەنجامەکە ئەوەبوو کە پێشمەرگەکانی بارزانی کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ ژمارەیان گەیشتە ١٠٠ هەزار کەس، هەمیشە کەم چەک بوون. عێراقییەکان هەمیشە باڵادەست بوون لە ئاسماندا و ئەو خاکەش تانکی زرێپۆش پێیبگەیشتایە نە تەنها پێشمەرگە بەڵکو بەئارەزووی خۆی خەڵکی گوندەکان و جوتیار و وەرزێڕەکانیشی بۆمباران دەکرد.

لە زەمینەوە کوردەکان سوودیان لە بەرزاییەکان وەردەگرت بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن و بەرگری لە وڵاتەکەیان بکەن. شەڕەکە قورس بوو، هەردوولاش کوژراو و بریندارى زۆریاندا. لە شەڕە گەورەکاندا ئێرانییەکان جارجار هاوسەنگیان بە شەڕەکە دەدا و تۆپە دوورهاوێژەکانیان لە سنوور نزیک دەکردەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی عێراقییەکان بەڵام زۆر جار کوردەکان ناچار بوون پاشەکشە بکەن لە بەردەم سوپای عێراقدا کە هەم لە ڕووی چەکوچۆڵ و هەم لە ڕووی ژمارەی هێزەکانیەوە باڵادەست بوو.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کوردەکان نەبەرد و لێهاتوو بوون. پێشمەرگەکانیان تۆزێک مەشقی شەڕی سەردەمیانەیان پێکرابوو بەڵام بێ وێنە ئازا و نەترس بوون. ئەو ژنراڵە ئیسرائیلیانە کە سەردانی پێشمەرگەکانیان کردبوو سەریان لەوە سوڕمابوو

که چۆن پێشمەرگەکان ئەو بارودۆخە دژوارە تەحەمول دەکەن و بێ پرسیار فەرمانەکان جێبەجێ دەکەن. پێشمەرگە هەتا چەک و تەقەمەنی هەبایا شەڕی دەکرد.

بارزانی چاوەڕێی ئەوە نەبوو لە گۆڕەپانی شەڕدا جەنگەکە لە دوژمنێک بباتەوە کە هەم لە رووی چەکوچۆڵ و هەم لە رووی ژمارەی هێزەکانییەوە باڵادەست بوو بەڵام وەک جاران گرەوی ئەوەی کردبوو رژێمی بەغداد ماندوو بکات و سوپا و ئابورییەکەی ئەوەندە لاواز بکات کە سەر نەوی بکات و واز لە کورد بێنێ بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان بەڕێوەببەن. بارزانی پێشتر ئەوەی کردبوو، راپەڕینەکانی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ رژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقی لە ١٩٦٠ کاندا رووخاندبوو. لەوەدەچوو هیچ هۆیەک لە ئارادا نەبێت کە نەتوانێ لە حەفتاکانیشدا ئەوە بکاتەوە.

بەڵام عێراق و دنیا ئاڵوگۆڕیان بەسەرداهاتبوو، لە ١٩٦٠ کاندا داهاتی نەوتی عێراق - کە دوای عەرەبستانی سعوودی دووەمین سەرچاوەی نەوتی جیهان بوو - کەم بوو، نەوت زۆر هەرزان بوو لە بازاڕی نێونەتەوەییدا و کۆمپانیا گەورە ئەمریکایی، بەریتانی و هۆلەندیەکان هەم کۆنترۆڵی بەرهەمهێنان و هەم کۆنترۆڵی نرخی نەوتیان لەدەستدابوو. حکوومەتەکان لە بەغداد هەمیشە کەم دەرامەت بوون و لە بنەڕەتەوە لاواز بوون. حیزبی بەعس لە ١٩٦٨ دەستیگرت بەسەر دەسەڵاتی عێراقدا. ئەو کاتە لەوەدەچوو کودتاکەی بەعس وەک ئەوانی دیکە بێت بەڵام زۆری نەبرد روون بووەوە کە ئەمەیان جیاوازە. تا ناوەڕاستی حەفتاکان، حکوومەتی بەعس دەستێکی پۆڵایینی بەسەر عێراقدا گرت، دەستێک کە پێش لەوە خەڵکی هیچ وڵاتێکی پڕ ئاشۆ و نەهامەتیلێدراو نەیانبینیبوو. ساڵی ١٩٧٢ حکوومەت هەموو کۆمپانیا نەوتییە رۆژئاواییەکانی خۆماڵی کرد و دوای شەڕی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ی عەرەب و ئیسرائیل، نرخی نەوت لە بازاڕی جیهاندا ١٠ قاتی شەستەکان گران بوو. پارەیەکی زۆر هەڵڕژایە خەزێنەی عێراقەوە، پارەکە ئەوەندە زۆر بوو کە جگە لەبەخێوکردنی

عێراق بەشی شەڕی کوردیشی دەکرد و دەیتوانی وڵاتەکەش بخاتە سەر ڕێگەی ئاوەدانکردنەوە و پێشکەوتن.

ئەمجارەیان بارزانی نەیارێکی جیاوازی هەبوو، نەیارەکەش تەنها ئەو تاقمە نەبوو کە حوکمی بەغدادی دەکرد و پارەیەکی زۆری لەژێر دەستدا بوو، بەڵکو سەدام حوسەین بوو کە سەرکردەیەک بوو کە لە بەرزبوونەوەدا بوو، پیاوێکی قژ قەترانی تەمەن زیاتر لە ٣٠ ساڵان کە خۆلیا و چاوچنۆکی بۆ دەسەڵات ئەوەندە زۆر بوو کە تەمەنەکەی وەلا نابوو. سەدام پیاوێک بوو کە هیچ لەو کەسانە نەدەچوو کە پێشتر بارزانی ڕووبەڕوویان ببوەوە. مەلا مستەفا کە خویندەوارییەکەی لەچەند پۆلێکی سەرەتایی زیاتر نەبوو لە تێکۆشانە دوور و درێژەکەیدا لە هەموو ئەو ڕێبەرە فێڵباز و ساختەچییە عەرەبانە زیرەکتر بوو کە ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانی بەغداد هێنابونیە پێشەوە. بارزانی هەمیشە لەوان باشتر بوو بەڵام پێشتر قەد بەرەنگاری کەسێکی ئەوەندە فێڵباز و دڵڕەق وەک ئەستێرە لاوەکەی ڕژێمی بەعس واتا سەدام حوسەین نەبوبوەوە.

## هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد

لەوەناچێت بارزانی قەد بە مێشکیدا هاتبێ کە کاتێک سەدام حوسێن لە رووی سەربازییەوە بگاتە بنبەست، رووبکاتە دیپلۆماسی. لەو بڕوایەشدا نەبوو کە کاربەدەستانی عێراق هەوڵی کڕینی شا بدەن یان شا لە بەرامبەر ئیمتیازێکی بچوکی سنووری بەو دڵڕەقییە بارزانی و نەتەوەکەی بفرۆشێ. بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی چاوپێکەوتنی شا و سەدام حوسێن لە جەزاییر و ڕێککەوتنیان لە پەراوێزی کۆنفرانسی OPEC لە ٥ی ئاداری ١٩٧٥ بۆ بارزانی و پێشمەرگەکانی و سەراسەری دنیا وەک دەنگی گرمەی هەور بوو لە ئاسمانێکی شینی ساکاردا.

ڕێکەوتنەکە تەنانەت بۆ کاربەدەستانی ئێران و باڵوێزی ئەمەریکا لە ئێران، ریچارد هێڵمز، کە پێشتر سەرۆکی CIA بوو، چاوەڕواننەکراو بوو. هێڵمز لە ٦ی ئادار لە

فڕۆکەخانەی تاران بوو کاتێک سەرانی حکوومەتی ئێران هاتبوونە پێشوازیی گەڕانەوەی شا لە جەزاییر. هێلمز بۆی دەرکەوت کە یاریدەدەرانی شاش وەک خۆی لە ڕێکەوتنەکەی جەزاییر حەپەساو و بێ ئاگابوون. هێلمز بە گرژییەوە چاوی لێبوو کاتێک شا هەر کە لە فڕۆکەکە دابەزی و هەر لە سەر فەرشە سورەکە کە بۆی ڕاخرابوو و پێش ئەوەی پێی بگاتە کۆشکەکەی دەستیکرد بە دەرکردنی فەرمان و تەعلیمات بۆ ئەوەی هەموو پشتگیرییەکی سەربازی و دارایی و جۆرەکانی دیکەی پشتگیریی بۆ کوردەکان یەکسەر ڕابگیرێ و سنوورەکانی ئێران و عێراق پاش ماوەیەکی کەم دابخرێن.

هێلمز ڕۆژی دواتر چوو بۆ سەردانی شا، بۆی دەرکەوت کە زۆر لەخۆبایی و لووتبەرزە. شا داوای نەکرد ویلایەتە یەکگرتووەکانیش وەک خۆی کۆتایی بە یارمەتیدانی کورد بهێنێت، یارمەتییەک کە خۆی پێش سێ ساڵ داوای لە سەرۆک کۆمار نیکسۆن کردبوو درێژەی پێبدات. شا بەسادەیی بە هێلمزی وت پچڕانی یارمەتی ئێران بۆ ڕاپەڕیوە کوردەکانی بارزانی بڕینی هەموو یارمەتییەکانی ئەمریکاشی بەدوادادێت. شا قەد داوای لێبوردنی لە هێلمز نەکرد بۆ کردەوە کتوپڕ و لەناکاوەکەی، شا لەو جۆرە مرۆڤانە نەبوو کە داوای لێبووردن لە کەس بکات بەڵام ڕوونکردنەوەیەکی هەبوو. شا پێیوت بارزانی شەڕێکی ئەوتۆی لەگەڵ عێراقییەکان نەدەکرد، تەنها پاڵیدابووە و داوای لە خەڵکی دیکە دەکرد شەڕی بۆ بکەن.

کاربەدەستانی CIA کە لە باڵوێزخانەکەی هێلمز جێگیر بوون — ئەوانە کە سێ ساڵ لەگەڵ بارزانی و کوردەکان کاریان کردبوو — دڵتەنگ و عاجز بوون، بەڕاستی لە هەواڵی ڕێکەوتنی جەزاییر تووڕە بوون. بەڵام هێلمز پێویستی بە ڕازیکردن نەبوو، ڕێکەوتنی ئێران و عێراقی وەک پێشهاتێکی ئەرێنی سەیر دەکرد، پێشهاتێک کە ئارامی و سەقامگیری بۆ ناوچەکە دێنێ. هێلمز باش لەوە تێدەگەیشت کە حکومەتەکان، لە بەغداد و تاران، دەبێ دژی ئەوەبن کە هەرێمێکی وڵاتەکەیان لەلایەن کەمینەیەکەوە دابڕدرێ.

هێڵمز کاتێک راپۆرتی گفتوگۆکەی نێوان خۆی و شای نارد بۆ وەزارەتی دەرەوە، لەو بڕوایەدا بوو کە بەرپرسەکەی واتا هێنری کیسینجێری وەزیری دەرەوە خۆشحاڵ دەبێ بە ئاساییبوونەوەی پەیوەندییەکانی بەغداد و تاران بەڵام سەریسوڕما کە بینی کیسینجێر لە رێکەوتنەکە نارازییە. ئەوەی کە کیسینجێری تورە کردبوو، پرەنسیپە مرۆڤدۆستانەکان و نیگەرانبوون بۆ نەهامەتی کورد لە ئەنجامی خیانەتکاریدا نەبوو بەڵکوو ئەوە بوو کە کیسینجێر بە هیوای ئەوە بووە کوردەکان بەردەوامبن لە بەستنەوەی عێراق و نەهێڵن بەغداد کێشە بۆ ئیسرائیل دروست بکات. کیسینجێر بڕیارەکەی شای پێناخۆش بوو بەڵام هەوڵی گۆڕینیشی نەدا. هێنری کیسینجێر نەیدەویست لەگەڵ محەممەد رەزا شا پەهلەویدا تێکی بدات، چونکە شا زۆر پێویست بوو و دەستی لێهەڵنەدەگیرا، شا کۆڵەکەی سیاسەتی ئەمریکا بوو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەو پیاوەبوو کە واشینگتۆن پشتی پێبەستبوو بۆ راگرتنی هاوسەنگی لە ناوچە هەستیارەکەی کەنداوی فارسدا.

شا حەفتەیەک بارزانی و رێبەرایەتی کوردی لە چاوەڕوانیدا هێشتەوە پێش ئەوەی لە ١١ی ئادار وەریانبگرێت و بە شێوەی فەرمی بڕیارەکانی خۆی پێیانڕابگەیەنێت. "شەفیق قەزاز"یش لەگەڵ بارزانی چاوەڕوان بوو، قەزاز نوێنەری بارزانی بوو لە تاران و سەرۆکی نوسینگەیەک بوو کە ٣٠ کارمەندی تێدابوو. قەزاز بەرپرسی هەستیارترین و گرنگترین پەیوەندییەکان بوو لەگەڵ حکومەتەکەی محمد رەزا شا پەهلەویدا بۆ گواستنەوەی پارە و چەک بۆ ناوچەی کوردنشینی باکوری عێراق کە لە کردەوەدا حکومەتێکی سەربەخۆ بوو. قەزاز بەڕێوەبەری ئەو نەخۆشخانەیە بوو لە ئێران کە بریندار و نەخۆشە کوردەکانی تێدا تیمار دەکرا و بەرپرسی کاروباری نیو ملیۆن ئاوارەی کورد بوو لە ئێران و بەرپرسی پەیوەندیکردن بە جۆستین[85] بوو کە ناوی خوازراوی کاربەدەستێکی باڵای CIA بوو لە پایتەختی ئێران.

---

[85] Justin

شەفیق قەزاز پیاوێکی قۆزی باڵابەرزی باریک بوو کە بە ئینگلیزیەکی بەریتانی بێگەرد قسەی دەکرد. چوار ساڵ پێشتر خوێندنی دکتۆرای لە زانکۆی واشینگتۆن تەواو کردبوو. قەزاز ئەو کاتە رەخنەی لە بارزانی دەگرت، ئەوە پێش ئەوە بوو بەڕاستی سەرکردەی کورد بناسێ. بەڵام ئێستا قەزاز وەک کوڕ بۆ باوک، دڵسۆزی بارزانی بوو. چاوەڕوانی بۆ دیتنی شا بۆ قەزاز نموونەیەک بوو لە دڵڕەقیی زۆردارێکی رۆژهەڵاتی چونکە ١١ی ئاداری ١٩٧٥ ساڵیادی ئەو رۆژە بوو کە پێنج ساڵ پێشتر بارزانی لەگەڵ سەدام حوسێن رێکەوتبوو، رێکەوتنێک کە شا دەیگوت بارزانی بەڵێنی پێداوە نەیباتەسەر. قەزاز هەستیکرد کە ئێستا ئێرانییەکان چێژ لە تۆڵەسەندنەوەکەیان وەردەگرن، خەنجەرەکەیان لە جەستەی کەسێکدا بابدەن، وەک ئەوە وایە کە خەنجەرەکەیان لە ناو جەستەیدا چەقاندبێ.

شەفیق قەزاز لەگەڵ مستەفا بارزانی و دکتۆر مەحموود عوسمان، دوکتۆری تایبەتی بارزانی و ئەندامی پایەبەرزی شۆڕشی کورد رۆیشتن بۆ کۆشکی شا. قسەکانی شای ئێران کورت و سەریح بوو، شا وتی زیاتر لەوەی کە چاوەڕوانی کردوە تێوەگلاوەتە نێو شەڕی کورد چونکە رۆژی یەکەم کە بڕیاریداوە یارمەتی کورد بدات نەیویستووە ئەوەندە یارمەتیان بدات. شا وتی یارمەتیدانی کوردەکان بوەتە بارێکی زۆر گران بۆی و ناچار بوە لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت. شا وتی لەگەڵ ئەوەشدا رێکەوتنەکەی لەگەڵ حکوومەتی بەعس وەک شتێکی کاتی سەیر دەکات و نازانێت عێراقییەکان بەڕاستی رێز لە رێکەوتنەکە دەگرن یان نا بەڵام ئەوە تاقیکردنەوەی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات دەبێت.

شا وتی بەڵام لە هەمان کاتیشدا کۆتایی بە هەموو یارمەتیەکانی بە کورد دەهێنێت، سنوورەکانی ئێران ٣٠ رۆژی دیکە کراوە دەبێت، لەو ٣٠ رۆژەدا ئەو کوردانە کە پێیانخۆش بێت دەتوانن بێنە ئێران، ئێمە پێشوازیان لێدەکەین و کاریان پێدەدەین و وەک هاووڵاتی خۆمان هەڵسوکەوتیان لەگەڵیان دەکەین، دوای ئەوە سنوور دادەخرێت.

مەحمود عوسمان لە شا تورە بوو. چۆن دەبێت خەباتی نەتەوەیەک کە خوێن و سامانی خۆی تێیدا بەخت و قوربانی کردووە لە سەر خواست و ئارەزووی ئەم تاکە پیاوە کۆتایی پێبێت؟ مەحمود عوسمان نارەزایی خۆی دەربڕی، وتی کاتێک بەڵێنتدا یارمەتیمان بدەیت هیچ باسی پاشەکشە لە ئارادانەبوو بەڵام ئێستا.... شا قسەکانی پێبڕی و وتی من بڕیاری خۆمت پێدەڵێم، هیچ شتێک بۆ باس و موناقشە نەماوە. بارزانی بێدەنگ گوێی گرتبوو، بە بێدەنگیش لای شا هاتە دەرەوە.

بە وتەی قەزاز، بارزانی ئەوەندە خەفەتی لە دڵدابوو کە داوای پێداچوونەوەی بڕیارەکەی لە شا نەکرد بەڵام دواتر لە کۆبوونەوە لەگەڵ راوێژکارە سەرەکییەکانی، وتی خەباتی چەکداری بەردەوام دەبێت. بارزانی ئیدریس و مەسعودی کوڕی ناردەوە بۆ کوردستانی عێراق بۆ ئەوەی پێشمەرگە ئامادەی شەڕی پارتیزانی بە شێوەی شەستەکان بکەنەوە. خۆیشی گەڕایەوە بۆ گوندی نێوپردان، لەودیو سنوور لە عێراق. چەند رۆژێک دواتر لە کۆبوونەوەیەکدا لە ژێر خێوەتێکی گەورەدا کە لە لاپاڵی گردێکدا هەڵدرابوو، بارزانی رایگەیاند کە رێکەوتنی نێوان سەدام و شا تەنها پاشەکشەیەکی کاتییە بۆ کێشەی کورد. بارزانی وتی ٩٩% دڵنیایە کە بارودۆخەکە باشتر دەبێت. ئەو تێبینیە، سەرکردە سەربازی و سیاسیەکانی شۆڕشی کوردی سەرسام کرد کە هاتبوون گوێ لە بارزانی بگرن. دوای ئەوەی بارزانی رۆیشت، هەموو ئامادەبووان لە دەوری قەزاز کۆبوونەوە، دەیانپرسی چی بوەتە هۆی ئەوەی بارزانی وا گەشبین بێت؟ قەزاز وەڵامی پێ نەبوو. ئایا بارزانی شتێکی دەزانی و بە کەسی نەدەوت یان تەنها دەیویست ورەی خەڵک بەرز رابگرێ؟

بەهەرحاڵ گەشبینییەکەی بارزانی زۆر زوو بوو بە وازهێنان. ١٨ی ئادار لە کۆبوونەوە لە گەڵ فەرماندە سەربازیەکانی شۆڕشدا، بارزانی رایگەیاند ناتوانێ بەردەوام بێت. بارزانی وتی ئێران لە ٣٠ نیسان سنوورەکانی دادەخات، تورکیا لە ئێستاوە سنوورەکانی داخستووە، سوپای عێراقیش سنوورەکانی باشوور و رۆژئاوای تەنیوە. بارزانی وتی بارودۆخەکە جێگای هیوا نییە بەڵام ئەگەر کەسێک بیەوێت لە باتی ئەو درێژە بە خەبات بدات، بە تەواوی پشتیوانی مەعنەوی لێدەکات. بە هەر حاڵ

قسەکەی زیاتر لە موجامەلە دەچوو تا راستی. ئەوانەی گوێیان لێبوو لایان ئاشکرا بوو کە مەبەستی بارزانی ئەوەیە کە ئەمە کۆتاییە، دەبێ هەر ئێستا کۆتایی بە هەموو شتێک بێنین. کاتێک کە بارزانی لە ژورەکە رۆیشتە دەرەوە، هەموو فەرماندەکان لە سەر ئەوە هاوڕابوون کە بێ سنوورێکی کراوە بۆ وەرگرتنی چەک و یارمەتی، بەردەوامبوونی خەبات مەحاڵە. تەنها عەلی عەسکەری بوو کە بیروڕای جیاوازی هەبوو. عەسکەری چەند رۆژێک پێشمەرگەکانی خۆی هەڵسەنگاند بەڵام ئەویش گەیشتە ئەو قەناعەتە کە درێژەدان بە شەڕ هیچ ئەنجامێکی نییە.
گەلێک لەو فەرماندانە کە بەڕاستی پیاوی ئازا و نەبەرد بوون بە چاوی پڕ لە فرمێسک لە کۆبونەوەکە هاتنە دەرەوە. کاتێک هەواڵەکە بڵاو بوەوە هەندێک لە پێشمەرگەکان بە تەواوی سەریان لێشێوا، هەندێکیان چەکەکانیان شکاند، هەندێکیشیان لە دەستپاچەییدا چەکەکانیان فڕێدایە ناو کەنداڵ و رووبارەکان، هەندێکیش دەگریان و باسی خۆکوشتنیان دەکرد. لەلایەک هاواری بەرزی سەرلێشێواوی، کۆسکەوتن، خیانەتپێکران دوای ١٠ ساڵ خەباتی بێ ئەنجام باڵی بەسەریاندا کێشابوو، لە لایەکی دیکەوە بیریان لە داهاتویەک دەکردەوە کە پشکێکی رەش بوو لە نێوان ئاوارەیی ئێران و گەڕانەوە بۆ عێراق و بڕواکردن بە عەفواتەکەی دەوڵەتی بەعس کە زۆر کەس دیزانی جگە لە دوورخستنەوە و بەندکردن یا مردن، هیچ واتایەکی دیکەی نییە کە هەر واش بوو بۆ هەزاران کەس. کۆسی هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد ئەوەندە گەورە بوو کە پاڵی بە مەحمود عوسمان، دکتۆر و یاریدەدەری تایبەتی بارزانیەوە نا لێی جیابێتەوە و سەرزەنشتی بکات بە هۆی دەستکێشان لە خەباتی چەکداری.
چی روویدا کە هزری بارزانی لەماوەی ئەو چەند رۆژەی نێوان دوو کۆبوونەوەکەدا [٨٦] لە بنەڕەتەوە گۆڕا؟ دەوترێت بارزانی پێش لە بریاری راگەیاندنی کۆتاییپێهاتنی خەبات لە ١٨ی ئادار، دوو جار لە تارانەوە تەلەفۆنی بۆ کراوە. ئایا کاربەدەستانی

---

[٨٦] مەبەستی لە دوو کۆبوونەوەکە، دیدارەکەی مەلا مستەفا و شا لە ١٢ی ئادار و کۆبونەوەکەی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش لە ١٨ی ئادارە. وەرگێڕ

ئێران هەڕەشەیان لێکردووە؟ ئایا ئەمەریکییەکان کەوتوونە بەینەوە و ساردیان کردوەتەوە؟ کەس ناتوانێ بەدڵنیاییەوە هیچ بڵێت بەڵام دواتر هەندێک لەوانەی بارزانییان باش دەناسی گەیشتنە ئەو ئەنجامە کە ئەو پیاوە کە سەرکردایەتی هەموو ڕاپەڕینە گەورەکانی کوردی لە ١٩٤٠کانەوە کردووە نە لە ترسی هەڕەشەی دەرەکی بەڵکوو لە ئەنجامی قەناعەتی خۆیدا دەستی لە خەبات کێشاوە.

بارزانی تەمەنی لە ٧٢ساڵیدا بوو، دەیزانی تەندروستییەکی پۆڵایین و وزەیەکی ئەوتۆی نەماوە سەرکردایەتی خەباتێکی پێشمەرگەتیانەی دیکە لە چیاکاندا بکات. بەپێچەوانەی شەڕەکانی پێشوو، لە ساڵانی کۆتایی خەباتدا بارزانی زیاتر لە بارەگای خۆیدا دەمایەوە، توانای ڕێگەبڕینە دوورودرێژە شەوانەکانی نێو چیاکانی نەمابوو کە پێی بەناوبانگ بوو و سەرکردایەتی شەڕ بکات و ناوبەناویش بەشداری شەڕ بکات و دوژمنەکەشی نەزانێ لە کوێیە. ئەگەر مستەفا بارزانی ئیدی نەتوانێت ڕێبەرایەتی خەبات بکات، ئەی چۆن کەسێکی دیکە دەتوانێ بیکات؟ دەڵێن بارزانی متمانەی بە توانایی ئەوانی دیکە نەبوو بۆ ئەوەی ئەوە بکەن کە خۆی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ کردبوی.

چەند کەسایەتیەکی کورد لەوە زیاتر بارزانیان خەتابار کردووە، دەڵێن وا هەستیان کردووە مەسەلەکە تەنها ئەوە نەبوە کە بارزانی هیچ کەسێکی لەو ئاستەدا نەبینیوە کە جێگەی بگرێتەوە، بەڵکوو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بارزانی نەیویستووە کەس جێگەی بگرێتەوە، نەیتوانیوە بیر لەوە بکاتەوە کەسێکی دیکە ئەو جڵەوە بگرێتە دەست کە بۆ ماوەیەکی دور و درێژ تەنها لەدەستی ئەودا بوو. کەوابوو ئەگەر مستەفا بارزانی نەتوانێ لەمەودوا ڕێبەرایەتی کود بکات لە شۆڕشەکەیدا، نابێت کەسی دیکەش بیکات[87].

---

[87] ئەوە کە پیری و ماندووبوونی بارزانی لە درێژەدان بە خەبات دڵساردی کردوەتەوە لەوانەیە ڕاست بێت چونکە مامۆستا هەژاریش لە کتێبی "چێشتی مجێور"دا ئاماژەی بەوە کردووە کە پێیوایە پیری بارزانی و گەندەڵبوونی کۆمەڵێک لە فەرماندەکانی شۆڕش، بارزانی دڵسارد کردوەتەوە بەڵام

# مێوانی شا

لەگەڵ کۆتاییپێهاتنی شۆڕشی کورد، بارزانی بووە میوانی محمد ڕەزا شای پەهلەوی، ئەو پیاوەی خیانەتی لێکردبوو. بارزانی و ئەندامانی خێزانەکەی گواسترانەوە بۆ خانویەک لە گەڕەکی "سازمانی ئەمنیەت و ئیتلاعاتی کشور" لە تاران کە زیاتر ناسراوە بە SAWAK کە دەزگای هەواڵگری و سیخوڕی شای ئێران بوو. خانووەکە گەورە و دڵگیر بوو و لە هیچ شتێک کەمی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی وەک زیندانییەکی ناوماڵ خۆی دەبینی کە لە کۆمەڵەی هاوڕێیان و دنیای دەرەوە دابڕاوە.

بارزانی بە هۆی هەرەسهێنانی شۆڕشەکەی خەفەتی دەخوارد و هەستی بە بێزاری و دڵتەنگی دەکرد، ئەوەش ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر کاریگەری لە سەر بارودۆخی تەندروستی دەکرد. هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە لاقی چەپی دەئێشا و ببوە هۆی ئەوەی بلەنگێ و جموجۆڵەکانی سنووردار بێت. دوکتۆرەکان نەخۆشییەکەیان وەک Spinal Stenosis دەسنیشان کردبوو یانی نوقورچی دەماری فەقەرات کە مەترسی لەسەر ژیان نییە و یەکێکە لە گیروگرفتەکانی پیری. بەڵام بارزانی ئێستا هەستی بە ئازارێکی نوێ و گەورەتر دەکرد لە بەشی سەرووی شانی ڕاستی. تا سەرەتای مانگی تەموزی ١٩٧٥، ئازارەکەی ئەوەند توند و بەردەوام بوو کە ئیدریسی کوڕی داوای لە دوکتۆر نەجمەدین کەریم (کە دوکتورێکی لاوی خەڵکی کەرکووک بوو) کرد سەیرێکی باوکی بکات.

---

ئەوە کە بارزانی پێیخۆش نەبوە دوای خۆی کەسی دیکە ڕێبەرایەتی شۆڕشی کورد بکات لەوە ناچێت ڕاست بێت چونکە بارزانی دەیتوانی ڕێبەرایەتی شۆڕش تەسلیم بە ئیدریس و مەسعودی کوڕی بکات بەڵام ئەوەی نەکرد. وەرگێڕ

نەجمەدین کەریم وەک خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی زانکۆی مووسڵ، بەگەرمی خەریکی کوردایەتی بوو. یەکسەر دوای تەواکردنی قۆناخی ریزیدینسی پزشکی لە مانگی ئابی ١٩٧٣ چووە ریزی پێشمەرگەکانەوە. پێکەوە لەگەڵ دۆکتۆر مەحمود عوسمان، نەخۆشخانەیەکی مەیدانییان لە بارەگای بارزانیدا کردبووەوە. کاتێک مەحمود عوسمان بە سیاسەت و ئاراستەکردنی شەڕ سەرقاڵ دەبوو، نەجمەدین کەریم نەخۆشخانەکەی دەبردەڕێوە، رۆژانە سەدان نەخۆشی دەبینی، ئەوەندە سەرقاڵی ئیشەکەی بوو کە نەیدەپرژایە سەر سیاسەت یان ئاگاداری شەڕەکان بێت لە نزیکەوە. نەجمەدین کەریم وردە وردە وەک دوکتۆری خێزانی بارزانی جێگەی مەحمود عوسمانی گرتەوە.

پاش پشکنینێکی سەرپێیی نەجمەدین کەریم بۆی دەرکەوت دڵی پیاوە پیرەکە باشە بەڵام گرفتەکەی دۆزییەوە کە گرێیەکی ئازاراوی بوو لە نزیک ئێسکی چەڵەمە. نەجمەدین شکی لە شێرپەنجەی سییەکان بوو، نیشانەکان وایان دەنواند و بارزانیش جگەرەی زۆری دەکێشا. بارزانی قەد جگەرەی پاکەتی نەکێشابوو، خۆی جگەرەی دەپێچایەوە، توتنێکی تیژی چیاکانی کوردستانی بەکاردەهێنا، نزیکەی ٦٠ ساڵ رۆژانە دوو تا سێ پاکەت جگەرەی دەکێشا. دەستنیشانکردنی جۆری نەخۆشیەکەی بەبێ وەرگرتنی تیشکی xrays نەدەکرا و بارزانی بەوە رازی نەدەبوو. بارزانی تەنانەت ئەو پزشکانەشی رەت دەکردەوە کە شا دەیەویست پشکنینی بۆ بکەن. رۆژێکیان بە نەجمەدین کەریمی وت "نامەوێت لە ئێران "x-rays"م بۆ بکرێت چونکە ئەگەر لێرە دەست بە تەداویکردن بکەم، قەت لێمناگەڕێن برۆم، پێمدەڵێن لێرە تەداویەکەت تەواو بکە".

بارزانی دەیەویست بچێت بۆ ئەمریکا، نە لەبەر ئەوەی بەتەمای تەداویەکی باشتر بوو لە ئەمریکا، بەڵکوو بۆ ئەوەی خۆی راستەوخۆ کێشەی کورد بگەیەنێتە لای هێنری کیسینجێر کە تەنها دوو حەوتوو پێش رێکەوتنەکەی شا لەگەڵ سەدام حوسێن بۆ بارزانی نووسیبووی "من دەستخۆشی لەخۆت و گەلەکەت و تێکۆشانە درەوشاوەکەتان

دەکەم." بارزانی حیسابی بۆ ئەوەکردبوو کە کۆمەڵێک دۆستی دەستڕۆیشتووی هەیە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەتایبەت سناتۆر هێنری سکووپ جەکسۆن کە نوێنەری ویلایەتی واشینگتۆن بوو لە ئەنجومەنی پیران لە سەر لیستی پارتی دیموکرات و کەسایەتییەکی موحافەزەکاری دەستڕۆیشتوو بوو و هەروەها جۆرج مینی، سەرۆکیAFL-CIO [88]. جۆرج مینی[89] و سناتۆر جەکسۆن[90] هەردووییان پێشتر بە توندی پشتیوانیان لە مافی کوردەکان کردبوو. بارزانی چاوەڕوانی ئەوەشی دەکرد پشتگیری و هاوخەمی هەندێک ئەمریکایی وەدەستبێنێت. نەخۆشیەکەی یارمەتیدا لە بەندیخانەی ئێران رزگاری بێت و بگاتە ئەمریکا.

---

[88] AFL-CIO بە "رێکخراوی فدراسیۆنی کار و کۆنگرێسی پیشەیی" دەوترێت کە گەورەترین رێکخراوی پیشەیی ئەمریکایە کە لە ئیتیلافی "رێکخراوی فدراسیۆنی کار" و "رێکخراوی کۆنگرێسی پیشەیی" پێکهاتوە کە هەر کام لەو دوو رێکخراوەش کۆمەڵێکی زۆر رێکخراوی پیشەیی نێونەتەوەیی لەخۆ دەگرن. AFL-CIO لە ساڵی ١٩٥٥ دامەزراوە و لە ساڵی ٢٠٠٨ نزیکەی ١١ ملیۆن کرێکار و ٥٥ رێکخراوی یەکێتی پیشەیی ئەندامی ئەو رێکخراوەیە بوونە. جۆرج مینی، دۆستی مەلا مستەفا بارزانی و دۆزی کورد یەکەم سکرتێری ئەو رێکخراوەیە بوو و ئێستا ریچارد ترومکا سکرتێریەتی. وەرگێڕ

[89] جۆرج مینی کەسایەتیەکی کاریگەر و ناوداری گۆڕەپانی سیاسی و ئابووری ئەمریکا بوو کە ساڵی ١٩٥٥ تا ١٩٧٩ سکرتێری رێکخراوی AFL-CIO بوو کە گەورەترین رێکخراوی پیشەیی ئەمریکا بوو. جۆرج مینی دۆستی کورد و مەلا مستەفا بارزانی بوو. جۆرج مینی لە ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

[90] سناتۆر هینری جەکسۆن کەسایەتییەکی زۆر بەناوبانگ و کاریگەری گۆڕەپانی سیاسی ئەمریکا بوو کە دۆستی کورد و مەلا مستەفا بارزانی بوو. جەکسۆن ساڵی ١٩٤١ تا ١٩٥٣ نوێنەری هەرێمی ٢ی واشینگتۆن بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا و ساڵی ١٩٥٣ تا ١٩٨٣ نوێنەری واشینگتۆن بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا. جەکسۆن ساڵی ١٩٧٢ و دیسان لە ١٩٧٦ لەلایەن پارتی دیموکراتەوە بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا کاندید کرا بەڵام هەڵبژاردنەکەی دۆڕاند. سناتۆر جەکسۆن ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

کیسینجێر و شا نەیاندەویست بارزانی بە ئەمریکادا بگەڕێ و چیرۆکە پڕ لە شەرمەزارییەکەی یارمەتییە نهێنییەکانی ئەمریکا بۆ کوردی عێراق و وازهێنانە لەناکاوەکەیان لە کورد ئاشکرا بکات کە هێشتا نهێنی بوو. بەڵام جەکسۆن و مینی دوو دۆستی دەستڕۆیشتووی مەلا مستەفا بوون کە دەیانتوانی بەسەرهاتەکە ئاشکرا بکەن ئەگەر بیانزانیایا کە دەوڵەتی ئەمریکا بە ناڕەوا ڕێگری لە تەداویکردنی بارزانی لە وڵاتەکەی کردووە.

شا و کیسینجێر بە دوودڵییەوە بڕیاریاندا بێ مەترسیترین ڕێگا هەڵبژێرن یانی لێبگەڕێن بارزانی بێتە ئەمریکا بۆ تەداویکردن بەڵام هاتوچۆ و پەیوەندییەکانی بە وریاییەوە سنووردار بکرێت، CIA هەموو کارەکان ڕێکبخات، هەموو خەرجەکەشی بدات و کاربەدەستانی CIA و SAWAK هەموو کاتێک لەگەڵ بارزانی و ئەندامانی حیزبەکەیدا بن. ئەوەبوو لە کۆتاییدا بارزانی ریگەی پێدرا بچێت بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەو رۆژە گەرم و هەڵمدارەی مانگی ئابی ١٩٧٥ بگاتە ئەوێ.

## تەداویکردن لە ئەمریکا

محمد دۆسکی کە سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراوی باکووری عێراق بوو، یەکەم کەس بوو لە مانگی ئەیلوولی ١٩٧٥ لە کلینیکی مایۆ سەردانی بارزانی کرد. دۆسکی پیاوێکی کورتەڵەی دەموچاو زموخت بوو، تەمەنی لە ناوەڕاستی چلەکاندا بوو بەڵام دەساڵ لەوە پیرتر دەردەکەوت، لە منداڵییەوە ڕێزی بۆ مەلا مستەفا بارزانی هەبوو بەڵام قەد وەکوو پێویست خۆی تێکەڵی کێشەی کورد نەکردبوو. کارمەندێکی دیپلۆماتکاری عێراقی بوو هەتا ساڵی ١٩٧١، واتا ئەو کاتە کە ڕژێمی بەعس لە عێراق یاسایەکی دەرکرد و داوای لەوانەکرد کە ژنی بیانییان هەیە (ئەو ژنانەی کە نە عەرەبن و نە مسڵمان) یان ژنەکانیان تەڵاق بدەن یان دەستبەرداری کاری دەوڵەت بن. ئەو کاتە دۆسکی بڕیاریدا کاری دیپلۆماسی و وڵاتی عێراقیش بەجێبێڵێ و لەگەڵ

هاوسەرە ئەمریکاییەکەی کە لە سەردەمی خوێندن لە ١٩٥٠کاندا هێنابووی، بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا.

پێش ڕۆیشتن بۆ لای بارزانی، دۆسکی شارەزابوونی خۆی لە دیپلۆماسی دەرخست بۆ یارمەتیدانی کێشەی کورد. دۆسکی بارزانی بینی و هەستی ڕێز و خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕی، بارزانیش تواناکانی دۆسکی بەرز نرخاند. لەو سەردەمەدا ژمارەیەکی کەم کورد لە ئەمریکا دەژیان، حیزبەکەی بارزانی واتا "پارتی دیمۆکراتی کوردستان" نوێنەری لە واشینگتۆن نەبوو، لەبەر ئەوە بارزانی داوای لە دۆسکی کرد پەیوەندی بۆ ڕێکبخات و ئاگاداری بکاتەوە. دۆسکی لە ١٩٧٢ گەیشتبووە واشینگتۆن و خەریکی خولانەوە و جموجۆڵ بوو لە دەوری کۆنگرێس و وەزارەتی دەرەوە. پەیوەندی لەگەڵ سیناتۆر جەکسۆن و یاریدەدەرە لاوەکەی، ریچارد پێرڵ[٩١]، جۆرج مینی و زاواکەی، ئێرنست لی[٩٢] کە سەرۆکی بەشی پەیوەندییەکانی دەرەوەی AFLCIO بوو، پەیدا کردبوو.

بەڵام دۆسکی درەنگ لە بارزانی نزیک بوبوەوە، لەبەر ئەوەش باوەڕی تەواویان پێی نەبوو. دۆسکی ئاگادار نەکرابوەوە کاتێک ئیدریسی کوڕی مەلا مستەفا و دکتۆر مەحموود عوسمان هەر لەو ساڵەدا بۆ کۆبوونەوە لە گەڵ بەرپرسانی CIA بە نهێنی سەردانی واشینگتۆنیان کردبوو. پاشانیش دۆسکی لە پەیوەندییە نهێنیەکانی نێوان بارزانی و CIAدا بەشدار نەبوو، بەڵام دوای هاتنی بارزانی بۆ ئەمریکا لە ئابی ١٩٧٥ وردەوردە کەوتە نێو ئەو پەیوەندییە، بەڵام هێشتا هەندێک بەربەستی هەبوو بۆ ئەوەی دزە بکاتە ناو بازنەی کەسە هەرە نزیکەکانی بارزانی.

کاتێک دۆسکی لە کلینیکی مایۆ لە مانگی ئەیلوولی ١٩٧٥ سەردانی بارزانی کرد، بۆی دەرکەوت کە بە هۆی کۆمەڵێ شت بارزانی لەژێر چاودێریCIA و SAWAKدایە.

---

[91] Richard Perle
[92] Ernest Lee

پاشان بە نهێنی لە مانگی تشرینی یەکەم چوو بۆ سەردانکردنی بارزانی، دواینیوەڕۆ گەیشتە رۆچێستەر و لەژێر ناوێکی خوازراودا لە تەنیشت ژوورەکەی بارزانی ژوورێکی لە هۆتێلەکە بە کرێ گرت، هۆتێلەکە لە تەنیشت ئەو کلینیکەوە بوو کە بارزانی تێیدا تەداوی دەکرا. دۆسکی تەلەفۆنی بۆ ژوورەکەی بارزانی و ئەوان کرد، شەفیق قەزاز ژمارە تەلەفۆنەکەی پێیدابوو. پاش ٤٥ خولەک، قەزاز و مەسعوود بارزانی، کە ئەو کاتە ئەویش هاتبووە لای باوکی لە رۆچێستەر، لە دەرگای ژوورەکەی دۆسکییان دا. پیلانەکەیان روونکردەوە: کاتژمێر ٨:٣٠ پاشنیوەڕۆ دوویان کارمەندەکانی CIA و SAWAK دەعوەتی ئێوارە خوانێک دەکەن، لەسەر نەریتی میوانداری رۆژهەڵاتی خواردنەوەیان بۆ دەکڕن و چەند جۆرێکیش خواردن داوا دەکەن بۆ ئەوەی میوانەکانیان بەلایەنی کەمەوە دوو کاتژمێر بە نانخواردنەوە مەشغوڵ بکەن بۆ ئەوەی کاتێکی تەواو بدەن بە بارزانی لەگەڵ دۆسکیدا بدوێت.

دۆسکی بینی بارزانی لەسەر جێگەکەی دانیشتووە، تا ئاستێک باش بوو بەڵام قژی بەهۆی تیشکی "رادیۆلۆژی و شیموترافی"[٩٣] هەڵوەریبوو. بارزانی سەرەتا گوێی بۆ خوێندنەوەی نامەیەکی سناتۆر جەکسۆن گرت کە بۆ بارزانی نووسیبوی و پاشان گوێی لە پەیامێکی زارەکی جۆرج مینی گرت. نامەکەی مینی بەلای بارزانییەوە گرینگ بوو چونکە پێشنیاری دەستپێکردنی هەڵمەتێکی جەماوەری بۆ بەرژەوەندی کورد کردبوو. دوای گوێگرتن لە هەردوو نامەکە، قسەیەکی بارزانی دۆسکی راچڵەکاند. بارزانی وتی تۆ لەو بڕوایەدای AFL-CIO بتوانێت بمڕفێنێ و لێرە رزگارم بکات؟ بارزانی ئاماژەی بەوە کرد کە لە مانگی ئابەوە لە کلینیلی "مایۆ"یە و تیشکی رادیۆلۆژی تەواو کردووە و تەداوی "شیمۆترافی"یەکەی ئێستاشی دەکرێ لە هەموو شوێنێک بۆی بکرێت. بارزانی زۆر جار داوای کردبوو رێگەی بدەن بچێتە واشینگتۆن بەڵام چاودێرەکەی CIA هەر جارێ پاساوێکی دەهێنایەوە و بەیانی و دووبەیانی پێدەکرد. لەوانەیە مەبەستی بارزانی ئەوە بووبێت کە دۆسکی بتوانێ

[93] radiation and chemotherapy

فرۆکەیەکی بچووک بەکرێ بگرێت و لە کاتێکدا کە مەسعود و شەفیق چاودێرەکانی CIA و SAWAK بە نانخواردنەوە خەریک دەکەن، خۆیان بدزنەوە و دواتر بفڕن بۆ واشینگتۆن.

دۆسکی لە رووی نەهات بە بارزانی بڵێت کە بیرۆکەکەی بێ مانایە. دوای ئەوەش ئەمە ئەمریکایە نەک وڵاتێکی پۆلیسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تۆ تەیارەت بەکرێ نەگرتوە، بە فرۆکەیەکی بازرگانی سەفەرت کردووە. دۆسکی نەیەویست مشتومڕ لەگەڵ بارزانیدا بکات، بۆیە ئەوەندەی گوت کە دڵنیایە بەشێوەیەک لە شێوەکان دەتوانێ جێبەجێی بکات. بارزانی ئامۆژگاری دۆسکی کرد کار لەسەر پیلانی خۆدزینەوەکە بکات و بەیانی ئێوارە بێتەوە لای. بەیانی کە هاتەوە سەری لەوە سوڕما کە بارزانی بە ساردی بەخێرهاتنی کرد. بارزانی بە توڕەییەوە لێپرسی" لەدوێنێوە کە منت بینی قسەت لەگەڵ کەس کردووە؟" دۆسکی لەوەڵامدا وتی "تەنها لەگەڵ مەسعود و شەفیق قسەم کردوە، بۆ چی بووە؟ " بارزانی وەڵامیدایەوە "لەبەر ئەوەی ئەم دواینیوەڕۆیە چاودێرەکەیCIA هات بۆ لام و وتی رازین من بڕۆم بۆ واشینگتۆن، وامزانی قسەت لەگەڵ کردوون". دۆسکی وتی "بە هیچ شێوەیەک قسەم لەگەڵ کەس نەکردووە. رەنگە ئامێرێکی گوێگرتن لە ژوورەکەدا شاردرابێتەوە، دەتەوێ بگەڕێم بیدۆزمەوە؟" بارزانیش وتی " خۆت ماندوو مەکە ئەگەر بیشیدۆزینەوە یەکێکی دیکە دادەنێن."

بارزانی بە دۆسکی وت بگەڕێتەوە واشێنگتۆن و نەک هەر لەگەڵ جەکسۆن و مینی بەڵکو لەگەڵ سیناتۆر ویلیام پرۆکسماییر، نوێنەری ویلایەتی ویسکۆنسن لە ئەنجومەنی پیران و خەڵکی دیکەش چاوپێکەوتنی بۆ رێکبخات. دۆسکی رۆژی دوایی بە فرۆکە گەڕایەوە بۆ واشینگتۆن و کەوتە چاوەڕوانی، هەر چاوەڕوان بوو. دوو حەفتە بەسەرچوو، هیچ دەنگوباسێک نەبوو. لەسەرەتای حەفتەی سێیەم بۆ هەواڵپرسی تەلەفۆنی بۆ هۆتێلەکەی رۆچێستەر کرد. کارمەندی هۆتیلەکە بە دۆسکی

وت ئەوانە لەمێژە لێرە رۆیشتوون و هیچ ناونیشانێکیشیان لە دوای خۆیان بەجێنەهێشتووە.

دۆسکی ترسی لێنیشت. تۆ بڵێی CIA رفاندبنی یان بارزانییان ناردبێتەوە بۆ ئێران یان بردبێتیان بۆ بەندیخانەیەکی نهێنی؟ لە سەرەتای حەفتەی چوارەم، قەزاز تەلەفۆنی بۆ دۆسکی کرد و بۆی روونکردەوە کە CIA بردوونی بۆ پشوودان، هەفتەیەکیان لەسەر دەریاچەی تاهۆ[94] لە کالیفۆرنیا بردوەتە سەر و هەندێک شوێنی دیکەی رۆژئاواش گەڕاون، هەروەها بۆی روونکردەوە کە سێ رۆژە هاتوونەتە واشینگتۆن و CIA لە گەڕەکی ڤیرجینیا لە ماڵێک دایناون کە تەلەفۆنەکەی کار ناکات. CIA بردوونی بۆ گەڕان بەناو واشینگتۆندا، بەلای کۆشکی سپیدا تێپەڕ دەبن و پێیان دەڵێن ئەمە کۆشکی سپییە بەڵام کاتێک بارزانی داوایان لێدەکات بووەستن، راناوەستن. کاتێکیش لە تەنیشت بینای کۆنگریسەوە تێدەپەڕن بارزانی داوایان لێدەکات رابوەستن بەڵام راناوەستن.

قەزاز بە بیانووی سەردانی کچەکەی کە لە واشینگتۆن دەژیا رێگەیاندابوو بچێتە دەرەوە. ژنەکەی قەزاز کە ئەو کچەی لێبوو ئەمریکایی بوو کە پاشان لێیجیابوەوە. رۆژێک دوای تەلەفۆنەکەی قەزاز، دۆسکی لە ساڵۆنی هۆتێل ماریۆت لە رۆزێلین[95]، بەرامبەر جۆرج تاون، قەزازی بینێ و پێیوت CIA سوورە لەسەر گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ ئێران، بارزانییش ناچێتە ژێر بار و دەڵێ هەتا چاکنەبێتەوە نایەوێ بگەڕێتەوە چونکە وەک پێویست لە ئێران تەداوی بۆ ناکرێت و ئەگەر ئیلا هەر دەبێ ئەمریکا بەجێبێڵێ، دەیەوێ بڕوات بۆ سویسرا یان سوید بۆ ئەوەی لەوێ درێژە بە تەداویەکەی بدات. بەڵام چاودێرەکانی CIA زۆر راشکاوانە پێیانوت شا دەیەوێ بگەڕێیتەوە بۆ ئێران.

---

[94] Lake Tahoe
[95] Marriott Hotel in Rosslyn

لەکۆتاییدا بارزانی کۆڵیدا، بەڵام بەو مەرجە کە مافی ئەوەی پێبدەن هێنری کیسینجێر ببینێ. بە بۆچونی دۆسکی، بارزانی پێیوابوو ئەگەر سووربێت لەسەر نەگەڕانەوە بۆ ئێران لەوانەیە خیزانەکەی و هاوڕێکانی لە ئێران ئازار بدرێن. بارزانی هەمیشە داوای دیتنی هێنری کیسینجێری کردبوو، دڵنیابوو ئەگەر کێشەکە بخاتە بەردەمی کیسینجێر، ئەوا جەنابی وەزیری دەرەوە شتەکان لە بەرژەوەندی کورد راست دەکاتەوە. جەنگاوەرە پیرە کوردەکە ئاگای لەوە نەبوو چەند بە هەڵە لەو پیاوە تێگەیشتووە کە لەسەردەمانێکی کۆنتردا نامەی گەرمی بۆ دەنارد. دواتر کیسینجێر لە لێدوانێکدا نکوولی لە هەموو یارمەتیەکانی ئەمریکا بۆ کورد کرد و وتی" نابێ شاڵاوی نهێنی و کاری خێرخوازی تێکەڵ بکرێت". ئەڵبەتە کیسینجێر بەردەوام ئەوەی رەتدەکردەوە کە قسەیەکی وای کردبێت.

ئێستاش کیسینجێر هیچ نیازی نەبوو بارزانی ببینێت بەڵام هەستی دەکرد نابێ بە تەواوی بارزانی پشتگوێ بخات، بۆیە بە جۆزێف سیسکۆ[٩٦] (کە جیگری خۆی بۆ کاروباری سیاسی بوو) وت بچێت گوێ لە بارزانی بگرێت و لێگەڕێ کوڵوکۆی دڵی خۆی هەڵڕێژێت، تەنها ئەوەندە، لەوە زیاتر نا.

بینینی بارزانی بۆ سیسکۆ ناخۆش بوو. کاتی خۆی لە ١٩٧٢ کە کیسینجێر بۆ یەکەم جار رێگەی یارمەتی نهێنی بۆ کورد کردەوە، سیسکۆ جێگری وەزیری دەرەوە بوو بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا بەڵام هیچ ئاگاداری ئەو یارمەتیە نەبوو، تەنانەت دوای ئەوەش کە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە جێگری وەزیر بۆ کاروباری سیاسی، لە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی شاڵاوەکە ئاگادار نەکرابووە، هەمووی لەژێر دەستی کیسینجێردا بوو. بە هەرحاڵ ئێستا کیسینجێر داوای لێکردبوو بەرەوڕووی کەسێک ببێتەوە کە هەستی دەکرد بەکۆتاییپێهێنانی شاڵاوەکە، خیانەتی لێکراوە.

[96] Joseph Sisco

سیسکۆ بە شەو چوو بۆ ئەو خانووە نهێنیەی CIA کە بارزانی و هاوڕێکانی لێی دەژیان. بارزانی وا خۆی نیشاندا کە حاڵی باش نییە، بەڵام گورجوگۆڵ و توند دەدوا و ناڕەزایی دەربڕی لە بەرامبەر ئەو شێوە هەڵسوکەوتە کە لەگەڵیدا کراوە. باسی رابردووی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد و وتی متمانەی بە ئەمریکیەکان کردوە. بارزانی بە سیسکۆی وت قەد متمانەی بە شا نەبووە بەڵام کاتێک ئەمریکاییەکان پشتگیریان لێکردوە دڵنیابووە کە پشتگوێ ناخرێت. بارزانی پێیوت قەد لەگەڵ حکوومەتی بەغداد نەدەچووە شەڕەوە ئەگەر تۆزقاڵێک دوودڵی لەسەر پتەوی بەڵێنی ئەمریکا هەبوایە.

سیسکۆ بۆ بارزانی روونکردەوە کە ئەمریکا لەسەر داواکاری شا یارمەتی کوردی داوە، ئێستاش لەسەر داواکاری شا خۆی کێشاوەتەوە. دەستەوەستان بەو ئامۆژگاریانە کە کیسینجێر پێیدابوو، سیسکۆ هیچ قسەیەکی دڵخۆشکەری نەکرد کە لەوانەیە ئەمریکا رای خۆی بگۆڕێت. تەنها دەیتوانی ئەوەندە بڵێت کە قسەکانی بارزانی دەگەیەنێتە کاربەدەستانی سەرووی خۆی.

سەردانەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٧٥ کۆتایی پێهات. سەرلەبەیانی ئەو رۆژە کە دەبوایا بگەڕایەوە بۆ ئێران، چاودێرەکانی CIA بەشی شەش مانگ دەواودەرمانیان بۆ هێنا. دۆسکی و قەزاز ئەو کارەی ئەمریکیەکانیان وەک کارێکی خراپ لێکدایەوە. دیارە دکتۆرەکان بە CIA یان وتبوو کە بارزانی ئەوپەڕی ٦ مانگی دیکە زیندووە. چاوەڕوانی ئەوە نەبوون جارێکی دیکە بیبیننەوە و دەرمانەکانیش وەک جۆرێک خواحافیزیکردنی بێ ویژدانانە بوو.

ئەگەر تێگەیشتنی چاودێرەکانی CIA ئەوە بووبێت کە بارزانی تا ٦ مانگی دیکە دەمرێت ئەوە بەهەڵەدا چووبوون، دوکتۆرەکانی کلینیکی مایۆش زیاتر لەوان بەهەڵەدا چوون. دوای تاقیکردنەوەی خوێن و سەیرکردنی x-rays لە مانگی ئاب دۆکتۆرەکان بۆیان دەرکەوت کە بارزانی توشی شێرپەنجەیەکی گەورە بووە، شێرپەنجەکە لە

سییەکانییەوە بە بەشی سەرووی سنگیدا بڵاوبوەتەوە و وایلێهاتووە نەشتەرگەری بۆنەکرێت. ئەو دکتۆرەی لە کلینیکی مایۆ سەرپەرشتی تەداویکردنی بارزانی دەکرد بە قەزازی وتبوو "نەخۆشیەکەی بارزانی زۆر زوو بە ناوی لەشیدا بڵاودەبیتەوە، پێموایە هەشت مانگ تا ساڵێک زیاتر زیندوو نابێت." ئەگەر کەسێکی دیکە تووشی نەخۆشیەکەی بارزانی هاتبا ئەوەندەشی نەدەخایاند بەڵام قەڵافەتە پۆڵایینەکەی بارزانی وایلێکرد تەمەنی سێ ساڵ و نیوی دیکەش درێژ بێت.

## دیسان بەندکراوی شا

بە گەڕانەوەی بۆ تاران، جارێکی دیکە بارزانی بوو بە بەندکراوی شا، دابڕاو لەو خەڵکەی پێشتر سەرکردایەتی دەکردن. گەلێک لە کوردەکان بە ویستی خۆیان گەڕابوونەوە بۆ عێراق بەڵام هێشتا سەدان هەزار کەسیان لە ئێران مابوونەوە و هەڵسوکەوتی ئێران بە هیچ شێوەیەک لەو هەڵسوکەوتە نەدەچوو کە شا بەڵێنی پێدابوون. زۆربەیان لە ئۆردوگاکاندا لەژێر چاودێرییەکی تونددا بوون، بێ کار، ژیانێکی کوڵەمەرگییان دەبردە سەر و هەمیشە لە ژێر مەترسی بەزۆرناردنەوە بۆ عێراق و دوورخستنەوە بۆ شوێنە دوورەکانی ئێران بوون.

زۆرێک لەوانەی کوێرانە ئەوشوێنی بارزانی کەوتبوون، جوێنیان پێدەدا، لۆمەیان دەکرد بە بۆنەی ئەو کارەساتەی بەسەریاندا هاتووە. کاتێکی پڕ دڵتەنگی بوو بۆ بارزانی. براکەی، شێخ بابۆ کە لە منداڵییەوە برادەر و هاوڕێی بوو، لە مانگی شوباتی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کرد. ئەو کاتە کە هەواڵی مردنی بە بارزانی گەیشت قەزاز و نەجمەدین کەریم لەگەڵی بوون. هیچکامیان قەت پێشتر بارزانیان بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە نەبینیبوو بەڵام ئێستا دەیانبینی کە بارزانی لە تەنیایی خۆیدا وەک گیانلەبەرێکی بریندار دەگری. لەوانەیە مردنی بابۆ بووبێت بە هۆکارێک بۆ ئەوەی بارزانی هەموو خەم و خەفەتەکانی هەڵبرێژێت کە تا ئەو کاتە لە سینگیدا پەنگی خواردبوەوە، نەخۆشییەکەشی چنگێکی دیکەی خستبووە سەری. بارزانی لە جێگەدا

نەکەوتبوو، شێرپەنجەکەشی بە هۆی "شیمیترافی" وە ڕاگیرابوو بەڵام ئەو تەداویە تێکیشیدەدا. دوکتۆر نەجمەدین کەریم کە هێشتا دوکتۆری تایبەتی خێزانی بارزانی بوو سەپەرەشتیاری تەداویکردنەکەی بوو لە نەخۆشخانەیەکی تاران و دواتریش لە کاتی ئێشوئازاری ڕشانەوەیدا لەگەڵی دەمایەوە، شلەی دەکردە دەمارەکانییەوە بۆ ئەوەی ئاسوودەیی پێبدات.

بارزانی پەشیمانی گەڕانەوەوە بوو بۆ ئێران، بە نەجمەدین کەریمی وت گەڕانەوەی هەڵەیەکی گەورە بووە، دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. بارزانی دڵنیابوو ئەگەر جارێکی دیکە پێی بگاتەوە بە ئەمریکا دەتوانێ قەناعەت بە ئەمریکاییەکان بهێنێت یارمەتی کورد بدەنەوە و شاش ناچار بکەن ڕای خۆی بگۆڕێت. کاربەدەستانی ئێران گوێیان بۆ داواکاری گەڕانەوەی بارزانی بۆ ئەمریکا نەدەگرت، باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تارانیش بە هەمان شێوە. لەبەر ئەوە دۆسکی دەبوایا لە واشینگتۆن دەست بە کار بێت.

دوای ئەوەی بارزانی ئەمریکای بەجێهێشتبوو، دۆسکیش خۆی لە گفتوگۆی فەرمی لەگەڵ ڕاگەیاندنەکان دوور گرتبوو نەکا لە تاران بۆ بارزانی ببێتە گیروگرفت، بەڵام بە نهێنی دەنگوباسی نەخۆشیەکەی بارزانی و چۆنێتی هەڵسوکەوتی CIA لەگەڵیانی لای دۆست و هاوڕێکانی خۆی بڵاو کردبووەوە.

مانگی تشرینی دووەمی ١٩٧٥ دۆسکی چوو بۆ دیتنی دانییێل شۆر کە هەواڵنێرێکی تەلەفیزیۆنی CBS بوو و چیرۆکەکەی بە تەواوی بۆ گێڕایەوە. دانییێل شۆر چیرۆکەکەی لە دەنگوباسی ئێوارەی CBS بڵاوکردەوە و لە ١٦ی شوباتی ١٩٧٦ ڕۆژنامەی "ڤیلەیج ڤۆیس"[٩٧] هەڵبژاردەیەک لە ڕاپۆرتێکی نهێنی کۆنگرێسی بڵاو کردەوە کە تێیدا ئاماژە بەوە کرابوو کە ئەمریکا بە نهێنی یارمەتی کوردی داوە و پاشان بە شێوەیەکی پڕ لە شەرمەزاریانە وازی لێهێناون.

---

[97] Village Voice

لە سەرەتای گوڵانی ١٩٧٦ دۆسکی تەلەفۆنی کرد بۆ سیدنی سۆبێر[98]، یارمەتیدەری جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سۆبێر سەرەتا داواکارییەکەی دۆسکی رەت کردەوە بۆ ئەوەی ئەمریکا ڤیزا بدات بە بارزانی و داوا لە دەوڵەتی شا بکات لێگەڕێ بارزانی لە ئێران دەربچێت و بێت بۆ ئەمریکا. سۆبێر بە دۆسکی وت ئێمە ناتوانین دەست لە کاروباری ناوخۆی ئێران وەردەین، شا رێگەی شتی وا نادات.

دوای بیستنی ئەو وەڵامە، دۆسکی بۆی دەرکەوت ئەو کێشەیە بە نەرمینواندن چارەسەر نابێت بۆیە بە سۆبێری وت "پارساڵ هەندێک شتم دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنی دەوڵەتی ئەمریکا لەگەڵ بارزانی بە تەلەفزیۆنی CBS وت، بەڵام ئێستا شتی زۆر زیاتریشم لایە بۆ بڵاوکردنەوە. ئەوە بارزانی خەریکە دەمرێت، ئەگەر رێگەی پێنەدەن بگەڕێتەوە بۆ تەداویکردن، ئەوا هەموو چیرۆکەکە بڵاو دەکەمەوە، ئیدی خۆتان دەزانن".

دۆسکی فێڵی لە سوبێر کردبوو، ١٠ ساڵ دواتر لە دیمانەیەکدا دانی بەوەدانا کە لەراستیدا لەو شتانە زیاتر کە بە "دانییل شۆر"ی گوتبوو، هیچی دیکەی نەدەزانی، لەوەش دڵنیا نەبوو کە بارزانی رێگەی پێبدات بە ئاشکرا بدوێ، بەڵام فێڵەکەی کاری کرد. سیدنی سۆبێر کەوتە دڵەڕاوکێوە و بە دۆسکی وت "چاوەڕوان بکە، لێمگەڕێ با سەیرێک بکەم بزانم چیم پێدەکرێت، خۆم پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە."

دوای دوو رۆژ سۆبێر تەلەفۆنی کردەوە بۆ دۆسکی و پێیوت وەزارەتی دەرەوە ڤیزا دەدات بە بارزانی، هەر ئەوەندەی دەوێ پاسپۆرتەکەی بنێرێت بۆ باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە تاران. دۆسکی لێیپرسی بەڵام ئەی بارزانی چی بکات بۆ ئەوەی کاربەدەستانی ئێران پاسپۆرتی بدەنێ؟ سۆبێر وتی ئەوە ئیدی کاری ئێمە نییە. دۆسکی تۆڕە بوو و وتی " ئێوە لە رووی سیاسییەوە بارزانیتان کوشت، دەتانەوێ بە

[98] Sidney Sober

جەستەش بیکوژن؟ ئەو پیاوە نەخۆشە، پێویستی بەوەیە بێت بۆ ئەمریکا بۆ تەداوی، ڕێگەپێنەدان بە تەداویکردنی بە مانای کوشتنیەتی، هیچ هۆیەک بۆ ئەم شێوە هەڵسوکەوتە لەئارادا نییە، ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ ئێران زۆر باشە داوایان لێبکەن پاسپۆرتی بدەنێ، بارزانی هیچ زەرەرێک لە ئێوە یان ئێران نادات ئەگەر ڕێگەی پێبدەن بێت بۆ ئێرە بۆ تەداوی ".

دۆسکی یەکسەر تێگەیشت قسەکانی کاریگەر بووە. سۆبێر پێیوت بەیانی، دوو بەیانی تەلەفۆنت بۆ دەکەمەوە. دوای ٤٨ کاتژمێر، تەلەفۆنی کردەوە بۆ دۆسکی و پێیوت " ئاگادار کراوینەتەوە کە کاربەدەستانی ئێران لێدەگەڕێن ژنێراڵ بارزانی لە ئێران دەرچێت، بەڵام مەرجمان هەیە بۆ مانەوەی بارزانی لە ئەمریکا. ئەمجارەیان دەبێ لەسەر خەرجی خۆی بێت و دەبێت بەڵێن بدات پەیوەندی بە ڕاگەیاندنە گشتیەکانەوە نەکات و لێدوانی سیاسی نەدات". دۆسکی لە وەڵامدا وتی "باشە ڕازین بەڵام بارزانیش مەرجی هەیە، ئەمجارەیان نابێت بارزانی لە ژێر چاودێری CIAدا بێت، دەبێ ئازاد بێت بڕوات بۆ هەرکوێیەک کە پێیخۆش بێت و هەر کەسی پێخۆشبێت ببینێت بەو مەرجەی پەیوەندی بە ڕاگەیاندنە گشتییەکانەوە نەکات.

## هاتنەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٦ بارزانی بۆ جاری دووەم لە فڕۆکەخانەی "جان ئێف کینیدی" لە نیۆیۆرک لە فڕۆکە دابەزی. دۆسکی کە بۆ پێشوازی بارزانی هاتبووە ئەوێ، بە بینینی کابرایەکی ئەمریکایی باڵابەرز پەستبوو، زوو زانی ئەو پیاوە چاودێری CIAیە و چاوەڕوانی سەرکردەی کورد دەکات. کابرا وتی تەنها بۆ ئەوە هاتووە بەخێرهاتنی بارزانی بکات چونکە پێشتر ناسیویەتی.

لەگەڵ ئەوەدا کە سیدنی سۆبێر پێداگری کردبوو کە خەرجی بارزانی دەبێ لە ئەستۆی خۆی بێت بەڵام CIA خەرجی بارزانی دەدا و هەر لە سەرەتاوە بەردەوام

بوو لە چاودێریکردنی بارزانی. کاتێک بارزانی چووە کلینیکی مایۆ، چاودێرێکی CIA ش لەوێ بوو. لە کاتی گواستنەوەشی بۆ واشینگتۆن، CIA شۆقەیەکی رازاوەی لە هۆتێل "شوریهام"[99] بۆ بارزانی بەکرێ گرت، شۆقەکەی بارزانی هەمان ئەو شۆقەیە بوو کە پێنج ساڵ پێش لەوە "سپیرۆ ئاگنیو"[100]، جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکای ئەو سەردەمەی تێدا دانرا بوو. لە سەرەتای مانگی ئاب، CIA ئێوارەخوانێکی رازاوە و دەستبلاوی بۆ بەرپرسەکانی بەشی" ئوپەراسیۆنەکان" و وەزارەتی دەرەوە و بارزانی رێکخست.

هەر وەک ساڵی پێشوو، CIA و SAWAK دیسان ویستیان بارزانی رازی بکەن بگەڕێتەوە بۆ ئێران بەڵام بارزانی ئەمجارەیان کۆڵینەدا. بارزانی هێشتا پێیوابوو دەتوانێ رای ئەمریکا بگۆڕی، دەشیزانی کە لە ئێران ناتوانێ هیچ بۆ کورد بکات و وەکوو پێویست تەداویشی لە ئێران بۆ ناکرێ.

کاتێک بارزانی نەچوە ژێر باری گەڕانەوە بۆ ئێران، CIA یارمەتییەکانی لێ بڕی. دۆسکی خانوویەکی لە قەراغ گەڕەکی "جۆرج تاون" بۆ دۆزییەوە کە نزیکەی ساڵێک تێیدا ژیا و پاشان گوازرایەوە بۆ ئەوبەری پاتۆماک، بۆ مکلێین[101]. بارزانی جارجار دەگەڕایەوە بۆ کلینیکی مایۆ و لە میانەی سەردانەکانیدا، تەداوی رادیۆلۆژی و شیمۆترافی لە نەخۆشخانەی زانکۆی جۆرج تاون و نەخۆشخانەی سیبلی[102] بۆ دەکرا. شێرپەنجەکەی راگیرابوو و دەیتوانی بە شێوەیەکی کەم تا زۆر ئاسایی بژی. بارزانی

---

[99] Shoreham Hotel

[100] سپیرۆ ئاگنیو جێگری ریچارد نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا بوو کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ بە تۆمەتی گەندەڵی و بەرتیلخواردن ناچار کرا دەست لە کار بکێشێتەوە. وادیارە مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە ئاگنیو لە کاتی لێپرسینەوە لە ١٩٧٣ لەو شۆقەیەدا نیشتەجێ کراوە کە پاشان بارزانی تێدا نیشتەجێ کراوە. وەرگێڕ

[101] Potomac to McLean

[102] Georgetown University Hospital and at Sibley Hospital

سناتۆر جەکسۆن، پرۆکسمایێر[١٠٣]، جۆرج مینی، کۆنگریسمەن ستێڤان سۆلارز، نوێنەری نیۆیۆرک لە ئەنجومەنی نوێنەران و کۆمەڵێک ئەندامی دیکەی کۆنگرێسی بینی بەڵام بەهۆی تەنگوچەڵەمە و ڕێگرییەکانی وەزارەتی دەرەوە نەیدەتوانی لە میدیاکاندا دەربکەوێت و لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکان دیمانە بکات کە زۆریش داوایان لێدەکرد.

لە بەهاری ١٩٧٧ خاتوون ڕۆبێرتا کۆهێن[١٠٤]، بەڕێوەبەری کۆمەڵەی نێودەوڵەتی مافی مرۆڤ (کە ئەو کاتە بەناوبانگترین گروپی ئەمریکایی مافی مرۆڤ بوو) بارزانی بانگهێشت کرد بۆ نووسینگەکەی لە نیویۆرک. کۆهێن زۆر لەوە توڕە بوو کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا مافی بارزانی بۆ قسەکردن لەگەڵ میدیاکان پێشێلکردوە. کۆهێن بیری لەوە کردەوە کە لەوانەیە دەوڵەتی فدراڵی ئەمریکا بتوانێ کەسێکی بیانی وەک بارزانی دەمبەست بکات بەڵام ناتوانێ ڕێگە لەوە بگرێت کە خۆی کە هاووڵاتی ئەمریکایە لەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکان قسە نەکات.

بۆیە کۆهێن کۆمەڵێک هەواڵنێری هێنایە ژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی گوێیان لە قسەکانی جەنگاوەرە پیرە کوردەکە بێت. پەیامنێرەکان پرسیاریان لە کۆهێن دەکرد و ئەویش پرسیاری لە بارزانی دەکرد و بارزانیش لەبەردەم پەیامنێرەکاندا وەڵامی کۆهێنی دەدایەوە. ئەم هەڵمەتە ناڕەزایەتی وەزارەتی دەرەوەی لێکەوتەوە بەڵام کیسینجێر ئیدی وەزیری دەرەوە نەمابوو و ئیدارەی دیموکراتەکان کە لافی پاراستنی

---

[١٠٣] سناتۆر ئیدوارد ویلیام پرۆکسمایێر ساڵی ١٩٥٧ تا ١٩٨٩ نوێنەری ڤیسکانسێن بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا و چەند جار لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا کێشەی کوردی لە ئەنجومەنی پیران خستەڕوو. پرۆکزمایێر تەنها ئەندامێکی کۆنگرێسی ئەمریکا بوو کە دوای کۆچی بارزانی، ڕەخنەی توندی لە سیاسەتی ئەمریکا و شا سەبارەت بە بزوتنەوەی کوردی کرد. بۆ دەقی قسەکانی پرۆکزمایێر و قسەی کۆمەڵێکی دیکە لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و پیرانی ئەمریکا دەربارەی شۆڕشی ئەیلوول سەیری بەشی کۆتایی ئەم کتێبە بکەن. وەرگێڕ

[104] Roberta Cohen

مافی مرۆڤی لێدەدا دەسەڵاتی گرتبووە دەست. بۆیە پێویست نەبوو بارزانی خەمی ئەوەی بێت لە ئەمریکا دەریدەکەن.

هەوڵ و لۆبییەکانی بارزانی وای لە کۆنگرێس کرد رێگە بدات هەزاران کوردی عێراقی مافی پەنابەری لە ئەمریکا وەربگرن. ئیدی ئەوە هەمووی بوو، بارزانی نەیتوانی سیاسەتی ئەمریکا هەڵبگەڕێنێتەوە که دڵنیا بوو دەتوانێ بیکات یان نەیتوانی تەنانەت کێشەی کورد بخاتە ناو بەرنامەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا. تا دەچوو کوردەکان زیاتر پشتگوێ دەخران و هەروەها بارزانیش رۆژ بەڕۆژ زیاتر پشتی تێدەکرا.

مۆریس دراپێر[١٠٥]، بەڕێوەبەری نووسینگەی کاروبازی وڵاتانی باکووری جیهانی عەرەب لە وەزارەتی دەرەوە بۆ ماوەیەک لەگەڵ رێبەری کورد لە پەیوەندیدابوو. بارزانی بەوە خۆشحاڵ بوو کە کێشەکەی بۆ "دراپێر" گرنگە بەڵام لە ١٩٧٨ پۆستی "دراپێر" بەرزکرایەوە و بوو بە یارمەتیدەری جێگری وەزیری دەرەوە و کاری پەیوەندیکردن لەگەڵ بارزانی رادەستی خاتون "ماری ئان کێیسی"[١٠٦] کرد. کێیسی فەرمانبەرێکی پلە نزمتر بوو بەڵام ئەوەی کە بارزانی بێزار کردبوو پۆستەکەی کێیسی نەبوو بەڵکوو راستیەکەی ئەوە بوو کە کێیسی ژن بوو و مەلا مستەفا ئەو مەسەلەیەی لای خۆی وا لێکدەدایەوە کە هیچ بایەخێکی لای دەوڵەتی ئەمریکا نەماوە.

بارزانی هەستی نارەزایی و بێ ئومێدییەکانی خۆی لە بەرامبەر وازهێنانی ئەمریکا لە کورد لە ١٩٧٥ لای "دراپێر" زۆر دەرنەبڕیبوو، سەرەتاش نەیەویست ئەو هەستەی خۆی لای "کێیسی"ش دەرببڕێت بەڵام لە یەکێ لە رۆژەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٧٨،

---

[105]Morris Draper
[106] Mary Ann Casey

بارزانی تەقییەوە و هەموو کۆنە قینەکانی خۆی رژاند بەسەر ئەو ژنە جوانەدا و پێیوت قەد لەو خیانەتە خۆش نابێت کە ئەمریکا لێیکردووە.

بارزانی هەمیشە بە دۆسکی دەوت لەوە پەشیمانە کە ئاوا باوەڕی بە ئەمریکا کردووە. رۆژێکیان بە دۆسکی وت ئەگەر بمزانیبایا خەڵکی ئەمریکا ئەوەندە تێکەڵ و پێکەڵن کە کەس نازانێت لە کوێوە هاتوون، قەت بڕوام پێیان نەدەکرد. جارێکیشیان لە دەمی دەرچوو و وتی نەمدەزانی CIA بەشێک نییە لەم وڵاتە، تەنانەت کۆنگرێس و گەلی ئەمریکاش رقیان لێیەتی.

لە سەرەتای ۱۹۷۷ تا کاتی مردنی لە ئاداری ۱۹۷۹، مۆتەکەی نوشستهێنان بە قورسی باڵی بەسەر هەستی بارزانیدا کێشابوو. زۆر جار لۆمەی خەڵکی دیکەی دەکرد بەڵام زۆر جارانیش بەرپرسیارێتیەکەی دەخستە ئەستۆی خۆی. جارێکیان لە هاوینی ۱۹۷۷ کاتێک بارزانی لە چێشتخانەیەکی سەر شێوازی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە "واشینگتۆن دی سی" لەگەڵ دۆسکی، قەزاز، نەجمەدین کەریم و جەمال عەلەمدار( نوێنەری پێشووی بارزانی لە لەندەن) نانیان دەخوارد، پیاوێک لێیان نزیک بوەوە و بە عەرەبی لێیپرسین " ئێوە کوردن، وانییە؟ گوێم لێبوو بەکوردی قسەتان دەکرد، من ئاسوریم". ئاسورییەکان کەمینەیەکن کە ئەوەندەی کوردەکان لە ئەنجامی هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد ئازاریان پێگەیشت.

کابرا بارزانی ناناسێتەوە و پێیاندەڵێت "پێمبڵێن بارزانی ئەو پیاوەی کە گوایە ئەوەندە زیرەک بوو، چۆن توانی شتێکی ئەوەندە بێ عەقڵانە بکات و بڕوا بە شای ئێران بکات؟". بارزانی هیچی پێنەوت، ئەوانی دیکەش بەکابرایان وت کاکە گیان بڕۆ بەلای ئیشی خۆتەوە. بەڵام کاتێک کە لە چێشتخانەکە هاتنەدەرەوە، عەلەمدار بینی کە بارزانی زۆر بێدەنگە. بۆ دڵنەواییدانەوەی بارزانی پێیوت هیوادارم قسەی ئەم کابرا ئاسورییە دڵگیری نەکردبێت. بارزانی بە دەنگێک کە بە ئاستەم دەبیسترا

وەڵامی دایەوە "نا، هەرچی وت بە تەواوی راستە، من زۆر بێ عەقڵ بووم، من شکستم خوارد."

دۆستە ئەمریکاییەکانی بارزانیش دڵنەواییان دەدایەوە، ئەوەیان بیردەخستەوە کە لە ژیانیدا کاری زۆر گرنگی کردوە، دڵنیایان دەکردەوە کە ناوی لە مێژوودا وەک پیاوێکی گەورە هەر زیندووە. بەڵام کاتێک دەیانەویست رازی بکەن بیرەوەرییەکانی بگێڕێتەوە، زۆر بە توندی رەتی دەکردەوە، دەیوت ئەگەر سەرکەوتوو بوومایە دەمگێڕایەوە. جارێکیشان وتی" ژیانی من پڕ بووە لە شکست، هیچ شتێکی تێدا نییە شیاوی گێڕانەوە بێت."

شێرپەنجەکەی بارزانی هەتا کۆتایی ١٩٧٨یش لەژێر کۆنترۆڵدا بوو، پاش ئەوە بەخێرایی بڵاو دەبووەوە. باری تەندروستی رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبوو، دواتر کەوتە جێگا و لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٧٩ بەپەلە گەیاندیانە کلینیکی مایۆ. کاتێک بارزانی لە کلینیکەکە هاتە دەرەوە، دوکتۆرەکەی بە دڵتەنگییەوە بە دۆسکی وت " پێموانیە جارێکی دیکە ببینمەوە."

بارزانی گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی لە مکلێین. لە سەرەتای مانگی شوبات کاتێک زانی ئیدی دوکتۆرەکان هیچیان پێناکرێت بۆی بکەن، وتی "دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ئەوەی لەسەر خاکی کوردستان بمرم، با کوردستانی ئێرانیش بێت". بارزانی دۆسکی راسپارد بلیتی گەڕانەوە بۆ تارانی بۆ بکرێت بەڵام پلانی گەڕانەوەی زوو تووشی گیروگرفت هات. کاتێک نووسینگە فڕۆکەوانییەکە زانی بارزانی پێویستی بە کەپسولی ئۆکسیژن هەیە لە فڕۆکەدا داوای بەڵگەنامەی پزیشکی لێکرد کە تێیدا نووسرابێت حاڵی باشە و دەتوانێ بەرگەی سەفەرەکە بگرێت. دۆسکی هەوڵیدا فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ بگرێت بەڵام بۆی دەرکەوت نرخی کرێکەی لە توانایاندا نییە.

بارزانی هێشتا لە ماڵی خۆی لە گەڕەکی مەکلێین بوو. لە سەرەتای حەفتەی کۆتایی مانگی شوبات قۆڵی راستی بەشێوەیەکی ترسناک و پڕ ئازار بای کردبوو. محمد

دۆسکی، ئیدریس بارزانی و موحسین دزەیی (هاوڕێی دڵسۆزی دێرینی بارزانی) هەوڵیاندا رازی بکەن بیبەن بۆ نەخۆشخانە بەڵام بارزانی گوێی لە قسەکانیان نەدەگرت و دەیوت "ناتوانن هیچم بۆ بکەن" بەڵام دوکتۆرێکیان بانگ کرد و لەسەر رێنمایی دوکتۆرەکە بۆ چۆڕاندنەوە و نیشتنەوەی هەڵاوسانی قۆڵی، بارزانی چوو بۆ نەخۆشخانەی زانکۆی "جۆرج تاون".

محمد دۆسکی و فەرهاد، کوڕەزای بارزانی[١٠٧]، هەموو رۆژێک لە کاتژمێر حەوتی بەیانییەوە هەتا حەوتی ئێوارە بەدیارییەوە بوون و ئیدریس و موحسین دزەییش لە ئێوارەوە هەتا بەیانی. تا سەرەتای مانگی ئادار بارودۆخی بارزانی ئەوەندە باشتر بوو کە دوکتۆرەکان بەڵێنیاندا بۆی بنووسن کە بەرگەی گەڕانەوە بۆ ئێران دەگرێت.

سەرلەبەیانی رۆژی ٣ی ئاداری ١٩٧٩، کاتێک دۆسکی و فەرهاد گەیشتنە نەخۆشخانە، بینیان حاڵی بارزانی زۆر باشترە. بارزانی ئاگای لەخۆ بوو، قسەی دەکرد و ئێش و ئازاری نەمابوو. تا ئێوارەکەی هیچ رووینەدا، دەوروبەری کاتژمێر پێنجی ئێوارە بارزانی داوای کرد لە ناو جێگەکەیەوە بیگوازنەوە سەر کورسییە قۆڵدارەکەی ناو ژورەکەی. دۆسکی و فەرهاد ئەمەیان بە شتێکی ئاسایی دەزانی، پێشتر زۆر جار لە سەر ئەو کورسیە قۆڵدارە دایاننابوو. دۆسکی کورسییەکەی راکێشایە نزیک جێگەکەی بارزانی و فەرهادیش کە لاوێکی چوارشانە و بەهێز بوو وەک جارانی پێشوو دەستێکی خستە پشتی باپیری و دەستی دیکەی خستە ژێر رانی بۆ ئەوەی هەڵیبگرێت بەڵام کاتێک هەڵیگرت پەشۆکا، بینی بارزانی زۆر سوورهەڵگەڕاوە. خێرا لەسەر جێگەکەی خۆی داینایەوە. بارزانی پشوویەکی دا و بە کوڕەزاکەی وت بمبە بۆ سەر کورسیەکە. فەرهاد بە باشی نەدەزانی بەڵام بەقسەی کرد چونکە وا پەروەردە کرابوو هەرگیز پرسیار لە فەرمانەکانی باپیری نەکات.

---

[١٠٧] فەرهاد کوڕەزای مەلا مستەفا بارزانی نەبوو، زاوای خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی بوو، شوی "نەدا" بوو کە کچی ئیدریس بارزانی و خۆشکی نچیروان بارزانی بوو.(دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ دۆکتۆر شەفیق قەزاز، ٣ی ئەیلوولی ٢٠١٢).

کاتێک فەرهاد بۆ جاری دووەم هەڵیگرت، بارزانی سوور وەک خوێن هەڵگەڕا، سەری بەدوادا شکایەوە و پاشان بەلایەکدا کەوت. دۆسکی بە پەلە پەرەستارێکی بانگ کرد، دوای چەند خولەکێک دوکتۆرێک هات، دوکتۆرەکە وتی بارزانی "کۆچی دوایی کردووە".

فەرهاد تەلەفۆنی ژورەکەی هەڵگرت و بە شپرزەییەوە ویستی تەلەفۆن بۆ ئیدریسی مامی لەماڵەکەی لە مەکلێین بکات، ژمارەکەی باش لەبەر بوو بەڵام هەر چی دەکرد ژمارە تەلەفۆنەکە نەدەهاتەوە بیری، تەلەفۆنەکەی دانا بۆ ئەوەی تۆزێ بێتەوە سەر خۆێ. جارێکی دیکە تەلەفۆنەکەی هەڵگرتەوە بەڵام دیسان تەنها چەند ژمارەیەکی دەهاتەوە یاد، لە کۆتاییدا دۆسکی ژمارەکەی پێوت و ئەویش تەلەفۆنی کرد بۆ ئیدریس.

تەرمی بارزانیان بردە هۆڵێکی ماتەمینی لە واشینگتۆن. ڕۆژێ دواتر سەدان کورد لە ژورێکی چاوەڕوانیدا کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بۆ دوا جار سەری ڕێز و حورمەت لە بەرامبەر سەرۆکە کۆچکردووەکەیان دابنوێنن.

٥ی ئاداری ١٩٧٩ تەرمی بارزانی لە باشترین شوێنی فڕۆکەی Boeing 747 ی هێڵی ئاسمانی ئێران دانرا. ئیدریس بارزانی، فەرهاد بارزانی، موحسین دزەیی و محمد دۆسکی لە سەفەرە درێژەکەیدا بۆ ئێران لە تەنیشتییەوە دانیشتبوون.

سەرلەبەیانی ٦ی ئادار لە تاران بە یاوەری چەند کەس لە لایەنگرەکانی، تەرمی بارزانی سواری هیلیکۆپتەرێکی سوپای ئێران کرا بۆ ئەوەی بیگواسنەوە بۆ (شنۆ)، شارێکی بچووک لە کوردستانی ئێران لە سەر سنووری عێراق لە ڕۆژئاوای مەهاباد. لە (شنۆ) خەڵکێکی یەکجار زۆر (کە فەرهاد بارزانی شتی وای قەد نەبینیبوو) چاوەڕوان بوون بۆ دوا جار بەخێرهاتنەوەی بارزانی بکەن. پیاوەکان دەگریان و تەقەیان بە ئاسماندا دەکرد، ژنەکان شین و ڕۆڕۆیان دەکرد، هاواری کۆس و سۆی

نەتەوەیەکی نەناسراو و بێکەس شەپۆلشەپۆل بە سەر چیا سارد و سەرکەشەکانی کوردستاندا دەڕژا.

لە مردندا هەڵەکانی بارزانی لێیبورا. مەلا مستەفا بارزانی ئیدی کەسێکی شکستخواردوو نەبوو بەڵکو جارێکی دیکە بوو بە قارەمان، قارەمانەکەی سەراسەری ژیانی خۆی، ئەو کەسە کە بەناوبانگترین کەس بوو لە ناو گەلی کورددا.

ئەو ڕۆژە ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٧٩ بوو، چوارەمین ساڵیادی ئەو ڕۆژە بوو کە محمد ڕەزا شای پەهلەوی لە کاتی هاتنەوەی لە جەزاییر یەکسەر کە لە فڕۆکەکەی دابەزی ئەو فەرمانەی دەرکرد کە بووە هۆی ماڵوێرانبوون و دەربەدەربوونی بارزانی و خەڵکەکەی. بەڵام تەنها چەند حەفتەیەک پێش لە کۆچی دوایی بارزانی، خەڵکی ئێران محمد ڕەزا شای پەهلەویان لە سەر تەختی پاشایەتی کێشایە خوارەوە و بوو بە قوربانی ڕق و کینەی خەڵکەکەی خۆی[١٠٨].

---

[١٠٨] لە کۆتایی ئەم وتارەدا نووسەر دەقی ئەو نامەیەی بڵاو کردوەتەوە کە کیسینجێر لە ٢٢ی شوباتی ١٩٧٥ نووسیویەتی بۆ بارزانی. نووسەر ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەو نامەیە لە فایلە تاکەکەسیەکانی محمد دۆسکیدا هەڵگیراوە کە لە حەفتاکاندا نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە واشینگتۆن. نووسەر هەروەها ئاماژەی بەوە کردوە کە هیچ نیشانە یان نوسراوێک بەسەر نامەکەوە نییە بەڵام پێیوایە کە ئەسلی هەمان ئەو نامەیەیە کە کیسینجێر کاتی خۆی بۆ بارزانی نووسیویە و لە ڕێگای CIA وە تەسلیم بە محمد دۆسکیَ کراوە بۆ ئەوەی بیدات بە بارزانی. بەهەرحاڵ دەقی ئەم نامەیە لە نێو بەڵگەنامەکانی ئەم کتێبەدا هەیە و لە بیرەوەریەکانی کیسینجیر لە پێشەکی ئەم کتێبەشدا ئاماژەی پێکراوە بۆیە وەرگێڕ نامەکەی لێرە دووپات نەکردوەتەوە. وەرگێڕ

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن**
**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**
**٢٢ی حوزەیرانی ١٩٦٢، کاتژمێر ٩:١٧ی پاشنیوەڕۆ**
**بابەت: یەکەم دیداری نوێنەرانی مەلا مستەفا بارزانی لە وەزارەتی دەرەوە**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، دیمەشق، لەندەن، پاریس، تاران، کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز و نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک

٣٨٣- کامەران بەدرخان[١٠٩]، کەسایەتی ناسراوی کوردی سوریە و جەمال عەبدوڵا[١١٠]، کوردی عێراق کە لە زانکۆی واشنگتۆن کار دەکات دوابەدوای قسەکردن لەگەڵ دادوەر داگلاس[١١١] ڕۆژی ٢٠ی حوزەیران سەردانی وەزارەتی دەرەوەیان کرد. کامەران بەدرەخان و جەمال عەبدوڵا وتیان نوێنەری مەلا مستەفا بارزانین کە ڕێبەرێکی عەشیرەتییە کە ئێستا لەگەڵ سپای عێراقدا شەڕ دەکات. کوردەکان وتیان ئامانجیان

---

[109] Kamaran Badrkhan
[110] Jamal Abdullah
[111] - Justice Douglasولیام ئۆرویل داگلاس کە بە دادوەر داگلاس ناسراوە، کەسایەتی و دادوەرێکی بەناوبانگی ئەمریکایی بوو کە دۆستی مەلا مستەفا بارزانی و دۆزی کورد بوە و جارجار گەڵاڵەی سیاسی پێشنیار کردووە بە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک ئەو گەڵاڵەیە کە بۆ چاکسازی سیاسی لە ساڵی ١٩٤٥ بە ئێرانی پێشنیار کرد. دادوەر داگلاس ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی کرد. (وەرگێڕ)

ئەوەیە کە سەرنجی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بەرەولای ئامانجەکەیان ( کە گەیشتن بە ئۆتونومی هەرێمییە) رابکێشن و هیوادارن کە نەتەوە یەکگرتووەکان گوێ بۆ داواکاریەکانیان بگرێت. کوردەکان هەروەها داوایان کرد ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر ئەو نەهامەتیانە کە بە هۆی هێرشەکانی عێراق بەسەر کورددا هاتوە، لە سەر بنەمای مرۆڤدۆستانە پشتیوانی ئەخلاقی لە خەڵکی کورد بکات.

ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێت چالاکانە لایەنی کوردەکان بگرێت یان ئامانجی ئۆتونومی کوردەکان هان بدات. کوردەکان داوایان کرد ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رێگر نەبێت لە بەرامبەر تاوتوێکردنی کێشەی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەگەر هات و ئەو مەسەلەیە لە نەتەوە یەککرتووەکان خرایەڕوو. بەرپرسەکەی وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا هەڵوێستی ئەمریکای دەربڕی و وتی کوردەکان دەبێ هەوڵ بدەن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق رێکبکەون و وتی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا تەنانەت ئەگەر پشتیوانیش لە کوردەکان نەکات و تەنها هاوخەمی و بەپەرۆشبوونی خۆی نیشان بدات، کێشەکانی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق ئاڵۆزتر دەبێت. کوردەکان قانع نەبوون بەڵام بەشێوەیەکی دۆستانە وەزارەتی دەرەوەیان بەجێهێشت. وادیارە کوردەکان هێشتا لە سەر ئەو باوەڕن کە بارودۆخی کورد لە عێراق ئێستا گەیشتوەتە جێگایەک کە لە لایەن نەتەوە یەککرتووەکانەوە تاوتوێ بکرێت. وەزارەتی دەرەوە پێشنیار دەکات باڵوێزخانەی ئەمریکا لە عێراق، وەزارەتی دەرەوەی عێراق لەم دیدارە ئاگادار بکاتەوە بەڵام ناوی نوێنەرە کوردەکان نەهێنێت[١١٢].

---

[١١٢]- ئەم رستەی کۆتاییە لە تیلیگرامەکەدا رەش کراوەتەوە بەڵام لە تیلیگرامی دواییدا هەیە. باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق لە تیلیگرامی٥٩٤، رۆژی ٢٧ی حوزەیران بەم شێوەیە وەڵامی وەزارەتی دەرەوەی داوەتەوە: "زانیاریەکان بە شێوەی زارەکی رۆژی ٢٦ی حوزەیران بە بەرپرسی بەشی رۆژئاوای وەزارەتی دەرەوەی عێراق راگەیندرا". سەرچاوە:

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد ـ ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٦٢**

**نهێنی**

**بابەت: مەلا مستەفا بارزانی داوای پشتیوانی ئەمریکا بۆ شۆڕشەکەی دەکات**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، دیمەشق، لەندەن، پاریس و تاران

١٥٠: کاربەدەستێکی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK)- کە بەرپرسی کاروباری ئەم حیزبەیە لە بەغداد - پاش وەرگرتنی رێنوێنییەکانی مەلا مستەفا بارزانی لە ١٨ی ئەیلوول بەشێوازی نهێنی سەردانی باڵوێزخانەی کرد. کوردەکان بەتوندی داوای پشتیوانی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەکەن بۆ شۆڕشەکەیان. ئەم کاربەدەستەی PDK وتی ئێستا پێویستی بە پارە هەیە و لەوانەیە پاشان پێویستی بە چەک هەبێت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زۆربەی شیوعییەکان لە PDK دەرکراون و ئەوانی دیکەش بەم زووانە دەردەکرێن.

لە بەرامبەر پشتیوانی ئێمە، مەلامستەفا بەڵێنی داوە کە:

١- ئەو کەسانە کە ئێمە لێیان بەدگومانین، لە ناو بزووتنەوەکەی دەر بکات.

---

ئارشیڤخانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، فایلە ناوەندیەکان، ٧٨٧.٠٠/٦-٢٢٦٢، نهێنی، دینیسمور رەشنووسەکەی ئامادە کردوە و سترانگ پێیداچوەتەوە و تالبۆت پەسەندی کردوە.

٢- لەگەڵ کەسایەتیە عەرەبە کۆنەپارێزەکانی عێراق هاوکاری بکات و عێراق بگەڕێنەتەوە بۆ نێو پەیماننامەی بەغداد، ئەگەر ئێمە بمانەوێت.

٣- دەستبەجێ زانیاری تەواو بدات بە ئێمە دەربارەی رووداوە سیاسی و سەربازییە ناوخۆییەکانی کوردستان یا عێراقی عەرەبی.

کاربەدەستەکەی PDK بانگەشەی ئەوەی کرد کە دەزگای هەواڵگری کوردەکان بەرفراوان و راست و دروستە و وتی ئەم مەسەلەیە بۆ کوردەکانی سوریا و ئێران و هەروەها عێراق وەراست دەگەڕێت. ئەو کوردە وتی PDK هەم لە بەغداد و هەم لە تاران پەیوەندی نزیک و دۆستانەی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران هەیە. ئێرانیەکان رازی بوونە بەوەی کە کاریان بە هاتوچوی کوردەکان لە سەر سنوور نەبێت و پێش بەو یارمەتیانە نەگرن کە کوردەکانی ئێران دەیدەن بە شۆڕش. مەلا مستەفا بارزانی لەم پەیوەندییە خۆشحاڵە بەڵام داوای یارمەتی مادی لە ئێران دەکات. کاربەدەستەکەی PDK وتی مەلا مستەفا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە پێشنیاری لکانی کوردستان بە ئێران وەک" کۆمارێکی خودموختار" بۆ شا سەرنجڕاکێشە.

کوردەکان هەروەها پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ میسر(کە دۆستی کوردەکانە بەڵام یارمەتیان نادات) و باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە بەغداد هەیە. کاربەدەستەکەی PDK وتی کوردەکان نایانەوێت هەموو پردی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سۆڤیەت بڕوخێنن هەتا کاتێک کە لەوە دڵنیانەبن کە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە بزووتنەوەکەیان دەکات.

کاربەدەستەکەی PDK وتی مانگانە هەزار دولار لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت بۆ هەندێ لە لایەنگرانی تایبەتی شیوعی لە ناو PDK وەردەگرێت بەڵام پارەکە دەچێتە ناو سندوقی PDK. مەلا مستەفا ئەم بڕە کەمە پارەیە بە یارمەتیدانی بزووتنەوەکەی نازانێت. کوردەکان داوای یارمەتیان لە کوەیت کردووە بەڵام کوەیت رەتی کردووەتەوە. باڵوێزخانەی بریتانیا لە بەغداد ئەم هەواڵەی پشتڕاست کردووەتەوە. کاربەدەستەکەی PDK وتی بریتانیا مۆچیاری کوەیتی کردووە پارە نەدات بە شۆڕشگێڕانی کورد. ئیسرائیل لە ئۆروپا پێشنیاری یارمەتی داوە بە کوردەکان بەڵام

کوردەکان ڕەتیان کردووەتەوە، نە لە بەر ئەوەی کە کوردەکان دژی ئیسرائیلن بەڵکوو بەهۆی ئەوەی کە دەترسن ئیسرائیل بە ئەنقەست زانیارییەکان ئاشکرا بکات و خەسار لە بزووتنەوەی کورد لە نێو وڵاتانی عەرەبیدا بکەوێت.

کاربەدەستەکەیPDK وتی مەلا مستەفا دەزانێ پاش ڕووخانی قاسم (کە بە بیروڕای بارزانی بەم زووانە ڕوودەدات) سۆڤیەت نیگەران دەبێت و بە پارە و بە چەک یارمەتی کوردەکان دەدات. ئەو کوردە وتی مەلا مستەفا بە باشتر دەزانێت لەگەڵ ڕۆژئاوا هاوکاری بکات تا سۆڤیەت و متمانەی بە سۆڤیەت نییە. بەهەرحاڵ هەموو کوردەکان ناسیونالیستن و دەبێ ئێستا ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنن ئەگەرنا دەبێ خۆیان بۆ لەناوچوونی ڕەگەزیی ئامادە بکەن بەڵام بۆ ئەوەی شتێکی وا ڕوونەدات کوردەکان یارمەتی لە سۆڤیەت یان تەنانەت لە شەیتانیش قبوڵ دەکەن.

کاربەدەستەکەی PDK بە ڕوونی ئاگادار کرایەوە کە سیاسەتی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەنیسبەت شۆڕشی کورد ئاڵوگۆڕی بە سەردا نەهاتووە[١١٣].

---

[١١٣] یادداشتنامەیەک لە ١١ی ئەیلوول لەلایەن "سترانگ" بۆ "تالبۆت" ناردراوە کە هەڵوێستی گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەبارەت بە کێشەی کورد وەها باس دەکات: "ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کێشەی کورد لە عێراق بە کێشەیەکی ناوخۆیی دەزانێت کە دەبێت لە ناوخۆی عێراق چارەسەر بکرێت. دەوڵەتی ئێمە بە هیچ شێوەیەک پشتیوانی لە چالاکیەکانی کوردەکان دژی دەوڵەتی عێراق ناکات و هیواداره بەم زووانە ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ ئەم کێشەیە بدۆزرێتەوە. ئێمە واتێدەگەین کە کوردەکان داوای ئەوە دەکەن کە هەندێ لە داواکارییەکانیان لەلایەن یاسای بنەڕەتییەوە زامن بکرێت. لەکاتێکدا کە هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت ئەوە ڕوونە کە یاسایەکی دیموکرات هەبێت لە عێراقدا، بەڵام هەرچەشنە شرۆڤەیەک دەربارەی ئەم داواکارییانە لە عێراق دەبێت بە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی ئەم وڵاتە. بەبۆچوونی ئێمە، داهاتوو بۆ کوردەکان لە عێراق (و هەروەها لە ئێران و تورکیا) باش دەبێت ئەگەر پەیوەندییەکی نەپساوەیان هەبێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین. ئێمە دەزانین تورکیا و ئێرانیش هەر ئەم ڕوانگەیانە هەیە و لەسەر ئەو باوەڕەن کە حکوومەتی عێراقیش بە هەمان شێوە هەست دەکات.

ئەویش لە وەڵامدا وتی ئەگەر وایە دەبێ بەزووترین کات پەیوەندی لەگەڵ مەلامستەفا بگرێت و پەیامی بۆ بنێرێت.

**لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (روبێرت کۆمێر)[114]**

**بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (بەڕێز بۆندی)[115]**

**واشنگتۆن، ١ی ئاداری ١٩٦٣**

**نهێنی**

MCGB

**بابەت: مەترسی هەڵگیرسانەوەی کێشەی کورد و ئامادەکاری ئەمریکا بۆ رووبەڕوونەوە لەگەڵ ئەو بارودۆخە**

هەندێ لە سیخوڕەکانمان بە تەواوی نیگەرانی مەترسی هەڵگیرسانەوەی کێشەی کوردن کە دەبێت بە نەهامەتی بۆ رژێمی نوێی عێراق. وەڵامی ئەو پرسیارە زەحمەتە کە ئایا وتووێژەکانی نێوان کورد و حکوومەت لە بەغداد باش دەچێتە پێش یا نا بەڵام گەلێ دەوڵەت(تورکیا، ئێران، میسر بە رێبەرایەتی ناسر و لە سەرووی هەموویان سۆڤیەت) پێیانخۆشە کوردەکان هان بدەن. ئێمە بەتایبەت هۆشداریمان بە ئێران داوە خۆی لەم مەسەلەیە دور بگرێت بەڵام ئەگەر شا بزانێت پەیوەندییەکانی رژێمی نوێی عێراق لەگەڵ جەماڵ عەبدولناسر گەرموگوڕە، لەوانەیە ئەم مۆچیارییەی ئێمە پشتگوێ بخات. من پێداگریم لە سەر CIA کردووە کە بەرنامەیەک لە گروپی تایبەت بۆ جاری داهاتوو ئامادە بکات بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەگەرەکانی ئەم

---

114 -Robert W. Komer
115 -Bundy

بارودۆخە و هیوادارم ئێوە پشتیوانیان لێبکەن. ئەوەی کە ئێمە ئێستا لە هەموو شتێک زیاتر پێویستیمان پێیەتی، دیپلوماسی پێشگیرانەیە .

CIA بەنیسبەت زیادبوونی ئەگەری هێرشی زەمینی جەماڵ عبدولناسر بۆ سەر عەرەبستانی سعودی نیگەرانە (DIAش[١١٦] نیگەرانە بەڵام لە ئاستێکی کەمتردا). وەزارەتی دەرەوە وابیر دەکاتەوە کە بەلەبەرچاوگرتنی هاوسەنگی هێزەکان، ڕوودانی شتێکی وا دوورە (ناسر نایەوێت بەم کارە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێمە بپچڕێنێت) بەڵام من پێموایە ناسر دەیەوێت تاقیمان بکاتەوە .

بەهەرحاڵ من پێداگریم لە سەر پنتاگۆن (وەزارەتی بەرگری ئەمریکا – وەرگێڕ) کردووە کردەوەی پێشگیرانە بگرێتە بەر یان دژکردەوەی سەربازی بە دوای ئەوە ئەنجام بدات. هیوادارم ناسر بارودۆخەکە لەمە زیاتر خراپ نەکات، بەڵام ئێمە دەبێ ئامادە بین ئەگەر پێویست بکات بڕیاری بە ئێش و ژان دەر بکەین.

باب[١١٧]

---

[١١٦] DIA- بە ئاژانسی هەواڵگری بەرگری ئەمریکا دەوترێت. وەرگێڕ.

[117] -BOB K

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**بۆ: لایەنە تایبەتە پەیوەندیدارەکان**

**CA_ ٩٤١١ واشنگتۆن**

**٢ی ئاداری ١٩٦٣، کاتژمێر ١:٥ ی پاش نیوەڕۆ**

**نهێنی**

**بابەت: سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە شۆڕشی کورد و مەسەلە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی عێراق**[١١٨]

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە ئادایس ئابابا، جەزاییر، ئەمان، ئانکارا، ئاتین، بەغداد، بەیرووت، بیلگراد، بۆن، قاهیرە، دەمیشق، جەدە، کابول، کەراچی، خارتوم، لەندەن، موگادیشۆ، مۆسکۆ، نیودلهی، نیکوزیا، پاریس، رەبات، رۆم، تایپە، تایز، تاران، تلابیب، تۆکیۆ، تریپوڵی، تونس، وەرشۆف، ئاکرە و کوەیت.

ڕێنوێنی بۆ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان :

کودیتای ئەم دواییەی عێراق (کە لەلایەن وتەبێژی کودیتاوە وەک درێژەی شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ وەسف کراوە) پێشهاتێکە کە لە بنەڕەتدا بۆ عێراق، رۆژهەڵاتی

---

[١١٨] "سترانگ" و "کیلگۆر" لە ٢٥ی شوبات ئەم راپۆرتەیان ئامادە کردووە و "نۆکز"، "بۆولینگ"، "نیکولاس"، "گاود" (AID) "مورهاوس(INR) "، "کۆنیست" (S/S) "کیرنز - پریستۆن " (لە وەزارەتی بازرگانی) و "مەگهی" بینیویانە و لەلایەن "تالبۆت"وە پەسەند کراوە.

ناوەڕاست بەگشتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێ لەگەڵ رژیمی نوێی عێراق هەڵسوکەوت بکات، هەر وەک ئێستا دەیبینین .

حکوومەتی عێراق لە ئاستی ناوخۆدا دەبێ لەگەڵ ٤ کێشەی بنەڕەتیدا مامەڵە بکات :

١- شۆڕشی کورد

٢- کومپانیای نەوتی عێراق (IPC)

٣- یاسای بنەڕەتی

٤- پێشکەوتنی ئابووری

سەرنەکەوتن لە دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ کێشەی کورد، تەنها بە قازانجی سۆڤیەت و شیوعیەکانی عێراق دەبێت. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک مەسەلەیەکی بەتەواوی ناوخۆیی سەیری کێشەی کورد لە عێراق دەکات. ئێمە دەبێ درێژە بە راوێژ لەگەڵ بەریتانیا بدەین دەربارەی مەسەلەکانی IPC و ئەو لایەنانە کە بەشیان هەیە لە IPCادا و بەتەواوی تەشویقیان بکەین وەڵامی نەرمونیان بدەنەوە بە دەستپێشخەرییەکانی حکوومەتی عێراق بۆ چارەسەرکردنی کێشە چارەسەرنەکراوەکان. ئێمە دەبێ خۆشحاڵی خۆمان بەنیسبەت نیازی عێراق (وەها کە رایگەیاندووە) بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی یاساسەروە دەرببڕین.

حکوومەتی عێراق سەرچاوەی ماددی پێویستی هەیە (ئەگەر باش بەڕێوەی ببات) بۆ ئەوەی ئابووری وڵاتەکەی پێش بخات. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئیرادەی خۆی نیشان بدات بۆ یارمەتیدانی عێراق بێ ئەوەی لەرووی مادییەوە ئاستی یارمەتی خۆی بە عێراق بەرز بکاتەوە. دەبێ بازرگانانی ئەمریکایی تەشویق بکرێن لە هەلە بازرگانیەکانی عێراق کەڵک وەربگرن و حکوومەتی عێراقیش دەبێ ئەو کەندوکۆسپانە لاببات کە "قاسم" لەسەر رێگای بازرگانی بیانی دایانابوو.

لە ئاستی دەرەکیدا حکوومەتی عێراق پێگەیەکی بەهێزی لە نێو وڵاتانی رۆژهەڵاتی جیهانی عەرەب دەبێت ئەگەر هێزی خۆی پتەو بکات و یەکگرتوویی خۆی لەگەڵ ئەم وڵاتانە بپارێزێت و ئامانج و ئیدوئۆلوژی عێراق، بەتایبەت سوریا، ئۆردون، یەمەن و

لە ئاستێکی نزمتردا، کوێت، عەرەبستانی سعودی و لوبنان بەرەولای خۆی رادەکێشت.

حکوومەتی عێراق دەیەوێت لە ئاستی دەرەوە لەسەر "پانعەرەبیزم" چڕ بێتەوە بەڵام هەوڵ دەدات پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەبێت بۆ ئەوەی بەرەی پشتی خۆی قایم بکات. ململانێی نێوان عێراق و UAR (میسر) لەوانەیە روو بدات. بەهەرحاڵ ئیسرائیل لە کاریگەری رووڵەزیادبوونی عێراق لە سەر عەرەبەکان نیگەران دەبێت. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ عێراق تەشویق بکات پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەبێت و دەوڵەتی ئێرانیش هان بدات لە کاروباری عێراقدا دەستێوەردان نەکات.

ئێمە دەبێ لە بەکارهێنانی دەستەواژەی "هیلالی خسیب"[119] دووری بکەین و درێژە بە پەیوەندی دوو لایەنەی دۆستانە و پڕ قازانج لەگەڵ وڵاتانی دیکەی عەرەب بدەین و بە تەواوی لە کێشەی نێوان میسر و عێراقدا بێ لایەن بین. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (و بریتانیا) دەبێ دۆزینەوەی رێگایەک بۆ پێکەوەژیانی کوێت و عێراق تەشویق بکەن و لە هەمان کاتدا درێژە بدەن بە پشتیوانیکردن لە سەربەخۆیی کوێت. ئەگەر کوێت ئازادانە سیستمی فدراتیو لەگەڵ عێراق هەڵبژێرێت ئێمە نابێ دژایەتی ئەوە بکەین کە کوێت دەسەڵاتی بڕیاردانی تەواوی هەبێت لەسەر مەسەلەی نەوت. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بە توندی پشتیوانی لە ئۆردون بکات. سوریا بەرەولای عێراق رادەکێشرێت. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێ دژایەتی سیستمی فدراسیونی سوریا لەگەڵ عێراق یا میسر بکات. لەم پەیوەندییەدا پێویست

---

[119] لە ئەدەبیاتی سیاسیدا مەبەست لە "هیلالی خەسیب" (کەوانەی بەپیت) ئەو سیاسەتەیە کە زلهێزەکان بۆ پێشگرتن لە تەشەنەکردنی ئیسلامی سیاسی و بەربەرەکانی لەگەڵ رۆحی نەیارێتی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا لە ناو وڵاتە ئیسلامیەکاندا گرتیانەبەر. هەندێ لە وڵاتانی ئیسلامی لەوانە میسر، لوبنان، فەلەستین و بەشێک لە ئۆردۆن، سوریا، عێراق، تورکیا و ئێران دەکەوتنە ناو ئەم کەوانەیە. (وەرگێڕ)

به کەڵکوەرگرتن لە هێزی سەربازی ناکات و زۆربەی خەڵکی سوریا بەم سیستمە ڕازی دەبن. ئێمە دەبێ وەک ڕابردوو وەڵامی ئەرێنی بدەینەوە بە داواکارییەکانی سوریا بۆ یارمەتی ئەمریکا بەو وڵاتە. ئێمە دەبێ لە نیگەرانیەکانی عەرەبستانی سعودی لە بارەی عێراق کەڵک وەربگرین بۆ ئەوەی تێوەنەگلانی یەمەن و پێشکەوتنە خێراکان لەپەیوەندی لەگەڵ چاکسازی و نۆژەنکردنەوە تەشویق بکەین .

ئێمە دەبێ لوبنان و وڵاتانی دیکە سەرلەنوێ دڵنیا بکەینەوە کە پشتیوانی لە سەربەخۆییان دەکەین بێ ئەوەی چاومان لە هیچ بێت. لەبەر دژایەتیکردنی عێراق لەگەڵ بەریتانیا لە عەدەن و لەگەڵ عەرەبستانی سعودی ئێمە نابێ چالاکیەکانی عێراق لە یەمەن تەشویق بکەین. ئێمە دەبێ لە نیگەرانی ئیسرائیل دەربارەی ئاکامەکانی شۆڕشی عێراق تێبگەین و لە هەمان کاتدا درێژە بدەین بە بێ لایەنبوونمان لە نێوان ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی. لەهەمان کاتدا دەبێ بەرژەوەندییەکانی خۆمان (بە نیسبەت ئاسایشی ئیسرائیل و مافی دەوڵەتبوونی ئەم ویلایەتە و بوونی ئاشتیەکی هەنگاو بە هەنگاوی هەمیشەیی لە نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل) بۆ عێراق و دەوڵەتانی دیکەی عەرەب ڕوون بکەینەوە .

## الف- ڕوانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەبارەت بە مەسەلە ناوخۆییەکانی عێراق:

حکوومەتی عێراق ئەوەی سەلماندووە کە دەتوانێ دەسەڵاتی خۆی پتەو بکات. حکوومەتی نوێی عێراق (کە حکوومەتێکی بەعسی ئینتیلافیی ناسیونالیستە) لەسەر "پانعەرەبیزم" لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی عێراق و بوونی حکوومەتێکی بێلایەن، چاکسازەخواز و سوسیالیست (وەک نمونەی وڵاتانی ئیسکاندیناویا) پێ دادەگرێ و دەڵێت ئامانجەکانی هەمان ئامانجەکانی خەڵکی عێراق دەبێت. وادیارە دوابەدوای ئارامکردنەوەی وڵات (لەوانە چارەسەرکردنی کێشەی کورد)

حکوومەتی عێراق هەوڵ دەدات ببێ بە حکومەتێکی دیموکرات و یاساسەروەر و زۆرتر خۆی لە پێشکەوتنی ئابووری نزیک بکاتەوە.

لە روانگەی کاروباری ناوخۆیی عێراقەوە، ئێمە چاوەڕوانی ئەوە دەکەین کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بتوانێ لەگەڵ حکوومەتی عێراق بژی. هەرچەند لەوانەیە لەمەوبەدوا شیوعیەکان بتوانن پێگەیەکی جەماوەری بەدەستبهێنن بەڵام حکوومەتی عێراق دەیەوێت کاریگەریان بەرتەسک بکاتەوە. چاوەڕوان دەکرێت حکوومەتی عێراق هەڵوێستێکی نادەروەس بگرێتە بەر کە لە کردەوەدا پێگەی بلۆک(ی رۆژهەڵات) لە عێراق لاواز دەکات.

ئێمە هیوادارین حکوومەتی عێراق بە شێوەیەکی مەعقول لەگەڵ IPC مامەڵە بکات. بەهەرحاڵ هەندێ نیشانەی درێژخایەنتر هەن کە کار دەکەنە سەر سیاسەتی دەرەوەی عێراق کە بۆ ئێمە ناخۆشە. لە بەشی ٢ دا باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم چوار مەسەلە ناوخۆییە بنەڕەتیە کە حکوومەتی عێراق دەبێ مامەڵەی لەگەڵ بکات، رێنوێنیتان دەکەین کە :

### ١ـ شۆڕشی کورد:

سەرنەوکەوتن لە دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی سیاسی بۆ کێشەی کورد بەم زووانە تەنها بە قازانجی سۆڤیەت و شیوعیەکانی عێراق دەبێت.

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژە بەوە بدات کە کێشەی کورد بە مەسەلەیەکی بە تەواوی ناوخۆیی عێراق بزانێت کە نایەوێت هیچ دەورێکی راستەوخۆ یان ناراستەخۆی تێدا ببینێت. لە کاتی قسەوباس لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتانی دیکە، کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ تەنها هیوای خۆیان دەرببڕن کە حکومەتی عێراق و کوردەکان بتوانن بگەن بە رێککەوتنێک کە هەرَ دولا پێی رازی بن و لەم پەیوەندییەدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سیاسەتێکی بێ لایەنانە بگرێتە بەر.

ئێمە دەبێ کار بکەینە سەر ئێران و تورکیا بۆ ئەوەی سیاسەتێکی بێ لایەنانەی هاوشێوە لەلایەن خۆیانەوە بگرنە بەر .

۲ـ مەسەلەی نەوت:

IPC بەو ئاکامە گەیشت کە ناتوانێ مامەڵەیەکی مەعقول لەگەڵ قاسم بکات. لە کاتێکدا کە حکوومەتی نوێی عێراق حکوومەتێکی لاواز نییە بەڵام بەڵگەکان وا نیشان دەدەن کە دەیەوێت لەگەڵ IPC لەسەر مەسەلە گرنگەکان رێکبکەوێت. ئێستا وەزیرێکی لێهاتوو و عاقڵ بووە بە وەزیری نەوت و دەستپێشخەری کردووە بۆ دەستپێکردنەوەی وتووێژ لەگەڵIPC . ئێمە چاوەڕوانی ئەوە دەکەین کە ئەم وتووێژە ببێتە هۆی گفتوگۆکردن لەسەر کۆمەڵێک مەسەلەی دیکە. لە میانەی ئەم وتووێژەدا روونتر دەبێتەوە چۆن حکوومەتی عێراق دەیەوێت یاسای ۸۰ جێبەجێ بکات و "کومپانیای نیشتمانی نەوتی عێراق" چ دەورێک دەگێرێت .

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** هەر لەکۆنەوە IPC لە ژێر بەڕێوەبەری بریتانیادا بووە و ئێمە هیچ هۆکارێک نابینین ئەم مەسەلەیە بگۆڕین. بەهەمان شێوە وتووێژەکان هەمیشە لە لایەن "کومپانیای نیشتمانی نەوتی عێراق" بێ دەستێوەردانی دەوڵەتی بریتانیا یا ئەمریکا بەڕێوە چووە. ئەم رەوتە دەبێ بەردەوام بێت، هەرچەند کە لە کاتی روودانی کێشەیەکی جیدی کاربەدەستانی بریتانیا یا ئەمریکا (یا پێکەوە) دەبێ لەگەڵ حکوومەتی عێراق گفتوگۆ بکەن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لە هەموو پێشهاتەکاندا لەگەڵ بریتانیا لە پەیوەندیدا بێت و هەوڵ بدات تێگەیشتنێکی هاوبەشی لەگەڵ بریتانیا لە هەموو کاتێکدا هەبێت. هەروەها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لەگەڵ کۆمپانیە ئەمریکاییە خاوەن بەشەکان( JERSEG AND SOCONG) لەIPC لە پەیوەندیدا بێت و دەبێ تەشویقیان بکات هەتا ئاستێک نەرمونیان بن لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ حکوومەتی عێراق .

بەرەپێشچوون لە دامەزراندنی حکوومەتێکی یاساسەروەر: "قاسم" زۆر جار بەڵێنی دا کە حکوومەتێکی یاساسەروەر (بە پێی ریفراندۆم) دابمەزرێنێت و هەڵبژاردنەکانی پارلمان بەڕێوە ببات بەڵام هیچ رووی نەدا. حکوومەتی نوێی عێراق بەئاشکرا رایگەیاندووە پاش ئەوەی کە عێراق سەقامگیر بوو(لەوانە لە رێگای چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ کوردەکان) پێشنیار دەکات حکوومەتێکی یاساسەروەر بەزووترین کات پێکبێت. بە لەبەرچاوگرتنی پێداگرتنی بەعسیەکان لەسەر یەکێتی نیشتمانی، ئەو هیوایە هەیە کە حکوومەتی نوێی عێراق بەرنامەکەی خۆی جێبەجێ بکات .

**هەڵوێستی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا:** هەر وەک کێشەی کورد، مەسەلەی پێکهێنانی سیستمێکی ناوخۆیی سیاسی مەسەلەیەکە کە بەتەواوی پەیوەندی بە بڕیاری عێراقەوە هەیە. لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و دەوڵەتانی دیکە، کاربەدەستانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ تەنها ئەوە بڵێن کە:

١ـ خۆشحاڵن سەبارەت بەو بەرنامانەی کە حکوومەتی عێراق رایگەیاندووە دەیەوێت ئەنجامیان بدات. ٢ـ هیوادارن بارودۆخەکە بەم زووانە بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامانە هەموار بێت.

ئێمە نابێ حکوومەتی عێراق مۆچیاری بکەین چ جۆرە سیستمێک هەڵبژێرێت و پێویست ناکات بە حکوومەتی عێراق بڵێین چۆن مامەڵە لەگەڵ کۆمونیزمی ناوخۆیی عێراقدا بکات .

## ٤ـ پێشکەوتنی ئابووری:

بۆ پێشکەوتنی ئابووری، سەرچاوەی پێویست (هەم گشتی و هەم هی کەرتی تایبەت) لە دەستی حکوومەتی عێراقدا هەیە (ئەگەر باش بەڕێوەی ببات). جگە لە بەرنامەڕێژی کاریگەر، ئەوەی کە بۆ عێراق زۆرتر پێویستە زیندووکردنەوەی دڵنیایی بازرگانییە. "دوکتۆرینی بەعس" داوای ئابوورییەکی تێکەڵاو و سەرمایەگوزاری کەرتی تایبەت لە هەموو بەشەکاندا (جگە لە سەرچاوە بنەڕەتیەکان) دەکات، کەوابوو مەیدانێکی بەرفراوان هەیە بۆ کەرتی تایبەت. لە کاتی رژیمی قاسمدا، عێراق رۆژبەرۆژ

خۆی زیاتر لە بواری پێشکەوتن و تجارتدا بە بلوکی سۆڤیەت دەبەستەوە. لە کاتێکدا کە دەبێ چاوەڕوان بین بزانین عێراق لەم بوارانەدا چەندە بەرەولای ڕۆژئاوا دێتە پێش، بەڵام میسر و سوریا بۆکڕینی چەک هەروا بەردەوام پشت بە سۆڤیەت دەبەستن بەڵام لە بواری مەسەلە ئابووریەکاندا لە سۆڤیەت دوور کەوتوونەتەوە.

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێ ئەوەی ئاستی یارمەتی خۆی بە عێراق بەرز بکاتەوە، دەبێ ئیرادەی خۆی نیشان بدات بۆ ئەوەی بە هەموو شێوەیەک کە قازانجی تێدابێت یارمەتی عێراق بدات. بەتایبەت دەبێ بازرگانانی ئەمریکایی تەشویق بکەین هەلەکان لە عێراق بقۆزنەوە و حکوومەتی عێراق دەبێ ئاگادار بکرێتەوە کە دەبێ ئەو کەندوکۆسپانە لاببات (یا لانیکەم هەموار بکات) کە ڕژیمی قاسم بە سەر بازرگانی بیانیدا سەپاندبووی (بنواڕن بۆ تیلیگرامی ٢٥١ ی وەزارەتی دەرەوە لە ١٥ ی شوباتی ١٩٦٣).

حکوومەتی نوێ عێراق بە پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی، پێگەیکی بەهێزی لە بەشی ڕۆژهەڵاتی جیهانی عەرەبیدا دەبێت. ئەو ئامانج و ئیدوئۆلۆژییە کە پێگەیەکی جەماوەری بەهێزی لە عێراق هەیە، دەتوانێت بەتایبەت خەڵکی سوریا، ئۆردۆن، یەمەن و لە ئاستێکی نزمتردا خەڵکی کوێت، عەرەبستانی سعودی و لوبنان بەرەولای خۆی رابکێشێت. پێش لە شۆڕشی ١٩٥٨ توانایی عێراق بۆ گێڕانی دەورێکی یەکلاییکەرەوە لە جیهانی عەرەب، بەهۆی پەیوەندییە بەرتەسکەکانی عێراق لەگەڵ ڕۆژئاوا قەتیس مایەوە و پاش شۆڕشی ١٩٥٨ ئەم مەسەلەیە بەهۆی یەکڕیزبوونی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ بلوکی سۆڤیەت سنووردار بوو. دەوڵەتی عێراق لە ڕووی خۆشەویستی جەماوەری و هێزەوە، دووەمین دەوڵەتە (پاش میسر) لە نێو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی جیهانی عەرەبیدا و ئابوورییەکی زیندووی هەیە.

حکوومەتی نوێی عێراق کە پەیڕەوی لە سیاسەتی بەعس دەکات، بۆ یەکێتی عەرەب لە سەر بنەمای سیستمیکی "فدراتیو"ی هەوڵ دەدات کە تێیدا کاروباری دەرەوە، سەربازی و مەسەلەی فەلەستین بە شێوازی هاوبەش بەڕێوە بچێت بەڵام سیاسەتی ناوخۆیی لە لایەن هەرکام لە ئەندامەکانەوە دیاری بکرێت.

بەپێچەوانەی جمال عبدالناسر کە دەیەوێت یەک پیاو و یەک دەوڵەت بەسەر یەکێتی عەرەبدا زاڵ بێت و ئەم یەکێتیشیە لە کۆمەڵێک حکوومەت بە پێی مودیلی ناوخۆیی میسر پێکبێت، حکوومەتی عێراق لەبەر هەڵکەوتی جوگرافیایی و نفوس و سەرچاوەکانی میسر، وەک هۆکارێکی یەکلاییکەرەوە بۆ ئامانجی عەرەبەکان سەیری ئەم دەوڵەتە دەکات، کەوابوو حکوومەتی عێراق هەموو کارێک دەکات(جگە لە تەسلیمکردنی خۆی بە میسر) بۆ ئەوەی بەئاشکرا درز نەکەوێتە ناویان و هەوڵ دەدات روانگەکانی میسر نەرم بکات .

## ب- روانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەبارەت بە مەسەلە دەرەکییەکانی عێراق:

**١- ململانێی عێراق و میسر:**

حکوومەتی عێراق بەهەوڵدان بۆ پتەوکردنی هێزی وڵاتانی رۆژهەڵاتی جیهانی عەرەب (سوریا، ئۆردون، کوێت، عەرەبستانی سعودی و یەمەن)، کۆمەڵێک کێشەی تایبەت بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دروست دەکات. ئێمە پێمان باشە ئەم بەهێزبوونە لە ماوەی چەند ساڵدا روو بدات بەڵام کێشەکە ئەوەیە بەهێزبوونەکە بەرەو عاقاری بەعس دەچێتە پێش. وادیارە ململانێی نێوان عێراق و میسر( وەک دو جەمسەری سەرەکی هێزەکە) پەرە دەسێنێت. ئەم مەسەلەیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچار دەکات سیاسەتێکی زۆر زۆر هەستیار لە پەیوەندی لەگەڵ میسر و عێراقدا بگرێتە بەر .

هەر یەک لە عێراق و میسر، یارمەتی ئەمریکا بە لایەنی بەرامبەر بە رەفتارێکی نادۆستانە لەقەڵەم دەدەن. لەمەزیاتر دوکتورینی بەعس زۆر ناسیونالیستە و دەیەوێت هەنگاوبەهەنگاو کونترۆڵی عەرەبەکان بەسەر سەرچاوەکانی وڵاتانی عەرەبیدا مسۆگەر بکات. هەروەها دوکتورینی بەعس کە لەگەڵ هەستە بەرفراوانەکانی عەرەبەکان هاورایە، دژی بوونی ئیسرائیلە و لانیکەم وەک هەرەشەیەک بۆ ئاسایشی

عەرەبەکان و لەمپەرێکی فیزیکی لە نێوان دو بەشی جیهانی عەرەبدا سەیری ئیسرائیل دەکات. ئیسرائیل کاردانەوەی دەبێت لە بەرامبەر جێگیربوونی هێزەکانی عێراق لەسەر سنوورەکانی .

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بەتەواوی لەکێشەی نێوان عێراق و میسردا بێ لایەن بێت و دەبێ درێژە بە پەیوەندییەکانی بدات لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتە عەرەبەکان لەسەر بنەمایەکی دولایەنە و بە گوێرەی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئێمە دەبێ لە بەرەوپێشبردنی بیرۆکەی"هیلالی خسیب" دووری بکەین و نابێت لە گفتوگۆکانمان یان لە بەڵگەنامەکانماندا کەڵک لەم دەستەواژەیە وەربگرین. بەهۆی ئەوەی کە هەر چەشنە بەرژەوەندی یا گوشارێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ پێشکەوتنی ناوچەیی لە بەشی رۆژهەلاتی جیهانی عەرەب تەنها بە قازانجی عێراق دەبێت، ئێمە دەبێ لە پەیرەوکردنی بیروکەی"هیلالی خێیب" دووری بکەین. دەبێ لەکاتێکی گونجاودا عێراق بەنیسبەت پێوانەکانمان بۆ یەکگرتوویی عەرەبەکان ئاگادار بکەینەوە. هەروەها دەبێ لەپەیوەندی لەگەڵ نیگەرانیەکانمان بەنیسبەت سەقامگیری ئوردون، عەرەبستانی سعودی و عەدەن و هەروەها بەرژەوەندییەکانمان بە نیسبەت نۆژەنکردنەوە و چاکسازییەکی خێرا حکوومەتی عێراق ئاگادار بکەینەوە .

## ٢ـ تورکیا و ئێران

حکوومەتی عێراق کە لە ئاستی دەرەوە دەیەوێت لەسەر پانعەرەبیزم چڕ بێتەوە، وادیارە دەیەوێت پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ تورکیا و ئێران هەبێت بۆ ئەوەی پشتی قایم بێت لە کاتێکدا کە خۆی بۆ ئەرکی سەرەکی(مەبەستی یەکگرتنی جیهانی عەرەبە ـ وەرگێڕ) تەرخان دەکات .

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ هەرچی لە دەستی دێت لەگەڵ ئەم سێ دەوڵەتانە (ئێران، عێراق، تورکیا) بیکات بۆ ئەوەی پەیوەندی دۆستانەیان پێکەوە هەبێت. ئێمە دەبێ تورکیا و ئێران تەشویق

بکەین دەستێوەردان نەکەن لە کاروباری عێراقدا و ئەگەر کێشەیەک لە نێوان ئێران و عێراق لەسەر شەتولعەرەب سەریهەڵدا، ئێمە دەبێت کتوپڕ بۆ ئارام کردنەوەی هەوڵ بدەین.

## ٣ـ کوێت

بەبۆچوونی ئێمە عێراق بانگەشەکانی خۆی گەرموگوڕتر ناکات لەسەر کوێت بەڵام هەوڵ دەدات ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ راکێشانی سەرچاوەکانی کوێت بەرەولای سەرمایەگوزاری لە عێراق. هاوکات عێراق بە شێوازێکی ورد و ناسک سەربەخۆیی کوێتیش بەفەرمی قبوڵ دەکات. ڕێگاچارەیەکی وا بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. کوێت و عێراق لەوانەیە پاشان لەسەر سیستمێکی "فدراتیوی" بڕیار بدەن.

هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: ئەگەر پێویست بکات ئێمە دەبێ بە پارێزەوە پێداگری لەسەر هەردولا (و بەراوێژ لەگەڵ بریتانیا) بکەین کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە بگەن بە ڕێککەوتنێکی دو لایەنە، بەشێوەیەک کە سەربەخۆیی کوێت بپارێزێت. ئێمە دەبێ لە خستەڕووی هەرچەشنە پێشنیارێک ( کە بە قازانجی یەکێ لە لایەنەکان بێت و نەگات بە ئاکام) بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دووری بکەین. کوێت دەبێ ئازادانە سیستمی فدراتیوی لەگەڵ عێراق هەڵبژێرێت. ئێمە نابێت دژایەتی ئەوە بکەین کە کوێت دەسەڵاتی تەواوی بڕیاڕدان لەسەر مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە نەوت بە دەست بهێنێتەوە.

## ٤ـ ئۆردۆن:

هەرچەند کە حکوومەتێکی عێراقی کە بەعس بە سەریدا زاڵ بێت خەڵکی ئۆردۆن بەرەولای خۆی رادەکێشێت، بەڵام ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە نین کە حیزبی بەعس بتوانێ لە ناو گروپە دابڕاوەکانی خۆی لە ئۆردۆن، ڕێکخستنێک پێکبهێنێت کە بتوانێ لە داهاتوویەکی نزیکدا "مەلیک حوسەین" لەسەر دەسەڵات لاببات. خەڵکی فەلەستین

بەریانیان بەرەولای ڕێبەرایەتی "ناسر" و میسر هەیە نە بەغداد. ئەفسەرانی سوپای ئۆردۆن کە لە تاکە نەخوێندەوار و عەشیرەتی و نیمچە عەشیرەتیەکان پێکهاتوون هەتا ئاستێک لەگەڵ ئیدوئۆلۆژییە جۆراوجۆرەکان نامۆن، لەوانە ئیدوئۆلۆژی سوسیالیستی و پانعەرەبی (هەم ئەوەی میسر و هەم ئەوەی عێراق).

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** ئێمە دەبێ بە توندی درێژە بدەین بە پشتیوانیکردن لە سەربەخۆیی ئۆردۆن بە یارمەتی ئابووری، سەربازی و تەکنیکی ئەمریکا. ئێمە دەبێ بەریانە چاکسازەخوازەکانی حکوومەتی ئێستای ئۆردۆن تەشویق بکەین کە کار دەکەن بۆ پێشکەوتنی ئابووری و چاکسازی کۆمەڵایەتی. ئەگەر ئۆردۆن بگاتە ئەو قەناعەتە کە درێژە بەم ئاراستەیەی ئێستا بدات، توانایی بەعسیەکان بۆ پێشخستنی ڕێکخراوێکی سیاسی بەهێز کەم دەبێتەوە. بەرژەوەندی یەکلاییکەرەوەی ئێمە لەوەدایە کە بارودۆخی ئێستای ئۆردۆن هەر وەک خۆی بمێنێتەوە و دەبێ چاودێری ورد بکەین بەسەر بارودۆخەکەدا. ئیسرائیل لە یەکگرتنی ئۆردۆن لەگەڵ عێراق یا میسر نیگەران دەبێت چونکە دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی سوپایەکی گەورەتر و مودێرنتر لەسەر سنووری ئیسرائیل و ئۆردۆن .

### ٥- عەرەبستانی سعودی:

بەبۆچوونی ئێمە عێراق دەتوانێت هەتا ئاستێک خەڵکی عەرەبستانی سعودی بەرەولای خۆی رابکێشێت و دەیەوێت هێدی هێدی میکانیزمێکی سیاسی دروست بکات بۆ ئەوەی بتوانێ هێدی هێدی حکوومەتی پاشایەتی عەرەبستانی سعودی بڕوخێنێت بەڵام ئێمە گومانمان هەیە بە نیسبەت ئەوە کە ڕێکخراوێکی کاریگەری بەعسی ناسیونالیستی بتوانێ لەکورتخایەندا دروست بێت. لەکاتێکدا کە عێراق بۆ عەرەبستانی سعودی دەتوانێ ببێ بە هاوسەنگییەک لە بەرامبەر گوشارەکانی میسر، ئێمە لەسەر ئەو باوەڕە نین کە عێراق بەوە ڕازی بێت کە بە قازانجی عەرەبستانی سعودی دژی میسر لە یەمەن کایە بکات.

هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: بە قازانجی ئێمە نییە هەوڵ بدەین هیچ پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان عێراق و عەرەبستاندا دروست بێت. لەبەر ئەوەی بنەماڵەی پاشایەتی عەرەبستانی سعودی تەنها لەلایەن عێراقەوە هەست بە هەڕەشە دەکەن ئێمە دەبێ کەڵک لەم راستیە وەربگرین بۆ ئەوەی قەناعەت بە (مەلیک) فەیسەڵ بهێنین کە لە کاروباری یەمەندا دەستێوەردان نەکات و هەنگاوی خێرا و چڕوپڕ بەرەو چاکسازی و نۆژەنکردنەوە هەڵبگرێت.

### ٦- میسر:

حیزبی بەعس کە بە سەر حکوومەتی ئێستای عێراقدا زاڵە پێگەیەکی ئەوتۆی لە میسر نییە و توانابیەکانی بۆ ئاوەژۆکردنی دەوڵەتی میسر زۆر لاوازە.
هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا: ئێمە دەبێ هەروا بەتەواوی لە نێوان عێراق و میسردا بێ لایەن بین و دەبێ درێژە بە بەرنامە یارمەتیدەرەکانمان بە میسر بدەین بۆ ئەوەی میسر گۆڕانکارییەکی جیدی لە سیاسەتەکانی ئێستای خۆیدا نەکات کە بە زەرەری ئێمە بێت.

### ٧- سوریە:

رژێمی نوێی عێراق دەتوانێت بەشێوازێکی بەهێز سوریا بەرەولای خۆی رابکێشێت و دەتوانێت لە کورتخایەندا سوریا ناسەقامگیرتر بکات. ئێمە بوارێکی ئەوتۆمان نییە لە سوریا جگە لە پێشگرتن لە کاریگەری و زاڵبوونی کۆمونیستەکان بەسەر سوریا و بەدەستهێنانی کاریگەرییەکی وا لە سەر سوریا کە بتوانین سوریا هان بدەین دژی ئیسرائیل چالاکی نەکات .
**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** بە نزیکبوونە لە ململانێی عێراق و میسر بۆ راکێشانی سوریا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ بەجیدی لە لایەنگریکردن لە یەکێ لەم لایەنانە دووری بکات. ئێمە دەبێ هەروەک رابردوو وەڵامی ئەرێنی بە داواکارییەکانی سوریا بۆ یارمەتیدانی ئەمریکا بدەینەوە. ئێمە ناتوانین

دژی یەکێتی سوریا لەگەڵ میسر یا عێراق رابوەستین ئەگەر ئەم یەکێتیە بێ بەکارهێنانی هێزی سەربازی جێبەجێ بکرێت و زۆربەی خەڵکی سوریا ئازادانە بڕیاری لەسەر بدەن. بە قازانجی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا نییە عێراق لەگەڵ سوریا ببێ بە هاوپەیمان چونکە لەوانەیە وەک هەڕەشەیەک بۆ ئیسرائیل لەقەڵەم بدرێت و (لە رێگای سەقامگیرتربوونی سوریا لە ئاکامی یەکێتی لەگەڵ عێراق) هەتا ئاستێک هاوسەنگییەکە بشێوێنێت (لانیکەم لە کورتخایەندا). ئەگەر فدراسیونی سوریا ـ عێراق روو بدات و ئەگەر عێراق بیەوێت هێزەکانی بگوازێتەوە بۆ سەر سنووری ئیسرائیل و سوریا، ئێمە دەبێ چالاکانە هەوڵ بدەین پەشیمانی بکەینەوە ئەم کارە نەکات .

## ٨ـ لوبنان:

لەوانەیە لوبنان پێشوازی لە شۆڕشی عێراق بکات چونکە دەیەوێت ئەو ناهەماهەنگیە سەرڕاست بکاتەوە کە لەجیهانی عەرەبدا هەیە. بەهەرحاڵ لوبنان لەوە دەترسێت (لانیکەم لە کورتخایەندا) کە پەیوەندییە هەستیارەکانی لەگەڵ سوریا کاریگەری پێچەوانەوەی بەدواوە بێت.

هەڵوێستی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا: ئێمە دەبێ لوبنان و وڵاتانی دیکە دڵنیا بکەینەوە کە پشتیوانی لە سەربەخۆیی لوبنان دەکەین و نامانەوێت لوبنان لە وڵاتانی عەرەبی داببڕێت.

## ٩ـ ئیسرائیل:

ئیسرائیل دەبێ بە نیگەرانیەوە سەیری شۆڕشی عێراق بکات چونکە لەوانەیە عێراق ببێ بە هێزێکی هاوشێوەی میسر، بەهەرحاڵ ئاکامەکەی بەهێزبوونی یەکێتی عەرەبەکانە کە ئەمەیش ئیسرائیل دەترسێنێت.

**هەڵوێستی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا:** ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە درێژە بە پەیوەندییە زۆر دۆستانەکانی لەگەڵ ئیسرائیل دەدات، دەبێ بەتەواوی لە نێوان ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبدا بێ لایەن بێت. ئێمە

دەبێ لە بەرامبەر هەرچەشنە هەوڵێکی ئیسرائیل رابوەستین بۆ فورمالیزە کردن یا بنیادنانی پەیوەندیی تایبەت لە نێوان ئیسرائیل و ئەمریکا لە بواری ئاسایشدا کە پەیوەندییەکانی ئەمریکا و عەرەبەکان تێکدەدات. لە لایەکی دیکەوە ئێمە دەبێ بەرژەوەندی خۆمان (لە بارەی ئاسایش و و مافی دەوڵەتبوونی ئیسرائیل و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی رێگایەک بۆ ئاشتی هەمیشەیی لە نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل) بۆ دەوڵەتی عێراق روون بکەینەوە، هەروەها کە بۆ دەوڵەتانی دیکەی عەرەبی روونی دەکەینەوە. ئێمە دەبێ عێراق و هەروەها دەوڵەتانی دیکەی عەرەب تەشویق بکەین کە لەسەر پێشکەوتن و چاکسازی چڕ ببنەوە نە ئەوەی وزە و سەرچاوەکانی خۆیان بۆ ناکۆکی عەرەب و ئیسرائیل بەفیڕۆ بدەن .

۱۰- یەمەن:

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ بوارێکی ئەوتۆی نییە لە یەمەن. بەرژەوەندی ئێمە لەوەیەدایە بەسەر کاریگەری سۆڤیەت یا کومونیستەکان لە یەمەن زاڵ بین و لە لایەن ئەوانەی کە دژی بوونی بنکەی بریتانیان لە عەدەن و دژی دەسەڵاتداری سوریان لە یەمەن وەک بنکەکەیەک کەڵک وەربگرین. لەوانەیە عێراق بە پاڵپشتی قورسی میسر یا بلوکی چین - سۆڤیەت پێشنیاری ئاڵترناتیڤێک بکات بە یەمەن. گومان لەوەدا هەیە کە عێراق بتوانێت کارێکی وا بکات هەتا کاتێک کە هێزەکانی میسر لە ناوچە نەچنە دەرەوە.

**هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:** بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە عێراق لە عەدەن هەم دژی بەریتانیایە و هەم دژی دەسەڵاتداری عەرەبستانی سعودییە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نابێ هیچ کارێک بکات بۆ تەشویقکردن یا یارمەتیکردنی عێراق بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لە یەمەن بەهێز بکات کە ئێستا لەسەر بنەمای گروپێکی بچووکی بەعسی و پەیوەندی لەگەڵ ئەو یەمەنیانە راوەستاوە کە لە عێراق پەروەردەیان بینیوە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لە کاتی گونجاودا

روانگەی خۆی بەنیسبەت چالاکیەکانی عێراق لە یەمەن کە بەرەو عەدەن و عەرەبستانی سعودی ئاراستە دەکرێت، بۆ ئەم دەوڵەتە روون بکاتەوە .

روسک[١٢٠]

120 -RUSK

له لایەن بەرپرسی ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانی (روبێرت کومێر)
بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار لە کاروباری ئاسایشی
نەتەوەیی (بەڕێز بۆندی)
واشنگتۆن، ٦ ی ئاداری ١٩٦٣
MCGB
نهێنی
بابەت: ئەگەری هەڵگیرسانی شۆڕشێکی دیکەی کوردەکان

FGI: کودیتای عێراق بووەتە هۆی روونتربوونەوەی سیاسەتە ناوخۆییەکانی عەرەبەکان کە پێویست بەوە دەکات ئێمە کۆمەڵێک کاری سەرپێیی لە چەند مانگی داهاتوودا ئەنجام بدەین.
ئەو پێشامەدانەی کە ئەگەری روودانیان هەیە بریتین لە:
١- شۆڕشێکی دیکەی کوردەکان[١٢١]

---

[١٢١] لە ٧ی ئادار، جێگری بەڕێوەبەری بەشی هەواڵگری لە ئاژانسی ناوەندی هەواڵگری، بەرێز "رەی کلین"، نووسراوەیەکی لەژێر ناوی" کێشەی کورد: مەترسیە نوێکان" ناردووە بۆ "مەک جۆرج بۆندی" کە لە ٥ی ئادار لەلایەن "ئیدارەی هەڵسەنگاندنە نیشتمانیەکان"ەوە ئامادە کراوە. لەم نووسراوەیەدا "کلین" ئاماژەی بەوە کردووە کە: "شانسی ئەوە زیاد بووە کە کێشەی کورد لە مانگەکانی داهاتوودا ئاڵۆزتر ببێت. بەدەسەڵاتگەیشتنی رژیمێکی دژە کومونیست لە عێراق، کەندوکۆسپەکانی پشتیوانیکردنی سۆڤیەت لە کوردەکانی لابردووە و ئەم کێشەیە ئاکام و لێکەوتەی

٢ـ كودیتایەک بەلایەنگری لە جمال عبدالناسر لە عێراق

٣ـ كودیتایەک بەلایەنگری لە عێراق یا جمال عبدالناسر لە سوریا

٤ـ ئاژاوە لە عەرەبستانی سعودی

باشترین سیاسەت بۆ ئێمە ئەوەیە كە بە تەواوی دابنیشین و ئامادەبین مامەڵە بكەین لەگەڵ هەر كەسێكدا كە سەر بكەوێت. خۆشبختانە سیاسەتی ئێمە ئێستا رێگەمان پێدەدات لەم پەیوەندییەدا بچینە پێش و یەكێ لە هۆكارەكانی ئەوەی كە ئێمە نابێ لایەنی عەرەبستانی سعودی بە دژی ناسر بگرین ئەوەیە كە دەستمان ئاوەڵا بێت. پاراستنی عەرەبستانی سعودی لە بەرامبەر دەستدرێژی، مەسەلەیەكە و راگەیاندنی ئەوەی كە ئێمە مەلیكەكانی (عەرەبستانی سعودی)مان بۆ رێبەرایەتی كردنی جیهانی عەرەب، هەڵبژاردووە مەسەلەیەكی دیكەیە. ئەگەر ئێمە بەم شێوازە بچینە پێش لە راستیدا نەوتەكەمان لە كیس دەدەین.

باب

---

گرنگی دەبێت بۆ دەرەوەی عێراق". (كتێبخانەی كنیدی، فایلەكانی ئاسایشی نیشتمانی، زنجیرەی وڵاتان، عێراق، ٦٣ / ٨ ـ ٦٣ /٦).

**لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (بەڕێز هارۆڵد ساندێرز)[١٢٢]**

**بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (بەڕێز بۆندی)**

**واشنگتۆن، ٢ی نیسانی ١٩٦٣**

**نهێنی**

**بابەت: سیاسەتی ئەمریکا بۆ فرۆشتنی چەک و تەقەمەنی بە دەوڵەتی عێراق و کوردەکان**

ئەمڕۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ئەوەی چۆن مامەڵە لەگەڵ رژێمی نوێی عێراق بکەین، وتی ئێمە دەمانەوێت تا ئەو شوێنە کە پێماندەکرێت لەم پەیوەندییەدا یارمەتیدەر بین بێ ئەوەی بکەوینە ناو پرۆگرامێکی یارمەتیدانی گەورە[١٢٣]. وەزارەتی دەرەوە وا هەست دەکات ئێمە تا ئەو

---

[122] - Harold H. Saunders

[١٢٣] بەگوێرەی یادداشتەکانی "لیگیر"، لە کۆبوونەوەی رۆژانەی کارمەندانی کۆشکی سپی لە ٢ی نیسان، کاتێک کە "بۆندی" لە "سەندێرز" (لە نەبوونی"کۆمێر"دا) دەپرسێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێت چی کردەوەگەلێک بگرێتەبەر بۆ نیشاندانی پشتیوانی خۆی لە رژێمی عێراق، "سەندێرز" لە وەڵامدا دەڵێت: "سەرۆک ئەرکانی سوپای عێراق، ئەم دواییانە داوای ژمارەیەک تانکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ هێزەکانی عێراق کردووە، بەڵام ئێمە دەبێ لەسەر ئەم مەسەلەیە بیر بکەینەوە لەبەر ئەوەی کە لەوانەیە عێراق ئەم تانکانە بەکاربهێنێت بۆ سەرکووتکردنی راپەڕینی کوردەکان و ئەمە شتێکە کە ئێمە نامانەوێت حەتمەن بیکەین. جارێ ئەم

شوێنه که پێمان دەکرێ خۆمان لەم مەسەلەیە ببوێرین هەتا ئەو کاتە کە دەوڵەتی عێراق بتوانێ زیاتر لە سەر پێی خۆی رابوەستێ.

رژێمی نوێی عێراق هەنگاوێکی ناڕوونی هەڵگرتووە بۆ وەرگرتنی یارمەتی ئابووری لە ئێمە بۆ ئەوەی پاساو بۆ دابڕان لە شیوعیەکان بهێنێتەوە. ئێمە دەمانەوێت یارمەتی خۆمان بە عێراق لە ئاستی یارمەتیِ تەکنیکی و متمانەی فرۆشتن رابگرین نە ئەوە کە سلفە بدەین بۆ پرۆژەکانی پێشکەوتن. دەوڵەتی عێراق سەرمایەی پێویستی لە داهاتی نەوت هەیە ئەگەر بە شێوازێکی عاقڵانە کەڵکی لێوەربگرێت. AID بڕی پارەی تەرخانکراوی خۆی زیاد کردووە (لە ٦٠٠ هەزار دولار بۆ ٨٠٠ هەزار دولار) بۆ بەشداریکردن لە بەشی راهێناندا.

هەروەها ئێمە بە دەوڵەتی عێراقمان وتووە ئامادەین یارمەتیان بدەین بۆ ئەوەی هەڵبسن بە جێبەجێکردنی BRDلەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان یا یارمەتی تەکنیکی کەرتی تایبەتی ئەمریکا و متمانەی EXIM BANKبەدەست بهێنن بۆ تەشویقکردنی سەرمایەدارانی کەرتی تایبەتی ئەمریکا و لەوانەیە وتووێژ دەربارەی دانانی بەرنامەیەک بۆ زامنکردنی سەرمایە بۆ عێراق (لە هەر کاتێکدا کە دەوڵەتی عێراق ئامادە بێت) و تەشویقکردنی بازرگانی رۆژئاوا لە عێراق یەنجام بدرێت.

ئێمە رەزامەندی خۆمانمان دەربڕیوە بۆ فرۆشتنی ١٢ هیلیکۆپتەر بە عێراق کە دەوڵەتی عێراق داوای کردووە، ماوەتەوە خۆیان بڕیاری ئەوە بدەن کە چی جۆرە کۆپتەرێکیان دەوێت (نرخەکەی ٤ ـ ١٥ میلیون دولارە بە گوێرەی مۆدیلی کۆپتەرەکان).

دەوڵەتی ئەمریکا هەروەها لەوانەیە بڕیاری فرۆشتنی ٤٠ تانکی سووک بدات بە عێراق کە پێشتر عێراق داوای کردووە بۆ ئەوەی بیانخاتە جێگای ئەو تانکانەی کە ئێمە پێش لە ساڵی ١٩٥٨ داومانە پێیان. ئێستا چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە سیاسەتێکی نوێ لە رێگای بەرنامەی "تالبۆت ـ هاریمان" بگیردرێتە بەر بۆ دیاریکردنی

---

بابەتە با دوا بخەین". (زانکۆی بەرگری نەتەوەیی، نووسراوەکانی "تەیلۆر"، یادداشتنامەکانی رۆژانەی کۆشکی سپی).

ڕێوشوێنەکانی چەک و تەقەمەنی قورس کە لەوانەیە لە ڕێگای سوریاوە بگوازرێتەوە بۆ بەرەی شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل. بەهەرحاڵ ئێمە گیروگرفتێکی جیدی نابینین بۆ فرۆشتنی تانکی سووک و چەکی بچووک و تەقەمەنی و پێداویستەکانی COMMG و تەنانەت فڕۆکەی گوازتنەوە بە عێراق، ئەگەر عێراق داوای بکات. هەروەها AID و DODلە بەشی مەدەنی عێراق کار دەکەن بەڵام ئەمە پەیوەندی بەوە هەیە کە ئایا عێراق دەیەوێت ئیزن بە ئێمە بدات لە نزیکەوە لەگەڵ سوپاکەیان کار بکەین.

کوردەکانیش دەتوانن چەک و تەقەمەنی لە ئێمە بکڕن هەرچەند کە ئێمە پێشتر داواکاری ئەوانمان بۆ یارمەتی سەربازی ڕەت کردووەتەوە. بەهەرحاڵ بە بۆچوونی ئێمە مەسەلەی گرنگتر بۆ ئەمریکا لەم پەیوەندییدا ئەوەیە کە لە بەرامبەر ڕژیمی نوێی عێراق وەڵامدەر بین. ئێمە دەمانەوێت کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی نوێی عێراق وتووێژ بکەن. ئەگەر ئەم وتووێژانە سەرنەکەوێت، بەرژەوەندی ئێمە ئەو کاتە باشتر دەپارێزرێت کە دەوڵەتی عێراق بتوانێت کوردەکان کونترۆڵ بکات نە ئەوە کە شۆڕشی کورد ئەوەندە سەربکەوێت کە ببێتە هۆی دەستێوەردانی سۆڤیەت یا ئێران لە کێشەکەدا.

هال[١٢٤]

---

[124] HAL

**له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**واشنگتۆن، ٥ی نیسانی ١٩٦٣، کاتژمێر ٩:٧ ی سەرلەبەیانی**

**بابەت: نیگەرانی ئەمریکا لە ئەگەرە مەترسیدارەکانی سەرنەکەوتنی وتووێژەکانی نێوان کوردەکان و حکوومەتی عێراق و دەستپێکردنەوەی ناکۆکیەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لەندەن، ئانکارا و تاران ٣٣١ ـ لە وەڵامی تیلیگرامی ٦١١ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە عێراقدا [١٢٥]:

وەزارەتی دەرەوە رۆژبەرۆژ نیگەرانتر دەبێت لە ئەگەرە مەترسیدارەکانی سەرنەکەوتنی وتووێژەکانی نێوان کوردەکان و حکوومەتی عێراق و دەستپێکردنەوەی

---

[١٢٥] لە تیلیگرامی ژمارە ٦١١ لە ١ی نیسان، باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد، ناوەرۆکی پەیامەکەی رێبەری کورد، مەلامستەفا بارزانی ناردووە بۆ وەزارەتی دەرەوە. ئەم پەیامە لەلایەن جەلال تاڵەبانیەوە (کە سەرۆکی لیژنەی کورد بووە کە هاتووە بۆ بەغداد بۆ وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی عێراق) تەسلیم بە باڵوێزخانە کراوە. لەم پەیامەدا مەلا مستەفا پێشنیاری پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ ئەمریکا کردووە و داوای یارمەتی بۆ شۆڕشی کورد کردووە و هەروەها داوای کردووە لەگەڵ نوێنەری ئەمریکا دیدار بکات. لە وەڵامدا، کاربەدەستێکی باڵوێزخانە بە جەلال تاڵەبانی وتووە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کێشەی کورد بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی عێراق دەزانێت و یارمەتی نادات بە کوردەکان و هیچ کاربەدەستێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ناتوانێت لەگەڵ مەلامستەفا دیدار بکات.

ناکۆکیەکان. سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەنیسبەت کورد هەمان سیاسەتی پێشووە و نەگۆڕاوە واتا ئێمە کێشەی نێوان کوردەکان و حکوومەتی عێراق بە کێشەیەکی ئەستەم دەزانین. بەهەرحاڵ ئاکام و لێکەوتەکانی تێکچوونی وتووێژەکانی ئێستا ئەوندە مەترسیدارە کە دەبێت هەوڵ بدەین قەناعەت بە هەر دو لا بهێنین کە لە ڕێگای پێکەوەسازانێکی دولایەنە بگەن بە ڕێگاچارەیەکی بە قازانج. کەوابوو ئێوە لەگەڵ (جەلال) تاڵەبانی قسە بکەن بۆ ئەوەی پەیامی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بگەیەنێت بە مەلا مستەفا دەربارەی ئەوە کە ئێمە هەڵوێستەکانی کاربەدەستی باڵوێزخانەکەمان لە عێراق بەتەواوی پشتڕاست دەکەینەوە.

هەروەها ئێوە وەک باڵوێزخانەی ئەمریکا لە عێراق ڕێگەپێدراون هەرکام لە لایەنی کوردەکان یا دەوڵەتی عێراق بە شێوازی غەیرە فەرمی ئاگادار بکەنەوە کە باڵوێزخانە هیوادارە ڕێگاچارەیەکی گونجاو بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بۆ کوردەکان قازانجی زۆری تێدایە کە لە وتووێژەکانی ئێستادا بە شێوەیەکی مەعقول لەگەڵ دەوڵەتی عێراق ڕێکبکەون. ئێمە نامانەوێت لە بارەی وردەکارییەکانی ئەم سازشە قسەوباس بکەین.

باڵوێزخانە لە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکان دەتوانێ ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرێت :

١ـ دەستپێکردنەوەی ناکۆکیەکان دەتوانێ ئەو دەستکەوتانە لە ناو ببات کە تا ئێستا بە دەست هاتوون.

٢ـ قازانجی زیاتری کوردەکان لەوەدایە کە ببن بە بەشێک لە دەوڵەتی عێراق.

٣ـ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەرک بە ئامانجە ڕەواکانی کورد دەکات لە ناو دەوڵەتی عێراقدا و هاوخەمی ئەم ئامانجانەیە بەڵام بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بەوە نادات کە ئەم هاوخەمییە کار بکاتە سەر ئاوەڕۆبوونی پەیوەندییە زۆر نزیکەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ ڕژیمی نوێی عێراق.

٤- خواستی کوردەکان بۆ ئەوەی بە کەمتر لە سەرجەم ئامانجەکانیان رازی بن (کە لە روانگەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە واقعبینانە نییە) متمانەی زۆرتر لە نێوان هەر دوولا دروست دەکات کە شتێکی پێویستە بۆ ئارامبوونەوەی بارودۆخەکە و بەرێوەچوونی وتووێژێکی مەعقول بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی دیکە .

کەوابوو باڵوێزخانە دەبێ دەوڵەتی عێراق لەپەیوەندی لەگەڵ هەڵوێستەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کورد ئاگادار بکاتەوە و پێداگری لە سەر دەوڵەتی عێراق بکات کە خۆی ئامادە بکات داواکارییەکانی کوردەکان هەتا رادەیەکی مەعقول جێبەجێ بکات. باڵوێزخانە هەروەها دەبێ جەخت لە سەر ئەوە بکاتە کە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە نیسبەت کورد نەگۆڕاوە و ئەمریکا بەردەوام وەک کێشەی ناوخۆیی عێراق سەیری کێشەی کورد دەکات و نەیویستووە و نایەوێت راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ دەستێوردان لەم کێشەیەدا بکات.

ئێمە ئێستا لە بەر ئەوە دەستپێشخەری دەکەین کە قازانجی یەکلاییکەرەوەی ئێمە لەوەدایە کە دەوڵەتی عێراق بارودۆخی ناوخۆیی خۆی پتەو بکات. لە کاتێکدا کە ئێمە نامانەوێت بە وردی خۆمان بخەینە ناو ئەم مەسەلەیە بەڵام لە سەر ئەو باوەڕەین کە رێگاچارەیەکی گونجاوی پێکەوەسازانە بۆ کێشەی کورد، دەتوانێ و دەبێ بدۆزرێتەوە.

لە روانگەی ئێمەوە (بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ناکۆکیە تۆکمانەی کە ئێستا لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا هەیە) بەدگومانییە دوولایەنەکانی نێوان دەوڵەتی عێراق و کوردەکان، مەترسیەکی گەورەتر بۆ سەرکەوتنی وتووێژەکان دروست دەکات. کەوابوو جەختکردنەوە لە سەر رەفتاری دەستپێشخەرانەی دەوڵەتی عێراق دەتوانێ زۆر گرنگ بێت وەک ئەوەی کە عێراق رایگەیاندووە دەیەوێت بەندکراوە کوردەکان ئازاد بکات و کۆتایی بە گەمارۆی ئابووری لە سەر کوردەکان بهێنێت.

ئێمە لە سەر ئەوە پێدادەگرین کە دەوڵەتی عێراق بە لەسەرخۆیی و شێلگیرییەوە لەگەڵ کوردەکان وتووێژ بکات بۆ ئەوەی بگەن بە رێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە.

بۆ لەندەن: دەوڵەتی بریتانیا دەربارەی ئەو شتانەی کە وترا ئاگادار بکەنەوە و بڵێن ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیوادارە کە باڵوێزی بەریتانیا لە بەغداد بە هەمان شێوە ڕێنوێنی بکرێت.

روسک

## راپۆرتی کۆبوونەوەی گروپی تایبەت (CI) دەربارەی نیشانەکانی سەرهەڵدانەوەی ناکۆکییەکانی نێوان حکوومەتی عێراق و کوردەکان[126]

**واشنگتۆن، ١٦ی گوڵانی١٩٦٣، کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ**

**نهێنی**

**بابەت: نیشانەکانی سەرهەڵدانەوەی ناکۆکییەکانی نێوان حکوومەتی عێراق و کوردەکان**

بەشداربووان:

پارێزگار هاریمان، دادئەستێنی گشتی، بەڕێز گیلپاتری، ژنەراڵ تەیلۆر، بەڕێز فۆریستاڵ، بەڕێز کافین جێگری بەڕێز بیل، بەڕێز ویلسۆن، جێگری بەڕێز مۆرۆ، بەڕێز کارامسینیز، جێگری بەڕێز مەککۆن.

بەڕێز مارتین و بەڕێز بیلچێر (بۆ تەوەری ژمارە١ ئامادە بوون)

بەڕێز بۆولینگ (بۆ تەوەری ژمارە٣ ئامادە بوو )

بەڕێز ماشلینگ

---

[126] لە سەرەتای مانگی گوڵان وەزارەتی دەرەوە، باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لە بەغداد ڕێنوێنی کردووە کە بەحکوومەتی عێراق بڵێت درێژە بە وتووێژەکانی لەگەڵ کوردەکان بدات و دووری بکات لە دەستپێکردنەوەی شەڕ(بروسکەی ٥٨٣ بۆ لەندەن، ٤ی گوڵان، بنوارن بۆ: فایلە ناوەندییەکان (IRAQ 26 POL).

بەڕێز "کارامسنیز" لەبارەی هەڵسەنگاندنی تایبەت کە بۆ ئەم تەوەرە ئامادە کرابوو، وتی کۆمەڵێک هێما نیشان دەدات کە کوردەکانی عێراق و دەوڵەتی عێراق بۆ دوژمنایەتیکردنی یەکدی خۆیان ئامادە دەکەن. ئێمە هیچ نیشانەیەکی فەرمیمان لە بەردەستدا نییە دەربارەی ئەوەی کە سۆڤیەت یارمەتی چەک و تەقەمەنی دەدات بە کوردەکان یا نا.

ژنەراڵ "تەیلۆر" وتی ئێمە دەبێ لەم پەیوەندییەدا لەگەڵ بریتانیا و فەرانسا پەیوەندی بگرین. سەرۆکی کۆبوونەوەکە ئەوەی زیاد کرد کە ئەمە کێشەیەکی زۆر جیدییە و پێیوانییە کە دەوڵەتی عێراق بتوانێت بە شێوازێکی سەرکەوتوو لە بەرامبەر شۆڕشی کوردەکاندا (کە لەوانەیە رووبدات) رابوەستێت. ژنەراڵ "تەیلۆر" ئاماژەی بەوە کرد کە بوونی بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت لەم رووداوانە، نیشانەیەکی خراپە.

لە وەڵامی پرسیارێکی بەڕێز "فۆریستاڵ"دا، بەڕێز "کارامسینیز" وتی شا هەندێ یارمەتی و پشتگیری دەدات بە کوردەکان بەڵام یارمەتیە مادەییەکەی شا ئەوەندە نییە. کوردەکانی عێراق لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران وەک ناوچەیەکی پارێزراوی کاتی کەڵکیان وەرگرتووە و شا یارمەتی بە کوردەکان دەدات.

گروپی تایبەت رەزامەندی لە سەر ئەوە دەربڕی کە ئەم مەسەلەیە بە وردی لە لایەن CIAوە چاودێری بکرێت و بەردەوام راپۆرت بدرێت بە گروپ، ئەگەر بارودۆخەکە بەرەو خراپی بچێت. بەڕێز "بۆولینگ" وتی نیگەرانە بەنیسبەت ئەگەری دروستبوونی پەیوەندییەکی بەرفراوان لە نیوان کوردەکان و سۆڤیەت کە رێگا خۆش دەکات بۆ دابینکردنی پێداویستەکانی کوردەکان لە لایەن سۆڤیەتەوە.

سەرۆکی گروپ ئاماژەی بەوە کرد کە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران وەڵامی تیلگیرامی وەزارەتی دەرەوەی داوەتەوە و جەختی لە سەر هەوڵەکانی "تیمی وڵات" کردووتەوە بۆ یارمەتیدانی بەرنامەی چاکسازی زەوی و ئەو میتودانە کە لە رێگایانەوە ئێمە دەتوانین کار بکەینە سەر ئێران بۆ ئەوەی سیاسەتە داراییە کۆنەشۆپەکەی خۆی چاک بکات. سەرۆکی گروپ پێشنیاری کرد پاش ئەوەی

ئەم وەڵامە لە لایەن ئاژانسەکانی بەرپرسیاری واشنگتۆنەوە تاوتوێ کرا، بخرێتە بەردەم گروپی تایبەت.

جەیمز دینگیمان[١٢٧]

سکرتێری کارگێڕی گروپی تایبەت (CI)

127 - JAMES W. DINGEMAN

**له سکرتێری کارگێڕی وەزارەتی دەرەوە (بەڕێز مەککیسۆن[128])**

**بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (بەڕێز بۆندی[129])**

**واشنگتۆن، ٦ی ئابی ١٩٦٣**

**نهێنی**

**بابەت: هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە نامەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا**

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران لە ئەیرگرامی ٦٧ لە بەرواری ٣٠ی تەموزی ١٩٦٣ (کە کۆپیەکەی ناردراوە بۆ کۆشکی سپی) نامەیەکی مەلا مستەفا بارزانی (ڕێبەری هێزە شەڕکەرەکانی کوردی عێراق) بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکای بەدەست گەیشتووە کە تێیدا مەلا مستەفا بارزانی داوای لە سەرۆک کۆماری ئەمریکا کردووە پشتیوانی لە ئۆتۆنۆمی کورد لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا بکات.

بە بۆچوونی ئێمە وەڵامدانەوەی سەرۆک کۆمار بە نامەکەی بارزانی لەوانەیە زیان بە پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ عێراق بگەیەنێت، کەوابوو ئێمە پێشنیاری ئەوە دەکەین کە کونسولخانەی ئێمە لە تەورێز بە شێوازی زارەکی بە گوێرەی ڕێنوێنیە ستانداردەکانی سیاسەتەکەمان سەبارەت بە کوردەکانی عێراق، وەڵامی نوێنەرەکانی بارزانی بداتەوە واتا ئەوە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

---

128 - McKesson
129 - Bundy

هاوخەمە لەگەڵ ئامانجە ڕەواکانی کورد لە چوارچێوەی یەکپارچەیی عێراقدا بەڵام ئەم هاوخەمییەی ئێمە نابێت زەرەر لە پەیوەندییە زۆر نزیکەکانی ئێستای ئێمە لەگەڵ عێراق بدات. ئێمە پێشنیاری ئەوە دەکەین کە کونسولی ئێمە لە تەوریز هەنگاوێکی دیکە بچێتە پێش (زۆرتر لەو هەنگاوانەی کە باڵوێزی ئێمە لە ئێران پێشنیاری کردووە) و ئەگەر نامەی دیکەی بارزانی بە دەست گەیشت، پەیامەکەی بنێرێ بۆ وەزارەتی دەرەوە و خودی کونسولگەری بە نوێنەراتی لە لایەن دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە بە گوێرەی ڕێوشوێنە ئاماژە پێکراوەکان وەڵامی بداتەوە. ئێمە لە سەر ئەو بڕوایەین کە ئەگەر لە کونسولی ئێمە پرسیار کرا کە ئایا نامەکەی بارزانی تەسلیم بە واشنگتۆن کراوە و کونسول وەڵام بداتەوە بەلێ، ئەمە زەرەر بە پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و عێراق ناگەیەنێت. لە هەمان کاتدا وەڵامێکی وەها نیشان دەدات کە تەنانەت ئەگەر بە شێوازێکی سەمبولیکیش بێت ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نیگەرانی کوردەکانە و سەرنجیان پێ دەدات.

ئێمە پێشنیار دەکەین تیلیگرامی هاوپێچ[١٣٠] کە دەبێ کۆشکی سپی پەسەندی بکات، بنێردرێ بۆ تاران .

ج و دەیویس[١٣١]

---

[١٣٠] ئەم تیلیگرامە لە ٧ی ئاب نێردراوە بۆ تاران. لە ١٢ی ئەیلوول، "ڕێد" نامەیەکی دیکەی ناردووە بۆ "بۆندی" کە مەلا مستەفا بارزانی لە ١٨ی تەموز ناردبووی بۆ سەرۆک کۆمار "کنیدی" و لە ٢٧ی ئاب تەسلیم بە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران کراوە. ئەم نامەیە هاوشێوەی نامەکەی ١٢ی تەموز بووە. بەهەمان شێوە کە هیچ وەڵامێک بە نامەکەی ١٢ی تەموز نەدراوەتەوە، وەزارەتی دەرەوە هیچ وەڵامێکی بە نامەکەی ١٨ی تەموزیش نەداوەتەوە. لەسەر یادداشتنامەکەی وەزارەتی دەرەوە، "کۆمێر" نووسیویەتی: "ئێمە بە باڵوێزخانەمان وت بە نوێنەرەکانی مەلا مستەفا بڵێت نامەکە گەیشتووە بە دەستمان و ناردومانە بۆ واشنگتۆن بەڵام هیچ وەڵامێکی ئەرێنی پێ نەدراوەتەوە."

131 - J.W. DAVIS

**یادداشتنامەی سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا بۆ وەزیری بەرگری، بەڕێز مەکنامارا**

**Jcsm ـ ٦٢٣ ـ ٦٣**

**واشنگتۆن، ١٥ ی ئابی ١٩٦٣**

**نهێنی**

**بابەت: فرۆشی پێداویستی سەربازی لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە عێراق و پەیوەندی ئەو مەسەلەیە بە کێشەی کوردەوە**

١ـ بەلەبەرچاوگرتنی یادداشتنامەی یارمەتیدەری تەکنیکی وەزیری بەرگری (ISA) بە ژمارەی ٦٣ /٢٥٣٢١ ـ الە بەرواری ٢ی ئابی ١٩٦٣

٢ـ روانگەکانی سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا دەربارەی سیاسەتی ئەمریکا بۆ فرۆشتنی چەک بە عێراق (هەروەها کە لە نامەی JCSM ـ ١٩٧ ـ ١٦٣، بەرواری ٩ ی ئاداری ١٩٦٣دا هاتووە) بە گوێرەی ئەو بۆچوونە بوو کە پێشهاتەکانی دواتر، گەوهەری دژە کومونیستی دەوڵەتی عێراق ئاشکرا دەکات کە لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ هاتووەتە سەر دەسەڵات. رووداوەکانی دواتر ئەوەی پشتڕاست کردووەتەوە کە سیاسەتی دەوڵەتی عێراق ئەوەیە لە رێژەی بەستراوەبوونی خۆی بە پشتیوانی سۆڤیەت کەم بکاتەوە و کەسایەتییە شیوعیە مەحەلیەکان کونترۆڵ بکات. لەمە زیاتر سۆڤیەت بە پشتیوانیکردن لە هەوڵی خستنەرووی مەسەلەی کورد لە نەتەوە یەککگرتووەکان، بە ئاشکرا پشتیوانی خۆی لە کەسایەتیە شۆڕشگێڕە کوردەکان نیشان داوە کە زۆرتر بە زەیانی پەیوەندییەکانی سۆڤیەت و عێراقە. هەروەها چەند

نیشانەیەکی دیکە هەیە کە نیشان دەدات سۆڤیەت لەوانەیە بە ئەنقەست تەسلیمکردنی یارمەتی سەربازی بە عێراق دوا بخات.

٣ـ پێشهاتێکی دیکە کە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە هەڵکشانی حیزبی بەعس لە عێراق و سوریا و ناکۆکی بەعس و زیادەخوازییەکانی جمال عبدالناسر لە جیهانی عەرەبدایە. ئاشنایەتی سوریا لەگەڵ سیاسەتە دژە کومونیستیەکانی عێراق، یارمەتیدەر بووە بۆ کەمبوونەوەی کاریگەری سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. نایەکانگیریی بەردەوامی ناسر و حکوومەتی عێراق دەتوانێ گوشارەکان لە سەر پاشایەتیەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی و هەروەها ئیسرائیل و ئەندامە ناوچەییەکانی پەیمانی CENTO کەمتر بکات .

٤ـ هەرچەند کە دەوڵەتی عێراق نیازی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی سیاسەتێکی بێ لایەنانە لە نێوان بلوکی کومونیست و بلوکی رۆژئاوا بگرێتەبەر، بەڵام پێشهاتەکان نیشان دەدات ئەگەری نەمانی کاریگەری کومونیست لە عێراق و یەکرِیزبوونی عێراق و سوریا لەگەڵ رۆژئاوا (لە داهاتوویەکی نەچەندان نزیکدا) زۆرە. ئێمە دەبێ ئاگادار بین کە نەبینە هۆی بەدگومانبوونی عەرەبەکان بەنیسبەت قەسد و نیازەکانی ئەمریکا و هاوسەنگی هێزی سەربازی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێکنەدەین، بەواتایەکی دیکە بە زەرەری بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کار نەکەین لە رێگای پەیرِەوکردنی ئامانجگەلی ناواقعبینانەی کورتخایەن لە عێراق و سوریا. لەگەڵ ئەمەشدا سیاسەتی فرۆشتنی چەک لەلایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە عێراق دەبێ لە پێناو راکێشانی عێراق (و لەوانەیە سوریا) بەرەولای رۆژئاوا ( وەک سەرچاوەی سەرەکی کرِینی چەک و تەقەمەنی پێویست) بێت.

٥ـ هۆکاری پێویستیی دەستبەجێی عێراق بە چەک ئەوەیە کە دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات شۆرِشی کورد سەرکووت بکات و بتوانێت بگات بە ئاستێک کە یارمەتی دەوڵەتی سوریا بدات ئەگەر پێویست بکات.

الف ـ وەک ئامانجێکی درێژخایەن، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێ درێژە بە هەوڵەکانی بدات بۆ ئەوەی کوردەکان لە ناو سنوری نەتەوەیی عێراقدا بتاوێنەوە و

حکوومەتی عێراق مافی خۆبەڕێوەبردنێکی محەلی لە ناوچە زۆرتر کوردنشینەکان ببەخشێ بە کورد. بەهەرحاڵ درێژبوونەوەی ناکۆکی کوردەکان و دەوڵەت لە عێراق، سەقامگیری ئەم وڵاتە تووشی مەترسی دەکات و هەل دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی کومونیستەکان لە کێشەی کورد لە عێراق و لە وڵاتانی دراوسێ کەڵکی خراپ وەربگرن. قایمبوونی بارودۆخی سەربازی عێراق (لەگەڵ جێبەجێکردنی داخوازە ڕەواکانی کورد) باشترین و هیوابەخشترین ڕێگایە بۆ کۆتاییپێهاتنی ناکۆکیەکان بە زووترین کات و بەرەوپێشچوونی سەقامگیری ناوخۆیی لە عێراق. بۆ ئەم ئامانجە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێ وەڵامی ئەرێنی بداتەوە بە داخوازییە مەعقولەکانی عێراق بۆ کڕینی چەک و تەقەمەنی و هەوڵ بدات لە ڕێگای کاریگەرییەکی بەئەنجام، لە سەر میانەڕەوبوونی دەوڵەتی عێراق پێداگری بکات.

ب ـ هەروەها کە لە بڕگەی ٣دا ئامارەی پێکرا، ئەگەر عێراق توانایی ئەوەی هەبێت یارمەتی دەوڵەتی سوریا بدات بۆ ئەوەی ڕاپەڕینە سەرەکیەکان سەرکووت بکات، بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش دەبێت.

٦ـ هەرچەند کە داهاتی ئاسایی عێراق دەبێ وەڵامی خەرجی چەک و تەقەمەنی بۆ بەرگری لە وڵات بدات ( بێ ئەوەی کاریگەری نەرێنی هەبێت لە سەر ئابووری ئەو وڵاتە) خەرجی زۆری کڕینی چەک و تەقەمەنی لە هەموو وڵاتانی ڕۆژئاوا لە داهاتوویەکی نزیکدا دەتوانێ کاریگەری چارەسەرنەکراوی هەبێت لە سەر عێراق بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ خەرجی شاڵاوی سەربازی دژی کوردەکان هاوکات بێت. کەوابوو ئێمە دەتوانین لە کورتخایەندا یارمەتی بدەین بە سەقامگیری عێراق لە ڕێگای وەڵامدانەوە بە داخوازییە مەعقولەکانی عێراق بۆ متمانەی ئابووری.

٧ـ جگە لە پێویستیی هەموارکردنی کەندوکۆسپەکانی سەر ڕێگای پەرەسەندنی متمانەی ئابووری، سەرۆک ئەرکانی سوپا وتی سیاسەتی پەسەندکراوی ئێستای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ فرۆشتنی چەک بە عێراق بە تەواوی ڕێگە بەوە دەدات کە وەڵامی ئەرێنی بدرێتەوە بە عێراق بە گوێرەی ئامانجەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو مەسەلانە کە باس کرا، سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا پێشنیاری کرد کە:

الف - ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وەڵامی ئەرێنی بداتەوە بە داواکارییەکانی عێراق بۆ کڕینی چەک لە ئێمە کە لە چوارچێوەی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادایە و لە توانایی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاشدا هەیە.

ب - تەسلیمکردنی ئەم چەکە پەسەندکراوانە بە عێراق بە گوێرەی ئیمکان و گرنگ بوونی چەکەکان بە رەزامەندی لەگەڵ وەرگری چەکەکان بە زووترین کات ئەنجام دەدرێت.

ج- پێداویستیەکانی چەکەکان بە جیا بە عێراق دەفرۆشرێت، بەڵام ماوەی متمانەی ماددی هەتا کاتی پێویست دەدرێت بە وەرگری چەکەکان بۆ ئەوەی لە کورتخایەندا کاریگەری خراپی نەبێت لە سەر ئابووری عێراق.

د ـ لەگەڵ فرۆشیارانی دیکەی چەک لە نێو دەوڵەتانی جیهانی ئازاد راوێژ دەکرێت بۆ ئەوەی تەشویق بکرێن سیاسەتگەلێک هاوشێوەی سیاسەتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بگرنە بەر.

سەرۆک ئەرکانی سوپای ئەمریکا

جان م رەینۆڵدز[١٣٢]

ژنەراڵی گشتی، USAF

جێگری بەڕێوەبەر، سەرۆکایەتی ئەرکان

132 - JOHN M. REYNOLDS

## نامەی (شا)ی ئێران بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەربارەی عێراق و کێشەی کورد

## تاران، ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٦٤

## بابەت: پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد

جارێکی دیکە بگەڕێینەوە سەر مەسەلەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بارودۆخی عێراق ناسەقامگیرە. بە رووخانی رژێمی لەرزۆکی قاسم، ئێمە هیواداربووین کە پەیوەندی نزیکترمان لەگەڵ عێراق هەبێت و وابیرمان دەکردەوە کە بەهۆی ئەوەی کە بەعسیەکان وڵاتی عێراقیان لە کومونیستەکان پاک کردووەتەوە، ئێمە لە شەڕی دراوسێیەکی کێشەخولقێنەر رزگارمان بووە بەڵام بەهەرحاڵ خۆشبینیەکەمان زۆری نەخایاند چونکە ماوەیەکی کورت پاش ئەوە، بنکەی سیخۆڕی عەرەبەکانمان لە باشووری ئێران کەشف کرد کە چاوی تەماحیان بڕیوەتە بەشێکی تایبەتی جیانەکراوەی وڵاتی ئێمە (پارێزگای خوزستان) کە ناوەندی سەرەکی پیشەسازی نەوتی ئێمەیە.

بە رووخانی دەوڵەتی بەعس لە عێراق، ئەم مەترسییە وادیارە کەم بووەتەوە بەڵام بەهەرحاڵ بەدگومانییەکە هەر بەردەوامە. زانیارییەکانی ئێمە نیشان دەدات کە خودی "مارشاڵ عارف" بەتەواوی ئاگاداری ئەم چالاکیانە بووە و بەتەواوی پشتیوانی لێکردووە .

بەداخەوە دەبێ بڵێم کە پێشتر "مارشاڵ عارف" بەریانی بەرەولای میسر نیشان دابوو. ئەگەر من لەسەر ئەم مەسەلەیە پێدادەگرم و نیگەرانی خۆم دەردەبڕم لەبەر

ئەوەیە کە ئێمە بەتەواوی ئاگاداری پێشهاتەکانی ئەم ناوچەیە و ئەو ڕێگایەین کە ئەوان دەیانەوێت بیگرنە بەر.
دەبێ بڵێم هەڵوێستی ئێمە بەنیسبەت عێراق هەمیشە دۆستانە بووە و هەمیشە هیوادار بووینە کە عێراق دەوڵەتێکی بەهێز و سەقامگیری هەبێت کە بتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت و داکۆکی لە بەرژەوندییە نەتەوەییەکانی بکات.
کێشەی کورد هێشتا چارەسەر نەکراوە. داردەستەکانی کومونیزمی نێونەتەوەیی هەموو هەوڵێک دەدەن بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بە قازانجی خۆیان بقۆزنەوە و میسر دەیەوێت دەوری خۆی (کە بە بۆچوونی ئێمە دەورێکی گومانلێکراوە) لە هەموو پێشهاتەکانی ئەم بارودۆخەدا بگێڕێت. ئەگەر وتووێژەکانی نێوان حکوومەتی عێراق و کوردەکان هەرەسبهێنێت، چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە شەڕ لە بەهار دیسان دەست پێبکاتەوە .
ئێمە کۆمەڵێک راپۆرتی متمانەپێکراومان لە دەستدایە کە "سەرۆک کۆمار ناسر" هەوڵیداوە (و ئێستاش هەوڵ دەدات) ببێ بە ناوبژیوان لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی عێراق. ئەم هەوڵانە هەرچەند کە جێگای دەستخۆشییە، بەڵام بەتەواوی زیانی هەیە (بۆ ئێمە). بەهەرحاڵ ناوەرۆکی یەکێ لە پەیامەکانی ناسر بۆ کوردەکان، نیازخراپی ناسر بەنیسبەت ئێران بەتەواوی نیشان دەدات. بەگوێرەی زانیارییەکانی ئێمە، ناسر وتوویەتی کە جێگای داخە کوردەکان لەگەڵ عەرەبەکان شەڕ دەکەن و وتوویەتی بەتەواوی پشتیوانیان لێدەکات ئەگەر کوردەکان ئاراستەی شەڕەکە بگۆڕن بەرەولای ئێران. کەوابوو بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی عێراق و پێشکەوتنەکانی میسر لە یەمەن و شوێنەکانی دیکە کە وادیارە لە شوێنەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دەتەقێتەوە، ئەرک و بەرپرسیارەتییەکانی من بەنیسبەت وڵاتەکەم و خەڵکەکەم، ناچارم دەکات هەموو تەگبیرێکی پێویست بۆ پاراستنی وڵات و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانمان بگرمەبەر. ئێمە ناتوانین کاریگەری خراپکارانەی میسر لەبەر دەرگای ماڵەکەمان تەحەمول بکەین و بە مەسەلەیەکی جیدی دەزانین .

من پێموایە (هەروەها کە پێشتریش باسم کرد) سەقامگیری ئێران گرێدراوە بە ئاسایشی هەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەکاتێکدا کە ئێمە لە ئێران بۆ زامنکردنی ئاسایش و سەقامگیری وڵاتەکەمان و کەنداوی فارس هەوڵ دەدەین، یارمەتی دەوڵەتانی دیکەش دەدەین بۆ پاراستنی ئاشتی لە سەراسەری ئەم ناوچەیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرژەوندی یەکلاییکەرەوەی تێدا هەیە. خۆشبختانە لەم مەسەلەیەدا (هەر وەک مەسەلەکانی دیکە) ئێمە پەیوەندی نزیک و زۆر دۆستانەمان لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە و قەد روانگەی جیاوازمان نەبووە لەم پەیوەندییەدا.

جارێکی دیکە شادی و سەرکەوتنتان بۆ بە ئاوات دەخوازم لە خزمەتکردن بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئامانجی پێکهاتنی جیهانێکی ئازاد.

لەگەڵ ئەوپەڕی رێزمدا

محمد رەزا پەهلەوی

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد، ٢٤ی ئاداری ١٩٦٤**

**بابەت: سەردانی جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ عێراق و پەیوەندی ئەو مەسەلەیە بە کێشەی کوردەوە**

سەردانە لەناکاو و کورتەکەی [١٣٣] جێگری وەزیری دەرەوە، بەڕێز تالبۆت [١٣٤] لە عێراق لە رووی سیاسیەوە سەرکەوتوو بوو، سەرەڕای کورتبوونی سەردانەکە و سەرەڕای ئەو راستیە کە ئەو سەفەرە هاوکات بوو لەگەڵ رۆژی "جومعەی مسلمانان" و سەرەڕای ئەوەی کە پێداویستییەکانی ئەو سەفەرە لە ماوەیەکی کورتدا ئامادە کرابوو و سەرەڕای ئەوە کە بەڕێز تالبۆت ١٢ کاتژمێر درەنگ گەیشتە بەغداد ( لە ئانکاراوە) و سەرەڕای ئەو راستیە کە گەیشتنی بەڕێز "تالبۆت" هاوکات بوو لەگەڵ رێوڕەسمی رۆیشتنی "عارف"، سەرۆک کۆمار و "عبدالحەمید"، وەزیری دەرەوەی عێراق بۆ پاکستان و هیند لە فرۆکەخانەی بەغدادەوە .

جگە لە قسەوباسەکانی نێو باڵوێزخانە و سەردانە بازرگانی و کولتورییەکانی لە بابل و مۆزەخانەی عێراق، بەڕێز "تالبۆت" توانی لەگەڵ ژمارەیەک لە وەزیران و کەسایەتیە

---

[١٣٣] ئەم سەردانە لە کاتژمێر ٩:١٥ ی سەر لە بەیانی رۆژی ٢١ی ئادار تا کاتژمێر ٢:٣٠ پاش نیوەڕۆی ٢٢ی ئاداری خایاند. "تالبۆت" هەروەها سەردانی چەند وڵاتێکی رۆژهەڵاتی نزیکی کرد.

[134] - Talbot

بليمەتە سەربازی و مەدەنیەکان (لەوانە رێبەری میانەڕەوی کورد، بابا عەلی)[١٣٥] دیدار بکات و قسەوباسی نهێنی بکات لەگەڵ باڵوێزی بەریتانیا و جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق، بەڕێز "علی حیدر سلیمان" و بە شێوازی جیاواز لەگەڵ سەرۆک وەزیران و جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق دیدار بکات.

کەشوهەوای دیدارەکە ( کە رۆژی هەینی سارد بوو) رۆژی شەممە بەهۆی بانگهێشتە جۆراوجۆرەکان و ئێوارەخوانەکەی باڵوێز گەرم بوو. لە دوایین دیدار کە راست توزێک پێش لە گەڕانەوەی بەڕێز "تالبۆت" ئەنجام درا، وەزیرانی دەوڵەتی عێراق کاتێکی باشیان لەگەڵ بەڕێز "تالبۆت" بە سەر برد و سەبارەت بە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە نیسبەت ئیسرائیل باس و گفتوگۆیان کرد. هاوکات لەگەڵ ئەوەی وا باشتر بوو قسەوباسی زۆرتر لەم پەیوەندییەدا کرابایا بەڵام وەڵامەکانی بەڕێز "تالبۆت" زۆر کاریگەر بوو. پێشهاتی سەرەکی (کە دەتوانین کۆمەڵێک ئەنجامی جۆراوجۆری لێوەربگرین) گفتوگۆی ٥٠ خولەکی بەڕێز "تالبۆت" بوو لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق. سەرۆک وەزیران بەم دیدارە خۆشحاڵ بوو و باسی ئەو تەوەرانەی نەکرد کە مشتومڕی لە سەرە.

ئەنجامەکان:

١- کاربەدەستانی پایەبەرزی ئەمریکا لە عێراق پێشوازیان لێدەکرێت و بە ئەدەب و میهرەبانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت (بەپێچەوانەی ساڵانی رابردوو).

٢- دەوڵەتی عێراق رژیمێکی میانەڕەوە و نایەوێت مەسەلەی فەلەستین، پەیوەندییە دولایەنە پڕ قازانجەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا تێکبدات بەڵام

---

[١٣٥] هەروەها کە لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا ئاماژەی پێکراوە بابا عەلی کوڕی شیخ مەحموودی بەرزەنجی، رێبەری ناسراوی کوردستان بووە کە ئەو کاتە وەزیری کابینەی عێراق بووە و جارناجار وەک ناوبژیوانێکی بێ لایەن لە کاتی شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق لە نێوان ئەم دووو لایەنەدا ناوبژیوانی و وتووێژی کردووە (وەرگێڕ).

ئێمەش دەبێ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق لە بارەی سیاسەتەکانمان لەم ناوچەیە قسەوباس بکەین.

٣- دەوڵەتی عێراق چاوەڕوانی بەردەوامبوون و زیاد بوونی قازانجی ئابووری و یارمەتی تەکنیکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە عێراقە. بواری هاوکاری کولتووری و پەروەردەیی لە نێوان ئێمە و عێراق بەرفراوانە.

٤- دەوڵەتی عێراق لە راستیدا دەیەوێت کێشەی کورد بە شێوەیەک چارەسەر بکات کە زۆربەی کوردەکان رازی بکات و توندڕەوەکان پەراوێز بخات. دەوڵەتی عێراق دەیەوێت زیادەی بەرنامەی خۆراکی TITLE II جێبەجێ بکرێت.

٥- بارودۆخی سیاسی ئێستا، باشترین بارودۆخ بووە لە ماوەی ساڵانی رابردوودا و ئاسۆیەکی روون چاوەڕوان دەکرێت بۆ بەردەوامبوونی ئەم بارودۆخە. سەرۆک وەزیران و سەرۆک کۆماری عێراق هاوکاری یەکدی دەکەن.

رۆبیرت سی سترانگ[١٣٦]

---

[136] - ROBERT C. STRONG

## رەشنووسی ئامادەکراو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ کۆبوونەوەی دوازدەهەمینی وەزیرانی[۱۳۷] CENTO
## واشنگتۆن، ۲۸ ـ ۲۹ی نیسانی ۱۹٦٤
## بابەت: بارودۆخی کورد

پاش دوو ساڵ و نیو شەڕ– کە کوردەکان لە کاتێکدا کە لە لوتکەدا بوون توانیان یەکینە رێکوپێکەکانی سوپای عێراق تێوەبگلێنن و هەرەسیان پێبهێنن و لە کاتێکدا کە زۆر لاواز بوون توانیان ناوچە شاخاوییە بەرزە دەستپێڕاگەیشتووەکانیان رابگرن– دەوڵەتی عێراق و نوێنەرانی کورد لە ۱۰ی شوباتی ۱۹٦٤ لەسەر ئاگربەست رێککەوتن. بەداخەوە وادیارە بەهەڵەتێگەیشتنێک لە شەرت و مەرجەکانی ئەم رێککەوتنە دروست بووە. دەوڵەتی عێراق دەڵێت شەرتومەرجەکانی رێککەوتننامەکەی

---

[۱۳۷] دوانزەهەمین کۆبوونەوەی وەزیرانی پەیمانی رێکخراوی ناوەندی( CENTO) لە ۲۸ ـ ۲۹ی نیسان لە واشنگتۆن بەرێوە چوو و ئەم کەسانە بەشداریان تێدا کرد: وەزیری دەرەوەی ئێران، عەباس ئارام، وەزیری دەرەوەی پاکستان، زولفەقار عەلی بوتۆ، وەزیری دەرەوەی تورکیا، فەرەیدون جەمال ئەرکین، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، بوتلێر و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، روسک. "لی ف دینسمۆر" لە ئیدارەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک ئەم بەڵگەنامەیەی ئامادەی کردووە و پەسەند کراوە لەلایەن "دەیوێز"، "جیرنیگان"، جێگری بەرێوەبەری ئیدارەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و کاروباری ناوچەی باشووری ئاسیا، جان واڵش" و َبەرپەرسی کاروباری CENTOلە NEA/NR، "ماتیۆ ئیسمیت."

جێبەجێ کردووە و کوردەکانیش جەختیان لەسەر نیازخراپی دەوڵەت کردوەتەوە بۆ جێبەجێنەکردنی شەرت و مەرجەکانی (کوردەکان ئێستا داوای پوانی زۆرتر دەکەن لەو پوانانەی کە دەوڵەت ئێستا ئامادەیە پێیان ببەخشێت). لەگەڵ ئەمەشدا دەوڵەت یەکینەکانی سوپا و سازوبەرگی سەربازی لە باکوور کێشاوەتەوە و هەموو نیشانەیەکی دەرخستووە کە نایەوێت لەوە زیاتر لەگەڵ کوردەکان شەڕ بکات.

کۆمەڵێک راپۆرت هەیە دەربارەی ناکۆکی لە نێو کوردەکان، بەهۆی نەبوونی یەکڕیزی لە نێوان پێشمەرگە عەشیرەتیەکان و کادرە خوێندەوار و چاوکراوەترەکانی نێو حیزبە کوردەکە. پێشمەرگەکانی حیزبە کوردەکە هەڕەشەیان کردووە کە دەست بە توندوتیژی دەکەنەوە ئەگەر حکوومەت بە تەواوی ئەو ئۆتۆنۆمیانە پێ نەبەخشێت کە شەڕی بۆ دەکەن. رێگاچارەی کۆتایی هێشتا ناڕوونە و بەم زووانەش بەدی ناکرێت. لەهەمان کاتدا کۆمەڵێک راپۆرت هەیە دەربارەی دەستبەسەربوونی کۆمەڵێک کەس لە ناوچە کوردنشینەکانی ئێران کە بەشوێن هەمان ئامانجگەلی هاوشێوەدان کە کوردەکانی عێراق بە شوێنییەوەن. ئەم پێشهاتانە بەوردی لەژێر چاودێریدان. گڕوتینی ناسیونالیستیی کوردی لە ئێران شتێکی نوێی نییە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک کێشەیەکی ناوخۆیی سەیری نائارامی کورد لە ئێران دەکات (بە هەمان شێوە کە سەیری کێشەی کورد لە عێراق دەکات).

له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

بۆ[١٣٨]: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق

واشنگتۆن، ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٤، کاتژمێر ٦:١ی پاش نیوەڕۆ

نهێنی

بابەت: بارودۆخی هەستیاری کورد و دەوڵەتی عێراق

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە قاهیرە و بەیروت

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٩٢٤ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قاهیرە

نە شەوکەت عەقراوی[١٣٩] و نە لوقمان ئەلبارزانی[١٤٠] ناتوانن بەرژەوەندییەکانی کوردەکان لە واشنگتۆن بەرەوپێش بەرن. بە پێچەوانەوە، بارودۆخی هەستیاری نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق لەوانەیە خراپتر بێت بەهۆی ئەو گفتوگۆانە کە عەقراوی و لوقمان ئەلبارزانی لەگەڵ ناسیونالیستە کوردە ناسراوەکان لە واشنگتۆن دەیکەن.

---

[١٣٨] دینسمۆر بەڵگەنامەکەی ئامادە کردووە و بەرپرسانی کاروباری کۆماری یەکگرتوویی عەرەبی و کاروباری کۆماری عەرەبی سوریا، "کورتیز جۆنز"، "دەیویس"، "ویلیام وۆل (NEA/NE)"، "هالپریس (AID/MR/ARD)"و بەرپرسی بەشی AIDلە ئیدارەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک، "جەیمز فلینت" بینیوییانە و "جیرنیگان" پەسەندی کردووە.

139 Luqman al-Barzani
140 Shawqat Aqrawi

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق دەتوانێت وەک کاناڵێک کار بکات بۆ گەیاندنی مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە کوردەکانی عێراق بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و روونکردنەوەی هەڵوێستەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ کوردەکان .

وەزارەتی دەرەوە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە نوێنەرە کوردەکان هەرچەند کە لە کاتی سەردان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشوازیان لێکراوە بەڵام تەنها کاتی خۆیان لێرە (بۆ ئاگاداربوون لە کاردانەوەکانی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا) بەفیڕۆ دەدەن چونکە لەم پەیوەندییەدا دەتوانن لە رێگای باڵوێزخانەی ئێمە لە بەغداد وەڵام و راوێژی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وەربگرن.

لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە بەردەوام دەخرێنە ڕوو، دەڵێین:

١- خۆراکە زیادییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنها کاتێک دەخرێتە بەر دەستی وەرگرەکانی کە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق رێککەوتن بکرێت بۆ زامنکردنی ئەوەی کە خۆراکە پێشکەشیەکان دەگات بە دەستی وەرگرە راستەقینەکانی.

٢- ئەو داستانە راست نیە کە کوردەکان راپۆرتیان بە کاربەدەستی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قاهیرە داوە کە گوایە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەڵێنی بە کوردەکان داوە لە کاتی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە عێراق لە رێگای وڵاتێکی سێیەمەوە یارمەتییان بدات.

وەزارەتی دەرەوە دەیەوێت شتی زۆرتر دەربارەی ناسنامەی ئەو "کاناڵە نوێیە" بزانێت کە ئاماژەی پێکراوە.

روسک

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا له عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە**

**٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤**

**بابەت: هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت به رێککەوتننامەکەی دەوڵەتی عێراق و کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا له ئانکارا، تاران، بەسرە، بەیروت، قاهرە، دیمەشق، لەندەن و کونسولخانەی ئەمریکا له حەلەب و تەورێز

له ٢٣ی تشرینی یەکەم، مەسعود محمد[١٤١]، وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری باکووری عێراق ئاگاداری کردمەوە دەیەوێت ئەو رۆژە بەرەو باکووری عێراق بچێت بۆ جێبەجێکردنی تاقیکاری رەوتی رێککەوتنامەکەی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ کوردەکان کە له ئەنجامی چەند کۆبوونەوەیەک له نێوان خۆی و وەزیری ناوخۆ و سەرۆک ئەرکانی سوپا و سەرۆکی ئیستخباراتی سوپا و موتەسەریفەکانی باکوور بەدەست

---

[١٤١] مامۆستا مەسعود محمد کەسایەتییەکی ئەدیب، رۆشنبیر و دڵسۆزی خەڵکی کۆیە بوو کە ساڵی ١٩٦٤ بە رەزامەندی رێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلوول کرا بە وەزیری کاروباری باکوور له ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق و له ١٥ی گوڵانی ١٩٦٥ دەستی لەکار کێشایەوە. مامۆستا مەسعود محمد له ١ی ٤ی ٢٠٠٢ له شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد و له شاری کۆیە بەخاک سپێردرا. وەرگێڕ.

هاتووه[١٤٢]. ئێستا دەوڵەتی عێراق خۆی ئامادە دەکات بۆ هەڵگرتنی یەکەم هەنگاو لەم پرۆسەیەدا کە بریتیە لە:

١- ئازادکردنی سەرجەم بەندکراوە کوردەکان، لەوانە ئەوانەی کە تاوانی سەربازییان خراوەتە پاڵ

٢- گەڕانەوەی کارمەندانی کورد بۆ سەر پۆستە پێشووەکانیان بەتایبەت لە باکوور

٣ - بردنە دەرەوەی فەوجی سلاح الدین لە باکوور

٤- بردنەدەرەوەی عەشیرەتە عەرەبەکان لە ناوچە کوردنشینەکان و گەڕانەوەی ئەو کوردانەی کە لە گوندەکانیان دەرکراون

٥- قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسانەی کە لە میانەی ئەم کێشانەی دواییە، زەرەرمەند بوونە .

دوابەدوای ئەم کردەوانەی حکومەتی عێراق، کوردەکانیش دەبێ ئەم هەنگاوانە هەڵبگرن:

١- پێشمەرگە لە جادە سەرەکییەکان پاشەکشە بکات و هێرشەکانی رابوەستێنێ.

٢- ئەو چەکانە تەسلیم بە حکوومەت بکەنەوە کە لە سوپای عێراق سەندوویانە (مەسعود وتی تەسلیمکردنەوەی چەکەکان بۆ پاراستنی شەرەفی دەوڵەتی عێراقە).

٣- رێگە بدەن بە پێکهاتنی ئیدارەی مەحەلی کە زۆرتر لە کوردەکان پێکدێت بەڵام لە ژێر چاودێری دەوڵەتی عێراقدا بێت.

---

[١٤٢] لە تیلیگرامی ٧٦٥ی ٢٨ی تشرینی یەکەمدا هاتووە کە وەزارەتی دەرەوە پشتیوانی لەو پێشامەدانە دەکات کە لە تیلیگرامی ١٣٦٢دا راپۆرت دراوە و لەگەڵ ئەو هێڵە هاوڕایە کە باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق گرتویەتیەبەر. لە پەیامەکەدا هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە گفتوگۆی مەسعود لەگەڵ باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق نیشان دەدات کە بارودۆخێک هاتووەتە پێش کە کوردەکان لە دەرونی خۆیاندا ئەمریکا بە پشتیوانی خۆیان دەزانن بێ ئەوەی ئەمریکا بەشوێنی ئەوەدابێت کە لەم پەیوەندییەدا دەور ببینێت.

ئەگەر ئەم کردەوانە جێبەجێ بێت، حکومەتی عێراق و کوردەکان دەبێ دابنیشن و ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بدۆزنەوە. مەسعود چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە پاش هەفتەیەک لە باکوور بگەڕێتەوە و کوردەکان ئەم پێشنیارانە قبوڵ بکەن، چونکە ئەم پێشنیارانە نیازپاکی دەوڵەتی عێراق دەردەخات. مەسعود جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە مەلا مستەفا وەک کلیلی چارەسەرکردنی کێشەی کورد سەیری دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات و دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێت لەم پەیوەندییەدا هەنگاو هەڵبگرێت. مەسعود هەروەها وتی مەلا مستەفا بەو هاوکارە عێراقیانەی کە لەگەڵ من ڕەوانەی کردبوون وتوویەتی کە دەیەوێت لە سەر ڕێککەوتننامەی تاقیکاری گفتوگۆ بکات.

هەڵسەنگاندن: هەرچەند ئەم هەنگاوە سەرەتاییانەی دەوڵەتی عێراق بە واتای قبوڵکردنی داواکارییە سیاسیەکانی کورد نییە بەڵام ئەو هەنگاوانەی تێدایە کە کوردەکان هەمیشە بۆ سەلماندنی نیازپاکی دەوڵەتی عێراق داوایان کردووە. کەوابوو بۆ کوردەکان قبوڵکردنی ئەو پێشنیارە ئاسانە کە ئەو چەکانە تەسلیم بە حکوومەت بکەنەوە و تەنانەت ئەگەر ژمارەی ئەم چەکانەش کەم بێت حکوومەت قبوڵی دەکات. ئەگەر حکوومەتی عێراق و کوردەکان بەرپرسیارەتییەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن وتووێژی سیاسی دەتوانێت بەردەوام بێت .

مەسعود خوی بە بزوێنەری سەرەکی خولقانی ئەم بارودۆخە نوێیە دادەنا بەڵام لە سەر ئەوە کۆک بوو کە میسر هۆکارێکی گەورە بووە لەم پەیوەندییەدا چونکە چارەسەرنەکردنی کێشە ناوخۆییەکانی عێراق دەبێتە هۆکاری دواکەوتنی یەکگرتوویی.[١٤٣]

بەهەرحاڵ هەر ئەوە کە حکوومەتی عێراق دەیەوێت هەنگاوی یەکەم هەڵبگرێت شتێکی گرنگە و نیشانەی بەفەرمیناسینی ناڕاستەوخۆی هەڵوێستی بەهێزی کوردەکان و کاریگەرییەکانی گوشاری میسرە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەڵسەنگاندنەی باڵوێزخانە دەربارەی ئەوەی کە نە حکوومەتی عێراق و نە مەلا مستەفا بارزانی

---

[١٤٣]- مەبەستی یەکگرتوویی جیهانە عەرەبە لە بەرامبەر ئیسرائیل - وەرگێڕ.

نایانەوێت ناکۆکییەکان سەرهەڵبداتەوە، پێشنیاری ئێستای حکوومەتی عێراق لەوانەیە ببێت بە خاڵی وەرچەرخان.

لە کاتی گفتوگۆکەماندا، مەسعود محمد چەند جار وتی مەلا مستەفا گوێ لە مۆچیاری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەگرێت. منیش بە شێوازێکی جەوهەری بە "مەسعود محمد"م وت کە:

١ـ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیوادارە چارەسەرییەکی ئاشتیخوازانە لە چوارچێوەی عێراق، بێ دەستێوەردانی بیانی بۆ ئەم کێشەیە بدۆزرێتەوە.

٢ـ کوردەکان دەبێ لەگەڵ حکوومەتی عێراق هاوکاری بکەن چونکە هیچیان نییە لە دەستی بدن.

٣ـ کوردەکان بەنیسبەت وتووێژە درێژخایەنەکان لە سەر چارەسەری سیاسی ناوخۆیی دەبێ لەسەرخۆ بن و ئامادەبن لە سەر داخوازە گەورەکانیان سازش بکەن.

هەروەها وترا کە ئامانجی کورد باشتر دەپارێزرێت ئەگەر کوردەکان نەبن بە داردەستی کەسانی دیکە و دەبێ دوری بکەن لەوەی کە خۆیان بۆ قازانجی کەسانی دیکە بکەن بە قوربانی.

لە کۆتایی گفتوگۆکەماندا، مەسعود زۆر بە جیدی پرسیاری ئەوەی لێمکرد ئایا لە کاتی سازبوونی کێشە دەتوانێ داوای پەنابەری سیاسی لە باڵوێزخانەی ئەمریکا بکات[١٤٤]. منیش پێموت ئەم مەسەلەیە لە کاتی خۆیدا بریاری لەسەر دەدرێت بەڵام

---

[١٤٤]ـ مامۆستا مەسعود محمد لە کتێبی بیرەوەریەکانیدا بەم شێوەیە باسی ئەو مەسەلەیە دەکات:
" ئەوەندەش دەزانم کە من بە تەمای هیچ شتێک ئەو داوەتەم (خوانەکەی لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا – وەرگێڕ) پەسەند نەکردبوو. تەنها یەک نوختەم لەمێشکدا بوو ئەویش ئایا ئەگەر لە بارێکدا کەوتمە مەترسی و گیران و خەتەری کوشندەوە دەتوانم پەنا بۆ سەفارەتی ئەوان ببەم؟ ڕووداوی ١٩٦٣م لەبیر بوو، نەمدەویست دووچاری وەزعێکی وەک ئەوسا ببمەوە. ( سەفیری ئەمریکا) وتی ئێمە لە سیاسەتماندا نیە تەمای پەناهێنان بۆ لامان لەبەر کەس بنێین، حەزیش ناکەین کەس پەنامان بۆ بهێنێ بەڵام کە کار گەیشتە خەتەری کوشندە دەرگا لە ڕووی هەڕەشەلێکراو داناخەین. ڕەنگە قسەکانی ڕاستییەکی ڕووت بن و ڕەنگیشە پەردەیەکی دیپلۆماسیانەی بێت بەسەر موجامەلەکردن

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەم کردەوانە تەشویق ناکات. لەوانەیە مەبەستی مەسعود ئەوە بووبێ ئەوەم پێبڵێت کە لە ژێر گوشارێکی گراندا کار دەکات. ئەمە لەوانەیە راست بێت. مەسعود لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە لەوانەیە کوردە توندڕەوەکان لە بەغداد دەست بە گرژییەکی رەگەزی خوێناوی بکەن و ژیانی ئەو بکەوێتە ناو مەترسییەوە.

**هاوپێچ//**

لە ٢٤ی تشرینی یەکەم لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق گفتوگۆم کرد. لە کۆتایی گفتوگۆکەماندا بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو دەنگۆیانە کە لەوانەیە وەزیری دەرەوەی عێراق سەبارەت بە خوانی ئێوارەکەم لەگەڵ مەسعود بیبیسێت، بە (وەزیری دەرەوەی عێراق)م وت کە بە "مەسعود"م وتووە:

١- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوام لایەنگری چارەسەرییەکی ئاشتیخوازانە و وتووێژکارانەیە بۆ کێشەی کورد.

٢- بەکارهێنانی هێزی سەربازی ناتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات.

٣- هێماکان وا نیشان دەدات کە دەوڵەتی عێراق نایەوێت کردەوەی سەربازی زۆرتر ئەنجام بدات .

٤- کوردەکان زۆر مۆچیاری کراون کە بە گوێرەی ئەو رێککەوتننامەیە کاربکەن کە بە هەوڵی مەسعود لەگەڵ دەوڵەتی عێراق پێکیانهێناوە .

٥- دەتوانین چاوەڕوان بکەین ئایا حکوومەتی عێراق بە نیاز پاکی کار دەکات.

٦- ئەگەر دەوڵەتی عێراق بە نیازپاکی کاری کرد کوردەکانیش بەرپرسیارن کە بەهەمان شێوە کار بکەن.

٧- لە کاتی وتووێژی سیاسیدا، کوردەکانیش دەبێ ئەوە قبوڵ بکەن کە ئەم رەوتە رەوتێکی ئاڵوزە و دەبێ بە لەسەرخۆییەوە نزیک ببنەوە.

---

لەگەڵ مندا کە بە قسەی توێکڵدار تێمبگەیەنێ رەت ناکرێمەوە. ( مەسعود محمد، گەشتی ژیانم، لاپەڕەی ٤١٥، چاپی دوەم، کوردستان، ١٩٩٩). وەرگێڕ

٨ـ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت بکەوێتە ناو وردەکارییەکانی ئەم کێشەیە .

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی دەرک بە هەڵوێستی ئێمە دەکات و سوپاسی وتەکانی منی کرد. لە قسەکانی وەزیری دەرەوەدا هیچ نیشانەیەک بەدی نەدەکرا کە مەبەستی دەستێوەردانی ئێمە لە کێشەی کوردەکان بێت و قسەکانی زۆر دۆستانە و نەرم بوو .

هەڵسەنگاندن: گوازتنەوەی لەشکری ٣ی سوپای عێراق بۆ H ـ3 پێگەی کوردەکان بەهێزتر دەکات و گوشارەکان لە سەر دەوڵەتی عێراق زیاتر دەکات بۆ ئەوەی کێشەی کوردەکان چارەسەر بکات. ئەمە یەکێ لە پێشنیارەکانی میسر بوو( لە سەر داواکاری UAC ) کە عێراق لەشکری ٣ی خۆی بگوازێتەوە.

"سترانگ"

## گفتوگۆی لێژنەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتی عێراق دەربارەی کێشەی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان

## نیویۆرک، ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٤، کاتژمێر ٤:٣٠ پاش نیوەڕۆ

## 28/ MC / DEL SEE

**بابەت: کێشەی کورد**

بەشداربووان:

- بەڕێز واڵش[١٤٥] لە لایەن NEA

- وەزیری دەرەوەی عێراق، ناجی تالیب

- جێگری وەزیرە دەرەوەی عێراق، خادم خەلاف

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی دەیەوێت سەرنجی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بەرەولای بارودۆخی کورد رابکێشێت. وەزیری دەرەوەی عێراق هەروەها وتی کێشەی کورد لەبنەڕەتدا بەسەر کەشوهەوای عێراقدا زاڵ بووە و تەواوی کاتی دەوڵەتی عێراق بەم کێشەیە گیراوە و دەوڵەتی عێراق کاتێکی ئەوەندە یا وزەیەکی ئەوتۆی بۆ تاوتوێکردنی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی دیکەی وڵات نەماوە. ناوبراو لەوە دڵنیا نەبوو کە لەچاو چەند ساڵ پێش (کە شەڕی کورد و حکوومەت هەڵنەگیرسابوو) ئێستا چارەسەری کێشەکە نزیکتر بێت.

---

[١٤٥] واڵش لە ١١ی کانوونی یەکەم ئەم راپۆرتەی ئامادەی کردووە و لە ١٧ی کانوونی یەکەم لە ئۆفیسی وەزیری دەرەوە پەسەند کراوە. یادداشتنامەکە سێ بەشە کە ئەمە بەشی یەکەمیەتی.

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی ناتوانێت لە هەندێ لە فاکتۆرەکانی کێشەی کورد تێبگات، مەبەستی ئەوە بوو کە هەندێ هێزی نەناسراو هەن کە پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن. ناوبراو وتی:

" کوردەکان خەڵکێکی هەژارن و وڵاتەکەیان بە هۆی شەڕ کاول بووە و دیار نییە پارەی کڕینی خۆراک، چەک و پێداویستیەکانیان لە کوێ دێنن؟ کێن ئەم هێزە ڕەمزناکانە کە پشتیوانی لە کورد دەکەن و چییان دەوێت؟".

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی دەوڵەتەکەی لەوانەیە بتوانێت لەگەڵ مەلامستەفا بارزانی مامەڵە بکات بەڵام مامەڵەکردن لەگەڵ شیوعیەکان و پارتی دیموکراتی کوردستان زۆر زەحمەتە. بە بۆچوونی وەزیری دەرەوەی عێراق، کوردەکان لە لایەن شیوعیەکانەوە کونترۆڵ دەکرێن و ئەگەر دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێت، دەبێت بە کیانێکی کومونیستی کە درز دەخاتە ناو جیهانی عەرەبی و کەمەربەندی پاراستنی پەیمانی[١٤٦] CENTO دەبچڕێنێت و تورکیا و ئێران ناسەقامگیر دەکات. ناوبراو وتی نەقشەیەکی کوردستانم بینیوە کە وڵاتی کوردی لە ئیسکەندرون(تورکیا) بۆ بەسرە (لە عێراق) ڕاکێشابوو.

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی دەوڵەتی تورکیا سنووری ناوچە کوردنشینەکانی خۆی قەپات کردووە بەڵام لە ڕێگای سنووری درێژی ئێرانەوە هەندێ پشتیوانی لە کوردەکان دەکرێت. ئەم پشتیوانییە لەوە ناچێت ئاکامی سیاسەتی دەوڵەتی ئێران بێت بەڵکو نیشانەی ناتوانی دەوڵەتێکی لاوازە کە ناتوانێت سنوورەکانی بپارێزێت. وەزیری دەرەوەی عێراق جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نایەوێت ئەوە بڵێت کە

---

[١٤٦] CENTO (ڕێکخراوی پەیمانی ناوەندی) ڕێکخراوێکی سەربازی بوو کە ساڵی ١٩٥٩ بە بەشداری بەریتانیا، تورکیا، پاکستان، ئێران و بە هاوکاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزرا و جێگای "پەیمانی بەغداد"ی گرتەوە. ئەم پەیماننامەیە ئاڵقەی زنجیرە سیستمی بەرگری و هێرشی ڕۆژئاوا بوو کە ڕێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور(NATO) و ڕێکخراوی پەیمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (CETO) بە یەکەوە دەبەستەوە. (وەرگێڕ)

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە کوردەکان دەکات بەڵام دەوڵەتەکەی سەری سوڕماوە لە پیلانی هەندێ لە هێزە رمزناکەکان کە پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن.

لە وەڵامدا وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وەزیری دەرەوەی عێراقی دڵنیا کردەوە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە شێوازی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پشتیوانی لە بزووتنەوەی کورد ناکات و پشتیوانی سەربەخۆیی، یەکپارچەیی و خۆشبەختی عێراقە و هیچ بەرژەوەندییەکی دیکەی نییە. هەروەها وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق هاوڕا بوو بەنیسبەت مەترسیەکانی دزەکردنی کومونیزم لە رۆژهەڵاتی نزیک لە رێگای "بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد"ەوە.

وەزیری دەرەوەی عێراق وتی زۆر خۆشحاڵ بووە لە ئاڵوگۆڕ کردنی بیروڕا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و لە سیاسەتی ئەمریکا دڵنیا بووەتەوە. ناوبراو هەروەها وتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێ یارمەتی عێراق بدات لە رێگای دیاری کردنی ئەوەی کە سەرچاوەی دارایی و دابینکردنی پێداویستەکانی کوردەکان کێیە و هانای ئەم سەرچاوەیە چییە بۆ یارمەتیدانی کوردەکان.

له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا

بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا لە عێراق

واشنگتۆن، ١٤ی كانوونی یەكەمی ١٩٦٤، كاتژمێر ٧:٤٤ ی پاش نیوەڕۆ

نهێنی

بابەت: روانگەی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا سەبارەت بە بەشداریكردنی كوردەكان لە هەر پیلانێك دژی دەوڵەتی عێراق[١٤٧]

ئاماژە بە: NIT: - Noforn/ 6583

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكا گەیشتووەتە ئەو قەناعەتە كە بەشداربوونی كوردەكان لە هەر پیلانێك بۆ رووخانی رژیمی عێراق، نابێت بە زامنی ئەوەی كە رژێمێك بێتە سەر دەسەڵات كە لە ئامانجەكانی كوردەكان نزیكتر بێت. جمال عبدالناسر بە زەحمەت دەتوانێت درێژە بە دەوری ئێستای خۆی بدات بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەیەكی ئاشتیخوازانە بۆ كێشەی كورد و رێككەوتن لە نێوان حكوومەتی عێراق و كوردەكاندا، بەتایبەت بەهۆی پیلانگێڕییەكانی ئێران. لەمە زیاتر ئەگەر دەوڵەتێكی نوێش بگات بە

---

[١٤٧] "دنیسمۆر" لە ١١ی كانوونی یەكەم ئەم راپۆرتەی ئامادەی كردووە و جێگری بەڕێوەبەری ئیدارەی كاروباری یۆنان، توركیا، ئێران، "جان مۆوییسۆن" و "دەیویس" بینیویانە و "تالبۆت" پەسەندی كردووە و وێنەیەكی نێردراوە بۆ تاران.

دەسەڵات، کوردەکان هێشتا روبەڕوی گیروگرفت دەبنەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق .

کوردەکان خۆیان وانیشان دەدەن کە دەیانەوێت لەگەڵ پیلانی ئێران دژی دەوڵەتی عێراق هاوکاری بکەن، کەوابوو دەبنە هۆی بەدگومانی قوڵی عەرەبەکان و زیان دەگەیەنن بە داواکارییەکانی خۆیان. تا ئێستا گەلێ لە عەرەبەکان تا رادەیەک خەمخۆری کوردەکان بوونە. بەهەرحاڵ چاوەڕوان ناکرێت هیچکام لە دەوڵەتەکانی دواتری عێراق بە گەورەیی و لێبوردوییەوە مامەڵە لەگەڵ کوردەکان بکەن یان داوای لێبوردن لە ئێران بکەن. پەیوەندی ئێران لەگەڵ ئەم پیلانە درەنگ یا زوو ئاشکرا دەبێت و چاودێری توندی ئەم دواییانەی دەوڵەتی عێراق بە سەر کومونیستەکان و هەوڵەکانی حیزبی بەعس بۆ رووخانی رژیمی ئێستای عێراق (بە گوێرەی راپۆرتە جۆراوجۆرەکانیCAS) دەمانباتە سەر ئەو قەناعەتە کە دەوڵەتی عێراق ئاگاداری چالاکیە خراپکارانەکانی ئێرانە.

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە عێراق دەبێ رێگایەک بدۆزێتەوە (بێ ئاشکراکردنی زانیارییەکان) بۆ ئەوەی کوردەکان ئاگادار بن کە روانگەی ئێمە چییە بەنیسبەت بەشداریکردنیان لە هەر پیلانێک دژی دەوڵەتی عێراق، لەوانە کودیتا.

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا له عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد، ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٤، کاتژمێر ٣ ی پاش نیوەڕۆ**

**نهێنی**

**بابەت: هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە هەوڵەکانی ئێران بۆ هاندانی کوردەکانی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران و ئانکارا

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٤٣ی وەزارەتی دەرەوە:

کوردەکان پێمانیان وت دەوڵەتی ئێران پێداگری کردوە لە سەریان کە دەست بە شەڕ بکەنەوە (تیلیگرامی ٤٥٨ی باڵوێزخانە)، بەڵام کوردەکان دەزانن بزوێنەری ئێران بۆ ئەم کارە چییە. ئێمە پێشتر بە کوردەکانمان وتووە نابێت وەک داردەستی کەسانی دیکە کار بکەن یان خۆیان بکەن بە قوربانی بەرژەوەندییەکانی کەسانی دیکە (تیلیگرامی ٣٦٢ی باڵوێزخانە) و نابێت گوێ لەو کەسانە بگرن کە دەیانەوێت شەڕ دەست پێبکاتەوە (گفتوگۆی ئاکین[١٤٨] لەگەڵ عەقراوی، ٨ی کانوونی یەکەم). مەسعود محمد و "عەقراوی" دەزانن مەبەستی ئێمە چییە. من لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ وەزیرەی دەروەی عێراق (هاوپێچی تیلیگرامی٣٦٢ی باڵوێزخانە ) لە ٢٤ی تشرینی

---

148 Akin

یەکەم باسی ئەم بابەتەم لەگەڵ مەسعود محمد کرد بەڵام بۆ "سوبحی عەبدوالحەمید"[149]م نەدرکاند.

کاربەدەستێکی باڵوێزخانە بەرنامەی داناوە بۆ ئەوەی لە لە ١٩ی کانوونی یەکەم لەگەڵ نوێنەرانی مەلا مستەفا و ئەندامانی نوێی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان دیدار بکات. لەم دیدارەدا کاربەدەستی باڵوێزخانە بێ ئەوەی ئاماژە بە هیچ پیلانێکی تایبەت بکات، باسی وتەکانی پێشوو دەکات لەبارەی ئەوەی کە ئێرانیەکان هەوڵ دەدەن کوردەکان بخەنە ناو جمۆجۆڵ و پێیان دەڵێت بە بۆچوونی ئێمە کوردەکان باشیان کردووە لە بەرامبەر دەمتەڕی ئێران راوەستاون و هیوادارین هەروەها ئارام بن و هەوڵ بدەن بگەن بە رێگاچارەیەک لەگەڵ دەوڵەتی عێراق (کە زۆربەی وەزیرەکانی بەریانیان بەرەولای کوردەکان هەیە).

به بۆچوونی ئێمە ئامانجی کوردەکان لە عێراق بە توندی تووشی زیان دەبێت ئەگەر کوردەکان وەک داردەستی بەرژەوەندییەکانی کەسانی دیکە کار بکەن. دەبێ لەبیرمان بێت کوردەکان پێویستیان بە هێڵی دابینکردنی پێداویستیەکانیان هەیە لە رێگای ئێرانەوە و تەنها لە رێگای پێشنیاری یارمەتی بەرەولای ئێرانییەکان رادەکێشرێن. ئەم هۆکارانە تەنها کاتێک لە گرنگی دەکەون کە دەوڵەتی عێراق نیازپاکی خۆی نیشان بدات و ئەوە بسەلمێنێت کە دەیەوێت وتووێژی راستەقینە بکات لەگەڵ کوردەکان. ئەگەر حکوومەتی عێراق وابکات، کوردەکان بەشداری ناکەن لە پیلانی ئێراندا هەرچەند کە لەوانەیە هەندێ لە ناسیونالیستە کوردە شارنشینەکان بەشێوازی سەربەخۆ کار بکەن.

به بۆچوونی" عەقراوی" (کە بە وتەی ناوبراو، مەلا مستەفاش لە سەر ئەم باوەڕەیە) جمال عبدالناسر خوازیاری چارەسەری ئاشتیخوازانەی کێشەکەیە و هەر رژیمێکیش کە جێگای دەوڵەتی ئێستای عێراق بگرێتەوە (بەتایبەت ئەگەر رژیمێکی دیکتاتوری سەربازی بێت) لە دەوڵەتی ئێستای عێراق ئاشتیخوازتر نابێت بەڵام ئەگەر دەوڵەتی عێراق بەم زووانە بە ئاشکرا نیازی خۆی بۆ وتووێژ نیشان نەدات، مەلا

---

[149] Subhi Abd al-Hamid

مستەفا دەگاتە ئەو ئەنجامە کە دەوڵەتی عێراق لە مانگی شوباتی رابردووەوە بە نیازخراپی کاری کردووە (هەر وەک چۆن زۆربەی کوردەکان پێشتر گەیشتوونەتە سەر ئەو قەناعەتە). ئەو کاتە ئیدی مەلا مستەفا بۆ دەستپێکردنەوەی شۆڕش پێویستی بە تەشویقی دەرەکی نامێنێت و خۆی دەست بە کار دەبێت. لە حاڵێکدا کە بە هیچ شێوەیەک ناکرێت لە پێشەوە مەزەندەی ئەوە بکەین کە ئەم پێشهاتە کەی روو دەدات بەڵام بەهەرحاڵ کوردەکان بێکار دانانیشن. ئەگەر شەڕ دەست پێبکاتەوە، چاوەروانکردنی ئەوە زەحمەتە کە کوردەکان یارمەتی ماددی و پارە لە ئێران وەرنەگرن.

رەنجاندی ناسر یان هەڵسانی رق و کینەی عەرەبەکان (کە گەلێکیان هاوخەمی کوردەکان نین) دەبێت بە مایەی نیگەرانی کوردەکان. ئەگەر شەڕ دەست پێبکاتەوە، کەندوکۆسپەکانی ئێستای سەر رێگای ئامانجەکانی کورد لەوانەیە لەناو بچێت و کێشەی کورد ببێ بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی و ئاکام و لێکەوتەی جیدی بە دواوە بێت[١٥٠].

سترانگ

[١٥٠] لە تیلیگرامی ژمارە ٣٥٠ی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ باڵوێزخانەی بەغداد لە ١٦ی کانوونی یەکەم، ئاماژە بەوە کراوە کە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە عێراق دەبێ پێداگری لەسەر هەموو تاقم و گروپە کوردەکان بکات کە دەست بە شەڕ نەکەنەوە و بانگەشەکانی کوردەکان بە درۆ بخاتەوە کە ئێران پێداگری لەسەر کوردەکان کردووە دەست بەشەڕ بکەنەوە.

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە**

**١٢ی نیسانی ١٩٦٥**

**بابەت: مەلا مستەفا بارزانی داوای یارمەتی مادی و سەربازی لە ئەمریکا دەکات**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەغداد، ئانکارا، قاهیرە

پیاوێک بە ناوی شمس الدین مفتی[١٥١] و هاوڕێیەکی بە ناوی مەسعود بارزانی ئەمڕۆ هاتن بۆ باڵوێزخانە کە نامەیەکی ناساندنیان لە لایەن مەلا مستەفا بارزانییەوە پێبوو. هەروەها پەیامێکی زارەکییان لە لایەن مەلا مستەفاوە پێبوو کە بە توندی داوای یارمەتی راستەوخۆی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کردبوو. شمس الدین مفتی وتی کوردەکانی عێراق پێویستیان بە یارمەتی دارایی و سەربازی هەیە، بەتایبەت چەکی گران و دەیانەوێت کاربەدەستانی ئەمریکا بێنە ناو ناوچەکەیان و وەک "ویلایەتێکی دیکە"ی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەیری ناوچەکەیان بکەن. "مفتی" هەروەها وتی بارزانی وتوویەتی سەرچاوەکانی نەوتی کوردستان

---

[١٥١] شمس الدین موفتی کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەری بنەماڵەی موفتییەکانی سلێمانی بوو کە ئەو کات بە ناوی خوازراوی " ئەمیر قاسمی" نوێنەری شۆڕشی ئەیلوول بووە لە تاران، شەمسەدین موفتی مانگی ئەیلوولی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کرد.. وەرگێڕ

دەبێت لە لایەن کومپانییەکی ئەمریکاییەوە بە رێککەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ کوردەکانی عێراق بەرهەم بهێنرێت. ئەڵبەتە ئێمە لە بەرامبەردا هیچ جۆرە لێدوانێکی تەشویقکارانەمان نەهێنایە سەر زمان .

"مفتی" وتی بارزانی داوای کردووە پەیامەکەی بنێردرێت بۆ واشنگتۆن و لەمەویەدوا باڵوێزخانەی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران وەک خاڵی پەیوەندی لەگەڵ بارزانی کەڵکی لێوەربگیردرێت چونکە بەهۆی جموجۆڵەکانی ئەم دواییەی سوپای عێراق زۆر زەحمەتە بارزانی بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەڵک لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد وەربگرێت."مفتی" هەروەها وتی بارزانی دەیەوێت کاناڵی پەیوەندی راستەوخۆی (نە لەرێگای دەوڵەتی ئێرانەوە) لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەبێت چونکە متمانەی ئەوەی بە ئێران نییە کە بیروبۆچوونەکانی بارزانی بە راستی وەک خۆی بگوازێتەوە بۆ ئەمریکا.

لە وەڵامدا کاربەدەستی باڵوێزخانە ئاماژەی بە سیاسەتی نەگۆڕی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد بە نیسبەت کێشەی کوردەکانی عێراق، بەو شێوەیە کە لە نامەی CA ٩٤١١ لە ٢ی ئاداری ١٩٦٣دا خاڵەکانی دیاری کراوە[١٥٢]. کاربەدەستەکە وتی پەیامەکەیان دەگەیەنێت بە واشنگتۆن بەڵام بەرپرسیار نیە لە وەڵامدانەوە بە پەیامەکەیان. لەگەڵ ئەمەشدا "مفتی" وتی لە تاران چاوەڕوان دەبێت. "مفتی" و مەسعود بارزانی وتیان کاربەدەستانی ئێران ئاگاداری هاتنی ئەوان بۆ باڵوێزخانە نین.[١٥٣]

---

[١٥٢] لە نامەکەدا هاتوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژە بەو سیاسەتە بدات کە شۆڕشی کورد بە کێشەیەکی ناوخۆیی عێراق بزانێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ هیچ دەورێکی تێدا ببینێت (١٩٦٣ - ١٩٦١).

[١٥٣] وەزارەتی دەرەوە لە تیلیگرامی ٩٨٣ لە ١٤ی نیسان رێنوێنی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای لە تاران کردووە کە هەر وەک رابردوو بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ نوێنەرەکانی بارزانی وتووێژ نەکات و جەختی لەسەر ئەو کردووەتەوە کە سیاسەتی خۆتێوەنەگلاندنی ئەمریکا لە کێشەی کوردەکان و حکوومەتی عێراق نەگۆڕاوە. هەروەها لە

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی**

**بەغداد، ٣٠ ی نیسانی ١٩٦٥**

**بابەت: داواکاری دەوڵەتی عێراق لە ئەمریکا بۆ راوەستاندنی یارمەتی ئێران بە کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لەندەن، تاران، کویت، جەددە، تایز، قاهیرە، ئانکارا و کەراچی.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٨٠٤ و ٩٢٦ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق

وەزیری دەرەوەی عێراق، "تالیب" شەوی رابردوو دیسان لە شوێنی ژاپۆنیەکان لەگەڵ من گفتوگۆی کرد کە وەزیری پەروەردە، بەڕێز "زەکی"ش تێیدا ئامادە بوو. دیار بوو "تالیب" لەوە زیاتر خۆی پێنەدەگیرا و بابەتە کۆنەکەی دوپات کردەوە کە سیاسەتی ئێران لە راستیدا هەمان سیاسەتی CENTOیە و وتی بۆ دەوڵەتی عێراق

---

تیلیگرامەکەدا هاتووە کە لەرێگای کانالی گونجاو، دەبێ SAWAK (رێکخراوی ئاسایش و هەواڵگری ئێران) باش ئاگادار بکرێتەوە دەربارەی ئەم دیدارە و ئەو وەڵامە کە دراوەتەوە بە کوردەکان (ئیداری ئارشیف و تۆمارکراوە نیشتمانیەکان، RG٥٩ ، فایلە ناوەندییەکان ١٩٦٦ ـ ١٩٦٤، IRAQ 29 ـPOL ٢٣ ).

مەسەلەیەکی یەکلاییکەرەوەیە کە بزانێت لە کۆبوونەوەکانی CENTO[١٥٤] یان دانیشتنە دۆستانەکاندا باسی چی کراوە.

بۆ یەکەم جار "تالیب" ئێرانی تۆمەتبار کرد کە یارمەتی سەربازی دەدات بە کوردەکان و رایگەیاند سیاسەتی شا بە نیسبەت کوردەکان، بارودۆخێکی لێدەکەوێتەوە کە بۆ خودی ئێران و هەروەها بۆ CENTO مەترسیدار دەبێت. "تالیب" ئاماژەی بەوە کرد کە ئێران هیچ کێشەیەکی لەگەڵ عێراق نەبووە کاتێک کە هەر دو وڵات ئەندامی "پەیمانی بەغداد" بوونە. وادیارە مەبەستی ئەوە بوو کە ئامانجی ئێران ئەوەیە لە رێگای کێشەی کوردەوە بارودۆخێک لە عێراق دروست بکات کە ببێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق ببێ بە ئەندامیCENTO. مەبەستی راشکاوانەی "تالیب" ئەوە بوو کە بنەمای سیاسەتی شا بەنیسبەت عێراق، دەگەڕێتەوە بۆ بێزاربوونی شا لە جمال عبدالناسر.

من دوپاتم کردەوە کە باسی کێشەی کورد نەکراوە لە CENTOدا و ئاگاداری هیچ دانیشتنێکی دۆستانەش نیم لەم پەیوەندییەدا. هەروەها وەبیری "تالیب"م هێنایەوە کە پاکستان ئەندامی CENTOیە بەڵام لە رێگای کارەبەدەستەکانەوە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی داوە بۆ ئەوەی ئێران و عێراق پێکەوە رێکبکەون. پاکستانیەکان دەتوانن بە عێراق بڵێن کە ئایا لە کۆبوونەوەکەی CENTOدا باسی کوردەکان کراوە یا نا و ئایا شا گوێڕایەڵی مۆچیارییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لەم پەیوەندییەدا یا نا؟ لەسەر داوای من، "تالیب" وتی یارمەتی سەربازی ئێران بە کوردەکان بریتیە لە چەند بار پێداویستی نەناسراو کە گوازراوەتەوە بۆ ناو خاکی عێراق لە رێگای ژمارەیەک ئۆتۆمبیلی "جیپ" کە ژمارەیان بە سەرەوە نەبووە ("زەکی" ئەوەی گوت کە شا یارمەتیشی ناردووە بۆ لایەنگرانی سیستمی پاشایەتی لە یەمەن، بەڵام ئەم مەسەلەیە بەدواداچوونەوەی لەگەڵ نەکراوە).

---

[١٥٤] سیزدەهەمین کۆبوونەوەی وەزیرانی رێکخراوی پەیمانی ناوەندی ( CENTO) لە ٧ ـ ٨ی نیسان لە تاران بەڕێوەچوو.

پاشان سەرزەنشتی "تالیب"م کرد کە دوابەدوای دوایین گفتوگۆکەماندا هەڵوێستەکانی توندتر بووە و وتم ئەم گفتوگۆیە ( لەوانە زانیارییەکانی لە بارەی یارمەتی سەربازی ئێران بە کوردەکان) راپۆرت دەدەم بۆ واشنگتۆن. "تالیب" بە نیسبەت ئەم مەسەلەیە خوشحاڵ بوو و وتی رێزی هەیە بۆ دەسەڵات ودەستپێشتوویی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵام من ئەوەم بۆ"تالیب" پشتڕاست کردەوە کە گەلێ مەسەلەی گرنگ هەیە کە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ناتوانێت کونترۆڵی بکات یا تەنانەت کاریگەری هەبێت لە سەری.

" تالیب" وتی دەوڵەتی عێراق وا هەست دەکات دەوڵەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ئەگەر بیەوێت دەتوانێت کار بکاتە سەر شا بۆ ئەوەی سیاسەتەکەی بگۆڕێت. کاتێ کە لە یەک جودا بووینەوە، بۆ ئەوەی"تالیب" زیاتر رازی بکەم، پێمگوت بەگوێرەی دوایین راپۆرتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، پێداویستە سەربازییە تاکەکەسیەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە مانگی گوڵان، حوزەیران و تەموز تەسلیم بە عێراق دەکرێت بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ئەم راپۆرتە لەگەڵ زانیارییەکانی دیکە ناگونجێت بەدوای بەیاننامەی کاربەدەستانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا دەگەڕێم. ئەویش خۆشحاڵ بوو.

**هەڵسەنگاندن:**

خودی "تالیب" CENTO بە شتێکی تاکتیکی دەزانێت بەڵام هەندێ لە هاوکارەکانی بە دڵنیاییەوە باوەڕیان پێیەتی. هەمووی ئەم کەسانە لە سەر ئەو باوەڕەن کە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەتوانێ شا ناچار بکات سیاسەتی خۆی بە نیسبەت کوردەکان بگۆڕێت .

باڵوێزی تورکیا (لە عێراق) لە کاتی گفتوگۆی تەلەفۆنی لەگەڵ من لە ٥ ی نیسان ئەو بیرۆکەیەی خستەڕوو کە بەهۆی سەرنەکەوتنی سوپای عێراق لە هەرەسهێنان بە کوردەکان، دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت عێراق بباتە نێو پەیماننامەیەکی ناوچەیی لەگەڵ تورکیا و ئێران .

به بۆچوونی ئێمه، ئەمه پێویست ناکات. ئەگەر شا وابیر دەکاتەوه که دەتوانێ دەوڵەتێکی لایەنگری ئێران به یارمەتی کوردەکان له عێراق بێنێته سەر دەسەڵات، بەقەد ئەوه به هەڵەدا چوه که پێشتر وا بیری دەکردەوه که یەکێتیەک له نێوان عێراق و میسر بەم زووانه دادەمەزرێت .

من هێشتا هیوادارم بتوانم "تالیب" له شوێنی کارەکەی ببینم بۆ ئەوەی لەسەر هەندێ مەسەلەی دیکه گفتوگۆی لەگەڵ بکەم. دەمەوێت له چوارچێوەی باس و گفتوگۆ لەسەر سێ گۆشەی کورد - ئێران - عێراق بچمه دەرەوه، تەنها دەمەوێت ئاماژه بەوه بکەم که دەستێوەردانی عەرەبەکان له خوزستان له لایەن شاوه پشتگوێ ناخرێت. ئەگەر وەزارەتی دەرەوه شتێک به سودمەند دەزانێت که لەگەڵ "تالیب" باس بکرێت، ئاگادارم بکەنەوه. هەروەها باش دەبێت ئەگەر رێنوێنیم بکەن چۆن وەڵامی پرسیاره بەردەوامەکانی "تالیب" بدەمەوه دەربارەی گفتوگۆ دۆستانەکانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا له تاران. وادیاره ئیدی بێ سوده ئێران هەوڵ بدات خۆی وا بنوێنێت که یارمەتی به کوردەکان نادات[100]. سترانگ

---

[100] له تیلیگرامی ٦٥٥ بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا له بەغداد له ٤ی گوڵان نووسراوه: "وەزارەتی دەرەوه لەسەر ئەو باوەڕەیه که باڵوێزی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له عێراق هەموو بەڵگه و نیشانەکان بخاتەڕوو بۆ ئەوەی قەناعەت به حکومەتی عێراق بهێنێت که دەوڵەتی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ دەستێکی نییه له کێشەی کورددا. به دوور دەزانرێت که هەڵێنجاندنی زۆرتر لەم پەیوەندییەدا بتوانێ بەدگومانیەکانی وەزیرانی دەرەوەی بەشدار له CENTO برەوێنێتەوه بەڵام کاربەدەستانی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ درێژه بدەن به سەر لەنوێ خستنەڕووی خاڵه سەرەکییەکانی سیاسەتی ئەمریکا. هەروەها"سترانگ" دەتوانێت به "تالیب" بڵێت که وەزیری دەرەوەی ئەمریکا "روسک" له کاتی گفتگو لەگەڵ شا دەربارەی ئاسایشی ئێران هیچ مەسەلەیەکی نوێی نەهێناوەته بەرباس".

**له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**واشنگتۆن، ٦ی گوڵانی ١٩٦٥، کاتژمێر ٤:٥١ ی پاش نیوەڕۆ**

**بابەت: هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە یارمەتیدانی ئێران بە کوردەکانی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە بۆ ئانکارا، لەندەن، تاران و تلابیب.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٩٥٦ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق :[١٥٦]

---

[١٥٦] لە تیلیگرامی ژمارە ٩٥٦ لە ٥ی گوڵان، "سترانگ" باسی دیدارێکی دیکەی لەگەڵ "تالیب"، وەزیری دەرەوەی عێراق کردوە کە تێیدا "تالیب" مەسەلەی سیاسەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکای بەنیسبەت کوردەکان هێناوەتە بەرباس. "تالیب" هەروەها شک و گومانی خۆی دەربڕیوە بەنیسبەت ئەوەی کە نوێنەری کورد، "وانلی" کە بۆ دامەزراندنی "نووسینگەی نوێنەرایەتی هەمیشەیی" بۆ کوردە شۆڕشگێڕەکان لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵ دەدات بتوانێ دژی خواستی دەوڵەتی ئەمریکا کار بکات. "تالیب" داوای ئەوەی کردووە کە ئەمریکا نەهێڵێت "وانلی" چالاکی بکات و لە ئەمریکا دەری بکات و قەناعەت بە ئێران بهێنێت تەشویقکردن و یارمەتیدانی کوردەکان رابوەستێنێت. بە بۆچوونی "سترانگ"، دەوڵەتی عێراق گەیشتووەتە ئەوپەڕی بێچارەیی و داماوی. "سترانگ" هەروەها پێشنیاری کردووە کە ویزای "وانلی" هەڵبوەشێندرێتەوە و رەوتی هەناردنەوەی "وانلی" دەست پێبکات و لە مەلامستەفا بارزانی داوا بکرێت رێنوێنی "وانلی" بکات ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بە جێ بهێڵێت .

تیلیگرامی ٦٥٥ زۆر درەنگ گەیشتە دەستمان بۆ ئەوەی لە گفتوگۆکەی ٥ی گوڵان لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق کەڵکی لێوەربگرین. ئێوە بە دەوڵەتی عێراق بڵێن کە:

١- دەوڵەتی ئێران بەتەواوی ئاگاداری روانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە دەربارەی ئەوەی کە بەرژەوەندیی ئێران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویست بەوە دەکات کە هەموو هەوڵێک بدرێت بۆ باشبوونی پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و دووریکردن لە هەڵگرتنی هەر هەنگاوێک کە ئەم پەیوەندییە تێکبدات. بەهەرحاڵ (هەروەها کە ئێمە هەمیشە بە دەوڵەتی عێراقمان وتووە) ئێمە سیاسەتی دەرەوەی ئێران کونترۆڵ ناکەین، هەروەها کە ناتوانین سیاسەتی دەرەوەی تورکیا، پاکستان، یۆنان، هیند و هتد کونترۆڵ بکەین. ئێمە هیچ نموونەیەکمان لەبیر نایێت کە تێیدا وڵاتێکی جیهانی ئازاد بەوە رازی بووبێت کە سیاسەتی نیشتمانی ئەو ویلایەتە لە لایەن وڵاتێکی دیکەوە کونترۆڵ بکرێت تەنها لەبەر ئەوەی پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەو وڵاتە.

٢- وەزارەتی دەرەوە پێشنیاری ئەوە بە باڵوێزخانە دەکات کە کوردەکانی عێراق رازی بکات "وانلی"[١٥٧] لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بانگهێشت بکەنەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە تاوتوێی رێوشوێنەکانی گەڕاندنەوەی ناوبراو دەکەین، لەوانەیە بتوانین ناوی "وانلی" وەک کەسی نەخوازراو تۆمار بکەین و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەری بکەین.

---

[١٥٧] مەبەستی عیسمەت شەریف وانلی، کەسایەتی ناسراو و چالاکی سیاسی کوردە کە ئەو کاتە نوێنەری شۆڕشی ئەیلول بوە لە ئەمریکا. هۆکاری ئەوە دیار نیە کە بۆ ئەوەندە ئەمریکا دژی عیسمەت شەریف وانلی بوە بەڵام وادیارە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەوە بوە کە عیسمەت شەریف وانلی کەسایەتیەکی چالاک بوە. عیسمەت شەریف وانلی لە کۆتایی ساڵی ٢٠١١ لە سوئیسرا کۆچی دوایی کرد (وەرگێڕ).

"جیرنیگان" له کاتی دانیشتن له‌گه‌ڵ به‌ڕێز "ئه‌لهانی" [158]، باڵوێزی عێراق له ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له ٥ ی گولان له سه‌ر بابه‌تێکی دیکه (که به جیا راپۆرت دراوه) خاڵی ١ و٢ ی سه‌ره‌وه‌ی پێڕاگه‌یاندووه ( جگه له ره‌سته‌ی یه‌که‌می به‌شی١) و دووپاتی کردووه‌ته‌وه که وه‌ڵامی ئێمه به داواکارییه‌کانی کورده‌کان هه‌مان وه‌ڵامه‌که‌ی پێشووه و ئێمه وه‌ک مه‌سه‌له‌یه‌کی ناوخۆیی عێراق سه‌یری کێشه‌که‌یان ده‌که‌ین.

"جیرنیگان" وتی وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی عێراق ده‌رباره‌ی"وانلی" زۆر نیگه‌رانه، هه‌رچه‌ند که "وانلی" وه‌ک تاک سه‌رکه‌وتوو نه‌بووه له ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا. باڵوێز "ئه‌لهانی" وتی به هه‌مان شێوه راپۆرتی ئه‌م گفتوگۆیه ده‌دات به وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی عێراق.

158 AL-HANI

**له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا**

**بۆ: باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له‌ ئێران**

**واشنگتۆن، ١١ ی ئابی ١٩٦٥، کاتژمێر ٧:١٥ ی پاش نیوه‌ڕۆ**

**بابه‌ت: یارمه‌تیدانی ئێران به‌ کورده‌کانی عێراق دژی به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌مریکایه**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له‌ ئانکارا، به‌غداد، که‌راچی و له‌نده‌ن.

ئاماژه‌ به‌: تیلیگرامی ٧٤ی باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له‌ عێراق بۆ وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌[١٥٩]:

عێراق داوای پشتیوانی له‌ ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا کردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی ئێران چه‌ک بۆ کورده‌کانی عێراق نه‌نێرێت. داواکاری ده‌وڵه‌تی عێراق - بۆ پشتیوانی ئه‌مریکا له‌ هه‌وڵه‌کان بۆ راوه‌ستاندنی ناردنی چه‌ک له‌ لایه‌ن ئێرانه‌وه‌ بۆ کورده‌ عێراقیه‌کانی دژبه‌ری حکووت- مه‌عقول نییه‌ ره‌ت بکرێته‌وه‌. سیاسه‌تی ئێمه‌ به‌رده‌وام ئه‌وه‌ بووه‌ که‌ راپه‌ڕینی کورد مه‌سه‌له‌یه‌که‌ که‌ ته‌نها په‌یوه‌ندی به‌ عێراقه‌وه‌ هه‌یه‌ و ناردنی چه‌ک و سه‌رباز(له‌ لایه‌ن ئێرانه‌وه‌ بۆ کورده‌کان) بۆ ئه‌وه‌ی گوشار بخاته‌ سه‌ر

---

[١٥٩] له‌ تیلیگرامی ٧٤ له‌ به‌غداد بۆ وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ له‌ ١١ی ئاب به‌رپرسی کاروباری باڵوێزخانه‌، "ویزلی ئادام"، راپۆرتی داوه‌ که‌ جێگری وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی عێراق، خادم خه‌لاف، ئه‌وی بانگهێشت کردووه‌ بۆ وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ و تکای له‌ ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا کردووه‌ ئێران رازی بکات کۆتایی به‌ ناردنی چه‌ک بۆ کورده‌کان بهێنێت. "ئادام" له‌وه‌ڵامدا وه‌ک هه‌میشه‌ ئه‌وه‌ی ره‌ت کردوه‌ته‌وه‌ که‌ ئه‌مریکا بتوانێت له‌و په‌یوه‌ندییه‌دا ئێران رازی بکات، به‌ڵام وتوویه‌تی داواکارییه‌که‌ی ده‌نێرێت بۆ کاربه‌ده‌ستانی ده‌وڵه‌تی ویلایه‌ته‌ یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا .

دەوڵەتی عێراق، دژی ئامانجی ئێمەیە کە سەقامگیربوونی ناوچەیە. سەرکەوتنی کورد لە عێراق لە ئاستی واقیعدا زۆرترین زیانی بۆ سەقامگیری تورکیا هەیە و بە قازانجی یەکپارچەیی خاکی ئەم دو وڵاتە نییە.

ئەو بەڵگە و زانیاریانە کە ئێستا عێراق هەیەتی (دەربارەی یارمەتیدانی کوردەکان لە لایەن ئێرانەوە) راستن و بەرفراوانبوونی یارمەتی ئێران بە کوردە راپەڕیوەکان دەبێتە هۆی خراپبوونی خێرای پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق.

لە کاتی دانیشتن لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران، ئێوە دەبێ هەڵوێستی عێراقیان وەبیربهێننەوە و نیگەرانی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکایان پێڕابگەیەنن دەربارەی ئەو گوشارانەی کە دەوڵەتی عێراق دەیخاتە سەر ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بەهۆی یارمەتیدانی ئێران بە کوردەکان. ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا دەیەوێت پەیوەندی باشی لەگەڵ عێراق هەبێت و بۆچوونی وەزارەتی دەرەوە ئەوەیە کە بە قازانجی ئێرانیشە کە دەستپۆیشتوویی سنوورداری ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە سەر عێراق لاواز نەبێت.[١٦٠]

بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق:

باڵوێزخانە دەتوانێ ئەم رێنوێنیانەی وەزارەتی دەرەوە بە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران بە ئاگاداری دەوڵەتی عێراق بگەیەنێت.

بۆ لەندەن: ئێوە دەتوانن وەزارەتی دەرەوە ئاگاداری ئەم رێنوێنیانە بکەنەوە.

---

[١٦٠] لە تیلیگرامی ١٥٣ لە تاران لە ١٣ی ئاب، بەرپرسی کاروباری باڵوێزخانە، "مارتین هێرز" راپۆرتیداوە کە بەگوێرەی تیلیگرامی ١٣٨١٢ی ئاب، داواکارییەکەی عێراقی گوازتوەتەوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران. رۆژی دواتر، "هێرز" لەلایەن "عەباس ئارام" وەزیری دەرەوەی ئێرانەوە بانگهێشت کراوە بۆ باس و گفتگو لەسەر پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق. "ئارام" پێی لەسەر ئەوە داگرتووە کە ئێران یارمەتی کوردەکان نادات و گلەیی کردووە کە عێراق سیاسەتێکی بەرنامە بۆدارێژراوی بۆ ئەزیەتدانی ئێران گرتووەتەبەر. "هێرز" هەروەها وتوویەتی "ئارام" نیگەرانی ئەوە بووە کە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بکەوێتە نێو مەسەلەکە.

**له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**واشنگتۆن، ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥، کاتژمێر ٢:١ ی پاش نیوەڕۆ**

**بابەت: گفتوگۆی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق دەربارەی کێشەی کورد**

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٥٥ی ٢٥ی تشرینی یەکەم لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق بۆ وەزارەتی دەرەوە

ئەمە کورتەیەکە لە گفتوگۆکانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق (بەزاز):

١ـ لە گفتوگۆکەی ٨ی تشرینی یەکەم لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا[١٦١]، سەرۆک وەزیرانی عێراق کێشەی کوردی هێنایە بەرباس و هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ئەم مەسەلەیەی بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی ناوزەد کرد، ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم مەسەلەیە هەندێ تایبەتمەندی دەرەکیشی هەیە. سەرۆک وەزیرانی عێراق وتی دەوڵەتی عێراق دەیەوێت وەک نەتەوە سەیری خەڵکی کورد بکات و بەهەرحاڵ ئاماژەی بەوە کرد کە قەد ناکرێت دەوڵەتێکی کورد هەبێت کە هەموو کوردەکان

---

[١٦١]—گفتوگۆی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق، عبدالرحمان بەزاز لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجام درا. بەزاز" لە ٢١ ی ئەیلوولی ١٩٦٥ بووە بە سەرۆک وەزیرانی عێراق.

لەخۆ بگرێت. سەرۆک وەزیرانی عێراق هەروەها وتی ئەم کێشەیە چارەسەر دەکرێت ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بریتانیا مۆچیاری شا بکەن دەست لە سیاسەتە ناعاقڵانەکەی هەڵگری.

٢- وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دیسان جەختی لەسەر پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە یەکپارچەیی خاکی عێراق کردەوە و داوای لە سەرۆک وەزیرانی عێراق کرد لەوە تێبگات کە دەستڕۆیشتوویی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم جۆرە مەسەلانە سنووردارە و کێشەی هیند و پاکستانی وەک نمونە هێنایەوە.

٣- لە وەڵامی پرسیاری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (دەربارەی ئەوەی کە ئایا خواستی دو لایەنە هەیە لە نێوان ئێران و میسر بۆ ئەوەی پەیوەندی دۆستانەیان پێکەوە هەبێت) سەرۆک وەزیرانی عێراق بانگەشەی ئەوەی کرد کە ترسی شا لە سەرۆک جمال عبدالناسر زیادەڕۆیانەیە و وتی ناسر دەیەوێت لەگەڵ ئێران هاوکاری بکات بەڵام هاندانەکانی ئێران بووەتە هۆی ئەوەی ناسر کاردانەوە نیشان بدات. سەرۆک وەزیرانی عێراق ترسی شا لە زیادەخوازییەکانی (ناسر)ی بەراوردکرد لەگەڵ زیادەخوازییەکانی شا لە نێو وڵاتانی عەرەبی لە کەنداوی فارس.

وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پێشنیاری ئەوەی کرد کە وەزیری دەرەوەی ئێران، "عەباس ئارام" لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق گفتوگۆ بکات بەڵام سەرۆک وەزیران وەڵامی دایەوە مەعقول نییە هیچ کەس جگە لە شا بتوانێت هەڵویستی فەرمی ئێران بە نیسبەت میسر و جیهانی عەرەب بگۆڕێت و وای بۆدەچوو کە تەنها مۆچیاری زلهێزێکی دۆست دەتوانێ قەناعەت بە شا بهێنێت.

٤- سەرۆک وەزیرانی عێراق وەک یەکەمین سەرۆک وەزیرانی مەدەنی عێراق لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا، هەستی بە کەشوهەوایەکی سەقامگیر دەکرد. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرژەوەندی سەرەکی هەیە لە خۆشبژێوی و یەکپارچەیی خاکی عێراق و ئەوەی زیاد کرد کە ئێمە هیچ

زیادەخوازییەکی نەتەوەییمان لە عێراق نییە و ئامادەین یارمەتی عێراق بدەین بۆ ئەوەی بکەوێتە سەر ڕێگای پێشکەوتن.

٥- سەرۆک وەزیرانی عێراق بەرنامەیەکی تایبەتی خستە ڕوو(کە بۆ خۆی زۆر هۆگری بوو) بۆ ئەوەی زانکۆی بەغداد بکرێت بە بنیادێکی گەورە. وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وتی وەزارەتی دەرەوە خۆشحاڵ دەبێت کە تاوتوێی ئیمکانی یارمەتیدانی ئەمریکا بە عێراق بکات لە هەندێ گەلاڵە و بەرنامەی زانکۆییدا.

٦- سەرۆک وەزیرانی عێراق ڕەزامەندی خۆی لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئیمکانی سەرمایەگوزاری ئەمریکا لە عێراق بۆ زامنکردنی ڕێککەوتنەکە دەربڕی.

٧- لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ١٥ی تشرینی یەکەم[١٦٢] "بەزاز" ئەوپەڕی ڕێزی "عارف"، سەرۆک کۆماری عێراقی بە سەرۆک ئەمریکا ڕاگەیاند و ئارەزووی چاکبوونەوەی خێرای بۆ خواست بۆ نەشتەرگەرییەکەی و وتی عێراق پاش تێپەڕکردنی زنجیرەیەک شۆڕش ئێستا لە حاڵی پێشکەوتندایە و وەک ئەندامێکی جیهانی ئازاد لە قۆناخی پەرەسەندن و بەرەوپێشچووندایە. "بەزاز" وتی دەوڵەتی ئێستای عێراق لەرووی سیاسییەوە "بێ لایەنە" و دەوڵەتەکانی ڕابردووی عێراق بێ لایەنبوونیان خراپ شرۆڤە کردووە. دەوڵەتی ئێستای عێراق سوسیالیستە بەڵام مارکسیست یا کومونیست نییە و دەوری کەرتی تایبەت بە فەرمی دەناسێت .

٨- "بەزاز" وتی ناسر تەنیا ڕێبەرێکی عەرەبە کە بە شێوازێکی کاریگەر دژی کومونیزم و مارکسیزم خەبات دەکات و کلیلی پەیوەندی باش لەگەڵ عەرەبەکان ئەوەیە کە ئەو لایەنە پەیوەندی باشی لەگەڵ ناسر هەبێت.

٩- سەرۆک وەزیرانی عێراق بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئێران بۆ کۆمەڵێک ئامانجی خراپکارانە ئاژاوەگێڕییەکان لە باکووری عێراق تەشویق دەکات و وتی کێشەی شا،

---

[١٦٢] گفتوگۆی ١٥ی تشرینی یەکەمی سەرۆک وەزیرانی عێراق لەگەڵ جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا، "هامپری" لە یادداشتنامەی گفتوگۆکەدا تۆمار کراوە.

هەڵوێستەکەیەتی بەنیسبەت ناسر و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ لە ڕێگای گونجاوەوە قەناعەت بە ئێران بهێنێت کە یارمەتیدانی کوردەکان ڕابوەستێنێت.

١٠- سەرەنجام سەرۆک وەزیرانی عێراق پێداگری کرد کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا قەناعەت بە بەریتانیا بهێنێت هەڵوێستێکی باشتر بەنیسبەت عەرەبستانی سعودی بگرێتە بەر.

١١-جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا وتی سەرۆک وەزیرانی عێراق بە شێوازێکی لایەنگرانە قسەی دەکرد. چاکسازی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی ئابووری تێکەڵ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوو دەدات. جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا جەختی لەسەر جیاوازی نێوان کومونیزم و سوسیالیزم کردەوە و وتی نهێنی ڕاستەقینەی ئازادی، مافی دەربڕین و ئاڵوگۆڕی بیروڕایە.

١٢- جێگری سەرۆک کۆمار ئاماژەی بەوە کرد کە سەردانی میسری کردووە و لەگەڵ ناسر گفتوگۆی کردووە و پەیامێکی لە لایەن سەرۆک کۆمار"کنیدی"یەوە بۆ بردووە. جێگری سەرۆک کۆمار هەروەها وتی ئێمە کۆمەڵێک بیروڕای جیاوازیمان هەیە بەڵام سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە کۆمەڵێک ڕێگا بدۆزێتەوە بۆ ڕێککەوتن. ناوبراو ئەوەی وەک نموونە هێنایەوە کە ئەم دواییانە لە وەڵامی هەستە بەهێزەکانی هەندێ لە خەڵکی ئەمریکا، کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان دژی ناسر کاردانەوەی نیشان داوە و سەرۆک کۆمار، جێگری سەرۆک کۆمار و وەزیری دەرەوە ناچار بوونە هەوڵێکی زۆر بدەن بۆ ئەوەی بڕیارەکەی کۆنگرێس هەڵبوەشێننەوە بۆ ئەوەی خۆراک وەک ڕابردوو لە ئەمریکاوە بچێت بۆ میسر. ئێمە سپاسی وتە ڕاشکاوانەکانی سەرۆک وەزیرانی عێراق دەکەین و بەهەرحاڵ "ناسر"یش دەبێت ڕاشکاوانە قسە بکات.

١٣ - جێگری سەرۆک کۆماری ئەمریکا هیچ باسی بارودۆخی کوردی نەکرد و وتی ئاگاداری وردەکارییەکانی نییە. سەرەنجام جێگری سەرۆک کۆمار مەسەلەی بریتانیا و عەرەبستانی سعودی گوازتەوە بۆ جێگری وەزیری دەرەوە، بەڕێز "هارە".

١٤- له گفتوگۆیەکدا لەگەڵ جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (بەڕێز "مان") له ١٥ی تشرینی یەکەم، سەرۆک وەزیرانی عێراق روانگە مودێرن و لیبراڵەکانی خۆی بەنیسبەت سوسیالیزم لەگەڵ روانگە وشک و توندەکانی سەرۆک وەزیرەکانی پێشووی عێراق بەراورد کرد و له دروشمدان و خستنەڕووی بیرۆکە دوکتورینیەکان دووری کرد. جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وتی لەگەڵ بۆچوونەکانی سەرۆک وەزیرانی عێراق هاوڕایە و ئەوەی بە سەر قسەکانیدا زیاد کرد کە ئەو دوکتورینە ئابووریانە کە ١٠٠ ساڵ یا زیاتر له ١٠٠ ساڵیان بەسەر دا چووە، بۆ ئەمڕۆ نابن ئەگەر گۆڕانکاریان تێیدا نەکرێت.

١٥- له وەڵامی پرسیارێکی جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا له بارەی پەیوەندییە ئابووریەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق، سەرۆک وەزیرانی عێراق وتی سیاسەتی عێراق ئەوەیە کە له راستیدا "بێ لایەن" بێت و حکوومەتی عێراق هەموو مەسەلەکان بە پێی شیاوبوونیان و بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی عێراق تاوتوێ دەکات بەڵام هەلێکی باش رەخساوە بۆ هاوکاری و یارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا .

١٦- جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا باسی کاری کومپانیە بازرگانییەکانی ئەمریکای له عێراق کرد کە وەڵامەکەی "بەزاز"مان له تیلیگرامی ١٦٨ له بەرواری ١٨ی تشرینی یەکەم ناردووە بۆ ئێوە بۆ بەغداد.

١٧- سەرۆک وەزیرانی عێراق دیسان داوای یارمەتی ئەمریکای کرد بۆ دروستکردنی زانکۆیەکی نوێ له عێراق کە خەرجەکەی ٣٠- ٣٥ میلیون دولار هەڵسەنگێندراوە و وتی عێراق دەتوانێت له ماوەی ٧- ٨ ساڵدا ئەم پارەیە بداتەوە بە ئەمریکا. بەڕێز "مان"[١٦٣] وتی تاوتوێی ئەم مەسەلەیە دەکات.

١٨- "بەزاز" وتی کێشەی کورد بووەتە هۆی وشکبوونی دارایی عێراق و ئابووری عێراقی لاواز کردووە. هەروەها ئاماژەی بە بەرنامەی سلفە کرد بۆ عێراق و وتی عێراق پێویستی بە سەرمایە هەیە و لەوانەیە داوای ٧- ٨ میلیون دولار سلفە له

---

[١٦٣] Mann

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکات. بەڕێز "مان" وتی ئەم مەسەلەیەش تاوتوێ دەکات .

ڕوسک

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد، ٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥**

**بابەت: هەڵسەنگاندنی کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەسرە، بەیروت، قاهیرە، دیمەشق، لەندەن، تاران و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنا، تەورێز و حەلەب.

ئەمە هەڵسەنگاندنێکی گشتییە لەسەر مەسەلەی کورد لە عێراق کە باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق، بەڕێز "سترانگ" ئامادەی کردووە. ئەم هەڵسەنگاندنە باسی گەلێ بەرژەوەندی و هۆکاری هاندەری ململانێکاری لەو مەسەلەیەدا کردووە و بۆ هەموو ئەو کەسانە سودمەندە کە پەیوەندییان بە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەبارەت بە کێشەی کورد لە عێراق هەیە.

ئەنجامی سەرەکی ئەم هەڵسەنگاندنە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان یا سەربەخۆیی بۆ کوردەکانی عێراق، سەقامگیری ناوچە تێکدەدات و بە زیانی بەرژەوەندییە درێژخایەنەکانی ئێمەیە. بەردەوامبوونی شەڕی کوردەکان بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە، هەرچەند کە ئاکام و لێکەوتەکانی ئەم شەڕە (لانیکەم بۆ ئێستا) مەترسی نییە بۆ ئەمریکا و پێویست بە دەستپێشخەرییەکی ئەوتۆ ناکات لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە .

دووره كه شيوعييەكان و سۆڤيەت بتوانن به شێوەيەكی بەرفراوان شۆڕشی كورد كۆنترۆڵ بكەن، تەنانەت ئەگەر كوردەكان بتوانن كوردستانێكی خاوەن ئۆتۆنۆمی يا رژێمێكی جياوازيش دابمەزرێنن.

ئەم شيكارييه بەو ئەنجامە دەگات كه له كاتێكدا كه ويلايەته يەككرتووەكانی ئەمريكا، سۆڤيەت و ميسر خوازياری چارەسەرييەكی ئاشتيخوازانەن بۆ كێشەی كورد له عێراق و لەم پەيوەندييەدا بەرواڵەت هاوتەريبن بەڵام ئامانجەكانيان جياوازە و بەتايبەت له پەيوەندی لەگەڵ ويلايەته يەككرتووەكانی ئەمريكا و سۆڤيەت ئەنجام و گريمانەی جياوازی له پشته.

بەهەمان شێوه ئێران و ئيسرائيل و لەوانەيه بريتانيا ئامانجی جياوازيان هەيه بۆ لايەنگريكردن له بەردەوامبوونی ناكۆكييەكه بۆ ئەوەی عێراق لاواز ببێت. دەستێوەردانی بەردەوامی ئێران و ئيسرائيل له كێشەكە، هەڕەشەيه بۆ پێگەی ويلايەته يەككرتووەكانی ئەمريكا له عێراق بەڵام بەداخەوە هيچ دەوڵەتێك رەچاوی بەرژەوەندييەكانی ئەمريكا ناكات لەم پەيوەندييەدا.

له داهاتوويەكی زۆر نزيكدا، نه كوردەكان و نه حكوومەتی عێراق ناتوانن به رێگاچارەی سەربازی سەركەوتن بەدەست بهێنن. بەهەمان شێوه رێگاچارەيەك به گوێرەی وتووێژيش ناتوانێت كێشەكه بۆ هەميشه چارەسەر بكات. كێشەی كورد، كێشەيەكی درێژخايەنه.

سياسەتی ئێستای ويلايەته يەككرتووەكانی ئەمريكا گونجاوترين سياسەته واتا ئەوە كه كێشەی كورد كێشەی ناوخۆيی عێراقه و باشترين رێگاچارە، رێگاچارەی سياسيه له سەر بنەمای وتووێژ .

بۆ باڵوێز:

ئينۆچ س دونكان[١٦٤]

راوێژكاری كاروباری سياسی

[164] ENOCH S. DUNCAN

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**تاران، ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٦٦**

**نهێنی**

**بابەت: روانگەی شا سەبارەت بە پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەغداد، جەددە و لەندەن.

**١- پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق**

من ئەمڕۆ پێشنیاری ئەوەم بە "شا" کرد کە پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق کونتروڵ بکات و نەچێت بۆ سەفەرە بەرنامە بۆداڕێژراوەکەی بۆ ئەورووپا، شا وەڵامی ئەرێنی بەم پێشنیارە دایەوە. شا وتی هەست دەکات ئێران گەیشتووە بە ئامانجی سەرەکی خۆی واتا ئەوە کە عێراقیەکان بزانن هەرچەشنە دەستدرێژییەکی سەربازی بۆ سەر سنووری ئێران، لەگەڵ وەڵامی توندی ئێران روبەڕوو دەبێتەوە و هەرکاتێک ئێران بیەوێت، سەرچاوەی ئەم چالاکیە بێ دەنگ دەکات.

**٢ـ ئامانجە درێژخایەنەکان:**

شا وتی ئامانجی ئێران هیچ کاتێک ئەوە نەبووە کە یەکپارچەیی خاکی عێراق بباتە ژێرپرسیار و وتی هەر دو وڵات لە رێگای پەیوەندی دراوسێیتیەوە دەتوانن هەموو دەستکەوتێک بەدەست بهێنن. شا وتی هەر دو وڵاتی ئێران و عێراق بەرهەمهێنەری

نەوتن و سەرچاوەی ئاوی هاوبەشیان هەیە کە دەبێ بە شێوەیەکی یەکسان کەڵکی لێوەربگرن. هەروەها کۆمەڵگای شیعە لە عێراق پەیوەندییەکی نزیکی هەیە لەگەڵ شیعەکانی ئێران و هتد .

٣ـ کێشەی کورد:

شا وتی نایەوێت لە ڕێگای کارکردن دژی کوردەکانی عێراق، کوردەکانی ئێران بکات بە دوژمنی خۆی و وتی کوردەکان" ئارییایی رەسەنن " کە رەگەزی ئێرانیەکانە. خاڵەکەی شا ئەوە بوو کە کێشەی کوردەکان لە عێراق، کێشەی ناوخۆیی عێراقە کە لەرێگای بەقوربانیکردنی کوردەکان چارەسەر ناکرێت و ناکرێت بنێردرێتە ناو ئێرانیش .

٤ـ مەسەلەی شەتولعەرەب:

شا وتی هەرچەند ئەوە گرنگە کە لە ناکۆکیەکەی لەگەڵ عێراق کەڵک وەربگرێت بۆ ئەوەی کێشەی "شەتولعەرەب" چارەسەربکرێت، بەڵام وتی ئەمە ئامانجی یەکەمی ئێران نییە و وتی ئەم کێشەیە ریشەیەکی دەیان ساڵەی هەیە و ئێران دەتوانێت چەند ساڵێکی دیکە چاوەڕوان بکات. لە راستیدا لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا بەهۆی گەشەکردنی بەندەرەکانی ئێران لە کەنداوی فارس، ئێران هیچ پێویستییەکی بە "شەتولعەرەب" نامێنێ. شا وتی کاتێ کە کەشتییەکان دێن بۆ بەندەرەکانی ئێران، عێراقیەکان کێشەیان بۆ ساز دەکەن و باری ئابووری راگرتنی دەریاوانی "شەتولعەرەب" زیاد دەکەن. شا لە هەمان کاتدا ئاماژەی بەوە کرد کە کاربەدەستانی عێراق لە داهاتوودا سەردانی ئێران دەکەن و هیوای خواست ئەوانیش بەشێک لەم باری ئابوورییە بگرنە ئەستۆ و "شەتولعەرەب" لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن. بەهەرحاڵ شا ئەوەی وەبیرهێنایەوە کە بێ ئەنجامدانی گفتوگۆ، مەسەلەی ناکۆکیەکانی "شەتولعەرەب" دەبێ بە سەرچاوەی کۆمەڵێک کێشەی بێ کۆتایی لە نێوان هەر دوو وڵاتدا.

## ٥- پێشهاتەکانی ئەم دواییانە:

ئاماژە بە گفتوگۆ تیروتەسەلەکەم (تیلیگرامی ١٠٣٤ی باڵوێزخانە لە ١٩ی کانوونی دووەم) لەگەڵ "حەسەن دوجەیلی"، باڵوێزی نوێی عێراق لە ئێران:

من بە "شا"م وت هەر چەند ئەم دۆستەم بە ماوەی ١٨ ساڵ نەبینیوە بەڵام وەبیرم دێت دۆستێکی زۆر راستگۆ و یەکدڵ بوو. هەروەها بە (شا)م وت "دوجەیلی" منی دڵنیا کردووەتەوە کە هیچ دەوڵەتێکی عێراقی ناتوانێت لە ژێر زەخت و زۆردا لەسەر مەسەلەیەک وەک "شەتولعەرەب" گفتوگۆ بکات. وادیارە "دوجەیلی" بەتەواوی بەپەرۆشە کە گرژییەکانی نێوان ئێران و عێراق کەم بکاتەوە و پەیوەندییەکانی هەر دوولا پتەو بکات .

## ٦- رەخساندنی دەرفەتێک بۆ بەزاز:

هەروەها کە هێماکان نیشان دەدات لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عێراق هێشتا رێگایەکی درێژی لەبەرە بۆ ئەوەی بتوانێ بگات بە ئامانجە پاک و شیاوەکانی سەردەمی پێش ١٩٥٨، من پێموایە "بەزاز" ( کە ئێستا لە سەر کورسی دەسەڵاتە لە عێراق) تا رادەیەک خۆی باش نیشان داوە و ئێرانیەکان دەبێ دەرفەتێکی باشی پێبدەن. شا بەمە رازی بوو و ئاماژەی بەوە کرد کە لەوکاتەوە کە دەوڵەتی "حیزبی کار" لە بریتانیا گەیشتووە بە دەسەڵات، بە بەرپرسیارەتیەکی زۆرترەوە رەفتاری کردووە (زۆرتر لەوەی کە لە راگەیاندننامەکانیدا پێش لە گەیشتن بە دەسەڵات چاوەڕوان دەکرا).

هەروەها تێگەیشتنی شا لە رابردوو باشتر ببوو دەربارەی ئەوەی کە "بەزاز" و جێگری سەرۆک کۆماری عێراق حەتمەن عەبدی میسر نین بەڵام وتی "عارف" لایەنگری (ناسر)ە و شێتە. پاشان ئاماژەی بە دۆستە عێراقیەکانی میسر کرد. هەروەها لەگەڵ ئەوە هاوڕا بوو کە تەنانەت ناسریش دەبێت لەوە تێبگات کە عێراق دەتوانێت لە سوریا کێشە خولقێنەرتر بێت.

### ٧ـ بەرنامەی سێ خاڵی:

شا وتی ئێران هەوڵیداوە لە ڕێگای قبوڵکردنی پێشنیارە ٣ خاڵییەکەی "بەزاز" نیوەی ئەو هەنگاوانە هەڵبگرێت کە لە ئەستۆیەتی بەڵام وتی ئەم بەرنامە ٣ خاڵییە دەبێ دوو لایەنە بێت و ئێران نایەوێت عێراقیەکان واتێبگەن کە پارەی قەرەبووکردنەوە (کە دەبێ کومیسیونێکی لێپرسینەوەی هاوبەش بڕیاری لەسەر بدات) هەموو ناکۆکیە سەرەکیەکانی ئێران و عێراق چارەسەر دەکات و دەبێ دەرگای گفتوگۆ لەسەر کێشەکانی دیکە وەک کێشەی "شەتولعەرەب" و دابەشکردنی سەرچاوەکانی ئاو (کە ٦٥٪ ی لە خاکی ئێران سەرچاوە دەگرێت) کراوە بێت.

### ٨ـ هەڵسەنگاندن:

من وای بۆ دەچم کە شا پێش سەفەر بۆ دەرەوە، دەوڵەتەکەی دڵنیا دەکاتەوە کە ئێران هیچ هەنگاوێک هەڵناگرێت بۆ سەرهەڵدانەوەی گرژییەکانی ئێران و عێراق. کێشە درێژخایەنەکان (هەم مەسەلەی یارمەتی ئێران بە کوردەکان و هەم مەسەلەی "شەتولعەرەب") بە چارەسەرنەکراوی دەمێننەوە بەڵام بڕیاردان لەم پەیوەندییەدا ئێستا پێویست نییە. مەبەستی من لە دەربڕینی بۆچوونەکانم ئەوە بوو کە شا تەشویق بکەم وەزیرەکانی دڵنیا بکاتەوە کە دەیەوێت بارودۆخەکە لە کاتی نەبوونی خۆیدا ئارام بێت.

مایێر[١٦٥]

---

165 MEYER

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد، ١٧ی گوڵانی ١٩٦٦**

**بابەت: گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆک کۆماری عێراق دەربارەی کێشەی کورد**[١٦٦]

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٦٧٧ی ١٦ی گوڵانی باڵوێزخانە و تیلیگرامی ٥٣٨ی وەزارەتی دەرەوە[١٦٧]:

١- من لە نیوەڕۆی ١٧ی گوڵان بەماوەی ٣٥ خولەک لەگەڵ "عارف"ی سەرۆک کۆماری عێراق گفتوگۆم کرد و ئەوپەڕی ڕێز و سڵاوی سەرۆک کۆمار "جانسون"م بە "عارف" و دەوڵەتی عێراق ڕاگەیاند، پاشان "عارف" سپاسی منی کرد و داوای لێمکرد ئەوپەڕی ڕێز و سڵاوی ئەو بگەیەنم بە سەرۆک کۆمار "جانسۆن". پاشان "عارف"

---

[١٦٦] سەرۆک کۆماری عێراق، "عبدالسلام عارف" لە ١٣ی نیسان لە ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە کوژرا و براکەی، ژنەراڵ "عبدالرحمان عارف" لە ١٦ی نیسان جێگای ئەوی گرتەوە.

[١٦٧] تیلیگرامی ٥٨٣ی وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد لە ١٤ی گوڵان ڕێنوێنی "سترانگ"ی کردووە کە لەلایەن سەرۆک کۆماری ئەمریکاوە پیرۆزبایی لە "عارف" بکات بەبۆنەی دەست بەکاربوونی و ئاماژەی بەوە کردووە کە گفتوگۆی یەکەم دەبێ دۆستانە بێت، هەرچەند کە باڵوێزی ئەمریکا دەتوانێت باسی هەندێ مەسەلەی تایبەتی نێوان دەوڵەتی عێراق و ئامریکادا بکات ئەگەر پێویست بکات.

پەیوەندییە دۆستانەکانمانی (پێش ئەوەی کە ببێ بە سەرۆک کۆماری عێراق) وەبیرهێنایەوە و وتی ئاواتەخوازە پەیوەندییەکانمان بە هەمان شێوە بەردەوام بێت .

٢- من بە کورتی باسی گرنگترین خاڵەکانی ئەرکەکانی خۆمم کرد بۆ پەرەپێدانی زۆرتری پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق و ئاماژەم بە هاوکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەڵ عێراق بۆ پەرەپێدانی سەقامگیری و پێشکەوتنی سیاسی و ئابووری عێراق کرد تا ئەو ئاستە کە عێراق دەیەوێت و ئیمکانی هەیە. "عارف" وتی دەرک بەمە دەکات و سپاسی منی کرد و باسەکەی گۆڕی بۆ مەسەلەی یارمەتیدانی ئێران بە کوردەکان.

٣- من بە وردی هەڵوێستی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکام سەبارەت بە کێشەی کورد بۆ "عارف" شی کردەوە و باسی نیگەرانیەکانی ئێرانم کرد و هەوڵەکانی خۆمانم دووپات کردەوە بۆ تەشویقکردنی ئێران و عێراق بۆ دوزینەوەی ڕێگایەک بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانیان بە شێوازی ئاشتیخوازانە و وتم بە بۆچوونی من تەنها ئێران و عێراق دەتوانن ناکۆکیە دولایەنەکانیان چارەسەر بکەن. "عارف" وتی ترسی ئێران لە عێراق بەهۆی پەیوەندییەکانی میسر و عێراق لە جێی خویدا نییە، بەڵام ئەگەر شا (کە تەنها خۆی بەرپرسیاری دوژمنایەتی ئێرانە لەگەڵ عێراق) پێداگری بکات لەسەر یارمەتیدانی کوردەکان، عێراقیش تا ئەو شوێنەی کە پێی بکرێت کێشە بۆ ئێران دروست دەکات ( لەم پەیوەندییەدا ئەیرگرامێک لە ١٨ی گوڵان بە وردەکاری زۆرترەوە نێردراوە بۆ وەزارەتی دەرەوە[١٦٨]).

٤- هەڵسەنگاندن: "عارف" ئارام و لەسەرخۆ بوو و چەندجار لە میانەی گفتوگۆکەماندا سوحبەتی کرد و بە هۆی کردەوەکانی ئێران بە هیچ شێوەیەک سەرزەنشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەکرد و ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە

---

[١٦٨] عارف سپاسی باڵوێزی ئەمریکای کردوە بۆ ئەم گفتوگۆیە و وتوویەتی ئەم گفتوگۆیە وەک نهێنییەک لای خۆی رادەگرێت. "عارف" هەروەها وتوویەتی دەیەوێت قسەکانمان وەک قسەوباسی نێوان دوو دۆست بێت نە سەرۆک کۆمارێک لەگەڵ باڵوێزێک.

دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتی کوردەکان نادات. کاتێ کە من ئاماژەم بەو پرەنسیپە گەورانە کرد کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڤیەتنام شەڕی بۆ دەکات، "عارف" وتی دەرکی پێدەکات و لەگەڵیدایە. لە سەراسەری گفتوگۆکەماندا کەڵک لە وەرگێڕ وەرگیرا، جگە لە چەند کورتە باسی تاکەکەسی لە سەرەتا و کۆتایی گفتوگۆکەمانەوە نەبێت. "عارف" ئەوەندە ئینگلیزی دەزانێت کە بتوانێت وتووێژێکی ئاسایی پێ بکات.

٥- ئەم گفتوگۆیە ئەو بۆچوونەی پشتڕاست کردەوە کە "عارف" بەریانی بەرەولای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە، هەرچەند کە ئێمە نابێت چاوەڕوانی ئەوەی لێ بکەین رەفتارێکی دۆستانەی ئاشکرای لەگەڵ ئێمە هەبێت و بێ گومان کۆمەڵێک پێشامەد لە داهاتوودا روو دەدات کە تا ئاستێک پەیوەندییەکانمان گرژ دەکات.

سترانگ[١٦٩]

[169] -STRONG

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**
**بۆ: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**
**بەغداد، ٢ی تەموزی ١٩٦٦**
**نهێنی**
**بابەت: روانگەی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئامریکا سەبارەت بەو بەرنامە سیاسیە کە حکوومەتی عێراق بۆ کوردەکان دایڕشتووە**

١٢ـ ئاماژە بە تیلیگرامی ٣٩٦ی وەزارەتی دەرەوە [١٧٠]:
الف – وێڕای گەیاندنی پەیامی پیرۆزبایی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە دەوڵەتی عێراق بە بۆنەی پوچەڵکردنەوەی کودیتا، لەکاتێکی گونجاودا ئەم بابەتانە بە شێوازی زارەکی لەگەڵ رێبەرانی عێراق بهێننە بەر باس :
١- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێیناخۆش بووە کە عێراق ناچار بووە تەحەمولی توندوتیژییەکی دیکە بکات.

---

[١٧٠] تیلیگرامی ژمارە ٣٩٦ی وەزارەتی دەرەوە بۆ باڵوێزخانەی بەغداد لە ١ی تەموز ئاماژەی بەوە کردووە کە وەزارەتی دەرەوە تاوتوێی ئەوە دەکات کە ئایا بە قازانجمانە باڵویزخانە پیرۆزبایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بگەیەنێت بە "عارف"، سەرۆک کۆمار یا "بەزاز"، سەرۆک وەزیرانی عێراق بەبۆنەی پوچەڵکردنەوەی کودیتای ئەم دواییە. هەروەها داوای لە باڵوێزخانە کردووە تاوتوێی ئەو مەسەلەیە بکات کە راگەیاندنی چارەسەرکردنی کێشەی کورد تا چە رادەیەک هۆکاری ئەم کودیتایە بووە.

٢- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیوادارە هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق ببێتە هۆی پاراستنی سەقامگیری ئەو وڵاتە و لە پێشکەوتنەکانیدا سەرکەوتوو بێت.

٣- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پیرۆزبایی لە حکوومەتی عێراق دەکات بە بۆنەی ئەو بەرنامە سیاسیە کە بۆ کوردەکان دایڕژتووە و کوردەکان قبوڵیان کردووە.

٤- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیوادارە چارەسەری کێشەی کورد بە شێوازێکی ڕێکوپێک و بەردەوام و بە نیازپاکی حکوومەتی عێراق و کوردەکان جێبەجێ بکرێت و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئەم ڕێگاچارەیە پڕبایەخە و پێش لە توندوتیژی دەگرێت[١٧١].

٢- دیاریکردنی کاتی کودیتا دژی حکوومەتی عێراق، بەشێکی بە هۆی ڕاگەیاندننامەکەی ٢٩ی حوزەیرانی "بەزاز" بووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. وادیارە ڕێبەرانی کودیتا هیوادار بوونە کە کەسانی دیکە وەک کاربەدەستانی سەربازی خەڵکی موسڵ (کە گەلێکیان دژی کوردن) پەیوەست دەبن بە جووڵانەوەکەیان بۆ ڕووخاندنی ڕژیم کە بە بووچوونی ئەوان ئەم ڕژیمە خیانەتی بە عێراق کردووە چونکە تەسلیمی داواکارییەکانی کوردەکان بووە. بەشداریکردنی "عەتارباشی[١٧٢]"، فەرماندەی لیوای ٤ لەم کودیتایە کە خەڵکی موسڵە ئەم ڕاستیە دەسەلمێنێت. بەڵام وادیارە حکوومەتی عێراق متمانەی بە ناوبراو نەبووە چونکە چەند ڕۆژ پێش باسی ئەوە دەکرا کە سەرتیپ "عدنان عبدالجلیل[١٧٣]" دەخرێتە شوێنی ئەو. لە لایەکی دیکەوە ڕێبەرانی کودیتا لە یەکەمین ڕاگەیاندننامەی خۆیاندا کە لە ڕادیو بڵاو بووەوە، چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان قبوڵ کرد. کێشەکە لە ڕاستیدا

---

[١٧١] لە تیلیگرامی ١٢٠٧ بۆ بەغداد لە ٣ی تەموزدا هاتوە کە "وەزارەتی دەرەوە هاوڕایە لەگەڵ کارە پێشنیارکراوەکەی باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق."

[172] Attarbashi
[173] Adnan Abd al-Jalil

بەرەو چارەسەری دەچوو و شەرتومەرجە گشتییەکانی هەفتەیەک پێش لە هەوڵی کودیتا بڵاو بووەوە.

ئەم خاڵانە دەمانباتە سەر ئەو باوەڕە کە کۆمەڵێک هۆکاری گرنگتر هەبووە بۆ دیاریکردنی کاتی کودیتاکە، بۆ نمونە چوونی "بەزاز" بۆ تورکیا لە ١ی تەموز، هەروەها پاشنیوەڕۆی ٣٠ی حوزەیران سەرەتای پشووی دوو رۆژی بوو و دامەزراوە حکوومەتیەکان کاتژمێر ١:٣٠ی پاش نیوەڕۆ دادەخرێن. کاتێک کە ئاژاوەکە دەستی پێکرد، خەڵک لە خەوی نیوەڕۆدا بوون و ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستان و سەربازان بە شێوازی ئاسایی لە ئیجازەی پشوو و کۆتایی حەوتوودا بوون.

٣- خێرابوون و تیژبوونی کاردانەوەی هێزەکانی وەفادار بە حکوومەت نیشان دەدات حکوومەتی عێراق لە پێشەوە ئاگاداری پیلانی کودیتا بووە و وای بە باشتر زانیوە رێبەرانی کودیتا لە کاتی خۆیدا دەستگیر بکات (نە پێش لە کودیتا و بێ سەلماندنی نیازەکەیان). ئەم سیاسەتە لەگەڵ شێوەی تێڕوانینی عێراقیەکان بۆ مەسەلەکان دەگونجێت، بەتایبەت لەو کاتانە کە لە سەرکەوتنی خۆیان دڵنیا بن.

سترانگ

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بەغداد - ١٩ ی ئابی ١٩٦٦**

**بابەت: گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی نوێی عێراق دەربارەی کێشەی کورد و ئێران**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، ئەلجەزایر، عەمان، ئانکارا، بەسرە، بەیروت، قاهیرە، دیمەشق، هاهاران، ئۆرشەلیم، جەددە، خارتوم، کویت، لەندەن، موسکۆ، ربات، تلابیب، تریپلولی، تونس.

١- من لە ١٨ ی ئاب بە ماوەی ٥٠ خولەک لەگەڵ "تالیب"[١٧٤] گفتوگۆم کرد. زۆربەی کاتی گفتوگۆکەمان بە کێشەی کورد و ئێران (بە دەستپێشخەری "تالیب") تێپەڕ بوو. من بە"تالیب"م وت دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەیە لەگەڵ حکوومەتی ئێستای عێراق (هەر وەک حکوومەتەکانی پێشووی عێراق) لە پێناو ئامانجی بنەرەتی ئێمە کە سەقامگیری و خۆشبەختی عێراقە کاربکات و بەوردی باسی نیگەرانی خۆمانم بۆ کرد دەربارەی پێشنەچوونی کاری بەڵێندەرانی ئەمریکایی لە عێراق، و راستیە بنەڕەتیەکانی بارودۆخی ڤیەتنام و واتاکەی بۆ جیهانی ئازاد و ئامانجەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکام بۆی شی کردەوە. هەروەها نیگەرانی

---

[١٧٤] بەزاز لە ٦ی ئاب وەک سەرۆک وەزیرانی عێراق دەستی لەکار کێشایەوە و "ناجی تالیب" جێگای ئەوی گرتەوە.

و بێ هیوایی قووڵی خومم بەنیسبەت هاوهەڵوێست بوونی عێراق لەگەڵ سۆڤیەت دەربڕی. "تالیب" وتی تاوتوێی ئەم بانگەشانە دەکات و خۆی لە قسەوباسی زۆرتر لەبارەی ڤیتنام بوارد و وتی کاتی کابینەی عێراق بە مەسەلە ناوخۆییەکان گیراوە و کاتی ئەوەی نییە (هەروەها کە "بەزاز" لە موسکۆ باسی کردبوو) کە خۆی سەرقاڵی مەسەلە جیهانیەکان وەک مەسەلەی ڤیەتنام و ئاڵمانیا بکات .

٢- "تالیب" رایگەیاند حکوومەتی عێراق بەرنامەی چارەسەری کێشەی کورد بەتەوای جێبەجێ دەکات، بەڵام زۆرتر باسی گیروگرفتەکانی کرد و ئاماژەی بەوە نەکرد کە چۆن دەوڵەتی عێراق لەم پەیوەندییەدا دەچێتە پێش. بە وتەی "تالیب" جیدیترین کێشە لەم پەیوەندییەدا، بوونی سێ کۆتلە لە نێو کوردەکاندایە. بارزانی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە حکوومەتی عێراق تەنها لەگەڵ ئەو مامەڵە بکات بەڵام حکوومەت ناتوانێت ئەو کوردانە پشتگوێ بخات کە لایەنگری حکوومەتی عێراقن یا ئەندامی کۆنی پارتی دیموکراتن. تالیب وتی بارزانی دەیەوێت ببێت بە پادشای کوردستان بەڵام بەرهەرحاڵ کەس نازانێت لە ڕاستیدا بە شوێن چ ئامانجێکەوەیە .

٣- "تالیب" پرسیاری لە من کرد ئەگەر کوردەکان لەم پەیوەندییەدا جیدی بن، حکوومەتی عێراق دەبێ چی بکات. منیش وتم حکوومەتی عێراق هەلێکی راستەقینەی بۆ رەخساوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و کوردەکان نایانەوێت دەست بە شەڕ بکەنەوە، مەگەر ئەو کاتە کە حکوومەتی عێراق نەتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات. من پێداگریم لەسەر ئەوە کرد کە حکوومەتی عێراق هەڵوێستێکی زۆر ئەرێنی لە درێژخایەندا پەیڕەو بکات بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆی نیشان بدات. من وتم کاتێ کە کوردەکان ببینن حکوومەتی عێراق لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکە جیدییە ئیدی پشتیوانی لە شۆڕشی چەکداری ناکەن. "تالیب" گوێی گرتبوو، بەڵام دیسان جەختی کردەوە لەسەر گیروگرفتەکان و پێویستی هاوکاری کوردەکان.

٤- "تالیب" وتی دڵنیایە ئێران هێشتا چەک بۆ کوردەکان دابین دەکات بەڵام داوای ئەوەی نەکرد کە حکوومەتی ئەمریکا گوشار بخاتە سەر ئێران و مەبەستی ئەوە نەبوو کە حکوومەتی ئەمریکا یارمەتی کوردەکان دەکات. من وتم پێموایە پاش ٢٩ ی

حوزەیران، ئێران ئیدی چەک بۆ کوردەکان دابین ناکات، بەڵام لەوانەیە بە شێوەگەلێ دیکە یارمەتی کوردەکان بدات، بەڵام بەهەرحاڵ ئەم یارمەتییە رادەوەستێت ئەگەر حکوومەتی عێراق گەمارۆی ئابووری لەسەر باکوور لاببات بەو شێوەیە کە بەڵێنی داوە.

" تالیب" هەڵوێستێکی زۆر توندی گرت و وتی ئێران چی لە عێراق دەوێت و هەڵوێستی ئێرانی لەگەڵ هەڵوێستی تورکیا بەراورد کرد. هەروەها وتی حکوومەتی عێراق دەیەوێت پەیوەندی باشی لەگەڵ ئێران هەبێت و "بەزاز" و "تاهیر یحیی" نەیانویستوە پەیوەندی خراپیان لەگەڵ ئێران هەبێت بەڵام ئێران وای لێکردوون. ئێستا ئێران هەوڵ دەدات کۆمەڵێک شەرت ومەرجی نەلواو بەسەر عێراقدا بسەپێنێت، بەڵام هیچ دەوڵەتێکی عێراقی ناتوانێت لە سەر "شەتوالعەرەب" سازش بکات. منیش نیگەرانیەکانی ئێرانم بۆ شی کردەوە و پاشان ئاماژەم بەوە کرد کە لە چەند هەفتەی رابردووەوە دەرفەتی ئەوە بۆ عێراق رەخساوە تا پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران باش بکات. من پێداگریم لەسەر "تالیب" کرد لەم پەیوەندییەدا هەوڵ بدات، ئەویش نە بە "بەڵێ" و نە بە" نەخەیر" وەڵامی نەدایەوە بەڵام بە دیقەتەوە گوێی بۆ قسەکانی من گرتبوو.

٥- وەبیری "تالیب"م هێنایەوە کە ئێران بۆ ئامانجێکی سنووردار، کۆمەڵێک یارمەتی سنووورداری داوە بە کوردەکان بەڵام سۆڤیەت لە راستیدا ئامانجی کوردەکان هان دەدات و لە رۆژهەڵاتی ئەوروپاوە درێژە بە پەخشی بەرنامەی نهێنی دژی حکوومەتی عێراق دەدات. من وتم ئەم مەسەلانە سەرەنجام بۆ عێراق مەترسیدارتر دەبێت و جەختم لە سەر ئەوە کردەوە کە سۆڤیەت زیادەخوازی درێژخایەنی هەیە بەرەو کەنداوی فارس و هاندانی کێشەی کورد لە پێناو ئەم ئامانجەدایە. "تالیب" ئەمەی پشتڕاست کردەوە بەڵام وتی سۆڤیەت دۆستی عێراقە و عێراق پێویستی بە یارمەتی سۆڤیەتە.

هەڵسەنگاندن:

الف: "تالیب" هیچ شتێکی نەدرکاند سەبارەت بە هێڵە گشتیەکانی ئەو سیاسەتە کە عێراق دەیەوێت بیگرێتە بەر و وتی سیاسەتی وەزارەتی دەرەوە لە بەیاننامەیەکدا لە چەند ڕۆژی داهاتوودا بڵاو دەبێتەوە. ئێستا زۆر زووە بۆ ئەوەی حکوومەتی ئێستای عێراق هەڵبسەنگێنین بەڵام لە چەند هەفتەی داهاتوودا کۆمەڵێک نیشانە دەردەکەوێت دەربارەی ئاراستە و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی عێراق.

ب - "تالیب" (کە خۆی شیعەیە) لەوانەیە وای بۆ بچێت کە پێویستە لەگەڵ ئێران توندوتۆڵ مامەڵە بکات و ببێ بە دژبەری ئێران بە هۆی ئەوەی کە باڵوێزی ئێران لە بەغداد، بەڕێز "پیراستە"[175] بە "تالیب"ی وتووە کە چونکە (تالیب) شیعەیە، لە کردەوەدا ئێرانییە و دەبێ لەگەڵ ئێران هاوکاری نزیک بکات. من هێشتا هیوادارم کە ئێران بە لەسەرخۆییەوە درگاکە بەکراوەیی بهێڵێتەوە و هەوڵی ڕاستەقینە بدات بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق.

ج - "تالیب" لە ڕووی جەستەییەوە ماندوو بوو. "تالیب" زۆرتر حەزی لە مەسەلە بازرگانییەکان بوو بەڵام هەڵوێستەکانی دۆستانە بوون و بەهەرحاڵ هیچ پرسیارێکی نەخستەڕوو دەربارەی بەرنامەی PL480 (مەبەستی کڕینی گەنم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە - وەرگێڕ) یا بەرنامەی حەسانەوە بۆ باکووری عێراق.

---

175 Pirasteh

لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق

واشنگتۆن، ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦، کاتژمێر ٣:٥٦ ی پاش نیوەڕۆ

نهێنی

بابەت: گفتوگۆکانی وەزیری دەرەوەی ئامریکا و عێراق دەربارەی مەسەلەی کورد

ئەمە کورتەیەکە لە ناوەڕۆکی دیدارە کورتەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ "پاچەچی" (وەزیری دەرەوەی عێراق ) لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦ [١٧٦]:

١ـ کێشەی کورد:

"پاچەچی" وتی عێراق توانیویە کێشەی کورد چارەسەر بکات و هیوادارە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بتوانێ شتێک بکات بۆ راوەستانی یارمەتی ئێران بە کوردەکان. "پاچەچی" هەروەها وتی زۆر باش دەبێت ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بتوانێ یارمەتی عێراق بکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی باکووری عێراق.

"پاچەچی" لە نیویورک لەگەڵ کاربەدەستانی سەربازی ئەمریکا دیدار دەکات.

---

[١٧٦] دانیشتنی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق، "پاچەچی" لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەڕێوەچوو. یادداشتنامەی گفتوگۆکە کە باسی مەسەلەی عەرەب ـ ئیسرائیلیشی تێداکراوە لە بەڵگەنامەی ٣٢٣ دا هەیە. یادداشتنامەکانی دیکەی گفتوگۆکان لە ناوەندی ئارشیف و تۆمارکراوە نیشتمانیەکان، ٥٩ RG فایلی کونفرانسەکان: ٨٣ CF و ٣٠٥ D 67 Lot دا هەیە.

### ٢ـ کاروباری ئابووری:

"پاچەچی" وتی حکوومەتی عێراق هیوادارە رێککەوتنامەکانی زامنکردنی سەرمایەگوزاری ئەمریکا لە عێراق هەموار بکات. هەروەها وتی عێراق هیوادارە دەوڵەتی ئەمریکا گوشار بخاتە سەر HMG و کومپانیاکانی US کە کاری IPC دەکەن بۆ ئەوەی لەم پەیوەندییەدا لەگەڵ حکوومەتی عێراق رێکبکەون.

### ٣ـ مەسەلەی عەرەب ـ ئیسرائیل:

"پاچەچی" گلە وگازندەی ئەوەی لە ئەمریکا کرد کە چەک بە ئیسرائیل دەفرۆشێت، هەر بۆیە وڵاتانی عەرەبی وادەزانن کە لایەنگری ئیسرائیلە و وتی حکوومەتی عێراق زیزە لە کەمبوونەوەی رۆژ لە دوای رۆژی یارمەتیەکانی ئەمریکا بە UNRWA (ئاژانسی جیهانی ئاوارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان) و ئاماژەی بەوە کرد کە خودی ئاوارەکان دەڵێن هیچ هەوڵێکی راستەقینە نەدراوە بۆ یارمەتیدانیان و هەرچەند کە "جوزیف جانسۆن" هەوڵی باشی داوە لەم پەیوەندییەدا بەڵام یارمەتییەکان بە لاوازییەوە جێبەجێ کراون.

**لە سکرتێری کارگێڕی وەزارەتی دەرەوە (بەڕێز رێد)**
**بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار (بەڕێز رۆستۆ)**
**واشنگتۆن، ١٦ ی شوباتی ١٩٦٧**
**نهێنی**
**بابەت: وەڵامی نەرێنی بە نامەی رێبەری شۆڕشی کورد، مەلا مستەفا بارزانی بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا**

ئەمە ئەو نامەیەیە کە رێبەری شۆڕشی کورد لە عێراق، ژنەراڵ بارزانی ناردوویەتی بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا[١٧٧]. دۆکتۆر(محمود) عوسمان کە یەکێ لە لایەنگرانی سەرەکی ژنەراڵ بارزانییە، نامەکەی هێناوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و تەسلیمی کردووە بە بەشی Desk level لە وەزارەتی دەرەوە کە نوێنەرە کوردەکان لەوێ وەردەگیرێن.
لە نامەکەدا داوا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کراوە لە دەستپێشتوویی خۆی لە ناو دەوڵەتی عێراق کەڵک وەربگرێت بۆ ئەوەی رێگاچارەیەکی کۆتایی و ئاشتیخوازانە بۆ کێشەی کورد لە عێراق بدۆزرێتەوە. هەروەها لە نامەکەدا داوای یارمەتی ماددی کراوە بۆ کوردە هەژارەکان.
لە راستیدا باڵوێزی ئێمە لە عێراق، "روبێرت سترانگ" تا ئێستا چەندجار بە پارێزەوە پێداگری لە سەر دەوڵەتی عێراق کردووە کە هەنگاوی زۆرتر هەڵبگرێت بۆ

---

[١٧٧] دەقی نامەکە لە ناو بەڵگەنامەکەدا نییە. وەرگێڕ.

قبوڵکردنی داواکارییە رەواکانی کورد لە چوارچێوەی خاکی عێراقدا. هەروەها لە ساڵی ١٩٦٤ وە ئێمە بەرنامەیەکمان جێبەجێ کردووە بۆ دابینکردنی خوراک بۆ ئاوارە کوردەکان لە عێراق .

لە حوزەیرانی ١٩٦٦وە نیمچە ئاگربەستێک لە نێوان کوردە شۆڕشگێڕەکان و دەوڵەتی عێراق پێکهاتووە بۆ ئەوەی رێگاچارەیەک بۆ کێشەکە بدۆزرێتەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٦ بارزانی یادداشتننامەیەکی ناردووە بۆ سەرۆک کۆماری عێراق (کە کوپییەک لەم یادداشتننامەیەی لەگەڵ نامەکەی خۆی ناردووە بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا) کە تێیدا گلەیی و گازندەی ئەوەی کردووە کە رژێمی عێراق نیازپاکی خۆی نیشان نەداوە بۆ جێبەجێ کردنی شەرت و مەرجەکانی ئاگربەست.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستیە کە بارزانی تا ئێستا ملکەچی دەوڵەتی عێراق نەبووە، ئێمە پێشنیار دەکەین هیچ وەڵامێکی نووسراوە نەدرێتەوە بە نامەکەی بارزانی. لە باتی ئەوە، پێشنیار دەکەین کاربەدەستێکی وەزارەتی دەرەوە لە ئاستی Desk levelبە نوێنەرایەتی لە لایەن سەرۆک کۆماری ئەمریکا، بە شێوازی زارەکی گەیشتنی نامەکەی بارزانی پشتڕاست بکاتەوە و جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە دەوڵەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە روانگەی مرۆڤدۆستانەوە نیگەرانی کوردەکانە، هەر بۆیە بەردەوام خۆراک دەنێرێت بۆ کوردە هەژارەکان لە عێراق. وەڵامێکی وەها دەگونجێت لەگەڵ وەڵامە پێشووەکانی ئێمە بە پەیامەکانی بارزانی.[١٧٨]

---

[١٧٨] یادداشتێک لە بەرواری ٩ی گوڵان لەسەر نامەکە بەم شێوەیە نووسراوە: " کۆشکی سپی بڕیاری داوە هیچ وەڵامێک بەم داواکارییە نەداتەوە."

**لەلایەن بەرپرسی ئیدارەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە (بەڕێز هۆگن)**

**بۆ: وەزیری دەرەوە، بەڕێز روسک**

**واشنگتۆن، ١ی ئەیلوولی ١٩٦٧**

**نهێنی**

**بابەت: مەترسی دەستپێکردنەوەی شۆڕشی کورد و دەستێوەردانی وڵاتانی دیکە لەو کێشەیەدا**

زێدەباری گەلێک کێشەی دیکە، رۆژهەڵاتی نزیک لەوانەیە لە ماوەی ٣ یا ٤ مانگی داهاتوودا لەگەڵ شەڕێکی نوێ لە نێوان پێشمەرگە کوردەکان و سوپای عێراق رووبەڕوو بێتەوە. هاوڕێیانی مەلا مستەفا رۆژ بە رۆژ سەرکەشتر دەبن و زۆربەی جاران لە نێوان تاقمە کوردە رکابەرەکان و هێزەکانی مەلا مستەفا و یەکێنە بچووکە گۆشەگیرەکانی سوپای عێراق پێکدادان روو دەدات. وادیارە کوردەکان هەتا کۆتایی مانگی ئەیلوول ( کاتی خەلەوخەرمان) دەست بە شەڕ ناکەنەوە، بەڵام لەوانەیە پێش لەوە بە هۆی حیسابی هەڵەی حکوومەت یان گوشاری دەرەکی پێکدادان روو بدات.

**کوردەکان هەست دەکەن دەبێ پێشمەرگە بن:**

گەلێ هۆکاری جۆراوجۆری ناوخۆیی و ناوچەیی کوردەکان هان دەدات تا لە هەر کاتێکدا کە خۆیان هەڵیبژێرن دەست بە شەڕ بکەنەوە :

**هۆکاری ناوخۆیی:**

حکوومەتی عێراق کەمتەرخەمە لە جێبەجێکردنی بەڵێنە ئاشتیخوازەکانی. کەموکورتی بودجەی عێراق بە هۆی دابەزینی نرخی نەوت، جاری یەکەم لە تشرینی دووەم – کانوونی یەکەم و پاشان لە کاتی شەڕی عەرەبەکان و ئیسرائیل، بەرنامەکانی دەوڵەتی عێراقی فەلەج کرد بۆ ئاوەدانکردنەوەی بەرفراوانی ناوچەی کوردنشین کە بەشێک بوو لە رێککەوتننامەی ئاشتی نێوان حکوومەت و کوردەکان.

کوردەکان متمانەیان بە "تاهیر یحیی" نییە کە لە ١٠ی تەموزەوە بووە بە سەرۆک وەزیرانی عێراق. کوردەکان هەست دەکەن "تاهیر یحیی" لە دانوستانەکانی پێشوودا، درۆی لەگەڵیان کردووە. "تاهیر یحیی" بارزانی تورەتر کردووە لەبەر ئەوەی "عبدالفتاح الشالی" (کە کەسێکی هەلپەرەستە) کردووە بە وەزیر (وەک وەزیرێکی کورد) لە کابینەی ئێستای خۆیدا. هەرەسهێنانی عەرەبەکان (لە بەرامبەر ئیسرائیل) پێشمەرگە کوردەکان زۆرتر بۆ شەڕ هان دەدات. پێشمەرگە گەنجە کوردەکان دەیانەوێت هەلەکە بقۆزنەوە و زەبر لە سوپای هەرەسهێناوی عەرەب بوەشێنن. لەوانەیە مەلا مستەفا نیگەران بێت بە نیسبەت وەفاداری ئەم کەسانە.

**حکوومەتی عێراق لاوازە:**

کابینە و رژێمی عێراق زۆر لەرزۆکە. مەلا مستەفا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە کوردەکان تەنها لە رێگای دەربڕینی ئامادەیی و توانایی خۆیان بۆ شەڕ دەتوانن لە رووی سیاسیەوە قورسایی خۆیان بەسەر رژێمی ئێستا یان رژێمەکانی دواتری عێراقدا بسەپێنن.

**لەوانەیە کوردەکان یارمەتی لە ئیسرائیل و ئێران وەربگرن:**

بێ پشتیوانی دەرەکی کوردەکان هەوڵ نادەن دەست بە شەڕێکی بەرفراوان بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر بە شێوەی پێشمەرگایەتیش بێت. بەهەرحاڵ پشتیوانە دەرەکییەکانی مەلا مستەفا ئێستا لە سەر ئەوە کۆکن کە کوردەکان کۆمەڵێک کردەوەی سنووردار

ئەنجام بدەن، لانیکەم وادیارە دەیانەوێت توانایی و خواستی مەلا مستەفا بۆ شەڕ زیندو رابگرن .

**بەرەیەکی دووەم بۆ ئیسرائیل؟:**

راست پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکاتەوە، کاربەدەستێکی ئیسرائیل لەگەڵ مەلا مستەفا دیداری کردووە و داوای لێکردووە کوردەکان ئەگەر بکرێت هەندێ چالاکی دژی سوپای عێراق ئەنجام بدەن بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. بە هەرحاڵ ئیسرائیل لە کۆتایی نیسان دەستی کردووە بە ناردنەوەی یارمەتی ماددی بۆ کوردەکان .

چەند مانگ پێش لە نیسان، یارمەتیەکانی ئیسرائیل سنووردار بوو. ئێستا لەوانەیە ئیسرائیل پێداگری لەسەر کوردەکان بکات شەڕ بکەن بۆ ئەوەی گوشار لەسەر عەرەبەکان بمێنێتەوە. لە روانگەی سوریاوە (کە روانگەیەکی توندە) ئیسرائیل ئێستا دەیەوێت کوردەکانی سوریا هان بدات (کە بەشێکی بچووک بوونە لە راپەڕینەکەی پێش لە ئاگربەست دژ بە سووریا).

**ئێران بەدگومانە:**

دەوڵەتی ئێران (کە سەرەتا پشتیوانی بەهێزی شۆڕشی کورد بوو) پێش لە شەڕی حوزەیران سیاسەتێکی ئارام و نەرمی بە نیسبەت عێراق گرتەبەر بەڵام ئەم سیاسەتە تێکچوو بە هۆی لێدوانە توندەکانی عێراق لە کاتی شەڕ و بوونی "تاهیر یحیی" بە سەرۆک وەزیرانی عێراق کە ئێران بەلایەنگری "ناسر"ی دەزانێت. لەمە زیاتر، SAWAK (رێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی وڵاتی ئێران - وەرگێڕ) لەسەر ئەو باوەڕەیە کە چالاکیە رووخێنەرەکانی ناسر لە کاتی شەڕەوە زۆرتر بووە .

دەوڵەتی ئێران لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئێستا نە مەلا مستەفا و نە دەوڵەتی عێراق ئەوەندە بەهێز نین کە بتوانن بەسەری ئەوی دیکەدا زاڵ بن، بەڵام ئەوە بە دوور نازانن کە کوردەکان بتوانن زەبرێکی بەهێز لە حکوومەتی عێراق بوەشێنن. ئێران لەگەڵ مەلا مستەفا هاوڕایە دەربارەی ئەوەی کە رژێمی عێراق لە قەیرانێکی جیدیدایە و لەوانەیە ئێران بکەوێتەوە بیری ئەوە کە سەرلەنوێ یارمەتی کوردەکان بداتەوە بۆ

ئەوەی رژێمی ئێستای عێراق بڕوخێت و رژێمێک بێتە جێگای کە لە ئێران نزیکتر بێت.

## سەرلەنوێ هەڵسانەوەی کوردەکان مەترسیدارە:

چالاکیە یەک لە دوای یەکەکانی پێشمەرگە کوردەکان دژی دەوڵەتی عێراق بۆ ماوەیەکی درێژ رووی داوە. بەهەرحاڵ ئێستا دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ناوچەی کوردنشین دەتوانێ ببێ بە هۆکارێکی تێکدەر لە بارودۆخی لەرزۆکی ئێستادا، بەتایبەت ئەگەر ئاژاوەکە دزە بکاتە ناو سوریاش.

دەبێ هەر چەشنە تێوەگلانێکی ئێران و ئیسرائیل لەم کێشەیە ئاشکرا بکرێت لەبەر ئەوەی عەرەبە رادیکاڵەکان پڕوپاگەندای ئەوە دەکەن کە هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەمە پیلانێکی نوێ دژی عەرەبەکانە کە بە هاندانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجام دەدرێت.

**لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا (بەڕێز جان فۆستێر)**

**بۆ: یارمەتیدەری تایبەتی سەرۆک کۆمار (بەڕێز روستۆ)**

**واشنگتۆن، ١٧ی تەموزی ١٩٦٨**

**نهێنی**

**بابەت: کودیتا لە عێراق و ئاسۆی چارەسەربوونی کێشەی کورد**

هەتا کاتێک کە پێشهاتەکان خۆیان نیشان نەدەن و زانیاری باشترمان دەست نەکەوێت، ئێمە هیچ نوێنەرایەتیەکمان لە بەغداد نابێت و بە هیچ شێوەیەک ناتوانین بڵێین کە ئاکامی کودیتاکەی شەوی رابردوو چی دەبێت[١٧٩]. ئێمە تەنانەت ناتوانین لەوە دڵنیا بین کە ئایا بانگەشەی رێبەرانی کودیتا دەربارەی ئەوەی کە پشتیوانی سەربازییان لە پشتە راستە یا نا. ئەمڕۆ لەوانەیە دژە کودیتایەک روو بدات.

بە گوێرەی هەڵسەنگاندنە سەرەتاییەکانی هەواڵگرانی ئێمە لە بەغداد، گروپی نوێ - وادیارە بەعسیەکانن - لە نموونە پێشووەکانی خۆیان کێشەی زۆرتریان دەبێت بەڵام لە حاڵی حازردا کەس نازانێت ئەم گروپە لە داهاتوودا چەندە رادیکاڵ دەبن. ئەم

---

[١٧٩]- لە ئەنجامی کودیتایەکی سەربازی (هەتا رادەیەک بێ خوێنڕێژی)، رژێمی سەرۆک "عارف" لە ١٧ی تەموز رووخا. ئەنجوومەنی نوێی فەرماندەیی شۆڕش کاتژمێر ٧ی سەرلەبەیانی بە تەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەتێکڕای دەنگ، جێگری پێشووی سەرۆک کۆمار و سەرژنەراڵی خانەنشین "احمد حسن البکر"ی وەک سەرۆک کۆماری عێراق هەڵبژارد. رادیۆ بەغداد پاشان رایگەیاند کە "عارف"، سەرۆک کۆماری پێشووی عێراق خانەنشین کراوە و دوورخراوەتەوە بۆ لای بنەماڵەکەی لە بریتانیا.

گروپە تا ئێستا لە راگەیاندننامەکانیدا، هێڵێکی میانەڕەوی گرتووەتە بەر (بە گوێرەی پێوانەکانی عێراق) و بەڵێنی چاکسازی ئابووری، پێکهاتنی حکوومەتێکی پاک و یەکدڵ، دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی عاقڵانە بۆ کێشەی کورد[180] و یەکێتی عەرەبی دژی هەڕەشەکانی سەهیونیزم و ئیمپریالیزم داوە. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر ئەم گروپە کودیتاچییە، بەعسی بن، بەریانیان (مەیل) بەرەولای نزیکترکردنەوەی عێراق لە "فتح" (مەبەستی رێکخراوی فەتحی فەلەستینە - وەرگێڕ)، سوریا و سۆڤیەت دەبێت.

لە روانگەی ئێمەوە گرنگترین پرسیار ئەوەیە کە ئایا کودیتاچییەکان درێژە بە پشتیوانی عێراق لە مەلیک حوسەین دەدەن یا نا. عێراق نزیکەی ٢٥ هەزار سەربازی لە ئوردۆن هەیە و بە ئاسانی دەتوانێت ژیانی مەلیک حوسەین بشێوێنێت.

ئەم یادداشتنامەیە تەنها بۆ ئەوە بوو کە باشترین هەڵسەنگاندنی خۆمان لە بارودۆخەکە پێشکەش بە ئێوە بکەین پێش ئەوەی ئێوە واشنگتۆن بەجێ بهێڵن.

جان[181]

---

[180] دەوڵەتی "عارف" لە جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی ئاگربەستی حوزەیران پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. بارزانی ئەوەی رەت کردەوەتەوە کە هێزە چەکدارەکانی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، مەگەر ئەو کاتە کە دەوڵەتی عێراق نیازپاکی خۆی نیشانبدات بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی بۆ بەخشینی ئۆتۆنۆمیەکی بەرتەسک بە کوردەکان لە باکوور و بە ئەندامبوونی دادپەروەرانەی کوردەکان لە پارلمانی عێراق و هەڵوەشاندنەوەی هێزە کوردەکان کە سەر بە دەوڵەتن و دژی بارزانین. لەهەمان کاتدا هێزەکانی بارزانی کونترۆڵی دۆفاکتۆی باکووریان لەدەستدایە و ئەم دواییانە یارمەتی سەربازی و مادی ئێران و ئیسرائیلیان بەدەست هێناوەتەوە (یادداشتی هەواڵگری ٤٨٨، ٢٠ی حوزەیران، هەمان سەرچاوە).

181 JOHN

## یادداشتنامەی کۆبوونەوەکان لە وەزارەتی دەرەوە

**واشنگتۆن، ٢٩ی گوڵانی ١٩٦٩**

**نهێنی**

**بابەت: دیداری لێژنەیەکی ئەمریکایی لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی و نامەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ وەزیرەی دەرەوەی ئەمریکا**

بەشداربووان:

بەڕێز زیا مەلیک ئیسماعیل

بەڕێز سام ئەندروز

بەڕێز ویلیام یۆنان

بەڕێز راجێر دەیویس لەلایەن NEA

بەڕێز برایان باس لەلایەن NEA/ARN

بەڕێز ئیسماعیل و بەڕێز ئاندروز لە سەرەتای نیسانی ١٩٦٩ سەردانی ئێرانیان کردووە و لە رێگای نوێنەری ئاسووریەکان لە مەجلیس (پارلمان)ی ئێران توانیویانە ئیزن لە خودی شا وەربگرن تا لە کوردستانی عێراق لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی دیدار بکەن. ئامانجی یەکەمی دیدارەکەیان ئەوە بووە کە لە بارودۆخی ئاسووریەکان لە ناوچە کوردنشینەکان دڵنیا ببنەوە. هێزە چەکدارەکانی ئێران بەڕێز ئیسماعیل و بەڕێز "ئاندروز"یان بە دەروەسبوونەوە بە هیلیکۆپتەر بردووە بۆ کوردستان، ٢٠ی نیسان گەیشتوونەتە ئەوێ و ٢٣ی نیسان گەڕاونەتەوە .

بەڕێز ئاندروز وتی هەموو ئێوارەیەک لەگەڵ مەلا مستەفا قسەوباس و گفتوگۆی تێروتەسەلیان کردووە و مەلا مستەفا نامەیەکی پێداون کە بۆ وەزیری دەورەوی ئەمریکا، بەڕێز راجێرز نووسیویەتی. ئەم نامەیە (کە کۆپییەکی هاوپێچ کراوە)بە شێوازی فەرمی هەفتەی داهاتوو بە ئامادەبوونی نوێنەری کورد لە واشینگتۆن، شەفیق قەزاز تەسلیم بە بەڕێز راجێرز دەکرێت. ئەوان رێگایان پێداین کۆپییەک لەم نامەیە هەڵبگرین بۆ زانیاری خۆمان. مەلا مستەفا بەتایبەت داوای لە بەڕێز ئاندروز و بەڕێز ئیسماعیل کردووە کە نامەکە بگەیەنن بە دەستی دەوڵەتی ئەمریکا. مەلا مستەفا دەیویست ئەوەمان پێبڵێت کە لە ژێر گوشاری هاوڕێکانیدایە بۆ ئەوەی دەست لە هێرش بۆ سەر دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکووک هەڵبگرێت. کوردەکان بە جیدی تاوتوێی ئەم مەسەلەیە دەکەن لە داهاتوودا. مەنتیقی کوردەکان بۆ ئەم هێرشانە ئەوەیە کە داهاتی نەوتی عێراق پێش لە هەموو شتێک بۆ کڕینی چەک بۆ هێرشکردنە سەر کوردەکان خەرج دەکرێت.

لە وەڵامی پرسیارێکی تایبەتی بەڕێز باس، بەڕێز ئاندروز وتی مەلا مستەفا لە بەرامبەر رێککەوتن لە سەر ئەوەی کە هێرش نەکاتە سەر دامەزراوە نەوتییەکانی کەرکووک، داوای هیچی لە ئێمە نەکرد. مەلا مستەفا دەیویست تەنها ئێمە خەبەرداری مەسەلەکە بین. بەڕێز ئاندروز وتی ئەڵبەتە مەلا مستەفا بە شوێن پشتیوانی هەموو لایەنێکدایە .

لە پەیوەندی لەگەڵ هەڕەشە بۆ سەر دامەزراوە نەوتییەکانی IPC (کومپانیای نەوتی عێراق- وەرگێڕ) لە کەرکووک وادیار بوو بەڕێز ئاندروز و بەڕێز ئیسماعیل خەبەریان لە هێرشی ئاداری ١٩٦٩ بۆ سەر ئەم دامەزراوانە نەبوو. ئەمە مەسەلەیەکی ئاڵۆزە چونکە کوردەکان بە گشتی هێرشەکانیان بۆ سەر ئەم دامەزراوە نەوتییانە توندتر کردووە .

بەڕێز ئاندروز وتی ئاسوورییەکان شانبەشانی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق شەڕ دەکەن و وادیارە متمانەیەکی تەواو لە نێوان کوردەکان و ئاسوورییەکاندا هەیە و هێزە شەڕوانەکانیان تێکەڵ بووە. لەم پەیوەندییەدا بەڕێز ئاندروز وتی دەوڵەتی ئێران

دڵنیای کردووەتەوە کە یارمەتی ئاسوورییەکان دەدات لە بەبەرەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا. ئاندروز هەروەها وتی لە تاران چاوی بە ئیسراییلیەکان کەوتووە و ئیسراییلیەکانیش دڵنیایان کردووەتەوە کە چەک بۆ ئاسوورییەکان دابین دەکەن. بەڕێز ئاندروز لە درێژەی قسەکانیدا وتی ئیسراییل چەک بۆ کوردەکان دابین دەکات و لە هەمان کاتیشدا ئێران خۆراک و پێداویستییەکانی دیکەیان بۆ دابین دەکات. بەڕێز ئاندروز ئاماژەی بەوە کرد کە ئێران بە گوێرەی ڕێژەی ناکۆکییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق یارمەتی کوردەکان دەدات و وتی مەلا مستەفا لای ئەو گلە و گازندەی کردووە کە هەر کاتێک ئێران و عێراق لە یەکدی نزیکتر دەبنەوە ئێران دڵۆپ دڵۆپ یارمەتیان دەدات. هەندێ جار(وەک ئێستا) ئێران باش پێداویستیەکانی کوردەکان دابین دەکات .

بەڕێز ئاندروز وتی ورەی کوردەکان زۆر بەرزە و شێلگیرن درێژە بە شەڕەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بدەن. ئێران، ئیسراییل و کوردەکان لە سەر ئەوە هاوڕان کە تەنانەت ئەگەر "مەلا مستەفا"ش کۆچی دوایی بکات کوردەکان ئەوەندە یەکێتیان هەیە کە بتوانن درێژە بە شەڕەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بدەن .

بەڕێز ئاندروز ئاماژەی بەوە کرد کە هێزەکانی جەلال تاڵەبانی کاریگەریان نەماوە. بەڕێز دەیویس وتی دوو مانگ لەمەوپێش دەنگۆی ئەوەی بیستووە کە جەلال تاڵەبانی لە پێکدادانێکدا لەگەڵ هێزەکانی بارزانی کوژراوە. بەڕێز ئاندروز وتی وادیارە جەلال تاڵەبانی هێشتا زیندووە و ئاماژەی بەوە کرد کە ئەو کاتە کە ئەوان دەنگۆی کوژرانی تاڵەبانیان بیستوە، تاڵەبانی و کۆمەڵێک لە لایەنگرەکانی هەوڵیانداوە بارزانی و ژمارەیەک لە هاوڕێکانی بخەنە ناو بۆسەوە بەڵام سەرنەکەوتوون و ٦٠ کەس لە لایەنگرانی تاڵەبانی کوژراون. هەم تاڵەبانی و هەم بارزانی لەو هەوڵی کوشتنە رزگاریان بوە.

لە وەڵامی پرسیارێکی بەڕێز "دەیویس"دا، بەڕێز ئاندروز وتی ئێستا هیچ وتووێژێک لە نێوان بارزانی و حکوومەتی عێراقدا لە ئارادا نییە .

بەڕێز ئاندروز ئاماژەی بە ئیمکانی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کورد و ئاسوورییەکان کرد و وتی دوابەدوای ئاگربەستی ١٩٦٤ لە نێوان کوردەکان و حکوومەتی عێراق، دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرنامەی TITLE IIلە باکووری عێراق داڕشتووە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی کوردە هەژارەکان بەڵام ئەم بەرنامەیە بە پچڕانی پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و عێراق کۆتایی پێهاتووە و ئیدی ئێمە ناتوانین کاریکی ئەوتۆ بکەین بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی کەمینەکانی عێراق. بەڕێز دەیویس وتی ئێمە زۆر خەمی کەمینەکانی عێراق دەخۆین لەوانە کوردەکان، ئاسوورییەکان، جولەکەکان، کەلدانییەکان و ئەوانی دیکە .

بەڕێز ئاندروز وتی دەبێت لەم پەیوەندییەدا لەگەڵ شەفیق قەزاز قسە بکات و پاشان لەگەڵ بەڕێز "باس" پەیوەندی دەگرێتەوە بۆ ئەوەی کاتێک دیاری بکەن بۆ دیدار لەگەڵ یەکدی بۆ ئەوەی نامەکەی مەلا مستەفا تەسلیم بە وەزارەتی دەرەوە بکرێت. بەڕێز ئاندروز وتی ئامادەیە لەم پەیوەندییدا هەر یارمەتییەک لە دەستی دێت بیکات و وتی هەرکاتێ بەشداربووان بیانەوێت لەگەڵیان دادەنیشێت. بەڕێز دەیویس سپاسی بەڕێز "ئاندروز"ی کرد و وتی خۆشحاڵین کە ئەم کانالە نوێیەمان بۆ پەیوەندی و هاتوچۆ هەیە.

هاوپێچ: کۆپی نامەکەی مەلا مستەفا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بە ژمارەی LS T-58 56 100کە بەشی خزمەتگوزارییەکانی زمان لە وەزارەتی دەرەوە لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە ئینگلیزی .

## دەقی نامەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ وەزیرەی دەرەوەی ئەمریکا

بەڕێز جەنابی "ویلیام راجێرز"، وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا
سڵاو و رێز

ئێوە لەو راستییە ئاگادارن کە خەڵکی کوردستانی عێراق زیاتر لە حەفت ساڵ و نیوە بووە بە قوربانی شەڕی رەگەزی دیکتاتورەکانی بەغداد کە لەرێگای کودیتایەکی سەربازی خوێناوییەوە گەیشتوونە بە دەسەڵات .

زێدەباری ئەو مەترسییە کە ئامانجی ئەم شەڕە لەناوبردنی ئامانجە ڕەواکان و خودی خەڵکی ئێمەیە (هەم کورد و هەم ئاسووریەکان) و بووە بە کارەسات و نەهامەتی بۆ سەرجەم قوربانییەکان و هەموو خەڵکی کوردستان، بەتایبەت ئاسووری و کوردەکانی لە پەروەردە و پێداویستی تەندروستی بێبەش کردووە و دەیان هەزار کەسیانی لێ ئاوارە کردووە. هەمووی ئەمانە بووە بە نەهامەتی بۆ ئێمە تەنها لە بەر ئەوەی داوای مافە نەتەوەیی و مرۆڤییە ڕەوا و بنەڕەتییەکانی خۆمان دەکەین کە ئێمە (وەک نەتەوەکانی دیکە) دەبێ هەمانبێت. نە یەک جار بەڵکوو بە جاران خەڵکی ئێمە دەست بە داوێنی خەڵک و حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە بۆ ئەوەی تا ئەو شوێنەی کە پێی دەکرێت یارمەتیمان بدات، هەروا کە لە هەموو بوارەکاندا یارمەتی خەڵکی گەشەنەکردووی جیهان دەدات .

ئێستا دیسان لە ڕێگای جەنابتەوە داوا لە خەڵک و دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەین یارمەتیمان بدەن و هیوادارین ئیدارەی سەرۆک نیکسۆن ئەم جارە خێرخوازتر بێت بە نیسبەت ئامانجی ئێمە و ئەم داواکارییەی ئێمە لە لایەن ئێوەوە بە هەند وەربگیردرێت و لەگەڵ هاوخەمی و پشتیوانی ئیوە ڕووبەڕوو بێتەوە.

هەر هەنگاوێکی جیدی کە ئیوە لە پێناو ئەم ئامانجەدا هەڵیبگرن، دەبێتە هۆی سپاس و پێزانینی بێ پایان و پشتیوانی خەڵکی ئێمە لە ئێوە و هەروەها گەورەیی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەسەلمێنێت کە ئامانجی خزمەتکردن بە مرۆڤایەتی و پشتێوانی لە نەتەوە بچووکە بندەست و چەوساوەکانە.

لێژنەیەک پیکهاتوو لە شەفیق قەزاز، مەلیک ئیسماعیل و سام ئەندروز لە لایەن منەوە ڕێگاپێدراون لایەنە جۆراوجۆرەکانی کێشەکەی ئێمە بە وردی بخەنە بەر باس.

هیوادارم ئەم لێژنەیە لە لایەن ئێوەوە بە هەند وەربگیردرێت.

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا

مستەفا بارزانی

١٩٦٩ /٤/٢٢

## یادداشتنامەی کۆبوونەوەکان لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

واشنگتۆن، ١٣ی حوزەیرانی ١٩٦٩،

نهێنی

بابەت: ناوەرۆکی دانیشتنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ نوێنەری مەلا مستەفا بارزانی

بەشداربووان:

بەڕێز ویلیام یونان، سەرۆکی فدراسیونی ئاسووری- ئەمریکایی

بەڕێز سام ئەندروز، سکرتێری فدراسیونی ئاسووری- ئەمریکایی

بەڕێز زیا مەلیک ئیسماعیل، نوێنەری ئاسوورییەکان لە سووریا

دۆکتۆر پیرلی، نوێنەری یاسایی فدراسیونی ئاسووری- ئەمریکایی

بەڕێز شەفیق قەزاز، نوێنەری شۆڕشی کورد لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

بەڕێز تالکۆت سیلی لە لایەن-NEA/ARN[١٨٢]وە

بەڕێز برایان پ باس لە لایەن-NEA/ARNوە

لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا بەڕێز قەزاز وتی ئامانجی سەرەکی دیدارەکەی ئەوە بووە کە نامەکەی مەلا مستەفا بارزانی تەسلیم بە وەزیری دەرەوە، ویلیام راجێرز بکات .

---

[١٨٢] NEA/ARN بە ئۆفیسی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا و ئۆفیسی کاروباری لوبنان، سوریە، ئوردون و عێراق لە وەزارەتی دەرەوی ئەمریکا دەوترێت. وەرگێڕ

- لەم نامەیەدا داوا لە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان کراوە یارمەتی بە خەباتی کورد و ئاسووریەکان دژی حکوومەتی عێراق بدات. بەڕێز سیلی نامەکەی وەرگرت و ناوبراوی دڵنیا کردەوە کە نامەکە دەگەیەنێتە دەستی وەزیری دەرەوە .

- بەڕێز ئاندروز و بەڕێز ئیسماعیل هەمان قسەو باسەکانی کۆبوونەوەکەی ۲۹ی مانگی گوڵانیان دووپات کردەوە کە بە عەرزی بەڕێز (دەیویس)یان گەیاندبوو. بەڕێز قەزاز باسی لایەنێکی دیکەی مەسەلەکەی کرد و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە کوردەکان هەست دەکەن ناچارن کردەوەیەکی یەکلاییکەرەوە دژی دەوڵەتی عێراق ئەنجام بدەن. قەزاز وتی ئێستا زۆرتر لە هەر کاتێکی دیکە لە ماوەی ۸ساڵی رابردوودا پێویستە کوردەکان هێرش بکەنە سەر دامەزراوە نەوتییەکانی IPC و جەرەیانی نەوت تێکبدەن و ئاماژەی بەوە کرد کە داهاتی نەوت شتێکی زۆر یەکلاییکەرەوەیە بۆ ئابووری عێراق و ئەگەر ئەم داهاتە بپچڕێت ئابووری وڵات تووشی توندترین زەبر دەبێت و خودی دەوڵەتەکەش لاواز دەبێت (لاوازترین حالەت لە مێژووی دامەزرانی دەوڵەتی عێراقدا) و پارەی نامێنێت چەکی پێبکڕێت و هەوڵە شەڕەنگێزانەکانی بە توندی کەم دەبێتەوە.

- قەزاز داوای یارمەتی لە حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد. ناوبراو زۆر راشکاوانە قسەی نەدەکرد بەڵام وتی کوردەکان پێویستیان بە پارە هەیە بۆ کڕینی چەک و پێداویستییەکانی دیکە. قەزاز ئاماژەی بە کوێرەوەرییەکانی کوردەکان لە باکووری عێراق و بەدخۆراکی لە نیو منداڵان و نەبوونی پێداویستی تەندروستی کرد. قەزاز وتی ئەگەر پێداویستییە بنەڕەتییەکانی کوردەکان دابین بکرێت دەتوانن خۆیان بە سەر عێراقدا زاڵ بکەن و ئیدی پێویستیان بە یارمەتی نامێنێت. قەزاز وتی ئێستا ۲۵ هەزار کورد چەکدارن.

لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی یارمەتیدانی ئێران و ئیسرائیل، قەزاز یارمەتیدانی ئەم دوو سەرچاوەیەی پشتڕاست کردەوە بەڵام وتی ئەم یارمەتییە وەکوو پێویست نییە. پاش تۆزێ قسە و باس کاتێک کە روون بووەوە حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان نایەوێت یارمەتی کوردەکان بدات بەڕێز قەزاز وتی ئەگەر کوردەکان لە

بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمییەکی سنووردار یا سەربەخۆییدا سەربکەون ئەوەیان قەد لە بیر ناچێت چ لایەنگەلێک لە رۆژی تەنگانەدا لە یارمەتیدانیان درێغی کردووە .

- بەڕێز سیلی زۆر راشکاوانە وتی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان نایەوێت بکەوێتە ناو ئەم جۆرە ئۆپەراسیونە نهێنییانە و بەڕێز یونان وەک نموونە ئاماژەی بە چوونی هێزە سەربازییە دەریاوانییەکانی ئەمریکا بۆ لوبنان لە ١٩٥٨ کرد. بەڕێز سیلی وتی ئێستا کاتەکە گۆڕاوە و هەڵوێستی بیروڕای گشتی ئەمریکاش دەربارەی مەسەلەی گورخییەکانی (ماجەراجوویی) دەرەوە بە تەواوی جیاوازە. وادیار بوو بەڕێز قەزاز زۆر بە روونی تێگەیشت کە یارمەتی نهێنی لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان بە کوردەکان لە ئارادا نییە .

- بەڕێز سیلی دەربارەی یارمەتی رێکخراوە نیونەتەوەییەکان بە کوردە هەژارەکان لە قەزاز پرسیاری کرد. بەڕێز قەزاز وتی JCRC لە رێگای رێکخراوی مانگی سووری ئێرانی هەندێ یارمەتی کوردەکانی داوە بەڵام رێکخراوی خاچی سووری ئەمریکی هیچ یارمەتییەکی بە کوردەکان نەداوە و هەست دەکات دەرگای یارمەتی ئەم رێکخراوەیە بە تەواوی بە رووی کوردەکان داخراوە. لە پەیوەندی لەگەڵ کێشەی کورد لە روانگەی مرۆڤدۆستانەوە بەڕێز قەزاز وتی کوردەکان دەست بە داوێنی UTHANT بوونە بۆ ئەوەی کێشەکەیان لە کومیسیونی مافی مرۆڤ بخاتە روو بەڵام وادیارە هیچ ئاکامێکی نەبووە .

- بەڕێز سیلی پرسیاری لە بەڕێز قەزاز کرد کە کوردەکان بە نیازن چی لەو یارمەتییە بکەن کە داوای دەکەن. بەڕێز قەزاز وتی کوردەکان دەیانەوێت رژیمی ئێستای عێراق بڕوخێت و دەوڵەتێک جێگای بگرێتەوە کە زۆرتر هاوکاری کوردەکان بکات. ناوبراو روونی نەکردەوە چۆن دەکرێت ئەم ئامانجە جێبەجێ بێت. بە هەرحال قەزاز پێداگری لە سەر ئەوە کرد کە کوردەکان قەد هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتێکی عێراقی ناکەن کە مافەکانی کورد بە فەرمی قبوول نەکات و هەروەها وتی هەرچەند کە کوردەکان خوازیاری سەربەخۆیی نین (بەڵکوو داوای ئۆتۆنۆمییەکی سنووردار و سەروەری کولتووری دەکەن) بەڵام ناتوانێت زەمانەتی جۆری داواکارییەکانیان لە ٥ یا ١٠ساڵی

داهاتوودا بکات. به واتایەکی دیکه کوردەکان به تەواوی بیزار بوونه و هیچ متمانەکیان به عەرەبەکانی عێراق نەماوە و نایانەوێت لەگەڵیان بسازێن.

- بەشداربووە ئاسوورییەکان وتیان ئاسوورییەکانی ناوچه کوردنشینەکان چوونەته پاڵ کوردەکان له خەبات دژی عێراق و شانبەشانی کوردەکان شەڕ دەکەن و یەکێ له حیمایەکانی ئیدریس بارزانی (ئیدریس کوڕی مەلا مستەفایە و یەکێ له فەرماندەکانی هێزە کوردەکانە) ئاسوورییە. بەڕێز سیلی ئاماژەی بەوە کرد که بەشداری ئاسوورییەکان له شۆڕشی کورد کۆمەڵێک مەترسی بۆ کۆمەڵگای ئاسووری به گشتی له عێراق به دواوە دەبێت.

- بەڕێز سیلی بەڕێز قەزازی دڵنیا کردەوە که ویلایەته یەکگرتووەکان خەمخۆری ئێش و کوێرەوەرییەکانی کورد و ئاسوورییەکانه بەڵام بەهەرحاڵ پشتیوانی له دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد و ئاسوری ناکات و ئامادە نییه به نهێنی یا به ئاشکرا پشتیوانی لەم ئامانجه بکات. بەڕێز سیلی ئەوەشی زیاد کرد که ویلایەته یەکگرتووەکان بەرژەوەندی زۆری له ناوچه هەیه و ناچارە حیساب بۆ ئەم بەرژەوەندیانەش بکات .

- له کۆتاییدا بەڕێز سیلی وتی به بیروبۆچوونی ئەو، ئەم دانیشتنه سودمەند بووە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا و وتی خۆشحاڵ دەبێت دیسان له داهاتوودا پێکەوە گفتوگۆ بکەن.

کاتێک که بەڕێز قەزاز له کۆبوونەوەکه دەچووە دەرەوە، دۆکتۆر پیرلی بەڕێز (باس)ی کێشایه سووچێک و پێی وت له راستیدا لایەنگری دەوڵەتی سەربەخۆی کورد نییه چونکه دەزانێت ئەوکاته کوردە مسڵمانەکان دەستبەجێ دژی ئاسووریه مەسیحیەکان رادەپەڕن .

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا (CIA)

واشینگتۆن

بەتەواوی نهێنی، هەستیار

٩ی ئاداری ١٩٧٠

DOI 4-7 country Iran/Iraq/Israel

بابەت: دیداری ئەندامێکی سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسرائیل

بۆ زانیاری:

- دۆکتۆر "رەی ستینیر کلین"[١٨٣] لە وەزارەتی دەرەوە
- "ژنێراڵ بنێت"[١٨٤] لە ئاژانسی هەواڵگری وەزارەتی بەرگری
- "ژنێراڵ مەک کریستیەن"[١٨٥] لە بەشی جێگری فەرماندەیی ستادی سوپای ئەمریکا/ ناوەندی فەرماندەیی سەربازی نیشتمانی
- ئەدمیراڵ "هارلفینگیر"[١٨٦]، جێگری سەرۆکی شاڵاوە دەریاییەکانی هێزی دەریاوانی ئەمریکا
- ئەدمیراڵ گایلێر[١٨٧] لە ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی

---

[183] dr. Ray S. Cline

[184] General Bennett

[185] General Mcchristian

[186] Admiral Harlfinger

- ژنێیراڵ تیریانتافلۆ[188] لە ناوەندی فەرماندەیی هێزی هەوایی

٩- بەڕێز[189] ... ڕوژی ٤ی ئاداری ١٩٧٠ لەسەر بانگهێشتی ڕێکخراوی ئاسایش و هەواڵگری نیشتمانی ئێران (SAVAK) گەیشتە تاران بۆ ئەوەی دەربارەی مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە داهاتووی شۆڕشی کورد باس و گفتوگۆ بکات. ڕوژی ٤ و ٥ی ئادار...، سامی سنجاری و ئەمیر قاسمی[190] لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی ئیسرائیل دیداریان کرد. کاربەدەستە ئیسرائیلیەکان نوینەرە کوردەکانیان زۆر هاندا بۆ ئەوەی لە باکووری عێراق دەست بە شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد بکەنەوە و بەڵێنیان پێدان ئیسرائیل چەکی دژە فڕۆکە و تۆپ و هاوەنیان بداتێ.

... داوای لە کاربەدەستە ئیسرائیلیەکان کرد ئوتومبیلی نەفەرهەڵگری زرەهی گەورە و بچوک بدەن بە کورد و کاربەدەستە ئیسرائیلیەکانیش ئەو داواکاریەیان قبووڵ کرد.

لە گفتوگۆکانی ڕۆژی دواتردا ئیسرائیلیەکان بەڵێنیاندا لە ڕێگای ئێرانەوە تانک و پسپۆڕی بەکارهێنانی تانک بدەن بە کوردەکان بەڵام وتیان دەبێ (هێزەکانی) مەلا مستەفا بارزانی هەوڵ بدەن دەست بەسەر لانیکەم دوو تانکی هێزەکانی عێراقدا بگرن (بۆ ئەوەی وا نیشان بدەن کە ئەو تانکانە کە ئیسرائیل داویەتی بە کوردەکان، کوردەکان خۆیان لە هێزەکانی عێراق سەندویانە).

---

[187] Admiral Gayler

[188] General Triantafellu

[189] بەلەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی نەتەوەیی ناوی ئەو ئەندامەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد لەلایەن وەرگێڕەوە ڕەش کراوەتەوە.

[190] مەبەستی لە سامی سنجاری، شەهید سامی عەبدوڕەحمانە کە ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول بوو. مەبەستی لە ئەمیر قاسمی، خوالێخۆشبوو شەمسەدین موفتییە کە نوێنەری شۆڕشی ئەیلوول بوو لە تاران. وەرگێڕ

... وتی وای پێباشترە نەفەرەکانی بەکارهێنەری ئەو تانکانە خودی کوردەکان بن و داوای لە کاربەدەستە ئیسرائیلیەکان کرد کورد فێر بکەن چۆن ئەو تانکانە بەکاربێنێت. ئیسرائیلیەکانیش بە خۆشحاڵییەوە ئەو داواکاریەیان قبووڵ کرد.

٢- ... ڕۆژی ٦ی ئادار لەگەل ژنێراڵ نیعمەتوڵا نەسیری[١٩١]، سەرۆکی SAVAK دیداری کرد. نەسیری وتی ئێران دەیەوێت زیاتر یارمەتی مەلا مستەفا بارزانی بدات و ئامارەی بەوە کرد کە ئێران نیگەرانی وتووێژەکانی بارزانی لەگەڵ ڕژیمی عێراقە. نەسیری هەروەها وتی ئێران بە تەواوی پشتگیری لە پلانەکەی ئیسرائیل بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ لە باکووری عێراق دەکات و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە دەبێ... بە دیقەت پێشنیارەکانی ئیسرائیل بنووسێت.

... ڕۆژی ٧ی ئادار دیسان لەگەڵ نەسیری دیداری کرد بۆ ئەوەی زیاتر پێشنیارەکانی ئیسرائیل تاوتوێ بکەن.

٣- مانگی ڕابردوو دەوڵەتی ئیسرائیل و ئێران بایی یەک ملیۆن و دووسەد هەزار دیناری عێراق (سێ ملیۆن و سێسەد و شەست هەزار دولاری ئەمریکا) یارمەتی بارزانییان داوە.

[191] General Nematollah Nasseri

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئێران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینتۆن**

**١٢ی ئاداری ١٩٧٠**

**نهێنی**

**بابەت: نیگەرانی توندی شای ئێران لە ڕێکەوتنی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق و هەڕەشەکانی سۆڤیەت- عێراق بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جەدە، کوەیت، لەندەن و کونسولخانەی ئەمریکا لە زەهرانی عربستانی سعودی

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٦٧ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

سەروک وەزیرانی ئێران، (ئەمیر عەباس) هوەیدا[١٩٢] ئەمرۆ (١٢ی ئادار) داوای لێکردم سەردانی بکەم. هوەیدا وتی شا ئێوارەی دوێنێ ڕێنوێنی کردوە لەگەڵ من دیدار بکات و گفتوکانی من و شا لە بەرواری ١٤ی کانوونی دووەم دەربارەی هەڕەشەکانی سۆڤیەت -عێراق بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەبیرم بهێنێتەوە. هەروەها کە شا لێی دەترسا سۆڤیەت هەنگاوێکی دیکەی بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی خۆی لەڕێگای دروستکردنی هەرێمێکی ئوتونومی کوردنشین لە عێراق هەڵگرتوە. هوەیدا وتی بارزانی ٣ ڕۆژ لەمەوپێش بە دڵنیایەکی زۆرەوە دەوڵەتی عێراقی ئاگادار کردوەتەوە

---

192 - HOVEYDA

که بەهۆی ئەوەی دەوڵەتی عێراق دانی بە هەرێمی ئۆتونومی کوردستاندا ناوە و سەرجەم داواکاریە گرنگەکانی دیکەی کوردەکانی قبووڵ کردوە، ئیدی هیچ هۆکارێکی راستەقینە بۆ کوردەکان لە ئارادا نیە تا درێژە بە خەباتەکەیان دژی دەوڵەتی بەغداد بدەن. هویدا وتی پێشگۆییەکانی شا لەو کاتەدا زۆر لە جێگای خۆیدا بوە دەربارەی ئەو شتانە کە سۆڤیەت و عەرەبە توندئاژۆکانی دیکە بۆ دزەکردن لە شوێنەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (واتا لیبیا، سودان، سومالی، باشوری یەمەن و...) ئەنجامی بدەن و هەروەها ئەو شتانە کە سۆڤیەت دەیەوێ لە عێراقدا ئەنجامی بدات. بەگوێرەی زانیاریە باوەڕپێکراوەکان ملدانی عێراق بە ئۆتونومی کوردەکان، ئەنجامی راستەوخۆی گوشاری سۆڤیەت لە سەر دەوڵەتی بەغداد بوە[١٩٣].

٢- شاه دەیەوێت کاربەدەستانی پایەبەرزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بزانن کە رێکەوتننامەی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق پێشهاتێکی نگریسە کە هەڕەشەکان لە سەر هەرێمی کەنداو و نیمچە دورگەی عەرەب زیاتر دەکات چونکە:

الف - هەروەها کە هەواڵنێری BBC سەرلەبەیانی ئەمڕۆ بڵاوی کردەوە ئەو رێکەوتننامەیە دەستی عێراق ئاوەڵا دەکات تا نزیکەی ٢٠ هەزار سەربازی عێراق لە کەنداو جێگیر بکات.

---

[١٩٣] باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران مانگی ئاداری ١٩٧٠ تیلێگرامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوە کە تێیدا نووسراوە، مەکئارتور، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران رۆژی ١٨ی ئادار سەردانی شای کردوە و شا هەر لە سەرەتای قسەکانیدا نیگەرانی خۆی بەنیسبەت رێکەوتننامەکەی ١١ی ئادار دەربڕیوە و وتویەتی ئەو رێکەوتننامەیە پێگەی عێراق بەهێزتر دەکات و توانایی عێراق زیاتر دەکات بۆ ئەوەی خراپکاری لە کەنداو بکات. شا هەروەها ئاماژەی بەوە کردوە کە ئەو رێکەوتننامەیە لە ئەنجامی گوشاری سۆڤیەت لە سەر دەوڵەتی عێراق و هەوڵەکانی شیوعیەکانی عێراق واژۆ کراوە و وتویەتی کە شیوعیەکان هەم لە لێژنەی کوردەکان و هەم لە لێژنەی دەوڵەتی عێراقدا بۆ گفتوگۆکانی رێکەوتننامەکە بەشداریان کردوە. شا لە کۆتایی قسەکانیدا وتویەتی هیوادارم کە ئەو ریکەوتننامەیە هەڵبوەشێتەوە. وەرگێڕ.

ب- ئەو ڕێکەوتننامەیە سەرچاوە و سەرمایەکانی عێراق بۆ کاری خراپکارانە و کردەوەی خراپتری دیکە دژی دەوڵەتانی بچوکی کەنداو زیاتر دەکات.

ج - ڕوونە کە دەوڵەتی عێراق یەکجار زۆر لە ژێر کاریگەری سۆڤیەتدایە چونکە پشتی بە هێزی سەربازی سۆڤیەت و یارمەتیەکانی دیکەی سۆڤیەت بەستوە بۆ ئەوەی درێژە بە مانی خۆی بدات.

د- ئەو ڕێکەوتننامەیە ڕێگا بۆ جێبەجێبوونی قۆناخی دواتری پیلانی سۆڤیەت خوش دەکات کە بریتیە لە وەی کە هێدی هێدی هەرێمی ئۆتونومی کوردستانی عێراق ئەوەندە بەرفراوان بکات کە وڵاتێکی سەربەخۆی کورد دابمەزرێت کە ببێت بە دراوسێی سنورەکانی یەکێتی سۆڤیەت، کەوابوو بەمشێوەیە سۆڤیەت دەتوانێت ئەو لەمپەرە بشکێنێت کە ئێستا بە هۆی ئێران و تورکیە لە بەرامبەر دزەکردنی ڕاستەوخۆی سۆڤیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێکهاتوە.

ی - سۆڤیەت دەست ناکات بە وروژاندنی هەستی نەتەوەیی بەهێزی کوردەکان، و کوردەکانی ئێران و تورکیە بۆ کردەوەی خراپکارانە هان نادات مەگەر بەو ئامانجە کە وڵاتێکی سەربەخۆی کورد دابمەزرێنێت.

٣- شا داوای لە هوەیدا کردوە بە ئێمە رابگەیەنێت کە لە ڕوانگەی شاوە گرنگی ئەم پێشهاتانە لەوەدایە کە ئێمە دەبێ زیاتر یارمەتی ئێران بدەین بۆ ئەوەی تەیار بکرێت و لە ڕوی سەربازیەوە بەهێزتر بکرێت بۆ ئەوەی پێش لە چونەدەرەوەی بریتانیا لە کەنداو لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١ بتوانێت لانیکەم لە سەر پێی خۆی ڕابوەستێت. جگە لەوەش شا هیوادارە کە ئەم پێشهاتانە ببێتە هۆی ئەوە کە پلانی دوایی، بەتایبەت یارمەتی ئابووری کەرتی تایبەتیFMS ی ئەمریکا بە ئێران لە ٢٥ % بۆ ٧٥% زیاد بکرێت چونکە سەرچاوە مادیەکانی ئێران ڕووی لە کەمبوونەوە کردوە.

٥- من به "هوەیدا"م وت بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بیروبۆچونەکانی شا بە کاربەدەستانی ئەمریکا ڕادەگەیەنم و وتم هەروەها کە خودی شا دەزانێت ئێمە لەگەڵ کێشەی ئێراندا زۆر هاوخەمین و لەگەڵ ئەوەدا هاوڕاین کە ئێرانێکی بەهێز و سەقامگیر دەتوانێت یارمەتییەکی بەرچاو بە ئاشتی و سەقامگیری کەنداو بدات، هەربۆیە ئێمە لە ڕووی هەندێ مەسەلەوە (کە هەروەها کە لە تیلیگرامی ٧٤٨١ ی باڵوێزخانەی تاراندا هاتوە، بە وردی بۆ خودی شام باس کردوە) بەشێوەیەکی تایبەت لەگەڵ ئێران هەڵسوکەوتمان کردوە. دەربارەی یارمەتی مادی FMS بە "هوەیدا"م وت ئێمە لەگەڵ ئێران هاوڕاین بەڵام دەبێ کۆنگریس پەسەندی بکات و کاری بۆ بکەین، کەوابوو ناتوانم بەڵێن بە شا بدەم ئەو داواکاریە جێبەجێ دەبێت.

مەک ئارتور[١٩٤]

[194] - MACARTHUR

**له وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**١٤ی ئاداری ١٩٧٠**

**نهێنی**

**بابەت: ئەنجام و ئاکامەکانی رێکەوتننامەی دەوڵەتی عێراق و کوردەکان**

ئاماژە بە تیلیگرامی ٩٢٨ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- ئێوە لە کاتی گفتوگۆکانتان لەگەڵ عەلەم[١٩٥] و لە کاتی گفتوگۆی زیاتر لەگەڵ هەر کاربەدەستێکی پایەبەرزی ئێران کە پەیوەندی بە پێشهاتەکانی عێراق و پیلانگێڕییەکانی سۆڤیەت هەیە ئەم خاڵانە لەبەر چاو بگرن:

٢- هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە لەگەڵ ئەوە هاوڕاین کە رێکەوتننامە راگەیەندراوەکەی نێوان دەوڵەتی عێراق و کوردەکان ئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت بەڵام پرسیارەکەی ئێمە ئەوەیە کە ئایا ئەم رێکەوتننامەیە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت یا نا. ئەگەر بە وردی مادەی ١٥ی ئەو رێکەوتننامەیە بخوێنینەوە ئەو پرسیارە زۆر گرنگەمان لا درست دەبێت کە لە راستیدا هەرێمی کوردستان دەگات بە چی رێژە ئۆتۆنومیەک چونکە توخمە سەرەکیەکانی هەر جۆرە رێکەوتننامەیەکی درێژخایەن کە شیمانەی جێبەجێکردنی لێبکرێت دەبێ بەشێوەیەکی جدی روون بێت. کەوابوو گومان

---

[١٩٥] - ئەسەدوڵا عەلەم وەزیری دەرباری ئێران و نزیکترین کەس لە شا بوە. وەرگێڕ

لەوەدا هەیە کە دەوڵەتی عێراق ئاراستەی سەرنجدان و جموجۆڵەکانی خۆی بەشێوەیەکی بەرچاو لە کوردستانەوە بەرەو ئێران و کەنداوی فارس بگۆڕێت. جگە لەوەش ئەگەر شتێکی وا روو بدات، چاوەڕوان دەکرێت هێزی سەربازی سەرلە نوێ لە ئوردن و سوریاوە بەڕێ بکرێت نە باشوری عێراق.

ئێمە لەگەڵ ئەوەدا هاوڕاین کە سۆڤیەت رێکەوتنی کوردەکان و دەوڵەتی عێراقی هانداوە بەڵام بەتەواوی روون نیە کە لە راستیدا سۆڤیەت چەندە کاریگەری لە سەر پێکهاتنی ئەو رێکەوتننامەیە هەبوە. هەڵوێستی سۆڤیەت بەنیسبەت کوردەکان هەوراز و نشێوی زۆری بەخۆوە بینیوە و بە گشتی لە سەر بنەمای سیاسەتەکانی دیکەی سۆڤیەت لە ناوچە بوە. هیچ گومان لەوەدا نیە کە چاوەڕوان دەکرا سرمایەگوزاری گرنگی سۆڤیەت لە ناو دەوڵەتی بەغداد بە هۆی ناکۆکیە ناوخۆیەکان نەمێنێت کەوابوو سۆڤیەت وای بە باشتر زانیوە کوردەکان و دەوڵەتی عێراق رێکبکەون[١٩٦].

٤- هەرچەند کە سۆڤیەت پێیخۆشە پێگە و دەسترۆیشتوی خۆی لە نیو کوردەکان بەرفراوانتر بکات بەڵام ئێمە گومانمان هەیە کە ئەمە تەنها ئامانجی سۆڤیەت لە داهاتویەکی نزیکدا بێت. ئێمە بەتایبەت ئەوە بە دور دەزانین کە سۆڤیەت هەوڵ بدات "کرۆدۆریکی کوردی" لەم کاتەدا درست بکات. درستکردنی ئەم کریدۆرە کۆمەڵێک پرسیار لە نیو عەرەبەکانی دۆستی سۆڤیەت دەربارەی قەسد و نیازی راستەقینەی سۆڤیەت درست دەکات چونکە عەرەبەکان دەبێنن کە هەرێمێکی گرنگ لە وڵاتێکی

---

[١٩٦]- لە تیلیگرامی ٩٢٨ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە لە بەرواری ١٢ی ئادار، مەک ئارتور، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران وتویەتی شا ئەوپەڕی نیگەرانی خۆی بە نیسبەت دەسترۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق لە رێگای پێکهاتنی هەرێمیکی ئوتونومی کوردی لە عێراق دەربڕیوە.

عەرەبی دادەبڕدرێت. جگە لەوەش وادیارە کە عەرەبەکان نایانەوێت لەرێگای بەرنامەیەک کە لەوانەیە کاردانەوەیٔ توندی ئێران و تورکیای لێبکەوێتەوە، پەیوەندیە هەستیارەکانی خۆیان لەگەڵ ئێران و تورکیە بخەنە ناو مەترسیەوە.

٥- ئەڵبەتە ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچونە گشتیەی دەوڵەتی عێراقدا هاوڕاین کە ئەو رێکەوتننامەیە پێشهاتێکی گرنگە کە شایانی سەرەنجپێدانی وردتر و بەردەوامە. ئێمە نیگەرانبوونی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت ئەو مەسەلەیە بەرز دەنرخێنین و پێشوازی لە هەر چەشنە بیروبۆچونێکی دیکە لەم پەیوەندیەدا دەکەین.

رۆجیرز

**ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)،**

**IN 143628 CITE TDCS -314 /70-8439 عێراق**

**١٠ی ئابی ١٩٧٠**

**نهێنی**

**بابەت: ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق و ئەگەری دەستپێکردنەوەی شەڕ**

١- پەیوەندییەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق ئاڵۆزە. کوردەکانی بارزانی داوای پێکهاتنی بەرەیەکی نیشتمانی، ئازادی حزبە سیاسیەکان و جێبەجێبونی خێرای ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەکەن کە لەنێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا واژۆ کراوە. ڕژێمی عێراق بەتوندی دژی دوو داواکاریە سەرەتایەکەی کوردەکان (پێکهاتنی بەرەیەکی نیشتمانی، ئازادی حزبە سیاسیەکان) ڕاوەستاوە و هەر چەند کە نیازپاکی و ئامادەیی خۆی بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەربڕیوە بەڵام بڕیاریداوە زۆر بە هێواشی بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێکەوتننامەیە هەنگاو هەڵبگرێت.

٢- پشتیوانیکردنی کوردەکان لە پشتگیری ڕوونی ویلیام ڕاجیرز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پێشنیاری ئاشتی (ئیسرائیل - فەلەستین) و قبوڵکردنی ڕێگاچارەی ئاشتیخوازانە بۆ کێشەی فەلەستین لە لایەن جەمال عبدالناسر، سەرۆک کۆماری میسر بوە بە یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی گرژبوونی پەیوەندیەکانی کوردەکان و

دەوڵەتی عێراق. بەپێچەوانەی دەوڵەتی عێراق کە هێرشی کردوەتە سەر پێشنیارەکانی ئاشتی (نێوان ئیسرائیل - فەلەستین)، رۆژنامەی التاخی، زمانحاڵی کوردەکانی بارزانی پشتیوانی لەو پێشنیارانە کردوە.

٣- کوردەکانی بارزانی پێشبینی ئەوە دەکەن کە شەڕەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دەستپێدەکاتەوە، هەر بۆیە خۆیان بەهێزتر دەکەن و بۆ هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنەکانی دیکە هەوڵ دەدەن. کوردەکان هەوڵ دەدەن هێزەکانی جەلال تالەبانی پەراوێز بخەن و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە ئەو کەسانە کە رێبەرایەتی بارزانی قبووڵ دەکەن بەرەولای خۆیان رادەکێشن وهێرش دەکەنە سەر ئەو کەسانە کە رێبەرایەتی بارزانی رەت دەکەنەوە. کوردەکانی بارزانی چەند نوێنەرێکیان ناردوە بۆ لەندەن بۆ ئەوەی قەناعەت بە ئیبراهیم ئەحمەد، هاوکاری جەلال تاڵەبانی، بهێنن پەیوەست بێت بە ریزەکانی بارزانی. کوردەکانی بارزانی هەروەها پەیوەندی کاریی نزیکیان لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق (CPI) درست کردوە. حزبی شیوعی عێراق پشتیوانی لە داواکاریەکانی کوردەکان بۆ پێکهاتنی بەرەیەکی نیشتمانی، ئازادی حزبە سیاسیەکان و جێبەجێکرانی خێرای رێکەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کردوە. ئەو رێبەرانەی شیوعی کە کاربەدەستانی عێراق بەشوێنیاندان، جارێکی دیکە خۆیان لە ناوچە ئەمنەکانی ژێر دەسەڵاتی بارزانی، حەشارداوە.

## راپۆرتی ٢٧٥ی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) دەربارەی عێراق و سۆڤیەت لە سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٧٠ تا سەرەتای ئابی ١٩٧٠

واشینگتۆن، ٢٤ی ئابی ١٩٧٠

نهێنی

بابەت: کێشەی کورد و نیشانەکانی بێ هیوابوونی سۆڤیەت لە دەوڵەتی عێراق

سۆڤیەت لە مانگی کانوونی دووەمی ١٩٧٠ دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە دەوڵەتی عێراق، و لە مانگی ئادار لە کاتی شروڤەکردنی نیگەرانی سۆڤیەت بەنیسبەت پێشهاتە ناوخویەکانی عێراق بەتوندی رەخنەی لە دەوڵەتی بەعسی عێراق گرت و وتی پێش لە هەموو شتێک کوردەکانی سۆڤیەت مەلا مستەفا بارزانی بە "پادشای کوردەکان "دەزانن و لە مانگی حوزەیران بۆ پێناسەکردنی رژیمی بەعس لە دەستەواژەی "سوسیالیزمی نەتەوەیی" کەڵکی وەرگرت. لە مانگی تەموز باڵوێزی سۆڤیەت لە عێراق وتی سەرەڕای ئەو یارمەتیە سەربازیە کە سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٦٣وە داویەتی بە عێراق، عێراق هیچ گرنگیەکێ بەو چەکانە نەداوە کە وەریگرتوە. بە وتەی باڵوێزی سۆڤیەت لە عێراق، سۆڤیەت ویستویەتی لەرێگای هەنگاوگەلێک وەک خستنەڕووی بیرۆکەی پێکهێنانی بەرەی نەتەوەیی، نیازپاکی خوی بە عێراق بسەلمێنێت.

٢- ئەمە یەکێ لە نمونەکانی بێ هیوابوونی سۆڤیەت لە عێراقە: وابەستەی[١٩٧] سەربازیی سۆڤیەت وتی سۆڤیەت دەیەوێت بنکەیەکی پاڵاوتنی نەوتی لە باشووری عێراق هەبێت بۆ ئەوەی وەک بنکەیەکی سوتەمەنی سۆڤیەت کار بکات. بە وتەی وابەستەی سەربازیی سۆڤیەت، بەسرە ناتوانێت بۆ ئەم مەبەستە بە کار بێت. بە وتەی سەرچاوەیەک ئەمە بە واتای ئەوەیە کە کاروباری سۆڤیەت لە کەنداو باش بەرەوپێش ناچێت بەڵام زانیاری زیاتری لانەبوو و وابەستەی سەربازیی سۆڤیەتیش زانیاری زیاتری لەم پەیوەندیەدا نەدرکاند.

٣- ئەمە یەکێ لە نمونەکانی درستبوونی درز لە نێوان سۆڤیەت و دەوڵەتی عێراقە: هەموو کاربەدەستە پایەبەرزەکانی بەعس لانیکەم دوو و تەنانەت سێ رادیو - تیلیفۆن لە سەر میزی کارەکەیان و چەند دانەیەکێ دیکەش لە ناو ئوتومبیلەکانیان دانراوە بۆ ئەوەی گوێ لە قسەکانیان بگیردرێت. باشتربوونی توانایی هەواڵگری دەوڵەتی عێراق لەم پەیوەندیەدا سۆڤیەتی تورە کردوە. ئێستا رژیمی بەعس لە چاو پێشوو باشتر وڵات کۆنترۆل دەکات وهەروەها بەشێوەیەکێ چڕوپڕتر جموجۆڵەکانی سۆڤیەت لە ناو و دەرەوەی بەغدادی بە وردی لە ژێر چاودێریدایە. بەردەوام ئەتومبیلی سۆڤیەتیەکان لە سەیتەرەکان رادەگیردرێت و دەپشکندرێت. سۆڤیەتیەکان دەڵێن بەردەوام ناڕەزایەتی خۆیان لەم کردەوانە بە دەوڵەتی عێراق راگەیاندوە. بنەماڵە سۆڤیەتیەکان زۆربەی جاران لە ناو گروپی ٢ یا ٣ بنەماڵەییدا پێکەوە بۆ ماسیگرتن دەچن بۆ دەریاچەی حەبانیە کە لە نزیک بنکەی هەوایی حەبانیە هەڵکەوتووە.

---

[١٩٧] لە هەموو باڵوێزخانەیەک کەسێک هەیە کە بەرپرسی پەیوەندی سەربازی، کولتووری یا کۆمەڵایەتی لە نێوان وڵاتەکەی خۆی و ئەو وڵاتەیە کە تێیدا کار دەکات. بەو کەسانە دەڵێن وابەستە (مولحەق). بەتایبەت وابەستەی سەربازی لە هەموو وابەستەکانی دیکە چالاکترە. وەرگێڕ

له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لوبنان

بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن

١٦ی تەموزی ١٩٧١،

نهێنی

بابەت: داواکاری مەلا مستەفا بارزانی بۆ پەیوەندی نهێنی لەگەڵ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

کورتە

زەید عوسمان[١٩٨] کە یەکێ لە دۆستە نزیکەکانی ڕێبەری کوردی عێراق، مستەفا بارزانییە، داواکاری بارزانی بۆ گفتوگۆی نهێنی لە نێوان نوێنەرانی گرۆپەکەی و نوێنەرانی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای گەیاندووە بە باڵوێزخانەی

[١٩٨] زەید ئەحمەد عوسمان کەسایەتییەکی سیاسی و ڕۆشنبیری شاری هەولێر بووە کە لە ساڵی ١٩٢٤ لە هەولێر لەدایک بووە و لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٨ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی بنەماڵەکەی لە باداوە نێژراوە. زەید ئەحمەد عوسمان لە ساڵی ١٩٥٨ وەک نوێنەری هەولێر هەڵبژێردراوە، دوای کودیتای ١٩٦٨ چووەتە ناو شۆڕشی ئەیلوول، جێگای متمانەی ڕێبەرایەتی شۆڕش بووە و بەشداری لەو شاندانە کردووە کە لەگەڵ حکوومەت وتووێژیان کردووە. زەید ئەحمەد عوسمان ئەوەندە مرۆڤێکی تێگەیشتوو و چالاک بوە کە تەنانەت باڵوێزخانەی ئەمریکاش ستایشی کەسایەتی بەرزی کردوە. (وەرگێڕ).

ویلایەتە یەکگرتووەکان لە بەیروت. بارزانی پێی خۆشە ئیمکانی پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە راپەڕینێکی کورد- عەرەب دژی رژێمی عێراق تاوتوێ بکرێت.
ئێمە بە (زەید عوسمان)مان وت سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەوەیە کە نایەوێت خۆی بخاتە ناو کێشەی ناوخۆیی وڵاتانی دیکە. پاش دوو هەفتەی دیکە زەید عوسمان دەیەوێت لەگەڵ بنەماڵەکەی لە رێگای بەیروتەوە لە لەندەن بگەڕێتەوە بۆ عێراق و لەوانەیە سەردانی باڵوێزخانە بکات بۆ ئەوەی بزانێت کە ئایا هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە یا نا .

## پەیامەکەی مستەفا بارزانی

زەید عوسمان کە کوردێکی هاوڕێی بارزانییە لە ٨ی تەموز سەردانی باڵوێزخانەی کرد بۆ ئەوەی پەیامی مستەفا بارزانی بگەیەنێتە دەستی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان. عوسمان سەرەتا وتی ئارەزووی بارزانی ئەوەیە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان هاوکاری بکات و پێیخۆشە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەرک بەوە بکات کە ئامانجی دادپەروەرانەی کورد بەدی نایێت مەگەر ئەو کاتە کە رژێمێکی دیموکرات لە عێراق بە دەسەڵات بگات کە رێز لە عەرەب و کورد بگرێت و پرەنسیپەکانی کۆمەڵگای کورد لە سەر بنەمای مافی "ئۆتۆنۆمی نەتەوەیی" بپارێزێت.
زەید عوسمان وتی بارزانی دەیەوێت دەوڵەتی ئەمریکا ئەوە بزانێت کە کورد داواکاریی رژێمی بەعسی رەت کردوەتەوە بۆ ئەوەی دژی ئێران کار بکات و هەروەها کوردەکانی بارزانی قەد کوردەکانی تورکیایان دژی دەوڵەتی تورکیا هان نەداوە واتا لە کاروباری تورکیا دەستێوەردانیان نەکردووە .
لە روانگەی بارزانیەوە رژێمی بەعس خراپ لەگەڵ خەڵکی عێراق هەڵسەکوت دەکات. کوردەکانی لایەنگری بارزانی لەم رژێمە بێزارن و متمانەیان پێی نییە و هەرچەند کە بارودۆخە ناچاری کردوون رێککەوتنێک لەگەڵ دەوڵەتی عێراق مۆر بکەن بەڵام قەد چاوەڕوانی ئەوە ناکەن کە بەعسییەکان رێز لەم رێککەوتنە بگرن. ئێستا کوردەکان

ئامادەن دژی دەوڵەت راپەڕن و ئەگەر پێویست بکات لە راپەڕینێکی گشتی لەگەڵ عەرەبەکانی نەیاری رژێم بەشداری دەکەن و بۆ ئەم مەبەستە پێشتر پەیوەندیان لەگەڵ عەرەبەکان گرتووە. ئەو حکوومەتە کە لە ئەنجامی ئەم راپەڕینە دێتە سەر دەسەڵات دەبێت بە لایەنگری ویلایەتە یەکگرتووەکان. بارزانی دەیەوێت دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە پەرۆشەوە سەیری بارودۆخی عێراق بکات. بارزانی ئامادەیە لە هەموو مەسەلە سیاسیەکاندا لەگەڵ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان راوێژ بکات و کەسایەتیە نەیارەکانی ئەمریکا لە ناوچەی ژێر کونترۆڵی خۆی پاک بکاتەوە .

لە ئەنجامدا زەید عوسمان وتی ئەگەر دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەم خاڵانە بە شیاوی ئەوە بزانێت کە گفتوگۆی لە سەر بکات، بارزانی بە شانازییەوە پێشوازی لە نوێنەرانی فەرمی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە بارەگای سەرکردایەتی خۆی لە کوردستان دەکات یا کوڕەکەی، ئیدریس و زەید عوسمان دەنێرێت بۆ واشنگتۆن بۆ دانیشتن لەگەڵ کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکان .

لە وەڵامی هەندێ پرسیاردا، زەید عوسمان لە پەیوەندی لەگەڵ پێشنیارەکەی بارزانی وتی بارزانی کونترۆڵی تەواوی کەرتی شاخاوی لە سنووری ئێران تا رۆژئاوای رواندوزی بە دەستەوەیە و هەرچەند کە شارە سەرەکییەکانی کوردستان بە دەستی حکوومەتەوەیە بەڵام بە توندی لە لایەن هێزەکانی بارزانی لە شاخەکاندا گەمارۆ دراون .

بە گوێرەی شەرت و مەرجەکانی رێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ کوردەکان ئەنجوومەنی شۆڕش و کومیتەی کارگێڕیان هەڵوەشاندوەتەوە. بەهەرحاڵ دەزگای ئیداری کە بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان پێویستە هیشتا هەر لە کاردایە. بارزانی هەر دوو مانگ ٥ دینار دەدات بە پێشمەرگەکانی و بۆ دابینکردنی خەرجی ئیدارەکردنی هێزەکانی و حکوومەتەکەی پێویستی بە یارمەتی ماددی هەیە. حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت ئەم یارمەتییە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە رێگای عەرەبستانی

سعوودی، ئوردۆن یا ئێرانەوە دابین بکات. لە رابردوودا بارزانی کۆمەڵێک یارمەتی لە ئێران وەرگرتووە .

زەید عوسمان بە رووترشییەوە وتی ئێران پێشتر بەشداری زۆری کردووە لە هەموو پیلانەکانی عەرەبەکان دژ بە رژێمی بەغداد کە سەرنەکەوتنی ئەم پیلانە بووەتە هۆی لەسێدارەدانی نزیکەی ٥٠کەس لە پیلانگێڕان لە ١٩٧٠. زاهید عوسمان وا هستی دەکرد کە بۆ ئێران فەرقی نییە ئەنجامەکە چی بێ .

بە هەرحاڵ بارزانی دەیەوێت پەیوەندی نهێنی لەگەڵ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دابمەزرێنێت و پێشنیارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان وەربگرێت دەربارەی ئەوەی کە چۆن شۆڕشەکەی دژی رژێمی عێراق بباتە پێش. لەوانەیە بکرێت نوێنەرێکی ئەمریکا لە بارەگای سەرکردایەتی بارزانی (کە کۆخێکی هەڕگینە) لە حاجی عومەران دیدار بکات کە ٣ کیلومەتر لە سنووری ئێران دوورە و یەک و نیو تا دوو کاتژمیر بە ئوتوموبیل لە شاری رەزاییە لە ئێران دوورە (لە تارانەوە دەتوانی بە فڕۆکە بچێتە رەزایە). روونە کە دەوڵەتی ئێران ئاگاداری دیدارێکی وا دەبێت بەڵام نابێت دەوڵەتی عێراق پێی بزانێت. ئەگەر حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بڕیار بدات پێشوازی لە نوێنەرانی بارزانی لە واشنگتۆن بکات، ئەم لێژنەیە ئیدریس بارزانی سەرۆکایەتی دەکات کە ٢٧ساڵیەتی و بە تواناترین کەسە لە نیو ٦ کوڕەکەی بارزانیدا. ئیدریس نازانێت زۆر بە ئینگلیزی قسە بکات بەڵام زاهیر عوسمان لەگەڵی دێت.

## پلانەکانی راپەڕین

زەید عوسمان ئەو روانگەیەی دەربڕی کە بە هۆی ئەوەی کە بەعس زۆر توند کونترۆڵی بارودۆخەکە دەکات، زەحمەتە کودیتا دژی ئەم رژێمە لە پایتەختی عێراق سەربکەوێت. سوپای عێراق بە گشتی لە بارودۆخەکە رازی نییە بەڵام هیچ کەس ناوێرێت دژی رژێم کار بکات. لە ئەنجامدا تەنها هیوا بە راپەڕین هەیە کە لەو ناوچەیە دەست پێبکات کە لە کونترۆڵی کوردەکاندایە لە باکوور.

بارزانی هیواداره قەناعەت بە دەوڵەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان بهێنێت پشتیوانی لە راپەڕینێکی وا بکات. تەمەنی بارزانی ئێستا ٦٨ی ساڵە و بە وتەی عوسمان ئەگەر بارزانی پێش لە ئازادی عێراق کۆچی دوایی بکات ئەو مەترسییە گەورەیە دێتە ئاراوە کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد بکەوێتە دەستی کەسایەتییە رادیکالەکان و کۆمەڵگای گەورەتری کورد لە تورکیاش بکەویتە ژێر کارێگەری ئەم رادیکالیزمە.

زەید عوسمان ئێستا چالاکانە بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی ئەمریکا بۆ شۆڕش هەوڵ دەدات و کەسایەتییەکە کە لە لایەن بارزانییەوە ئەو دەسەڵاتەی پێدراوە بچێتە هەموو شوێنێک، بۆ نموونە واشنگتۆن یا نەتەوە یەکگرتووەکان. ئێران بەڵێنی بە کوردەکان داوە ئەگەر شەڕ دەست پێبکاتەوە یارمەتیان بدات. زەید عوسمان چەند مانگ پێش لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ دیداری کردووە و فەیسەڵ پێشوازییەکی دۆستانەی لێکردووە و پشتیوانی لە پرەنسیپی راپەڕین لە عێراق کردووە بەڵام پێش لەوەی کە وەڵامی عوسمان بداتەوە داوای وردەکاری زۆرتری لەم پەیوەندییەدا کردووە .

زەید عوسمان وتی پاش ماوەیەکی کورت بەیروت بەرەو لەندەن بەجێ دەهێڵێت بۆ ئەوەی سەردانی بنەماڵەکەی بکات کە بە فڕۆکە لە بەغداد چوونەتە لەندەن. زەید عوسمان دەیەوێت لە کۆتایی مانگی تەموز بگەڕێتەوە بۆ بەیروت و لەوانەیە سەردانی باڵوێزخانە بکات بۆ ئەوەی بزانێت کە ئایا هەڵوێستی ویلایەتە یەککگرتووەکان هیچ بەرەوپێشچوونیکی بە خۆوە بینیوە یا نا. هەروەها لەوانەیە سەردانی مەلیک فەیسەڵ و مەلیک حوسەین بکات.

## ژیاننامەی زەید عوسمان

زەید عوسمان کە تەمەنی نزیکەی ٤٧ ساڵە، پێش لە شۆڕشی کورد لە زانکۆی قاهیرە خوێندوویەتی و پاش ئەوە کاری یاسایی کردووە لە بەغداد. لە ساڵی ١٩٦٦ یارمەتی داوە بە ئامادەکردنی رەشنووسی رێککەوتننامەی کورد و حکوومەتی عێراق لە لایەن سەرۆک وەزیران بەزاز. زەید عوسمان دەڵێت بە هۆی چالاکی سیاسی ٥

جار له بەغداد خراوەتە بەندیخانە. رووخانی حکوومەتەکەی بەزاز و درزی دواتری نێوان بارزانی و حکوومەتی عێراق له ١٩٦٨ عوسمانی ناچار کرد به بەهای لەدەستچوونی ژیانی له بەغداد هەڵبێت. لەو کاتەوە عوسمان له بارەگای سەرکردایەتی بارزانی دەژی و زۆربەی جاران وەکە لێژنە دەچێتە دەرەوەی عێراق. زەید عوسمان پاش رێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ ی نێوان بارزانی و حکوومەتی عێراق تا ئێستا نەچووەتە لای بنەماڵەکەی له بەغداد چونکە متمانەی به رژێمی بەعس نییە. زەید عوسمان هەرچەند کە زۆر شارەزای زمانی ئینگلیزییەوە و به راستی به سەر ئەم زمانەدا زاڵە بەڵام مرۆڤێکی به شەرم و حەیایە و له قسەکردندا به تەواوی مرۆڤ به قەناعەت دەگەیەنێت. زەید عوسمان لایەنگری شێوە ژیانێکی دیموکراتانەیە وەک ئەوەی له ئەمریکادا هەیە .

**هەڵوێستی ویلایەتە یەککگرتووەکان**

کاربەدەستی باڵوێزخانە سوپاسی زەید عوسمانی کرد بۆ شیکردنەوەی بارودۆخی عێراق و جەختی له سەر ئەوە کردەوە کە ویلایەتە یەککگرتووەکان سیاسەتی دەستێوەرنەدان له کاروباری ناوخۆیی وڵاتانی دیکە پەیڕەو دەکات، کەوابوو پێیوانییە حکوومەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان بتوانێ هیچ کارێک لەم بارودۆخەدا ئەنجام بدات.

بوفووم[١٩٩]

---

[199] - BOFFUM

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیرووت**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دیسی، ٥٣٨٤**

**٣ی تشرینی دووەمی ١٩٧١**

**نهێنی**

**بابەت: ناوەرۆکی دانیشتن لەگەڵ سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٩٦١٢ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیرووت

١- رۆژی ٢ی تشرینی دووەم، کاربەدەستێکی باڵوێزخانە و حەبیب محمد کەریم پێکەوە دیداریان کرد. لەو دیدارەدا هەروەها کە پێشبینی دەکرا حەبیب محمد کەریم داواکاری بارزانی بۆ پشتگیری ئامریکا دژی رژێمی عێراق خستەڕوو. حەبیب محمد کەریم پێشبینی ئەوەی دەکرد کە راپەڕێنێکی گشتی بەرفراوان لە لایەن کوردەکان و لایەنەکانی دیکەی دژبەری بەعس لە عێراق لە بەهاری ١٩٧٢دا روو دەدات. کاربەدەستەکەی باڵوێزخانە سیاسەتی ئەمریکای جارێکی دیکە بۆ حەبیب محمد کەریم باس کرد و روونی کردەوە کە ئەمریکا نەتەنها بەنیسبەت کێشەی کورد بەڵکوو بە نیسبەت عێراق بە گشتی سیاسەتی دەستێوەرنەدان پەیڕەو دەکات. حەبیب محمد

کەریم ئەو هەڵوێستەی بە روویەکی خۆشەوە قبووڵ کرد و تەنها ئەوەی وت کە هیواداره رەوتی رووداوەکانی داهاتوو لە عێراق، ئەمریکا هان بدات بە سیاسەتی خۆیدا بچێتەوە.

٢- لە پەیوەندی لەگەڵ هەمان بابەتدا، حەبیب محمد کەریم بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئەمریکا قەد وەڵامێکی روونی بەوَ داواکاریەکەی بارزانی بۆ دانیشتنی تاکەکەسی لەگەڵ نوێنەری ئەمریکا نەداوەتەوە کە پێشتر تەسلیم بە کاربەدەستانی ئەمریکا لە تاران و بەیروت کراوە. کاربەدەستەکەی باڵوێزخانە لە وەڵامدا وتی سیاسەتی ئەمریکا لەو پەیوەندیەدا پێشتر بە نوێنەرە کوردەکان راگەیەندراوە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە دیداری نوێنەری ئەمریکا لەگەڵ بارزانی خزمەت بە هیچ ئامانجێک ناکات و لە راستیدا لەوانەیە هیوای هەڵە لە نێو کوردەکان دروست بکات و ببێتە هۆی بەهەڵەتێگەیشتن لە داهاتوودا. حەبیب محمد کەریم داوای کرد وەزارەتی دەرەوە ئەو بۆچوونەی باڵوێزخانە پشتڕاست بکاتەوە بۆ ئەوەی کوردەکان وەڵامێکی روون وەربگرن.

بوفووم

**له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا**

**بۆ: باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له تاران**

**٢٤ی تشرینی دووه‌می ١٩٧١**

**نهێنی**

**بابه‌ت: روانگه‌ی ئه‌مریکا سه‌باره‌ت به بیروبۆچوونه‌کانی رۆژنامه‌نووسێکی لوبنانی ده‌رباره‌ی عێراق و کورده‌کان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له ئه‌مان، ئانکارا، بروکسێل، به‌یروت، جه‌ده، کوه‌یت، له‌نده‌ن، مۆسکۆ، پاریس، تلابیب و قاهیره

ئێمه له‌گه‌ڵ باڵوێزخانه‌ی ئه‌مریکا له تاران هاوڕاین که زۆربه‌ی ئه‌و شتانه که ئیدوارد سائیب[٢٠٠]، رۆژنامه‌نووسی لوبنانی ده‌رباره‌ی عێراق راپۆرتی داوه راست نیه. به‌تایبه‌ت ئێمه له‌گه‌ڵ ئه‌م بیروبۆچونانه‌ی سائیبدا نین که:

١- ده‌ستڕۆیشتوویی عێراق له ناوچه به‌خێرایی په‌ره ده‌سێنێت.

٢- ئابووری عێراق به‌شێوه‌یه‌کی زۆر به‌رچاو گه‌شه ده‌کات.

٣- ده‌ستی ده‌وڵه‌تی عێراق ئیدی به هه‌ڕه‌شه‌ی کورده‌وه به‌ستراو نیه.

---

200 - Edward Saab

هۆکارەکانی ئێمە بۆ رەتکردنەوەی ئەم بیروبۆچونانە و بیروبۆچونەکانی دیکەی سائیب ئەمانەی خوارەوەیە. ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە کاریگەری سۆڤیەت لە عێراق، بەتایبەت لە بواری نەوتدا وادیارە رووی لە زیادبوونە.

٤- بارودۆخی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق: ئێمە پێمانوایە کە پەیوەندیەکانی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی لە سەر بنەمای بێ متمانەیی و بەدگومانی بەنیسبەت یەکدییە. بارزانی و هەروەها کاربەدەستانی دیکەی پارتی دیموکراتی کوردستان (KPD ) بەردەوام دەوڵەتی عێراق تاوانبار دەکەن کە ئەرک و بەرپرسیارەتیەکانی خۆی بەگوێرەی رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ کە کۆتایی بە شەڕی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق هینا، جێبەجێ ناکات. هاوکات لەگەڵ ئەوەی زەحمەتە رێژەی توانایی بارزانی بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق هەڵبسەنگێنین بەڵام بەردەوام کۆمەڵێک راپۆرتمان بە دەست گەیشتوە کە نوێنەرانی بارزانی بە دوای یارمەتی بیانیدان بۆئەوەی خۆیان بۆ پێشهاتێکی وەها ئامادە بکەن. پێشهاتگەلێک وەک هەوڵەکەی ئەم دوایە بۆ کوشتنی بارزانی و دڵنیابوونی بارزانی لەوەی کە دەوڵەتی ناوەندی لە پشتی ئەو هەوڵەدایە، بێ متمانەیی و بەدگومانی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندی قوڵتر کردوەتەوە. لەم رووەوە سەرنجتان بەرەولای راپۆرتی ئەم دوایەی رۆژنامەی "النهار"، چاپی بەیروت رادەکێشین کە نووسیویەتی بارزانی هەڕەشەی ئەوەی کردوە هەڵوێستی خۆی بەنیسبەت رێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی دەگۆڕێت ئەگەر رێگە بە کوردەکان نەدرێت لە کاری بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەشدار بن. هەرچەند کە کوردەکان ئێستا لە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقدا بەشدارن بەڵام رێگەیان پێنادرێت لە ئەنجوومەنە دەسەڵات بەدەستەکان بەتایبەت RCC (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)دا بەشدار بن.

**له لایەن بەرپرسی بەشی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا له ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (بەڕێز والیر[201])**

**بۆ: یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا (بەڕێز سیسکۆ[202])**

**واشینگتۆن، ٩ی ئاداری ١٩٧٢**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: هەوڵی ڕێبەری کورد، ئەلبارزانی بۆ نزیکبوونەوە له ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ڕێگای دەزگای هەواڵگری ئێرانەوە**

بۆ زانیاری: بەڕێوەبەری بەشی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە (بەڕێز کلین[203])

١- له سەرەتای ئاداری ١٩٧٢، سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا راپۆرتی دا کە مەلا مستەفا بارزانی، ڕێبەری کوردەکانی عێراق له ژێر گوشارێکی بەرچاوی یەکێتی سۆڤیەتدایە بۆ ئەوەی له ڕژیمی بەعسی عێراق نزیک بێتەوە. یەکێتی سۆڤیەت هاوکات لەگەڵ ئەم هەوڵە، گوشاریش دەخاتە سەر حیزبی بەعسی عێراق و حیزبی شیوعی عێراق بۆ ئەوەی ناکۆکیەکانیان چارەسەر بکەن و لەپێناو پێکهێنانی دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی پێکەوە کار بکەن. له ئەنجامی ئەم

[201] Waller
[202] Sisco
[203] Cline

گوشارەی سۆڤیەتدا ئەلبارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە هەم بزووتنەوەی کوردەکانی عێراق و هەم نەتەوەی عێراق لە مەترسیدان چونکە بارزانی ناچار دەبێت ملکەچی ئەم گوشارانە بێت ئەگەر لە دەرەوەی عێراق یارمەتی وەرنەگرێت.

لە ئەنجامدا ئەلبارزانی جارێکی دیکە دەیەوێت نوێنەرەکانی خۆی رەوانەی ئەمریکا بکات بۆ ئەوەی قەناعەت بە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بهێنێت و ئامادەکاری سەفەری ئەلبارزانی بۆ ئەمریکا بکات بۆ ئەوەی خودی بارزانی کێشەکەی لەگەڵ دەوڵەتی ئەمریکا باس بکات. ئەلبارزانی وتوویەتی تا کاتێک کە هەڵوێستی ئەمریکا دەربارەی ئامانجی کوردەکان هەڵنەسەنگێنێتەوە، هیچ چەشنە رێکەوتننامەیەک لەگەڵ حیزبی بەعسی عێراق واژۆ ناکات. دوایین دانیشتنی نێوان دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نوێنەرانی بارزانی لە سەرەتای تشرینی دووەمی ١٩٧١ لە بەیرووت ئەنجام درا کە زانیاریەکانی ئەو دانیشتنە لە تیلیگرامی نهێنی ٩٦٨٩، بەرواری ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٧١ لە لایەن باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت بۆ وەزارەتی دەرەوە راپۆرت دراوە.

٢- لە ٦ی ئاداری ١٩٧٢ کاربەدەستێکی پایەبەرزی رێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران (SAWAK) لەگەڵ (رەش کراوەتەوە) پەیوەندی گرت و وتی SAWAK لە سەر ئەو باوەڕەیە کە عێراق رۆژبەرۆژ زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری سۆڤیەت. کاربەدەستە فەرمیەکەی SAWAK ئاماژەی بە گوشارەکانی سۆڤیەت لە سەر بارزانی و ناوەڕۆکی پەیماننامەکەی عێراق- سۆڤیەت کرد و وتی ئەم هۆکارانە رێگا بۆ دەستڕۆیشتوویی زیاتری سۆڤیەت لە عێراق خۆش دەکات و لە ئەنجامدا کێشە بۆ ئێران و کەنداوی فارس دروس دەکات.

کاربەدەستەکەی SAWAK دەیەوێست بزانێ دوایین هەڵوێستی ئەمریکا بەنیسبەت مەسەلەی هەوڵدان بۆ روخاندنی دەوڵەتی بەعسی عێراق چیە. کاربەدەستە فەرمیەکەی SAWAK هەروەها پێیخۆشبوو بزانێت ئایا ئەمریکا خۆی ئامادە دەکات

بۆ ئەوەی بەشێوەی مادی و سەربازی پشتیوانی لە هەوڵدان بۆ رووخاندنی دەوڵەتی بەعسی عێراق بکات و یارمەتی بە کۆکردنەوەی کەسایەتیە عێراقیەکانی دانیشتووی تاراوگە دەدات بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی جیاواز کە سەرەتا لە ژێر پاراستنی ئەلبارزانیدا بێت پێکبهێنن؟. نوێنەری ئەمریکا وەڵامیدایەوە کە پرسیارەکانی SAWAK دەخاتە بەر دەستی کاربەدەستانی ئەمریکا.

بەرپرسی بەشی رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا
جان ه والێر[٢٠٤]

---

[204] John H. Waller

**له لایەن هارۆڵد سەندێرز[205] له ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی**

**بۆ: جێگری یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (ژنراڵ هەیگ[206])**

**واشینگتۆن، ٢٧ی ئاداری ١٩٧٢**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: پشتیوانیکردنی ئەمریکا له شۆڕشی کوردەکان**

دەزگای هەواڵگری ئێران، SAWAK، جارێکی دیکه پێداگری کردوه که ئێمه لەرێگای (رەش کراوەتەوه -وەرگێڕ) یارمەتی رێبەری کوردی عێراق، مەلا مستەفا ئەلبارزانی بدەین. له ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا کوردەکان ویستویانه له ئەمریکا نزیک ببنەوه بەڵام ئەم داواکاریه له لایەن ئەمریکاوه رەت کراوەتەوه. دەوڵەتی بریتانیاش دەستێوەردانی له مەسەلەکەدا نەکردوه. دەوڵەتی ئیسرائیل مانگانه یارمەتیەکی مادیی بەرچاوی کوردەکان دەدات و لەوانەیه مەلک حوسەین له کاتی

[205] Harold Saunders
[206] Haig

سەردانەکەی بۆ ئەمریکا لە داهاتوودا پشتیوانی لە دەستێوەردانی ئەمریکا لەو مەسەلەیەدا بکات[٢٠٧].

بە گوێرەی راپۆرتێکی CIA، سۆڤیەت پێداگری لە سەر بارزانی و کوردەکان کردوە کە پەیوەست بن بە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی عێراق کە لە شیوعیەکان، لایەنگرانی جەمال عەبدولناسر و کوردەکانی ژێر رکێفی حیزبی بەعسی عێراق پێکدێت. هەروەها کە لەوانەیە بزانن، کوردەکان لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا تا رادەیەک بێ دەنگ بوونە. ئامانجی دەوڵەتی ئێران لە جموجۆڵەکانی ئێستای ئەوەیە کە جارێکی دیکە بۆ روخاندنی دەوڵەتی بەعسی عێراق هەوڵ بدات و دەرفەتەکانی دەسترۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق کەم بکاتەوە. بەگوێرەی هەندێ لە راپۆرتەکان ئەگەری واژۆبوونی پەیماننامەیەک لە نێوان سۆڤیەت و عێراق (هاوچەشنەی پەیماننامەکەی میسر و سۆڤیەت) نزیکە.

وەزارەتی دەرەوە و CIA دەیانەوێت درێژە بە سیاسەتی دەستێوەرنەدان لەم مەسەلەیەدا بدەن. ئێران و ئیسرائیل دەتوانن بە تەواوی پێداویستیەکانی بارزانی دابین بکەن و پێویستیان بە هیچ شتێکی ئێمە نیە و تەنها دەیانەوێت ئێمە بخەنە ناو کێشەکە. هۆکاری دیکە ئەوەیە کە بارودۆخەکە دژی سەرکەوتنی کوردەکانە. هەروەها ئەگەر بۆ یەکەم جار خۆمان بخەینە ناو کێشەکە لەوانەیە سۆڤیەت وەک کردەوەیەک بە دژی خۆی لێکی بداتەوە.

من پێمباشترە ئێمە درێژە بە سیاسەتی رابردوومان بدەین و خۆمان نەخەینە ناو ئەو کێشەیە بەڵام هەست دەکەم کە ئێوە دەبێ ئاگاداری لایەنی سۆڤیەت لەو مەسەلەیەدا بن.

---

[٢٠٧] کیسینجێر لە لاپەڕەی ٥٩٠ی کتێبەکەیدا (ساڵانی بووژانەوە) دەڵێت مەلک حوسەین، پادشای ئوردن لە ٢٨ی ئاداری ١٩٧٢ (واتا یەک رۆژ دوای ئامادەکرانی ئەم بەڵگەنامەیە) نامەیەکی مەلا مستەفا بارزانی گەیاندووە بە نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەمریکا. وەرگێڕ

پێشنیار: پێشنیار دەکەم بە CIA بڵێین لەگەڵ هەڵسەنگاندنەکەی ئەواندا هاوڕاین کە نابێ خۆمان بخەینە ناو کێشەی کوردەکان[٢٠٨].

## هاوپێچی ا:

**بــابەت: نزیکبــوونەوەی ئێــران لە دەوڵەتــی ئەمریکــا بە ئامــانجی یارمەتیــدانی کوردەکان**

لە کۆتایی تشرینی دووەمی ١٩٧١، SAWAK پێشبینی کرد کە لە ماوەی ٣ یا ٤ مانگی داهاتوودا دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق پێکدەهێندرێت و ئەم دەوڵەتە لە شیوعیەکان، لایەنگرانی جەماڵ عەبدوناسر و کوردەکانی ژێر رکێفی حیزبی بەعسی عێراق (BPI)پێکدێت و بارودۆخێک دەخۆلقێنێت کە دەبێت بە مەترسی هەم بۆ بەرژەوەندیەکانی ئێران و هەم بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا. SAWAK رایگەیاند کە رێبەری کورد مستەفا ئەلبارزانی تەنها کەسایەتییەکی بەردەستمانە کە دەتوانێت ببێت بە کۆڵەکەی چالاکیە کاریگەرەکانمان بۆ دژایەتیکردنی حیزبی بەعسی عێراق.

لە سەرەتای ئاداری ١٩٧٢، SAWAK ئاماژەی بە پەیوەندیە رۆژبەرۆژ روو لە زیادبوونەکانی سۆڤیەت و عێراق و گوشارە هاوبەشەکانی عێراق و سۆڤیەت لە سەر ئەلبارزانی کرد بۆ ئەوەی هەم لەگەڵ حیزبی بەعسی عێراق و هەم لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراق رێکبکەوێت. SAWAK رایگەیاند کە ئەم پێشهاتانە رێگا بۆ

---

[٢٠٨]- ژنراڵ هەیگ یادداشتنامەیەکی ناردوە بۆ کیسینجێر و پێشنیارەکانی ناو ئەم یادداشتنامەیەی پەسەند کردوە. هەیگ هەروەها لە لایەن کیسینجێرەوە لە سەر یادداشتنامەکە نووسیویەتی: "بە CIA بڵێن لانیکەم رێگایەکی پێشگیرانە بگرێتەبەر و وەبیریان بهێننەوە کە نوێنەرانی بارزانی لەرێگای هاتن بۆ واشینگتۆن دان". والێر لە ٢٩ی ئادار لە وەڵامی کیسینجێر بەم یادداشتنامەیە ئاگادار کراوەتەوە.

دەستڕۆیشتوویی زیاتری سۆڤیەت لە عێراق خۆش دەکات و لە ئەنجامدا کێشە بۆ ئێران و کەنداو دروست دەکات. ئێستا SAWAK دیسان داوا دەکات کە ئەمریکا یارمەتی بە دژایەتیکردنی حیزبی بەعسی عێراق بدات و لە چوارچێوەی یارمەتی مادی، دابینکردنی پێداویستی سەربازی و کردەوەی سیاسی پشتیوانی لە بارزانی بکات.

هاوکات (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) لە راپۆرتێکدا باسی لە گوشاری سۆڤیەت (لە سەر بارزانی – وەرگێڕ) کرد و ئاماژەی بەوە کرد کە ئەلبارزانی دەیەوێت نامەیەک بنێرێت بۆ راجێرز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و داوای پشتیوانی ئەمریکا دژی حیزبی بەعسی عێراق بکات. هەمووی ئەم پێشهاتانە لە یادداشتنامەی (رەش کراوەتەوە) بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا راگەیەندراوە.

لە ١٥ی ئاداری ١٩٧١ SAWAK و (رەش کراوەتەوە) رایانگەیاند بارزانی داوای لە SAWAK کردوە دەوڵەتی ئەمریکا ئاگادار بکاتەوە کە ئەگەر ئەو رەوتە ئاوا بەردەوام بێت عێراق وەک وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئوروپا دەبێت بە خاوەنی سەتەلایتی (رەش کراوەتەوە). SAWAK دووبارە داوای لە دەوڵەتی ئەمریکا کرد پشتیوانی لە ئەلبارزانی بکات بو ئەوەی پێش لە پێکهاتنی دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق بگرێت و لە ئەنجامدا بەدەسەڵاتگەیشتنی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی لە عێراق پوچەڵ بکاتەوە. SAWAK هەروەها رایگەیاند کە دەکرێت یارمەتی ئەمریکا بە کوردەکان لە کاناڵی (رەش کراوەتەوە) بە شێوەی نهێنی جێبەجێ بکرێت و تەنها ئەلبارزانی ئاگاداری بێت.

شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا داواکارێگەلێکی هاوشێوە لە لایەن SAWAKەوە بە نوێنەرایەتی ئەلبارزانی خراوەتە بەردەم دەوڵەتی ئەمریکا.

## هاوپێچی ٢

**٢٠ی ئاداری ١٩٧٢**

**بابەت: پەیوەندییەکانی سۆڤیەت لەگەڵ بارزانی**

دوابەدوای سەردانەکەی سەدام تەکریتی بۆ مۆسکۆ لە شوباتی ١٩٧٢، دەوڵەتی بەعسی عێراق خۆی لە ڕێبەرایەتی کورد نزیک کردوەتەوە و داوای لێکردوە "پەیمانی نیشتمانی" واژۆ بکات. چەند ڕۆژ دواتر لە ٢٨ی شوبات لیژنەیەکی سۆڤیەت کە لە چوار کەس پێکهاتووە سەردانی بارەگای مەلا مستەفا ئەلبارزانی کردوە. سەردانی ئەو لیژنەیە شتێکی نائاسایی و ئاوارتە و گرنگ بووە. لیژنەکەی سۆڤیەت لەم کەسانە پێکهاتبوو:

١-ڕۆمانیتسۆف[٢٠٩] لە نووسینگەی نێونەتەوەیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت

٢- فیدۆرۆف[٢١٠] کە وەک یارمەتیدەری ڕۆمانیتسۆف هاتبوو. کەسیکی دیکە بە هەمان ناو لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت لەبەغداد کار دەکات کە لەوانەیە هەر ئەو کەسە بێت.

٣-ئازەرۆف[٢١١]، سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لەبەغداد

٤-خایجیۆف[٢١٢] ( ناسنامەی دیار نیە).

لیژنەی سۆڤیەت ئەم پێشنیارانەی خستەوەتە بەردەم ئەلبارزانی:

---

[209] RUMANYTSEV
[210] FIODOROV
[211] AZAROV
[212] KHAJIEFF

١- کوردەکان دەبێ "پەیمانی نیشتمانی" واژۆ بکەن و پەیوەست بن بە بەرەی گشتی لە بن ڕێبەرایەتی حیزبی بەعسدا. شیوعیەکانیش پەیوەست دەبن بەو پەیمانە.

٢- سۆڤیەت لەگەڵ کوردەکان پەیوەندی دەگرێت و لێژنەیەکی سۆڤیەت لە بارەگای بارزانی دادەمەزرێت بۆ ئەوەی پەیوەندیەکانی بارزانی و سۆڤیەت بەردەوام بێت و بارزانی بپارێزێت.

٣-بانگهێشتی بارزانی کراوە سەردانی یەکێتی سۆڤیەت بکات و دڵنیا کراوەتەوە کە بە سلامەتی دێت و دەگەڕێتەوە.

٤- بەڵێن بە بارزانی دراوە ئەگەر ئەم پێشنیارانە قبووڵ بکات سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکات.

وادیارە ئەم جموجۆڵەی سۆڤیەت -عێراق لە ڕووی ژئۆپلۆتیکییەوە زۆر گرنگە. لەوانەیە ئامانجی ئەم جموجۆڵە ئەوە بێت کە دەستی هێزەکانی عێراق بۆ چالاکی سیاسی - سەربازی لە کەنداوی فارس ئاوەڵا بکرێت و هەروەها دژی بەرژەوەندی نەوت لە ناوچە بەکار ببردرێت.

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

واشینگتۆن دی سی، ٢٠٥٠٥

نووسینگەی بەڕێوەبەر

لە لایەن بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (هێڵمز)[٢١٣]

بۆ: یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (کیسینجێر)[٢١٤]، وەزیری دەرەوە ( ویلیام راجێرز)[٢١٥] و وەزیری بەرگری (لایرد)[٢١٦]

واشینگتۆن، ٢٩ی ئاداری ١٩٧٢

نهێنی

بابەت: هەوڵەکانی مەلا مستەفا بارزانی بۆ وەدەستخستنی پشتیوانی نێونەتەوەیی لە هەڵوێستەکەیان دژی پەیوەندیە نزیکەکانی سۆڤیەت - عێراق کە لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەوەی کوردەکان بکەونە ژێر گوشار

بۆ ئاگاداری:

- یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی
- وەزیری دەرەوە

---

213 Helms
214 Kissinger
215 Secretary Rogers
216 Laird

- وەزیری بەرگری

بۆ زانیاری:

- یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەلاتی نزیک و باشووری ئاسیا
- بەڕێوەبەری بەشی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە

**کورتە:** رێبەری کورد، مەلا مستەفا ئەلبارزانی لە مانگی ئاداری ١٩٧٢ نوێنەرێکی رەوانە کردوە بۆ ئەوەی لە دەوڵەتی ئوردون و ئەمریکا نزیک بێتەوە بۆ ئەوەی یارمەتی کورد بدەن و سەرۆک وەزیرانی پێشووی عێراق، ژینیرال عبدالرزاق النایف[217] بانگهێشت کردوە لە پێکهاتنی دەوڵەتێکی کوردی — عەرەبی لە باکووری عێراق بەشداری بکات. نوێنەری بارزانی وتی ئەلبارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە وڵاتانی رۆژئاوا ناتوانن لە داهاتوودا بەهێزتربوونی پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و عێراق پشتگوێ بخەن کە نیشانەکانی ئەم دوایانە دەرکەوتوە. نوێنەرەکەی بارزانی هیوادارە کە لە میانەی گفتوگۆکانی لە وڵاتانی رۆژئاوا وەڵامێکی خوازراو بۆ سەرجەم یا هەندێ لەم داواکاریانەی کوردەکان وەربگرێت:

الف- گفتوگۆی سیاسی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا بە شێوەیەکی بەردەوام

ب- وەدەستخستنی یارمەتی مادی

ج - وەدەستخستنی ئێزگەیەکی رادیۆی بەهێز و راهێنانی کەسانێک بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ئێزگەیە لە رووی تەکنیکیەوە.

د-هاوکاری لەگەڵ دەزگای هەواڵگری کوردەکان کە مەسعود بارزانی بەرپرسیەتی.

و- دانی بورس (زەمالەی خویندن) بە کوردەکان بۆ ئەوەی لە زانکۆکانی رۆژئاوا بخوێنن.

١- لە مانگی ئاداری ١٩٧٢ مەلا مستەفا ئەلبارزانی، بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی زەید ئەحمەد عوسمانە -وەرگێڕ) وەک نوێنەری تایبەتی خۆی رەوانە

---

[217] General 'Abd al-Razzaq al-NAYIF

کرد تا لەگەڵ نوێنەری دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و (رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی بریتانیایە- وەرگێڕ) گفتوگۆ بکات.

٢- نوێنەرەکەی بارزانی لە میانەی دانیشتنەکانی لەگەڵ(رەش کراوەتەوە) پێشهاتەکانی ئەم دوایەی عێراقی شیکردەوە، لەوانە پەیماننامەی دوستایەتی عێراق و سۆڤیەت کە لە میانەی سەفەرەکەی سەدام حوسەین ئەلتەکریتی، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق (RCC) و یارمەتیدەری سکرتێری گشتی حزبی بەعسی عێراق بۆ مۆسکۆ لە مانگی شوبات لە سەری رێککەوتوون و بەمزوانە واژۆ دەکرێت. نوێنەرەکەی بارزانی هەروەها ئاماژەی کرد بە گوشارەکانی سۆڤیەت لە سەر کوردەکان بۆ واژۆکردنی پەیمانی نیشتمانی لەگەڵ حیزبی بەعسی عێراق و حیزبی شیوعی عێراق و ئەنجام و ئاکامەکانی ئەم پێشهاتانە بۆ ناوچە.

٣- نوێنەرەکەی بارزانی وتی ئەم پێشهاتانە کوردەکان دەخاتە پەراوێزەوە و وتی ئەگەر کوردەکان بەوە رازی بن کە لەگەڵ حزبی بەعسی عێراق و حزبی شیوعی عێراق بچنە ناو بەرەی نیشتمانی، ئیدی مومکین نیە کوردەکان بتوانن خۆیان لە دەستی حیزبی بەعس رزگار بکەن و وتی ئەو پشتیوانییە زۆرە کە سۆڤیەت ئێستا لە دەوڵەتی بەعسی عێراقی دەکات راستیی ئەو مەسەلەیە زیاتر دەسەلمێنێت. هەروەها وتی ئەگەر کوردەکان نەچنە ناو ئەو بەرەیە دەبێ لەگەڵ ئەنجام و ئاکامەکانی دەستپێکردنەوەی شەڕ روبەڕوو ببنەوە.

هاوکات یەکێتی سۆڤیەت گوشاری خستوەتە سەر کوردەکان بۆ ئەوەی بچنە ناو ئەوە بەرەیە بەڵام دەوڵەتی ئێران هەموو هەوڵی خۆی خستوەتەگەڕ بۆ ئەوەی قەناعەت بە کوردەکان بهێنێت نەچنە ناو ئەو بەرەیە. ئێران داوای لە ئیدریس بارزانی، کوڕی مەلا مستەفا کردوە لیستی ئەو پێداویستیە سەربازی و مادیانەیان پێبدات کە کوردەکان ئێستا پێویستیان پێیەتی. ئەو لیستە تەسلیم بە ئێران کراوە و ئێران قبوڵی کردوە پێداویستیەکانیان دابین بکات. بەهەرحاڵ کوردەکان متمانەیان بە ئێران نیە بەڵێنەکانی جێبەجێ بکات.

٤- نوێنەرەکەی بارزانی لە درێژەی قسەکانیدا وتی کوردەکان ئیدی تەنها بیر لە خۆیان ناکەنەوە و پێشهاتەکانی ئەم دوایانە وەک کێشەیەک بۆ سەرجەم عێراق لێکدەدەنەوە. پەیماننامەی سۆڤیەت و عێراق کە بەمزوانە واژۆ دەکرێت ئەنجام و ئاکامی ئیستراتژیکی بۆ سەراسەری ناوچە بەدواوە دەبێت. کوردەکان وەک هەوڵێک بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سەراسەری عێراق لەگەڵ کەسایەتیە عەرەبە عێراقیەکانی دانیشتووی قاهیرە پەیوەندیان گرتوە بەڵام متمانەیان پێیان نیە. نوێنەرەکەی بارزانی وتی ئەگەر(ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام وادیارە مەبەستی ژینیرال عبدالرزاق النایف -وەرگێڕ) لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێستا کاتی هاتوە، خۆی دەبێ لە پێکهاتنی کومیتەی هاوبەشی کورد — عەرەب لە کوردستان بەشداری بکات کە دروشمەکەی "شۆڕشی عێراق لەباکوور"ە. کومیتەکە دەبێ تۆڕی پەیوەندی نێونەتەوەیی لە سەراسەری جیهان دابمەزرێنێت و پاشان لەرێگای دەوڵەتێکی نەتەوەیی لە باکووری عێراق، بنەمای رژیمێکی نوێ لە عێراق دابنێت. پاشان دەبێت بە دوای وەدەستخستنی سوپای عێراق بێت و بەعس لە بەغداد دەربکات.

نوێنەرەکەی بارزانی وتی کومیتەی کورد -عەرەب دەبێ بۆ ئێرانی روون بکاتەوە کە هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە یارمەتیە سەربازی و مادیەکانی قبووڵ دەکات بەڵام کۆنترۆلکردن یا دەستێوەردانی راستەوخۆی ئێران لە کاروباری ناوخۆی عێراق قبووڵ ناکات. تەجروبەی درێژخایەنی کارکردنی کوردەکان لەگەڵ ئێران هیچ گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە سیاسەتی ئێران ئەوەیە کە دەوڵەتێکی لاواز لە بەغداد بە رێبەرایەتی کەسانێک وەک عبدالغنی الراوی[٢١٨] پیکبێت.

نوێنەرەکەی بارزانی وتی ئەگەر بڕیارە شتێک بکرێت دەبێ لە ماوەی سێ مانگی داهاتوودا دەستپێبکات و پێشنیاری کرد لەگەڵ (ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام وادیارە مەبەستی مەلک حوسەین، پادشای ئوردونە -وەرگێڕ) دیدار بکات کە پێشتر بەڵێنی داوە قەناعەت بە شای ئێران بهێنێت کە پێداویستیە سەربازیەکانیان دابین

---

218 'Abd al-Ghany al-Rawi

بکات بێ ئەوەی ئێران راستەوخۆ لە کاروباری ناوخۆی (عێراقدا) دەستێوەردان بکات و کنترۆلی رووداوەکان بگرێتە دەستی خۆی. نوێنەرەکەی بارزانی هەروەها وتی هیوادارە کە لەگەڵ کاربەدەستانی پایەبەرز لە واشینگتۆن گفتوگۆ بکات بۆ ئەوەی ئاکامە ئیستراتژیکەکانی جموجۆڵەکانی ئەم دوایەی سۆڤیەت لە عێراقیان بۆ شی بکاتەوە و داوایان لێبکات هەندێ کردەوەی ئاسایی بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بگرنەبەر و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەو یارمەتیە بە تەواوی نهێنی دەمێنێتەوە.

٦- نوێنەرەکەی بارزانی هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە دەیزانی سیاسەتی رۆژئاوا بە نیسبەت کوردەکان هەر لە کۆنەوە ئەوە بوە کە دەستێوەردان لە مەسەلەکەدا نەکەن، بەڵام وتی کوردەکان باوەڕیان بەوە نیە کە زلهێزەکانی رۆژئاوا بۆ هەمیشە پێشهاتەکانی عێراق پشتگوێ بخەن و هیوای دەربڕی کە وەڵامی ئەرێنی بە سەرجەم یا هەندێ لەم داواکاریانەی خوارەوە لە رۆژئاوا وەربگرێت:

الف- گفتوگۆی سیاسی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوا بە شێوەیەکی بەردەوام

ب- وەدەستخستنی یارمەتی مادی

ج- وەدەستخستنی ئێزگەیەکی رادیۆی بەهێز و راهێنانی کەسانێک بۆ بەڕێوەبردنی ئەو ئێزگەیە لە رووی تەکنیکیەوە.

د-هاوکاری لەگەڵ دەزگای هەواڵگری کوردەکان کە مەسعود بارزانی بەرپرسیەتی.

ریچارد هێڵمز[٢١٩]

بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

---

[219] Richard Helms

له لایەن ریچـــارد هێڵمـــز، بەڕێـــوەبەری ئاژانســـی هەواڵگـــری ناوەندی ( (CIA)

بۆ:

- یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (کیسینجێر)
- وەزیری دەرەوە (ویلیام راجیرز)
- وەزیری بەرگری (لایرد)

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

نووسینگەی بەڕێوەبەر

واشینگتۆن، ٣١ی ئاداری ١٩٧٢

نهێنی

بابەت:

الــف- بیروبۆچوونەکـانی کوردەکـان دەربـارەی هاوکـاری روو لە زیـادبوونی سـۆڤیەت و عێـراق و گوشـارەکانی سـۆڤیەت و عێـراق بـۆ پێکهـاتنی ئیتلافـی بەعـس و شـیوعی و کـورد لە بەغـداد و تێبینیەکـانی کوردەکـان دەربـارەی وتووێژ لەگەڵ بەعس

ب- تێبینیەکانی کوردەکان دەربارەی سەردانی برژنف یا کۆسیگین[220] لە بەغداد کە بڕیارە لە نیسانی ١٩٧٢ ئەنجام بدرێت.

بۆ زانیاری:

- یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا
- بەڕێوەبەری بەشی هەواڵگری و لێکۆڵینەوە

١- بە وتەی (رەش کراوەتەوە) رێبەرانی کورد لە سەر ئەو بیروباوەڕەن کە سەردانەکەی سەدام حوسەین ئەلتەکریتی، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق (RCC) و یارمەتیدەری سکرتێری گشتی حزبی بەعسی عێراق (BPI) بۆ مۆسکۆ لە ناوەڕاستی شوباتی ١٩٧٢ قوناخێکی نوێی لە هاوکاریەکانی یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتی حیزبی بەعس لە بەغداد کردوەتەوە. نوێنەرانی کورد لە بەغداد راپۆرتیانداوە کە کاربەدەستانی پایەبەرزی عێراق زۆر لەو رێکەوتننامە سەربازیە رازین کە لە میانەی سەفەرەکەی سەدام حوسەین بۆ موسکۆ واژۆ کرا کە بە گوێرەی ئەو رێکەوتننامەیە سۆڤیەت مینی ئاوی، قایقی ئەژدەر و تانکی زیاتر دەدات بە عێراق و بەڵێنیداوە فڕۆکەی جەنگی MIG-23یشی بداتێ (سەرچاوەکە جوری ئەو فڕۆکە جەنگیانەی روون نەکردەوە کە بڕیارە سۆڤیەت بیدات بە عێراق چونکە عەرەبەکان بە فڕۆکەی "FOXBAT" دەڵێن MIG-23).

٢-کوردەکان بەوەیان زانیوە کە کاربەدەستانی سۆڤیەت پێشنیاریان کردوە سیستمی بەرگری SAM لە شوعەیبە[221] دابمەزرێت. بەهەرحاڵ بەبۆچوونی کوردەکان خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە سەدام حوسەین پێشنیارێکی خستووەتە بەردەم یەکێتی سۆڤیەت بۆ نەتەوەییکردنی سەرجەم دامەزراوە نەوتیەکانی بیانی لە عێراق و بانگهێشتکردنی رێبەرانی سۆڤیەت بۆ سەردانکردنی بەغداد کە رێبەرانی سۆڤیەت قبووڵیان کردوە. کوردەکان پێیانوایە کە سکرتێری گشتیی حزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەت، لیۆنید

[220] - BREZHNEV or Kosygin
[221] Shu'aybah

برژنف[222] یا سەرۆک وەزیران ئالیکسی کۆسیگین[223] لە نیسانی ١٩٧٢ سەردانی بەغداد دەکەن و ئەوکاتە عێراق بە پەیڕەوی لە پەیماننامەی دوستی میسر – سۆڤیەت کە لە مانگی گوڵانی ١٩٧١ واژۆ کرا، ڕێکەوتننامەی دوستایەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت واژۆ دەکات.

٣- تەنها مەرجێک کە یەکێتی سۆڤیەت بۆ پشتیگیری تەواو لە دەوڵەتی بەعسی بەغداد دایناوە ئەوەیە کە حیزبی بەعس، حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان ( KDP) پەیمانی نیشتمانی (ئەلمیساقیل وەتەنی[224]) پێکەوە واژۆ بکەن و جێبەجێی بکەن. دوابەدوای واژۆکردنی پەیمانی نیشتمانی، ئەنجوومەنی وەزیرانی نوێ پێکدەهێنرێت کە لە وەزیرە شیوعییەکان و ئەو وەزیرە کوردانە کە ئێستا لە دەوڵەتدان، پێکدێت.

٤- ئەو لێژنەیەی سۆڤیەت کە لە کۆتایی مانگی شوباتی ١٩٧٢ بۆ شەوێک سەردانی کوردستانی کرد ڕاستەوخۆ گوشاری خستوەتە سەر کوردەکان (بۆ ئەوەی بچنە ناو پەیمانی نیشتمانی). ئەو لێژنەیە لە ئەندامێکی جێگری کومیتەی ناوەندی (حزبی شیوعی) سۆڤیەت و نوێەرانی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە عێراق، لەوانە ئەفسەری هەواڵگری پێکهاتبوو. ڕاپۆرتێکی دیکە نیشان دەدات کە ئەو نوێنەرەی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعی سۆڤیەت کە لەو لێژنەیەدا بوە، ناوی ڤ پ رویامنتسوڤە[225] کە بەرپرسی بەشی عەرەبی یا ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئۆفیسی نێونەتەوەیی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤیەتە (بەڵام خۆی ئەندامی سەرکردایەتی یا ئەندامی جێگری ئەو کۆمیتەیە نیە).

---

222 Leonid A. Brezhnev
223 Aleksey N. Kosygin
224 - Al-Mithaq al-Watani
225 V. P. Rumyantsev

ڕێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان، مەلا مستەفا ئەلبارزانی لە کاتی گفتوگۆکانی لەگەڵ لێژنەکەی سۆڤیەت زۆر بە توندی هێرشی کردوەتە سەر کارەکانی سەدام حوسەین ئەلتەکریتی و دەوڵەتی بەعس. بارزانی بۆ ئەندامانی ئەو لێژنەیەی سۆڤیەتی روونی کردوەتەوە کە تەجروبەی هەڵسوکەوتی کوردەکان لەگەڵ بەعس دوابەدوای هەوڵێکی سەرنەکەوتوو بۆ کوشتنی ئەلبارزانی لە ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٧٠ کۆتاییپێهاتوە و بوەتە هۆی ئەوەی کە کوردەکان ئیدی متمانە بە بەعس نەکەن. ئەلبارزانی هەروەها ئاماژەی بەوە کردوە کە کوردەکان پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئێران باش بەرەوپێش بردوە و دەیانەوێت درێژە بەو پەیوەندیە بدەن. ئەندامانی لێژنەکەی سۆڤیەت لە وەڵامدا وتویانە کە کوردەکان دوابەدوای واژۆکرانی پەیمانی نیشتمانی بەرەبەرە متمانە بە بەعس دەکەن و کەم کەم لە ڕێژەی گرێدراوبوونیان بە ئێران کەم دەبێتەوە. لێژنەکە هەروەها پێشنیاریان کردوە ئەفسەرێکی نوێنەری سۆڤیەت بنێرن بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە لە بارەگای ئەلبارزانیدا بمێنێتەوە و ئاسایشی بارزانی بەتەواوی بپارێزێت.

٥- پاش ئەوەی کە لێژنەکەی سۆڤیەت کوردستانی بەجێهێشتوە، نوێنەرانی کورد لە بەغداد لەوانە محمد مەحموود عبدالرحمان (ئاکا سامی)[٢٢٦]، وەزیری دەوڵەت، سالح الیوسفی[٢٢٧]، نووری شاوەیس (کە لایەنگری سۆڤیەتە)، دارا تۆفیق (کە شیوعیە)، وەزیری شارەوانی ئیحسان شیرزاد[٢٢٨] و وەزیری کشتوکاڵ، نافیز جەلال[٢٢٩] بانگهێشت کراون بگەڕێنەوە بۆ باکوری عێراق. گروپی دەسەڵاتداری کوردەکان کە بە دەوروبەری بارزانیدان واتا ئیدریس و مەسعود بارزانی، دۆکتۆر مەحموود عوسمان و حەبیب عبدالکەریم لە نێوان نوێنەرە کوردەکان تەنیا متمانەیان بە ئاکا سامی هەیە[٢٣٠].

---

[226] Muhammad Mahmud Abd-al-Rahman (aka Sami)
[227] Minister of State Salih al-Yusufi,
[228] Ihsan Shirzad
[229] Nafidh Jalal

[٢٣٠] دۆکتۆر مەحموود عوسمان لە دیمانەیەکدا لەگەڵ وەرگێڕ وتی ئەو مەسەلەیە راست نیە و سەرکردایەتی شۆڕش باوەڕی بە هەموو نوێنەرە کوردەکان لە بەغداد بوە.

نوێنەرە کوردەکانی بەغداد پێیانوایە کە بەعس شتی زۆری بۆ کوردەکان پێیە و کوردەکان خۆیان تەخسیربارن بەتایبەت بە هۆی ئەوەی کە پشتیان بە ئێران بەستوە. ئەو نوێنەرە کوردانە دەڵێن کە بەعس بەراستی دەیەوێت دەربارەی پەیمانی نیشتمانی وتوویژ بکات. لە وەلامدا ئەلبارزانی جارێکی دیکە بە توندی هێرشی کردوەتە سەر بەعس و گوێی لە روانگەکانی نوێنەرە کوردەکان نەگرتوە. لەگەڵ ئەمەشدا کومیتەیەک لە محمد مەحموود عبدالرحمان، سالح الیوسفی و دارا تۆفیق پێکهاتوە بۆ ئەوەی لەگەڵ بەعس وتوویژ بکات. ئەو کۆمیتەیە خێرا باسی شەرتومەرجە دژوارەکانی وتوویژەکانیان لەگەڵ بەعس و گەیشتن بە رێککەوتنێکی خێرا کردوە و داوایان کردوە کات بە کوردەکان بدرێت بۆ ئەوەی هەلومەرجەکە تاوتوێ بکەن.

ئەو شەرتومەرجانە بریتین لە:

الف – خودموختاری خێرای هەرێمی بۆ ناوچە کوردنشینەکان بەو شێوەیە کە لە رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا هاتوە.
ب – گەڕانەوەی ناوچەی کەرکووک بۆ سەر هەرێمی کوردەکان.
ج – دوو لە پێنجی داهاتی عێراق بەگوێرەی رێژەی ژمارەی دانیشتوە کوردەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان خەرج بکرێت.

٦- رێبەرە کوردەکان باش دەزانن کە بەعس ئەم شەرتومەرجانە قبووڵ ناکات بەلام لە وە دەترسن کە ئەگەر بە هۆی هۆکارگەلی تاکتیکی پێشنیاری رێکەوتن لەگەڵ بەعس بخەنەڕوو، بەعس شەرتومەجەکانی ئەو رێکەوتننامەیە جێبەجێ نەکات. کوردەکان لە سەر ئەو باوەڕن کە بەعس لە هەموو دەرفەتێک کەڵک وەردەگرێت بۆ ئەوەی پیلان بە دژیان دابڕێژێت و پارە بە (جاشە) کوردەکان دەدات بە بارزانی وەفادار نەبن و هەوڵ دەدات ئەلبارزانی گوشەگیر و لاواز بکات بۆ ئەوەی ئەو کاتە کە بارزانی بەتەواوی لاواز بوو یا بیکوژێت یا لەگەڵی شەڕ بکات. بارزانی لەوە

دوودڵە کە بڕیاری ئەوە بدات دژی بەعس بجولێتەوە چونکە لەوە دەترسێت کە یەکێتی سۆڤیەت بە دژی خۆی بجولێتەوە. یەکێتی سوفیەت بە ئاشکرا رایگەیاندوە کە دژی سەرجەم ئەو لایەنانەیە کە دژی بەعس کار بکەن. ئەلبارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بەو بڕە کەمە یارمەتیە کە لەم چەند مانگەی دواییدا لە ئێران وەریگرتووە ناتوانێت لەم بارودۆخەدا لەگەڵ بەعس شەڕ بکات.

٧- ئەگەر بەهەرحاڵ "دەوڵەتی عێراق لە تاراوگە" کە لە کورد و عەرەبەکان پێکدێت، لە باکووری عێراق دابمەزرێت و لایەنە بیانیەکانی دیکە پشتیوانی لێبکەن، هیوایەکی باش بۆ رووخاندنی بەعس دێتە کایەوە. کوردەکان لە سەر ئەو باوەڕن کە ئەگەر لایەنە بیانیەکان یارمەتیان نەدەن، خواستی رولەزیادبوونی یەکێتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی پشتی بەعس بگرێت، دەبێتە هۆی ئەوەی کوردەکان کەم کەم پێگەی سەربەخۆی خۆیان لە دەستبدەن و رێگا بۆ ئەوە خۆش دەبێت کە بەعس کۆنترۆلی هەموو عێراق بگرێتە دەست.

ریچارد هێڵمز
بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

**لەلایەن ئانــدرۆ کیلگــۆر[231] لە نووســینگەی کاروبــاری رۆژهەڵاتــی نزیک و باشووری ئاسیای وەزارەتی دەرەوە**

**بۆ: جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا (جۆزێف سیسکۆ)**

**واشینگتۆن، ٥ی نیسانی ١٩٧٢**

**بـابەت: نـامەی مەلا مسـتەفا بـارزانی بـۆ وەزیـری دەرەوەی ئەمریکـا و هۆکارەکانی یارمەتینەدانی ئەمریکا بە کوردەکان**

ئەوەی کە هاوپێچ کراوە یادداشتنامەی گفتوگۆکانی زەید عوسمان و توماس سکاتە[232]. زەید عوسمان داوای یارمەتی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی ئەمریکای کردووە بۆ ئەوەی بارزانی بتوانێت "بزوتنەوەیەکی ئازادیبەخش"ی عەرەبی — کوردی بە ئامانجی روخاندنی رژیمی بەعسی بەغداد لە کوردستانی عێراق دابمەزرێنێت. زەید عوسمان هەروەها نامەیەکی بارزانی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکای تەسلیم بە ئێمە کرد کە تێیدا بارزانی داوای هەمان شتی کردوە. زەید عوسمان داوای کرد تا رۆژی ٦ی نیسان وەڵامی داواکاریەکەی بدرێتەوە.

بە بۆچوونی ئێمە دەبێ وەڵامی نەرێنی بەم داواکاریە بدەینەوە بە لەبەرچاوگرتنی ئەم هۆکارانە:

---

[231] Killgore
[232], Thomas Scotes

الف – رژێمێک که له ژێر دەسەڵاتی بارزانیدا بێت زەحمەته بتوانێت له بەرامبەر دژایەتیکردنی عەرەبەکان هەم له ناوخۆ و هەم له دەوەی عێراق که بێ گومان رۆژ به رۆژ زیاتر دەبێت، درێژه به مانی خۆی بدات.

ب – پێگەی ئابووری سۆڤیەت له عێراق بەهێزه کەوابوو ئەگەریش بارزانی له روخاندنی رژێمی بەعسدا سەربکەوێت، دوره که بتوانێت پەیوەندیەکانی عێراق لەگەڵ مۆسکۆدا بپچڕێنێت مەگەر ئەوەی ئێمه خۆمان ئاماده بکەین بەشێوەی خێرا و بەرفراوان یارمەتی (عێراق) بدەین.

ج – ئەگەر دەوڵەتی ئەمریکا پشتیوانی له شاڵاوی کودتایەک دژی بەعس بکات (که له باشترین حالەتی خۆیشیدا دیسان له روی رێکخستنیەوه لاواز دەبێت) شاردنەوەی ئەو شاڵاوه کارێکی زەحمەته، کەوابوو ئەمریکا زیاتر پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتانای دیکەی عەرەبی تێکدەدات چونکه پشتیوانی له بزووتنەوەیەکی غەیره عەرەبی کردوه که له لایەن دەوڵەتانی غەیره عەرەبی دیکه (ئێران و ئیسرائیل) دژی عەرەبەکان یارمەتیدراوه.

د – ئاسانکاریکردن بۆ بەدەسەڵاتگەیشتنی دەوڵەتێک له بەغداد که کوردەکان پشتیوانی لێبەکەن، کوردەکانی ئێران و تورکیاش دەوەرژێنێت، کەوابوو لانیکەم نیگەرانی له نێو دەوڵەتی تورکیه درست دەکات (تەنانەت ئەگەر ئێران نیگەران نەکات).

ی – هەرچەشنه تەشویقکردنێکی کوردەکان دەبێته هۆی ورژاندنی هەست و سۆزی نەتەوەیی کوردەکان که ئامانجیان دامەزراندنی بەرەبەرەی وڵاتی سەربەخۆی کوردستانه. ئەم هەنگاوه دەبێته هۆی پارچەپارچەبوونی زیاتری ناوچه که خۆی له خۆیدا پێشتر پارچه پارچه بوه.

سەرەڕای ئەو شتانە کە باس کرا، ئێمە ئەم مەسەلەمانە لەگەڵ بەڕێز رۆی[233] باس کردوە و "رۆی" لەگەڵ ئەوەدایە کە ئێمە پێش لەوەی کە بڕیاری کۆتایی خۆمان بەنیسبەت داواکاریەکەی زەید عوسمان بدەین، بارودۆخی کوردەکان لەگەڵ مایک والیر[234] لە CIA تاوتوێ بکەین. CIAش لەرێگای سەرچاوەگەلی سەربەخۆوە هەمان زانیاریگەل و داواکاریگەلی بە دەست گەیشتوە. ئەم پێشنیارەی ئێمە لەگەڵ ئەو بۆچونانەی ئێوەدا هاوتەریبە کە دوێنێ لە فرۆکەخانە بۆ بەڕێز تام سکات باستان کرد و وتتان ئێمە دەبێ درێژە بە نوێکردنەوەی هەڵسەنگاندنەکانمان بدەین و نابێ تەنها بەگوێرەی عەقلی ئاسایی خومان بجولێینەوە. لە هەمان کاتدا پێشنیار دەکەین جەنابت بە شێوەی زارەکی بە کورتی وەزیری دەرەوە لەم مەسەلەیە ئاگادار بکەیتەوە چونکە نامەکەی بارزانی بۆ ئەو نووسراوە.

هاوپێچەکان:

١- ناوەرۆکی گفتوگۆکان لەگەڵ زەید عوسمان، نوێنەری بارزانی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا

٢- وەرگێڕانی نامەکەی بارزانی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا[235]

---

233 Roy
234 Mike Waller

٢٣٥ - نامەکەی مەلا مستەفا بارزانی لە نێو بەڵگەنامەکەدا نییە. وەرگێڕ

**وەزارەتی دەرەوە**

**یادداشتنامەی گفتوگۆکان لەگەڵ زەید عوسمان**

**٣ی نیسانی ١٩٧٢**

**بابەت: کوردەکان داوای یارمەتی لە ئەمریکا دەکەن**

بەشداربووان:

- تام ج سکات، بەرپرسی کاروباری عێراق لە نووسینگەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای وەزارەتی دەرەوە
- زەید عوسمان، نوێنەری تایبەتی مەلا مستەفا بارزانی

شوێنی گفتۆگۆ: هۆتیل های ئادامز[٢٣٦]، واشینگتۆن، دی سی

کورتە: لە میانەی دانیشتنێک لەگەڵ زەید عوسمان، نوێنەری تایبەتی رێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی لە رۆژی ٣ی نیسان کە لە سەر داواکاری زەید عوسمان ئەنجامدرا، زەید عوسمان ئەم خاڵانەی خستە بەردەم توماس سکات، بەرپرسی بەشی کاروباری عێراقی ئوفیسی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای وەزارەتی دەرەوە:

---

[236] Hay-Adams Hotel

الف – له ئه‌نجامی دیداره‌که‌ی ئه‌م دوایه‌ی سه‌دام حوسه‌ین ئه‌لته‌کریتی، جێگری سکرتێری گشتی حیزبی به‌عسی عێراق له‌ مۆسکۆ، ده‌سه‌ڵاتی سۆڤیه‌ت له‌ عێراق به‌شێوه‌یه‌کی زۆر نائاسایی زیادی کردوه‌.

ب – ئێستا سۆڤیه‌ت له‌ درێژه‌ی هه‌وڵه‌کانی بۆ پته‌وکردنی پێگه‌ی خۆی له‌ عێراق، گوشار ده‌خاته‌ سه‌ر مه‌لا مسته‌فا بۆ ئه‌وه‌ی په‌یوه‌ست بێت به‌ حزبی به‌عس و حیزبی شیوعی عێراق بۆ ئه‌وه‌ی ده‌وڵه‌تی به‌ره‌ی نیشتمانی پێکبهێنن.

ج – مه‌لا مسته‌فا نایه‌وێت بچێته‌ ناو ده‌وڵه‌تی به‌ره‌ی نیشتمانی چونکه‌ له‌وه‌ ده‌ترسێت که‌ حیزبی به‌عس له‌و پێشنیاره‌ وه‌ک ئامرازێک بۆ له‌ناوبردنی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP) که‌ڵکوه‌ربگرێت.

د – مه‌لا مسته‌فا داوای له‌ ده‌وڵه‌تی ئه‌مریکا کردوه‌ به‌ شێوه‌ی مادی و سه‌ربازی یارمه‌تی بدات بۆ ئه‌وه‌ی بتوانێت "ده‌وڵه‌تی عێراق له‌ تاراوگه‌" که‌ له‌ کورد و عه‌ره‌به‌کان پێکدێت له‌ کوردستانی عێراق دابمه‌زرێنێت بۆ ئه‌وه‌ی به‌ردی بناخه‌ی رووخانی حیزبی به‌عسی عێراق دابنرێت.

ی – یارمه‌تیه‌که‌ی ئه‌مریکا ده‌کرێت به‌ شێوه‌ی راسته‌وخۆ یا ناڕاسته‌وخۆ (بۆ نموونه‌ له‌ڕێگای مه‌لک حوسه‌ینه‌وه‌) ته‌سلیم به‌ بارزانی بکرێت. ئه‌گه‌ر ئه‌و یارمه‌تیه‌ له‌ داهاتویه‌کی نزیکدا ته‌سلیم به‌ بارزانی نه‌کرێت مه‌لا مسته‌فا ناتوانێت له‌ به‌رامبه‌ر گوشاری سۆڤیه‌ت و به‌عسدا رابوه‌ستێت و له‌ ئه‌نجامدا عێراق به‌ره‌به‌ره‌ ده‌بێت به‌ ژارده‌ستی سۆڤیه‌ت، که‌وابوو به‌رژه‌وه‌ندیه‌کانی جیهانی ئازاد له‌ که‌نداوی فارس و هه‌روه‌ها ئێران و تورکیه‌ ده‌که‌وێته‌ ناو مه‌ترسی.

ف – زه‌ید عوسمان نامه‌یه‌کی ته‌سلیم به‌ ئێمه‌ کرد که‌ بارزانی به‌ زمانی عه‌ره‌بی بۆ ویلیام راجێرز، وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا نوسیویه‌تی و تێدا داوای هه‌مان ئه‌و شته‌ی

کردوه که باس کرا. زەید عوسمان داوای کرد پێش لەوەی ڕۆژی ٦ی نیسان واشینگتۆن بە جێ بهێڵێت، وەڵامی داواکاریەکەی وەربگرێت.

٩- داواکاری بارزانی بۆ یارمەتیدانی ئەمریکا: زەید عوسمان وتی وەک نوێنەری تایبەتی مەلا مستەفا بارزانی هاتوە بۆ ئەمریکا بۆ ئەوەی بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی ئەمریکا لەم کاتە هەستیارەی مێژووی عێراق و بزووتنەوەی نەتەوەی کورددا هەوڵ بدات. زەید عوسمان لە درێژەی قسەکانیدا وتی لە ئەنجامی سەفەرەکەی ئەم دوایەی سەدام حوسەین تەکریتی، جێگری سکرتێری گشتی حزبی بەعسی عێراق بۆ مسکۆ ئێستا سۆڤیەت پشتیوانی لە هەوڵەکانی حزبی بەعسی عێراق بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق دەکات. ئەم پشتیوانیەی سۆڤیەت لەو گوشارەدا ڕەنگ دەداتەوە کە سۆڤیەت دەیخاتە سەر مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئەوەی داواکاریەی بەعس قبووڵ بکات. کاربەدەستێکی پایەبەرزی حیزبی شیوعی سۆڤیەت ئەم دوایانە لە کوردستان بوە و هەوڵیداوە قەناعەت بە بارزانی بهێنێت داواکاریەکەی بەعس قبووڵ بکات. بەهەرحاڵ بارزانی هەست دەکات ئەگەر پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP) پەیوەست بە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق بێت، بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد دەشکێت و بێ هێز دەبێت.

زەید عوسمان شیکردەوە کە ئامانجی سۆڤیەت لە پشتیوانیکردن لە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق ئەوەیە کە پێگەی خۆی زیاتر لە عێراق قایم بکات بەتایبەت لەم ساتوکاتەدا کە پێگەی سۆڤیەت لە سوریە و میسر قابلی پێشبینیکردن نیە. زەید لە درێژەی قسەکانیدا وتی بەرژەوەندیە ئابووری - سیاسیەکانی سۆڤیەت لە عێراق لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەوپێش چوە و سۆڤیەت دەیەوێت ئەم سەرمایەگوزاریە بپارێزێت. زەید وتی کوردەکان لە سەر ئەو باوەڕن کە سۆڤیەت دەیەوێت نەتەنها لە کەنداوی فارس بەڵکوو دژی ئێران و تورکیەش کەڵک لە عێراق وەبگرێت.

زەید لە ئەنجامی ئەو بەشە لە قسەکانیدا وتی بارودۆخەکە زۆر هەستیارە و تەنیا ئەمریکا دەتوانێت لەرێگای پشتیوانیکردنی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە بارزانی، ئەو کلۆکپەی سۆڤیەت بنیشێنێتەوە. لە وەلامی پرسیاری مندا زەید وتی کوردەکان هەم لەگەڵ شا و هەم لەگەڵ مەلەک حوسەین لە پەیوەندیدان. بەهەرحاڵ شا زۆر گەرموگوڕە و شێلگیرە لە پشتیوانیکردن لە بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بەلام بارزانی ناتوانێت بە پشتبەستن بەم پشتیوانیە کە نازانێت لە داهاتوودا بە چی دەبێت، خۆی بە تەواوی بخاتە ناو خەباتێکی بەرفراوان دژی رژێمی بەعسی بەغداد. مەلک حوسەین هەر چەند کە لەگەڵ کوردەکان هاوخەمە بەلام نەیتوانیوە جگە لە پشتیوانی ئەخلاقی، بەڵێنی هیچ چەشنە یارمەتیەکی دیکەیان پێبدات. بەهەرحاڵ مەلک حوسەین نیازی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی سەردانی تاران بکات و شا هان بدات زیاتر یارمەتی کوردەکان بدات بەلام بارزانی لەوە زیاتر ناتوانێت چاوەڕوانی شا یا مەلک حوسەین بکات.

سۆڤیەت و رێبەرایەتی حیزبی بەعس ئێستا بارزانیان خستوەتە ژێر گوشار بۆ ئەوەی لە ماوەی ٣ یان ٤ حەوتووی داهاتوودا وەلامیان بداتەوە، هەر بەو هۆکارەیە کە بارزانی بڕیاریداوە نامەیەک بنێرێ بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و تێیدا بۆ دواجار داوای یارمەتی لە ئەمریکا کردوە. ئەگەر ئەم یارمەتیە بە بارزانی نەدرێت، بارزانی ناچار دەبێت بچێتە ناو بەرەی نیشتمانی، کەوابوو دوایین دەرفەتی رۆژئاوا بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانەکانی سۆڤیەت لە عێراق لە ناو دەچێت.

٢- **پلانی بارزانی:** زەید عوسمان پاشان شیکردەوە کە بارزانی دەیەوێت چی بکات ئەگەر ئەمریکا پشتیوانی لێبکات و لە سەرەتای قسەکانیدا وتی لەوانەیە ئەمریکا بیەوێت بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، بۆ نمونە لەرێگای مەلک حوسەینەوە یارمەتی کوردەکان بکات. وتی کوردەکان ئەمەیان قبوولە و لەهەر حاڵەتێکدا متمانەیان بە مەلک حوسەین هەیە. زەید لە درێژەی قسەکانیدا وتی خۆی بە نوێنەرایەتی لە لایەن بارزانیەوە لەگەڵ کۆمەڵێک لە کەسایەتیە ناسراوەکانی عێراق لە پەیوەندیدایە کە

دژی بەعسن و ئامادەن هاوکاری کوردەکان بکەن بۆ ئەوەی رژیمی بەعس بڕوخێنن. بەهەرحاڵ ئەم کەسایەتیە عەرەبانە هیچ بەرپرسیاریەتێکی ئاشکرایان نیە کە پشتیوانی لە بارزانی بکەن مەگەر ئەوە کە هەم لە پشتیوانی مادی و هەم پشتیوانی ئەخلاقی ئەمریکا دڵنیا بن. زەید عوسمان چەند جار دووپاتی کردەوە کاتێک کە ئەو کەسایەتیە عەرەبانە بزانن کە ئەمریکا پشتیوانیان لێدەکات لە دەوری بارزانی لە باکووری عێراق کۆ دەبنەوە و دەکرێت باکووری عێراق وەک ناوەندێک بەکار بێت بۆ ئەوەی سەرەتا لەوێوە هێرشی پڕۆپەگەندایی و پاشان ئەگەر پێویستی کرد هێرشی سەربازی بکرێتە سەر رژیمی بەعس.

لە وەڵامی پرسیارێکی مندا (دەربارەی کردەوەکانیان دژی دەوڵەتی عێراق) زەید نەیەویست تەنها لە سەر کردەوەگەلی سەربازی چڕ بێتەوە و وتی وردەکاریەکانی ئەو مەسەلەیە پاشان ئامادە دەکرێت. زەید لەوە دڵنیا بوو کە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بیزاریە بەرفراوانەی کە لە عێراق دژی رژیمی بەعس هەیە، هەم سوپای عێراق و هەم خەڵکی عێراق پێشوازی لە دامەزراندنی بزووتنەی رزگاری لە باکووری عێراق دەکەن. زەید هەروەها ئاماژەی بەوە کرد کە کوردەکان پێشتر لەگەڵ کەسایەتیە بێ کاریگەرەکانی ناو سپای عێراق پەیوەندیان گرتووە و ئەو کەسایەتانە تەنیا چاوەڕوانی شتێک دەکەن تا پەیوەست بن بە بارزانی. زەید لە درێژەی قسەکانیدا وتی ئەڵبەتە بارزانی دەبێ بتوانێت مووچەی ئەم کەسایەتیانە دابین بکات و بنەماڵەکانیان بەخێو بکات ئەگەر شتێکیان لێ بقۆمیت. ئەم پشتیوانیە مادیە جگە لەو پشتیوانیە مادیەیە کە ئێستا بارزانی بۆ دابینکردنی موچەی هێزەکانی خۆی (پێشمرگە) پێویستی پێیەتی. ئێستا رژیمی عێراق مانگانە نزیکەی ١٥٠ هەزار دیناری عێراقی (کە دەبێت بە نزیکەی ٤٢٠ هەزار دولار) دەدات بە بارزانی بۆ ئەوەی موچەی هێزەکانی پێدابین بکات.

زەید لە درێژەی قسەکانیدا وتی ئەگەر بارزانی نەچیتە ناو بەرەی نیشتمانی لەوانەیە دەوڵەتی عێراق ئەم پارەیە ببڕێت و لە ئەنجامدا بارزانی پارەی نامێنێت بیدات بە

هێزەکانی. لەم پەیوەندیەدا زەید وتی ئێستا نزیکەی بیست و چوار هەزار پێشمەرگە چەکدارن یا دەکرێت لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا چەکدار بکرێن. زەید هەروەها ئەوەی بە سەرقسەکانیدا زیاد کرد کە ئەگەر پارەیان پێبدرێت کوردەکان دەتوانن تەنها لە ماوەی چەند مانگدا ژمارەی هێزەکانیان لە باکووری عێراق بگەیەننە پەنجا هەزار کەس). زەید وتی بارزانی هەروەها پێویستیشی بە چەکی هێرشبەر دەبێت بۆ ئەوەی ئەو چەکە بەرگریانەی پێ قایم بکات کە ئێستا کوردەکان هەیانە.

**٣-بەعس داوای چی لە بارزانی دەکات؟:** زەید وتی بەهۆی ئەوەی کە هەندێ لە (لایەنەکانی) بارزانی دەیانەوێت لە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانیدا بەشدار بین، دەوڵەتی عێراق چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە بارزانی سنووری ئێران دابخات و ڕێگە بەوە بدات بنکەی سەربازانی عێراق لە باکوور دابمەزرێندرێت بەڵام بارزانی نایەوێت ئەم پێشنیارانە قبووڵ بکات. سۆڤیەت هەوڵیداوە لە نیگەرانی بارزانی لەم پەیوەنیەدا کەم بکاتەوە و ئامادەیی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی کاربەدەستێکی پایەبەرزی سۆڤیەت بنێرێت بۆ هەمیشە لە باکوور لای بارزانی بمێنیتەوە بۆ ئەوەی بارزانی دڵنیا بێتەوە کە بەعسیەکان ڕێکەوتننامەکەیان لەگەڵ کوردەکان جێبەجێ دەکەن (ئەو ڕێکەوتننامەیە کە ئۆتۆمیەکی بەرفراوانی شانۆیی دەدات بە باکوور). بارزانی نە متمانەی بە سۆڤیەت هەیە و نە بە بەعس.

**٤-ئامانجەکانی سۆڤیەت:** زەید عوسمان چەند جار هەڵسەنگاندنی خۆی بە نیسبەت ئامانجەکانی سۆڤیەت لە عێراق و ناوچە دووپات کردەوە. هەروەها کە باس کرا زەید وتی سۆڤیەت سەرەتا دەیەوێت بەرژەوەندیە سیاسی و ئابووریەکانی لە عێراق بپارێزێت. زەید لەم پەیوەندیەدا وتی لەوانەیە سۆڤیەت چاویشی بڕیبێتە نەوتی عێراق و ئاماژەی بەوە کرد کە کوردەکان لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بیستویانە کە سەدام حوسەین بەدوای یارمەتی و ڕاپرسی لەگەڵ سۆڤیەتدایە بۆ ئەوەی دەست بە سەر بەشە نەوتی بریتانیا و ئەمریکا لە کۆنسورتیۆمیIPC (کۆمپانیای نەوتی عێراق) بگرێت. زەید لە درێژەی قسەکانیدا جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئامانجی

درێژخایەنی سۆڤیەت لە عێراق ئەوەیە کە لە عێراق وەک ناوەندێک کەڵک وەربگرێت بۆ ئەوەی هێرش بکاتە سەر تورکیە و ناتۆ و دژی ئێران و کەنداوی فارس خراپکاری بکات. زەید وتی سۆڤیەت ئێستا یارمەتی عێراق دەدات بۆ ئەوەی سیستمی بەرگری موشەکی لە بنکەی هەوایی شعوبیە[٢٣٧] لە نزیکی بەسرە دابمەزرێنێت.

٥- دەستتێوەردانی ئێران لە مەسەلەکەدا: زەید هەرچەند کە سپاس و پێزانینی خۆی بەنیسبەت یارمەتیەکانی ئێران لە رابردوودا دەربڕی بەڵام ئاماژەی بەوە کرد کە ئێران یا نازانێت چۆن لەگەڵ عێراق هەڵسووکەوت بکات یا لە بارودۆخی عێراق بۆ ئامانجەکانی خۆی کەڵک وەردەگرێت. زەید زیاتر لە سەر کەڵکوەرگرتنی ئێران لە بارودۆخی عێراق رۆیشت و وتی ئێران هەوڵیداوە نەهێڵێت کوردەکان لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکەی یارمەتیوەرگرتن وەک (رەش کراوەتەوە) پەیوەندی بگرن. زەید هەروەها وتی ئێران زۆر بەهەڵەدا دەچێت ئەگەر پێیوابێت دەتوانێت لەم پەیوەندیەدا کەڵک لە کوردەکان و لایەنە میانەڕەوەکانی دیکەی عێراق وەربگرێت. زەید هەروەها ئاماژەی بەوە کرد نابێت ئامانجی ئێران ئەوە بێت کە عێراق بەردەوام ناسەقامگیر بێت و وتی وادیارە ئێستا ئامانجی ئێران هەر ئەوەیە.

٦- نزیکبونەوەی میسر لە بارزانی: زەید وتی ئەم دوایانە میسر چەند نوێنەرێکی ناردوە بۆ لای بارزانی و ئامادەیی میسر و سوریەی دەربڕیوە بۆ هاوکاریکردنی کوردەکان بۆ ئەوەی رژێمی بەعسی عێراق بڕوخێنن. بەهەرحاڵ میسر وتویەتی کە پێویستە کوردەکان لەگەڵ کەسایەتیە نەتەوەیە عەرەبەکان هاوکاری بکەن بەڵام بارزانی ئامادە نیە لەگەڵیان هاوکاری بکات چونکە پێیوایە کە ئەو کەسایەتیانە بەگشتی لەبەرچاوی خەڵکی عێراق کەوتوون.

٧- بارودۆخی باکور: بە وتەی زەید بارودۆخی باکوور ئارامە. سەرەڕای ئەو راپۆرتانە کە باس لەوە دەکەن کە دەوڵەتی ناوەندی یارمەتی کوردەکان دەدات، زەید

---

[237] Shu'aybah Air Base

بانگەشەی ئەوەی کرد کە لە راستیدا زۆر کەم یارمەتی دراون و ئاماژەی بەوە کرد کە یەکی لە هۆکارەکانی ئەوەی کە بارزانی بە رژیمی بەعس و بەڵێنەکانیان بەدبینە، هەر ئەوەیە. ئەڵبەتە جگە لەوەش هەوڵەکانی ئەم دوایەی بەعس بۆ کوشتنی بارزانی جێگای هیچ متمانەیەکی کوردەکانی بە رژیمی بەعس نەهێشتوەتەوە. هەر چەند کە دانیشتوانی عەرەب ناوچەی هەولێریان بە جێهێشتوە بەلام دەولەتی بەغداد درێژە بە هێنانی عەرەبەکان بۆ ناوچەی کەرکووک دەدات و بە ئاشکرا هەوڵ دەدات ئەو ناوچەیە تەعریب بکات پێش لەوەی سەرژمێری لەو هەریمە ئەنجام بدرێت (هەرچەند کە بارزانی گومانی لەوەدا هەیە ئەو سەرژمێریە قەد جێبەجێ بکرێت). ئێستا زۆربەی هەرە زۆری عەشیرەتەکان پشتیوانی لە بارزانی دەکەن، لەوانە هەندێ لەو عەشیرەتانەی کە هەر لە کۆنەوە دژی بارزانی بوونە وەک عەشیرەتی لۆلان و هەرکی و زۆربەی زیباریەکان. جگە لەوەش باڵی جەلال تاڵەبانی لە نیو KDP ئێستا بە تەواوی لە پشتی بارزانیدایە و تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد لە باکوور لە بارەگای سەرکردایەتی بارزانیدان.

٨- **بارودۆخی بەغداد:** زەید عوسمان بارودۆخی بەغدادی وەها وەسف کرد کە دژایەتی لەگەڵ رژیمی بەعس لە بەغداد روو لە زیادبوونە بەلام ئەوەی زیاد کرد کە بەهەرحاڵ کردەوە ترۆریستیەکانی رژیمی بەعس زۆربەی خەڵکی بەغدادی ترساندوە. زەید ئاماژەی بەوە کرد کە ئەو ئەشکەنجەیە کە ئێستا لە بەندیخانەکانی عێراقدا هەیە زۆر لە ئەشکەنجەی سەردەمی رژیمە کۆمۆنیستەکانی پێشوو خراپترە. زەید لەم پەیوەندیەدا وتی بەگوێرەی راپۆرتەکان دەولەتی ئاڵمانیای رۆژهەلات ئێستا ئیستیخباراتی عێراق رادەهێنێت. زەید جارێکی دیکە وتی خەڵکی عەرەبی عێراق ئامادەن پشتیوانی لە هەر بزووتنەوەیەک بکەن کە ببێتە هۆی روخاندنی رژیمی بەعس بەلام جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە بەهەرحاڵ عەرەبەکانی عێراق پشتیوانی لە کەسایەتیەکانی رژیمەکانی پێشوتری عێراق یان ئەو ناسیونالیستە عەرەبانە ناکەن کە تەنها دروشم دەدەن.

## توێژینەوەیەکی نووسینگەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارە کوردەکانی عێراق

## ٣١ی گوڵانی ١٩٧٢

## بابەت: کوردەکانی عێراق: هەڵگیرسانەوەی شۆڕش

کوردەکانی عێراق جارێکی دیکە داوای پشتیوانی دەرەکی دەکەن بۆ شەڕە ناوخۆییەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کە لەوانەیە هەڵبگیرسێتەوە. ئەم توێژینەوەیە رابردووی ناکۆکییەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق و پێگەی کوردەکان لە پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق و نێو وڵاتانی عەرەبی و دەرفەتەکانی سەرهەڵدانەوەی ئەم شەڕە و ئاکامەکانی شی دەکاتەوە.

کورتە

خەڵکی کورد هەر لە سەردەمی کەونارەوە لە زۆربەی ئەو ناوچە شاخاوییانە ژیاون کە ئێستا لێی دەژین و ژمارەیان ئێستا نزیکەی ٦ میلیونە و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە تێیاندا دەژین واتا یەکێتی سۆڤیەت، تورکیا، ئێران، عێراق و سووریا ئاڵۆزە. مەلا مستەفا بارزانی کە دوایین رێبەری کوردە کە هێزی مەعنەوی پێویستی هەیە بۆ ئەوەی عەشیرە جۆراوجۆرەکان لە چوارچێوەی هێزێکی نیمچە سەربازیی بەرچاودا کۆ بکاتەوە، سەرەتا لە دەیەی ١٩٤٠ دژی پاشایەتی عێراق راپەڕی بەڵام ناچار بوو بچێتە ئێران و پاشان بچێتە یەکێتی سۆڤیەت و ١١ ساڵ لەوێ ژیا و فێری ئەوە بوو کە نابێ متمانە بە سۆڤیەت بکات.

مەلا مستەفا ماوەیەکی کورت پاش شۆڕشی ١٩٥٨ گەڕایەوە بۆ عێراق و ساڵی ١٩٦١ بوو بە ڕێبەرێکی بێ وینە لە ناو عەشیرە کوردەکاندا و شەڕیکی پێشمەرگەیی ڕێبەری کرد کە پاش گۆڕانی ٤ ڕژیم لە عێراق (کە ئەم شەڕە یارمەتی بە رووخانی هەر چواریان داوە) تا ئێستا بەردەوامە. لە ماوەی چوار ساڵ شەڕی قورسدا هێزەکانی مەلا مستەفا لە لایەن ئێران و وڵاتانی دیکە (لە ڕێگای ئێرانەوە) یارمەتی دەدران و پۆشتە دەکران. ئامانجی ئێران ئەوە بوو کە دەستڕۆیشتوویی و کاریگەری جمال عبدالناسر لە سەر دراوسێ لاوازەکەی (عێراق) لا ببات و پێش لە بڵاوبوونەوەی کێشەکە لە لە نیو کوردەکانی ئێراندا بگرێت .

ڕژیمی ئێستای عێراق لە ژێر گوشاری هەندێ لە دەوڵەتانی عەرەبیدایە بۆ ڕازیکردنی کوردەکان بۆ ئەوەی سوپای عێراق (کە بە هۆی پەرەسەندنی شۆڕشی کورد بە تەواوی دەستی بەسترابووەوە) بتوانێت دەستی ئاوەڵا بێت ئەگەر هاتوو دوژمنایەتی عەرەب - ئیسراییل بە تەواوی پەرەبسێنێت. سۆڤیەت بەردەوام پێداگری لە سەر ئەوە کردووە کە عێراق کوردەکان کونتروڵ بکات، هەروەها کە خودی سۆڤیەت کەمینە نەتەوەییەکانی خۆی کونتروڵ دەکات. لەوانەیە سۆڤیەت دەوری بینیبێ لەو پێشنیارە یەک لایەنەیە کە حکوومەتی عێراق بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ کوردەکان خستییەڕوو و کوردەکانیش قبوڵیان کرد، بەڵام قەد بە تەواوی جێبەجێ نەکرا .

ئێستا سۆڤیەت دەیەوێت لە ڕێگای پەیماننامەیەکی نوێ و بەرنامەگەلی گەورە بۆ یارمەتیدانی سەربازی و تەکنیکی بە عێراق، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەم وڵاتە پتەوتر بکات. سۆڤیەت نایەوێت خۆی بخاتە ناو کێشەی عێراق و ئێران و هەروەها نایەوێت بکەوێتە نێو شەڕی ناوخۆیی بێ کۆتایی عێراق لەگەڵ کوردەکان. سۆڤیەت گوشار دەخاتە سەر کوردەکان تا پەیوەست بن بەو دەوڵەتی بەرەی نیشتمانییە کە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق سەرکردایەتی دەکەن.

مەلا مستەفا بە دروستی پێشبینی ئەوەی کرد کە ئەگەر بەم پلانە ڕازی بێت، نیمچە ئۆتۆنۆمییەکەی ناوچە کوردنشینەکان لە ناو دەچێت کە کوردەکان بە هێزی سەربازی

به دەستیان هێناوە. مەلا مستەفا دەزانێت دەوڵەتی عێراق (و لەوانەیە سۆڤیەت) لە پشتی هەوڵ بۆ کوشتنی خۆی و کوڕە گەورەکەی، ئیدریس دان کە لە هاوینی رابردوو ئەنجام درا[٢٣٨]. بارزانی هیچ متمانەیەکی بە دوو لایەنی دیکەی ئەم هاوپەیمانییە پێشنیارکراوە نییە. بارزانی هەروەها دەزانێت دەوڵەتی عێراق ئەم دواییانە هەوڵیداوە پشتیوانی عەشیرەتە نەیارەکانی بارزانی بەرەولای خۆی رابکێشێت و هەوڵیداوە لە رێگای بەرتیلدان بە هەندێ لە هاوڕێکانی، بارزانی بێ وەج (بێ حەیسییەت) بکات.

باڵێکی گەنجتر، ریفۆرمخواز و چەپ لە ناو کوردەکاندا هەیە. سەرۆکی ئەو باڵە جەلال تاڵەبانیە کە لە کاتی شەڕدا وەفاداری خۆی بۆ بارزانی دەربڕی بەڵام لە کاتی ئاشتیدا دژایەتی بەرنامەکەی بارزانی کرد. هەرچەند کە دەسەڵاتی تاڵەبانی لە بارزانی زۆر کەمترە (تاڵەبانی قەد دەسەڵاتی لە ناو خەڵکی عەشیرەتی و نیمچە فئودالی و نەریتیدا نیە) بەڵام داوای جۆرە دەسەڵات و رێبەرایەتیەک دەکات کە دەوڵەتی عێراق ( و سۆڤیەت) پێیانباشترە. ئەگەر بارزانی شەڕ نەکات رێبەرایەتییە تاکەکەسیەکەی هێدی هێدی لە ئەنجامی ئەم تاکتیکانە لەناو دەچێت. هەروەها رۆزگاریش لەگەڵ بارزانیدا یار نیە ( تەمەنی ٦٩ ساڵە هەرچەندکە هێشتا بەهێزە). کەوابوو راستیەکەی ئەوەیە کە هاوڕێ پێشمەرگەکانی بارزانی پێیانخۆش نییە پاش دە ساڵ شەڕ لە شەستەکاندا جارێکی دیکە بەمزوانە دیسان چەک هەڵبگرنەوە.

---

[٢٣٨] ئامارە بەوەیە کە لە ٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٠ بۆ رەواندنەوەی گرژییەکانی نێوان کورد و دەوڵەتی عێراق، وەفدێکی زانایانی ئایینی لە بەغدادەوە سەردانی مەلا مستەفا بارزانیان کرد بەڵام رژیمی بەعس بە بیانووی تۆمارکردنی دەنگی گفتوگۆکان، بومبێکی لە ناو جلوبەرگی یەکێ لە مەلاکان بە ناوی ئیبراهیم خوزاعی دانابوو چونکە دەیزانی مەلا مستەفا رێز لە کەسایەتیە ئایینیەکان دەگرێت و نایانپشکنێت. بەڵام لەوکاتەدا کە بومبەکە دەتەقێتەوە پێشمەرگەیەک خەریکی دانانی چای دەبێت و دەکەوێتە نێوان بارزانی و خوزاعی و بەو شێوەیە بارزانی بە شێوەیەکی موعجزەیی بە سلامەتی رزگاری دەبێت. هیچکام لە مەلاکان ئاگایان لەو پیلانەی بەعس نەبوو جگە لە شۆفیری ئەو ئەتوموبیلانە کە مەلاکانیان هێنابوو، شۆفێرەکانیش بەدەستی پێشمەرگەکان کوژران. وەرگێڕ

بەهەرحاڵ وادیارە ئێستا بارودۆخەکە باشتر بووە بۆ ئەوەی بارزانی بتوانێت بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش، پشتیوانی پێویستی دەرەکی بە دەست بهێنێت. ئەگەر بارزانی ئەم پشتیوانییە بە دەست نەهێنێت ناتوانێت هیوادار بێت کە هیچ کارێک جگە لە بەرگریکردن لە خۆی لە شاخەکان ئەنجام بدات. هەڵگیرسانەوەی شۆڕشیکی دیکەی کوردەکان لەوانەیە ببێتە هۆی رووخانی حکوومەتی بێزلێکراوی بەعس. بەهەرحال لەوانەیە کوردەکان نەتوانن پێکهاتەی رژیمی دوایی عێراق دیاری بکەن و وادیارە رژیمەکانی دواتری عێراق لە رژیمی ئێستا سەقامگیرتر، بەهێزتر و سەربەخۆتر لە سۆڤیەت نابن .

بارزانی کە لە نێو نەوەی خۆیدا بەهێزترین کەسایەتییە، بە توندی دووری کردووە لە هاندانی سیاسی یا بەرێکخستنکردنی کوردەکانی وڵاتانی دراوسێی عێراق. سۆڤیەت (کە لەوانەیە راستەوخۆ بکەوێتە ناو کێشەی کوردەکان) بارودۆخێکی سیاسی دژواری هەیە بەڵام ئامرازەکانی ئەوەشی لە دەستدایە کە گوشار بخاتە سەر ئێران و (لە پێوەرێکی کەمتردا) تورکیا، ئەگەر بڕیار بدات کەڵکی لێوەربگرێت.

ئیدارەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا لە وەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەر: کورتیس جونز[٢٣٩]
شیکار: شارلۆت مۆرهاوس[٢٤٠]

## کورد کێیە و لە کوێ دەژی

کورد گروپێکی ئەتنیکی جیاوازی هیندوئەورووپاییە کە زۆربەی دانیشتووانی سەرزەمینێکی شاخاوی پێکدەهێنن کە نزیکەی ١٥٠ هەزار مایلی چوارگۆشەیە و لەگەڵ تورکیا، ئێران، عێراق، سووریا، ئازەربایجان و ئەرمەنستانی سۆڤیەت هاوسنوورە. ئەم کوردستانە کۆنە قەد کیانێکی سیاسی جیاوازی نەبووە، کەوابوو بە

239 -CURTIS F JONES
240 -CHARLOOTE M MOREHAOUSE

وردی پێناسە نەکراوە. هەندێ کۆمەڵگای کورد لە دەرەوەی ئەم ناوچە کوردنشینانە لە عێراق، ئێران، تورکیا و سوریا هەیە و لە لوبنان و ئەفغانستان بڵاون.
هیچ ئامارێکی ورد دەربارەی ژمارەی کوردەکان لە بەردەستدا نییە و ئاماری دەوڵەتەکان، کورد بە خەڵکێکی جیاواز دانانێن بەڵام بە گوێرەی هەڵسەنگاندنە باوەڕپێکراوەکان ژمارەیان لە نێوان ٥ و ٦ میلیون کەسە کە ٨٩ هەزاریان لە سۆڤیەت دەژین .
نزیکەی نیوەی ئەو کوردانەی کە لە دەرەوەی سۆڤیەت دەژین لە تورکیان کە گەورەترین کەمینەی ئەم وڵاتەن و ژمارەیان ٣ میلیۆن کەسە واتا ٥٨٪ی نفووسی گشتی تورکیا. هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکان (نزیکەی میلیۆنێک و پەنجا هەزار کەس کە دەکاتە نزیکەی ٥٣٪لە سەرجەم دانیشتووانی ئێران) لە ئێران و نزیکەی میلیۆنیک و ٧٩٥ هەزار لە عێراق دەژین کە دەکاتە ١٨٪ی سەرجەم دانیشتووانی ئەم وڵاتە و نزیکەی ٢٤٠ هەزار لە سووریا دەژین. زۆربەی هەرەزۆری کوردەکان موسڵمانی سوونەن بەڵام لە عێراق ٢٥ هەزار ئیزدی ( کە لقێکی جیابوو لە ئایینزای شیعەیە و باوەڕی نائیسلامی و مەسیحی تێدایە[٢٤١]) و یەک لە سێ یا کەمتری کوردەکانی ئێران مسڵمانی شیعەن کە ئایینی زاڵی ئێرانە .
کوردەکان لە سەردەمی کەونارەوە لە ناوچە شاخاویەکانی خۆیاندا ژیاون و "گزینفۆن"[٢٤٢] باسی کردوون و مێژوونووسە کلاسیکەکان لە ژێرناوی "کاردوکی" و "گوتی" ناوی لێبردوون (کوردەکانی ئێران هندێ جار بە نادروست خۆیان یە نەوەی مادەکانی کەونار دەزانن). کوردەکان شاخنشینن و زۆرتر ئاژەڵداری رەوەند و نیمچە رەوەندن، هەرچەند کە هەندێکیان یەکجێنشینن و هەندێکی دیکەیان شارنشینن .

---

[٢٤١] ئایینی ئیزەدی هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینی شیعەوە نییە. (وەرگێڕ)

[٢٤٢] ئاماژەیە بە گزێنفۆن، شاگردی سوقرات و سەرداری یۆنانی کە ساڵی ٤٠١ی بەر لە زایین کاتی گەڕانەوە لە ئێران بەرەو یۆنان تووشی کورد بووە و لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی" ئانابازیس" یان گەڕانەوەی ١٠ هەزار کەسی باسی ئەو زەبرانەی کردووە کە کورد لە سوپاکەی وەشاندوویە. (وەرگێڕ)

کوردەکان شانازی بە خۆیان دەکەن و خۆڕاگر و هێژان. کوردە خوێندەوارەکان پۆستگەلی بالآیان لەو ولآتانەی کە تێیدا دەژین بە دەست هێناوە. هەستی کوردایەتی و پاراستنی شوناس و دابونەریتی باوباپیران لە نێو کوردان بەهێزە و بە توندی لە بەرامبەر تاواندنەوە، بەتایبەت لە ولآتانی عەرەبیدا راوەستاون چونکە کوردەکان بە گشتی هەر لە کۆنەوە خۆیان لە عەرەبەکان بە رەسەنتر زانیوە .

سەربەخۆیی سیاسی کوردستان ئاواتی لەمێژینەی کوردەکانە و لە کونفرانسی ئاشتی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی[٢٤٣] داوای سەربەخۆیان کرد بەلآم ئەم سەربەخۆییە زۆرتر بە هۆی رکابەری و جیاوازی عەشیرەتی و دوژمنایەتی ناوخۆیی کوردەکان دەستەبەر نەبوو. بە هۆی نەبوونی کانالّی پەیوەندی لە نێوان سەرزەمینی شاخاوی کوردەکان، سێ زاراوەی جیاوازی کوردی دروست بووە کە ئەوانەی کە قسەیان پێدەکەن بە دەگمەن لەیەک تێدەگەن. زاراوەی ناوچەی سلێمانی لە عێراق نزیکترین زاراوەیە بە زمانی فەرمی کوردی.

بیست و سێ گروپی عەشیرەتی سەرەکی لە نێو کورداندا هەیە کە گرنگترینیان دزەیی، هەرکی و جاف -ن. بارزانی عەشیرەت نییە بەڵکوو کونفدراسیونی کۆمەڵێک گوندە کە لە لایەن بزووتنەوەیەکی ئایینییەوە لە سەرەتای سەدەی ١٩ بەرێکخستن کراوە.

## راپەڕینە سەرەکییەکان

راپەڕینە جیدییەکانی کورد تەنها کاتێک بووە بە کێشە بۆ دەوڵەتەکان کە رێبەرێکی کورد توانیبێتی بە هێزی مەعنەوییەوە عەشیرەتە جۆراوجۆرەکان بەرێکخستن بکات. راپەڕینگەلێکی وەها لە دەیەی ١٩٢٠ لە ئێران و لە ساڵی ١٩٣١ لە عێراق بە رێبەرایەتی شیخ مەحموود (باوکی بابا عەلی، وەزیری پێشووی کابینەی عێراق کە

---

[٢٤٣] مەبەستی کونفرانسی ئاشتی پاریسە کە ژنەراڵ شەریف پاشا بە نوێنەرایەتی لە نەتەوەی کورد تێیدا بەشداری کرد و پەیماننامەی "سێڤر"ی لێکەوتەوە کە بواری بۆ سەربەخۆیی کوردستان لە ئیمپراتۆری عوسمانی خۆش دەکرد. ( وەرگێڕ)

جار جار وەک ناوبژیوانێکی بێ لایەن لە کاتی شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق لەگەڵ ئەم دووو لایەنە وتووێژی دەکرد) روویداوە.

مەلا مستەفا بارزانی سەرەتا دژی سیستمی پاشایەتی عێراق لە دەیەی ۱۹٤۰ راپەڕینی کرد و ناچار بوو لەگەڵ هاوڕێکانی بچێتە باکووری ئێران (رۆژئاوای ئێران راستە - وەرگێڕ) و لە کۆماری کورتە تەمەنی مهاباددا بەشداری کرد کە بە پشتیوانی سۆڤیەت لە بەشێک لە ئێران کە سۆڤیەت لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا داگیری کردبوو، دامەزرا. کاتێ کە سۆڤیەت ناچار بوو ساڵی ۱۹٤٦ لە ئێران بچێتە دەرەوە، کۆماری مهاباد بە خیرایی رووخا و مەلا مستەفا لەگەڵ ٥۰۰ کەس لە هاوڕێکانی لە ساڵی ۱۹٤۷ چووە ناو خاکی سۆڤیەت و ۱۱ ساڵ لەوێ مایەوە.

کۆماری تورکیا هەوڵی زۆری داوە بۆ ئەوەی کوردەکان بکات بە تۆرک و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێستا کوردەکان مەترسی سیاسی نین بۆ تورکیا، هەرچەند کە هەستی سەربەخۆیی کوردستان لە نێواندا هەر هەیە. لە کاتی پەرەسەندنی شەڕی ناوخۆی عێراق لە دەیەی ۱۹٦۰ چەند سەد کەس لە کوردەکانی تورکیا هاتنە ریزی برا کوردەکانیان لە عێراق.

کوردەکانی ئێرانیش بەردەوام رەخنەیان لە حکوومەتی ئێران گرتووە کە زۆرتر بە هۆی هەڵاواردنی ئابوورییە کە بە وتەی خۆیان ئێران دژ بەوان پەیڕەوی دەکات. راپەڕینی کوردەکانی عێراق و هەروەها چەند هۆکارێکی دیکە بووەتە هۆی ئەوەی کۆمەڵێک چاکسازیی بەپەلەی ئابووری لە کوردستانی ئێران ئەنجام بدرێت.

## کورد و سیاسەتی عەرەبەکان

لە عێراق کوردەکان بێ لەبەرچاو گرتنی ژمارەیان، خاوەن قورساییەکی سیاسین چونکە وڵاتی عێراق پێکهاتەیەکی ئەتنیکی و ئایینی تایبەتی هەیە. دانیشتووە عەرەبەکانی عێراق بە شێوازێکی یەکسان بە شیعە و سوونە دابەش کراون. لە راستیدا ژمارەی عەرەبە شیعەکان لە عەرەبە سوونەکان زۆرترە بەڵام بە هۆکارگەلی مێژوویی هەمیشە عەرەبە سوونەکان دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە. کوردەکان لە

ڕووی ئەتنیکییەوە لە عەرەبەکان جیاوازن بەڵام لە ڕووی ئایینیەوە سوونەن، کەوابوو هاوسەنگی هێزەکەیان بە دەستەوەیە. حکوومەتی عێراق بە هۆی ئەم هاوسەنگییە ئایینییە داواکاری کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی ناوچەیی ڕەت دەکاتەوە لە بەر ئەوەی دەترسێت ئەگەر داواکارییەکەی کوردەکان جێبەجێ بکات شیعەکان و کەمینە بچووکترەکانی دیکەش داوای هەمان مافانە بکەن و هەروەها بە هۆی ئەوەی کە کۆنترین و گەورەترین ناوچەی بەرهەمهێنانی نەوتی عێراق لە سەرزەمینی کوردەکاندایە.

کوردەکان پاش شەڕی یەکەمی جیهانی نەیانویست ببن بە بەشێک لە دوو وڵاتی عەرەبی عێراق و سووریا و بەرژەوەندیان لەوەدا بوو کە دژایەتی هەر چەشنە یەکێتییەکی عەرەبی بکەن کە تێیدا ببەن بە کەمینەیەکی بچووکتر، هەربۆیە کوردەکان دژی یەکێتی سەرنەکەوتووی عێراق و ئوردۆن لە دژی جمال عبدالناسر لە ١٩٥٨ ڕاوەستان. کوردەکان هەروەها دژی هەوڵەکانی ناسر بۆ یەکخستنی عەرەبەکان ڕاوەستاون و بە چاوێکی نەرێنی سەیری حیزبی بەعسی دەسەڵاتداریان کردووە کە بە شێوازێکی دوگم لایەنگری یەکێتی عەرەبەکانە. کوردەکان تەنانەت هەندێ جار هەوڵیانداوە بەعسییەکان و لایەنگرانی ناسر دژی یەکدی هان بدەن.

ماوەیەکی کورت پاش شۆڕشی ١٩٥٨ واتا ئەو کاتە کە قاسم هاتە جێگای ئەو ڕێبەرە نیشتمانییانە کە لەگەڵ ڕژیمی پێشوو هاوکاریان کردبوو، عبدولکەریم قاسم مەلا مستەفا و هاوڕێکانی بانگهێشت کرد لە سۆڤیەت بگەڕێنەوە بۆ عێراق و لە بەر چاوی خەڵک کردی بە شێر. قاسم ئەوەی بە درستی هەڵنەسەنگاندبوو کە مەلا مستەفا هێشتاش سەمبولی خەبات دژی حکوومەتی ناوەندیە. مەلا مستەفا وەک سەرکردەکانی دیکەی کورد دەیویست ئەو بەشانە لە خاکی کوردستان بە دەست بهێنێتەوە کە لە لایەن هێزەکانی دیکەوە داگیر کرابوو، کەوابوو ئەم هەست و گروتینە بەدەر لە چوارچێوەی ئەو پوانانە بوو کە قاسم ئامادە بوو پێیبدا.

قاسم زۆر درەنگ هەوڵیدا یارمەتی عەشیرەتەکانی نەیاری بارزانی بدات بۆ ئەوەی پێش لە پەرەسەندنی بزووتنەوەی کورد بگرێت و لە ئابی ١٩٦٠ شەڕی نێوان

عەشیرەتەکان هاتە ئاراوە. بارزانی تا تەموزی ١٩٦١ عەشیرەتە دوژمنەکانی دەر کرد یا خستنییە ژێر رکێفی خۆی.

یاسای بنەڕەتی ١٩٥٨ی عێراق مافە ئابووری و کولتوورییەکانی کوردەکانی لە خۆ دەگرت و پێشنیاری ئەوەی دەکرد کە دەوڵەتی فدراڵی عەرەب و کورد دابمەزرێت و دوو پایتەختی لە بەغداد و سلێمانی هەبێت. رێبەرایەتی کورد بە واقعبینییەوە ئەو کاتە و پاش ئەوەش خوازیاری سەربەخۆیی نەبوو و تەنها داوای ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقی دەکرد. لە ناوەڕاستی ئەیلوولی ١٩٦١ حکوومەتی عێراق دەستی کرد بە بومبارانکردنی هەوایی ناوچە کوردنشینەکان و لە ١٩٦٣ گازی کیمیایی دژی کوردەکان بە کار هێنا. ئەم تاکتیکەی عێراق هەرچەند کە لە رووی سەربازییەوە سەرکەوتوو بوو بەڵام بووە هۆی شەرمەزاربوونی عێراق چونکە ئاراستەی با کیمیاییەکەی برد بەرەولای سنووری ئێران و کاری کردە سەر هەندێ لە گوندەکانی ئێران و چەند سەر مەڕ وماڵاتێکی کوشت.

ناکۆکی نێوان کورد و حکوومەتی عێراق بە خێرایی بوو بە بەربەرەکانییەکی سەربازی و کوردەکان کونترۆڵی تەواوی ناوچە شاخاوییەکانی باکووریان (لە باشوورەوە تا رووباری زێی بچووک و لە رۆژئاواوە تا چیای حەمرین) گرتە دەست بەڵام هەوڵیان نەدا شارە سەرەکییەکانی ناو دەشتەکان وەک هەولێر و کەرکووک یا ریگا سەرەکییە گرنگەگان بگرن بەڵام هەرکاتێک کە بیانویستبایا جادەکانیان دەگرت و شارۆچکەکانیان گەمارۆ دەدا. کوردەکان لە ناوچەی ژێر کونترۆڵی خۆیان (کە پتر لە ١١ هەزار مایلی چوارگۆشە بوو واتا بە قەد ئەیالەتی "مریلەند" و "دیلوەیر" [٢٤٤]دەبوو) دەوڵەتی باڵادەست بوون و باجیان کۆ دەکردەوە (لەو ناوچانەی کە کوردەکان و حکوومەت لە سەری ناکۆک بوون ئەم باجە دووجار وەردەگیرا) و گومرکیان لە خاڵە سنوورییەکان دانابوو و ئیدارەکەیان رۆژ بەرۆژ نوێتر دەکردەوە.

ئەم بارودۆخە هەروا ٨ ساڵ بەردەوام بوو (بەڵام بە هۆی سەرمای زستان یا هەوڵی وتووێژەکان شەڕ رادەوەستا) و کوردەکان نەیانتوانی ناوچەی زیاتر لە ژێر چنگی

---

[244] Maryland and Delaware

هێزەکانی حکوومەت بهێننە دەرەوە و هێزەکانی حکوومەتیش نەیانتوانی سەرکەوتنێکی یەکلاییکەرەوە بە دەستبهێنن. لە ماوەی ئەم ٨ ساڵەدا پێشمەرگەکان توانیان بە سەرکەوتوویی چوار لە پێنجی هێزەکانی عێراق سەرقاڵی خۆیان بکەن و بۆ ماوەگەلێکی کورت تەناتەت زۆرتر لەم رێژەیەش لە سەرچاوەکانی عێراق بە فیرۆ بدەن. زۆربەی ئەو کوردانەی کە پۆستی حکوومەتیان هەبوو، یا بە هۆکاری ئەمنی دەرکران و یا خۆیان دەستیان لە کار کێشایەوە و سەدان کورد لەوانە دوو ئەفسەر بە پلەی ژنەراڵی پەنایان بۆ لایەنی کوردەکان برد.

بەردەوامبوونی شەڕی بێ ئاکامی ناوخۆیی یەکێ لە هۆکارەکانی ناکارامەبوونی حکوومەت بە گشتی و سوپا لە نێو ئەم رژیمە یەک لە دوای یەکانە لەم دە ساڵەدا بووە، کەوابوو شەڕ یەکێ لە هۆکارە گرنگەکانی رووخانی خێرای ئەم رژیمانە بووە. پیلانگێرانی کودیتا حیسابیان بۆ مەسەلەی کورد دەکرد و رێبەرایەتی کورد گەیشتبووە ئەو قەناعەتە کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی عێراقدا کورد بووە بە هۆکارێکی راستەوخۆی پێکهاتن و هەڵوەشانەوەی دەوڵەتە نیشتمانییەکانی عێراق. کەوابوو کاتێ کە کوردەکان بەڵێنی ئەوەیان دەدا کە پشتیوانی لە دەوڵەتی عێراق دەکەن هۆشداری ئەوەشیان دەدا کە ئەم حکوومەتە تێکدەدەن (ئەڵبەتە بە یارمەتی هێزەکانی دیکە) ئەگەر داواکاریەکانیان قبوڵ نەکات.

## پەیوەندییە دەرەکییەکان

### یارمەتی و پشتیوانی دەرەکی

روونە کە کوردەکان بێ یارمەتی دەرەکی نەیاندەتوانی ٩ ساڵ لەگەڵ حکوومەت شەڕ بکەن. لە راستیدا کوردەکان سەرجەم یارمەتییەکانیان لە ئێران یا لە رێگای ئێرانەوە وەردەگرت. سەرەتا کوردەکانی ئێران خۆیان ئەم یارمەتییانەیان پێشکەش بە کوردەکانی عێراق دەکرد بەڵام پاشان کە شا لەوە ترسا دراوسێ لاوازەکەی بکەوێتە ژێر رکێفی جمال عبدالناسر، ئاشکرا بوو کە ئێران پێداویستییەکانی مەشقکردن و پێداویستی مادی و دەوا ودەرمان بۆ کوردەکان دابین دەکات. لە بەرامبەردا ئێران

داوای له مەلا مستەفا دەکرد کوردەکانی ئێران هان نەدات و نەهێڵێت بێنە ریزی شۆڕشەکەی. حکوومەتی عێراق سەرەڕای ئەو هەموو دڵنیاکردنانەی کە لەرێگای ئەندامانی پەیمانی CENTOوە پێیدەدرا، پێی لە سەر ئەوە دادەگرت کە ئەم چالاکیانە بە رەزامەندی ئەمریکا (ئەگەر نەڵێین بەشداری) بەڕێوە دەچێت و ئەم تاوانبارکردنەی ئەمریکا کاری کردە سەر ئالۆزبوونی پەیوەندییەکانی عێراق و ئەمریکا لە ١٩٦٣ تا ئەوە کە لە کاتی شەڕی عەرەب وئیسراییل لە حوزەیرانی ١٩٦٧ بە تەواوی پچڕا. دەوڵەتی عێراق هەروەها لەوە بەدگومان بوو کە بریتانیا بە هۆی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی و ئیسراییل بە هۆکارگەلی روون پشتیوانی لە کوردە راپەڕیوەکان دەکەن .

هەرچەند کە مەلا مستەفا وەرگرتنی یارمەتی لە رۆژئاوا بە باشتر دەزانێت بەڵام ئەم یارمەتییە لە هەموو سەرچاوەیەک وەردەگرێت. بە وتەی یەکێ لە دۆستە کۆنەکانی مەلا مستەفا، بارزانی کاتێک کە لە دوورە وڵاتی لە ئاکادیمیای سەربازی سۆڤیەت پەروەردەی دەبینی، دەیویست پرۆژەی دروستکردنی جادە و تۆڕی پەیوەندی جێبەجێ بکات بۆ ئەوەی کوردستانی عێراق لە رێگای باکووری ئێرانەوە گرێ بدات بە ئەرمەنستانی سۆڤیەت و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سۆڤیەت پشتیوانی لە شۆڕشی کورد دەکات.

لە کانوونی یەکەمی ١٩٦٠ — کانوونی دووەمی ١٩٦١ (٧ مانگ پێش لە هەڵگیرسانی ناکۆکی کورد و حکوومەت) مەلا مستەفا چوو بۆ موسکۆ و ئامانجی نەتەوەیی کوردی لە کۆبوونەوەی حیزبی کومونیست خستەڕوو بەڵام بە هۆی ئەوەی کە رژیمێکی چەپ تازە لە عێراق گەیشتبوو بە دەسەڵات، سۆڤیەت داواکارییەکەی مەلا مستەفای رەت کردەوە. بەهەرحال لە ١٩٦٣ کاتێ کە بەعس گەیشت بە دەسەڵات و شیوعییەکانی عێراقی ئازاردا، سۆڤیەت شوێنێکی ئارامی لە ناوچە کوردنشینەکان بۆ شیوعییە هەڵهاتووەکان دۆزییەوە و لە بەرامبەردا باری ٢ - ٣ فڕۆکە چەکی سووکی دا بە کوردەکان. سەرەنجام سۆڤیەت (هەروەک ئەمریکا) وەک کێشەیەکی ناوخۆیی مامەڵەی لەگەڵ کێشەی کورد کرد بەڵام لە هەمان کاتدا

پێداگری لە سەر دەوڵەتی عێراق کرد کە نەرمونیانتر بێت و ڕێگاچارەیەک بۆ رازی کردنی کوردەکان بدۆزیتەوە. مەلا مستەفا لە لایەن خۆیەوە هەستی کرد لە لایەن سۆڤیەتەوە بەکارهێنراوە و خیانەتی پێکراوە، هەر بۆیە ئیدی متمانەی بە سۆڤیەت نەما.

## هەوڵە سیاسیەکان

لە کۆتایی ١٩٦٢ تا ١٩٦٥ ڕێبەرایەتی کورد بە هەموو شێوەیەک هەوڵیدەدا کێشەکەی نیونەتەوەیی بکات و پشتیوانی مادی و سیاسی دەرەکی بەرەولای خۆی رابکێشێت. ڕێبەرایەتی کورد کەڵکی لە کوردە شارەزاکانی نیشتەجێی تاراوگە وەرگرت و نوێنەری نارد بۆ دەرەوە کە مەلا مستەفا نامەی تاکەکەسی متمانە پێبەخشینی دەدانێ. عیسمەت شەریف وانلی، سەرۆکی ڕێکخراوی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا لەم پەیوەندییەدا سەردانی گەلێ شوێنی کردووە و دوو جاریش سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی کردووە. ساڵی ١٩٦٤ عیسمەت شەریف وانلی داواکارییەکی تەسلیم بە ڕێکخراوی خاچی سووری نیونەتەوەیی لە ژنیف کرد و لە ساڵی ١٩٦٥ هەوڵێکی سەرنەکەوتووی دا بۆ ئەوەی کێشەی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان بخاتەڕوو.

نوێنەرانی مەلا مستەفا سەرەتا لە ڕێگای کونسولگەری ویلایەتە یەکگرتووەکان لە تەورێز (لە ئێران) و پاشان لە ڕێگای باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە تاران، بەغداد و بەیروت پەیوەندیان لەگەڵ حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان گرت. مەلا مستەفا لانیکەم دوو نامەی ناردووە بۆ جانسۆن، سەرۆک کۆماری ئەمریکا و چەند نامەی دیکەشی ناردووە بۆ شای ئێران. مەلا مستەفا هەروەها پەیوەندی تاکەکەسیشی لەگەڵ کەسایەتییەکانی ناوخۆی ئەمریکا هەیە، لەوانە دادوەر ویلیام

داگلاس[٢٤٥] و چەند کەس لە ئەندامانی کۆنگریس و گەلێ لە سەرۆکەکانی ڕێکخراوە سەهیونیستیەکان.

لە میانەی ئاگربەستی ١٩٦٣-١٩٦٤ ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵیدا بەرنامەی pl480بۆ یارمەتیدانی کوردەکان و پرۆژەی دابینکردنی خۆراک جێبەجێ بکات. بەهەرحاڵ دەوڵەتی عێراق کەندوکۆسپی بۆ جێبەجێبوونی ئەم پرۆژەیە دروست کرد و توانی زۆربەی یارمەتییەکانی ئەم پرۆژەیە بەرەولای کوردەکانی لایەنگری حکوومەت رابکێشێت و سەرەنجام بە هۆی ئەوەی کە ئاسایشی ئەم پرۆژەیە دابین نەکرا، ویلایەتە یەککگرتووەکان ناچار بوو دەستی لێبکێشێت.

## یەکگرتوویی لە یەکنەگرتوویيدا

تەنانەت لەو کاتانەدا کە شۆڕشی کورد لەو پەڕی هێزدا بووە، کوردەکان قەد بە تەواوی یەکگرتوو نەبوونە و هەندێ لە بەکرێگیراوانی کورد لە پاڵ دەوڵەتی عێراق لەم شەڕە بەردەوامەدا بەشداریان کردووە و هەندێ لە عەشیرەت و نیمچە عەشیرەتەکان جارجار لە پاڵ دەوڵەت و جارجار لە پاڵ کوردەکاندا شەڕیان کردووە. هەندێ بنەماڵەش لەم شەڕەدا بێلایەن بوونە و گرۆپێکی دیکەشیان لە پاڵ یەکێ لە لایەنەکاندا بووە. گەورەترین یەکگرتوویی کورد ئەو کاتە بوو کە دوابەدوای کۆبوونەوەیەک لە کۆیە لە گوڵانی ١٩٦٣ کونفدراسیۆنیک بۆ شۆڕش پیکهات کە هەموو گرۆپەکانی سەر بە عەشیرەتە گرنگەکان و چەپەکان و شارنشینەکان و لایەنگرانی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و کەمینە بچووکترەکانی باکووری عێراق (ئیزەدی، تورکمان و هتد) تێیدا بەشداریان کرد کە لە لایەن ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە ڕێبەرایەتی دەکرا و نوێنەرە کوردەکانی سووریاش تێیدا جێیان گرتبوو .

---

[٢٤٥] ویلیام داگلاس دادوەرێکی بەناوبانگی ئەمریکایە کە جارجار گەڵاڵەی سیاسی پێشنیار کردووە بە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک ئەو گەڵاڵەیە کە بۆ چاکسازی سیاسی لە ساڵی ١٩٤٥ بە ئێرانی پێشنیار کرد. (وەرگێڕ)

بەهەرحاڵ کەم و زۆر بەردەوام ناکۆکی لە نێو کەسایەتیە سیاسیە شارنشینەکان ( کە سەرەکیترینیان ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانین) و ئاغا عەشیرەتیە نەریتیەکان ( کە مەلا مستەفا یەکێ لە نموونەکانیانە) هەبوە. ئەم دژمنایەتیە ( کە لە سەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای کورد لە دوای شەڕە) ماوەیەکی کورت پاش کۆبوونەوەکەی کۆیە سەریهەڵدا. لە قۆناخی راوەستانی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کە ماوەیەکی درێژی خایاند (١٩٦٤-١٩٦٥) پێکدادانگەلی توند لە نێوان ئەو دوو گرووپەدا روویدا کە لە ئەنجامدا مستەفا بارزانی سەرکەوت و تاڵەبانی دواتر گەڕایەوە بۆ ناو گۆڕەپان.

لانیکەم دوو جار کوردەکان (وادیارە بە پێشنیاری ئێران) پەیوەندیان لەگەڵ کەسایەتیە شیعە کۆنەپارێزە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان گرت و هەوڵیاندا بەرەی دووەمی شەڕ لە باشووری عێراق بکەنەوە بەڵام سەرکەوتوو نەبوون.

## دامرکانەوەی شەڕ

هەرچەند کە کوردەکان و حکوومەتی عێراق لە شوباتی ١٩٦٤ ئاگربەستیان کرد و هیوایان دەربڕی کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە وتووێژ بکەن بەڵام هیچکام لە لایەنەکان بەڵێنەکانی خۆیان قەد بە تەواوی جێبەجێ نەکرد. کوردەکان زۆربەی چەکەکانیان تەسلیم بە حکوومەت نەکرد و حکوومەتیش بە پێچەوانەی بەڵێنەکانی، بەندکراوە کوردەکانی ئازاد نەکرد و قەد لە رووی مادیەوە کوردەکانی قەرەبوو نەکردەوە. کوردەکان بەردەوام گلە و گازندەیان دەکرد کە حکوومەت بازرگانی بە کێشەی کوردەوە دەکات و کێشەکە هەر لە ناو بونبەستدا مابووەوە. دوایین شەڕی قورس لە ١٩٦٥ روویدا و لە کۆتاییدا هێزەکانی عێراق شاخە بەرزەکانیان گرت کە زاڵ بوو بە سەر ئەو رێگایانە کە پێشمەرگەکان لەوێوە یارمەتیان لە ئێران وەردەگرت.

ئاگربەستێکی نیوەچڵ بەردەوام بوو تا ئەوە کە لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠ حکوومەتی عێراق یەکلایەنە پێشنیاری رێککەوتنی ئاشتی کرد کە زۆربەی داواکارییەکانی

کوردەکانی لە خۆ دەگرت. هەرچەند کە کوردەکان بەم ڕێککەوتنە ڕازی بوون بەڵام تەنها هەندێ لە شەرتومەرجە کولتوورییەکانی بەڕاستی جێبەجێ کرا و لە ئەیلوولی ١٩٧١ پیاوەکانی سەدام حوسەین ئەلتکریتی هەوڵیاندا لە ڕێگای تەقاندنەوەی ئۆتۆمۆبیلێک مەلا مستەفا بکوژن و پێش ئەوەش تەقەیان لە کوڕەکەی، ئیدریس کرد. ئیدی پاش ئەو هەموو ڕێککەوتنە درێژخایەنانە، هیچکام لە لایەنەکان متمانەی بە لایەنی بەرامبەر نەما.

لە ڕوانگەی کوردەکانەوە گرنگترین خاڵە جێبەجێنەکراوەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بریتی بوو لە:

١- دیاریکردنی سنووری ناوچە کوردنشینەکان لەوانە پارێزگای کەرکووک لە ڕێگای ریفراندۆم.

٢- دانانی کوردێک وەک جێگری سەرۆک کۆمار لە حکوومەتی ناوەندی. کوردەکان هەروەها داوای نوێنەریان لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەکرد کە بڕیاردەری ڕاستەقینە بوو لە ناو حکوومەتدا.

٣- ئەنجامدانی هەڵبژاردنێک بۆ دیاریکردنی ڕێژەی نوێنەرە کوردەکان لە پارلمانی داهاتووی عێراقدا.

٤- کونترۆڵکردنی هێزەکانی ئاسایش لە ناوچە کوردنشینەکان. دوابەدوای شەپۆلی دەستبەسەرکردن و ڕفاندنی کوردەکان لە هاوینیساڵی ڕابردوو ئەم داواکارییە جاریکی دیکە پێشێل کرا. کوردەکان هەروەها داوای دڵنیاییان دەکرد کە عێراق دژ بە وان لەگەڵ دەوڵەتێک یان دەوڵەتگەلی دیکەی عەرەب نەبێ بە هاوپەیمان.

ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق، پەیوەندیەکانی کوردەکان و حکوومەتی عێراقیشی ئاڵۆز کرد. حکوومەتی عێراق ئێرانی تۆمەتبار دەکرد کە پیلانی کودیتای دژی بەعس داڕژتووە و لەوە زۆر توڕە بوو کە ئێران چەند دوورگەیەکی بچووکی لە کەنداو لە ١٩٧١ داگیر کردووە. حکوومەتی عێراق نزیکەی ٦٠ هەزار هاووڵاتی عێراقیی بە ڕەگەز ئێرانی لە وڵاتەکەی دەرکرد. ئێرانیش عێراقی تاوانبار کرد کە ئاژاوە لە پارێزگای زۆرتر عەرەبنشینی خوزستان لە باشووری ئێران دەنێتەوە.

حکوومەتی عێراق دەڵێت کوردەکان دەبێ هەموو پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئێران بپچڕێنن بۆ ئەوەی نیازپاکی خۆیان بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی کێشەکە بسەلمێنن. کوردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە حکوومەتی عێراق داوای لێکردوون کوردەکانی ئێران دژی دەوڵەتی ئێران راپەڕێنن و ئەوانیش رەتیان کردووەتوە. بەهەرحاڵ دیار نییە کام لەم بانگەشانە راستە بەڵام بووەتە هۆی بەدگومانییەکانی ئەم دواییە.

## تەنانەت کوردەکانیش تەنها یەک ڕێگایان لە پێش نییە

مەلا مستەفا هرچەند کە ئێستا لە ژێر گوشاردایە بەڵام نایەوێت لەگەڵ بەعس و شیوعیەکانی عێراق بچێتە ناو بەرەیەکی نیشتمانی. کوردەکان قازانجی زۆریان دەست ناکەوێت ئەگەر بچنە ناو ئەم بەرەیە و شتی زۆریش لە کیس دەدەن. ئێستا مەسەلەکە ئەوەیە کە ئایا کوردەکان درێژە بە شەڕ بدەن یا نا.

مەلا مستەفا تەمەنی لە ٦٩ دایە و بە شوێن ئەو دەستکەوتە سیاسیانەدایە کە خەڵکەکەی شەڕی بۆ کردووە.

دەوڵەتی عێراق باش دەزانێت مەلا مستەفا تەنها کەسایەتییەکە کە دەتوانێت خەڵکەکەی بۆ شۆڕشی چەکداری دژی حکوومەتی عێراق بەرێکخستن بکات، هەربۆیە دوابەدوای سەرنەکەوتنی پیلانی کوشتنی بارزانی لە ساڵی رابردوو، بە دوای ریگاگەلی دیکەدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی مەلا مستەفا تێکبشکێنێت و لاوازی بکات. لە پێناو ئەم ئامانجەدا حکوومەتی عێراق پارە بە عەشیرەتە نەیارەکانی بارزانی دەدات، چەکداریان دەکات و بەرتیل بە پێشمەرگەکان دەدات بۆ ئەوەی چەک دابنین .

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

لە بەڕێوەبەرایەتی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

بۆ: یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (کیسینجێر)

واشینگتۆن دی سی، ٢٠٥٠٥

نووسینگەی بەڕێوەبەر

٦ی حوزەیرانی ١٩٧٢

نهێنی، هەستیار

بابەت: پێداگری شا لە سەر دانیشتنی هێنری کیسینجێر لەگەڵ نوێنەرانی تایبەتی بارزانی

١- ڕۆژی ٥ی حوزەیرانی ١٩٧٢، بەڕێز (ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە) داوای دیدارێکی خێرای کرد. لە دانیشتنکەدا بەڕێز (ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە) وتی ئەم دوایانە شای بینیوە و شا کۆمەڵێک پەیامی پێبوە کە بیگەیەنمە ئێوە.

شا دەیەوێت بەڕێز هێڵمز ئەم پەیامە بگەیەنێتە دەستی دۆکتۆر کیسینجێر:

بە لەبەرچاوگرتنی گفتوگۆکانی ئەم دوایەی شا لەگەڵ دۆکتۆر کیسینجێر دەربارەی بارودۆخی کوردەکان، شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە نوێنەرە کوردەکانی مەلا مستەفا بارزانی کە لە داهاتوودا بۆ ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا سەفەر دەکەن، دەبێ لە

لایەن خودی دۆکتۆر کیسینجێرەوە وەربگیردرێن. شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دۆکتۆر کیسینجێر دەبێ گوێ لە قسەکانی ئەو نوێنەرە کوردانە بگرێت و کێشەکەیان تاوتوێ بکات. شا هەروەها چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە دۆکتۆر کیسینجێر پاش قسەکردن لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان، بیروبۆچونەکانی خوی دەربارەی ئەو دانیشتنانە لەگەڵ شا باس بکات".

شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بە لەبەرچاوگرتنی سیاسەتەکانی ئێستای دەوڵەتی عێراق، دەبێ کوردەکان بپارێزرێن و پێش لەو بگیردرێت کە کوردەکان بچن بە شوێن سیاسەتگەلێک وەک سیاسەتەکانی دەوڵەتی عێراقدا. کوردەکان هەروەها دەبێ لە بەرامبەر کاریگەری کومونیزم بپارێزرێن.

شا دەیەوێت ئەم پەیامە بگاتە دەستی بەڕێز هێڵمز: "زەحمەت نەبێت لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دابنیشە، گوێ بۆ قسەکانیان بگرە و قسەکانیان تاوتوێ بکە و بیروبۆچوونی خۆتم لەم پەیوەندیەدا پێڕابگەیەنە". پەیامی سێیەمی شا بۆ بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بوو. شا چاوەڕوانی ئەوەیە کە پێش لە سەفەرەکەی رۆژی ١٢ی حوزەیران یا پشوودانی ئوروپا وەڵامی ئەم پەیامانە لەرێگای(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) وەربگرێت.

من لە بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) پرسیارم کرد کە شا لەو ماویەدا کە دیاری کردوە، بە وردی داوای چی جورە وەڵامێک دەکات، ئەویش وتی شا دەیەوێت بزانیت کە ئایا دۆکتۆر کیسینجێر و بەڕێز هێڵمز دەیانەوێت لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دابنیشن یا نا و پاش ئەو دیدارە بۆچونەکانی خویان لەگەڵ شا باس بکەن. ناوی نوێنەرە کوردەکان و کاتی دیدارەکەیان هێشتا دیار نیە.

٢- کورتەیەک لەم زانیاریانە خراوەتە بەردەم باڵوێز فەرلاند[٢٤٦].

---

[246] Ambassador Farland

٣-باككگراوەند: لەم چەند ساڵەی دواییدا دەوڵەتی ئێران بەردەوام مەسەلەی پشتیوانیکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بارزانی خستوەتەڕوو. لە تشرینی دووەمی ١٩٧١ بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) داوای کرد لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەی پەرەسەندنی بەرەی نیشتمانی عێراقدا ئەگەر بکرێت ویلایەیە یەکگرتوەکان یارمەتی بارزانی بدات. ئەو کاتە بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بەگوێرەی رێنوێنیەکانی واشنگتۆن، بە بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە)ی وت کە سیاسەتی ئەمریکا ئەوەیە کە لە کاروباری کوردەکاندا دەستێوەردان نەکات. لە ئاداری ١٩٧٢، بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) پێشنیاری کرد کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوەی نهێنی پشتیوانی لە بارزانی بکات. بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) جارێکی دیکە وتی کە سیاسەتی ئەمریکا ئەوەیە کە لە کاروباری کوردەکاندا دەستێوەردان نەکات.

دواتر لە ئاداری ١٩٧٢ بارزانی نوێنەرێکی تایبەتی رەوانەی لەندەن و واشنگتۆن کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ کەسایەتیە بەرچاوە عێراقیەکانی دانیشتووی تاراوگە و نوێنەرانی دەوڵەتی ئەمریکا و بریتانیا گفتوگۆ بکەن. بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی زەید عوسمانە -وەرگێڕ) لە میانەی ئەو سەفەرەدا لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئاستیDESK LEVEL دا گفتوگۆی کرد. لە نیسانی ١٩٧٢ بارزانی نوێنەرێکی تایبەتی دیکەی رەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد بۆ ئەوەی پشتیوانی فەرمی و نافەرمی ئەمریکا لە کوردەکان بەدەستبهێنێت. لە مانگی گوڵان بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) پێشنیاری کرد بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی مەلا مستەفا بارزانییە - وەرگێڕ) لە میانەی سەفەری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ ئێران، لەگەڵ ئێوە یان وەزیری دەرەوە، ویلیام راجێرز دیدار بکات. ئەو پێشنیارە بە هۆی نەبوونی کات رەت کرایەوە.

ریچارد هێڵمز

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

**لەلایەن هارۆڵد ساندێرز لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا**
**بۆ: جێگری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (دۆکتۆر کیسینجێر)**
**واشینگتۆن،**
**٧ی حوزەیرانی ١٩٧٢**
**نهێنی، هەستیار**
**بابەت: هۆکارەکانی یارمەتیدان و یارمەتینەدانی ئەمریکا بە کوردەکان و شێوازەکانی جێبەجێکردنی ئەو یارمەتیە**

هێڵمز، بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)، ڕاسپێردراوە ئەم پەیامەی شا بگەیەنێت بە ئێوە لە سەر بنەمای ئەو گفتوگۆیە کە لە تاران لەگەڵ ئێوە دەربارەی بارودۆخی کوردەکان کردوویەتی.
بە بیروبۆچوونی شا ئێوە دەبێ لەگەڵ دوو نوێنەرە کوردەکەی مەلا مستەفا بارزانی ڕووبەڕوو دابنیشن کە لە داهاتوویەکی نزیکدا سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەن. ئەم دوو نوێنەرە کوردە بریتین لە (ناوەکەیان ڕەش کراوەتەوە[٢٤٧]). شا چاوەڕوانی

[٢٤٧]- ناوی نوێنەرە کوردەکان لەم بەڵگەنامەیەدا ڕەش کراوەتەوە بەڵام لە وێنەیەکی دیکەی ئەم بەلگەنامەیەدا هاتوە کە ئەو نوێنەرانە بریتین لە ئیدریس بارزانی، کوڕی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی و مەحموود عوسمان کە زۆربەی جاران وەک نوێنەری کوردەکان کار دەکات- وەرگێڕ.

ئەوەیە کە ئێوە پاش تاوتوێکردنی کێشەی نوێنەرە کوردەکان، بیروبۆچونەکانتان دەربارەی ئەو مەسەلەیە لەگەڵ ئەو (شا) باس بکەن.

بە لەبەرچاوگرتنی سیاسەتەکانی ئێستای عێراق، شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ کوردەکان لە بەرامبەر دەستڕۆیشتوویی کومونیزم بپارێزرێن و پێش لەوە بگیردرێت کە بچن بە شوێن سیاسەتەکانی عێراقدا. لەوانەیە کوردەکان لە ئەنجامی بانگهێشتەکەی ئێوە، بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئەمریکا پشتیوانیان لێدەکات. تەنانەت ئەگەر ئێمە بڕیاری ئەوە بدەین کە یارمەتی کوردەکان بدەین دەبێ ئەم یارمەتیە نهێنی بێت. ئێستا هەردوو تای ترازووەکە وەک یەکە بۆ ئەوەی ئایا پشتیوانی لە کوردەکان بکەین یا نا .

هۆکاری سەرەکی ئێمە بۆ پشتیوانیکردن لە کوردەکان ئەوەیە کە:

- ڕێگا بە کوردەکان بدەین یا تەشویقیان بکەین کە بەردەوام بن بە سەرچاوەی ناسەقامگیربوونی عێراق و هەوڵی سۆڤیەت بۆ تەشویقکردنی پێکهاتنی حکوومەتی یەکێتی نیشتمانی ( کە دەبێتە هۆی بەهێزتربوونی پێگەی سۆڤیەت) پوچەڵ بێتەوە.

- ئێران، ئوردون و ئیسرائیل بەردەوام پشتیوانیان لە کوردەکان کردووە وەک ئامرازێک بۆ ئەوەی هێزەکانی عێراق بە کێشەی ناوخۆیی وڵاتەکەیانەوە سەرقال بکەن و ئاسایشی خۆیان قایم بکەن کە بەهەرحاڵ قایمبوونی ئاسایشی ئەو وڵاتانە لە بەرژەوەندیی ئێمەشدایە. جگە لەوەش ئێستا ئەگەری ئەوە هاتووەتە ئاراوە کە عێراق چالاکانە دەستێوەردان لە کەنداودا بکات بەڵام ئەگەر عێراق لەناوخۆ ناسەقامگیر بێت، توانایی عێراق بۆ دەستێوەردان لە کەنداو لاواز دەبێت. (ڕەش کراوەتەوە بەڵام وادیارە مەبەستی مەلا مستەفا بارزانییە - وەرگێڕ) لەوانەیە بتوانێت لە پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ هەندێ کەسایەتی سەربازی نەیاری ڕژێمی عێراق کەڵک وەربگرێت بۆ ئەوەی ئەم دەوڵەتە بڕۆخێنن کە پەیماننامەی لەگەڵ سۆڤیەت واژۆ کردووە .

سەرەکیترین هۆکارەکانی پشتیوانی نەکردنی ئێمە لە کوردەکان بریتین لە:

١- خۆمان دەخەینە ناو شەڕێکی گریلایی کە تەنانەت ئەگەر وایدابنێین ئەو شەڕە سەریش بکەوێت، زۆرترین ئەنجامی ئەوەیە کە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ حکوومەتی

عێراق دەپچڕێت و کوردەکان دەگەن بە ئۆتۆنۆمی. ئەگەریش شەڕەکە بە زیانی کوردەکان بشکێتەوە، ئێمە نە هیچ دەستکەوتێکمان دەبێت و نە بەرژەوەندیشمان لەوەدایە کە بە شێوازێکی یەکلاییکەرەوە پشتیوانی لە کوردەکان بکەین.

٢- سەرچاوە مادییەکانی یارمەتیدانی کوردەکان لە راستیدا لە ئێران و عەرەبستانی سعودیە. ئەوە مەسەلەیەکە کە دەبێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە راوێژ لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچە کە بە شیوازگەڵی جۆراوجۆر پشتیوانیان لە کوردەکان کردوە، جێبەجێی بکات و راشکاوانە بەو وڵاتانە بڵێت کە ئێمە هەست دەکەین ئەم یارمەتیدانە دەبێ هەوڵێکی ناوچەیی بێت نە ئەوەی کە ئێمە تەنها بەشێوەی راستەوخۆ یارمەتی کوردەکان بدەین.

٣- پشتیوانیکردن لە کوردەکان دەبێ لە چوارچێوەی گفتوگۆکانی کۆبوونەوەکەی مۆسکۆ لێکبدرێتەوە. بە هۆی ئەوەی سۆڤیەت ئەم دواییانە هەوڵیداوە قەناعەت بە کوردەکان بهێنێت پەیوەست بن بە حیزبی بەعس لە چوارچێوەی حکوومەتی یەکێتی نیشتمانیدا، پشتیوانیکردن لە کوردەکان دەبێ بە دژکردەوەیەکی راستەوخۆ لە بەرامبەر سۆڤیەت.

سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ماوەیەک ئەوە بووە کە خۆی نەخاتە ناو کێشەی کورد. دوایین نزیکبونەوەکان لەگەڵ کوردەکان لە میانەی سەفەری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ تاران ئەنجام درا. ئەو کاتە هەمان وەڵام دووپات بوەوە کە ئێمە خۆمان ناخەینە ناو ئەو کێشەیە. وەزارەتی دەرەوەش تا ئێستا تەنها لە ئاستی DESK LEVELدا لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دانیشتوە. CIA ئێستا لایەنگری دانیشتن لەگەڵ کوردەکان نیە، کەوابوو هەمووی دەگەڕێتەوە سەر ئەوە کە ئایا ئێوە دەتانەوێت بەو جۆرە کە شا داوای کردوە لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دابنیشن یا نا. ئەڵبەتە ئەم مەسەلەیە زۆر پەیوەندی بەوە هەیە کە ئێوە بەنیسبەت ئەم خاڵە تایبەتانە چەندە خۆتان لە بەرامبەر شا بە دەرووەس دەزانن.

من بۆ خۆم لە سەر ئەو باوەڕەم کە باشتر ئەوەیە ئێوە لەم قۆناخەدا خۆتان نەخەنە ناو کێشەکە چونکە لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا سەرۆک کۆماریش دەخەنە ناو کێشەکە (تەنانەت ئەگەر ناڕاستەوخۆش بێت). بە بۆچوونی من ئێوە دەتوانن ڕاستەخۆ ئەم مەسەلەیە بڵێن بە شا و هەروەها ئەوەشی پێبڵێن کە ئێوە بە منتان (هارۆلد ساندیرز) وتووە کە بە تەواوی گوێ بۆ قسەکانی نوێنەرە کوردەکان بگرم و ڕاپۆرتەکەتان تەسلیم بکەمەوە. هەروەها بە شا بڵێن "هێڵمز"یش لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان گفتوگۆ دەکات.

شا داوای وەڵامی ئەم نامەیەی کردووە پێش ئەوەی ڕۆژی دووشەمە ئێران بەرەو ئەورووپا بەجێ بهێڵێت."[٢٤٨]

پێشنیارەکان:

١- پێشنیار دەکەم ئەم وەڵامە بنێرنەوە بۆ شا:

"من (کیسینجێر) لەوە نیگەرانم کە ئەگەر خۆم لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دابنیشم ئەوان بە هەڵەدا بچن و چاوەڕوانی پشتیوانی ڕاستەوخۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکەن، لە کاتێکدا کە هەروا کە خۆتان دەزانن دەوڵەتی ئەمریکا بڕیاری نەداوە پشتیوانی لە کوردەکان بکات. بەهەرحاڵ من داوا لە جێگری یەکەمی خۆم بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەم بە تەواوی گوێ لە قسەی نوێنەرە کوردەکان بگرێت و ڕاپۆرتەکەی بداتەوە بە من. پاشان بیروبۆچوونەکانی خۆمتان لەم پەیوەندییەدا بۆ دەنێرم."

---

[٢٤٨] - کیسینجێر لە سەر ئەم بەڵگەنامەیە نووسیویەتی"پیموابێ جێبەجێی دەکەین". نوسخەیەکی واژۆنەکراوی ئەم بەڵگەنامەیە لە ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) لە بەشی فایلە تایبەتەکان بە ژمارەی Job 80B01086A, Box 1 Executive Registry Subject Files, I-13, Iran, دا هەیە.

٢- SAWAK راپۆرتیداوە کە ئێوە بە "شا"تان وتوە کە ئەمریکا لەرێگای "نوێنەرە کوردەکان لە واشینگتۆن" پێشتر هەندێ پشتیوانی لە کوردەکان کردوە. CIA دەیەوێت ئەو مەسەلەیە سەرڕاست بکاتەوە و بڵێت ئەو راپۆرتە راست نیە.

**لەلایەن سەرۆکی نووسینگەی رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا لە ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)، بەڕێز والێر**

**بۆ: بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)، بەڕێز هێڵمز**

**واشینگتۆن،**

**١٢ی حوزەیرانی ١٩٧٢**

**نهێنی**

**بابەت: هەوڵەکانی رێبەری کورد، بارزانی بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**

١- ئەم یادداشتنامەیە بۆ زانیاری ئێوە ئامادە کراوە لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو دانیشتنەی کە بڕیارە جەنابت و ژنەراڵ هێگ لەگەڵ نوێنەرانی رێبەری کورد، مەلا مستەفا بارزانی ئەنجامی بدەن. نوسخەیەکی پێداچوونەوەکراوی ئەم یادداشتنامەیە بۆ ژینیراڵ هێگیش ئامادە کراوە.

## باروودۆخی کوردەکان بە کورتی:

٢- پەیوەندیە نزیکە رۆژ بە رۆژ روو لە زیادبونەکانی یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتی بەعسی عێراق و گوشارەکانی سۆڤیەت و بەعس بۆ ئەوەی کوردەکانی عێراق پەیوەست بن بە دەوڵەتێکی یەکێتی نیشتمانی لە بەغداد، ئەو بانگەشانەی کوردەکانی وەڕاست خستوەتەوە کە بێ یارمەتی مادی

وڵاتێکــــی ڕۆژئـــــاوایی بە هێـــزە کوردەکـــانی بـــــارزانی واتــــا هێـــزی پێشـمەرگە (بەتایبەت پشـتیوانی ئەخلاقـی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا بـۆ ڕووبەڕووبـونەوە لەگەڵ پشـتیوانی سـۆڤیەت لە بەعسـی عێـراق) کوردەکـانی عێراق لەوانەیە ناچار بن لەگەڵ دژمنەکانیان سازش بکەن.

٣- شای ئێران لەوە نیگەرانە کە عێراق ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت و ئەمەش مەترسیە بۆ ئاسایشی ئێران و بەرژەوەندیەکانی ئێران و وڵاتانی ڕۆژئاوایی لە کەنداوی فارس. کەوابوو شا هەوڵ بۆ ئەوە دەدات کە کاریگەری سۆڤیەت لە سەر ئێران بگەیەنیتە کەمترین ئاستی خۆی و لەم پەیوەندیەدا شا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە باشترین شت ئەوەیە کە بارزانی بەهێز ڕابگیردرێت بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە خەباتەکەی دژی ڕژیمی بەعسی بەغداد بدات.

٤- بە هۆی ئەو شتانە کە لە سەرەوە باس کرا، لەم مانگانەی دواییدا هەم بارزانی و هەم SAWAK (بە نوێنەرایەتی شا) هەوڵەکانیان چڕوپڕتر کردوەتەوە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ڕۆژئاوا، بەتایبەت پشتیوانی ئەخلاقی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بریتانیا وەک دژکردەوەیەک لە بەرامبەر پشتیوانی سۆڤیەت لە بەعسیەکان. هەر چەند کە مەلا مستەفا بارزانی دەڵێت هەر چەشنە پشتیوانیەکی ئەخلاقی ئەمریکا بە نهێنی دەپارێزێت و ناهێڵێت کەس پێی بزانیت بەڵام ئەم بەڵێنە کەڵکی ئەوتۆی بۆ مەلا مستەفا نابێت ئەگەر نەتوانیت ئەو مەسەلەیە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکا بەکار بهێنێت و ئەمەش بە واتای ئەوەیە کە مەسەلەکە ئاشکرا دەکات.

٥- ئاواتی کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی مادی، هۆکاری ڕاستەقینەی خۆی هەیە. ئەو یارمەتیە کە دەوڵەتی بەغداد پاش کۆتاییپێهاتنی شەڕی ناوخۆ لە ١٩٧٠ دەیدا بە کوردەکان ئەم دوایانە پچڕاوە و ئەو یارمەتیە کە ئێران پێش لە کۆتاییپێهاتنی شەڕ دەیدا بە بارزانی، لەو کاتەوە کە یارمەتیەکانی بەعسیەکان کەوتە

بواری جێبەجێکردنەوە، بە توندی کەم بوەتەوە. لە ئەنجامدا لەم مانگانەی دواییدا بارزانی ناچار بوە موچەی هێزەکانی زۆر کەم بکاتەوە و ژمارەیەکی زۆر لەو هێزانە دەستیان لە کارەکەیان کێشاوە. هەڵسەنگاندنی ئێمە ئەوەیە کە بارزانی تەنها بۆ موچەی هێزەکانی (کە بۆ خۆی دەڵێت ئێستا نزیکەی ١٥ هەزار کەس دەبن) پێویستی بە ساڵانە ٢٤ ملیۆن دولار هەیە. بارزانی پێشنیاری ئەوەی کردوە کە ژمارەی هێزەکانی بۆ ٥٠ هەزار کەس بەرز بکاتەوە کە ئەو کاتە جگە لە پارەی پێداویستیەکان و چەک و تەقەمەنی، تەنها بۆ موچەی ئەو ٥٠ هەزار کەسە پێویستی بە ساڵانە ٢٤ ملیۆن دولار دەبێت.

**کورتەیەک لە هەوڵەکانی ئەم دوایەی بارزانی بۆ نزیکبوونەوە لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و وەڵامەکانی ئێمە و پێشهاتە پەیوەندیدارەکان:**

٦- لە تشرینی دووەمی ١٩٧١ بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بە لە بەرچاوگرتنی مەسەلەی بەرەپێشچوونی دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق داوای یارمەتیدانی ئەمریکا بە بارزانی کرد. بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بەگوێرەی رێنوێنیەکانی وەزارەتی دەرەوە وتی کە سیاسەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە لە کاروباری کوردەکاندا دەستێوەردان نەکات. لە ئاداری ١٩٧٢ مەسەلەی یارمەتیدانی نهێنی ئەمریکا بە بارزانی خرایەڕوو و جارێکی دیکە نەتەنها وەزارەتی دەرەوە بەڵکوو نوسینگەی دۆکتۆر کیسینجێریش ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە سیاسەتی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە لە کاروباری کوردەکاندا دەستێوەردان نەکات. دواتر لە لە مانگی ئادار بارزانی نوێنەرێکی تایبەتی رەوانەی واشنگتۆن و (رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی لەندەنە) کرد بۆ ئەوەی لەگەڵ کاربەدەستانی ئەمریکا و (رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی بریتانیایە) گفتوگۆ بکات.

٧- بەڕێز (رەش کراوەتەوە بەڵام وادیارە مەبەستی شایە) ئەو کاتە کە لە واشنگتۆن بوو هەوڵیدا لە دەستڕۆیشتوویی خۆی کەڵک وەربگرێت بۆ ئەوەی یارمەتی نهێنی

ئەمریکا بە بارزانی وەدەست بهێنێت. لە میانەی دیدارەکەی جەنابت لەگەڵ (رەش کراوەتەوە) ناوبراو ئاماژەی بە بارودوخی عێراق و ئەو دو گروپە دژبەرە کرد کە ئەو پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبوو. ئێوەش وەڵامتان دایەوە کە بە گشتی لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەو دەربارەی بارودۆخی عێراق هاوڕان و ئاماژەتان بەوە کرد کە بەهەرحاڵ ویلایەتە یەکگرتوەکان ناتوانێت راستەوخۆ خۆی بخاتە ناو کێشەکە.

٨- قسەکانی بەڕێز و راپۆرتەکەی (رەش کراوەتەوە) نیشان دەدات کە بارزانی و شا هیوادارن کە ئەمریکا لە داهاتودا یارمەتیان دەدات.

٩- بەڕێز (رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی زەید عوسمانە) لە میانەی سەفەرەکەی لە مانگی نیسان لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش دیداری کرد و هەروەها هەر لەو مانگەدا بارزانی نوێنەرێکی تایبەتی دیکەی رەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد بۆ ئەوەی پشتیوانی فەرمی و نافەرمی ئامریکا لە کوردەکان بەدەست بهێنێت. بەڕێز (رەش کراوەتەوە) لەم رۆژانەی دواییدا لەگەڵ نوسینگەی سناتۆر گراویڵ لە هاتووچۆ و پەیوەندیدا بوە. لە مانگی گوڵان بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی مەلا مستەفا بارزانییە) پێشنیاری کرد بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی مەلا مستەفا بارزانییە) لەمیانەی سەفەری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ ئێران، لەگەڵ وەزیری دەرەوە، ویلیام راجێرز یا دۆکتۆر کیسینجێر دیدار بکات. ئەو پێشنیارە بە هۆی نەبوونی کات رەت کرایەوە. دواتر شا داوای کرد کە خودی جەنابت و دۆکتۆر کیسینجێر لەگەڵ نوێنەرەکانی بارزانی دابنیشن. شا هەروەها داوای کرد جەنابت و دۆکتۆر کیسینجێر بیروبۆچونی خوتان دوای ئەو دانیشتنە پێڕابگەیەنن. پاشان پەیامێک بۆ شا ناردرا کە تێیدا هاتبوو ئەگەر نوێنەرەکانی بارزانی هاتن بۆ واشنگتۆن، جەنابت و ژنراڵ هێگ پێکەوە لەگەڵیان دادەنیشن.

جان والێر

**یاداشتنامەیەک لەلایەن هارۆڵد سەندێرز لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی**
**بۆ: جێگری یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (ژنێراڵ هەیگ)**
**واشینگتۆن،**
**٢٣ی حوزەیرانی ١٩٧٢**
**نهێنی، هەستیار**
**بابەت: بەکگراوەندی گفتوگوکانی جێگری یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی لەگەڵ ڕێبەرانی کورد**

بەڕێز هێڵمز(بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی -CIA) ئەم یادداشتنامەیەی هاوپێچ کردوە کە بەکگراوەندی ئەو گفتوگۆانە لەخۆ دەگریت کە بڕیارە جەنابت و بەڕێز هێڵمز لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان ئەنجامی بدەن. دڵنیام کە هێڵمز دەربارەی ئەم مەسەلەیە ئێستا لەگەڵ ئێوە لە پەیوەندی دایە.

یادداشتنامە هاوپێچکراوەکە ئەوەندە ئاسانە کە من لێرە کورتی ناکەمەوە. بەکەڵکترین شتێک کە دەتوانم ئاماژەی پێبکەم ئەو خاڵە سەرەکیانەیە کە پەیوەندی هەیە بە بڕیاری تەرخانکردنی مانگانە یەک و نیو میلیون دولار بۆ یارمەتیدانی کوردەکان یان ئەو پشتیوانیە ئەخلاقیە کە ڕێبەرانی کورد بەشوێنیدان.

١- گرنگترین خاڵێک کە زۆربەی ئێمە لەگەڵی هاوڕاین ئەوەیە کە نابێ بە شێوەی ڕاستەوخۆ پشتیوانی لە کوردەکان بکەین. هەروەها کە هێلمز دەزانێت دەزگای هەواڵگری ئێران (SAWAK - وەرگێڕ) بەڵێنیداوە کە ئێران نیوەی ڕێژەی ئەو پارەیە کە دەدرێت بە کوردەکان دابین بکات. بە کورتی ئەوەندە پارە لە ناوچە هەیە کە بتوانێت ئەو ڕێژەیە دابین بکات و ئەمە یەکێ لەو نموونانەیە کە ئێمە دەتوانین جێبەجێکردنی بخەینە ئەستۆی وڵاتانی ناوچە.

٢- دووەمینی خاڵی گرنگ کە دەبێ لەبەرچاوی بگرین ئەوەیە کە ئەو شتە کە کوردەکان لە ڕاستیدا دەیانەوێت ئەوەیە کە هەندێ نیشانەی پشتیوانیکردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەربگرن بۆ ئەوەی دەوروبەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پێ بشێوێنن. کەوابوو هەرشتێک کە ئێمە لە پێناو پشتیوانی ئەخلاقی لە کوردەکان ئەنجامی بدەین، لە ناخی خویدا ناتوانێت شاراوە بمێنیتەوە چونکە بارزانی ناچار دەبێت ئەو مەسەلەیە بە کەسانی دیکە بڵێت. ئەم مەسەلەیە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ ئێمە دەخاتە ناو یەکێ لە درێژخایەنترین شەڕە گریلایەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٣- لە لایەکی دیکەوە قازانجی ئێمە لەوەدایە کە هەوڵ بدەین یارمەتی کوردەکان بدەین بۆ ئەوەی تا ڕادەیەک سەربەخۆیی خۆیان لە بەرامبەر دەوڵەتی عێراق بپارێزن بۆ ئەوەی پێش لەوە بگرن کە سۆڤیەت یارمەتی بە بەهێزبوونی دەسەڵاتی حیزبی بەعس بدات و لەگەڵ کومونیستەکانی عێراق لە پەیوەندیدا بێت. بەهەرحاڵ هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە دەبێ هەموو چەشنە هەوڵێکی مەنتقی بدەین بۆ ئەوەی کاریگەری سۆڤیەت پوچەڵ بکەینەوە بەڵام پرسیار ئەوەیە کە ئایا پشتیوانی ئەمریکا لە کوردەکان شتێکی زۆر پێویستە بۆ سەرکەوتنی هەوڵەکانمان. کوردەکان بە یارمەتی ئێران و (ڕەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی ئیسرائیلە - وەرگێڕ) بە ماوەی چەند ساڵ توانیویانە خۆیان ڕابگرن و ویلایەتە یەکگرتوەکان دەتوانێت ئەو هەڵوێستە بگرێتەبەر کە ئەمە مەسەلەیەکە کە زیاتر لە قازانجی وڵاتانی ناوچەدایە کە درێژەی پێبدەن. ئەگەر ئێمە بە شێوەی ئەخلاقی پشتیوانی لەم مەسەلەیە بکەین، دەبێ بەو شێوەیە

بیکەین کە ڕاستەوخۆ هاوڕابوونی خۆمان لەگەڵ سیاسەتی ئەو وڵاتانە دەرببڕین نە ئەوە کە پشتیوانی لە کوردەکان بکەین.

٤- ئامانجی سەرەکی ئێوە لە بینینی نوێنەرە کوردەکان تەنها ئەوەیە کە گوێ لە قسەکانیان بگرن و پاش بیستنی قسەکانیان زانیاری بدەن بە هێنری (کیسینجێر) بۆ ئەوەی هەندێ شت بنێرێتەوە بۆ شا.

٥- دەمەوێت ئەوە بە سەر بۆچونەکانمدا زیاد بکەم کە من پێشتر هەندێ شتم لە هەندێ لەم نوێنەرە کوردانە دەستکەوتوە کە تا ئێستا بە تەواوی پشتگوێم خستوون. ئەگەر ئێوە پێتان خۆش بێت خوشحاڵ دەبم لە کۆبونەوەکەی جەنابت و هێڵمز لەگەڵ نوێنەرە کوردەکاندا بەشدار بم (سەرەنجام ساندێرز لە دانیشتن لەگەڵ نوێنەرە کوردەکاندا ئامادە نەبوە).

**وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**یادداشتنامەی گفتوگۆکان،**

**واشنگتۆن**

**٥ی تەموزی ١٩٧٢**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: ناوەرۆکی دانیشتنی فەرمی و نهێنی لەگەڵ نوێنەرە تایبەتەکانی مەلا مستەفا بارزانی لە وەزارەتی دەرەوە لە واشینگتۆن**

١- لە ڕێگای ئاسانکارییەکانی شای ئێران، نوێنەرانی ڕێبەری کورد[٢٤٩]، مەلا مستەفا بارزانی لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٢ لەگەڵ ریچارد هیڵمز، کولونیل ریچارد کنێدی و کاربەدەستێکی CIA دیداریان کرد. ئەم یادداشتنامەیە ناوەرۆکی ئەم دیدارە لەخۆ دەگریت. هەروەها کۆمەڵێک زانیاری بەکگراوەندی دیکە و وردەکارییەکانی پشتیوانیکردن لە داواکارییەکانی کوردەکان بۆ یارمەتیدانیان هاوپێچ کراوە. ئەم زانیاریانە هەروەها لە کاتی گفتوگۆ بەرفراوانەکان لە ١ی تەموزی ١٩٧٢ خراوەتە بەردەم نوێنەرانی CIA کە لەم گفتوگۆیەدا بەشدار بوون .

٢- وەک وتەبێژی نوێنەرە کوردەکان، بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بە ڕاگەیاندنی سڵاو و ڕێزی مەلا مستەفا بارزانی بە نیکسۆن(سەرۆک کۆماری ئەمریکا) و خەڵکی ئەمریکا، دانیشتنەکەی ١ی تەموزی کردەوە و لە لایەن بارزانییەوە سوپاسی

---

[٢٤٩]- ئەو دوو نوێنەرە دۆکتۆر مەحموود عوسمان و خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی بوون. وەرگێڕ

ئەمریکای کرد بۆ ڕەخساندنی ئەم هەلە (کە کوردەکان لەمێژە هەوڵی بۆ دەدەن) بۆ خستنەبەرباسی ڕاستەوخۆی مەسەلەی کورد لەگەڵ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان و داوای لە هەر دوو لا کرد بە تەواوی ڕاشکاوانە و بێ ڕوودەربایسی گفتوگۆ بکەن. ناوبراو پاشان باسێکی کورتی بە گشتی دەربارەی مێژووی بزووتنەوەی کورد و شەڕ بۆ ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراق خستەڕوو و وێڕای شیکردنەوەی باردۆخی کوردستان لە ڕووی ژئۆپلۆتیکییەوە وتی تەنها هەڵکەوتی ژئۆپلۆتیکی کوردستانە کە دەتوانێت ببێت بە کەندوکۆسپ لە سەر ڕێگای دەسەڵاتی تەواوی سۆڤیەت بە سەر عێراق و کارێکەرییەکانی لە سەر وڵاتانی دیکە بەتایبەت ئێران، تورکیا، عەرەبستانی سعوودی، ئوردون و وڵاتانی کەنداوی فارس. ناوبراو بە وردی باسی هەوڵە هاوبەشەکانی عێراق و سۆڤیەتی کرد بۆ ئەوەی کوردەکان بخەنە ژێر کونتروڵی ڕژیمی بەعس لە بەغداد و بەتایبەت ئاماژەی بە توندتربوونی گوشارە سیاسییە ڕاستەوخۆکانی سۆڤیەت لە سەر ڕێبەرە کوردەکان کرد، لەوانە دیداری ڕێبەرە سەرەکیەکانی حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەت و کۆماری دیموکراتیکی ئاڵمانیای ڕۆژهەڵات لەگەڵ بارزانی.

ناوبراو وتی سۆڤیەت لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٧٢ داوای لە بارزانی کردووە کە کوردەکان پەیوەست بن بە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق. ناوبراو ئەم هەوڵەی سۆڤیەتی وەک یارمەتییەک بە ئابووری، سوپا و هەوڵە تیرۆریستیەکانی عێراق ناوزەد کرد کە ئامانجی تێکشکاندنی بارزانی و ڕێبەرایەتی سیاسی کوردی عێراقە.

وتەبێژی نوێنەرە کوردەکان وتی بارزانی و ڕێبەرانی دیکەی عێراق لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەگەر یارمەتییەکی بەرچاویان لە دەرەوە نەدرێت ناتوانن زۆرتر لە ٦ مانگ لە بەرامبەر گوشارە هاوبەشەکانی عێراق و سۆڤیەت ڕابوەستن و ئەگەر ئەم یارمەتییە نەگات بە دەستیان، کوردەکان لە ماوەی ٦ مانگدا ناچار دەبن یا لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی عێراق سازشێکی سیاسی بکەن یا شەڕی لەگەڵ بکەن کە بە دڵنیاییەوە سەرکەوتوو نابن.

٣- ناوبراو جەختی کردەوە کە بارزانی خوازیاری زیادبوونی یارمەتی دەرەکییە، نەتەنها بۆ ئەوەی ناوچەکەی لە بەرامبەر سۆڤیەت و عێراق بپارێزیت، بەڵکوو دەیەوێت کوردستانیش بکات بە فاکتۆرێکی ئەرێنی لە پاڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دۆست و هاوپەیمانەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت ئێران، تورکیا، ئیسرائیل، عەرەبستانی سعوودی، ئوردون و وڵاتانی کەنداوی فارس. ناوبراو هەروەها وتی بارزانی لە سەر ئەو قەناعەتەیە کە سۆڤیەت ئێستا کونترۆڵی رووداوەکانی عێراق دەکات و کاتی ئەوە بە سەر دەچێت کە رۆژئاوا و هاوپەیمانەکانی ببن بە هاوسنووری عێراق. بارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە کوردستان هەرچەند کە وڵاتێکی بچووکە بەڵام دەتوانێت لە هەڵکەوتە ئیستراتژیکەکی کەڵک وەربگرێت و وەک فاکتۆرێکی کارێگەر لە جیهانی ئازاددا شەڕ بکات بۆ ئەوەی رێگا لە پەرەسەندنی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگرێت و دەستپێشخەر بێت بۆ جیهانی ئازاد و هاوپەیمانەکانی لە ناوچە. لەم پەیوەندییەدا ناوبراو ئاماژەی بەوە کرد کە سەرچاوەکانی نەوتی عێراق زۆرتر لە ناوچە کوردنشینەکاندایە، کەوابوو کوردستانێکی بەهێز دەتوانێت ببێت بە فاکتۆرێکی گرنگ لە سیاسەتی نەوتی عێراقدا .

٤- ناوبراو وتی لەم چوارچێوەیەدا کە ئاماژەی پێکرا، بارزانی خوازیاری یارمەتی سیاسی، مادی، سەربازی و هەواڵگری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە بەم شێوازەی خوارەوە:

الف - بە فەرمیناسینی ئامانجی ئۆتۆنۆمی کورد و بەردەوامبوونی پەیوەندی نهێنی راستەوخۆ لە نێوان بزووتنەوەی کورد و حکوومەتی ئەمریکا.

ب - یارمەتیدانی ماددی بە کورد وەکوو پێویست بۆ ئەوەی کوردەکان ببن بە هێزێکی چەکداری هێرشبەر بەو مەبەستە کە یا راستەوخۆ دەوڵەتی بەعس لە بەغداد بڕوخێنن یا لانیکەم زۆربەی هێزەکانی سوپای عێراق بخەنە ناو شەڕیکی بەرفراوان بۆ ئەوەی رژیمی عێراق بڕوخێنن (وەک دەوڵەتێک کە لە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەتدایە و هەڕەشەیە بۆ بەرژەوەندی ئەمریکا و جیهانی ئازاد و هاوپەیمانەکانی لە ناوچە ).

ج- دابینکردنی یارمەتی سەربازی

د - دروستبوونی پەیوەندی هەواڵگری لە نێوان کوردەکان و ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی یارمەتی هەواڵگری بدەن بە کوردەکان.

٥- بۆ جێبەجێبوونی داواکاریی سەرەوە بۆ بوونی پەیوەندی راستەوخۆی بەردەوام لە نێوان رێبەرایەتی کورد و حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ناوبراو وتی بارزانی پێشنیار دەکات بەڕێز(ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بۆ هەمیشە یان بۆ ماوەیەک بێتە حاجی عومەران، ئەگەریش ئەم پێشنیارە بە باش نازانن، بزووتنەوەی کورد لە هەر شوێنێکی گونجاو کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە باشی بزانێت دەتوانێ لەگەڵ ئەمریکا لە پەیوەندیدا بێت. ناوبراو وتی بارزانی لە قۆناخی یەکەمدا چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە لە هەر کاتێکدا کە هەلومەرجی سیاسی رێگا بدات سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بکات و جەختی کردەوە کە لە بەرامبەر ئەو یارمەتییەی کە کورد لە ئەمریکا داوای دەکات بارزانی ئامادەیە بزووتنەوەکەی و هێزە شەڕوانەکانی رەچاوی سیاسەتی ئەمریکا بکەن. ناوبراو ئەوەی زیاد کرد کە پێش لە دەرچوون لە واشنگتۆن خۆی و بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بوار و وردەکاری داواکارییەکانیان بۆ (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) ئامادە دەکەن .

٦- بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) وتی هەست دەکات نیگەرانییەکان و داواکارییەکانی بارزانی (کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکراوە) زۆر نزیکە لە لیدوانەکانی سەرۆک نیکسۆن لە کونفرانسە چاپەمەنییەکەی ٢٩ی حوزەیران لە پەیوەندی لەگەڵ هەڕەشەی سیاسەتەکانی سۆڤیەت بۆ ئاشتی جیهانی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ناوبراو وتی هەوڵی ئێستای سۆڤیەت وعێراق بۆ کونترۆڵکردنی کوردستان دەبێ بە بەشی کۆتایی سیاسەتی سۆڤیەت بۆ ئەوەی عێراق بکات بە دەوڵەتێکی داردەست کە پێش لە هەموو شتێک هەڕەشەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٧ - ناوبراو ئاماژەی بەوە کرد کە خۆی و بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) پێستی بەورێکیان لە کوردستان هێناوە بۆ سەرۆک نیکسۆن وەک پێشکەشییەک لە لایەن بارزانییەوە و ئەم پێشکەشییە دەنێرێ بۆ بەڕێوەبەرە پەیوەندیدارە ئەمریکیەکە بۆ

ئەوەی لە لایەن ڕێبەری کوردەوە بیدات بە سەرۆک کۆماری ئەمریکا. ناوبراو لە کۆتایی قسەکانیدا وتی بارزانی هیوادارە دیداری نوێنەرانی کورد لە واشنگتۆن کە زۆر نزیکە لە جەژنی ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ٤ی تەموز، حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان تەشویق بکات وەڵامی ئەرێنی بداتەوە بەم داواکارییەی ئەوان بۆ یارمەتیدانی کورد بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی .

٨ - بەرپرسی بەشی پەیوەندیداری وەزارەتی دەرەوە سوپاسی نوێنەرە کوردەکانی کرد بۆ دیدار لە واشنگتۆن و سوپاسی بەڕێز(ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە) کرد بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە هەڵوێست و داواکارییەکانی خەڵکی کورد و ڕێبەرایەتییەکەی ڕوون کردووەتەوە. ناوبراو وتی خۆی و "کولونیل هیلمز" لە لایەن دوکتۆر کیسینجیر-ەوە ڕێگایان پێدراوە هاوسۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ بزووتنەوەی کورد بە ڕێبەرایەتی بارزانی بەوان رابگەیەنن. بەڕێز هیلمز ئاماژەی بەوە کرد کە دانیشتن لەگەڵ نوێنەرانی کورد لە ئۆفیسیکی وەها لە وەزارەتی دەرەو ئەوە دەسەلمێنێت کە ئێمە هاوهەڵوێستین لەگەڵ کوردەکان و ئامادەین داواکارییەکانیان تاوتوێ بکەین. بەرپرسی ئۆفیسەکە وتی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەیەوێت درێژە بە پەیوەندییەکانیی لەگەڵ بزووتنەوەی کورد بدات کە ئامادەبوونی نوێنەرانی کورد هەنگاوی یەکەمی ئەم پەیوەندییانەیە .

٩- بە تەواوی ڕەش کراوەتەوە

١٠-بەرپرسی ئۆفیسەکە پاشان داوای لە(ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە ) کرد کە بە زووترین کات پێداویستییە ماددی و سەربازییەکانی کوردەکان بە وردی ئامادە بکات بۆ ئەوەی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بتوانێ بە زووترین کات تاوتوێی بکات. بەڕێز هیلمز جەختی کردەوە کە کات بۆ کوردەکان زۆر هەستیارە و حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەم پەیوەندییەدا هەرچی لە دەستی بێت دەیکات و پاشان بە زووترین کات ئەم یارمەتیانە بۆ کوردەکان دابین دەکات. ناوبراو هەروەها وتی وەڵامەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ڕێگای(ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی شایە -وەرگێڕ) دەدرێتەوە بە بارزانی.

بەڕێز هیلمز وەک بەرپرسی ئۆفیسەکە لە پێشەوە کوردەکانی ئاگادار کردەوە کە زۆر زەحمەتە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان کە بتوانێ یارمەتی سەربازی راستەوخۆ بدات بە کوردەکان بێ ئەوەی بیروڕای گشتی ئاگاداری بێت. ناوبراو وتی لەوانەیە ئێمە بتوانێن تاوتوێی کاناڵێک بکەین بۆ دابینکردنی ئەم یارمەتییە لە ڕێگای ئێران یا (رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی ئیسرائیلە - وەرگێڕ). بەرپرسی ئۆفیسەکە بە راشکاوی وتی نهێنیپارێزی مەرجی سەرەکی ئەم پەیوەندییەیە و ئەگەر ئەم نهێنییە نەپارێزرێت، پەیوەندییەکە ئاڵۆز دەبێت .

١١- بەڕێز (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) لە وەڵامدا وتی ڕێبەرایەتی کورد دەرک بە گرنگی نهێنیپارێزی ئەم مەسەلەیە دەکات و ئامادەیە سەرجەم ئەو ڕێوشوێنانە کە ئەمریکا لەم پەیوەندییەدا دایدەنێت جێبەجێ بکات و هەموو یارمەتییەکانی ئێمە قبوول بکات بەو شێوەیە کە ئێمە پێیان دەڵێین. ناوبراو بۆ نیشاندانی نیازپاکی کوردەکان لەم پەیوەندییەدا وتی تەنها حکوومەتی ئێران ئاگاداری دیداری کوردەکانە لە واشنگتۆن .

١٢- کۆلونیل کنێدی سپاس و پێزانینی دوکتۆر "کیسینجێر"ی بە کوردەکان ڕاگەیاند بۆ ئامادەبوونیان لە واشنگتۆن و روونکردنەوەی بارودۆخی هەستیار و مەترسیداری کوردستان و پوتانسیەلەکەی بۆ ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەور ببینێت. ناوبراو هەروەها ستایشی (ناوەکەی رەش کراوەتەوە بەڵام مەبەستی ئیدریس بارزانییە - وەرگێڕ) کرد کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن مەلا (مستەفا) بارزانییەوە لەو دانیشتنە گرنگەدا بەشدار بوە.

پاشان دانیشتنەکە کۆتاییپێهات و هەردوو لا لە سەر ئەوە ڕێککەوتن کە نوێنەرە کوردەکان دیسان لەگەڵ (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) دیدار بکەن بۆ ئەوەی وردەکارییەکانی داواکارییەکانیان بخەنە بەر دەستی "هیلمز" و کلونیل" کنێدی".

هاوپێچەکان:

هاوپێچی سیاسی

هاوپێچی ماددی

هاوپێچی سەربازی

هاوپێچی هەواڵگری

### هاوپێچی سیاسی

**پەکگراوەند**

ئامانجی یەکەمی بزووتنەوەی کورد لە عێراق ئۆتۆنۆمییە بۆ ناوچە کوردنشینەکان. ئەو ئۆتۆنۆمییە کە کوردەکان داوای دەکەن بەراوەرد دەکرێت لەگەڵ ئۆتۆنۆمی هەرکام لە ئەیالەتەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە خۆی کونترۆڵی سیستمی پەروەردەی خۆی بکات و خزمەتگوزارییە بنەڕەتییە کۆمەڵایەتییەکانی دابین بکات بۆ هاووڵاتیانی خۆی. ئەم ئۆتۆنۆمییە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ سەربەخۆیی بەراورد ناکرێت. ئامانجی دووەمی بزووتنەوەی کورد پەرەپێدانی دیموکراسی لە ناو سیستمی سیاسی دەوڵەتی عێراقدایە.

کەوابوو گرنگترین لایەنی سیاسی پەیوەندی کورد لەگەڵ هەر دەوڵەتێک (لەوانە دەوڵەتی ناوەندی عێراق) ئەوەیە کە ئەو دەوڵەتە ئۆتۆنۆمی کورد لە چوارچێوەی کۆماری سەربەخۆی عێراقدا وەک مافیکی رەوا و یاسایی بە فەرمی بناسێت .

ئەم ئۆتۆنۆمییە یەکەم جار لە "راگەیاندننامەی کریسمەس" لە ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ بە فەرمی ناسرا کە تێیدا بریتانیا بەتایبەت ئۆتۆنۆمی کوردی بە فەرمیناسی و ئەو دەسەڵاتەی دا بە کوردەکان کە ناوچەی ئۆتۆنۆمی خۆیان بەڕێوە بەرن. بەداخەوە ئەم راگەیاندننامەیە قەد لە لایەن بریتانیا و عێراقەوە جێبەجێ نەکرا و پێش لە هەموو شتێک بووە هۆی راپەڕینی یەک لە دوای یەکی کوردەکان. ئامانجی کورد لەم شەڕانەدا ئەوە بوو کە ئەو ئۆتۆنۆمییە فەرمییە یاساییە کە لە "راگەیاندنامەی کریسمەس"دا پێیان درابوو لە کردەوەدا بە فەرمی بناسرێت .

پاش کودیتای قاسم لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ حکوومەتی عێراق یاسایەکی بنەڕەتی دانا کە لە ماددەی ٣دا ئەوەی بە فەرمی دەناسی کە کورد و عەرەب لە بەڕێوەبردنی وڵات بەشدارن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەم ماددەیە قەت جێبەجێ نەکرا و لە ساڵی ١٩٦١

عەبدولکەریم لە راستیدا دەستی کرد بە کۆمەڵێک هەوڵی بەرچاو بۆ ئەوەی بزووتنەوەی کورد تێکبشکێنێت. قاسم ئوفیسەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی (رێکخراویکی سیاسییە کە نوێنەری بزووتنەوەی کوردە) داخست، رۆژنامەکەی داخست، هێزی سەربازی نارده کوردستان و هەوڵیدا عەشیرە عەرەبەکان لە ناوچە کوردنشینەکان نیشتەجێ بکات. لە وەڵامی ئەم کردەوانەدا مەلا مستەفا بارزانی بزووتنەوەی خۆڕاگری کوردی لە ١٩٦١ تەنها بە ٦٠٠ پێشمەرگەوە بەرێکخستن کرد و تا ١٩٦٣ ئامانجی ئۆتۆنۆمی بزووتنەوەی کوردی عێراق لە مێشکی بارزانی و هاورێکانیدا جێگیر بوو. شەڕ درێژەی کیشا تا ئەوە کە لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠ بارزانی رێککەوتننامەیەکی لەگەڵ حکوومەتی بەعس لە بەغداد مۆر کرد. چەند مانگ پاش ئەوە رژیمی بەعسی سەدام التکریتی دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پیلانێک بۆ تێکشکاندنی رێبەرایەتی کورد و پاشان هەوڵیدا مەلا مستەفا بارزانی و کوڕەکەی، ئیدریس بکوژێت.

هەوڵەکانی بەعس بۆ تێکشکاندنی کوردەکان هەتا رۆژی ئەمڕۆ بە هاوئاهەنگی لەگەڵ گوشارە توند و بەرفراوانەکانی سۆڤیەت، کۆماری دیموکراتی ئاڵمانیا، بولگاریا و دەوڵەتە کومونیستەکانی دیکە بەردەوامە. یەکێتی سۆڤیەت بۆ پاراستنی زۆرتری رژیمە داردەستەکەی لە بەغداد، گوشاری خستووەتە سەر میسر (دوژمنی لەمێژینەی بەعس) تا رەفتارێکی دۆستانەتر بە نیسبەت عێراق بگرێتەبەر و تەنانەت قەناعەتی بە سوریا (کە یەکێ لە نەیارەکانی حیزبی بەعسی عێراقە) هێناوە تا کۆتایی بە کردەوەکانی دژی رژیمی بەعسی عێراق بهێنێت. ئەم رووداوانە لەگەڵ کەشوهەوای کوشتن و ئەشکەنجەدانی رژیمی بەعس بە رێبەرایەتی سدام حسین التکریتی تێکەڵ بووە تا عێراق بکات بە داردەستی سۆڤیەت و هەرچەند کە زۆربەی خەڵکی عێراق (وەک زۆربەی خەڵکی چکسلڤاکیا) لەم رژیمە بێزارن بەڵام بەهەرحاڵ تیرۆر و دڕندەیی لە رادەبەری بەعسییەکان بووەتە هۆی ئەوەی کە بە سەر ئەم خەڵکەدا زاڵ بن.

کوردستان ئێستا تەنها شوێنێکە کە بووە بە کەندو کۆسپ لە سەر ڕێگای زاڵبوونی تەواوی سۆڤیەت بە سەر عێراقدا لە ڕێگای (سدام التکریتی)یەوە. ئەگەر ئەم ئامانجەی سۆڤیەت جێبەجێ بێت، سۆڤیەت پێش لەهەموو شتێک دەتوانێت لە ڕێگای عێراق و یەمەنی باشوور (کۆماری دیموکراتی گەلی یەمەن) گوشارێکی یەکجار زۆر بخاتە سەر دەوڵەتە لاواز و تازە پێگەیشتووەکانی کەنداوی فارس. کوردەکان ئاگاداری ئەوەن کە ڕێبەری یەمەنی باشوور، عبدالفتاح اسماعیل لەگەڵ کۆسیگێن (وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت) ڕیککەوتووە تا بە هاوئاهەنگی لەگەڵ عێراق ئەم دەورە لە کەنداو بگێڕن .

بارودۆخی ئێستای هێزەکانی بارزانی ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کردووە تا بزووتنەوەی کورد تەنها ڕەفتارێکی بەرگرییانەی لاواز لە بەرامبەر هێزی دوژمنە هاوبەشەکەی بگرێتە بەر. بارزانی مەزەندەی ئەوە دەکات کە بەو ڕێژە یارمەتییە کە ئێستا لە ئێران و (ڕەش کراوەتەوە - وەرگێڕ) وەریدەگرێت، ئیدی ناتوانێت لە کاتی خۆیدا دژی ڕژیمی عێراق شەڕ بکات. بارزانی هەست دەکات لە ماوەی ٦ مانگی داهاتوودا ناچار دەبێت یا لەگەڵ ڕژیمی عێراق ڕێکبکەوێت (کە ئەمەش بە واتای تەسلیمبوونی سیاسییە) یا هێزی پێشمەرگە و ڕێبەرانی کورد بخاتە ناو شەڕیکی کورتخایەن کە بە دڵنیاییەوە بە هەرەسهێنانی هەمیشەییان کۆتایی پێدێت .

بارزانی تەنها بە دوای ئەوەدا نییە کە یارمەتی پێویست بۆ ئەوە بە دەست بهێنێت تا بتوانێت کوردستان لە بەرامبەر عێراق و سۆڤیەت بپارێزێت، ئەمە بچووکترین ئامانجی مەلا مستەفایە. مەلا مستەفا ئەوە بە باشتر دەزانێت یارمەتی سیاسی، مادی و سەربازی وەکوو پێویست بۆ کوردەکان دەستەبەر بکات بۆ ئەوەی بارودۆخی بەرگریانەی خۆیان بگۆڕن و ببن بە هێزیکی هێرشبەر دژی عێراق و هاوپەیمانە سۆڤیەتییەکانی. خۆشبەختانە لەم بارودۆخەدا کوردەکان دەتوانن لەگەڵ عەرەبە نەیارەکانی بەعس تێکەڵ بن بۆ ئەوەی یا ڕژیمی بەعسی عێراق بڕوخێنن یا ڕژیم و هێزەکانی ئەوەندە دژی یەک هان بدەن و لاوازی بکەن کە ئیدی نەتوانێت ببێت بە

هەرەشەیەک بۆ ئێران، تورکیا، عەرەبستانی سعوودی، ئۆردۆن یا دەوڵەتانی کەنداوی فارس.

ڕێبەرانی کورد هاوکات لەگەڵ ئەوەی ئاگاداری ئەوەن کە لە ناوچەیەکی بەرفراواندا دەتوانن دەورێکی بچووک بگێڕن بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە سەر ئەو باوەڕەن کە دەتوانن یارمەتییەکی زۆر بدەن بە پاراستن و تەنانەت بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئەمە خاڵێکە کە نوێنەرانی کورد لە واشنگتۆن دەیانەوێت زۆر جەختی لە سەر بکەنەوە. ئەم نوێنەرانە هەروەها جەخت دەکەنەوە کە بارزانی دەیەوێت بزووتنەوەکەی لەگەڵ ئامانج و سیاسەتە ناوچەییەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکان هاوئاهەنگ بکات بەو مەرجە کە ئەمریکا پێداویستییەکانی کوردەکان دابین بکات. نوێنەرانی کورد دەڵێن ئەم هاوکارییە لەگەڵ فەلسەفەی هاوبەشی سیاسی کوردستان و ویلایەتە یەککگرتووەکان (واتا ئازادی خەڵکێک کە دەیەوێت بەو شێوازەی کە خۆی پێی باشە، بژی و کاروباری خۆی بەڕێوە ببات) دەگونجێت. بەتایبەتتر نوێنەرە کوردەکان لە واشنگتۆن بە شوێن ئەوەدان کە ویلایەتە یەککگرتووەکان ئامانجی سیاسی کورد واتا ئۆتۆنومی بەفەرمی بناسێت هەروا کە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانە دەوڵەتی ناوەندی عێراق، یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتە کومونیستەکانی دیکە پێشتر بە فەرمیان ناسیوە.

کوردەکان ئەوە دەزانن کە بە هۆی پێویستی نهێنیپارێزی لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکان، ئەم هاوخەمییە و بە فەرمیناسینی هەڵوێستەکەیان لە لایەن ویلایەتە یەککگرتووەکان دەبێ بە تەواوی نهێنی بێت. بەهەرحاڵ ئەوان هیوادارن دەرفەتی ئەوە بڕەخسێت کە ویلایەتە یەککگرتووەکان کوردستان وەک کیانێکی سیاسی خاوەن ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی وڵاتی عێراقدا بە تەواوی بە فەرمی بناسێت.

کاتێک کە بەڕێز(ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە - وەرگێڕ) لە ٤ی حوزەیران سەردانی شای کرد، شا وتی بە تەواوی لەگەڵ ئەوەدایە دوو ڕەوتی کاری لە پەیوەندی لەگەڵ

ئامانجی ئۆتۆنۆمی کورد بگیردرێته بەر: یەکەم رەوت کە شا ئەمەیان بە باشتر دەزانێت ئەوەیە کە کەڵک لە کورد و عەرەبە نەیارەکانی بەعسی عێراق وەربگیردرێت بۆ رووخاندنی ئەم حکوومەتە. رەوتی دووەم پشتیوانیکردنە لە کوردستانێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی لە ناو عێراق بۆ ئەوە بتوانێت لە سەر پێی خۆی رابوەستێت و هەروەها لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەدا رابوەستێت، کە بۆ تێکشکاندنی دەدرێت. ئەمە روونترین شێوازی بە فەرمیناسینی ئۆتۆنۆمی کوردە کە تا ئێستا ئێران کردوویەتی .

بزووتنەوەی کورد هەروەها یارمەتی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بۆ ئەوە دەوێت کە قەناعەت بە ئێران و تورکیا بهێنێت کە بزووتنەوەی کورد لە عێراق هیچ زیادەخوازییەکی سەرزەمینی یا سیاسی بە نیسبەت کوردەکانی ئێران یا تورکیا نییە. بزووتنەوەی بارزانی بەتایبەت نیگەرانی دەوڵەتی تورکیایە کە بەردەوام هەر چەشنە پەیوەندییەکی لەگەڵ کوردەکانی عێراق رەت کردووەتەوە، سەرەڕای ئەو راستییە کە لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا گولەیەک بەرەو سنووری تورکیا نەتەقینراوە، بە پیچەوانەوە بزووتنەوەی کورد ئاسایشی سنووری ئێران و تورکیای لەگەڵ کوردستان بە توندی پاراستووە. کەوابوو ئەمە پێش لە هەموو شتێک ئاسایشی زۆربەی سنووری ئێران و تورکیا لەگەڵ عێراقی نەیاریان دابین دەکات.

کوردەکان سوپاسی ئۆفیسی پەیوەندیداری ئەمریکا دەکەن ئەگەر پەیوەندی راستەوخۆ لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی تورکیا درووست بکات. نوێنەرە کوردەکان هەروەها ئامادەیی کوردەکانی عێراقیان دەربڕی بۆ ئەوەی هەموو چەشنە گارانتییەک بدەن بە ئێران یا تورکیا بۆ پاراستنی سنوورەکانیان و ئەوەیان زیاد کرد کە ئەم دوو دەوڵەتە هەر چەشنە گارانتییەکیان دەربارەی ئاسایشی سنوورەکانیان لەگەڵ کوردستان بوێت دەتوانن بینووسن و کوردەکان واژۆی دەکەن .

سەرەنجام ئەوە کە بزووتنەوەی کورد داوا لە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکات درێژە بەو پەیوەندییە راستەوخۆیە بدات کە یەکەم جار لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٢ لە نێوانیاندا دروست بووە. بزووتنەوەی کورد ئەوە دەزانێت کە پەیوەندییەکی راستەوخۆی وەها دەبێ بە تەواوی نهێنی بێت .

له ئەنجامی گفتوگۆکانی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٧٢ لە واشینگتۆن دی سی نوێنەرە کوردەکان و (ڕەش کراوەتەوە بەڵام وادیارە مەبەستی شایە -وەرگێڕ) گەیشتوونەتە ئەو باوەڕە کە هاوخەمی ئەمریکایان لەگەڵ ئۆتۆنۆمی سیاسی و جوگرافیایی کوردەکان لە ناو عێراقدا بە دەست هێناوە. کوردەکان دەرک بەوە دەکەن کە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕەزامەندی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی درێژە بە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕێبەرایەتی سیاسی کوردستان بدات. سەرەنجام ئەوان دەرک بەوە دەکەن کە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە زووترین کات داواکارییەکانی کوردەکان بۆ یارمەتی مادی و سەربازی تاوتوێ دەکات و (ڕەش کراوەتەوە).

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لوبنان**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن**

**١٣ی تەموزی ١٩٧٢**

**بابەت: ئاڵۆزی لە باکووری عێراق و پەرەسەندنی ناکۆکیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، تاران

**کورتە:**

١- بەگوێرەی راپۆرتەکان لە ماوەی ١٠ رۆژی رابردوودا ئاڵۆزی و پێکدادان لە باکووری عێراق رویداوە و لەوانەیە ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی بەرفراوان و درێژخایەن لە نێوان هێزەکانی بارزانی و رژێمی بەعس. هەرچەند کە کێشەکە ئێستا تا رادەیەک کپ بوەتەوە بەڵام بەگوێرەی راپۆرتەکان ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و رژێمی بەعس لە کاتی ریکەوتننامەی بارزانی و دەوڵەتی عێراق لە ئاداری ١٩٧٠ بەملاوە ئەوەندەی ئێستا تەشەنەی نەکردوە. هەندێ لە لایەنگرانی کوردەکان لێرە (لوبنان) لە سەر ئەو باوەڕەن کە پێکدادانەکانی ئەم دوایە تەنها پێشەکیەکە بۆ پێکدادانی زیاتر و جدیتر لە داهاتوودا چونکە دەوڵەتی عێراق - کە بە هۆی پشتیوانی سۆڤیەت و سەرکەوتن لە بەنەتەوەییکردنی کۆمپانیای نەوتی عێراق جەسورتر بوە - هەنگاوی زیاتر هەڵدەگرێت بۆ ئەوەی زیاتر گوشار بخاتە سەر

بارزانی و ئەو دەستکەوتانە لە بار ببات کە بارزانی لە ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠دا بەدەستیهێناوە. کۆمەڵێ کەسی دیکەش هەر لە سەر ئەو باوەڕن کە پێکدادانەکان بەمزوانە ڕوو دەدات بەڵام بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بارزانی هۆکاری دەستپێکردنی ئەو پێکدادانانەیە.

٢- لە ماوەی ١٠ ڕۆژی رابردوودا ڕۆژنامەکانی چاپی لوبنان بەشێوەیەکی بەرچاو سەرنجیان بە هەڵگیرسانی پێکدادانی نێوان کورد و عەرەبەکان (لەوانە لە ناوچەکانی دەوروبەری موسڵ، کەرکووک و سلێمانی لە باکووری عێراق) داوە. نووسینەکانی ئەو ڕۆژنامانە لەگەڵ ئەو زانیاریانە یەکناگرێتەوە کە ئێمە لە کوردەکان و عێراقیەکانی دانیشتووی بەیروت کۆمان کردوەتەوە. کەوابوو ئەم ڕاپۆرتە سەرەتاییە (و هەندێ جار نایەکانگیرە)تان بۆ دەنیرین دەربارەی ئەوەی چی ڕویداوە و چاوەڕوان دەکرێت چی لە داهاتوودا ڕوو بدات.

٣-بە وتەی ئاژانسی هەواڵی عێراق، لە یەکێ لە ڕۆژەکانی هەفتەی یەکەمی مانگی تەموز کابرایەکی کوردی عەشیرەتی یاخی ئێزەدی لە ناوچەی سنجار لە ڕۆژئاوای موسڵ (کە یەکێ لە ناوچە جێناکۆکەکانی نێوان بارزانی و ڕژیمی بەعس لە کاتی ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ تا ئێستا بوە) تەقەکەی دەستپێکردوە. ئەو هەواڵنێرە بیانیانە کە سەردانی بەغدادیان کردوە ڕاپۆرتیان داوە کە ئێزەدیەکان لەو هەواڵە نیگەرانن کە عێراق کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی کردوە و لەوە دەترسن ئەم کارەی دەوڵەتی عێراق ببێتە هۆی ئەوەی ئەو پارەیانە لێ ببڕێت کە کۆمپانیای نەوتی عێراق تا ئێستا وەک" پارەی پاراستن" پێیداون. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکان سپای عێراق لە موسڵ لە نیو بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان تەقەی لە کوردەکان کردوە و پێکدادانەکە بە خێرایی لە پاریزگای موسڵ بەرەو ناوچەکانی دەوروبەری کەرکووک و سلێمانی پەرەیسەندوە. کوردەکان دەڵێن بە یارمەتی هێزەکانی بارزانی لە هەمووی ئەم سێ ناوچانەدا لەگەڵ سپا و پۆلیسی عێراق کە لە لایەن هێزی هەوایەوە پشتیوانیان لیکراوە شەڕیان کردوە. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکان ٣٠ تا ٥٠ کەس لە هەر

دوو لا لەو شەڕەدا کوژراون کە یەکێکیان غانم العلی[٢٥٠]، قائیمەقامی سەر بە بەعسی ناوچەی سینجار بوە کە ڕۆژی ٣ی تەموز بە دەستی کەسانی نەناسراو کوژراوە. هەروەها چەند کەسی دیکە لە ئەفسەرانی سپای عێراق لەو شەڕەدا کوژراون.

٤- بەگوێرەی راپۆرتی ڕۆژنامەکانی بەغداد تەنیا ڕێگای پێشگرتن لە پێکدادانی گشتی لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی بەغداد ئەوەیە کە هەم بارزانی و هەم ڕێبەرانی بەعس، بەتایبەت سەرۆک کۆمار بەکر دان بە خۆیاندا بگرن. بەکر دوو کەس لە وەزیرە کوردەکانی ئەندامی ئەنجومەنی وەزیرانی ناردوە لەگەڵ بارزانی دیدار بکەن بۆ ئەوەی پێش لە پەرەسەندنی شەڕەکە بگرن و بارودۆخەکە هێور بکەنەوە (یەکێ لەو وەزیرانە نافز جەلال حەوێزی[٢٥١] بوە کە پاش دەرچوون لە بارەگای بارزانی بەهۆی پێکدادانی ئوتومۆبیل گیانی لە دەسداوە). بارزانی پەیامێکی بۆ بەکر ناردوە و نکوڵی لەوە کردوە کە پێشمەرگەکانی ئەو شەڕەکەیان دەستپێکردبێت و وتویەتی یارمەتی بە ڕوونبونەوەی چۆنیەتی کوژرانی قایمەقامی سنجار دەدات و جارێکی دیکە داوای کردوە هێزەکانی عێراق لە ناوچە جیناکۆکەکانی باکوری عێراق پاشەکشە بکەن و دەوڵەتی عێراق شەرتومەرجەکانی ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ جێبەجێ بکات. دوایین راپۆرتەکانی نێردراو لە بەغداد کە لە ڕۆژنامەکانی ١٢ی تەموز چاپی بەیروتدا بڵاو بوونەتەوە نیشان دەدات کە هەر چەند کە بارودۆخەکە لە باکوور بە تەواوی هێور نەبوەتەوە بەڵام چاوەڕوان ناکرێت کە ببێتە هۆی دەستپێکردنی شەڕێکی بەرفراوان. سەیر ئەوەیە کە ڕۆژنامەکان هیچ باسی دەوری سەدام حوسەین تەکریتیان لەم قەیرانەدا نەکردوە.

٥- ئەنجامی پەیوەندیەکانی ئێمە لەگەڵ کەسایەتیە کورد و عێراقیەکانی دانیشتووی لوبنان نیشان دەدات کە زۆربەی ئەو شتانە کە باس کرا ڕاستن بەڵام ڕوانگەکانی کوردەکان و عێراقیەکان یەکجار زۆر لە یەک دورە. ئەوان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە

---

[250] ghanem al 'ali,
[251] - nafez jallal howeizi

له راستیدا هۆکاری سەرەکی هەلگیرسانی شەڕەکەی ناوچەی سینجار، ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان لە ناوچە جیناکۆکەکانی دەوروبەری موسڵ، کەرکووک و سلێمانی بوە و لە سەر ئەوە هاوڕان کە ئەو ناکۆکیانە پاشان توندتر دەبێت. کەسایەتیە کورد و عێراقیەکانی دانیشتوی لوبنان هەروەها مەسەلەی گرێدراوبوونی بژێوی ٣٠ هەزار خەڵکی عەشیرەتی ئیزەدی بە کۆمپانیای نەوتی عێراق لە بەعشیقە بە چیرۆکێکی سیحراوی بەعسیەکان دەزانن چونکە ئیزەدیەکان زیاتر لە بارزانی نزیکن و شیخەکەیان واتا" تەحسین بەگ[٢٥٢] "پەیوەست بوە بە بارزانی لە شاخدا. ئەو کەسایەتیانە هەروەها دان بەوەدا دەنێن کە بەهەرحاڵ کوردەکان بەگشتی لە و سیاسەتە ئابووریەی دەوڵەتی عێراق ناڕازین کە بوەتە هۆی ئەوە ژیان لە ناوچە جێناکۆکەکانی باکوور دژوار بێت. ئەو کەسایەتانە هەروەها دەربارەی چۆنیەتی کوژرانی غانم العلی، قایمەقامی سنجار دەڵێن پێشمەرگەکان کوشتویانە و دەڵێن لە کوژرانی ناوبراو خۆشحاڵن. هەندێ لەو کەسایەتیانە تەنانەت دەڵێن لەوانەیە بارزانی پیلانی مەرگی جەلال حەویزی داڕشتبێ ( کە ساڵی ١٩٦٩ فەرماندەی هێزەکانی بارزانی بووە) چونکە حەویزی تەسلیمی ژیانی ئارامی وەزیرایەتی خۆی لە بەغداد بوە و بوە بە داردەستی بەعس.

ئەو کەسانە کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵیان گرتوون و دژی بەعسن دەڵێن پێشهاتەکانی ئەمدوایە لە باکووری عێراق نیشانەی دەستپێکردنی راپەڕینی کوردەکان دژی دەوڵەتی بەغدادە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کام لە بارزانی یا دەوڵەتی عێراق ئەو پێکدادانەیان دەستپێکردوە. هەندێ لەو کەسایەتیانە دەڵێن بارودۆخە ئارامەکەی ئێستا زۆر ناخایەنێت و جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە بارزانی هێشتا مەسەلەی دەستپێکردنی راپەڕینی بەرفراوانی کوردەکانی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی لە ئێران تاوتوێ نەکردوە.

---

[252] Tahsin Bey

٧- هەڵسەنگاندن: ئێمە ناتوانین بڵێین ئەو راپۆرتە نایەکانگیرانەی سەرەوە تا چ رادەیەک راستن. چاوەڕوان دەکرێت وتەبیژی بەعسیەکان لە بەغداد راستیەکانی ئەو بارودۆخە روون بکاتەوە چونکە ئەو بارودۆخە یەکێ لە سەرچاوە سەرەکیەکانی نیگەرانی بەعسیەکانە. لە لایەکی دیکەوە ئێمە باش شارەزای شێوەی بیرکردنەوەی زیادەڕۆیانە و زۆر خۆشبینانەی لایەنگرانی بارزانی لە بەیروتین. لە روانگەی ئێمەوە ئەو شتە کە دەکرێت تا رادەیەک بە دڵنیایەوە بوترێت ئەوەیە کە پەیوەندیەکانی کوردەکان و بەعسیەکان پاش رێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ ئەوەندەی ئێستا ئاڵۆز نەبوە.

هۆگتۆن

**وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**یادداشتنامە**

**نهێنی، هەستیار**

**١٨ی تەموزی ١٩٧٢**

**بابەت: یارمەتیدانی ئەمریکا بە رێبەری کوردی عێراق، مەلا مستەفا بارزانی**

١- ئەم یادداشتنامەیە باسی پێشنیارێک دەکات کە هێلمز، بەڕێوەبەری CIA بۆ یارمەتیدانی نهێنی بە رێبەری کوردی عێراق، مەلا مستەفا بارزانی ئامادەی کردوە. ئەوانەش کە هاوپێچ کراون بریتین لە :

هاوپێچی (الف) کە باسی چۆنیەتی تەسلیمکردنی چەک و تەقەمەنی بە کوردەکان دەکات و هاوپێچی (ب) کە بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنێت و قازانج و زیانەکانی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان شی دەکاتەوە .

٢- ئەو یارمەتییە مادییە کە مەلا مستەفا بۆ درێژەدان بە خەبات دژی رژیمی عێراق پێویستییەتی دوو جۆرە: یارمەتی ماددی و چەک و تەقەمەنی

٣- لە پەیوەندی لەگەڵ یارمەتی مادیدا دەزگای هەواڵگری ئێمە بەردەوام بودجەیەکی ساڵانەی تەرخان کردووە بۆ دابینکردنی یارمەتی ماددی بۆ ٢٥ هەزار پێشمەرگە (هێزە چەکدارەکانی بارزانی) کە دەکاتە نزیکەی ١٨ میلیۆن دولار. لە کاتێکدا کە نوێنەرانی بارزانی ئەم دواییانە وتوویانە ساڵانە بە گشتی پێویستیان بە ٦٠ میلیۆن دولار هەیە بەڵام ئەمە پارەیەکی خەیاڵییە چونکە بە ٦٠ میلیون دولار دەکرێت

خەرجی ٦٠ هەزار سەربازی هێرشبەر و خەرجی ژێرخانی حکوومەت و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییە تایبەتەکان بۆ دانیشتووانی ناوچە کوردنشینەکان دابین بکرێت.

ئێمە نابێت پشتیوانی لە یارمەتییەکی زیادەخوازانە و زۆر هاندەرانەی وەها و چالاکییەکی ئەوەندە بەرفراوان (کە جێبەجێش ناکرێت) بکەین کە لەوانەیە لە سنووری یارمەتییەکی نهێنی بچێتە دەرەوە.

٤- لە بڕی ئەو ١٨ میلیون دولارە کە بۆ شەڕی پێشمەرگایەتی پێویستە و لە بنەڕەتدا بۆ بەرگریکردن لە خۆیە، لەوانەیە ئێران بتوانێت نیوەی ئەم پارەیە واتا ٩ میلیون دولاری دابین بکات.

٥- لە چوارچێوەی یارمەتی ماددیدا پێشنیار دەکەین ساڵێ ٣ میلیون دولار بدەین بە بارزانی. بە هەرحال هەم بارزانی و هەم شا چاوەڕوانی یارمەتی ئێمەن. ئەم بڕە پارەیە هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە تا رادەیەک سەلیقەییە، کاتێک بە دەستی لایەنی بەرامبەر دەگات کە یەکەم لانیکەم نیوەی سەرجەم پارەکە لە لایەن ئێرانەوە دابین بکرێت چونکە ئێران وەک دراوسێی عێراق قازانجی زۆری لەم مەسەلەیەدا هەیە و دووەم (رەش کراوەتەوە — وەرگێڕ).

٦- لە چوارچێوەی یارمەتی چەک و تەقەمەنیدا CIA ئێستا ئەو چەک و تەقەمەنییە زیادییەی لە دەستدایە کە کوردەکان پێویستیان پێیەتی. ئەم چەک و تەقەمەنییە نابێت هی ئەمریکا بێت واتا یا دەبێت لە وڵاتانی دیکەدا دروست کرابێت یا ئەو چەک و تەقەمەنییانەی ئەمریکا بێت کە بە شێوازی ئاسایی لە ئێران و عێراقدا هەیە (جگە لە تۆپی زەمینی و دژەهەوایی و تانک کە بەهرحال ئێمە ناچار نین بیدەین بە کوردەکان) کەوابوو بە گشتی دەبێ بڕی دوو میلیون و چوار هەزارو سەد و نەوەد (٢٠٠٤١٩٠) دولار بۆ دابینکردنی چەک و تەقەمەنی بۆ کوردەکان تەرخان بکرێت (جگە لە خەرجی گوازتنەوەی ئەم چەک و تەقەمەنییە بە پاپۆڕ بۆ ناوچە).

٧- مەسەلەی گوازتنەوەی ئەم چەک و تەقەمەنییە دەبێ بە کێشەیەکێ بەرچاو. ئێمە پێشنیار دەکەین ئەم چەک و تەقەمەنییە تەسلیم بە کوردەکان بکرێت (رەش کراوەتەوە) کەوابوو ئێران ئەم ئەرکە وەئەستۆ دەگرێت. دابینکردنی ئاسایشی ئەو

پاپۆڕانەی کە ئەم چەک و تەقەمەنییە دەگوازنەوە و وەرگرتنی لە ئێران و گوازتنەوەی لە ئێران بۆ کوردستانی عێراق بە تەواوی چارەسەر ناکرێت بێ راوێژ لەگەڵ چەند (رەش کراوەتەوە).

٨- لەم کاتەدا پێشنیار دەکەین ئەم هەنگاوانە هەڵبگیردرێت:

الف - بڕی ٥٣٧٩١٩٠٨٠ دولار بەم شیوازە دابەش بکرێت و تەرخان بکرێت بۆ پشتیوانیکردن لە کوردەکان بۆ یەک ساڵ:

١- سێ میلیون دولار بۆ یارمەتی ماددی

٢- (رەش کراوەتەوە)

ب - راوێژکردن لەگەڵ (رەش کراوەتەوە) بۆ دیاریکرنی تەواوی چۆنیەتی وەرگرتن و گوازتنەوەی چەک و تەقەمەنییەکە بۆ کوردستان بەو شیوازە کە لە سەرەوە شی کراوەتەوە .

هاوپێچی ب

١٨ی تەموزی ١٩٧٢

## کێشەکان و روانگەکانی یارمەتیدانی کوردەکان

ئەمەی خوارەوە هەڵسەنگاندنێکی سەرەتاییە کە بە وردی نرخاندنەکانی پەیوەندیدار بە پشتیوانی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کوردەکانی عێراق بە رێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی دەخاتەڕوو.

### کورتە

١- روونە کە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکان و دۆستەکان و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەیە کە رژیمی ئێستای عێراق لاواز بکرێت و تەنانەت بڕوخێت، ئەگەر ئەم ئامانجە بێ پەرەسەندنی ناکۆکییەکان لە ئاستی نیونەتەوەییدا بەدی بێت. کاریگەرترین و دڵنیاترین ئامرازەکانی گەیشتن بەم ئامانجە تەیارکردن و

پشتیوانیکردن له بارزانی و کوردەکانە بۆ ئەوەی بتوانن بەردەوام دژایەتی رژیمی عێراق بکەن. رژیمی عێراق کە لە ئاستی ناوخۆییدا رژیمێکی دیکتاتۆرە نیازی دەستدرێژیکارانەی هەیە بە نیسبەت ئێران، کوێت، ئوردۆن و عەرەبستانی سعودی و فدراسیونی تازەدامەزراوی ئەماراتی یەکگرتووی عەرەبی.

ئەو مەترسییە کە لە دوژمنایەتییەکانی عێراق کەوتووەتەوە بووەتە فاکتۆرێکی رۆژبەرۆژ گرنگ لە ناوچە بە هۆی پشتیوانی بەردەوامی سۆڤیەت لە عێراق کە ئێستا لە پەیماننامەی دوستی و هاوکاری نێوان ئەم دوو وڵاتەدا بەرهەست بووە کە لە ٩ی نیسانی ١٩٧٢ واژۆ کراوە. ئاگاداربوونی سۆڤیەت لە مەترسی دوژمنایەتیکردنی کوردەکان لەگەڵ رژیمی عێراق بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم دواییانە سۆڤیەت و ئاڵمانیای رۆژهەڵات گوشارەکانیان لە سەر بارزانی زیاد بکەن بۆ ئەوەی بارزانی پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی عێراق کە سۆڤیەت و رژیمی عێراق پشتیوانی لێدەکەن .

هەم سۆڤیەت و هەم رژیمی عێراق دەزانن کە ئەگەر سوپای عێراق بۆ شەڕێکی نوێ دژی کوردەکان تەیار بکرێت ئەگەری ئەوە کەمتر دەبێت کە کوردەکان بکەونە ژێر کونترۆڵی رژیمی عێراق و توانایی رژیم بۆ چالاکی دژی دراوسێکانی کەمتر دەبێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئێستا کۆمەڵێک هۆکار نیشان دەدەن کە رژیمی عێراق خۆی ئامادە دەکات هێرشی سەربازی بکاتە سەر کوردەکان و ئەم ئەگەرە زیاد دەبێت ئەگەر رژیمی عێراق ئاگادار بێتەوە کە ئێستا کوردەکان لە حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان نزیک بوونەتەوە بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەم دەوڵەتە بەدەست بهێنن.

٢- رژیمی عێراق چ کردەوەی سەربازی دژی کوردەکان ئەنجام بدات و چ ئەنجامی نەدات، حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت یارمەتی بە بارزانی بدات بۆ ئەوەی دژایەتی کوردەکان لەگەڵ رژیمی عێراق بەردەوام بێت. ئەگەر کوردەکان لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە بکەونە بەر هێرش، دەستبەجێ پێویستیان بە چەک و تەقەمەنی دەبێت. یارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێ بەو پەڕی نهێنیپارێزی و ئاسایشی ئیداری و فیزیکی ئەنجام بدریت بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا حاشای

لێبکرێت. هەرچەند کە چوارچێوەی ئەم یارمەتییە چەند ڕەهەندییە، بێ گومان مەسەلەی ئاڵۆزی پاراستنی ئاسایش لە خۆ دەگرێت. جگە لەبەرچاو گرتنی لایەنی حاشاکردن لەم یارمەتییە لە کاتی پێویستی خۆیدا، ڕێژە و شێوازی یارمەتی مادی و سەربازی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە کوردەکان دەبێ ئەوەندە بێت کە کوردەکان تەشویق بکات درێژە بە ئوپەراسیۆنە پێشمەرگایەتییەکەیان بدەن لە سنووری ناوچە شاخاوییەکانی خۆیاندا کە هەر لە کۆنەوە تێیدا باڵادەست بوونە و هەروەها دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێ تا ئەو شوێنەی کە پێی دەکرێت مەترسی ئەوە دوور بخاتەوە کە پەرەسەندنی چالاکی سەربازی کوردەکان ببێتە هۆی ئەوەی کە سۆڤیەت ڕاستەوخۆ لە کێشەکەدا دەستێوەردان بکات.

٣- پشتیوانی نهێنی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کوردەکان کۆمەڵێک کێشەی تایبەتی بە دواوە دەبێت کە یەکێ لەوانەیە ئەوەیە کە سۆڤیەت ڕاستەوخۆ بکەوێتە ناو کێشەکە. لە کاتێکدا دەستێوەردانی سۆڤیەت باشبوونی پەیوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەت دەخاتە ناو مەترسی کە سۆڤیەت لەم ساڵانەی دواییدا کاری بۆ کردووە، بەڵام لەوانەیە سۆڤیەت ئامادە بێت ئەم باجە بدات بۆ ئەوەی سەرمایە و پێگەی خۆی لە عێراق بپارێزێت.

یەکێ لە کێشەکانی دیکەی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان ئەوەیە کە تورکیا بە نیسبەت ناسیونالیزمی کورد هەستیارە چونکە تورکیا لە کەمینەی گەورەی کوردی خۆی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە نیگەرانە و سەرەنجام ئەوە کە پشتیوانی نهێنی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کوردەکان لە ئێستادا خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکی ئاڵۆزە چونکە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەیەوێت لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٢ نووسیگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد بکاتەوە.

٤- ئەگەر ئەم کێشانە بنێینە لایەکەوە، ڕوونە کە هەتا کاتێک کە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان و دەوڵەتە خاوەن بەرژەوەندییەکانی دیکە پشتیوانی زۆرتر لە بارزانی بکەن، بارزانی هیچ ئالترناتیڤێکی دیکەی نییە بۆ ئەوەی بەم زووانە لەگەڵ ڕژێمی عێراق ڕێکبکەوێت کە ئەم ڕێککەوتنە بە قازانجی ئامانجەکانی سۆڤیەتە و

تواناییەکانی عێراق دەباتە سەرەوە بۆ ئەوەی سەقامی دەوڵەتەکانی دیکەی ناوچە تێکبدات. بارزانی و هەندێ لە لایەنەکانی دیکە کە پشتیوانی لەو دەکەن بزووتنەوەی کورد بە بەشێک لە بزووتنەوەیەکی گەورەتر دەزانن، لەوانە هێزە غەیرە کوردەکانی عێراق کە جێگای رژیمی رادیکالی بەعس دەگرنەوە و دەوڵەتێکی میانەڕەو و ئاشتیخواز پێکدێنن.

٥- بە پێشبینیکردنی بڕیاری دەرچوونی پشتیوانی نهێنی بە کوردەکان لە لایەن ویلایەتە یەککگرتووەکانەوە، ئێمە چۆنیەتی ئەم پشتیوانییەمان تاوتوێ کردووەبەتایبەت گرنگتربوونی دابینکردنی چەک و تەقەمەنی و چەکی ئاسایی زیادەی دیکە بۆ ئەوەی کوردەکان بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن. تاوتوێکردنە سەرەتاییەکان نیشان دەدات کە چەک و تەقەمەنی پێویست بۆ ئەم مەبەستە لە بەر دەستماندا هەیە.

## پشتیوانی لە بارزانی: هەڵسەنگاندنێکی سەرەتایی

### تێڕوانینەکان

١- نوێنەرە کوردەکان لە گفتوگۆکانیاندا لەگەڵ نوێنەرانی ئێمە، پێداویستییە سیاسی، ماددی و هەواڵگرییەکانی خۆیان بە وردی خستووەتەڕوو. هەروەها کە ئێمە ئەم پێداویستیانە و رەوتی مامەڵەکردن لەگەڵ کوردەکان شی دەکەینەوە دەبێ ئاکام و ئەنجامەکانی پەرەپێدانی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ کوردەکان لەبەرچاو بگرین بۆ ئەوەی بە کەمترین مەترسییەوە بگەین بە ئامانجە خوازراوەکانمان.

هەندێ مەسەلە هەیە کە کار دەکاتە سەر ئاست و چۆنیەتی پشتیوانی ئێمە لە کوردەکان کە بریتین لە نیگەرانی بە نیسبەت پشتیوانی سۆڤیەت لە رژیمی عێراق و ئەرکەکانی حکوومەتی عێراق لە بەرامبەر سۆڤیەت بە گوێرەی پەیماننامەی نیسانی ١٩٧٢ و توانا سەربازی و پێداویستییەکانی کوردەکان و هەروەها کۆمەڵێک کێشەی دیکە وەک یەکنەگرتوویی خودی کوردەکان، دوژمنایەتی تورکیا لەگەڵ کوردەکان،

چۆنیەتی پەیوەندی ئەمریکا لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی و پشتیوانی ماددی و لوجستیکی لە مەلا مستەفا.

## هاوکاری رژیمی بەعس و سۆڤیەت دژی حکوومەتە میانەڕەوەکان و بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا

٢- هیچ گومان لەوەدا نیە کە بەرژەوەندی ئێمە و هاوپەیمانەکانمان و دەوڵەتە دۆستەکانی دیکەمان لە ناوچە لەوەدایە کە رژیمی بەعسی عێراق لاواز بێت و ئەگەر بکرێت بڕوخێت ئەگەر ئەم ئامانجە بێ زیادبوونی دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق یا پەرەسەندنی دژمنایەتییەکان تا ئاستێکی مەترسیداری نێونەتەوەیی دەستەبەر بێت.

٣- رژیمی عێراق نەتەنها بە سەرەڕۆیی خاک و خەڵکەکەی خۆی کونترۆڵ دەکات بەڵکوو لە لایەن ئیدوئۆلۆژی نیمچە مارکسیستی داگیرکەری ماجەراجوە پاڵی پێوە دەنرێت و چالاکییەکانی دژ بە دراوسێکانی و سەرجەم بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا لە کەنداو پەرەپێداوە. گروپی سەرکردایەتی بەعس بە سەرکردایەتی سەدام حسین التکریتی هەوڵیداوە رژیمی کوێت، بەحرەین و ئەماراتی یەکگرتووی عەرەبی بڕووخێنێت، هەروەها مەشقی بە خراپکارەکان و پیاوکوژەکان کردووە و ناردوونی بۆ ئەنجامدانی چالاکی دژی شا، و کەمینەی عەرەب و بەلووچی ئێرانی بۆ راپەڕین دژی حکوومەتی شا هان داوە. گروپی پیاوکوژەکانی بەعس کاری خۆیان بە سەرکەوتووویی لە کوێت و بەیروت ئەنجام داوە و هەوڵیان داوە یەکێ لە سەرۆک وەزیرەکانی پێشووی عێراق لە لوبنان بکوژن.

٤- لە کاتێکدا کە ئاوات و ئامانجەکانی بەعس تا ئێستا دوور بووە لە تواناییەکانی، پێشهاتەکانی ئەم چەند مانگی رابردووە نیشان دەدات کە ئەم رژیمە دەیەوێت بە جیدییەتییەکی زۆرترەوە بە شوێن ئاواتەکانیدا بچێت. لە ماوەی ئەم چەند مانگەدا یەکێتی سۆڤیەت قەسد و نیازی خۆی بە روونی ئاشکرا کردووە بۆ ئەوەی لەپێناو بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییە ستراتژیک و ئابوورییەکانی خۆی لە رۆژهەڵاتی

ناوەڕاست، رژێمی عێراق بەکار بهێنێت. هەرچەند کە گەلێ لە کردەوەکان و بانگەشەکانی پێشووتری سۆڤیەت ئێستا کەم بووەتەوە بەڵام ستراتژی سۆڤیەت بۆ کونترۆڵکردنی ناوچە و سەرچاوەکانی قەد ئەوەندەی ئەمڕۆ روون و ئاشکرا نەبووە.

٥- لە ٧ی نیسانی ١٩٧٢ سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت، "ئالێکسی کۆیسیگێن" لە رێورەسمی کردنەوەی بیری نەوتی "رومەیلا" لە باکووری عێراق کە بە یارمەتی تکنولۆژی زیاتر لە ٢٠٠ میلیۆن دولاری سۆڤیەت خراوەتە کار، قسەی کرد و بە ئەدەبیاتی پڕوپاگەندایی کومونیزم (کە لە شەڕی یەکەمی جیهانییەوە تا ئێستا شەڕاشۆیی پێدەکات) وتی وڵاتانی ناوچە دەبێ کۆتایی بە بەتاڵانچوونی نەوتەکەیان لە لایەن کومپانیا نەوتییەکانی کاپیتالیستەوە بهێنن و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە بزووتنەوە رزگاریخوازە نەتەوەییەکان توانیویانە کولونیالیستەکان ناچار بکەن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست (وەک شوێنەکانی دیکەی جیهان ) پاشەکشە بکەن. "کۆسیگێن" هەروەها بۆ پوچەڵکردنەوەی بانگەشەکانی کومپانیای نەوتی کاپیتالیست دەربارەی ئەوەی کە عەرەبەکان ناتوانن ئابووری خۆیان بەڕێوە بەرن، بەڵێنیدا کە دەوڵەتە سوسیالیستەکان یارمەتی بە عەرەبەکان بدەن تا دەستیان بگات بە پسپۆڕ و تکنسیەن و زانستوان بۆ ئەوەی گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن.

## پەیماننامەی دۆستی و هاوکاری سۆڤیەت و عێراق

٦- دوو رۆژ دواتر لە ٩ی نیسان لە بەغداد "کۆسیگێن" و سەرۆک کۆماری عێراق، احمد حسن البکر پەیماننامەی دۆستی و هاوکارییان واژۆ کرد کە بە گوێرەی رێوشوێنە بڵاوکراوەکانی پەیماننامەکە ئەم دوو دەوڵەتە لە کاتی هاتنەئارای مەترسی بۆ ئاشتی دەبێ لە لایەنی دیکە بەرگری بکات و هەردوو لا هاوکاری بەردەوامی یەکدی بکەن بۆ بەهێزترکردنی توانایی بەرگری خۆیان. ئەم شەرتومەرجانە عێراقی دڵنیا کردەوە کە ئەگەر لایەنێکی دەرەکی هێرشی بکاتە سەری یا لەگەڵ راپەڕینی ناوخۆیی رووبەڕوو بێتەوە، سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکات.

مادده‌ی ٩ی ئه‌م په‌یماننامه‌یه که په‌یوه‌ندی به به‌هێزترکردنی توانایه به‌رگرییه دوولایه‌نه‌کانه‌وه هه‌یه، رێگا خۆش ده‌کات بۆ زیادبوونی دامه‌زراوه و پێداویستییه ده‌ریاوانییه‌کانی سۆڤیه‌ت له به‌نده‌ره‌کانی عێراق له که‌نداو و ده‌ستڕاگه‌یشتنی زۆرتری سۆڤیه‌ت به سیستمی هه‌وایی عێراق. ئه‌م په‌یماننامه‌یه ئه‌و په‌یماننامه‌یه‌مان وه‌بیر دێنێته‌وه که یه‌کێتی سۆڤیه‌ت ٣٢ ساڵ له‌مه‌و به‌ر له‌گه‌ڵ ئاڵمانیای نازی مۆری کرد که تێیدا یه‌کێتی سۆڤیه‌ت رایگه‌یاند ئامانجه سه‌رزه‌مینیه‌کانی خۆی له باشووری قه‌ڵه‌مڕه‌وی نه‌ته‌وه‌یی خۆی به‌ره‌و ئاراسته‌ی ئوقیانووسی هیند ده‌باته پێش.

## پشتیوانی سۆڤیه‌ت له نیشتمانیبوونی IPC (کومپانیای نه‌وتی عێراق)

٧- که‌متر له دوو مانگ پاش لیدوانه‌کانی "کۆسیگێن" له "رومه‌یلا" و واژۆبوونی په‌یماننامه‌ی سۆڤیه‌ت و عێراق، حکوومه‌تی به‌عس له ١ی حوزه‌یرانی ١٩٧٢ رایگه‌یاند IPC (کومپانیای نه‌وتی عێراق- وه‌رگێڕ) خۆماڵی (نه‌ته‌وه‌یی) کردووه و کتوپڕ پاش ئه‌وه وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی عێراق به سه‌رۆکایه‌تی لێژنه‌یه‌ک چوو بۆ موسکۆ بۆ به‌ده‌ستهێنانی پشتیوانی سۆڤیه‌ت بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌ت و کومپانیا رۆژئاواییه‌کان له به‌رامبه‌ر عێراقدا دژکرده‌وه‌یان نیشان دا ئاکام و لیکه‌وته‌ی ئابووری (که شتێکی چاوه‌ڕوانکراو بوو) بۆ عێراق به‌دواوه نه‌بێت.

ئاژانسی ده‌نگوباسی TASSی سۆڤیه‌ت به توندی پشتیوانی له خۆماڵیبوونی IPC کرد و وه‌ک هه‌نگاوێک به‌ره‌و رزگاری عێراق له ده‌سه‌ڵاتی کاپیتالیزمی ده‌ره‌کی ناوزه‌دی کرد. له ٣ی حوزه‌یران رادیۆ موسکۆ شرۆڤه‌یه‌کی به زمانی فارسی بۆ ئێران بڵاو کرده‌وه که ده‌یگوت خۆماڵیبوونی IPC ده‌بێ ببێ به نموونه‌یه‌ک بۆ ئێران بۆ ئه‌وه‌ی چۆن له‌گه‌ڵ چالاکییه تالانکه‌رانه‌کانی کونسێرتیۆمی نیونه‌ته‌وه‌یی نه‌وت هه‌ڵسوکه‌وت بکات. رادیۆ سۆڤیه‌ت هه‌روه‌ها رایگه‌یاند: "ئه‌مڕۆ ده‌بینین دارایی و سه‌رمایه‌ی کومپانیای نه‌وتی ئیمپریالیست له عێراق خۆماڵی بووه و بێ گومان ئه‌مه دره‌نگ یا زوو له وڵاتانی دیکه‌ش روو ده‌دات. سۆڤیه‌ت و وڵاتانی سوسیالیستی دیکه پشتیوانی له خه‌باتی ره‌وای به‌رهه‌مهێنانی نه‌وتی وڵاتان ده‌که‌ن. ئه‌مه فاکتۆرێکی

گرنگە بۆ بەهێزبوونی پێگەی وڵاتان بۆ بەرهەمهێنانی نەوت. هیچ گومان لەوەدا نییە کە خۆماڵیبوونی IPC لە لایەن عێراقەوە پێگەی پاوانخوازە نەوتییەکانی ئیمپریالیست لە وڵاتانی دیکە لاواز دەکات و دەبێتە هۆی ئەوەی خەباتی خۆیان دژی ئەم پاوانخوازانە بەهێز بکەن". ( رادیۆ مۆسکۆ، بە زمانی فارسی بۆ ئێران، کاتژمێر ٩:٣٠ خولەک بە کاتی گرینویچ،٣ی حوزەیرانی ١٩٧٢).

## بزووتنەوەی کورد، کەندو کۆسپێک لە سەر رێگای بەعس و سۆڤیەت

٨- یەکێتی سۆڤیەت بە ئاشکرا گرنگییەکی زۆری بەوە داوە کە مەلا مستەفا بارزانی و هاوڕێکانی رازی بکات پەیوەست بن بە بەرەی نیشتمانی عێراق کە سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکات و حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق تێیدا بەشدارن. نوێنەرە کوردەکان و سەرچاوە سەربەخۆکانی خۆمان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم دواییانە کاربەدەستانی باڵای سۆڤیەت و لێژنەی ئاڵمانیای رۆژهەڵات لەگەڵ بارزانی دیداریان کردووە بۆ ئەوەی رازی بکەن پەیوەست بێت بەم بەرەیە. سۆڤیەت و بەعس بە روونی پەیان بەوە بردووە کە ئەگەر بارزانی لەمە زیاتر بتوانێت ناوچەیەکی سەربەخۆ لە باکووری عێراق بۆ خۆی رابگرێت، دەبێت بە هەڕەشەیەکی هەمیشەیی بۆ رژێمی دیکتاتۆری عێراق کە پێگەی لەناو خەڵکدا نییە .

٩- لە سەرەتا و ناوەڕاستی دەیەی ١٩٦٠ راپەڕینی کورد دەستی زۆربەی هێزەکانی سوپای عێراقی بەستبووەوە. ئەم بارودۆخە رێگای خۆش کرد بۆ کۆمەڵێک کودیتای سەرکەوتووی سەربازی و لە راستیدا توانایی عێراقی کەم کردەوە بۆ ئەوەی چالاکی سەربازی لە دەرەوەی عێراق دژی ئیسراییل، کوێت، ئۆردون و ئێران ئەنجام بدات. سەدام حوسەین تکریتی توانیویەتی کونترۆڵی سیاسی بەعس بە سەر سوپادا زیاد بکات. ئەگەر حکوومەتی عێراق ناچار بێت سۆپای خۆی بۆ خەباتێکی دیکە دژی کوردەکان وەگەڕ بخات بەهەرحاڵ پێویستی بە چەک و تەقەمەنی و سووتەمەنی زۆرتر دەبێت و دەبێت ئۆپەراسیۆنێکی گەورەتر ئەنجام بدات. ئەمە دەسەڵاتی حیزبی

بەعس بەسەر سوپا کەم دەکاتەوە و هەل دەڕەخسێنێت بۆ ئەوەی کودیتایەکی سەربازی ئەنجام بدرێت .

توێژینەوەکەی ئەم دواییانەی ئیدارەی لێکۆڵینەوەی هەواڵگری وەزارەتی دەرەوەی (ئەمریکا) نیشان دەدات ئەگەر بارزانی پشتیوانی دەرەکی وەکوو پێویست وەچنگ بخات بۆ ئەوەی شۆڕشەکەی هەڵبگیرسێنێتەوە، باری زیادەی شەڕێکی دیکەی کوردەکان دەتوانێت حکوومەتی بەعس بڕۆخێنێت .

١٠- رابردووی سیاسەتەکانی دەوڵەتی بەعسی عێراق نیشان دەدات کە ئەم دەوڵەتە بە وەرگرتنی پوان ئاشت نابێتەوە و تەنها کاتێ لە کردەوە دەستدرێژیکارانەکانی خۆی پاشگەز دەبێتەوە کە لە هەرەسهێنانی خۆی بترسێت و یا لە حاڵەتی بەرگریدا بمێنێتەوە .

١١- لە بارودۆخی ئێستادا کە رژیمی بەعس لەگەڵ کەمبوونەوەی جیدی داهات رووبەڕوو بووەتەوە و رێبەرایەتی سیاسی بەرێکخستنکراوی کورد هێشتا دەتوانێ لە بەرامبەر ئەم رژیمەدا رابوەستێت، لەوانەیە دوایین دەرفەت بۆ ئێمە ئەوە بێت کە پلانی ئۆپەراسیۆنێک دابڕێژین بۆ ئەوەی لانیکەم رژیمی بەعس زەلیل و ماندوو بکەین و یارمەتی بەوە بدەین کە بارودۆخێک بێتە ئاراوە کە تێیدا کەسانیک جێگای بەعس بگرنەوە کە کەمتر دوژمنی بەرژەوەندییەکانی ئێمە و دۆستەکانمان لە ناوچە بن.

ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کە ئەگەر شۆڕشی کورد هەڵبگیرسێتەوە رژیمی بەعس لەوانەیە ناچار بێت داوای پشتیوانی زۆرتر لە سۆڤیەت بکات و ئەگەر ئێمە پشتیوانی لە کوردەکان نەکەین و لە ئاکامدا بزووتنەوەی کورد لەناوبچیت بەهەرحاڵ کوردەکان ناچار دەبن پەیوەست بن بەو بەرە نەتەوەییە کە سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکات و لە ئەنجامدا رژیمی بەعس دەتوانێت بێ هیچ تەنگ و چەڵەمەیەک سیاسەتی دەستدرێژیکارانەی خۆی لە ناوچە درێژە پێبدات.

لە نێوان ئەم دوو رێگایەدا، وادیارە رێگای باشتر بۆ ئێمە ئەوەیە کە مەترسییەکانی زیندوومانەوەی بزووتنەوەی کورد قبوڵ بکەین .

٦٢- له روانگەی ئێمەوە باشتر ئەوەیە تا ڕادەی پێویست بارزانی تەشویق بکەین و پشتیوانی لێبکەین بۆ ئەوەی مەحتاجی حکوومەتی عێراق نەبێت و پێش لەوە بگرێت سوپای عێراق سەرەنجام کونترۆڵی سەربازی ناوچە کوردنشینەکان بگرێتە دەست، کەوابوو هەتا کاتێک کە ناوچەی پارێزراوی کورد هەبێت کەسایەتییە ناڕازییەکانی ناو سوپا و گۆڕەپانی سیاسی عێراق لەوە بێ هیوا نابن کە ڕۆژێ بتوانن ڕژیمی عێراق بڕوخێنن. هەروەها مانەوەی بزووتنەوەی کورد (تەنانەت ئەگەر تەنها لە ئاستی بەرگریشدا بێت) توانایی ڕژیمی عێراق بۆ ئەوە سنووردار دەکات کە چالاکی زیادەخوازانە دژی ئێران، ئۆردون و کەنداو ئەنجام بدات .

## ئەگەری هێرشی ئەم زووانەی عێراق بۆ سەر بارزانی

٦٣- سەرەڕای هیوادارببوون بە ئەنجامدانی هێرشێکی سەرەکی دژی عێراق، بارزانی ئێستا باش دەزانێت کە تا کاتێک چەکی دژە هەوایی و چەک و تەقەمەنی بەرگریکارانەی وەکوو پێویست لە دەستدا نەبێت بە قازانجی نییە ئۆپەراسیۆنێکی هێرشبەرانە ئەنجام بدات چونکە دەبێتەهۆی ئەوەی ڕژیمی عێراق لە بەرامبەردا هێرشی هەوایی و زەمینی بکاتە سەر شار و گوندەکانی کوردەکان .

٦٤- بەهەرحاڵ خواستی بارزانی بۆ ئەوەی کردەوەی سەربازی ناوەخت دژی ڕژیمی عێراق ئەنجام نەدات نابێتە هۆی ئەوەی کە بەعس لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا متمانەی پێبکات. SAWAK (ڕێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران) کۆمەڵێک ڕاپۆرتی لە دەستدایە کە نیشان دەدات سوپای عێراق ئەم دواییانە لە دەوروبەری موسل و کەرکووک مەشقی بە سەربازە پەڕاشۆتڤانەکان (چەتربازان) کردووە و دووجار جەولەی هەوایی لە سەر بارەگای سەرکردایەتی بارزانی لە ناوچەی حاجی عومەران ئەنجام داوە. بارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە سوپای عێراق حەتمەن هێرش دەکات و فەرمانی بە خەڵکەکەی خۆی داوە تەقە لە فڕۆکەکان بکەن.

چاپەمەنی و ڕادیۆی عێراق خەباتیکی بەرفراوانی لە ماوەی هەفتەی ڕابردوودا بەڕێوە بردووە و بانگەشەی ئەوەی کردووە گرووپێکی ٣٠ کەسی (کە ١٥ کەسیان کورد بوونە)

له پیکدادانێکدا له ۳ی تەموز له ناوچەی سنجار له باکووری رۆژئاوای عێراق دەستگیر کراون که بەکرێگیراوی داردەستەکانی ئیمپریالیزم و کومپانیا نەوتە پاوانخوازەکان بوونه و ئەمه یەکێ له ئاڵقەکانی زنجیرە پیلانگێڕییەکان دژ بە عێراق بووە .

هەروەها لەوانەیه بە هۆی ئەوەی که بارزانی له هەندێ له دەوڵەتەکان نزیک بووەتەوە، یەکێتی سۆڤیەت و بەعس له هەوڵەکانی بارزانی بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکا ئاگادار ببنەوە که ئەمەش بەریانی سۆڤیەت و بەعس زیاد دەکات بۆ ئەوەی کردەوەی پێویست دژی بارزانی ئەنجام بدەن پێش لەوەی بارزانی بتوانێت پێگەی خۆی قایم بکات .

## پێویستیی بارزانی بە یارمەتی دەستبەجێ و درێژخایەن

۱۵- بارزانی له راستیدا هیچ رێگایەکی نییه جگه لەوەی که بەرگری له خۆی بکات و بۆ زیندوومانەوەی بزووتنەوەکەی خەبات بکات، کەوابوو بە زووترین کات پێویستی بە تەقەمەنی هەیه بۆ ئەو چەکانەی که پێشتر هەیبووە و هەروەها پێویستی بە جۆرە چەککەلێکی دیکه هەیه که کوردەکان پێشتر بەکاریان هێناوە. ئەم پێداویستییه بە پەلەیه دەبێ بە شیوازگەلێک و له ریگاگەلێکەوە تەسلیم بە کوردەکان بکرێت که بە زووترین کات بەدەستیان بگات و تا ئەو شوێنەی که دەکرێت نهێنی بێت .

۱٦- ئەگەر بارزانی لەگەڵ هێرشی کتوپڕی عێراق رووبەڕوو نەبێتەوە، ئێمه گرنگی دەدەین بە دابینکردنی پێداویستییه درێژخایەنەکانی بارزانی له چوارچێوەی سێ ئیستراتژی ئاڵترناتیڤدا که نوێنەرانی بارزانی خستوویانەتەڕوو. ئەم نوێنەرانه پێداویستییه ماددی وسەربازییەکانیان له سێ پلاتفۆرمدا گونجاندووە که بریتین له "بەرگری، هێرش و شۆڕشگێڕانه" .

۱۷- بە وتەی نوێنەرە کوردەکان یەکەم جۆری پێداویستییەکان واتا "پلاتفۆرمی بەرگری" دەبێ ئەوەندە زیاد بێت که بزووتنەوەکەیان بتوانێ بارودۆخی ئێستا

رابگرێت و له بەرامبەر گوشارە سیاسی، ئابووری و سەربازییەکانی بەعسدا رابوەستێت .

١٨- یارمەتییەکانی جۆری دووەم واتا "پلاتفۆرمی هێرش" کە بارزانی زۆرتر جەختی لە سەر دەکاتەوە دەبێ هەم ماددی و هەم سەربازی بێت بۆ ئەوەی کوردەکان بتوانن نەتەنها شوێنەکانی خۆیان رابگرنَ بەڵکوو رژێمی بەعس ئەوەندە زەلیل و ماندوو بکەن کە ئیدی نەتوانێت هەڕەشەی سەربازی یا خراپکارانە لە دراوسێکانی و لە بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا بکات. پرۆژەی بارزانی بۆ یارمەتی ماددی و پێداویستی سەربازی شتێکی یەکلاییکەرەوەیە بۆ چالاکییەکانی نێو ئەم پلاتفۆرمە .

١٩- جۆری سێیەمی یارمەتییەکان واتا "پلاتفۆرمی شۆڕشگێڕانە" ئەوەیە کە وەک بنکەیەکی ئارام کەڵک لە کوردستان وەربگیردرێت بۆ ئەوەی لە رێگای هاوکاری هێزە عێراقییەکانی دژبەری رژێمی بەعس، هەوڵ بدرێت بۆ رووخاندنی ئەم رژێمە. نوێنەرە کوردەکان رایانگەیاند کە بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکییە پێویستیان بە تۆزێ یارمەتی زۆرتر (لە چاو یارمەتییەکانی پلاتفۆرمی دووەم) هەیە و دەبێت یارمەتی ماددی بدرێت بە هاوکارە عەرەبەکانیان.

٢٠- لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دەربارەی جۆری ئەو چەک و تەقەمەنییەی کە کوردەکان بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکانی پلاتفۆرمی یەکەم و دووەم پێویستیان پێیەتی، ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە کوردەکان کۆمەڵێک بیروڕای ناواقعبینانەیان هەیە دەربارەی کردەوە سەربازییەکان و جۆری ئەو چەکانەی کە دەتوانن بەکاری بهێنن. بۆ نموونە داوای تانک دەکەن بۆ ئەوەی لە دەرەوەی ناوچە شاخاوییەکان واتا لە ناوچە دەشتەکاندا بە کاری بهێنن. کوردەکان دەیانەوێت ئەوەمان پێبڵێن کە دەتوانن وەک شەڕی ئاسایی نێوان دوو سوپا لەگەڵ سوپای عێراق شەڕ بکەن. کوردەکان هەروەها داوای بنکەیەکی لوجستیک لە ئێران دەکەن وەک ئەوەی ڤیەتنامی باکوور بۆ "ڤییەتکۆنگەکان"[٢٥٣] دابینی کردووە. بەهەرحاڵ

---

[٢٥٣] ڤییەتکۆنگ ناوی رێکخراوی گریلایی چەکدارانی چالاکی کۆمۆنیستیٰ ڤییەتنامی باشوور بوو کە لە کاتی شەڕی ڤییەتنام و دەستدرێژی ئەمریکا بۆ سەر ئەم وڵاتە دژی هێزەکانی ئەمریکا و ئەو

خۆشبەختانە نوێنەرە کوردەکان دانیان بەوەدا ناوە کە پێویستیان بە راوێژی سەربازی هەیە .

٢١- ئازموونەکانی رابردوو ئەوە دەسەلمێنێت کە کوردەکان زۆر باش دەتوانن لە بەرامبەر سوپای عێراقدا رابوەستن ئەگەر باش خۆیان لە ناو شاخەکاندا بشارنەوە و تاکتیکگەلی هێرشبەرانەی پێشمەرگایانە ئەنجام بدەن و لە گەلێ شوێنەوە زەبر لە هێزەکانی عێراق بوەشێنن و لاوازیان بکەن. بەهەرحاڵ کوردەکان بە هۆی ئەوەی کە هیچ پشتیوانییەکی هەواییان نییە و چەکی گران و تۆپخانەی قورسیان لە دەستدا نییە ناتوانن پێش لە بومبارانی شار و گوندەکانیان لە لایەن سوپای عێراقەوە بگرن یا لە هاویندا کە جادەکان دەکرێنەوە ناتوانن رێگا لە ناردنی بەتالیونی زرەیی بگرن کە هێرش دەکەنە سەر ئەو گوندانەی کە لە قەراخ جادە سەرەکییەکاندان. کوردەکان بە چەکی سووک لەملاولاوە لە هەوراز و دۆلەکان جموجۆڵ دەکەن لە کاتێکدا کە سوپا بە چەکی قورس و ئۆتۆمۆبێل تەنها لە سەر بۆ خواری جادەکان دەچێتە پێش. سوپا ناتوانێت لە گەردەنە بەرزەکاندا لەملا بۆئەولاو و لەم هەوراز بۆ ئەو هەوراز جموجۆڵ بکات .

## دەوری هێزە غەیرە کوردەکان لە دژایەتیکردنی رژێمی بەعس

٢٢- کوردەکان بۆ خۆیان دەڵێن بە تەنهایی ناتوانن رژێمی بەعس بڕوخێنن و پێویستە هێزی دیکەش بێتە نێو کایەکە بۆ ئەوەی زۆرترین گوشار بخرێتە سەر بەعس .

٢٣- داوا دەکەین ئەو کەسایەتی و گروپانە بدۆزرێنەوە کە پێشتر دژایەتی رژێمی بەعسیان کردووە یان دەکرێت ئێستا دژی ئەم رژێمە هان بدرێن، و ئەوە دیار بکرێت چ جۆرە دوژمنایەتییەک لە گەڵ بەعسیەکان زۆرترین سوودی دەبێت.

---

دەوڵەتەی کە ئەمریکا لە ڤییەتنامی باشوور دایمەزراندبوو، شەڕیان دەکرد و ساڵی ١٩٦٠لەگەڵ چەند رێکخراوی سەربەخۆخوازی دیکە لە بەرەی رزگاریدەری نەتەوەیی ڤییەتمین کۆبوونەوە و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٥ شکستێکی گرانیان بەسەر ئەمریکادا سەپاند. (وەرگێڕ)

٢٤- لەم پەیوەندییەدا دەبێ لە سەر سێ گروپ حیساب بکرێت: بەعس بۆ خۆی، سوپا و نەیارە سیاسیەکانی دانیشتووی تاراوگە .

٢٥- راپۆرتەکانی ئێمە نیشان دەدات ئێستا کۆمەڵێک ناکۆکی هەیە لە نێوان سەرۆک کۆمار "البکر" و پیاوی بەهێزی حیزبی بەعس واتا سەدام حوسەین تکریتی. ئەمە بەرچاوڕوونیەکە کە دەتوانین کەڵکی لێوەربگرین. هەروەها کۆمەڵێک بواری ناڕازیبوونی دیکە لە ناوخۆی بەعسدا هەیە بۆ نموونە پێگەی زۆر بەرزی ئەندامانی ئیدارەی پەیوەندییە گشتییەکانی ناو حیزبی بەعس و ناکۆکی نێوان باڵی سەربازی و مەدەنی ئەم حیزبە. ئێمە زانیاری وردمان لەم پەیوەندییەدا لە دەستدا نییە .

٢٦- پاکتاوکردنەکانی ئەم دواییانەی کەسایەتییە گومانلێکراوەکانی ناو سوپا لە لایەن حیزبی بەعس بووەتە کەندو کۆسپ لە سەر ڕێگای ئەوەی کە بزانین چ کەسانێک لە ناوە ئەفسەرانی سوپادا لە ڕژیمی بەعس دەترسن و لێی بێزارن. جارێکی دیکە دووپاتی دەکەینەوە کە ئێمە زانیاری زۆرمان لەم پەیوەندییەدا لە دەستدا نییە .

٢٧- ئێمە زانیاری زۆرمان هەیە دەربارەی گروپە سیاسیە نەیارەکانی عێراق کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتن کە هەندێکیان رابردووی پیلانگێڕی سەرنەکەوتوویان دژی ڕژیمی عێراق هەیە. هەروەها ئێرانیش لە رابردوودا هەوڵیداوە کودیتایەک لە عێراق هان بدات بەڵام سەرنەکەوتووە .

٢٨-دەبێ بە خیرایی و بە شێوازی سیستماتیک سەرجەم هێزە غەیر کوردەکانی نەیاری ڕژیمی عێراق بدۆزینەوە کە دەتوانن لەم پەیوەندییەدا چالاکی بکەن.

## چۆنیەتی دابینکردنی پشتیوانی لۆجستیکی بۆ بارزانی

٢٩- لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو چەکانەی کە ئێستا لە دەستماندایە و لەوانەیە دابین بکرێت بۆ کوردەکان، ئێمە دەبێ زۆر گرنگی بدەین بەو چەک و تەقەمەنییە کە پێشتر لە دەستی کوردەکاندا بووە، پاش ئەوەش دەبێ گرنگی بدەین بە چەکی دژە هەوایی و دژی تانک لەوانە مین و ڕۆکێت کە بە ئاسانی لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە دەگوازریتەوە. فاکتۆری گوازتنەوە نیشان دەدات کە ئێمە دەبێ مۆچیاری

کوردەکان بکەین لە باتی ئەوەی توانایی خۆیان بۆ بەکارهێنانی تۆپ بە شێوازی شەڕی نێوان دوو سوپا زیاد بکەن، پشت بە رۆکێت و هاوەن ببەستن.

٣٠- وتەبێژی نوێنەرە کوردەکان ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەگەر کوردەکان بکەونە ناو "پلاتفۆرمی هێرش" دەتوانن ژمارەی هێزی پێشمەرگە تا ٦٠ هەزار کەس زیاد بکەن بەڵام ئێستا تەنها ٢٤ هەزار پێشمەرگەیان هەیە کە ١٤ هەزاریان پارێزەری سنوور و پۆلیسن کە حکوومەت موچەیان دەداتێ و ١٠ هەزاریان سەر بە یەکێنەی سەربەخۆی پێشمەرگەن. لۆجستیکی پێویست بۆ دابینکردنی پێداویستی ئەم ٦٠ هەزار کەسە کاریکی ئەستەمە .

دەستڕاگەیشتن بەم ناوچەیە لە رێگای جادە لە ئێرانەوە زەحمەتە و گوازتنەوەی پێداویستییەکان لەرێگای هەواییەوە لە دەرەوەی توانایی ئێرانە و نهێنیپارێزی مەسەلەکەش دەخاتە ناو مەترسی و پاشان بە ئاسانی حاشای لیناکرێت .

٣١- ئێمە دەبێ لە بیرمان بێت کە داواکاری کوردەکان بۆ (رەش کراوەتەوە) بۆ بەڕێوەبردنی "پلاتفۆرمی هێرش" تەنها بۆ ئەوەیە کە موچەی پێشمەرگە و یارمەتی بێوەژن و هەتیوەکانی پێ دابین بکرێت و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و پەروەردەی پێ بەڕێوەبچێت. لە کردەوەدا بۆ پشتیوانیکردن لە حکوومەتی کورد دەبێ لە بودجەدا یارمەتییەکی بۆ تەرخان بکرێت. ئەم یارمەتییە خەرجی شەڕ واتا دابینکردنی چەک و تەقەمەنی و ئامرازەکانی پەیوەندیگرتن لەخۆ ناگرێت .

ئەگەر مەسەلەی پەیماننامەی دۆستی و هاوکاری سۆڤیەت و عێراق راستەوخۆ بێتە مەیدان، سۆڤیەت یارمەتی بەرفراوانی دەرەکی بە کوردەکان پشتگوێ ناخات و بۆی گرنگ نییە چەندە رەچاوی پەیوەندییە هەستیارەکانی خۆی لەگەڵ شای ئێران بکات. سۆڤیەت حیسابێکی زۆری بۆ پێگەی خۆی لە عێراق کردووە و ئامادە نییە لە دەستی بدات، رژێمی بەعسیش تا ئێستا بە قەد ئەمڕۆ پوانی بە سۆڤیەت نەداوە. پەیماننامەی سۆڤیەت -عێراق (تەنانەت ئەگەر هیچ شەرتومەرجێکی نهێنیشی تێدا نەبێت) رێگای خۆش کردووە بۆ دەستێوەردانی سۆڤیەت لە کاتی پێویستی خۆیدا بۆ لەسەر دەسەڵات مانەوەی رژێمی ئێستای عێراق .

٣٣- کەوابوو ئێمە لە کاتی گفتوگۆی زۆرتر لەگەڵ نوێنەرانی بارزانی دەبێ چاوەڕوانیەکانیان لە ئاستی واقیعدا قبوول بکەین و ئەوەندە یارمەتییان بدەین کە پاشان بتوانین حاشای لێبکەین و مۆچیاریان بکەین هیچ کردەوەیەک ئەنجام نەدەن کە ببێتە هۆی ئەوەی بەربەرەکانیەکی نێونەتەوەیی بێتە ئاراوە .

٣٤- چۆنیەتی دابینکردنی پشتیوانیَ سەربازی و ماددی بۆ کوردەکان بەوە گرێدراوە کە ئێمە چەندە دەمانەوێت ئەم یارمەتییە نهێنی بێت و چەندە دەمانەوێت کوردەکان لە رووی سەربازییەوە بە توانا بن و دەمانەوێت بە چ ئامانجگەلێک بگەین .

٣٥- بەپێچەوانەی دابینکردنی چەک و تەقەمەنی، ئێمە دەتوانین راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە کەمترین گیروگرفت (لە رووی نهێنیپارێزییەوە) یارمەتی ماددی بۆ کوردەکان دابین بکەین. هەروەها بە قازانجی ئێمەیە کە لە سەر بنەمای کۆمەڵێ هۆکاری ئەمنی و هەروەها بۆ ئەوەی هەستی بەشداری ئێران لەم رەوتەدا بەهێزتر بکەین هەندێ یارمەتی ماددی زیادەش بدەین بە ئێران. هەروەها بە سوودی ئێمەیە کە راستەوخۆ برێک پارە بدەین بە خودی کوردەکان بۆ ئەوەی دەسەڵاتمان بە سەریانەوە هەبێت و هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین لە لایەن خۆمانەوە کونترۆڵیان بکەین و لە رووی هەواڵگرییەوە بیانخەینە خزمەت خۆمان .

ئێمە دەتوانین میکانیزمەکانی بەدەستهێنانی ئەم برە پارەیە و تەسلیمکردنی بە کوردەکان لە عێراق و شوێنەکانی دیکە تاوتوێ بکەین .

٣٦- دابینکردنی چەک وتەقەمەنی مەسەلەیەکی دیکەیە و ئێمە بە نوێنەرە کوردەکانمان وتووە کە زۆربەی یارمەتییەکانی ئێمە دەبێ لە لایەن لایەنی سێیەمەوە تەسلیم بە کوردەکان بکرێت. ئێران بە هۆی هەڵکەوتی جوگرافیایی دەتوانێت ببێت بە واسیتەیەکی سەرەکی لە رەوتی تەسلیمکردنی چەک بە کوردەکان (رەش کراوەتەوە – وەرگێڕ).

## ئاسایش و نهێنیپارێزی

لە بەرنامەکەماندا ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین بەو پەڕی ئاسایش و نهێنیپارێزییەوە کار بکەین. بەهەرحاڵ بە هۆی ئەوەی کە چەند لایەنێک لەم بەرنامەیەی ئێمەدا بەشدارن ناتوانین بە تەواوی نهێنی مەسەلەکە بپارێزین و لەوانەیە ڕۆژێک بێت حاشا لە بوونی بەرنامەیەکی وەها بکەین.

کوردەکان لە ناوخۆیاندا زۆر نایەکانگیرن و ڕێکخراوە هەواڵگرییە کارزانە بیانییەکان دەتوانن دزەیان تێدا بکەن و نهێنییەکانیان لێ بدزنەوە. هەروەها هەندێ لە لایەنەکانی سێیەمی ئەم ڕەوتە لەوانەیە نهێنیەکان بدرکێنن. بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئێمە پێشتر لە لایەن ڕژیمی عێراقەوە بەوە تۆمەتبار کراوین کە یارمەتی بە دوژمنەکانی دەدەین، دەبێ زۆر ئاگاداری ئەوە بین کە هیچ بەڵگە و نیشانەیەک نەکەوێتە دەستی لایەنی بەرامبەر بۆ ئەوەی دژی ئێمە کەڵکی لێوەربگرێت. ئەم ڕەوتە دەبێ بەردەوام بێت، تەنانەت ئەگەر بڕیاریشماندا هیچ کارێک نەکەین.

٣٨- لە پەیوەندی لەگەڵ بانگەشەکانی ڕژیمی عێراق، بۆ نموونە لە تەموزی ١٩٧٢ ڕادیۆ بەغداد لە پەخشی ناوخۆی عێراقدا، شرۆڤەیەکی بڵاو کردەوە کە تێیدا هێرشی کردە سەر سەفەرەکەی بەڕێز ڕاجێرز، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وەک ئاڵقەی زنجیرە کردەوەگەلێکی گوماناوی بۆ پیلانگێڕی دژی نەتەوەی عەرەب لە قەڵەمیدا، بەتایبەت بە هۆی ئەوەی کە عێراق سامانی نەوتی خۆی لە ١ی حوزەیران ئازاد کردووە. ڕادیۆ بەغداد سەردانەکەی سەرۆک کۆمار نیکسۆن بۆ تارانی لە مانگی گوڵان وەک ئاڵقەیەکی گوماناویی دیکەی پیلانەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی وەسف کرد و ڕووداوەکەی ناوچەی سنجار لە باکووری عێراق لە ٣ی تەموزی بە کردەوەیەکی تاوانبارانە لەقەڵەمدا کە لەلایەن ئیمپریالیزم و داردەستەکانی کومپانیا نەوتییەکانەوە پیلانی بۆ داڕێژراوە.

## دەستێوەردانی سۆڤیەت

٣٩- ئەگەری ئەوە زۆرە کە سۆڤیەت بۆ پشتیوانی لە رژێمی بەعس دەستێوەردانی زۆرتر بکات ئەگەر شەڕی رژێمی عێراق لەگەڵ کوردەکان دەستپێبکاتەوە یا تەنانەت ئەگەر حکوومەتی عێراق پێشبینی ئەوە بکات کە شەڕەکە هەڵدەگیرسێتەوە. سۆڤیەت ئێستا پێگەیەکی گەورەی لە عێراق هەیە کە لەراستیدا جێپێکەی دەگەڕێتەوە بۆ خولی دەسەڵاتداری عبدالکریم قاسم لە ١٩٥٨-١٩٦٣. بە پێچەوانەی ئەوەی رژێمی بەعس لە سەرەتای گەیشتن بە دەسەڵات لە شوبات- تشرینی دووەمی ١٩٦٣ دژی کومونیزم بوو و کەندوکۆسپی بۆ سۆڤیەت دروست دەکرد، لە ساڵی ١٩٦٨ تا ئێستا دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراق زۆر پەرەی سەندووە و بە واژۆبوونی هاوپەیمانییەکەی نیسانی ١٩٧٢ گەیشتە ئەوپەڕی خۆی .

٤٠- لە کاتی رووخانی حکوومەتی پاشایەتی لە تەموزی ١٩٥٠ تا ئێستا سۆڤیەت زۆرترین یارمەتی سەربازی و ئابووری بە ئەماراتی یەکگرتووی عەرەبی و پاش ئەوە بە عێراق داوە. تەنانەت لە مانگەکانی پاش کودیتای بەعس لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ دژی قاسم کە بەعس سەدان کەس لە شیوعییەکانی لەسێدارەدا و سۆڤیەت بزووتنەوەکەی بەعسی بە فاشیست ناوزەد کرد، سۆڤیەت کۆتایی بە دەستێوەردان لە سوپای عێراق و تەواوکردنی ئەو پرۆژە ئابووریانە نەهێنا کە دەستی پێکردبوو. سۆڤیەت مەزەندەی ئەوەی دەکرد کە هێدی هێدی هەر حکوومەتێک لە عێراق بگات بە دەسەڵات پێویستی بە هاوکاری سۆڤیەت دەبێت بۆ دابینکردنی تەقەمەنی و پۆشتە کردنی سوپا و هێزی هەوایی خۆی و هیچ رێگایەکی دیکەی نابێت جگە لەوەی کە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سۆڤیەت تا ئاستی هاوکاری پەرەپێبدات. هەڵسەنگاندنەکەی سۆڤیەت راست بوو. حکوومەتی یەکەمی بەعس و ئەو حکوومەتە غەیرە بەعسی و رادیکاڵانە کە پاش بەعس بە دەسەڵات گەیشتن، رۆژبەرۆژ زیاتر مەحتاجی یەکێتی سۆڤیەت بوون .

٤١- خێراتربوونی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراق لە سەرەتای ئەم ساڵ بووەتە مایەی نیگەرانی تایبەتی ئێمە. سۆڤیەت پاش ئەوەی کە پارە و زانستی تەکنیکی دا بە عێراق بۆ ئەوەی نەوتی ڕۆمەیلای باکوور بەرهەم بهێنێت، پێگەی خۆی لە ڕێگای پەیماننانەی دۆستی و هاوکاری ٩ی نیسان لە عێراق بەهێزتر کردووە. بە گوێرەی ٣ مادده لەم پەیماننامەیە:

ماددەی ٨: لە کاتی هاتنەئارای هەر بارودۆخیکی نائاساییدا کە ببێتە هەڕەشە بۆ ئاشتی، هەردوولا دەستبەجێ دەبێ پەیوەندی لەگەڵ یەکدی بگرن بۆ ئەوەی هەڵوێستەکانی خۆیان هاوئاهەنگ بکەن بۆ ئەوەی بەرەنگاری مەترسییەکە ببنەوە و ئاشتی جێگیر بکەنەوە .

ماددەی ٢: لە پەیوەندی لەگەڵ ئاسایشی هەردوو وڵات، عێراق و سۆڤیەت درێژە دەدەن بە هاوکارییەکانیان بۆ بەهێزترکردنی توانایی بەرگری لە یەکدی.

ماددەی ١٠: هەردوو لا ڕادەگەیەنن کە ناچنەناو هیچ هاوپەیمانییەک یان بەشداری ناکەن لە هیچ گروپ یا چالاکی یا کردەوەیەک کە دژی لایەنی دیکە بێت. هەروەها هیچکام لە لایەنەکان نابێ ڕێگا بەوە بدەن کە کەڵک لە خاکی وڵاتەکەیان وەربگیردرێت بۆ ئەنجامدانی هەر کردەوەیەک کە زیانی سەربازی بۆ لایەنی دیکە هەبێ.

٤٢- سۆڤیەت چالاکانە هەوڵ دەدات پەیوەندییەکانی ڕژیمی بەعسی عێراق و ڕژیمی بەعسی سوریا ئاسایی بکاتەوە (ڕژیمی بەعسی سوریا توندترین دوژمنی ڕژیمی بەعسی عێراق بووە لە سەروبەندی خەباتی نەپساوەی ئەم دوو لایەنە بۆ گرتنەدەستی حیزبی بەعس). سۆڤیەت هەروەها هەوڵ دەدات پەیوەندییەکانی عێراق و ئەماراتی یەککگرتووی عەرەبی باشتر بکات. ئەم دوو وڵاتە هەوڵ دەدەن هاوپەیمانییەک لە نێوان گروپە سیاسییەکانی عێراق (لەوانە شیوعیەکان و ناسیونالیستە پێشووکانی لایەنگری جمال عبدالناسر) لە بەرەیەکی نیشتمانیدا بە ڕێبەرایەتی بەعس کۆ بکەنەوە. سۆڤیەت (لەوانە خودی "کۆسیگێن"ی وەزیری دەرەوە) هەوڵیداوە بارزانی ڕازی بکات بچێتە ناو ئەم بەرەیە. ئەم هەوڵانەی سۆڤیەت

نیشان دەدات کە بۆ ئەم دەوڵەتە زۆر گرنگە رژیمی بەعس (کە زۆر ڕێگای داوە بە دەسەڵاتی سۆڤیەت و زۆر بەپەرۆشە هێرش بکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا لە ناوچە) بەهێز بێت.

٤٣- SAWAK (ڕێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران) راپۆرتی داوە کە ئێستا ئەفسەران و راوێژکارانی سۆڤیەت مەشق بە پەرەشۆتڤانانی (چەتربازان) عێراق لە نزیکی موسل و کەرکووک دەکەن. لە کاتی شەڕی ناوخۆی یەمەن کە سەربازانی کۆماریخوازی حکوومەت (کە سۆڤیەت پشتیوانی لێدەکردن) کەوتنە ژێر گوشاری توندی هێزەکانی لایەنگری پاشایەتی، سۆڤیەت فڕۆکە و فڕۆکەوانی ناردە یارمەتی سەربازانی لایەنگری حکوومەت. هەروەها فڕۆکە و فڕۆکەوانانی سۆڤیەت لە ئەماراتی یەکگرتووی عەرەبی وەگەڕ خران واتا ئەو کاتە کە میسر کەوتبووە ژێر کاریگەری هێرشە قووڵەکانی ئیسرایيل. کەوابوو ئەگەر سۆڤیەت هەست بکات رژیمی بەعس لەگەڵ هەڕەشەی جیددی ڕووبەڕوو بووەتەوە، دوور نییە هەندێ هێز (تەنانەت هێزە کوردە بەکرێگیراوەکان) بنێرێت بۆ یارمەتیدانی بەعس و پاراستنی بەرژەوەندی سۆڤیەت لە عێراق.هەروەها لەوانەیە سۆڤیەت دەست بکات بە خەباتێکی سیاسی، دیپلۆماتیک و پڕوپاگەندایی بۆ پشتیوانی لە هاوپەیمانە عێراقییەکەی.

٤٤- لەوانەیە سۆڤیەت دووری بکات لە بەربەرەکانی لەگەڵ ئێران چونکە نایەوێت ئەو قازانجانە بخاتە ناو مەترسی کە لەم ساڵانەی دواییدا لە شا بەدەستی هێناوە. بەهەرحال لەوانەیە سۆڤیەت لای خۆی وا حیساب بکات کە دەتوانێ شا بترسێنێت و مەزەندەی ئەوە بکات کە تەنانەت ئەگەر شا لە هەڕەشەی دەستێوەردان یان هەڕەشەی راستەقینەی سۆڤیەت بترسێت، دەستەوەستانتر دەبێت لە بەر ئەوەی کە هاوپەیمانە ئەمریکاییەکەی نایەوێت یا ناتوانێت لە لایەن ئەوەوە لەگەڵ سۆڤیەت بەربەرەکانی بکات .

٤٥- ئەگەر لە ئەنجامی هەڵگیرسانەوەی شەڕی کورد و حکوومەتی عێراق، سۆڤیەت سەرباز بنێرێتە یارمەتی حکوومەتی عێراق یا بەعس هەست بکات وەکوو پێویست لە لایەن دوژمنە دەرەکییەکان وەک ئێران هەڕەشەی لێدەکرێت لەوانەیە رژیمی عێراق

داوا لە سۆڤیەت بکات بۆ ماوەیەکی نادیار لە ناو خاکی عێراقدا بمێنێتەوە. بوونی هێزی زەمینی و دەریایی سۆڤیەت لەناوخۆی عێراق (ئەگەر بە قەد ئەو هیزانە بێت کە لە میسر هەیەتی) دەبێتە هۆی ئەوەی کە شیوعییەکان پشت ئەستوور بن و دەسەڵات لە بەعس بسێننەوە. ئێستا سۆڤیەت گوشار دەخاتە سەر هەموو لایەنەکان تا بچنە نێو بەرەی نیشتمانی. پەیماننامەی سۆڤیەت و عێراق و بەرەوپێشچوونی بارودۆخەکە لەوانەیە لایەنەکانی دیکە هێدی هێدی بخاتە ناو کایەی دەسەڵات واتا سەربازیچێتی سۆڤیەت.

٤٦- لایەنی"تورکیا"ی ئوپەراسیونە پێشنیارکراوەکە بۆ یارمەتیدانی کوردەکان پێویستی بە لێکدانەوەی زۆرتر هەیە. لە راستیدا تورکەکان بەنیسبەت هەرچەشنە سەرهەڵدانێکی ناسیونالیزمی کورد لە وڵاتەکەیان زۆر هەستیارن. سێ میلیۆن کورد (کە دەکاتە نیوەی نفووسی کوردەکانی جیهان) لە تورکیا دەژین. هەرچەند کە کوردەکان بە توندی لە لایەن حکوومەتی تورکیاوە سەرکووت دەکرێن و ئێستا پێیان دەڵێن "تورکی شاخاوی" بەڵام تورکیا هیشتا وەک هەڕەشەیەکی جیدی لە سەر سەقامگیری ناوخۆ و یەکپارچەیی خاکی خۆی سەیری کوردەکان دەکات. سەرەڕای ئەوەی تورکیا لە رژیمی بەعس و هاوپەیمانییەکەی لەگەڵ سۆڤیەت بێزارە بەڵام ناسیونالیزمی چەکداری کورد لە بەعس بە مەترسیدارتر دەزانێت بۆ ئاشتی و ئاسایشی خۆی. لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٧٠ کاتێک کە سەرۆک کۆماری عێراق، حسن البکر سەردانی ئانکارای کرد دەربارەی کێشەی کورد لەگەڵ رێبەرانی تورکیا راوێژی کرد. تورکەکان لە سەر ئەوە هاوڕان کە ئامانجی کوردەکان ئەوەیە بەرەبەرە کوردستانی گەورە لە نێوان دانیشتووان و خاکی کوردەکانی عێراق، ئێران و تورکیا دابمەزرێنن .

## کەسایەتی مەلا مستەفا بارزانی

٤٧- مەلا مستەفا بارزانی دەوری سەرەکی بینیوە لە خەباتی کوردەکان بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی لە عێراق و ڕێبەری ڕاپەڕینی کوردەکان لە ١٩٤٣ بووە و هەروەها فەرماندەی سەربازیی "کۆماری مهاباد" بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد لە ئێران لە ١٩٤٦ بووە. بارزانی لە ساڵی ١٩٦١ تا ئێستا ڕێبەری خەباتی چەکداری کوردە دژی حکوومەتی بەغداد .

مەلا مستەفا بارزانی تەنها ڕێبەری کوردەکان نییە بەڵکوو کەسایەتییەکی جیهانیشە. بارزانی خۆی ڕێبەرێکی عەشیرەتی نییە بەڵکوو ڕێبەرێکی ئایینی - (نەتەوەییە). بارزانییەکانی هەواڵی مەلا مستەفا بارزانی بە واتای ڕاستەقینەی خۆی عەشیرەتی نین بەڵکۆ خەڵکێکی کوردی نیشتەجێی ناوچەی بارزان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی عێراقن.

تەمەنی بارزانی ٦٩ ساڵە و بە توندی لە لایەن کوڕەکانیەوە، ئیدریس و مەسعوود پشتیوانی لێدەکرێت. مەسعوود بەرپرسی ڕێکخراوی "پاراستن"-ە و ئیدریس کاروباری پەیوەندییەکانی دەرەوە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی دەرەکی بەڕێوە دەبات .

## یەکنەگرتوویی کوردەکان

٤٨- تاقمچێتی قووڵ کە لە ناکۆکی عەشیرەتی، سیاسی و کۆمەڵایەتی سەرچاوە دەگرێت، کوردەکانی لە یەک جیا کردووەتەوە. سەرچاوەی سەرەکی یەکنەگرتوویی کوردەکان ناکۆکی عەشیرەتی کۆنە. ئەم بارودۆخە کۆمەڵێک کێشە دروست دەکات بۆ کاریگەری و بەتایبەت ئاسایشی بەرنامەکەی ئێمە بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بەڵام بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بەرنامەی یارمەتیدانی نهێنی کوردەکان جێبەجێ نەکەین کە بەشێکە لە هەوڵی ئێمە بۆ لاوازکردنی دسەڵاتی بەعس و سۆڤیەت لە پێناو پاراستنی دوستەکانمان و بەرژەوەندییەکانمان .

بەهەرحاڵ سەرەڕای یەکنەگرتوویی کوردەکان، ئەمڕۆ بارزانی زۆرتر لە هەر ڕێبەرێکی دیکەی کورد لە لایەن خەڵکەوە بە گشتی پشتیوانی لێدەکرێت .

## بەرنامەی وەزارەتی دەرەوە ی ئەمریکا بۆ کردنەوەی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە باڵوێزخانەی بەلژیکا لە عێراق بە کارمەندی ئەمریکییەوە

٥٤- وەزارەتی دەرەوە ئامادەیە لە ١ی ئەیلوول بەشی FSO-4 و خزمەتگوزاری ئیداری لە نووسینگەی بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە باڵوێزخانەی بەلژیکا لە بەغداد بکاتەوە. ئێستا عێراق دوو کەسی وەک نوێنەر لە واشنگتۆن هێشتووەتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندی دیپلوماتیکی خۆی لە حوزەیرانی ١٩٦٧وە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان پچڕاندووە. کەوابوو بەرنامەی جێگیرکردن و هێشتنەوەی کاربەدەستانی ئەمریکا لە بەغداد رووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە ئەگەر عێراق لە بەرنامەی پشتیوانیکردنی ئێمە لە کوردەکان ئاگادار بێتەوە .

## ئەنجامەکان

٥٦- هەڕەشەی رژیمی بەعسی عێراق (کە سۆڤیەتی لە پشتە) لەسەر حکوومەتە میانەڕەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا رامانده‌چڵەکێنێت تا یارمەتی بارزانی بدەین بۆ ئەوەی دژمنایەتیەکەی لەگەڵ رژیمی عێراق درێژە پێبدات .

٥٧- بێ لەبەرچاوگرتنی بەرنامەکانی بارزانی، لەوانەیە بارزانی لەگەڵ هێرشی سەربازی کتوپڕی عێراق رووبەڕوو بێتەوە و ئەگەر ئەم هێرشە روو بدات بارزانی لە هەموو شتێ زۆرتر پێویستی بە چەک و تەقەمەنی بەرگری دەبێت .

٥٨- یارمەتی ئێمە بە بارزانی (چ یارمەتی ماددی بێت، چ یارمەتی سەربازی) دەبێت بەو پەڕی ئاسایش و نهێنیپارێزی ئیداری و فیزیکییەوە ئەنجام بدرێت. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە بە هۆی ئەوەی چەند لایەنێک لەم رەوتەدا بەشدارن، بە دڵنیاییەوە کۆمەڵێک گیروگرفتی ئاسایشی دێتە ئاراوە .

٥٩- یارمەتی ماددی و سەربازی ئێمە بە کوردەکان نابێ ئەوەندە زیاد بێت کە نەتوانین رۆژێ لە رۆژان حاشای لێبکەین چونکە ئەگەر ئەم یارمەتییە لە هەندێ چوارچێوەی تایبەت بچێتە دەرەوە، حاشا کردن لێی مومکین نابێت .

٦٠- وەک هەوڵێکی تەواوکەر ئێمە دەبێ راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کەڵک لە هێزە غەیرە کوردەکانی نێو گۆڕەپانی سیاسی عێراق کە نەیاری رژیمی بەعسن، وەربگرین.

٦١- بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە چەند دەوڵەتێک لە رەوتی پشتیوانیکردن لە بارزانی و هێزە نەیارەکانی دیکەی رژیمی بەعس بەشدارن، دەبێ هەوڵی هەموو لایەنەکان هاوئاهەنگ بکرێت بۆ ئەوەی ئاسایش و کاریگەری مەسەلەکە بپارێزرێت و بە یەک شێوە و یەک ئامانج کارەکان ئەنجام بدرێت.

**کۆشکی سپی، واشنگتۆن**

**٢٨ی تەموزی ١٩٧٢**

**لە لایەن ژنێراڵ هێگ[٢٥٤]**

**بۆ: هێنری کیسینجێر، یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: یارمەتی مادی و سەربازی ئەمریکا بە شۆڕشی کورد و شێوازەکانی جێبەجێکردنی ئەو یارمەتیە**

ئەوە کە هاوپێچ کراوە، یادداشتنامەیەکە کە بەڕێز "هیلمز" (بەڕێوەبەری CIA) ئامادەی کردووە و ئەنجامەکانی گفتوگۆی خۆی و "کنێدی" لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان و هەروەها پێشنیارێک بۆ دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لەخۆ دەگرێت. پێشنیارەکە لە چوارچێوەی دوو جۆرە یارمەتی بە بارزانی پۆلێنبەندی کراوە: یەکەم یارمەتی ماددی و دووەم دابینکردنی چەک و تەقەمەنی.

---

[٢٥٤] Alexander Meigs Haig ژینیراڵ ئەلیکساندێر مەیس هێگ، جێگری فەرماندەی ستافی سپای ئەمریکا، سەرۆکی ستافی کۆشکی سپی لە سەردەمی سەرۆک کۆماری ریچارد نیکسۆن و جێراڵد فۆرد و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە سەردەمی سەرۆک کۆماری رۆناڵد رەیگان بووە. ژینیراڵ هێگ ساڵی ٢٠١٠ کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

١- له پەیوەندی لەگەڵ یارمەتی ماددیدا، پێشنیار دەکرێت زێدەباری یارمەتیەکانی ئێران، ساڵانە ٣ میلیون دولار لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ کوردەکان تەرخان بکرێت. "هیلمز" ئەم (رەش کراوەتەوە) تەواو دەکات، بەڵام بە ئاگاداری تەواوی شا و بارزانی.

٢- لەپەیوەندی لەگەڵ دابینکردنی چەک و تەقەمەنی بۆ کوردەکان، ویلایەتە یەکگرتووەکان نزیکەی ٢ میلیون دولار بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بکات (جگە لە خەرجی گواستنەوەی ئەم چەک و تەقەمەنییە بۆ ناوچە). چەک و تەقەمەنییەکە تەسلیم بە ئێران دەکرێت تا ئەویش تەسلیمی بکات بە کوردەکان. وردەکارییەکانی خەرجی گوازتنەوەی چەک و تەقەمەنییەکە لە بەشی ٣ی یادداشتنامە هاوپێچکراوەکەدا گونجاندراوە.

"هیلمز" و "کنێدی" هەردوویان لایەنگری پشتیوانیکردن لە بارزانین. ئەم مەسەلەیە ئێستا لە رابردوو گرنگترە بە هۆی رووداوەکانی ئەم دواییانەی میسر کە لەوانەیە ببێتە هۆی توندتربوونی هەوڵەکانی سۆڤیەت لە عێراق. لە هەمان کاتدا بە هۆی دەسەڵاتخوازی لەڕادەبەدەری سۆڤیەت لە ئەنجامی رووداوەکانی میسر، لەوانەیە بارودۆخەکە لە رادەبەدر هەستیار بێت.

٣- لەم رەوتەدا ئێمە دوو ریگامان لە پێشە: یەکەم خۆمان لە کومیتەی ٤٠ بدزینەوە و لە رێگای یادداشتنامەیەکەوە راستەوخۆ بچینە لای سەرۆک کۆمار و پاش ئەوەش تەنها لەگەڵ OBM و "هێڵمز" مامەڵە بکەین. رێگای دووەم ئەوەیە تەنها ئەندامانی سەرەکی کومیتەی ٤٠ (جانسۆن، رۆش، سەرۆکی JCS و هیڵمز) بێ هیچ نووسراوەیەک و تەنها بە شێوازی زارەکی ئاگادار بکەینەوە و پێیان بڵێین سەرۆک کۆمار ویستوویەتی وەها بکرێت.

## پێشنیارەکان

بە بۆچوونی من ئێمە دەبێ رێگای دووەم بگرینە بەر نەکا شتێ روو بدات و دەبێ پێداگری بکەین لە سەر ئەوەی کە رێوشوێنە جێکەوتووەکان گیراوەتە بەر. لەمە

زیاتر من زۆر شک و گومانم هەیە بەنیسبەت ئەوەی ئەم ئۆپەراسیونە ئەنجام بدرێت ئەگەر لە هەندی رووەوە لە کاناڵە فەرمییەکاندا نەخرێتەڕوو. ئەگەر ئێوە رازی بن، من ئەمە دەکەم بە یادداشتنامەیەک بۆ ئەوەی ئێوە پەسەندی بکەن و تەسلیمی بکەن بە سەرۆک کۆمار و پێی بڵێن ئەگەر جەنابیان بڕیاری لە سەر بدات ئێمە ئەندامانی سەرەکی کومیتەی ٤٠ رێنوێنی دەکەین و هەروەها دەیخەینە بەردەمCIA و OBMبۆ ئەوەی کاری پێویست لەم پەیوەندییەدا ئەنجام بدەن.

کۆشکی سپی، واشنگتۆن
لەلایەن یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (هێنری کیسینجێر)
بۆ:

- جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری سیاسی
- جێگری وەزیری بەرگری
- سەرۆکی هێزە هاوبەشەکانی وەزارەتی بەرگری
- سەرۆکی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)
- بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

٢١ی ئابی ١٩٧٢
نهێنی، هەستیار
بابەت: فەرمانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ یارمەتیدانی بارزانی و کوردەکانی عێراق لە خەباتەکەیان دژی ڕژێمی بەعس

به ئامانجی یارمەتیکردنی مەلا مستەفا بارزانی و کوردەکانی عێراق لە خەباتەکەیان دژی رژیمی بەعسی عێراق، سەرۆک کۆماری ئەمریکا فەرمانی داوە ئەم کردەوانەی خوارەوە بگێردرێتەبەر:

١- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا رێژەی (رەش کراوەتەوە) دولار بۆ ساڵێک یا بە گشتی سێ میلیۆن دولار تەرخان بکات. بەڕێز هێڵمز بەڕێوەبەری (ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی-CIA) لە رێگای کاناڵەکانی خویەوە ئەم یارمەتیە جێبەجێ دەکات.

٢- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەروەها رێژەی دوو میلیۆن دولار بۆ دابینکردنی پێداویستیەکان (تەنها بۆ دابینکردنی خەرجی گوازتنەوەی پێداویستیەکان) تەرخان دەکات. ئەم پێداویستیانە لەرێگای کاناڵەکانی CIAوە تەسلیم بە کوردەکان دەکرێت.

هێنری کیسینجێر[٢٥٥]

یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی

---

٢٥٥- کیسینجێر ئەو بیرۆکەیەی پەسەند کردوە کە Rob Roy Ratliffe لەمەوبەدوا ئەو مەسەلەیە جێبەجێ بکات و ئە یادداشتەی زیاد کردوە کە : "دەبێ رۆبی بێت بمبینێت". ئەم بەلگەنامەیە بەشی ٢ی یادداشتنامەکەی بەرواری ٣١ی حوزەیرانە کە تام لاتیمێر لە ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ هێگی Haig نووسیوە.

**کۆشکی سپی، واشینگتۆن**

**لە لایەن یارمەتیـــدەری ســـەرۆک کۆمـــار بـــۆ کاروبـــاری ئاسایشـــی نەتەوەیی (کیسینجێر)**

**بۆ: سەرۆک کۆمار نیکسۆن**

**٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٢**

**بۆ زانیاری: سەرۆک کۆمار**

**بابەت: راپۆرتی بەرەوپێشچوونی شالاوی پشتیوانیکردنی مادی و سەربازی ئەمریکا لە کوردەکان**

هێلمز، بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) لە یادداشتنامەی یەکەمدا (بلاو نەکراوەتەوە) زانیاریەکانی چۆنیەتی پشتیوانی ئێمە لە بزووتنەوەی خەباتکاری کورد بە رێبەرایەتی مەستەفا بارزانی خستوەتەڕوو. بە کورتی هێلمز راپۆرتی داوە کە:

١- پارە و چەکەکان لەرێگای ئێرانەوە بێ هچ کێشەیەک تەسلیم بە بارزانی کراوە.

٢- پارە و چەکی زیاتر بۆ بارزانی بەڕێوەیە و ئەم پارە و چەکە نە تەنها لە خەزینەی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی بەڵکوو لە لایەن (رەش کراوەتەوە) تەرخان کراوە.

٣- بارزانی یەکەم وەجبەی پارە دوو مانگانەکەی بۆ مانگی تەموز و ئاب وەرگرتوە. پارەکەی مانگی ئەیلوولیش لە سەرەتای ئەم مانگە (تشرینی یەکەم) دەگاتە دەستی بارزانی و وەجبەی چوارەمی پارەکە واتای پارەی مانگی تشرینی یەکەم لە کۆتایی مانگ دەدرێت بە بارزانی.

٤- بڕی دەیان تۆن چەک و تەقەمەنی، لەوانە ٥٠٠ دانە کلاشینکۆفی AK-47 و ٥٠٠ دانە چەکی نیمە ئۆتوماتیکی سۆڤیەت و ٢٠٠ هەزار زەنجیر فیشەک بە فڕۆکە ناردراوە بۆ بارزانی.

٥- تا کۆتایی تشرینی یەکەم بڕی ٢٢٢ هەزار پوند چەک و تەقەمەنی لە خەزینەی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی و ١٤٢ هەزار پوند لە خەزینەی (ڕەش کراوەتەوە) دەنێردرێت بۆ ئێران بۆ ئەوەی تەسلیمی کوردەکانی بکات.

٦- بەڕێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی، هێڵمز ڕاپۆرتی داوە کە شا بەشێوەیەکی زۆر زۆر باش لەم ڕەوتەدا هاوکاری کردوە. هێڵمز هەروەها ڕاپۆرتی داوە کە ڕژێمی بەغداد و سۆڤیەت زۆر زۆر نیگەرانن بەنیسبەت ئەو هێڵە سەربەخۆیە کە بارزانی گرتوویەتە بەر. هەروەها بە وتەی CIA بارودۆخی ڕژێمی بەعس زۆر باش نیە.

٧- کەمبوونەوەی داهاتی نەوت، کێشەی مادی و کۆمەڵێک ناڕەزایەتی بۆ ڕژێمی عێراق دروست کردوە. ئەگەر بارزانی ئەم بارودۆخە قایمەی خۆی ڕابگرێت دوو لە سێی سپای عێراق سەرقالی خۆی دەکات و ناهێڵێت بەعسیەکان ببن بە خاوەن پێگەیەکی قایم بۆ ئەوەی دژی ئێران خراپکاری بکەن و گروپی پیاوکوشتن دژی ئێران بەڕێکخستن بکەن.

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٣٧١**

**٢٨ی گوڵانی ١٩٧٣**

**نهێنی**

**بابەت: پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، جەدە، کووەیت، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، تاران و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە قاهیرە.

ئاماژە بە تیلیگرامی ٢٦٦ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرە

٣- دانیشتنە نهێنیەکەی وەزیرانی دەوەی ئێران و عێراق لە ژنێڤ لە هەفتەی کۆتایی مانگی نیسان دزەی کردوەتە ناو کۆمەڵگای دیپلۆماتیک. ئێران و عێراق نەیانتوانیوە لەو دانیشتنەدا لە سەر چونیەتی چارەسەرکردنی کێشەی "شەتولعەرەب" رێکبکەون. باڵوێزی فەرانسە لە عێراق رۆژی ٢٧ی گوڵان پێمیوت کۆمەڵێک زانیاری پشتڕاستنەکراوی بە دەست گەیشتوە کە دانیشتنیێی دیکەش لە نێوان ئێران و عێراقدا بەڕێوەچوە کە تێیدا عێراق بەوە رازی بوە کە هێڵی" تالویگ" بکرێت بە سنووری ئێران و عێراق و کۆمەڵێک پوانی دیکەشی بە ئێران پێشنیار کردوە بۆ ئەوەی ئێران لە بەرامبەردا ئیدی یارمەتی کوردەکان نەدات. باڵوێزی فەرانسە لە عێراق لە سەر ئەو باوەڕەیە کە هۆکاری جموجۆڵەکانی عێراق بۆ ریکەوتن لەگەڵ

ئێران ئەوەیە کە دەیەوێت کێشەی کورد چارەسەر بکات و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە زۆر لە قازانجی ڕۆژئاوادایە کە شا بە شێوەی نیوە و ناتەواو لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت. بە بوچونی باڵوێزی فرانسە، چارەسەربوونی کێشەی کورد دەبێتە هۆی ئەوەی دوایین ئامرازی دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق لەناو بچێت. بەهەرحاڵ گومان لەوەدا هەیە کە شا بیەوێت لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت چونکە ئامانجی شا ئەوەیە کە دراوسێیەکی توندئاژۆ و نەیاری هەبێت.

٤- هەر چی لە ئاداری ١٩٧٤ نزیکتر دەبێینەوە گوشارەکان لە سەر ڕژیمی عێراق زیاتر دەبێت بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر بکات. بەگوێرەی شەرتومەرجەکانی ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠، ئەو ڕێکەوتننامەیە دەبێ لە ماوەی ٤ ساڵ جێبەجێ بکرێت و پاش کۆتاییپێهاتنی ئەو ٤ ساڵە کوردەکان مافی ئەوەیان هەیە ئۆتونومی بەدەستبهێنن. باڵوێزی فرانسا وتی کوردەکان ئەمدوایانە کۆمەڵێک پێشنیاریان خستوەتە بەردەمی بەعس بۆ ئەوەی دەزگای یاسادارِژتنی تایبەت بە هەرێمی کوردستان دابمەزرێت کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن (ئەنجوومەنی تەنفیزی) دا بێت و یەکێتیەکی فدراڵی بەرفراوان لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی ناوەندیدا پێکبێت و کوردێک بکرێت بە جێگری سەرۆک کۆمار، بەڵام وادیارە جێبەجێکردنی ئەو پێشنیارانە بە خەیاڵی ڕژیمی بەعسیشدا نایێت.

٥-هەڵسەنگاندن: یەکێ لە هۆکارەکانی نایەکانگیربوونی جموجۆڵە دیپلۆماتیکەکانی عێراق بەنیسبەت ئێران و ڕووداوەکانی نەجەف[٢٥٦] ئەوەیە کە دەزگای ئیستیخباراتی عێراق وەک دەوڵەتێک لەناو دەوڵەتێکی دیکەدا درێژە بە کردەوەکانی دەدات و ئەو کەسانە کە بۆ ڕێکەوتنی ئێران و عێراق هەوڵ دەدەن هێشتا ناتوانن بەربەست بۆ چالاکیەکانی دەزگای ئیستیخبارات درست بکەن یان ئەو چالاکیانە ببەنە ژێر پرسیار کەوابوو هەوڵەکان بۆ نزیکبونەوە لە ئێران هێشتا هیچ پێشکەوتنیکی بەخۆوە

---

[٢٥٦]- ئاماژە بەو ڕووداوەیە کە نیوەشەوی ٨ی گوڵان، گروپێکی ٧ کەسی چەکداری دەزگای ئەمنی عێراق هەڵیانکوتاوەتە سەر قوتابخانەیەکی ئێرانی لە نەجەف و وێڕای پشکنینی قوتابخانەکە سێ کەس لە مامۆستایانی قوتابخانەکەیان لەگەڵ خۆیان بردووە — وەرگێڕ.

نەبینیوە و بۆ نموونە پرۆپاگەندا دژی ئێران لە میدیاکانی عێراقدا هەر ڕۆژ بەرچاو دەکەوێت.

بۆ: هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١١ی حوزەیرانی ١٩٧٣

نهێنی

بابەت: ناوەڕۆکی دیداری کاربەدەستانی سۆڤیەت لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی

١- سپاست دەکەم کە پەیامەکەی "شا"ت بۆ ناردم کە تێیدا شا مۆچیاری مەلا مستەفا بارزانی کردوە پەیوەست نەبێت بە هاوپەیمانی بەعس و شیوعیەکان و پێیوتوە کە پەیوەستبوون بە هاوپەیمانی بەعس و شیوعیەکان کارێکی خۆکوژییە[٢٥٧].

٢- کوردەکان بە ئێمە و ئێرانیان ڕاگەیاندوە کە دوو کاربەدەستی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە بەغداد سەردانی کردوون. ئێمە هەمیشە مۆچیاری کوردەکانمان کردوە کە هەموو پەیوەندیەکانیان لەگەڵ سۆڤیەت بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و خێرا بە کاربەدەستانی ئێران ڕابگەیەنن بۆ ئەوەی بەدگومانی کاربەدەستانی ئێران کەم

---

٢٥٧-ڕۆژی هەینی ٢٧ی تەموزی ١٩٧٣، لە دانشتنێکی بەتەواوی نهێنیدا لەگەڵ هێنری کیسینجێر، ڕاوێژکاری سەرۆک کۆماری ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی، هارۆلد سەندیرز، بەرپرسی ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، ریچارد هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران و ئەردەشیر زاهیدی، باڵوێزی ئێران لە ئەمریکا، شا وتویەتی مَن ڕاشکاوانە بە کوردەکانم وتوە کە لە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی عێراقدا بەشداری نەکەن. هەروەها بە کوردەکانم وتوە کە ئیدی لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی سۆڤیەت یان عێراق دانەنیشن. (وەرگێڕ).

بکەینەوە سەبارەت بەوەی کە ئەگەری ئەوە هەیە بارزانی دەورێکی دووفاقی بگێرێت[٢٥٨].

٣- ئەو نووسراوەیە کە هاوپێچی ئەم پەیامە کراوە، کورتەیەکە لەو شتانەی کە کوردەکان بە ئیمەیان وت. لە ٩ی حوزەیران ئەو نوسراوەمانە نارد بۆ نوسینگەکان بۆ ئەوەی بیروڕای جیاواز لەو پەیوەندییەدا پێکنەیێت. دەبوایا ئەو نوسراوەیەم زووتر بناردایا بۆتان بەڵام هەروا کە خۆتان ئاماژەتان پێکردوە ئەم هەڵسوکەوتەی سۆڤیەت شتیکی ئاساییە و کاردانەوەی کوردەکانیش لە چوارچێوەی وەڵامەکانی پێشوویان بە سۆڤیەت بووە. راپۆرتەکەی کوردەکان بە زمانی عەرەبی بۆ من ناردراوە و خۆم وەرگێڕانم کردوە.

٦- رۆژی ٢ی حوزەیرانی ١٩٧٣ ڤیکتۆر ئابوسۆڤ البوک[٢٥٩]، سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە بەغداد و ئیگنۆر پیتراکۆڤ[٢٦٠]، سکرتێری دووەمی باڵوێزخانەی سۆڤیەت سەردانی ناوچەی کوردنشینیان کردوە و بە کوردەکانیان وتوە کە بە راسپاردەی رێبەرایەتی سۆڤیەت، لەوانە برژنیف[٢٦١]، کۆسیگێن[٢٦٢] و پۆدگۆرنی[٢٦٣] سەردانی ئەوانیان کردوە و ئامانجی سەفەرەکەیان ئەوەیە کە مەلا مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسی KDP دڵنیا بکەنەوە و بیروڕای بزووتنەوەی کورد و پارتی دیموکراتی کوردستان بە گشتی و بارزانی بەتایبەتی وەربگرن. بەڵام بەهەرحاڵ هەڵوێست و بۆچونەکانیان نیشان دەدات کە ئامانجی راستەقینەیان ئەوە

---

[٢٥٨] مەبەستی ئەوەیە کە کاربەدەستانی ئێران لەوە بەدگومانن کە بارزانی هاوکات لەگەڵ سۆڤیەت و ئێران لە پەیوەندیدا بێت. وەرگێڕ

[259] - VICTOR ABUSOV ALBUK
[260] -IGNOR PETRAKOV

[٢٦١] - BREZHNEV، لیۆنید برژنێف سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی رێبەرایەتی حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەت بوە. وەرگێڕ

[٢٦٢] KOSYGIN، ئالیکسی کۆسیگین وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت بوە. وەرگێڕ

[٢٦٣] PODGORNY، نیکۆلیا پۆدگۆرنی سکرتێری یەکەمی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی سۆڤیەت بوە. وەرگێڕ

بووە کە گوشار بخەنە سەر بارزانی بۆ ئەوەی لەگەڵ سەدام ئاشت بێتەوە و لەگەڵی هاوکاری بکات و پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی کە لە بەعسیەکان و شیوعیەکان پێکهاتوە. سۆڤیەتیەکان بەتایبەت جەختیان کردوەتەوە لە سەر پشتیوانیکردنیان لە سەدام حوسەین ئەلتەکریتی و وتویانە پێویستە کوردەکانیش لەگەڵ سەدام هاوکاری بکەن و لە هەموو هەلومەرجێکدا پشتیوانی لێبکەن.

٢- هەروەها ئەفسەرانی سۆڤیەت بە تێروتەسەلی باسی ئەوەیان کردوە کە یەکێتی سۆڤیەت زۆر گرنگی بە عێراق و کێشەی کورد دەدات و پێیانباشترە کێشەی کورد لەگەڵ دەوڵەتی ئیستای عێراق و شیوعیەکان لە چوارچێوەی بەرەی عێراقی یەکگرتوو و دژەئیمپریالیست چارەسەر بکرێت. سۆڤیەتیەکان ئامادەیی خۆیان دەبڕیوە بۆ ئەوەی ئەوە لە دەستیان دێت بیکەن بۆ یارمەتیدانی گەلی کورد لە ناوچە جۆراوجۆرەکان پاش ئەوە کە کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق رێککەوتن.

٣- مەلا مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسیKDPیش بە تێروتەسەلی باسی هەڵوێستی بەعس و خاڵە ناکۆکی لەسەرەکان وەک بەرنامەی تەعریب، دیارنەکرانی سنووری هەرێمی کوردنشین، رێگانەدان بە بەشداریکردنی کوردەکان لە دەوڵەت، هەوڵدان بۆ کوشتنی بارزانی و مەسەلەکانی دیکەیان کردوە کە نیشان دەدات نیازی بەعس پاک نییە. ئەمانە وای کردوە کە کوردەکان بە هیچ شێوەیەک متمانەیان بە رژیمی بەعس و تواناکەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەبێت. کوردەکان بە تێروتەسەلی روانگە و بۆچوونەکانی خۆیان دەربڕیوە و نوێنەرە سۆڤیەتیەکانیش بەڵێنیانداوە بۆچونەکانیان بگەیەنن بە رێبەرایەتی سۆڤیەت.

٤- کاربەدەستانی سۆڤیەت هیچ پێشنیاریکی تایبەت یان چڕوپڕیان پێنەبوە بۆ ئەوەی لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەی کورددا بیخەنە بەردەستی کوردەکان یا دەوڵەتی عێراق، و زیاتر بۆ ئەوە هەوڵیانداوە کە بارزانی رازی بکەن لەگەڵ سەدام حوسەین ئەلتەکریتی و رژیمی عێراق هاوکاری بکات و پەیوەست بێت بە بەعس و شیوعیەکان لە چوارچێوەی بەرەی نیشتمانیدا. دوو دیپلوماتە سۆڤیەتییەکە پەیامێکی زارەکی رێبەرایەتی سۆڤیەتیان گەیاندوە بە بارزانی و تەوەرە سەرەکیەکانی

گفتوگۆکانیان لەگەڵ کوردەکان نووسیوە. دوو کاربەدەستە سۆڤیەتیەکە هەروەها وتویانە کە رژیمی عێراق بڕیاریداوە یاسای ئۆتۆنۆمی کوردستان تا ١١ی ئاداری ١٩٧٤ پەسەند بکات.

٥- تێبینی: ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی KDP چووە بەگژ کاربەدەستە سۆڤیەتیەکاندا و تۆمەتباری کردوون کە سۆڤیەت گازی کیمیایی داوە بە عێراق و سوپای عێراق خەریکی راهێنانە بۆ ئەوەی گازی کیمیایی بۆ ژینوسایدکردنی کوردەکان بەکاربێنێت[٢٦٤]. کاربەدەستانی سۆڤیەت وتویانە ئاگایان لەو مەسەلەیە نییە و داوایان لە کوردەکان کردوە بۆ سەلماندنی ئەو بانگەشەیە بەڵگە یان زانیاری بخەنەڕوو. کاربەدەستە کوردەکەش وتویەتی زانیاریەکانی جێگای متمانەن و جەختی لە سەر ئەوە کردوەتەوە کە سەرچاوەی زانیاریەکانی بۆ سۆڤیەتیەکان ئاشکرا ناکات بەڵام سۆڤیەت خۆی باش دەزانێت کە ئەو شتە راستە.

٦- تێبینی: کاربەدەستانی سۆڤیەت رۆژی ٥ی حوزەیران بارەگای بارزانییان بەجێهێشتوە. پاش رۆیشتنی سۆڤیەتیەکان، مەلا مستەفا بارزانی بە هەندێ لە راوێژکارە کوردەکانی خۆی وتوە کە نیگەرانی ئەوەیە کە سۆڤیەت کەمکەم بە هەموو شێوەیەک پشتیوانی لە عێراق بکات بۆ ئەوەی لە رێگای شاڵاوی سەربازی، کوردەکان تێکبشکێنێت.

---

[٢٦٤] بۆ یەکەم جار ئیدارەی هەواڵگری و لێکۆڵینەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە توێژینەوەیەکدا دەربارە کوردەکانی عێراق کە لە ٣١ی گوڵانی ١٩٧٢ ئامادە کراوە، ئاماژەی بەوە کردوە کە دەوڵەتی عێراق لە ١٩٦٣ گازی کیمیایی دژی کوردەکان بەکارهێناوە. جاری دووەم رۆژنامەی "دترویت نیوز"ی ئەمریکا لە ٤ی ئەیلوولی ١٩٧٣ وتارێکی بڵاو کردوەتەوە و ئاماژەی بەوە کردوە کە سۆڤیەت گازی کیمیایی داوە بە عێراق و ئەگەری ئەوە هەیە عێراق دژی کوردەکان بەکاری بهێنێت. دواتر لە ٦ی تشرینی ١٩٧٣ لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا کۆنگرێسمەن هابز ئەو مەسەلەیەی خستوەتەڕوو و ئاماژەی بەوە کردوە کە سۆڤیەت پسپۆڕی ناردوە بۆ عێراق بۆ ئەوەی هێزەکانی عێراق فێری چۆنیەتی بەکارهێنانی گازی کیمیایی بکەن. وەرگێڕ

کاربەدەستە سۆڤیەتیەکان وتوویانە کە دەوڵەتی ئێران و عێراق بە شێوەی نهێنی خەریکی وتووێژی دیپلۆماتیکن و پرسیاریان لە کوردەکان کردوە کە سەبارەت بەو مەسەلەیە چۆن بیر دەکەنەوە. رێبەرانی KDPش لە وەڵامدا وتویانە کە ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بە خودی ئەو دوو دەوڵەتەوە هەیە و پەیوەندی بەوانەوە نیە. بەڵام بەهەرحاڵ لە راستیدا کوردەکان ئاگاداری وتووێژەکانی ئێران و عێراقن و تا رادەیەک نیگەرانی ئەوەن کە ئەگەر ئێران ئیمتیازی (پوان) شەتولعەرەب لە عێراق وەربگرێت کۆتایی بە پشتیوانیکردن لە بارزانی بهێنێت یان پشتیوانیەکەی کەم بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەستپێکردنەوەی پرۆپاگەندای ئێران دژی عێراق لە ٥ی حوزەیرانەوە کوردەکانی گەیاندوەتە ئەو ئەنجامە کە پشتیوانی ئێران لەدەست نادەن.

**له باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٢٨١٥**

**٢١ی حوزەیرانی ١٩٧٣**

**بابەت: ئەگەری سەفەری ڕێبەرانی کورد بۆ ئەمریکا**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، مۆسکۆ، تاران، نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و لێژنەی ویلایە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە نەتەوە یەککگرتووەکان لە نیویورک

١- نوێنەری بارزانی لە بەیروت، عەزیز شێخ ڕەزا[٢٦٥]، ئەمدوایانە باڵوێزخانەی ئاگادار کردەوە کە یەکێ لە کوڕەکانی بارزانی، مەسعود و یەکێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP)، مەحموود عوسمان، لە هەوڵدان بۆ ئەوەی بەمزوانە سەردانی ویلایەیە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بکەن. عەزیز پرسیاری کردوە ئایا ئەو دوو نوێنەرە کوردە دەرفەتی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێت دەربارەی مەسەلەی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە باس و گفتوگۆ بکەن.

باڵوێزخانە لە وەڵامدا وتی نوێنەری کوردەکان، زەید عوسمان لە کاتی سەردانەکەی بۆ وەزارەتی دەرەوە لە هاوینی ساڵی ڕابردوو دەرفەتێکی وای بۆ ڕەخساوە بەڵام

---

[٢٦٥] عەزیز شێخ ڕەزا ساڵی ١٩٧٢ تا ١٩٧٥ نوێنەری مەلا مستەفا بارزانی بووە لە لوبنان و ئێستا سەرۆکی دەزگای خێرخوازی بارزانییە لە هەولێر. وەرگێڕ

جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە دەبێ باڵوێزخانە لەم پەیوەندیەدا بیروڕای وەزارەتی دەرەوە وەربگرێت. عەزیز شیخ رەزا ئاماژەی بەوە کرد کە پلە و پایەی مەسعود بارزانی و مەحموود عوسمان لە نێو پارتی دیموکراتی کوردستان لە پلە و پایەی زەید عوسمان زۆر بەرزترە.

٢- عەزیز شیخ رەزا شتێکی ئەوتۆی نوێی دەربارەی بارودۆخی باکوری عێراق پێنەبوو(کە لە تیلیگرامی ٤١٠٨ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران باس کراوە) بەڵام وتی مەلا مستەفا بارزانی لە دیدار لەگەڵ هەواڵنێرانی رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست" و "نیویورک تایمز" خۆشحاڵ بوە و هیواداره کە رۆژنامەکانی ئەمریکا لە داهاتودا سەرنجی زیاتر بە کێشەی کورد بدەن.

٣- عەزیز شیخ رەزا بانگەشەی ئەوەی کرد کە کاریگەری سەرکەوتوانەی لە سەر کوردەکانی دانیشتووی بەیروت (کە بە وتەی ئەو نزیکەی ٨٠ هەزار کەس دەبن و زیاتر لە نزیکی ئوردوگاکانی ئاوارە فەلەستینیەکاندا دەژین) داناوە بۆ ئەوەی لە میانەی پێکدادانەکانی ئەم دوایانەی نێوان فەدائیان- داردەستە چەپەکان و دەوڵەتی لوبناندا، لە بەرامبەر فەدایەکان بەربەرەکانی بکەن.

٤- سەبارەت بە سەردانەکەی مەسعود بارزانی و مەحمود عوسمان بۆ وەزارەتی دەرەوە، باڵوێزخانە دەبێ چی وەڵامێک بە عەزیز شیخ رەزا بداتەوە؟

هۆگتۆن[٢٦٦]

---

[266] HOUGHTON

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**[267]

**بۆ:**

**- وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٤٢٥**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**٢٤ی حوزەیرانی ١٩٧٣**

**بابەت: حیزبی شیوعی عێراق نایەوێت کێشەی کورد چارەسەر بێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، جەدە، کووەیت، لەندەن، مۆسکۆ و پاریس

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٢٩ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- رۆژنامەی "الفکر الجدید"، زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق(ICP) و رۆژنامەی "التاخی"، زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان KDP))، وتارێکی هاوشێوەیان لە رۆژی ٢٣ی حوزەیران بڵاو کردەوە کە تێیدا هاتبوو لێژنەیەکی حیزبی شیوعی عێراق

---

[267] دەوڵەتی بەعس لە گوڵانی ١٩٧١ دەستی بە سەر مڵکی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەغداد گرت. لە ساڵی ١٩٧٢ بەولاوە ئەمریکا باڵوێزخانەی لە بەغداد نەما و "نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد" لە نێو باڵوێزخانەی بەلژیکا جێگای گرتەوە. دەوڵەتی عێراقیش ساڵی ١٩٦٧ باڵوێزخانەکەی لە واشینگتۆن داخستبوو و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی عێراقی لە ١٩٦٧ لە واشنگتۆن کردبووەوە. وەرگێڕ.

بە سەرۆکایەتی عەزیز محمد[٢٦٨]، سکرتێری گشتی لەگەڵ مستەفا بارزانی لە بارەگای سەرکردایەتی بارزانی لە ١٩ی حوزەیران دیداری کردوە. لەو راگەیاندنامەیەدا هاتوە کە هەر دوو لایەن بەو ئەنجامە گەیشتوون کە عێراق لەگەڵ مەترسییەگی گەورە لە لایەن ئیمپریالیزتەکانەوە روبەڕویە و دەبێ:

الف - یەکێتی نەتەوەیی لەرێگای جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکەی ئاداری ١٩٧٠ و پاراستنی مافی کەمینەکان پێکبێت.

ب- بەرەیەکی نیشتمانی بە زووترین کات پێکبهێنرێت.

سەروتارەکەی رۆژنامەی "الفکر الجدید" وتبووی کە ئەو دیدارە هەنگاوێکی نوێ بۆ خێراترکردنی پێکهاتنی بەرەیەکی نیشتمانی و پوچەڵکردنەوەی هەوڵی ئەو لایەنە پاشوەڕۆیانەیە کە دەیانەوێت لە ناکۆکیەکان کەڵکی خراپ وەربگرن و هەستی بەدگومانی و بێزاری لە یەکتر لە ناو هێزە نەتەوەیەکاندا پەرەپێبدەن. سەروتارەکە هەروەها داوای لە کۆمەڵانی خەڵک کردبوو یارمەتی بە چەسپانی ئاشتی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و بەعس بدەن.

تێبینی: ئەو دانیشتنە بەدڵنیاییەوە بە رەزامەندی بەعس بەڕێوەچوە چونکە بەعس هەوڵ دەدات لە دەستڕۆیشتوویی شیوعیەکان لە ناو KDP و بەپەرۆشبونی زۆریان بۆ پێکهاتنی بەرەیەکی نیشتمانی کەڵک وەربگریت بۆ ئەوەی گوشار بخاتە سەر بارزانی لە سەر مەسەلەی ئۆتونومی سازش بکات. ئەمە لە کاتێکدایە کە هێماکان وا نیشان دەدات کە دووربونەوەی ICP و بەعس لە یەکدی لە سەر کێشەی کورد رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت. رێبەرانی بەعس لە سەر ئەو باوەڕن کە خاڵی سەرەکی لاوازی رژیمەکەیان، کێشەی کوردە و شێلگیرن ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن. گاوین یانگ[٢٦٩]، هەواڵنێری لەندەن (مەبەستی BBC یە - وەرگێڕ) کە ئەم دوایانە لە سەر بانگهێشتی دەوڵەتی عێراق چەند هەفتە لێرە بوو، دەڵێت سەرجەم وەزیرانی دەوڵەتی عێراق جەختیان لە سەر شێلگیربوونی خۆیان کردوەتەوە بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر

[268] Aziz Mohammad

[269] - Gavin Young

بکەن و رەزامەندی خۆیان دەربڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران ڕێکبکەون چونکە ئەو ڕێکەوتنە بۆ چارەسەربوونی کێشەی کورد پێویستە. بە وتەی ئەو هەواڵنێرە، لە لایەکی دیکەوە ڕێبەرانی شیوعی بەنیسبەت کوردەکان و هەڕەشەی ئێران دڵنیاتر بوونە و ئاماژەیان بە سنووری درێژی نێوان ئێران و یەکێتی سۆڤیەت کردوە کە بە واتای ئەوەیە سۆڤیەتَ دەتوانێت هەر کاتێک پێویست بێت گوشار بخاتە سەر ئێران بۆ ئەوەی عێراق بپارێزێت.

٤- هەرچەند کە گەلێ لە لایەنەکانی مەسەلەکە روون نیە بەلأم وادیارە شیوعیەکان نایانەوێت بەعس کێشەی کورد چارەسەر بکات و لەگەڵ ئێران ڕێکبکەوێت چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بەهێزتربوونی دەسەلأتی پاوانخوازی بەعس. بەهەرحاڵ ئەگەر شیوعیەکان بتوانن ڕێگا بۆ چارەسەربوونی کێشەی کورد خۆش بکەن لە بەرامبەردا دەوری باشتریان لە ناو بەرەی نیشتمانیدا دەستدەکەوێت.

باڵوێزی فرانسە لە بەغداد، سیرلز[٢٧٠]، راپۆرتیداوە کە جگە لەو شتانە کە لە بروسکەکەدا ئاماژەی پێکراوە، هەندێ سەرچاوەی نادیار بە بەعسیان وتوە کە شا دەیەوێت لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت بەلأم زلهێزەکانی ڕۆژئاوا شایان دڵسارد کردوەتەوە چونکە نایانەوێت بیرۆکە "شۆڕشگێڕانەکان" بلأو بێتەوە.[٢٧١] ئەوە کە دانیشتنی ڕێکخراوی سینتۆ بە نهێنیەکی یەکجار زۆر بەڕێوەچوە و تێدا جەخت لە سەر بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ کردەوە خراپکارانە کراوە، راستبوونی ئەو بۆچوونەی ئێمە (سەبارەت بە ترسی ڕۆژئاوا لە بلأوبوونەوەی بیرۆکە "شۆڕشگێڕانەکان") زیاتر دەسەلمێنێت.

٥- هەڵسەنگاندنی دیپلۆماتەکانی ئێرە ئەوەیە کە ڕژیمی بەعس بەجدی بە شوێن ئەوەدایە لەگەڵ ئێران ڕێکبکەوێت بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر بکات و بەشێوەیەکی چڕوپڕ بۆ گەشەکردنی خێرای پیشەسازی نەوتی عێراق کار بکات کە نزیکەی ١٠ ساڵە هیچ گەشەیەکی بەخۆوە نەبینیوە. من دەزانم کە وەزارەتی

---

[270] Cerles

[٢٧١] مەبەستی بلأوبونەوەی بیرۆکەکانی شیوعیەکانی عێراق لە ناوچەیە -وەرگێڕ.

دەرەوەی ئەمریکا و باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران لەوانەیە هەندێ زانیاریان پێبێت کە لەگەڵ هەندێ لەو شتانەی کە من باسم کرد نایەکانگیر بێت بەڵام ئەگەر وانیە بە بۆچوونی من لە بارودۆخی ئێستادا باش دەبێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (لەرێگای لایەنێکی سێیەم وەک باڵوێزخانەی جەزایر یا تورکیە) بە دەوڵەتی عێراق رابگەیەنێت کە دەوڵەتی ئەمریکا پێیخۆشە ئێران و عێراق لە یەک نزیک ببنەوە.

لۆڤری

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٢٩١٧**

**٢٨ی حوزەیرانی ١٩٧٣**

**بابەت: دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کوردەکان و سپای عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، بەیروت، جەدە، کویت، لەندەن و ئوفیسی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و قاهیرە

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٤١٠٨ لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە

کورتە: رۆژنامەکان لە سێ رۆژی رابردوودا کۆمەڵێک شتیان دەربارەی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کوردەکان و سپای عێراق لە کوردستانی عێراق بڵاو کردوەتەوە و دەڵێن سپای عێراق دەستپێشخەری ئەو شەڕە بوە. سەرچاوە فەرمیەکانی ئێران دەستپێکردنەوەی شەڕیان پشتڕاست کردوەتەوە بەڵام ئەوەیان بە دوور زانی کە لە کاتی ئێستادا شەڕێکی بەرفراوان و گەورە لە نێوان کوردەکان و بەغداد هەڵبگیرسێت. هۆکارەکانی دەستپێکردنەوەی ئەو شەڕە لە لایەن بەغدادەوە هێشتا دیار نیە.

١- رۆژنامەکانی چاپی تاران لە لاپەڕەی یەکەمیاندا لە ٢٦، ٢٧ و ٢٨ی حوزەیران دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کوردەکان و سپای عێراقیان بەشێوەیەکی زەق بڵاو کردوەتەوە و دەڵێن لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا ١٣ کورد کوژراون و ٢٢ کوردی دیکەش بریندار بوونە بەڵام ٥ سەربازی عێراقی کوژراون. بەگوێرەی راپۆرتەکان سپای عێراق

به هێرشکردن بۆ سەر چەند گوندێکی کوردنشین (کە ناوەکەیان نەزانراوە) ئەو شەڕەی دەستپێکردوە.

٢- بە گوێرەی راپۆرتەکان رێبەری کورد، مەلا مستەفا بارزانی هۆشداری بە دەوڵەتی بەغداد داوە ئەگەر هێزەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان نەکشێنێتەوە، لەگەڵ شەڕێکی بەرفراوان روبەڕوو دەبێتەوە. هەندێ لەو شوێنانە کە شەڕ تێیاندا هاتوەتە ئاراوە بریتین لە "بابا ئیسماعیل، بەمۆ، قلادزێ، هەڵەبجە و کەرکووک (کەرکووک بە تەواوی لە لایەن هێزە کوردەکانەوە گەمارۆ دراوە).

٣- سولتان حوسەین سەنەندەجی[٢٧٢]، بەڕێوەبەری گشتی کاروباری سیاسی لە وەزارەتی دەرەوەی ئێران رۆژی ٢٧ی حوزەیران لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ باڵوێزخانە وتی دەزگای هەواڵگری ئێران ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە شەڕ جارێکی دیکە دەستی پێکردوە بەڵام بە هەرحاڵ بە دوریزانی کە شەڕەکەی ئەم رۆژانی دوایە ببێت بە پێشەکی شەڕێکی نوێی بەرفراوان لە نێوان کورەکان و سپای عێراقدا. شەڕی خوێناوی لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی بەغداد بەردەوام بوە بەڵام تەنها شتێکی نوێ کە سەرنجی حوسەین سەنەندەجی بەرەولای خۆی راکێشاوە، راپۆرتەکەی ئەم دوایەی جیم هۆگلەند[٢٧٣] لە رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست" بوە کە تێیدا بارزانی لێدوانی توندی دژی دەوڵەتی بەغداد داوە بە هۆی ئەوەی رێکەوتننامەی (١١ی ئاداری ١٩٧٠)ی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقی جێبەجێ نەکردوە.

حوسەین سەنەندەجی وتی لەوانەیە دەوڵەتی بەغداد بڕیاری دابێ تا رادەیەک لەگەڵ کوردەکان شەڕ بکات بۆ ئەوەی بێزاربوونی خۆی لە بارزانی نیشان بدات.

٤- هەڵسەنگاندن: بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستیە کە ئێران دژایەتی دەوڵەتی بەغداد دەکات، لەوانەیە میدیای ئێران دەربارەی رادەی شەڕەکەی نێوان کوردەکان و بەغداد

---

[272] Soltan- Hossein Sanandaji
[273] Jim Hoagland

زیادەڕۆیی کردبێت، هەرچەند روونە کە ئەو شەڕە کە لەم رۆژانەی دوایدا رویداوە گەورەترین شەڕی ئەم مانگانەی دواییە بوە[٢٧٤].

---

[٢٧٤]– لە تیلێگرامێکی دیکەدا کە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروتی لوبنان لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردوە، هاتوە: "راپۆرتەکان باس لەوە دەکەن کە کوردەکان هێرشیان کردوەتە سەر هێزەکانی عێراق. ئێمە ئەو مەسەلەمانە لەگەڵ سەرچاوەکانی لایەنگری بارزانی لە لوبنان (کە بەردەوام زانیاری باوەڕپێکراو و نوێیان دەربارەی دوایین پێشهاتەکانی باکوری عێراق پێیە) باس کرد بەڵام وتیان نە هیچ راپۆرتێکیان بە دەست گەیشتوە و نە هیچ زانیاریەکیان دەربارەی هێرشی کوردەکان بۆ سەر دەوڵەتی عێراق لەم چەند رۆژەی دواییەدا هەیە. ئەو سەرچاوانە بانگەشەی ئەوەیان کرد کە لەم قۆناخە هەستیارەی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیلدا، بارزانی قەد ئەوە ناکات کە بە ئەنجامدانی کردەوەیەک، پێگەی خۆی لە نێوان عەرەبەکان خراپ بکات". وەرگێڕ

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٤٣٤**

**١ی تەموزی ١٩٧٣**

**نهێنی**

**بابەت: ئەمریکا دەبێ پەیوەندیەکانی لەگەڵ کوردەکان بپچڕێنێت چونکە سەرکەوتنی بزووتنەوەی کورد دژی سەقامگیری ناوچەیە**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیروت، مۆسکۆ و تاران

ئاماژە بە:

- تیلیگرامی ٧٣٥١ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت
- تیلیگرامی ٣٦٩ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- ئەگەر ئێمە پێمانخۆشە بۆ باشترکردنی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ عێراق کار بکەین، بە بۆچونی من ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە داواکاری کوردەکان بۆ یارمەتی سەربازی ئەمریکا بە تەواوی رەت بکەینەوە و ئیدی نوێنەرە کوردەکان، تەنانەت بۆ بیستنی داواکاریەکانیانیش، وەرنەگرین. بڕیارێکی وەها هەروەها دەتوانێت خزمەت بە بەرژەوەندیە بەرفراوانترەکانی ئێمە لەپێناو سەقامگیری ناوچەدا بکات.

ئەو پێشنیار و موچیاریە لە سەر بنەمای ئەم هۆکارانەی خوارەوەیە:

٢- رژێمی بەعس (کە بەهەرحاڵ ئەمریکا و زۆربەی عێراقیەکان حەزیان لێی نیە) لە بنەڕەتدا رژێمێکی نەتەوەپەرەستە و دەیەوێت بە هەموو شێوەیەک خۆی یەکپارچە

رابگرێت. رژیمی بەعس دانی بەوەدا ناوە کە ناتوانێت بەشێوەی سەربازی بەسەر کوردەکاندا سەربکەوێت و لە رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا مافی کولتووری و مافەکانی دیکەی کوردەکانی قبووڵ کرد کە لەو مافانە زۆر زیاترە کە کوردەکان لە وڵاتانی دراوسێدا هەیانە. بەڵام نە رژیمی بەعس و نە هیچ رژیمێکی دیکەی عێراقی نایەوێت ئەو جورە ئۆتونومیە قبووڵ بکات کە بارزانی داوای دەکات چونکە ئەو جۆرە ئۆتونومیە یەکپارچەی خاکی عێراق دەخاتە ناو مەترسی.

٣- بارزانی هەتا کاتێک کە یارمەتی لە ئێران وەربگرێت و بە یارمەتیدانی ئەمریکا هیوادار بێت، لەگەڵ بەعس سازش ناکات، کەوابوو چاوەڕوان دەکرێت شەڕ بەردەوام بێت و عێراق لە رووی ئابووریەوە گەشە نەکات. هەروەها وادیارە شاڵاوە سەربازیەکانی دەوڵەتی عێراق دژی کوردەکان لە باتی لاوازکردنی کاریگەری سۆڤیەت، دەبێتەهۆی بەهێزتربوونی کاریگەری سەفیەت. هەروەها لەوانەیە راپەڕینی کوردەکان دزە بکاتە ناو تورکیەش و هێدی هێدی لە ئێرانیش بڵاو بێتەوە. من نازانم تورکیە چەندە بە جدی سەیری کێشەی کورد دەکات بەڵام باڵوێزی تورکیە لە عێراق، جوهروک[٢٧٥]، بە جدی سەرنج بە هەموو لایەنەکانی ئەو مەسەلەیە دەدات و لە کاتی دیدارە پێنج رۆژیەکەی ئەم دوایەی وەزیری ناوخۆی تورکیە لە عێراق، تا ئاستیک وەزیری ناوخۆی دەربارەی نیگەرانیەکانی بە نیسبەت کوردەکان ئاگادار کردوەتەوە.

٤- چی پێمان خۆش بێت و چی پێمان ناخۆش بێت، دەبێ ئەو راستیە قبووڵ بکەین کە داهاتووی کوردەکان لەوەدایە کە لە ناو وڵاتی عێراقدا بمێننەوە ئەڵبەتە بەو مەرجە کە تا ئەو شوێنە پێیان دەکرێت بۆ بەدەستهێنانی ئۆتونومی هەوڵ بدەن. کوردەکان تەنها کاتێک دەتوانن بە ئۆتونومی راستەقینە بگەن کە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە دەرەوە یارمەتی بدرین بەڵام وادیارە وڵاتانی دیکە، تەنانەت ئێرانیش بەو جۆرە یارمەتیان نادات. هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی مەسەلەی سەقامگیری ناوچە، باشتر ئەوەیە بزووتنەوەی کورد سەرنەکەوێت.

---

[275] Cuhruk

٥- یارمەتیدانی ئێران و ئیسرائیل بە کوردەکان، خزمەتی بە بەرژەوەندی ئێران و ئیسرائیل کردوە بەڵام خزمەتێکی ئەوتۆی بە بەرژەوەندی گەلی کورد نەکردوە، تەنها ئەوە نەبێ کە ئاسۆی سەربەخۆیی بەرەبەرەی کوردەکانی زیندوو راگرتوە و هیوای کوردەکانی بۆ سەندنی کۆمەڵێک پوان لە رژیمی بەعس زیندوو هێشتوەتەوە. بەگوێرەی ئەو سەرچاوە زانیاریە کەمانەی ئیرە، بەهەرحاڵ لە کاتی راوەستانی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لە ئاداری ١٩٧٠ تا ئێستا، کوردستان هەرێمێکی شڵەژاو بوە و لە روی ئابووریە گەشەی نەکردوە و وەک وڵاتێکی گەمارۆدراو بوە. بۆ نمونە بەگوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی پسپۆریی ئەم دوایانەی رێکخراوی نێونەتەوەیی کار (ILO) داهاتی هونەرمەندانی کورد بە قەد ٥٤٠%ی داهاتی هونەرمەندانی شوێنەکانی دیکەی عێراقە.

٦- کێشەی کورد ئەڵبەتە پەیوەندی راستەوخۆی بە سیاسەتی ئێران بەنیسبەت عێراقەوە هەیە. هەتا کاتێک ئێران یارمەتی کوردەکان بدات، کێشەی عێراق چارەسەر نابێت و پەیوەندیەکی درێژخایەن لە نێوان ئێران و عێراقدا درست نابێت. من هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە بە گشتی دان بە گرنگی سیاسەتی ئێراندا دەنێم بەڵام پێشنیار دەکەم سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بەو مەسەلەیە بۆ سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکان روون بکەینەوە. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە هەڵوێستی ئەمریکا دەبێ ئەوە بێت کە کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق تەنها مەسەلەیەکی ناوخۆیی عێراقە کە ئەمریکا نایەوێت خۆی بخاتە ناوی. ئەم هەڵوێستە دەبێ بۆ نوێنەرانی بارزانی (هەر کاتێک کە هەوڵیاندا بۆ وەدەستخستنی یارمەتی ئەمریکا لە ئێمە نزیک ببنەوە) و هەروەها بۆ دەوڵەتی عێراق (باشترە لەرێگای یادداشتێکی فەرمیەوە) روون بکرێتەوە.

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٤٤٠**

**١ی تەموزی ١٩٧٣**

**بابەت: کاریگەری کێشەی کورد لە سەر پەیوەندییەکانی عێراق و سۆڤیەت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، مۆسکۆ و بەیرووت

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٤٤٧٥ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- ئێمە ئەو شتانە کە لە برگەی یەکی تیلیگرامە پەیوەندیدارەکەدا ئاماژەی پێکراوە بەم شێوەیە هەڵدەسەنگێنین:

الف- تەنها رێکەوتنێک کە ئێمە ئاگادارینی، ئەو رێکەوتنەیە کە وەزارەتی ناوخۆی عێراق لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٢ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلڤاکیا واژۆی کردوە (کە لە تیلیگرامی ٨١ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد ئاماژەی پێکراوە). هەروەها کە ئەو کاتە ئاماژەمان پێکرد دەوڵەتی عێراق دەیەوێت لە ئازموونی دەوڵەتە شیوعیەکان لەم ناوچەیە، بەتایبەت لە بواری تکنیکی ئاسایشدا کەڵک وەربگرێت.

ب- نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد ئاگاداری ئەوە نیە کە هیچ سەندیکایەکی بازرگانی تایبەت کۆنفرانسی گرتبێت بەڵام سەندیکا بازرگانیەکانی عێراق وەکوو هەموو رێکخراوە گشتیەکانی دیکەی عێراق، لەوانە حیزبی شیوعی، یان

لە ژێر کۆنترۆلی راستەوخۆی حیزبی بەعسدان یان لە ژێر چاودێری نزیکی حیزبی بەعسدان.

ج- ئەگەر ژمارەی ئەو تکنیسیەنە سۆڤیەتیانە کە لە عێراق کار دەکەن هەزار کەس هەڵبسەنگێنین لە راستی نزیکترە.

د- شیوعیەکان زیاتر لە ساڵێکە لە کردەوەدا بەرەی نیشتمانی عێراقیان قبوول کردوە کە لە ژێر دەسەڵاتی بەعسدایە و دوو وەزیری سەرەکیان لە ناو ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقدا هەیە. لەوانەیە شیوعیەکان و بەعس زیاتر پێکەوە رێککەوتبن بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نیە کە بەعس بیەوێت ئازادی کاری زیاتر بە حزبی شیوعی عێراق بدات.

ی- کاربەدەستانی باڵوێزخانەی ئیتالیا و فەرەنسا بیستویانە کە عێراق فڕۆکەیەکی جەنگی Tu22 یان هەندێ جۆری فڕۆکەی جەنگی لە سۆڤیەت کڕیوە. لەگەڵ ئەوەشدا راستیەکەی ئەوەیە کە سپای عێراق لە ئاست سپای ئێراندا نیە.

٢- تێبینی: ئەو پێشگوویيەی شا لە راست دەچێت کە عێراق خەریکە دەبێت بە بنکەی دەسەڵاتی سۆڤیەت. ئێران بۆ ئەوەی پێش لە هەنگاوە سەرەتایەکانی عێراق بۆ نزیکبوونەوە لە ئێران بگرێت درێژە بە یارمەتیدانی سەربازی بە کوردەکان دەدات و لە سەر مەسەلەی شەتولعەرەب لەگەڵ عێراقدا سازش ناکات و پڕۆپاگەندا دژی عێراق توندتر دەکات. رژێمی بەعسیش لە رێگای خراپکاری و پڕۆپاگەندا و پشتبەستن بە پشتیوانی سەربازی و بەرگری سۆڤیەت درێژە بە دژایەتیکردنی ئێران دەدات. رێگایەکی دیکە کە لە بەردەم ئێراندایە ئەوەیە کە بە شێوەی نیوەوناتەواو (یان تۆزێ زیاتر لەوە) لەگەڵ عێراق هەڵسوکەوت بکات بۆ ئەوەی ئەوە تاقی بکاتەوە کە عێراق چەندە بۆ نزیکبوونەوە لە ئێران جدییە.

٣- هەڵسەنگاندنی باڵوێزی جەزاییر، میسر، فەرەنسا و تورکیە (کە زانیاری باشیان پێیە) بەم شێوەی خوارەوەیە: رژێمی بەعس هەوڵیداوە بزووتنەوەی کورد تێکبشکێنێت بەڵام نەیتوانیوە و نایەوێت شەڕێکی هەمەلایەنە لەگەڵ کوردەکان دەستپێبکاتەوە. رژێمی بەعس بەو ئەنجامە گەیشتوە کە هیچ رێگایەکی دیکەی نیە

جگە لەوەی کە هەندێ ماف و نیمچە ئۆتونومیەک بدات بە کوردەکان. ئەوەی کە بەعس بە کوردەکانی پێشنیار دەکات زۆر لەوە کەمترە کە کوردەکان داوای دەکەن بەڵام لەوە زیاترە کە رژێمەکانی پێشووی عێراق بە کوردیان داوە. هەروەها هیچ دەوڵەوتێکی خاوەن سەروەری ناتوانێت ئەوەندە ماف بە لایەنی بەرامبەری بدات کە ببێتە هۆی سەربەخۆبوونی. بزووتنەوەی کورد ئەگەر لەگەڵ بەعس سازش بکات، کۆتایی پێدیت ئەگەر ئێران یارمەتیەکانی بچڕێنێت. کەوابوو نزیکبوونەوەی عێراق لە ئێران بۆ پتەوبوونی دەسەڵاتی بەعس پێویستە.

٤- من هیوادارم کە لە وەڵامی داواکاری شا بۆ ئاگاداربوون لە زانیاریەکانی پەیوەندیدار بە چالاکیەکانی ئەمدوایانەی سۆڤیەت لە عێراق، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاماژە بەوە بکات کە عێراق ئێستا بۆ پرۆژە ئابووریە نوێکان رووی لە رۆژئاوا کردوە و پەیوەندیەکانی لەگەڵ چین نوێ کردوەتەوە و ئەمدوایانە داوای کردوە پەیوەندیەکانی لەگەڵ بریتانیا و ئیسپانیا نوێ بکاتەوە و ئەمانە نیشان دەدات کە عێراق دەیەوێت لە دەسەڵاتی سۆڤیەت، تەنانەت لە بواری سەربازیشدا کەم بکاتەوە.

لۆڤری

**له وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ: نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**١٠ی تەموزی ١٩٧٣**

**بابەت: سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە ڕێککەوتنی ئێران و عێراق و کێشەی کورد و ئێران**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، ئانکارا، بەیرووت، جەدە، کوەیت، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، سەنعا و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە جەزاییر

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٦٣ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

هەروەها کە لە تیلیگرامەکەی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداددا ئاماژەی پێکراوە، دەوڵەتی عێراق پێیوایە کە بەرژەوەندی لەوەدایە لەگەڵ ئێران ڕێکبکەوێت چونکە ئەو هەنگاوە زۆر پێویستە بۆ ئەوەی عێراق کێشەکەی لەگەڵ کوردەکان چارەسەر بکات و هێزی خۆی زیاتر بۆ پێشخستنی بەشی نەوت و گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی بەگشتی تەرخان بکات.

٢- دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هیچ کارێک ئەنجام نادات کە ببێتە هۆی ئەوەی عێراق لەگەڵ ئێران ڕێکنەکەوێت و لە مەسەلەیەکی ناوچەیی وەهادا دەستێوەردان ناکات. کەوابوو ئەو دەنگوانە کە لە تیلیگرامەکەی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداددا ئاماژەی پێکراوە ڕاست نیە کە گوایە

"شا دەیەوێت لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت بەڵام زلهێزەکانی ڕۆژئاوا دڵساردیان کردوەتەوە بۆ ئەوەی پێش لە بڵاوبوونەوەی بیرۆکە شۆڕشگێڕانەکان بگرن".
لەراستیدا دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا ئێستا باسی ئەو مەسەلەیەی لای شا نەکردوە.

٣- گەوابوو ئێمە پێمانوایە کە باشَ دەبێت بۆ دەوڵەتی عێراق روونی بکەینەوە کە ئێمە بە هەمان شێوە کە سەیری عێراق دەکەین بە هەمان شێوەش وەک وڵاتێکی خاوەن سەروەری و سەربەخۆ سەیری ئێران دەکەین کە دەتوانێت بەو شێوازە کە لە قازانجی خۆیدا دەیبینێت خۆی بڕیاری هەموو شتەکانی بدات و بگات بە ئامانجەکانی. ئێمە وەک سیاسەتی گشتی، پێشوازی لە هەموو هەنگاوێک لە هەموو شوێنێک دەکەین کە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی ناکۆکیە نێونەتەوەیەکان و ببێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکان هێزی خۆیان بەتەواوی بۆ باشترکردنی خۆشبژێوی و کامەرانی خەڵکەکەیان تەرخان بکەن. بەهەرحاڵ ئێمە هیچ بەرژەوەندیەکمان لە ناکۆکبوونی ئێران و عێراقدا نیە و ئێمە ئەو مەسەلەیە بە مەسەلەیەک دەزانین کە تەنها پەیوەندی بەو دوو وڵاتەوە هەیە.

ئێمە لە هەر دەرفەتێکدا لە کاتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی عێراق لە واشینگتۆن و لە هەموو پەیوەندیەکانمان لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق لە ڕێگای نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد دەبێ ئەم هەڵوێستەی ئەمریکایان پێڕابگەیەنین. ئێمە بە باشتر دەزانین ئەم هەڵوێستەی خۆمان ڕاستەوخۆ (لە چوارچێوەی پەیوەندیە سنووردارەکانمان لەگەڵ عێراق) بە کاربەدەستانی عێراق ڕابگەیەنین نە لە ڕێگای واسیتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هیچ کێشەیەک لەوەدا نابینین کە ئەم هەڵوێستەی خۆمان بۆ دیپلۆماتە بیانیەکان وەک تورکیە و جەزایر (هەروا کە لە تیلیگرامەکەی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد ئاماژەی پێکراوە) دووپات بکەینەوە بەڵام هەر ئەو هەڵوێستەی خۆمان لە ڕێگای کاناڵی تایبەتی خۆمانەوە بە دەوڵەتی عێراق رادەگەیەنین.

٤- بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران: ئێوە دەتوانن لە هەر دەرفەتێکدا کە بۆتان بڕەخسێت هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەو شێوەیە کە لە سەرەوە باس کرا، بە کاربەدەستانی ئێران رابگەیەنن.

راجێرز[٢٧٦]

---

[276] - ROGERS

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٠٥٠٠**

**٢٦ی ئابی ١٩٧٣**

**بابت: خراپتربوونی پەیوەندیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، تاران، مۆسکۆ، بەیروت

ئامارژە بە تیلیگرامی ٠٤٤٣ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

پەیوەندیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق خراپتر بوە. دەوڵەتی عێراق رۆژی ٢٣ی ئاب رایگەیاند کە سێ کەس ( کە هەموویان کورد بوونە) بە تاوانی هاوکاری لەگەڵ دەزگای سیخوڕی ئێران رۆژی ٢٠ی ئاب لەسێدارە دراون. پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) پێشتر لەسێدارەدانی ئەو کەسانەی ئیدانە کردبوو. هەروەها کۆمەڵێک راپۆرت دەربارەی پێکدادان (لە نێوان کوردەکان و هێزەکانی عێراق - وەرگێڕ) لە باکووری عێراق بڵاو بوەتەوە. ١٨ی ئاب لە خانەقین[٢٧٧] پێکدادان روویداوە و لە ئەنجامدا دوو سەرباز و ١٠ کورد کوژراون. پێکدادانێکی جدی دیکە لە سنجار (لە نزیک سنووری سوریە) روویداوە و بۆ نارەزایەتی دەربرین دژی هێرشە تروریستیەکانی کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق دژی دانیشتوانی سینجار کە بوەتە هۆی کوژرانی

277 -KHANIQUIN

ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک، ٢٤ی ئاب سەرجەم دانیشتوانی کوردی قەزا و ناحیەکانی سنجار لە کاتژمێر ٥ی سەرلەبەیانی تا ٥ی ئێوارە مانیان گرتوە.

رۆژنامەی التاخی رۆژی ٢٦ی ئاب لە سەروتارەکەیدا ئەو هێرشانەی ئیدانە کردبوو. کاربەدەستێکی تورک رۆژی ٢٣ی ئاب پێمیوت کە جدیترین پێکدادان رۆژی ١٧ی ئاب واتا ئەوکاتە روویداوە کە هێزە کوردەکان بە چەک و تۆپ هێرشیان کردوەتە سەر "گوندی ١٧ی تەمووز"[278] کە ٢٥ کیلومەتر لە کەرکووک دوورە. ئەو گوندە سەرلەنوێ ئاوەدان کراوەتەوە و عەرەبەکان تێدا نیشتەجێ بوونە کە ئەوەش بەشێک لە هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ تەعریبی ناوچەی کەرکووکە. جگە لەوە، گروپێکی وڵاتی هەنگاریا[279] کە بۆ دەرهێنانی نەوت کار دەکات، لەو شوێنە نیشتەجێ بوە و کوردەکان بە سەیارەی ئەو گروپە هەڵهاتوون. هیچ هێزێکی دەوڵەتی عێراق لەو رووداوەدا نەکوژراوە و کوژراوەکان ژن و منداڵ بوونە. دەوڵەتی عێراق لە وەڵامدا بەتالیونێک سەرباز و ٢٠ دانە تانکی ناردوە بۆ ناوچە و جادەی بەغداد – کەرکووکی بۆ هاتوچۆی شەوانە داخستوە.

لۆڤری

---

278 "-17TH OF JULY VILLAGE"

279 -HUNGARIAL

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٥٠٣٠**

**٢٨ی ئابی ١٩٧٣**

**بابەت: ناکۆکییەکانی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و حیزبی شیوعی عێراق پەرەدەسێنێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، ئانکارا، بەیرووت و مۆسکۆ

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٤٥٢ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- رۆژنامەی التاخی[٢٨٠]، زمانحاڵی کوردەکان رۆژی ٢٨ی ئاب لە سەروتارێکی تێروتەسەلدا وەلامی وتارەکەی ٢٧ی ئابی دەوڵەتی عێراقی دایەوە کە تێدا لیستی پێکدادانەکانی نێوان کوردەکان و سپای عێراقی لە ساڵی ١٩٧٣ی بلاو کردبوەوە. التاخی بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە هۆکاری راستەقینەی ئەو پێکدادانانە ئەوە بوە کە دەوڵەتی عێراق لە چوارچێوەی سیاسەتی تەعریبدا پارە و چەکی لە نێوان دژمنانی کورد دابەش کردوە. التاخی دەوڵەتی عێراقی بەوە تۆمەتبار کردبوو کە لە باتی ئەوەی لە رێگاچارەی دیکە کەڵک وەربگرێت دەستی کردوەوتەوە بە سووتاندنی گوندەکان.

---

280 -AT-TAAKHI

٢- سەروتارەکەی التاخی هەروەها پەیامێکی مەکتەبی سیاسی KDP لەخۆگرتبوو کە لە ٢١ی ئاب بۆ Rcc (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق) ناردبووی. پەیامەکە ئاماژەی بەوە کردبوو کە "هێزەکانی سپای عێراق بە پشتیوانی فڕۆکە، تۆپ و تانک ماوەی دوو ڕۆژە درێژە بە هێرشەکەیان بۆ سنجار دەدەن و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر ژن و منداڵ کوژراون. ئامانجی ئەو هێرشە ئەوەیە کە بۆ ئامادەکاری بۆ تەعریبی ناوچەکە، کوردەکان لەو ناوچەیە دەربکرێن. ئەو هێرشانە دەبێ هەر ئێستا رابوەستێندرێت بەڵام ئەگەر بەردەوام بێت، کوردەکان بەو شێوەیە کە شایانیەتی وەڵامی دەوڵەتی عێراق دەدەنەوە".

٣- التاخی نووسیبووی کە بارزانی ڕێنوێنی کاربەدەستانی کورد لە بەغدادی کردوە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق پەیوەندی بگرن بۆ ئەوەی هێرشەکانی رابوستێنێت. وەزیرێکی کورد بۆ ئەو ئامانجە هەوڵیداوە بەڵام کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق پێیان وتوە پێکدادانەکانی سنجار کێشەیەکی عەشایرییە و دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراق بۆ دەستێوەردان لەو کێشەیە سنووردارە. کەوابوو KDP هیچ ڕێگایەکی دیکەی جگە لە راگەیاندنی مانگرتنی گشتی بۆ نەمابوەوە و مانگرتنەکەش بە تەواوی سەرکەوتوو بوە. التاخی هەروەها نووسیبووی دواپین دانیشتنی نێوان بەعس و KDPلە ٨ی ئاب بەڕێوەچوە و هەر دوو لا لە سەر ئەوە ڕێکەوتوون کە سەرجەم هێزەکان لە سنجار چەک بکرێن و هەوڵەکان بۆ گۆڕینی پێکهاتەی سنجار رابوەستێندرێت بەڵام بەعس ڕێکەوتنەکەی جێبەجێ نەکردوە. التاخی لە کۆتایی وتارەکەیدا پرسیاری کردبوو کە KDP چۆن دەتوانێت باوەڕ بە ئوتونومیەکەی دەوڵەتی عێراق بکات.

٤- ڕۆژنامەی الفکرالجدید[٢٨١]، زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق لە ٢٨ی ئاب سەروتارێکی تێروتەسەلی بڵاو کردەوە و ڕەخنەی لە هەڵوێستی KDP سەبارەت بە بەرەی نیشتمانی گرت و بانگەشەی ئەوەی کرد کە KDP ناتوانێت لە لایەن سەرجەم خەڵکی کوردستانەوە قسە بکات چونکە کۆمەڵێک گروپی سیاسی دیکە، لەوانە حیزبی شیوعی ڕیشەی قوڵ و پێگەی سەرەکیان لە ناو بەشێکی زۆر لە خەڵکی

---

281 -Al FKIR AL-JADID

کوردستاندا هەیە. سەروتارەکەی رۆژنامەی الفکرالجدید ئاماژەی بەوە کردبوو کە حیزبی شیوعی عێراق نایەوێت KDP لاواز بێت بەڵکوو تەنها دەیەوێت KDP تەشویق بکات لە بەرەی نیشتمانیدا بەشداری بکات.[٢٨٢]

---

[٢٨٢]- نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ پەیامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و تێیدا باسی پەرەسەندنی ناکۆکیەکانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراقی کردوە. لە پەیامەکەدا هاتوە کە رۆژنامەی تەریقەلشەعب، زمانحاڵی حیزبی شیوعی بانگەشەی ئەوەی کردوە کە KDP دوو هەزار پێشمەرگەی ناردوە بۆ چەککردنی شیوعیەکان لە گوندەکانی ناوچەی سلێمانی. رۆژنامەی التاخیش وەڵامی داوەتەوە کە حیزبی شیوعی دژی بەرژەوەندیەکانی گەلی کورد هەنگاوی هەڵگرتوە و بە چەکی دەوڵەتی عێراق رۆژی ٧ی تشرینی دوەم هێرشی کردوەتە سەر بارەگای KDP لە دەربەندیخان و ٤ کەسی کوشتوە. لە پەیامەکەدا هەروەها لە زمانی رۆژنامەی التاخیەوە ئاماژە بەوە کراوە کە ئەندامانی رێبەرایەتی KDP، سالەح یوسفی و دارا تۆفیق سەردانی سۆڤیەتیان کردوە و لە بەیاننامەیەکی هاوبەشی KDP و حیزبی شیوعی سۆڤیەتدا داوا کراوە کە بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ جێبەجێ بکرێت و KDP پەیوەست بە بەرەی نیشتمانی عێراق بێت. لە کۆتایی پەیامەکەدا هاتوە کە ئەو بانگەشەیەی KDP لەڕاست دەچێت کە دەوڵەتی عێراق شیوعیەکان دژی کوردەکان بەکاردەهێنێت و سۆڤیەت لەپێناو پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی و حیزبی شیوعی عێراق بۆ چارەسەربوونی کێشەی کورد هەوڵ دەدات. وەرگێڕ

## له هێلمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران
## بۆ: هێنری کیسینجێر، واشینگتۆن
## ٣١ی ئابی ١٩٧٣
## بابەت: بڕیاری ئەمریکا بۆ زیادکردنی یارمەتیەکانی بە بارزانی
## بەتەواوی نهێنی، هەستیار

ئاماژە بە: تیلیگرامی WH 31939

١- بەڕێز( ناوەکەی رەش کراوەتەوە[٢٨٣]) رۆژی ٢٤ی ئاب لە نەوشەهر[٢٨٤] بڕیارەکەی ئێمەی بە شا راگەیاندوە بۆ ئەوەی یارمەتیە مادیەکەمان بە بارزانی لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٧٣وە بە رێژەی ٥٠% زیاد بکرێت[٢٨٥]. شا بەو بڕیارە زۆر خۆشحاڵ بوە و سپاسی ئەمریکای کردوە کە بە خیرایی بڕیاری داوە و سپاسی خۆتی (کیسینجێر)

---

[٢٨٣] ئەو کەسە کە ناوەکەی رەش کراوەتەوە، کاربەدەستێکی باڵای CIA بوە لە ئێران کە واسیتەی نێوان شا و کۆشکی سپی بوە بۆ مەسەلەی یارمەتیدان بە بزووتنەوەی کورد لە عێراق. وەرگێڕ

[٢٨٤]- نەوشەهر شارێکە لە باکوری ئێران کە سەر بە پارێزگای مازندەرانە. وەرگێڕ

[٢٨٥] ئەم بڕیارەی هێنری کیسینجێر بۆ زیادکردنی یارمەتیەکانیان بە بزووتنەوەی کورد دوای ئەوە دەرچوە کە شا لە ٢٧ی تەموزی ١٩٧٣ لە دانشتنێکدا لە ئەمریکا لەگەڵ کیسینجێر، هیلمز و سەندیرز، بەرپرسی ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا داوای لە ئەمریکا کردوە زیاتر یارمەتی کورد بدات بۆ ئەوەی کوردەکان نەچنە ناو بەرەی نیشتمانی عێراق و لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەت دانەنیشن. وەرگێڕ

کردوه کە لەو پەیوەندیەدا یادداشتت بۆ ناردوە. شا ئیستا دەیەوێت یارمەتیە مادیەکەی بە بارزانی بە ڕێژەی تۆزی زیاتر لە ٥٠% زیاد بکات (پیاوەتیەکی شازادەیانە).

٢- شا وتویەتی بڕیارەکەی ئێمە هەم گرنگە و هەمیش زۆر لە کاتی خۆیدایە چونکە بارزانی زۆر پێویستی بە پارەیە و یارمەتییەکانی ئێمە سەمبولی پشتیوانی مەعنەوی ئێمە لە بارزانییە. شا هەرچەند ئەمەی نەوتوە بەڵام ئەوە ڕاستە کە زیادکردنی پشتیوانی مادی ئیمە لە بارزانی (کە لە سەر داواکاری شا بوە) سەمبولی پشتیوانیکردنی ئێمە لە "شا"یە و شا ئەم دڵنیاییدانەوەیەی ئێمەی زۆر پێخۆشە.

٣- بە بۆچوونی شا زۆر پێویستە پێش لەوە بگیردرێت کە بارزانی پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی عێراق کە لە بەعس و شیوعیەکان پێکهاتوە. شا ئەوەشی زیاد کرد کە بارزانی بە دڵی ئەوی کردوە چونکە وتویەتی یەکێ لە شەرتومەرجەکانی بۆ پەیوەستبوون بە بەرەی نیشتمانی ئەوەیە کە دەوڵەتی عێراق هەڵبژاردنێکی ئازاد لە سەراسەری عێراق بەڕێوە ببات، بەعسیش قەت ئەوە ناکات. شا وتی داوا لە بارزانی دەکات رۆژی یەکی ئەیلوول سەردانی تاران بکات.

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەووە، واشینگتۆن دی سی ٥٢٠٠**

**١٣ی ئەیلوولی ١٩٧٣**

**بابەت: شەڕی ڕاگەیاندن لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی بەعس پەرەدەسێنێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیرووت، موسکۆ و تاران

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٤٤٥٠ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- مانگرتنە گشتیەکەی ٢٤ی ئاب کە بە هاندانی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP) بەڕێوەچوو وادیارە بەتەواوی کاریگەر بوە چونکە ڕۆژنامەی الثورە، زمانحاڵی حیزبی بەعس لە سەروتارێکی دوورودرێژ و نائاساییدا لە ٢٨ی ئاب بە توندی رەخنەی لەو مانگرتنە گرت. لەو سەروتارەدا هاتبوو کە زۆربەی کوردەکان خۆیان بە عێراقی دەزانن و دەیانەوێت شەرتومەرجەکانی بەیاننامەی ئادار جێبەجێ بێت. سەروتارەکە ڕێبەرایەتی KDP بەوە تۆمەتبار کردبوو کە بە ڕێژەیەکی مەترسیدار لە کۆمەڵانی خەڵک دابڕاوە ( لە سەروتارەکەدا نووسرابوو کە خەڵکی کوردستان لە شەرتومەرجی تایبەتدا و نە لە هەموو هەلومەرجێکدا پشتیوانییان لە KDP کردوە). سەروتارەکە هەروەها ئەوەی روون کردبوەوە (هەروەها کە حیزبی

شیوعی پێشتر روونی کردبوەوە و ئێمە لە تیلیگرامی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد[٢٨٦]) کە KDP تەنها حیزبی نوێنەری خەڵکی کورد نیە و ئەو راستیە لە باکووردا روونە کە KDP ئەمڕۆ بە زەبری چەک حوکم دەکات.

٢ - رۆژنامەی الثورە بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە خەڵکی عێراق پشتیوانی لە یەکێتی نیشتمانی، سەقامگیری، یاسای نیشتمانی و بەرەی نیشتمانی دەکەن و ئاماژەی بەوە کردبوو کە بەلەبەرچاو گرتنی جێبەجێبوونی بەیاننامەی ئادار، بەعس سەرجەم ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ کردوە و ئێستا نۆرەی KDP یە کە ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات. سەروتارەکە لە کۆتاییدا هۆشداریدابوو کە ئەگەر دەوڵەتی عێراق دەسەڵاتی لە باکووردا هەبوایە (و ئەگەر بیەوێت دەتوانیت ئەو دەسەڵاتەی لە باکوور هەبێت) ئەنجامی مانگرتنەکە بەتەواوی جیاواز دەبوو.

٣- رۆژنامەی التاخی، زمانحاڵی KDP لە سەروتارێکی تێروتەسەلدا لە ١١ی ئەیلوول وەڵامی وتارەکەی الثورەی دایەوە. گرنگترین خاڵەکانی سەروتارەکەی التاخی ئەوە بوو کە بەعس لە هەڵسەنگاندنی ئاواتە راستەقینەکانی خەڵکی کوردستان و بچووککردنەوەی دەسەڵاتی پارتی دیموکراتی کوردستان و تواناکانی شۆڕشی کورد و رێبەرایەتی بارزانی بەهەڵەدا چووە. لە سەروتارەکەدا هەوەها نووسرابوو کە ئەوەی کە جێگای داخە ئەوەیە کە ئەگەر ئەو هەڵسەنگاندنە هەڵانەی رۆژنامەی الثورە بەمزوانە سەرڕاست نەبێتەوە، لەوانەیە وڵات بەرو کارەسات بباتەپێش هەروەها کە پێشتر بردوویە. التاخی پرسیاری کردبوو بۆ مانگرتنە سیاسیە ئاشتیخوازە سەرکەوتوەکەی خەڵکی کورد بۆ دەربڕینی پشتیوانی لە بزووتنەوەی کورد وەک دابڕانی KDP لە کۆمەڵانی خەڵک هەڵدەسەنگێندرێت لەکاتێکدا کە ئەو خۆپیشاندانە فەرمیانە کە لە بەغداد بەڕێوە دەچن وەک پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵک لە دەوڵەتی عێراق هەڵدەسەنگێندرێن؟.

---

[٢٨٦]-مەبەستی تیلیگرامەکەی ٢٨ی ئابی ١٩٧٣ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوەیە (بەڵگەنامەی پێشوو).

٤- التاخی بانگەشەی ئەوەی کردبوو کە پەیوەندیەکانی نیوان بەعس و KDP ئاڵۆز بوە و ئەو متمانەیە کە پاش ڕێکەوتننامەی ئادار هاتبوە ئاراوە، ئێستا نەماوە. التاخی هەروەها پرسیاری کردبوو کە بۆ دەوڵەتی عێراق بۆ گۆڕینی پێکهاتەی کوردستان (مەبەستی تەعریب بوو) هەوڵ دەدات. هەروەها کۆمەڵێک مەسەلەی دیکە وەک ڕێگرتن لە بەشداریکردنی کوردەکان لە دەسەڵات و نەبوونی مافی یەکسان گومانی جدی دەربارەی ئەوە دروست کردوە کە ئایا ڕێکەوتننامەی ئادار جێبەجێ دەکرێت؟ ڕۆژنامەی التاخی هەروەها لە وەڵامی ئەو بانگەشەیەی ڕۆژنامەی الثورە کە ئەو مانگرتنە بە زەبری چەک بەڕێوەچوە، وتبووی سەرجەم خەڵکی کوردستان پشتیوانی لە ئامانجەکانی ئەو مانگرتنە دەکەن و سیاسەتی گۆڕینی پێکهاتەی نیشتمانی کوردستان شەرمەزار دەکەن. لە درێژەی سەروتارەکەی التاخیدا ئامارژە بەوە کرابوو کە ئێمە نکوڵی لە کاریگەری دەورە سەرکەوتوەکەی حیزبەکەمان لەو مانگرتنەدا ناکەین بەڵام پێمانوایە کە بەعس لە چەند ساڵی رابردوو کە دەسەڵاتی بەدەستەوە نەبوو نەیدەتوانی خۆپیشاندانی خەڵک بەڕێکخستن بکات.

٥- التاخی پرسیاری کردبوو کە ئایا زمانی چەک تەنها لە کوردستان هەیە؟ لە باشووی و ناوەڕاستی عێراق لە چی زمانێک کەڵک وەردەگیردرێت؟ التاخی ئامارژەی بەوە کردبوو کە پشتیوانی مادی و سەربازی هەندێ لە کاربەدەستانی ڕەوتگەلی تایبەت بە ئامانجی دژایەتیکردنی بزووتنەوەی کورد قەد سەرکەوتوو نابێت. التاخی بە ووتنی ئەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنابوو کە KDP قەد بانگەشەی ئەوەی نەکردوە کە نوێنەری سەرجەم خەڵکی کوردستانە بەڵکوو ئەوە بزووتنەوەی خەڵکی کوردستان و ئۆتونومی بۆ کوردستانە کە کێشەی هەموو کوردێکە. التاخی لە کۆتاییدا نووسیبووی کە KDP ئامادەیە ڕۆح و شەرتومەرجەکانی ڕێکەوتننامەی ئادار جێبەجێ بکات.

لۆڤری

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٦٥٧**

**٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣**

**بابەت: روانگەی دەوڵەتی میسر سەبارەت بە شۆڕشی کوردەکانی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەبەیروت، مۆسکۆ، تاران و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە قاهیرە.

ئاماژە بە: بروسکەی ٦٣٠ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- لە میانەی قسەوباسە دورودرێژەکانمان دەربارەی مەسەلە جۆراوجۆرەکان لە ٢٧ی تشرینی دووەم، باڵوێزی میسر لە عێراق، نەجاڕ[287]، پێمیوت پێیوایە ئێستا ئیمکانی چارەسەربوونی کێشەی ئۆتونومی کوردەکان هاوکات لەگەڵ نزیکبوونەوە لە ئاداری ١٩٧٤، لە ئارادایە. بە وتەی نەجاڕ، نە کوردەکان و نە دەوڵەتی عێراق لە بارودۆخێکیدا نین کە دەست بە شەڕ بکەنەوە و وتی بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە ئۆتونومی هەم واقعبینانەیە و هەمیش باشترین رێگاچارەیە، ئێستا نوخبە کورەکان ئەو رێگایانە قبووڵ کردوە و بانگەشەی ئەوەی کرد کە تەنانەت بارزانیش ئامادەیە ئەو رێگاچارەیە قبووڵ بکات. باڵوێزی میسر وتی پێشبینی ئەوە ناکات کە رێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ تا ئاداری ١٩٧٤ جێبەجێ بکرێت بەڵام هەر دوو لا رێگاچارەیەکی مامناوەندیان قبوڵە.

---

287 - Najjar

٢- نەجاڕ وتی پێکدادانەکانی ئەم دوایانەی شیوعیەکان و کوردەکان ئەوەندە گرنگ نیە و وتی دەوڵەتی عێراق چەکی داوە بە شیوعیەکان چونکە دەزانێت کوردەکان کاردانەوەی توندیان دەبێت و هەرواش بووە. بەوتەی باڵوێزی میسر ئامانجی راستەقینەی دەوڵەتی بەغداد ئەوەیە کە شیوعیەکان لاواز و فەلەج بکات و وتی سۆڤیەت لە حزبی شیوعی عێراق توڕە بوە کە بۆ کەوتوەتە ناو داو. باڵوێزی میسر لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سۆڤیەت ئێستا دەیەوێت کێشەکە چارەسەر بێت بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لە عێراق قایمتر بکات و وتی سۆڤیەت نە دەسی لە پلانە زیادەخوازانەکانی خۆی بە نیسبەت کەنداو هەڵگرتوە و نە دەسی لە بەکارهینانی کەمینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە پێناو ئامانجەکانی خۆیدا هەڵگرتوە بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەترەکانی، ئێستا پشتیوانی لە کوردەکان دەکات. بە بۆچونی باڵوێزی میسر ئامانجە گەورەترەکەی سۆڤیەت ئەوەیە کە کە پێگەیەکی قایم و سەقامگیر بۆ خۆی لەسەراسەری ناوچە درست بکات بۆ ئەوەی پێش لە چالاکیەکانی چین بگرێت و لەگەڵ رۆژئاوا ئاشت بێتەوە.

٣- باڵوێز نەجاڕ هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئێران ئێستا ئامادەیە کۆتایی بە یارمەتیدانی کوردەکان بهێنێت بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا پەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراق ئاسایی بکاتەوە و هەوڵە خراپکارانەکانی عێراق لە ئێران کۆتایی پێبێت. بەلەبەرچاوگرتنی ئەوە کە میسر لە درستبونی پەیوەندی دیپلۆماتیک لە نێوان ئێران و عێراقدا دەوری گێڕاوە، نەجاڕ زانیاری زیاتری دەربارەی گفتوگۆکانی ئێران و عێراق لابوو بەڵام زانیاری زیاتری نەدرکاند.

٤- نەجاڕ وتی ئامانجی میسر ئەوەیە عێراق و کەنداو سەقامگیر بێت بۆ ئەوەی قازانجە ئابوریەکانی چارەسەربوونی کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل بگات بە جیهانی عەرەب و وتی ئەگەر هەڵسەنگاندنەکانم دەربارەی ئامانجەکانی سۆڤیەت راست دەربچێت، ئیمکانی سەقامگیربوونی هەرێمی کەنداو زیاترە.

لۆڤری

**کۆشکی سپی**

**لە هێنری کیسینجێر(یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی)**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران(تەنها باڵوێز هێڵمز بیبینێت)**

**٢٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: ئاکام و ئەنجامە مەترسیدارەکانی ئۆتونومیەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئەمریکا**

ئاماژە بە:

- تیلیگرامی ٨٥٧، ٨٦٩ و ٨٧٢ ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران بۆ کۆشکی سپی
- تیلیگرامی ٤٠٧٧٠ی کۆشکی سپی بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- ئێستا دەتوانن بە شا بڵێن کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئامادەیە وەڵامی داواکاری کوردەکان بۆ وەرگرتنی یارمەتی لە ئەمریکا بەمشێوەیە بداتەوە:
جگە لە درێژەدان بە یارمەتیەکانی پێشوومان، ئێمە ئامادەین بڕی یەک ملیۆن دولار بۆ یارمەتیدانی ئاوارەکان تەرخان بکەین ئەگەر بەشێوەیەکی کاریگەر خەرج بکرێت.

ئێمە دەمانەویت ئەو بڕە پارەیە بۆ کڕینی خواردەمەنی بۆ ئاوارەکان (بەو جورە کە شا لە تیلیگرامی ٨٦٩ی باڵوێزخانەدا پێشنیاری کردوە) یا بۆ کڕینی پێداویستیە زۆر پێویستەکانی دیکە خەرج بکرێت. دەوڵەتی ئێران دەبێ ئەو پێداویستیانە بکڕێت و خواردەمەنیەکان تەسلیم بە ئاوارەکان بکات. ئێمە هەروەها ئامادەین دەست بە ناردنی بری ٩٠٠ هەزار پوند چەک و تەقەمەنی بچووک (کە وڵاتانی دیکە درستیان کردوە) بە فڕۆکە بۆ SAWAKی ئێران بکەین (بۆ ئەوەی بیدات بە کوردەکان).

٢- پێش ئەوەی کوردەکان لەم مەسەلەیە ئاگادار بکەنەوە، ئێوە دەربارەی ئەوە ئالوگۆری بیروڕا بکەن کە ئایا کوردەکان دەبێ بەمزوانە ئوتونومی رابگەیەنن یا نا. پاش ئەوەی کە ئەو بڕیارەتان لەگەڵ شا تاوتوێ کرد پێشنیارتان پێدەکەین ئەم خاڵانەی خوارەوە (کە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی خۆتان هاوتەریبە کە لە تیلیگرامی ٨٧٢ی باڵوێزخانەی تاراندا ئامāژەتان پێکردوە) لەبەرچاو بگرن:

الف- ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جارێکی دیکە دووپاتی دەکاتەوە کە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە راگەیاندنی پێشوەختی ئوتونومی لە لایەن کوردەکانەوە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و ئێران ناکات. بەرژەوەندی ئەمریکا لەوەدایە کە:

١- کوردەکان بەردەوام دەربارەی ئەو مافانەی کە دەوڵەتی بەغداد بە فەرمی ناسیویەتی، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق وتووێژ بکەن.

٢- دەستی دەوڵەتی ئێستای عێراق هەر بەم شێوەیە بە بەستراوی بمێنێتەوە بەلام عێراق پارچە پارچە نەبێت.

٣- عێراق بۆ هەمیشە پارچەپارچە نەکەن چونکە ئەگەر هەرێمێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێت ناتوانێت لە رووی ئابووریەوە خۆی بەخێو بکات و بەرژەوەندی ئێران و ئەمریکا لەوەدا نیە کە پەیوەندیە باشەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق (کە لە ژێر دەسەڵاتی رێبەرایەتیەکی مودیرندا بێت) بۆ هەمیشە بپچڕێنن.

٤- پشتیوانیکردن لە دەوڵەتێکی کوردی لەدرێژخایەندا (بەو شێوە بەرفراوانەی کە بارزانی داوای دەکات) لەوە زیاتر ناتوانێت بە شاراوەیی بمێنێتەوە. هەروەها بەلەبەرچاوگرتنی جەوهەری بەرژەوەندیەکانمان، ئێمە پێمانوایە کە ناتوانین لە

داهاتوودا لەو برە پارەیە کە ئێستا بۆ کوردەکان تەرخانمان کردەوە، پارەی زیاتر تەرخان بکەین. ئەگەر ئێمە ئێستا ئەوە قبووڵ بکەین کە کوردەکان ئۆتۆنومی رابگەیەنن، ناڕاستەوخۆ خۆمان پابەند دەکەین کە پشتیوانی لە کوردەکان بکەین و ئاکام و ئەنجامەکانی ئەو پشتیوانیە قبووڵ بکەین و خۆمان بخەینە ناو بەرەبەرەکانیەکی ئاشکرای درێژخایەن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، لە کاتێکدا کە ئێمە پێمانوایە بەربەرەکانیکردنی ئاشکرا لەگەڵ عێراق خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا و ئێران ناکات و لە درێژخایەنیشدا بە قازانجی کوردەکان نابێت.

ب- ئەگەر پاش قسەکردن لەگەڵ شا هەستتان کرد هیچ شتێک نیە کە پێویستی بە دوبارە بیرکردنەوە و سەرلەنوێ بڕیاردانەوەی ئێمە بێت، ئێوە دەتوانن بە پرسوڕا لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بەو شێوەیە کە خۆتان پیتانباشترە بڕیاری خوتان بە نوێنەرە کوردەکان رابگەیەنن.

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٧٠٦**

**٣٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣**

**بابەت: بۆچوونی دەوڵەتی تورکیە و سۆڤیەت دەربارەی کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، مۆسکو و تاران

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٦٣٦ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- باڵوێزی تورکیە لە عێراق بەردەوام لە نزیکەوە بەدوای کێشەی کورددا دەچێت و لە ١٩ی کانوونی یەکەم پێمیوت لە کاتی سەردانەکەی پۆنۆمارۆڤ[٢٨٨]، لێژنەی روسی دوو جار لەگەڵ شیوعیەکان و کوردەکان دیداری کردوە و دوابەدوای دیدار لەگەڵ لێژنەیەکی هاوبەشی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق، سەردانی (مەلا مستەفا) بارزانی کردوە. باڵوێزی تورکیا پێیوایە سۆڤیەت پێیخوش بووە کێشەی نێوان شیوعیەکان و کوردەکان هێور بکاتەوە و تا رادەیەکیش سەرکەتوو بووە بەڵام هیچ چەشنە سەرکەوتنێکی چڕوپڕی بەدەستنەهێناوە.

٢- بە پیچەوانەوە، هێرش و دژە هێرشە رۆژنامەوانیەکان لە نێوان رۆژنامەی "التاخی" زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان و "تەریقولشەعب" زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق لەماوەی دوو حەوتووی رابردوودا بەردەوام بووە و حیزبی شیوعی، کوردەکانی

---

[288] Ponomarev

تۆمەتبار کرد کە ڕێکەوتنەکەی ٢٠ی تشرینی دووەمیان جێبەجێ نەکردوە و شیوعیە ڕفێندراوەکانیان ئازاد نەکردوە. ڕۆژی ٢٥ی کانوونی یەکەم ڕۆژنامەی "تەریقولشەعب" ڕاگەیاندننامەی هاوبەشی حزبی شیوعی سوریە، ئوردون و لوبنانی بڵاو کردەوە کە تێدا هەڵسووکەوتی خراپی کوردەکان لەگەڵ شیوعیەکان شەرمەزار کرابوو. لەبەرامبەردا ڕۆژنامەی "التاخی" ئەو تۆمەتانەی ڕەت کردەوە و ڕایگەیاند حیزبی شیوعی عێراق لە پێناو بەرژەوەندی لایەنی سێیەمدا (مەبەستی دەوڵەتی عێراق بوو) کار دەکات بۆ ئەوەی سەرنجی گەلی کورد لە مەسەلە سەرەکیەکە واتا ئۆتونومی لا بدات.

٣- دەربارەی ئەو ڕاپۆرتە کە باس لەوە دەکات کە ئێران و عێراق لە بەشێک لە پەیوەندیە دیپلۆماتیکەکانیاندا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە لە کاروباری ناوخۆی یەکدیدا دەستێوەردان نەکەن، باڵوێزی تورکیا وتی دەوڵەتی تورکیە داوای لێکردوە بزانێت ئەو ڕاپۆرتە چەندە ڕاستە و ئەویش بەشێوەی فەرمی پرسیاری لە وەزارەتی دەرەوەی عێراق کردوە و وەزارەتی دەرەوەش لە وەڵامدا وتویەتی دەوڵەتی عێراق نە ئەو ڕاپۆرتە پشتڕاست دەکاتەوە و نە ڕەتیشی دەکاتەوە. بەهەرحاڵ باڵوێزی نوێی عێراق لە ئێران، مدحت ئیبراهیم جومعە[٢٨٩] ڕۆژی ٢٣ی کانوونی یەکەم گەیشتوەتە تاران.

٤- وادیارە ڕوسیە سەبارەت بە بارودۆخەکە خۆشبینە. باڵوێزی سۆڤیەت لە عێراق، ڤینیامین لیخاشۆف لە میانەی گفتوگۆیەکی موحتەرەمانەدا ڕۆژی ٢٠ی کانوونی یەکەم پێمیوت پێیوانیە شەڕێکی بەرفراوان لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا دەستپێبکاتەوە چونکە ئەو شەڕە لە قازانجی هیچکام لەو دوو لایەنەدا نیە. باڵوێزی سۆڤیەت وتی ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان پەیان بەوە بردوە کە باشترین هیوا بۆ ژیانی داهاتوویان لە عێراق دەبێت بەڵام هێشتا ئامادە نین لە دەرەوەی چوارچێوەی ڕێکەوتننامەیەک بەو ئامانجە بگەن. باڵوێزی سۆڤیەت وتی دەوڵەتی عێراق ئێستا هەوڵ دەدات لە ڕێگاگەلی ئابوریەوە کێشەکە چارەسەر بکات و داهاتی نەوت لە

---

[289] Medhat Ibrahim Jumaa

سەراسەری عێراق بڵاو بکاتەوە و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەمە ئیمکانگەلی باش دەرەخسێنێت. بە کورتی باڵوێزی سۆڤیەت پێشبینی دەکرد کە کێشەکە هێدی هێدی چارەسەر دەبێت بەڵام بەپەلە نابێت.

٥- بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ: باڵوێزی سۆڤیەت لە عێراق، ڤینیامین لیخاشۆف، پاش چوار ساڵ کارکردن لە بەغداد، رۆژی ٣٠ی کانوونی یەکەم عێراقی بەجێهێشت. لیخاشۆف وتی لە پێشەوە ئاگاری ئەو گۆڕانکاریە نەبوە. باڵوێزی سۆڤیەت بەشێوەیەکی دوستانە لەگەڵ نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد هەڵسووکەوتی کرد و سەرەڕای ئەو کەندوکۆسپانە کە عێراق بۆمانی درست کردوە، بانگهێشتی کردین سەردانیان بکەین و وتی بە باشترین شێوە پێشوازیمان لێدەکات. راوێژکارێکی میسری پێمیوت دەوڵەتی عێراق حەزی لە ڤینیامین لیخاشۆف نیە چونکە نە پسپۆڕی کاروباری عەرەبەکانە و نە ئینگلیزیش باش دەزانێت. بەگوێرەی راپۆرتەکان بڕیارە باڵوێزی پێشووی سۆڤیەت لە دیمەشق و نیکوزیا[٢٩٠] بێتە جێگای لیخاشۆف. ئێمە (نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد) سپاستان دەکەین ئەگەر ژیاننامەی ئەم باڵوێزە نوێیەمان بۆ بنێرن.

لۆڤری

[290] Nicosia

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٧٥٩**

**٣ی شوباتی ١٩٧٤**

**بابەت: وتووێژەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و دەوڵەتی عێراق بۆ ئۆتونومی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، موسکۆ، تاران و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق.

ئاماژە بە: تیلیگرامی A7ی ٣ی شوباتی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- رژیمی بەعس بە توندی لە سەر ئەوە شێلگیرە کە ١١ی ئاداری ١٩٧٤ ئۆتونومی بدات بە کوردەکان سەرەڕای ئەو راستیە کە روانگەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق دەربارەی جۆری ئەو ئۆتونومیە هێشتا لە یەک دوورە. پێشنیارەکەی گوڵانی ١٩٧٣ی پارتی دیموکراتی کوردستان (کە لە تیلیگرامی 27Aدا ئاماژەمان پێکردوە[٢٩١]) بە

---

[٢٩١] نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد مانگی گوڵانی ١٩٧٣ پەیامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و لە پەیامەکەدا ئاماژەی بەوە کردوە کە باڵوێزی فەرانسە لە بەغداد کۆپیەک لەو پێشنیارە ئۆتونومیە (کە پارتی دیموکراتی کوردستان خستوویەتیە بەردەم دەوڵەتی بەغداد) داوە بە لۆڤری، بەرپرسی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد. لە پەیامەکەدا خاڵە سەرەکییەکانی پلانە پێشنیارکراوەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان باس کراوە و ئاماژە بەوە کراوە کە هێشتا کاردانەوەی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە راگەیاندننامەکەی ئۆتونومی

تەواوی لەلایەن بەعسەوە رەتکرایەوە چونکە لە روانگەی بەعسەوە ئەو گەڵاڵەیە لەگەڵ سەربەخۆیی کوردستان یەکسانە. گەڵاڵە پێشنیارکراوەکەی بەعس لە کۆتایی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ خرایە بەردەستی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP). هەرچەند کە گەڵاڵەکەی بەعس لە گەڵاڵەکەی KDP زۆر دوورە، وادیارە KDP رازی بوە کە ئەو گەڵاڵەیە ببێت بە بنەمای وتووێژەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق. لێژنەکەی KDP بە سەرۆکایەتی سکرتێری KDP، حەبیب محمد کەریم[٢٩٢] رۆژی ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٧٤ گەیشتە بەغداد و رۆژی دواتر وتووێژەکانی لەگەڵ کۆمیتەی باڵای بەرەی نیشتمانی عێراق (کە لە حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراق پێکهاتوە) دەستپێکرد.

٢- KDP لە ژێر گوشاریکی گراندایە بۆ ئەوەی ئۆتونومیەکەی بەعس قبووڵ بکات و پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی عێراقەوە. رژێمی عێراق هەم لە گۆپال و هەم لە گیزەر کەڵک وەردەگرێت و لە پاریزگای سلێمانی شیوعیەکانی چەکدار کردوە و بەگوێرەی زانیاریەکان درێژە بە گوشاری سەربازی لە سەر گوندەکانی ئەو پارێزگایە و ناوچە جێناکۆکەکانی دەورەوبەری کەرکووک دەدات. رژێمی عێراق هەروەها هۆشداری بە KDP داوە کە تەنها ئەو نیە کە نوێنەرایەتی کوردەکان دەکات و هەمان کاتدا بەرنامەی سەرمایەگوزاری لە ناوچە کوردنشینەکانی دەستپێکردوە و بەڵێنی بە کوردەکان داوە خۆشبژێویان دەکات. رژێمی عێراق هەروەها ئێستا بەشێوەیەکی راستەوخۆتر پارە خەرج دەکات.

٣- یەکێتی سۆڤیەت و حیزبی شیوعی عێراق لەو مەسەلەیەدا بە تەواوی پشتی رژێمی عێراقیان گرتوە. ئێستا جگە لە رادیۆ موسکۆ کە پێداگری لە سەر KDPدەکات پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی و ئۆتونومیەکەی بەعس قبول

---

پارتی دیموکراتی کوردستان دیار نیە بەڵام لە کاتی تەسلیمکردنی ئەو پێشنیاری ئۆتونومیە بە دەوڵەتی عێراق، پەیوەندیەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و دەوڵەتی عێراق ئاڵۆزتر بوە (وەرگێڕ).

[292] Habib Mohammad Karim

بکات. سکرتێری گشتی حزبی شیوعی سوریە، خالید بەکداش[٢٩٣]، حیزبی تودەی ئێران و حزبی شیوعی لوبنان و ئوردونیش پەیامیان بۆ KDP و بارزانی ناردوە و تێدا رەخنەیان لە شەڕکردنی KDP لەگەڵ شیوعیەکان و پەیوەستنەبوونی بە بەرەی نیشتمانی عێراق گرتوە.

٤- باڵوێزی تورکیە لە عێراق، جوهروک[٢٩٤] پێمیوت خاڵە سەرەکیە ناکۆکی لە سەرەکانی وتووێژەکانی ئێستای کوردەکان و دەوڵەتی عێراق بریتین لە مەسەلەی سنوری هەرێمی کوردستان، سەرژمێری، کۆنترۆلکردنی سەرۆکی ئەنجومەنی راپەڕاندنی هەرێمی کوردستان لە لایەن دەوڵەتی ناوەندی و مافی دامەزراندنی کاربەدەستانی ناوچە، لەوانە پۆلیس.

٥- هەڵسەنگاندن: دوورە ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق هەتا کاتی رێکەوتنی کۆتایی لە مانگی ئادار چارەسەر بێت بەڵام وادیارە رژێمی عێراق لە پێگەیەکی بەهێزتردایە. هەر دوو باڵوێزی میسر و سۆڤیەت لە سەر ئەو باوەڕن کە ژمارەی ئەو ئەندامانەی KDP کە دەیانەوێت کێشەکە لە سەر بنەمای ئوتونومیەکەی بەعس چارەسەر بێت، رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبێت( هەروەها کە لە تیلیگرامی ٦٣٦ و ٦٨٩ دا ئاماژەمان پێکردبوو) بەڵام وادیارە بارزانی هێشتا لە نیازپاکی بەعس دڵنیا نیە. لایەنی خراپی بارودۆخەکەی ئێستا ئەوەیە کە سۆڤیەت و حزبی شیوعی عێراق بە تەواوی پشتی دەوڵەتی عێراقیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد گرتوە چونکە لەوانەیە شیوعیەکان پێیانوابێت چونکە ئەندامی بەرەی نیشتمانین، دەتوانن لە باتی درستکردنی کێشە بۆ بەعس، پێگەی خۆیان قایم بکەن. بڕیاری ئەم دوایەی دەوڵەتی عێراق بۆ کردنەوەی نوسینگە ناوچەییەکانی بەرەی نیشتمانی لە سەراسەری وڵات، ئامرازێکی نوێ دەداتە دەستی حزبی شیوعی بۆ ئەوەی دزە بکات ناو بەعس.

لۆڤری

---

293 Khalid Bakdash
294 Cuhruk

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٥٦٤٧**

**٦ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: ئاسۆی وڵاتی سەربەخۆی کوردستان و کێشەکانی ئێران و عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، مۆسکۆ، لیژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد (لەرێگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت)

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٩٨ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

کورتە: هیچ شتێک نیە کە نیشان بدات ئێران پێیخۆش بێت پێش لە چارەسەربوونی کێشەی کوردی عێراق بگرێت هەروەها کە لە پاراگرافی سێی ئەم بروسکەیەدا ئاماژەی پێدەکرێت. هاوکات لەگەڵ ئەوەی شتێکی لۆژیکیە کە ئێران خوازیاری ئەوە نیە کە هەرێمێکی سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆی کوردستان (کە لە رووی ئابوریەوە بتوانێت خۆی بەخێو بکات) لە خاکی عێراقدا دابمەزرێت بەڵام ئەوە ئەو جۆرە ئۆتونومیە نیە کە دەوڵەتی عێراق خستویەتیە بەردەم کوردەکانی بارزانی. بەهەرحاڵ کوردەکانی ئێران، سەرەڕای ئەو تێکەڵاویە هاوخوێنیە کە لەگەڵ برا کوردەکانی عێراقدا هەیانە، دورە کە هیچ شتێک کەمتر لە کوردستانی سەربەخۆ سەرنجیان رابکێشێت بەڵام بارودۆخی ئابووری ئێستای کوردەکانی ئێران و ئاسۆی ژیانێکی باشتر لە ئێران لە سەرووی ئەو ژیانەیە کە لەوانەیە کوردەکان لە شاخەکانی عێراقدا دەسیان بکەوێت.

١- ئێمە هیچ شتێکمان نەبینیوە کە نیشان بدات ئێران نایەوێت کێشەی کوردی عێراق لە سەر بنەمای ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ جێبەجێ بێت. کاربەدەستانی عێراقیش بە هەمان شێوە شتێکی وایان دەرنەبڕیوە بەڵام تەنها ئەگەر لە ڕوانگەی لۆژیکیەوە سەیری مەسەلەکە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ئێران دژی ئەوەیە کە وڵاتێکی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆی کورد لە سەر سنورەکانی ڕۆژئاوای دابمەزرێت. بەهەرحاڵ وڵاتێکی کوردی وەها بۆ ئەوەی بتوانی لە ڕووی ئابووریە خۆی بەخێو بکات، دەبێ کۆنترۆلی سەرچاوەگەلی ئابووری سەرەکی وەک نەوتی کەرکووکی لە دەسدا بێت. تا ئەو شوینە کە ئێمە ئاگادارین دەوڵەتی عێراق ئەوەندە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری نادات بە کوردەکان کە بتوانن کوردستانیکی ئوتونومی پێدابمەزرێنن کە کوردەکانی ئێران و تەنانەت سەرجەم کوردەکانی عێراقیش بەرەولای خۆی رابکێشێت.

٢- بە پێچەوانەی برا کوردە عێراقیەکانیان، کوردەکانی ئێران ٢٥ ساڵە بە ئاشتی لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی ئێراندا دەژین و لە ماوەی ئەم ٢٥ ساڵەدا و بەتایبەت لە پێنج ساڵی رابردودا دەوڵەتی ئێران بەجدی بۆ باشترکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی - ئابووری کوردەکانی خۆی هەوڵیداوە لە کاتێکدا کە یارمەتیەکی سنوورداری بە خەباتی کوردەکانی ئەو بەری سنوور داوە کە ئەویش هانای سیاسی هەبوە. کوردەکانی ئێران ئێستا خاوەن سیستمی پێشکەوتووی ڕێگەوبانی ئاسفالت و ڕێگاوبانی خاکیی باش لە سەراسەری ناوچەکەیانن و دەوڵەتی ناوەندی پارەیەکی یەکجار زۆر بۆ درستکردنی بەنداو و پرۆژەی کشتوکاڵی خەرج دەکات. بەگوێرەی پلانی پێنج ساڵەی ئێستای ئێران، ناوچەی کوردنشین پلەی دووەمی بودجەی گەشەپێدانی پێدراوە. بێ گومان ئەو بەرنامەیە بە ئەنجام گەیشتوە چونکە ئەو کاربەدەستانەی پارێزگا کوردنشینەکان کە کاربەدستانی کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز سەردانی کردوون، بەنیسبەت وەفاداربوونی کوردەکان بە ئێران هیچ نیگەرانیەکیان نیە. لە کاتێکدا کە ئێران سینگی خۆی بۆ قبووڵکردنی ڕاستی کوردەکانی خۆی بەرفراوانتر کردوە، پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتی عێراق و

کوردەکانی بارزانی ئەوەندە خراپتر بوە کە هەم کوردەکانی ئێران و هەم کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران بە دووری نازانن کە ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق هەڵبوەشێتەوە، چی بگات بەوەی کە جێبەجێ ببێت.

٣- بە کورتی ئێمە پێمانوانیە کە دەوڵەتی ئێران ئەوەندە نیگەرانی ئەنجام و ئاکامەکانی جێبەجێبونی ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ بێت کە ئەو کردەوە پێشگیرانانە بگرێتەبەر کە نجارِ، باڵوێزی میسر لە عێراق باسی کردوە.

هێک[295]

295 Heck

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٨٢٥**

**١٠ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: ئوتونومیەکی ناواقعی بۆ کوردستان و بەردەوامبوونی شەڕی دەروونی لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، موسکۆ، تاران، قاهیرە، لیژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٩٨ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا

١- رۆژی ٣ی ئادار ئەنجوومەنی بەرەی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی سەدام حوسەین، جێگری سەرۆکیRCC ( ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق - وەرگێڕ) دوایین بڕیارنامەی ئوتونومی کوردستانی پەسەند کرد و رۆژی ٩ی ئادار حیزبی بەعس لە کۆنفراسی هەشتەمی نائاسایی خۆیدا بڕیاریدا ئوتونومی کوردستان لە رۆژی ١١ی ئادار رابگەیەنێت. بەرەی نیشتمانی عێراق رۆژی ١٠ی ئادار بە بەشداری ٦٦٥ کەسایەتی عێراقی کۆ بوەوە بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە تاوتوێ بکات.

٢- سەرەڕای ئەو شتانە کە باس کرا، هیچ شتێک لە ئارادا نیە کە نیشان بدات KDP بە ئوتونومیەکەی بەعس رازی بوە. بەپێچەوانەوە، رۆژنامەی التاخی، زمانحاڵی KDP لە هەفتەی رابردودا دەربارەی وتووێژەکانی ئوتونومی بە تەواوی بێدەنگ بوو و رۆژی ١٠ی ئادار بڕیارەکەی بەعس بۆ راگەیاندنی ئوتونومی کوردستانی

له چوارچێوەی هەواڵێکی بچووکدا و بێ هیچ شرۆڤەیەک بڵاو کردەوە. بەگوێرەی زانیاریەکان وتووێژەکانیKDP و بەعس هەفتەی رابردوو پەکی کەوتوە و ئەو کوردانەی کە لەو وتووێژەدا بەشداریان کردوە لەگەڵ چوار وەزیرە کوردەکەی دەوڵەتی عێراق، بەغدادیان بەجیهێشتوە و روویان لە ریزەکانی بارزانی کردوە. بەگوێرەی زانیاریەکان، سەدام حوسەین وەک دوایین هەوڵ بۆ رازیکردنی KDP چوە بۆ هەولێر بۆ ئەوەی لەگەڵ بارزانی دیدار بکات.

لە هەمان کاتدا دەنگۆیەکی زۆر هەیە کە دەوڵەتی عێراق باکووری وڵاتی بومباران کردوە و پێشمەرگەکان بە فەرمانی بارزانی بەرەو بنکەکانی خۆیان لە شاخەکاندا پاشەکشەیان کردوە. وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی هیند، سوری[٢٩٦]، دەڵێت لەم رۆژانەی دواییدا شەڕێکی دژوار لە نزیکی کەرکوک رویداوە کە تێیدا سوپای عێراق لە هێلیکۆپتەر و تانک دژی پێشمەرگەکان کەڵکی وەرگرتوە. دەڵێن سوپای عێراق لە سەراسەری باکور کەوتوەتە جموجۆڵ و ئامادەیە دەس بە کار بێت. هەروەها بەگوێرەی زانیاریەکان، پێشمەرگان ئەم جارە باشتر لە رابردوو بەرێکخستن کراون و تەیارترن و(بە وتەی وابەستە سەربازیەکەی باڵوێزخانەی هیند) سێ بەتالیونی رێکوپێکیان هەیە.

٤-هەڵسەنگاندن: شەڕی دەرونی لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا بەردەوامە و هیچ شتێک لە ئارادا نیە کە نیشان بدات هیچ کام لەو دوو لایەنە بیەوێت ئیمتیاز(پوان) بە ئەوی دی بدات. دەوڵەتی عێراق هەوڵیداوە وا نیشان بدات کە خەڵک بە گشتی پشتیوانی لە ئوتونومیە پێشنیارکراوەکەی ئەو دەکەن و دەیەوێت درز بخاتە ناو ریزەکانی کوردەکان بەڵام تا ئێستا سەرکەوتوو نەبوە. هەرچەند کە سپای عێراق لە جموجۆڵدایە بەڵام وادیارە دەوڵەتی عێراق نایەوێت فەرمانی هێرشی هەمەلایەنەی سەربازی دەربکات چونکە لە ساڵەکانی ١٩٦١-١٩٦٩دا چوار جار فەرمانێکی وای دەرکرد بەڵام بە هیچ ئەنجامێکی درێژخایەن نەگەیشت. ئێستا کات لە قازانجی دەوڵەتی عێراقدایە و بارزانی لەگەڵ ئەو مەترسیە روبەڕویە کە پێشمەرگەکان

---

[296] indian milatt suri

لێیداببڕێن چونکە دەوڵەتی عێراق تەماحی مادی زۆری خستەوە بەردەمیان و کوردە غەیرە عەشیرەتیەکان پێیانخۆش نیە بگەڕێنەوە ناو ژیانی شاخ.

٥- دەوڵەتی عێراق بەردەوام پێیوایە ئێران نایەوێت کێشەکە چارەسەر بێت و وەزیری دەرەوەی عێراق، عبدالباقی[297]، لە رونکردنەوەیەکدا بۆ باڵوێزی وڵاتانی عەرەبی دەربارەی پێکدادانە سنوریەکان وتی ئێران لەوە دەترسێت کە ئەگەر ئۆتونومی کوردەکانی عێراق سەربکەوێت، کوردەکانی ئێران کێشە بۆ دەوڵەتی ئێران ساز بکەن. دەوڵەتی عێراق لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بارزانی هە تا کاتێک کە حیساب لە سەر پشتیوانی وڵاتانی بیانی بکات، ئەو پوانانە قبول ناکات کە دەوڵەتی عێراق پێیدەدات. ئەو راستیە کە هاوکات لەگەڵ نزیکبونەوە لە ١١ی ئادار، دژوارترین شەڕ لە سەر سنووری ئێران و عێراق رودەدات، گەلێ لە پسپۆڕانی هێناوەتە سەر ئەو قەناعەتە کە ئەو بانگەشانەی عێراق هەندێ راستیان تێدایە. بەهەرحاڵ بە بۆچونی زۆربەی پسپۆڕان، هۆکاری ئەو مەسەلەیە ململانێی ئێران و عێراق لە کەنداوە نە نیگەرانی ئێران لە کێشەی کوردەکانی خۆی.

لۆفری

297 Abdul Baqi

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٨٣١**

**١٤ی ئاداری ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: ئولتیماتومی دەوڵەتی عێراق بە کوردەکان بۆ قبوڵکردنی ئوتونومی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، موسکۆ، تاران، قاهیرە، لیژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٤١ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا

١- سەدام حوسەین جێگری سەرۆکی RCC (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق)، رۆژی ١٢ی ئادار لە کوبونەوەیەکی بەرەی نیشتمانی عێراقدا قسەی کرد و رایگەیاند KDP (پارتی دیموکراتی کوردستان) ١٥ رۆژ کاتی هەیە بۆ ئەوەی پەیوەست بێت بە بەرەی نیشتمانی عێراق و بەیاننامەی ئوتونومی ١١ی ئادار قبووڵ بکات. سەدام وتی لەو ماوەیەدا رژێمی عێراق وەک هاوپەیمانیک لەگەڵ KDP هەڵسووکەوت دەکات بە مەرجێک کە KDP یاسای ئوتونومی پێشیل نەکات و لەو رەوتەدا بەشداری بکات و وتی دوای بەسەرچوونی ئەو ماوەیە، ئەو پێشنیارە ئیدی لە ئارادا نابێت.

سەدام حەسەین وتی KDP دەبێ ٤ ساڵی رابردوو کە بێ شەڕ تێپەڕ بوە، وەک نیازپاکی رژیمی عێراق لێکبداتەوە و وتی رژیمی عێراق زۆر خەمی داهاتووی گەلی کورد دەخوات.

٣- سەدام حوسەین ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بە جیابوونەوەی دوو رێبەری KDP لە بارزانی لە سەرەتای مانگی شوبات کرد (کە لە تیلیگرامی ٧٩ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوەدا باس کراوە[٢٩٨]) و وتی تەنانەت ئەگەر رژیمی عێراق لەگەڵ رێبەرایەتی ئێستای KDP رێکنەکەوێت، KDP پەیوەست بە بەرەی نیشتمانی دەبێت و پێی لە سەر ئەوەداگرت کە گەلی کورد بە هەرەشە بە چۆکدا نایێت.

٤- رۆژنامەی التاخی، زمانحاڵی KDP رۆژی ١٣ی ئادار بڵاو نەبوەوە.

لۆڤری

---

[٢٩٨] نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد ١١ی شوباتی ١٩٧٤ تیلیگرامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و باسی ئەوەی کردوە کە رۆژنامەی الرشید بانگەشەی ئەوەی کردوە کە سێ کەس لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی KDP بە ناوەکانی عەزیز عەقراوی، ئیسماعیل مەلا عەزیز و هاشم عەقراوی لە بارزانی جیابوونەتەوە. لە تیلیگرامەکەدا ئاماژە بەوە کراوە کە ئەو بانگەشەیە هەوڵێکی بەعسە بۆ ئەوەی درز بخاتە ناو ریزەکانی KDP و گوشار بخاتە سەر بارزانی بۆ ئەوەی تا مانگی ئادار لەگەڵ دەوڵەتی عێراق رێکبکەوێت. وەرگێڕ

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە موسکۆ**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٦٨٤٨**

**١٤ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: پشتیوانیکردنی سۆڤیەت لە ئوتونومی دەوڵەتی عێراق بۆ کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، قاهیرە، تاران، کونسولخانەی ئەمریکا لە لینینگراد، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و دیمەشق و نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویورک.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١١٨ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- کورتە: دیمشینکۆ[٢٩٩]، لە نووسەرە پسپۆڕەکانی رۆژنامەی پراودا[٣٠٠] رۆژی ١٣ی ئادار شرۆڤەیەکی بڵاو کردەوە کە تێیدا پشتیوانی تەواوی خۆی لە بەیاننامەکەی دەوڵەتی عێراق دەربارەی ئوتونومی کوردستان دەربڕیبوو. ئەو وتارە "داردەستانی بیانی" و "کەسایەتیە کوردە راستڕەوەکانی" تۆمەتبار کردبوو کە کەندوکۆسپ بۆ چارەسەری کۆتایی کێشەی کورد درست دەکەن بەڵام خۆشبینی خۆی دەربڕیبو کە کێشەکان بەم زوانە چارەسەر دەبێت.

---

299 Demchenko

300 Pravda

٢- دیمشینکۆ نوسیبووی ڕاگەیاندننامەکەی ئۆتونومی دەوڵەتی عێراق بۆ کەمینەی کورد، هەنگاوێکی مێژوویی گرنگ و بەرچاو لە ڕەوتی بەرەپێشچوونی عێراقدایە و ئەو هەنگاوەی دەوڵەتی عێراق کۆتایی بە ساڵەها شەڕ و خوێنڕشتن دەهێنێت (کە بە هاندانی ئیمپریالیزمی بریتانیا و حکومەتی پاشایەتی عێراق ئەنجام دراوە) و جێبەجێکردنی ڕیکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ کە دەوڵەتی عێراق بەڵێنی داوە، مافە نەتەوەییە بنەڕەتیەکانی کوردەکان دەستەبەر دەکات.

٣- دیمیشینکۆ جەختی لە سەر ئەوە کردبووەوە کە پێکهاتنی بەرەی نیشتمانی عێراق لە نێوان حزبی بەعس و حزبی شیوعی عێراق، کێشەی کورد چارەسەر دەکات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە هەندێ گیروگرفت لە ئارادایە و باسی ئەوەی کردبوو کە "داردەستانی بیانی" دەست لە کاروباری کوردەکاندا وەردەدەن و "کەسایەتیە ڕاستەکانی" ناو پارتی دیموکراتی کوردستان هەوڵ دەدەن بۆچوونی جیابونەوە لە عێراق بەرەوپێش بەرن و هەمووی ئەمانەش دەستی دژمنانی عێراقی تێدایە. دیمیشینکۆ لە درێژەدا وتبووی لە هەمان کاتدا هێشتا کۆمەڵێک بیروڕای جیاواز دەربارەی شرۆڤەکردنی ڕاگەیاندننامەی ئاداری ١٩٧٠ و پێناسەکردنی سنورەکانی هەرێمی کورستان لە ئارادایە. دیمیشینکۆ ئاماژەی بەوە کردبوو کە لەگەڵ ئەمەشدا بەگوێرەی ئەو ڕاپۆرتانە کە لە بەغدادەوە دێن، ئەم ناکۆکیانە لە ماوەی ١٥ ڕۆژی داهاتوودا چارەسەر دەکرێن.

٤- تێبینی: شرۆڤە ئەرێنیەکەی دیمیشینکۆ دەربارەی ڕاگەیاندننامەکەی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت ئۆتونومی کوردەکان و پێناسەکردنی "کوردە ڕاستەکان" و "داردەستانی بیانی" وەک دژمنانی عێراق، دەربڕی ئەوپەڕی پشتیوانیکردنی سوفیەت لە دەوڵەتی عێراقە. ئەم هەڵسەنگاندنەی دیمیشینکۆ ئەو ڕوانگەیە پشتڕاست دەکاتەوە کە سۆڤیەت بە تەواوی پشتی ڕاگەیاندنامەکەی بەعس دەربارەی ئۆتونومی کوردەکانی گرتوە.

ستۆئیسێل[٣٠١]

---

301 Stoessel

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٣٢١٨**

**١٥ی ئاداری ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: کاردانەوەی تورکیە سەبارەت بە هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوان دەوڵەتی عێراق و هێزەکانی بارزانیدا**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، قاهیرە، مۆسکۆ، تاران، کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدەنە، ئێستانبوول، ئیزمیر، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و لێژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان.

١- هەندێ زانیاریمان لە سەرچاوە سەربازیەکانی تورکیەوە پێگەیشتوە کە دەوڵەتی تورکیە دوابەدوای دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان دەوڵەتی عێراق و هێزە کوردەکانی بن ڕێبەرایەتی بارزانی، سنوری خۆی لەگەڵ عێراق داخستوە. هەروەها بەگوێرەی ئەو سەرچاوانە، هێزەکانی ژاندارمری و سپای تورکیە لە سەر سنوور لە ئامادەباشیدان بۆ ئەوەی پێش لەوە بگرن کە لە خاکی تورکیاوە یارمەتی بچێت بۆ هێزە کوردەکان و نەهێڵن ئاوارە کوردەکان بە تاک یا بە کۆمەڵ دزە بکەنە ناو خاکی تورکیە.

٢- کاربەدستێکی وەزارەتی دەرەوەی تورکیە (ئەربەک[٣٠٢]، بەرپرسی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیای وەزارەتی دەرەوە) لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی رێژەی توندبوونی شەڕەکە، رۆژی ١٥ی ئادار وتی چاپەمەنیەکانی تورکیا شەڕەکەی باکووری عێراقیان گەورە کردوەتەوە بەڵام بەهەرحاڵ وتی بە گوێرەی ئەو زانیاریانە کە هەیەتی، هێزەکانی بارزانی شاری سنووری زاخۆ(کە لە سەر یەکێ لە رێگا سەرەکیەکانی نێوان تورکیە و عێراق هەڵکەوتوە) یان گرتوە.

٣- ئەربەک وتی ئێستا هیچ نیگەرانیەک دەربارەی ئاسایشی ئەو یەک میلیون و ٣٠٠ هەزار کەسە بە رەگەز تورکە لە ئارادا نیە کە لە عێراق دەژین.

٤- رۆژنامەکانی تورکیە مەسەلەی یارمەتیدانی سەربازی ئێران بە بارزانیان تاوتوێ کردوە و لەم پەیوەندیەدا ئاماژەیان بەوە کردوە کە ئەمریکا پشتیوانی لە ئێران دەکات و سۆڤیەت پشتیوانی لە عێراق دەکات. بە وتەی رۆژنامەکان ئەو ناکۆکیە تەعبیر لە ململانیی ئێران و عێراق بۆ دەسەڵات لە کەنداوی فارس دەکات و پەیوەندیەکی زۆری بە تورکیاشەوە هەیە چونکە تورکیە هاوپەیمانی یەکێ لەو دوو وڵاتەیە (مەبەستی ئێرانە - وەرگێڕ) و دۆست و ورگری نەوتی ئەوی دیکەیانە (مەبەستی عێراقە - وەرگێڕ).

مەکۆمبێر[٣٠٣]

302 Arbak
303 Macomber

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مۆسکۆ**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٦٩٢٨**

**١٦ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: روانگەکانی سۆڤیەت سەبارەت بە کێشەی کورد و رێبەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، تاران، کونسولخانەی ئەمریکا لە لینینگراد و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و دیمەشق.

ئاماژە بە: بروسکەی ٣٥٩٠ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مسکۆ

١- کورتە: لە کاتی قسەوباس لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا لە رۆژی ١٦ی ئادار، جێگری بەرپرسی بەشی کاروباری وڵاتانی رۆژهەڵاتی نزیک لە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت، پێرلین[٣٠٤]، باسی کێشەی کورد و پەیوەندیەکانی ئێران و عێراقی کرد. پیرلین پشتیوانی تەواوی سۆڤیەتی لە سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت کوردەکان دەربڕی و وتی دەوڵەتی سۆڤیەت پێداگری لە سەر عێراق و ئێران کردوە کێشە سنوریەکانیان بە شێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکەن.

٢- کاتێک کە باڵوێزی ئەمریکا باسی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراقی کرد، پیرلین باسەکەی گۆڕی بۆ کێشەی کورد و وتی دەوڵەتی عێراق وەڵامی ئەرێنی بە خەباتی

---

304 -PERLIN

کورد بۆ ئۆتونومی داوەتەوە بەڵام کێشەی کوردەکان کێشەیەکی ئاڵۆزە. پیرلین بە هەمان شێوە کە باسی فەلەستینییەکانی دەکرد، دەربارەی کوردەکانیش وتی کوردەکان رێبەریان نیە و یەکگرتوو نین. هەروەها وتی پارتی دیموکراتی کوردستان یەکدەس نیە و هەموو لایەنەکانی نیو پارتی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بە ناوی سەرجەم پارتیەوە قسە دەکەن وَ هەموشیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بە ناوی بارزانیەوە قسە دەکەن. پیرلین دەربارەی بارزانی وتی" بارزانی پیر بوە".

٣- پیرلین وتی دەستێوەردانی هێزە بیانیەکان، بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کردوە و ئاماژەی بەوە کرد کە ئێران و تورکیا کەمینەیەکی گەورەی کوردیان هەیە، هەر بۆیە بۆ نمونە تورکیە وەک کاردانەوەیەک لە بەرامبەر راگەیاندنی ئۆتونومی کوردەکان لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە، ئاسایشی سنورەکانی خۆی لەگەڵ عێراق توندتر کردوە. پیرلین وتی پێکدادانە سنوریەکانی ئێران و عێراقیش پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە.

٤- پیرلین وتی پێکدادانەکانی ئەم دوایانەی ئێران و عێراق، بوەتە کێشە بۆ سۆڤیەت. هەروەها وتی دەوڵەتی سۆڤیەت هەوڵ دەدات پەیوەندی باشی لەگەڵ ئێران و عێراق هەبێت و خۆشحاڵە کە لەم مانگانەی دواییدا پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق بەرەو باشبوون چوە (مەبەستی ئاڵوگۆرکردنی باڵوێز لە نێوان ئێران و عێراق بوو) بەڵام وتی بەهەرحاڵ پێکدادانە سنوریەکانی ئەم دوایە نیشانیدا کە پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق زۆر باشتر نەبوە. پیرلین هەروەها وتی سۆڤیەت پیداگری لە سەر ئێران و عێراق کردوە کێشەکەیان بە شێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکەن بەڵام هیچ بەرەوپێشچونێکیراستەقینە نەهاتوەتە ئاراوە، هەر بۆیە سۆڤیەت خۆی لە ناو بارودۆخیکی دژواردا دەبێنێت.

٥- دەربارەی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق، پیرلین ئەو زانیاریەی پشتڕاست کردەوە کە عێراق یەک بەرمیل نەوت بە ١٢ دولار دەدات بە سۆڤیەت.

٦- هەڵسەنگاندن: پشتیوانیکردنی پیرلین لە سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت کوردەکان لەگەڵ ئەو هێڵە هاوتەریبە کە رۆژنامەکانی ئیرە دەیڵێن بەڵام بەهەرحاڵ

وادیاره بەپێچەوانەی پێشبینیەکەی رۆژنامەی "پراودا" کە نوسیبووی لە ماوەی دوو حەوتووی داهاتوودا کێشەی کورد و دەوڵەتی عێراق چارەسەر دەبێت، پیرلین زۆر هیوای بە چارەسەربوونی کێشەکانی نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق نیە. بۆچونەکانی پیرلین بەنیسبەت پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق نیشان دەدات کە لەگەڵ ئەوەدا کە سۆڤیەت پشتی سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت کێشەی کوردەکان دەگریت و ئاگاداری ئەگەری دەستێوەردانی وڵاتانی بیانی لە کێشەی کورددایە بەڵام پشتی دەوڵەتی بەغداد سەبارەت بە کێشە سنوریەکەی لەگەڵ ئێران ناگریت.

ستۆیسیل

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٨٤٢**

**١٧ی ئاداری ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: روانگەکانی میسر دەربارەی کێشەی کورد و پێکهاتەی رێبەرایەتی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، تاران، قاهیرە، لێژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٣٦،١٤١و١٤٤ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- باڵوێزی میسر لە عێراق، عبدالمنعم النجار[٣٠٥] داوای لێکردم سەردانێکی بکەم و رۆژی ١٦ی ئادار بە ماوەی زیاتر لە کاتژمێرێک بینیم. النجار شتی زۆری دەربارەی کێشەی کورد لە مێشکدا بوو.

٢- النجار وتی باڵوێزخانەی میسر پەیوەندی نزیکی لەگەڵ رێبەرایەتی کوردی عێراقدا هەیە و ئاماژەی بەوە کرد کە رێبەرایەتی کوردی عێراق لە سێ گروپ پێکهاتوە: گروپی یەکەم "راستەکانن" کە دژی قبوڵکردنی یاسای ئوتونومیەکەی بەعسن و

[305] Abdel Moneim Al-Naggar

دەیانەوێت ئەوەندە درێژە بە خەباتەکەیان بدەن کە دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێت کە کوردەکانی ئێران، تورکیە و سوریە لە خۆ بگرێت. گروپی دووەم "میانەڕەوەکانن" کە زیاتر لە کوردە غەیرە عەشیرەتیەکان پێکدێت و لە لایەن ئەو کوردانە کە وەک وەزیر لە ناو دەوڵەتی عێراقدا کار دەکەن و هەروەها سەرنوسەری رۆژنامەی "التاخی"، دارا تۆفیقەوە نوێنەرایەتی دەکرێن.

ئەم کەسانە کوردە ناسیونالیستە واقعبینەکانن و خوازیاری قبوڵکردنی یاسای ئوتونومین و لە ناو دەوڵەتی عێراقدا کار دەکەن بۆ ئەوەی ئابووری کوردەکان باشتر بکەن و ئوتونومی کولتووری کوردەکان پەرەپێبدەن. ئەم گروپە دەڵێن ئەگەر بتوانن لە ماوەی پێنج ساڵی داهاتوودا لە عێراق بگەن بەم ئامانجانە، ئێران و تورکیەش ناچار دەبن کۆمەڵێک ماف بدەن بە کوردەکانی خۆیان. گروپی سییەم "چەپەکانن" کە جەلال تالەبانی و عەزیز عەقراوی نوێنەرایەتیان دەکات کە جارێکی دیکە لە بارزانی دابڕاون و دەوڵەتی عێراقیش پشتگوێی خستوون و خۆیان نوێنەرایەتی خۆیان دەکەن.

٣- النجار وتی "راستەکان" زیاتر پێشمەرگەکان و سەرۆک عەشیرەتەکانن کە تا ئێستا زیاترین کاریگەریان لە سەر بارزانی هەبوە. هۆکاری ئەوەی کە دارا تۆفیق و رێبەرانی دیکەی کورد بەغدادیان بە جێهێشتوە، ئەوە نیە کە لەوەترسابن بەعس سزایان بدات (چونکە بنەماڵەکانیان هێشتا لە بەغدادن) بەڵکوو بۆ ئەوە بوە کە قەناعەت بە بارزانی بهێنن یاسای ئوتونومی هەتا رۆژی کۆتایی واتا ٢٦ی ئادار قبووڵ بکات. النجار وتی رژیمی عێراق، قازانجی مادی و مەعنەوی باش بە بارزانی وەک رێبەری کورد دەدات ئەگەر بارزانی یاسای ئوتونومی قبووڵ بکات. بەهەرحاڵ ئەو شتە بە مردنی بارزانی کۆتایی پێدێت و نادرێت بەو کەسانەی کە جێگای دەگرنەوە.

٤- النجار وتی لە روانگەی ئەوەوە، ئامانجەکانی "راستەکان" بە تەواوی ناواقعبینانەیە و ئاماژەی بەوە کرد کە "راستەکان" داوای پشتیوانیان لە میسر کردوە و ئەویش پێیوتوون کە میسر تەنها لە چوارچێوەی مرۆڤدۆستانەدا سەرنج بە کوردەکان دەدات

و لەوە زیاتر ناچیتە پێش چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی یەکێتی عەرەب و سەقامگیری ناوچە، و کەمینە نەتەوەیەکانی دیکەی ناو جیهانی عەرەب هان دەدات. النجار بە دڵنیایەوە وتی کە سەرجەم باڵوێزخانەکانی وڵاتانی دیکەی عەرەبیش هەمان وەڵامیان بە کوردە"راستەکان" داوەتەوە.

٥- النجار لە سەر ئەو باوەڕەیە کە تەنها سەرچاوەیەکی بیانی کە یارمەتی کوردەکان دەدات ئێرانە و وتی ئەگەر ئێران سنورەکانی خۆی دابخات (بەو شێوەیە کە تورکیە دایخستوە) کێشەی کوردی عێراق کۆنترۆڵ دەکرێت. النجار هەروەها پێیوایە کە عێراق بە جدی هەوڵ دەدات لە ئێران نزیک بێتەوە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە میسر هانی عێراق دەدات لە باتی پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعس، سیاسەتی جیهانی عەرەب لە کەنداو پەیڕەو بکات چونکە پەیڕەوکردنی سیاسەتی بەعس دەبێتە هۆی ئەوەی کێشەی لەگەڵ ئێران بۆ ساز بێت. النجار وتی خۆشحاڵە کە عێراق رازی بوە لە "کۆنفرانسی پیسبوونی کەنداو" لەگەڵ ئێراندا بەشداری بکات و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە بە گشتی لە رەوتی پێشهاتەکانی عێراق، خۆشحاڵە بەتایبەت هەوڵە چڕوپڕەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ گەشەپێدانی ئابووری، رێکەوتن لەگەڵ فەرانسە و ژاپۆن، دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ دەوڵەتی ئاڵمان و دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ بریتانیا کە چاوەڕوان دەکرێت بەم زوانە جێبەجێ بێت.

٦-هەڵسەنگاندن: هەرچەند کە النجار خۆی وای نەگوت بەڵام روونە کە پێیوایە دەوڵەتی ئەمریکا دەتوانێت کاریگەری لە سەر دەوڵەتی عێراق دابنێت و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێمە دەبێ هەرچی لە دەسمان دێت بیکەین بۆ ئەوەی کێشەی کوردی عێراق چارەسەر بێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندیە درێژخایەنەکانی سەقامگیری ناوچە و بەرژەوەندیە کورتخایەنەکانی میسر و جیهانی عەرەب دەستەبەر بێت.

لۆڤری

**لەلایەن هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: ژنیراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی**

**٢٠ی ئاداری ١٩٧٤**

**بەپەلە، نهێنی**

**بابەت: ناوەڕۆکی دیدارەکەی مەلا مستەفا بارزانی و شا**

١- زەحمەت نەبێت ئەم پەیامە بە زووترین کات بگەیەنە دەستی هێنرِی کیسینجێر، وەزیری دەرەوە

٢- مەلا مستەفا بارزانی و دۆکتۆر مەحمود عوسمان ئێوارەی رۆژی ١٩ی ئادار لە مێوانخانەی SAWAK لە سەر داواکاری خۆیان لەگەڵ (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) دیداریان کرد[٣٠٦]. مەلا مستەفا بارزانی و دۆکتۆر مەحمود عوسمان وتیان ١٨ی ئادار

---

[٣٠٦] - هێڵمز لە ١٦ی ئاداری ١٩٧٤ پەیامێکی ناردوە بۆ هێنرِی کیسینجێر، وەزیری دەرەوە و باسی ئەوەی کردوە کە ١٤ی ئادار چاوی بە شا کەوتوە و پەیامەکەی کیسینجێری بە شا راگەیاندوە دەربارەی ئەوەی کە لە رێگای یارمەتیدانی کوردەکان درێژە بە گوشاری سەربازی لە سەر دەوڵەتی عێراق بدرێت تا ئەو کاتە کە دەوڵەتانی عەرەبی لە سەر بەرزاییەکانی جەولان لەگەڵ ئیسرائیل سازش بکەن. شاش رەزامەندی خۆی سەبارەت بەوە دەربڕیوە و جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە کە لە هەموو بارودۆخێکدا دەبێ پشتیوانی لە کوردەکان بکات. شا هەروەها وتوویەتی مەلا مستەفا بارزانی و دۆکتۆر محمود عوسمان بەپەلە داوایان کردوە چاویان پێی بکەوێت و کۆتایی ئەم هەفتەیە دێن بۆ تاران. لە درێژەی پەیامەکەدا هاتوە کە مەلا مستەفا بارزانی و دۆکتۆر محمود

لەگەڵ شا دیداریان کردوە و داوایان لێکردوە لە رووی مادی و سەربازییەوە زیاتر یارمەتیان بدات و دەربارەی ئەوان لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی تورکیە قسە بکات. مەلا مستەفا و مەحمود عوسمان هەروەها وتیان هیوادارن کە شا ئەو پلانە ئۆتونومیە بەفەرمی بناسێت کە ئەوان بۆ هەرێمی کوردنشین رایانگەیاندوە و مەسەلەی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان بخاتەڕوو ئەگەر بێت و دەوڵەتی عێراق هێرش بکاتە سەریان.

٣- مەلا مستەفا و مەحمود عوسمان پێشنیارەکانی خۆیان دەربارەی چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتی ئۆتونومی کورد بە شێوەی نووسراو تەسلیم بە شا کردوە و وردەکاریەکانی بودجەی پیویست بۆ بەشی ئیداری، بەرگری، پەروەردە و تەندرستییان خستوەتەڕوو و وتویانە کە ساڵانە لانیکەم پێویستیان بە ٦٠ ملیۆن دیناری عێراق (نزیکەی ١٨٠ ملیۆن دولار) و لانی زۆر ١٢٠ ملیۆن دیناری عێراق (نزیکەی ٣٦٠ ملیۆن دولار) هەیە.

٤- مەلا مستەفا و مەحمود عوسمان وتیان شا لە وەڵامدا وتویەتی دەبێ داواکاریەکانیان بە وردی تاوتوێ بکرێت بەڵام بەڵێنی پێداون لە رووی مادیەوە زیاتر یارمەتیان بدات چونکە بارودۆخەکە گۆڕاوە و بە تایبەت ٢٥٠ هەزار کەس ئاوارە بونە و ئەگەری ئەوە هەیە کە دەوڵەتی عێراق گەمارۆی ئابووری بخاتە سەر هەرێمی کوردنشین. شا هەروەها پێیوتون بە ژنێراڵ نەسیری دەڵێت سەیر بکات بزانیت چی یارمەتیەکی دیکە دەتوانیت بەوان بدات و بە تایبەت هەوڵ بدات هەندێ راکیتی سووکی دژە هەوایی بریتانیایان بۆ دابین بکات.

تێبینی: ئەم راکیتانە ئێستا لە ئەمباری ئێراندا نیە و ئەگەر بە دەستی کوردەکانەوە بگیردرێت دەبێ ئێران نکۆڵی لەوە بکات کە ئەو راکیتانەی داوە بە کوردەکان.

٥- وادیارە مەلا مستەفا بارزانی و (مەحمود) عوسمان لە ئەنجامی دیدارەکانیان لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران زۆر رازین. ئەوان چاوەڕوانی ئەوە نەبوون کە ئەمریکا خێرا

---

عوسمان چاویشیان بە (ناوەکەی رەش کراوەتەوە) دەکەوێت و ئەگەر شتێکی گرنگ دەربارەی هەڵوێست و داواکاریەکانیان هاتەئاراوە، ئاگادارتان دەکەمەوە. وەرگێڕ.

وەلامیان بداتەوە بەلام دەیانەویست بزانن ئایا دەولەتی ئەمریکا دەتوانێت باسی ئەوان لای تورکیە بکات و وتیان هەموو چەشنە گارانتیەک دەدەن بە تورکیە. بارزانی و (مەحمود) عوسمان هەروەها وتیان هیوادارن ئەمریکا شانبەشانی شا لە نەتەوە یەککگرتووەکان پشتیوانی لە دۆزەکەیان بکات.
بەڕێز( ناوەکەی رەش کراوەتەوە) هیچ وەلامێکی ئەرێنی بەو داواکاریە نەدایەوە بەلام وتی کاربەدەستانی ئێران (وەک هێزێکی ناوچە کە خۆیشی کەمینەی کوردی هەیە) باشتر دەتوانن سەبارەت بەو مەسەلەیە لەگەڵ کاربەدەستانی تورکیە قسە بکەن بەلام ئەگەر ئێمە (ئەمریکا) و شا پێکەوە لەگەڵ تورکیە قسە بکەین بەدگومانی تورکیە سەبارەت بەوە زیاتر دەبێت کە ئێمە و شا پێکەوە یارمەتی بارزانی دەدەین. سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوە یەگرتوەکانیش کاربەدەستە ئەمریکاییەکە وتی هەلوێستی ئێمە لە نەتەوە یەککگرتووەکان پەیوەندی بەوەوە دەبێت کە ئایا بەڕاستی دەولەتی عێراق کوردەکان ژینۆساید دەکات یان نا.
٦- تێبینی: وادیارە شا بڕیاری ئەوە نادات کە یارمەتی کوردەکان بدات بەو شێوەیە کە کوردەکان داوایان کردوە. شا ئەوەندە یارمەتی کوردەکان دەدات کە بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن و ناچار نەبن خۆیان تەسلیمی بەغداد بکەن. پێموانیە شا ئەو برە پارەیە دابین بکات کە کوردەکان داوایان کردوە (١٨٠ تا ٣٦٠ میلیۆن دولار لە سالدا) چونکە لەمێژە هەرێمی کوردنشین لە داهاتی نەوتی عێراق بێبەشە. ناوچەی کوردنشینی عێراق هیچ سەرچاوەیەکی پێشکەوتووی ئابووری یان رێگایەکی پەیوەندی ئابووری لەگەڵ دنیای دەرەوە نییە بۆ ئەوەی بتوانێت لە رووی ئابووریەوە دەولەتێکی سەربەخۆی پێبژێنێت.

**ئاژانسی هەواڵگری ناوندی ئەمریکا (CIA)**

**لە لایەن ژنێراڵ سکۆکرافت**

**بۆ: هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**تەنها باڵوێز هێڵمز ببینێت)**

**٢٥ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: مەترسیەکانی پلانی مەلا مستەفا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئوتونومی بۆ عێراق، ئێران و ناوچە و خودی کوردەکان**[٣٠٧]

هەروەها کە خوتان دەزانن وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئێستا لە واشینگتۆن نیە. ئێمە هەوڵ دەدەین بە پێی توانا وەڵامتان بدەینەوە و یارمەتی بە روونکردنەوەی ئەو بارودۆخە نوێیە بدەین کە بارزانی دەیەوێت دروستی بکات و ئێوە لە پەیامەکەتاندا ئامارژەتان پێکردوە. ئێمە جارێ ئەم وەڵامە سەرەتاییەتان بۆ دەنێرین کە بەرهەمی

---

٣٠٧- ١٦ی نیسانی ١٩٧٤ ئاژانسی هەواڵگری ناوندی ئەمریکا (CIA)، دەقی راگەیاندننامەیەکی تێروتەسەلی ئوتونومی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە زمانی عەرەبیەوە کردوە بە ئینگلیزی کە لە ١١ لاپەرە پێکهاتوە و ناردویەتی بۆ هێنری کیسینجێر، یارمەتیدەری سەرۆک کۆمار بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و تێدا ئاماژەی بەوە کردوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان پلانی ئوتونومی کوردستانی لە وەڵامی پلانە ئوتونومیەکەی دەوڵەتی عێراق بۆ کوردستان بڵاو کردوەتەوە. وادیارە ئەو نیگەرانیەی ئەمریکا کە لەم پەیامەدا باسکراوە دوابەدوای راگەیاندننامەی ئوتونومی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئاداری ١٩٧٤ دروست بوە. (وەرگێڕ)

بیر و فکری ستافی (CIA)یە بۆ ئەوەی بیروبۆچۆنی ئەوان بزانن و هەروەها ئەوانیش بیروبۆچوونی ئێوە دەربارەی ئەو مەسەلانە بزانن بۆ ئەوەی لە کۆتایی ئەم حەفتەیە کە وەزیری دەرەوە هاتەوە، بیخەینە بەردەستی.

هەندێ لە لێکدانەوە بنەڕەتیەکانی ئێمە ئەمانەن:

١- پلانی مەلا مستەفا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئوتونومی، بارودۆخەکە وا ئاڵۆز دەکات کە ئیدی نەتوانین بەشێوەی شاراوە کۆنترۆلی بکەین. ئەو بارودۆخە ناچارمان دەکات بە شێوەی ئاشکرا پێداویستیەکانی بارزانی دابین بکەین و ئەو کاتە نهێنیپاریزی مومکین نابێت، کەوابوو هاوسەنگی سیاسی تێکدەچێت. لە راستیدا ئێمە هەر لە سەرەتای پەیوەندیەکەمانەوە هەمووی ئەو شتانەمان بە مەلا مستەفا راگەیاندوە و پاشانیش کە باسی دامەزراندنی دەوڵەتێکی خاوەن ئوتونومی دەکرد بۆمان دوپاتکردوەتەوە. ئەوە کە ئایا ئاشکرابوونی دەستێوەردانی ئێمە لەو مەسەلەیەدا، پەیامێک دەبێت بۆ سۆڤیەت و ئایا ئەو مەسەلەیە چۆن کاریگەری لە سەر پەیوەندیەکانی تورکیە و ئەمریکا دەبێت و عەرەبەکان چون سەیری ئەو مەسەلەیە دەکەن پرسیارگەلێکن کە دەبێ بەجیدی بخرێنەڕوو.

٢- ئایا ئەوە بە قازانجی ئێمەیە کە دەوڵەتێکی کوردی -عەرەبی یا هەر جۆرە دەوڵەتێکی لاوازی دیکە لە هەرێمی ئارامی کوردەکان دابمەزرێت؟ ئایا تەنانەت بە قازانجی خودی مەلا مستەفاشە کە بەم شێوەیە ئوتونومیەکەی فورمالیزە و سمبۆلیزە بکات؟ پێشهاتێکی وەها هیچ رێگایەکی دیکە لە بەرامبەر دەوڵەتی عێراقدا ناهێڵێتەوە جگە لەوەی کە بۆ پاراستنی یەکپارچەیی خاکەکەی هێرشێکی بەرفراوان بکاتە سەر کوردستان. ئەو کردەوەی بارزانییە بە واتای هێرشکردن بۆ سەر عێراقە و بەپێچەوانەی ئەو هەڵوێستەیە کە تا ئێستا گرتویەتیەبەر واتا بەرگریکردن لە خۆ لە بەرامبەر هێرشی بەغداد. لەم حاڵەتەی دواییدا (بەرگریکردن لە بەرامبەر هێرشی دەوڵەتی عێراق) بارزانی لانیکەم دەتوانێت هەندێ یارمەتی لە ئێران یا وڵاتانی دیکە وەربگرێت بەڵام لە حاڵەتی یەکەمدا (هێرشکردن بۆ سەر عێراق) ناتوانێت ئەو یارمەتانە وەربگرێت. جگە لەوەش پرسیارێکی جدی کە لە ئارادایە ئەوەیە کە ئایا

بارزانی دەتوانێت دەوڵەتێک دابمەزرێنێت کە سەرجەم پیکهاتەکانی عەرەبەکان لە خۆ بگرێت. ئەگەر نەتوانیت ئەو جۆرە دەوڵەتە دابمەزرێنێت عەرەبەکانی نەیاری دەوڵەتی عێراق لە خۆی نامۆ دەکات کە ئێمە هەست دەکەین رۆژ بە رۆژ بەهێزتر و کاریگەرتر دەبن (هێماکان بە دڵنیایەوە نیشان دەدات کە دەوڵەتی بەغداد لەم مەسەلەیە نیگەرانە).

٣- ئایا شا بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی خودموختاری (کوردی) رازی دەبێت؟ قازانجی شاش هەر وەک خۆمان لەوەدایە کە بارودۆخی عێراق هەروا لە بنبەستدا بێت و دەوڵەتی بەعس لە ئەنجامی پیداگریکردنی کوردەکان لە سەر نیمچە ئۆتونومیەک، بە تەواوی لاواز بێت. هەتا ئێستا نە شا و نە خۆمان نەمانویستوە کە کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق بە شێوەیەک لە شێوەکان چارەسەر بێت یانی بەو شێوەیە کە یا کوردەکان داواکاریەکانی دەوڵەتی عێراق قبووڵ بکەن یا دەوڵەتێکی کوردی خاوەن ئۆتونومی (بەتایبەت دەوڵەتێک کە خۆی وا نیشان بدات کە زمانحاڵی عەرەبەکانیشە) دابمەزرێت. هەوڵی مەلا مستەفا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک لە هەرێمێکی ئەمن دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەموو رێگاکان لە سەر خۆی دابخات و لەخۆڕا دەوڵەتی عێراق (بە پشتیوانی بەهێزی سۆڤیەت و لەوانەشە تورکیا) لە خۆی هان بدات. هەرچەند کە عێراق خۆی بۆ هێرش بۆ سەر کوردەکان ئامادە کردوە بەڵام لەوانەیە هێشتا دەرفەتی جۆرە سازشێک لە نێوان بارزانی و بەغداد مابێت یا لانیکەم بارودۆخیک بێتە ئاراوە کە دوور بێت لە شەڕێکی هەمە لایەنە و بەرفراوان. ئایا ئێمە لەوە دڵنیاین کە بارزانی دەتوانێت بۆ خۆی هەموو شتێک ببڕێتەوە و بەرەوپێش ببات؟

٤- ئێمە ئەوە دەزانین کە بارزانی تەنات ئەگەر لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئۆتونومی کوردی پاشگەز بێتەوە، هێشتا لەگەڵ کۆمەڵێک کێشەی جدی روبەڕوو دەبێتەوە لەوانە پچڕانی یارمەتیە مادیەکانی عێراق، جموجۆڵی سەربازانی عێراق و ئاوارەبوونی خەڵک. لە وەها حاڵەتیکدا بارزانی پێویستی بە پارە و پێداویستی زیاتر دەبێت بەڵام هەروەها کە ئاماژەمان پێکرد ئێمە ناتوانین زیاتر لە سنووری یارمەتیە نهێنیەکانی ئێستا، یارمەتی کوردەکان بدەین. کەوابوو وادیارە تەنها کەسێک کە بتوانێت ئەو

کێشەیە چارەسەر بکات، "شا"یە چونکە بە قازانجی شا دەبێت کە کوردەکان بەردەوام لە حاڵەتی دژایەتیکردنی دەوڵەتی عێراقدا بن و لە ژێر کۆنترۆلی بەغدادا نەبن.

ئەوەی کە ئێمە وەک شتێک بۆ خەمخۆری لەگەڵ کوردەکان لە دەستمان دێت بیکەین ئەوەیە کە جگە لە یارمەتیەکانی ئێستا، لەڕێگای "SAWAK"ەوە چارەکە میلیۆنیکی زیادە بۆ ئاوارە کوردەکان تەرخان بکەین( کە لەوانەیە ئەمساڵ بە هۆی نرخی باشی گۆڕینی دولار بە دینار پاشکۆ مابێتەوە). هەروەها بەلەبەرچاو گرتنی ئەو راستیە کە بە دڵنیایەوە کوردەکان ناچارن شەڕ بکەن بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن و لە ئەنجامدا زۆربەی ئەو چەک و تەقەمەنیانە خەرج دەکەن کە ئێستا هەیانە، ئێمە بایی ٩٠٠ هەزار پۆند چەکی بچوک و تەقەمەنی وڵاتانی دیکە بە فڕۆکە دەنێرین بۆ SAWAK بۆ ئەوەی بیدات بە کوردەکان. ئێمە بە هەزار زەحمەتی ئەو چەک و تەقەمەنیمانە لە بازاڕی رەشدا کۆ کردوەتەوە و بایی نزیکەی یەک لە سێی میلیۆنیک دۆلارە و باری ٢٠ فڕۆکەی C·141 –ە. ئێمە لەڕێگای ئەو دوو هەوڵەی خۆمانەوە هیوادارین ئەوە بە بارزانی نیشان بدەین کە هێشتا لە کاتی تەنگانەدا دوست و خەمخۆری ئەوین و ئامادەین تا ئەو رادەیە کە لە سنووری نهێنیەوە نەچیتە دەرەوە، یارمەتی بدەین بەڵام ئەگەر شەڕێکی نوێ لە نیوان کوردەکان و عێراقدا هەڵبگیرسێت ناتوانین دەوری سەرەکی تێدا بگێڕین.

هیوادارین ئەو شتانە کە باس کرا یارمەتی بە تێگەیشتنی ئێوە لە هەڵسەنگاندنە سەرەتاییەکان و دەسکورتیەکانی ئێمە بدات. ئێمە سپاستان دەکەین ئەگەر بۆچون و پێشنیارەکانی خۆتان هەم دەربارەی ئەو مەسەلانە کە باس کرا و هەم دەربارەی هەر مەسەلەیەکی دیکە کە ئێوە هەست دەکەن پەیوەندی بە بڕیاردانی ئێمەوە هەبێت، لەگەڵ ئێمە باس بکەن. هەرەها باش دەبێت بزانین کاردانەوەی شا لەم پەیوەندیەدا چی دەبێت (ئەگەر ئێوە بتوانن کاردانەوەی شا هەڵبسەنگێنن بێ ئەوەی مەسەلەکە لەگەڵ خۆی باس بکەن باشترە) و بزانین ئایا شا ئامادەیە هەنگاوی جدی بۆ

دابینکردنی داواکاریه نوێکەی کوردەکان (بە قبووڵکردنی ئاکام و ئەنجامەکانی) هەلبگرێت.

باش دەبێت ئەگەر ئێوە بتوانن بۆچونەکانتان تا رۆژی ٢٨ی ئادار بە ئێمە رابگەیەنن چونکە وەزیری دەرەوە رۆژی ٢٩ی ئادار دەگەرێتەوە.

لەو پەڕی رێزماندا

ژنێراڵ سکۆکرافت

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مۆسکۆ**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٧٣٦٢**

**٢٨ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: سەردانی وەزیری بەرگری سۆفیەت بۆ عێراق و پەیوەندی ئەو سەردانە بە کێشەی کوردەوە**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، تاران، کۆنسولخانەی ئەمریکا لە لینینگراد و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد (لە ریگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیرووت)

١- باڵوێزی میسر پیمانی وت کە بیستویەتی کە ئامانجی سەرەکی سەردانەکەی وەزیری بەرگری سۆڤیەت، گریشکۆ [٣٠٨] بۆ عێراق ئەوە بوە کە هەوڵ بدات کوردەکان رازی بکات ئەو پلانی ئۆتونومیە قبووڵ بکەن کە دەوڵەتی عێراق پێشنیاری کردوە. باڵوێزی میسر ئاماژەی بەوە کرد کە بەرژەوەندی سۆڤیەت لەوەدایە کە پەیوەندیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق باش بێت و وتی سۆڤیەت لە پلانەکەی دەوڵەتی عێراق بۆ ئۆتونومی کوردستان پشتیوانی دەکات. باڵوێزی میسر هەروەها وتی بەپێچەوانی ئەوەی کە پێشتر چاوەڕوان دەکرا بەهەرحاڵ پێیوانیە کە کێشەی کورد، هۆکاری سەرەکی سەردانەکەی گریشکۆ بێت.

---

308 - GRECHKO

٢- وادیارە باڵوێزخانەی ئێران راپۆرتێکی هاوشێوەی بەدەست گەیشتوە کە سەردانەکەی گریشکۆ بۆ عێراق پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە. باڵویزی بریتانیاش پێمانی وت کە سۆڤیەت دەوڵەتی ئێرانی دڵنیا کردوەتەوە کە سەردانەکەی گریشکۆ بۆ ئێران مایەی نیگەرانی نابێت.

ستۆئسێل[٣٠٩]

[309] -STOESSEL

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٣٤١٠**

**٢٨ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: روانگەکانی دەوڵەتی تورکیە سەبارەت بە کێشەی کوردەکانی عێراق**

بۆ زانیاری: نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، قاهیرە، مۆسکۆ، تاران، تلابیب، عەدەن، نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئێستانبوول و ئیزمیر

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٩٦٣ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا

کورتە: کاربەدەستێکی باڵای وەزارەتی دەرەوەی تورکیە پێیوایە کە دەوڵەتی عێراق هەرچەند کە ئولتیماتۆمی بە هێزە کوردەکانی بن رێبەرایەتی بارزانی داوە تا رۆژی ٢٦ی ئادار ئوتونومیە پێشنیارکراوەکەی قبووڵ بکەن بەلام دوای بەسەرچوونی ئەو کاتە لە باتی شەڕ لەگەڵ هێزە کوردەکان، لەگەڵ بارزانی درێژە بە وتووێژ دەدات. ئەو کاربەدەستەی تورکیا هەروەها وتی هەم کێشەی کورد و هەمیش پەیوەندیەکانی تورکیە-عێراق بۆ دەوڵەتی تورکیە گرنگە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە تورکیە لە نزیکەوە بەدواداچونی پێشهاتەکان دەکات و ناهێڵێت کوردەکانی تورکیە بکەونە ژێر کاریگەری ئەو کێشەیە.

١- رۆژی ٢٦ی ئادار (کە رۆژی کۆتایی ئەو ئولتیماتۆمەیە کە دەوڵەتی عێراق دیاری کردوە بۆ ئەوەی کوردەکان ئوتونومیە پێشنیارکراوەکەی دەوڵەت قبوڵ بکەن) ئێمە فاروق جەلی ئوغڵوو[٣١٠]، بەرپرسی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقای وەزارەتی دەرەوەی تورکیەمان بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی لە هەڵوێستی تورکیە سەبارەت بە پێشهاتەکانی عێراق ئاگادارمان بکاتەوە.

٢- جەلی ئوغڵوو وتی دەوڵەتی عێراق بە تورکیەی راگەیاندوە کە دەتوانێت کێشەی کورد چارەسەر بکات. جەلی ئوغڵوو وتی ئەگەر شەڕ دەسپێبکاتەوە، هەرچەند کە هێزەکانی بارزانی چەکوچۆڵی باشیان لە سۆڤیەت[٣١١] و ئێران وەرگرتوە، بەڵام سوپای عێراق (کە لە لایەن سۆڤیەتەوە بە چەکە پێشکەوتوە دژە گریلاییەکان تەیار کراوە) لە پێگەیەکی بەهێزتردا دەبێت و دەتوانێت هێرشی گەورە بکاتە سەر هێزەکانی بارزانی. جەلی ئوغڵوو وتی ئەگەری ئەوە زۆرە کە دوای بەسەرچوونی ئولوتیماتۆمەکەی ٢٦ی ئادار، دەوڵەتی عێراق لە باتی شەڕ، هەوڵ بدات لەگەڵ بارزانی وتووێژ بکات.

٣- جەلی ئوغڵوو لە درێژەی قسەکانیدا وتی کاربەدەستانی سەربازی تورکیە رێوشوێنی باشیان گرتوەتەبەر بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەو پێشهاتانە کار بکاتە سەر کوردەکانی تورکیە. هەروەها وتی بەهەرحاڵ بە پێچەوانەی ئەو هەواڵانە کە راگەیاندنەکان بڵاوی دەکەنەوە، دەوڵەتی تورکیە سنووری عێراق - تورکیەی دانەخستوە. لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە بەڕاستی ئێستا چی لە باکووری عێراق رویداوە، جەلی ئوغڵوو وتی راگەیاندنەکان شەڕی پاش ١١ی ئاداری نێوان عێراق و هێزە کوردەکانیان گەورە کردوەتەوە و ئامارەی بەوە کرد کە دەوڵەتی عێراق خۆی لە شەڕکردن لەگەڵ کوردەکان دەبوێرێت.

---

310 Faruk Celioglu

٣١١- بەنیسبەت سۆڤیەت ئەو مەسەلەیە بە هیچ شێوەیەک راست نییە چونکە ئەو کاتە سۆڤیەت نەتەنیا یارمەتی کوردی نەدەدا بەڵکوو هەموو جۆرە چەکوچۆڵێکیشی دەدا بە عێراق و عێراقیش بەو چەکوچۆڵانە بزووتنەوەی کوردی سەرکووت دەکرد. وەرگێڕ

٤- جەلی ئوغلۆو هەروەها وتی ئەڵبەتە دەوڵەتی تورکیە نیگەرانی چارەنووسی کەمینەی تورکمانی عێراقە بەڵام وتیشی ژیانی تورکمانەکانی عێراق ئەوەندە کە راگەیاندنەکان دەیڵێن لە مەترسیدا نیە.

٥- جەلی ئوغلۆو بە بزەیەکەوە وتی "راگەیاندنەکانی ئەمریکا" بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەوڵەتی ئەمریکا چەک بە بارزانی دەدات. منییش لە وەڵامدا وتم ئاگاداری هەواڵەکەی رۆژی ٢٢ی ئاداری "هەبەر ئاژانسی حوریەت"[٣١٢] (ئاژانسی هەواڵی حوریەت)م کە باسی ئەوەی دەکرد کە دەوڵەتی ئەمریکا ١٠ دانە فرۆکەی F-105'sی داوە بە بارزانی (کە فرۆکەوانەکانی راهاتووی دەستی ئەمریکان) و چەکەکانی ئەمریکا لەرێگای ئیسرائیلەوە دەگات بە دەستی کوردەکانی عێراق. هەروەها وتم ئەو داستانە ناڕاست و بەلاڕێدابەرانە بە لای ئێمەوە سەیر نیە. جەلی ئوغلۆو وتی لە روانگەی شەخسی خۆیەوە، ئەو داستانە لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە درست کراوە.

٦- جەلی ئوغلو باسەکەی هێنایە سەر مەسەلەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق و بە جدی پرسیاری کرد بۆ ئەمریکا توانیویەتی پەیوەندیەکانی لەگەڵ هەندێ لە وڵاتانی عەرەبی وەک میسر و سوریە باشتر بکات بەڵام ناتوانێت پەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراق بەرەو پێشەوە ببات. هەروەها وتی تورکیە نیگەرانی زیادبوونی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراقە و پێشوازی لە زیاتربوونی دەسەڵاتی وڵاتانی رۆژئاوایی لەو وڵاتە دەکات و هەر چی لە دەستی بێت دەیکات بۆ ئەوەی عێراق تەشویق بکات پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکا باشتر بکات.

٧- هەڵسەنگاندن: روانگەکانی جەلی ئوغلۆو بەنیسبەت پێشهاتەکانی عێراق ئێمەی ئارامتر کردەوە. بەهەرحاڵ دوابەدوای دەسپێکردنەوەی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق، فەرماندەی هێزە زەمینیەکانی سپای تورکیە، ئاکینجی[٣١٣] و فەرماندەی هێزی هەوایی، ئالپکایا[٣١٤] سەردانی هێزەکانی سەر سنووری عێراقیان کردوە. جگە لەوەش،

---

[312] Haber Ajansi Hurriyet
[313] Akinci
[314] Alpkaya

باڵوێزخانە کۆمەڵێک زانیاری پشتڕاستنەکراوی بە دەست گەیشتوە کە باس لەوە دەکات کە ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیە رۆژی ٢١ی ئادار بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی عێراق بڕیاری سەپاندنی یاسای حکومەتی سەربازی بە سەر گەلێ لە پاریزگاکانی رۆژهەلاتی تورکیەی تاوتوێ کردوە. بەهەرحاڵ ئێمە پێمانوایە کە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو رەخنانەی کە لە یاسای حکومەتی سەربازی ١٩٧١-١٩٧٣ی تورکیا گیراوە ئێستا کەشوهەواکە بۆ پەسەندکردنی بڕیاری حکومەتی سەربازی لە لایەن سەرۆک وەزیران، ئەجەویت[٣١٥] گونجاو نیە مەگەر ئەوە کە شەڕێکی گەورە لە باکووری عێراق بێتە ئاراوە.

مەکۆمبیر[٣١٦]

---

[315] ECEVIT

[316] Macomber

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٨٧٨**

**٣٠ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: دەستێوەردانی ئیسرائیل لە کێشەی کوردەکانی عێراقدا**

بۆ زانیاری:

بالّوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، قاهیرە، مۆسکۆ، تاران و تلابیب

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٨٣ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- بالّوێزی میسر لە عێراق، نەجارِ رۆژی ٣٠ی ئادار بەشێوەیەکی بەتەواوی نهێنی پێمی وت کۆمەلّێک زانیاری پشتڕاستکراوی لایە کە ئیسرائیلیەکان لەرێگای رادیۆوە لەگەلّ بارەگای سەرکردایەتی بارزانی پەیوەندی راستەوخۆیان هەیە و چەند پسپۆڕێکی سەربازی ئیسرائیلی لای کوردەکانن. لە قسەکانی دواتری نەجارِدا دەردەکەوت کە ئەو زانیاریانیەی لە سەرچاوە سەربازیەکانی عێراق بە دەستهێناوە.

٢- نەجارِ هەروەها لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێران درێژە بە یارمەتیدانی کوردەکان دەدات و وتی بیستویەتی کە ئەمریکاش تێوەگلاوەتە ناو کێشەکە چونکە کوردەکان چەکی ئەمریکاییان پێیە بەلاّم وتی ئەو زانیاریانەی لە کاربەدەستانی دەولّەتی عێراق وەرنەگرتوە.

٣- نیگەرانی سەرەکی نەجاڕ ئەوەیە کە مەسەلەی کورد، بەتایبەت ئەگەر ئیسرائیلیش تێوەگلابێت، سەرنجی عەرەبەکان لە ڕێگاچارەی ئاشتیخوازانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (مەبەستی کێشەی فەلەستین و ئیسرائیلە - وەرگێڕ) لابدات.

لۆڤری

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٨٦٧**

**٣٠ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: پەیوەندیەکانی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق پاش راگەیاندننامەی ئۆتونومی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئانکارا، بەیروت، قاهیره، مۆسکۆ و تاران

١- کەشوهەوای کێشەی کورد لێرە زیاتر بە پەیامی پشتگیری و ستایشکردنی بەیاننامەی ئۆتونومی ( ئاداری ١٩٧٠)ی کورد سنووردارە. کۆنفرانسی AAPSO (رێکخراوی سۆلیداریتی لەگەڵ گەلانی ئەفریقا و ئاسیا - وەرگێڕ) له بەیاننامەی کۆتایی خۆیدا بانگەشەی ئەوەی کرد کە "ئیمپریالیستەکان و بەتایبەت ئەمریکا هەوڵ دەدەن ئۆتونومی کوردەکان له بار ببەن بۆ ئەوەی رژیمی پێشکەوتنخوازی عێراق بڕوخێنن" بەڵام بە رۆژنامەکانی عێراق وتراوە وڵاتانی بیانی بە پشتیوانیکردن له کوردەکان تۆمەتبار نەکەن. ئەمە له کاتێکدایە کە وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی بریتانیا پێمیوت بەرپرسی بەشی پەیوەندیە سەربازیەکانی وەزارەتی بەرگری عێراق، کاپیتان تاهیر[٣١٧] له سەر ئەو قەناعەتەیە کە دەوڵەتی ئەمریکا یارمەتی کوردەکان دەدات هەر چەند هیچ بەڵگەیەکی بۆ سەلماندنی ئەو مەسەلەیە نەخستوەتەڕوو.

[317] Captain Tahir

دەنگی رادیۆی کوردەکان کە لە شوێنێکی نادیارەوە بڵاو دەبێتەوە، ئێستا بە جوانی لە بەغداد دەبیسرێت. کارمەندە کوردەکانی نوسینگەکەمان دەڵێن بارزانی سەرلەئیوارەی ٢٩ی ئادار قسەی کردوە و بەنیسبەت هەر چەشنە هێرشێک هۆشداری بە دەوڵەتی عێراق داوە.

٢- سەرچاوە جۆراوجۆرەکان دەڵێن هێشتا وتووێژی نهێنی لە نێوان دەوڵەتی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان بەردەوامە و باڵوێزی میسر لە عێراق، نەجارِ، وتی فەرمان بە سپای عێراق دراوە هیچ چەشنە هێرشیک نەکاتە سەر کوردەکان. بەگوێرەی دەنگوباسەکان، کۆمەڵێک لە رێبەرانی سیاسی پێشوی عێراق، لەوانە عبدالرحمان عارف[318]، سەرۆک کۆماری پێشووی عێراق، کۆلۆنیل عبدالرزاق النایف[319]، ئەندامی پێشووی پارلمانی عێراق و الراوی[320]، ژینیراڵی پێشووی سپای عێراق، سەردانی بارەگای سەرکردایەتی بارزانیان کردوە. ئەڵبەتە بەعس ئەم سەردانە وەک هەوڵێک بۆ روخاندنی خۆی لێکدەداتەوە.

٤- سەرەرِای ئەم دەنگۆ خراپانە، کۆمەڵێک نیشانەی هیوابەخشیش لە ئارادایە و هەر دوولا خۆیان لە هەڵگرتنی هەنگاوی هاندەرانە دەبوێرن. سەرنووسەری نوێی رۆژنامەی التاخی، زمانحاڵیKDP کە دەوڵەتی عێراق دیاری کردوە، هێشتا هێرشی نەکردوەتە سەر بارزانی. دەنگۆی ئەوە هەیە کە سۆڤیەت کۆمەڵێک پەیامی بەهێزی ناردوە بۆ بارزانی و پێداگری لە سەر کردوە پلانی ئوتونومی قبووڵ بکات. باڵوێزی میسر، نەجارِ پێمیوت لێژنەیەکی نهێنی عێراق دەیەوێت سەردانی تاران بکات بۆ ئەوەی دەربارەی کێشەی کورد و کۆمەڵێک مەسەلەی دیکە لەگەڵ دەوڵەتی ئێران گفتوگۆ بکات.

٤-تێبینی: ئەگەر دەوڵەتی عێراق و کوردەکان رێکنەکەون، دەوڵەتی عێراق تەنها ئەوەی پێدەکرێت هەوڵ بدات لەرێگای سەربازی، سیاسی و ئابوریەوە (هەر سێیان پێکەوە) بارزانی لاواز و گۆشەگیر بکات. دەستپێکردنی هێرشێکی هەمەلایەنە دژی

---

[318] ABDUL RAHMAN AREF
[319] COLONEL ABDUL RAZZAK AL-NAYIF
[320] AR-RAWI

کوردەکان لە دەستی سەدام دایە کە سیاسەتەکەی لە بەرامبەر کورد شکستی هیناوە، کەوابوو چاوەڕوان ناکرێت سەدام ئەو بڕیارە بدات مەگەر ئەوە کە هیچ ڕێگایەکی دیکەی لە بەردەمدا نەمێنێتەوە. ئەگەر ڕاپۆرتەکەی باڵوێزی میسر دەربارەی وتووێژەکانی ئێران و عێراق ڕاست بێت، لەوانەیە ئێران و عێراق پێکەوە مامەڵەیەک بکەن و عێراق دەست لە هاندانی عەرەبەکانی کەنداو دژی ئێران هەڵگرێت بۆ ئەوەی ئێران لە بەرامبەردا یارمەتی کوردەکان نەدات.

لۆڤری

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٨٧٩**

**٣١ی ئاداری ١٩٧٤**

**بابەت: پشتیوانی سۆڤیەت لە سیاسەتی عێراق سەبارەت بە کورد**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، تلابیب، ئانکارا، بەیرووت، جەدە، کوەیت، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، رۆم و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە جەزاییر و دەمیشق

١- وەفدێکی کاربەدەستانی پایەبەرزی سۆڤیەت بە سەرۆکایەتی مارشاڵ گریشکۆ[٣٢١]، وەزیری بەرگری لە ٢٣ تا ٢٦ی ئادار و وەفدێکی دیکە بە سەرۆکایەتی شیلیکۆڤ[٣٢٢]، وەزیری ناوخۆی سۆڤیەت لە ٢٨ی ئادار تا ١ی نیسان سەردانی بەغدادیان کرد. ئەو دوو دیدارە هەوڵێکی هاوبەش بوو بۆ ئەوەی پێگەی سۆڤیەت لە عێراق قایم بکەن و پشتیوانی تەواوی سۆڤیەت لە سیاسەتی رژیمی عێراق سەبارەت بە کورد دەرببڕن و نیشانی بدەن کە عێراق نە گۆشەگیرە و نە لە دەرەوەی بازنەی راوورایژی سۆڤیەت و جیهانی عەرەبدایە. تەنانەت ئەگەری ئەوە هەیە کە کاربەدەستانی پایەبەرزی سۆڤیەت لەساڵیادی واژۆکرانی پەیمانی (سۆڤیەت و عێراق) لە ٩ی نیسان سەردانی عێراق بکەن.

---

321 - MARSHALL GRECHKO

322 - SHILIKOV

٢- به رواڵەت وادیارە کە سەردانەکەی مارشاڵ گریشکۆ باش بوە. جێگری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەدام حوسەین ڕۆژێک پاش گەیشتنی گریشکۆ ڕۆیشت بۆ هیند بەڵام سەفەرەکەی تەنها ڕۆژێکی خایاند و زوو گەڕایەوە بۆ عێراق بۆ ئەوەی گریشکۆ بتوانێ لە دانیشتنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە ٢٧ی ئادار بەشداری بکات. گریشکۆ ٢٥ی ئادار بە فڕۆکە سەفەرێکی دەرەوەی بەغدادی کردوە بەڵام بۆ کوێ ڕۆیشتوە، دیار نیە. بە گوێرەی زانیاریەکان گریشکۆ پەیامێکی لەگەڵ ڕێبەرانی کورد ئاڵوگۆڕ کردوە و لەو پەیامەدا پشتیوانی تەواوی سۆڤیەت لە پلانەکەی رژیمی عێراق بۆ ئۆتونومی کوردستانی دووپات کردوەتەوە. هەروەها بە هۆی ئەوەی کە داهاتی نەوتی عێراق زیادی کردوە و عێراق لە ئێران و کوردەکان تورەیە ئەگەری ئەوە زۆرە کە عێراق چەکی نوێیی لە سۆڤیەت کڕیبێت.

٣- دوابەدوای چارەسەربوونی ناکۆکی عێراق و سۆڤیەت لە سەر بەهەرزانکڕینی نەوتی ئێستای عێراق لە لایەن سۆڤیەتەوە ( کە لە تیلیگرامی ٣٤٦٧ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە مۆسکۆ ئامارەی پێکراوە) پەیوەندیەکانی عێراق و سۆڤیەت لە قۆناخی پتەوبووندایە بەڵام سەرەڕای ئەم سەردانانەی کاربەدەستانی پایەبەرزی سۆڤیەت، پێشبینی ناکرێت کە پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و عێراق لەناکاو پەرەبسێنێت.

لۆڤری

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٢٧٦**

**١ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابەت: ئەگەری یارمەتیدانی سوریە بە عێراق دژ بە کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، قاهیرە، لەندەن، پاریس، ڕۆم، مۆسکۆ و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- بەگوێرەی زانیاریەکانی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو، جێگری فەرماندەی گشتی و سەرۆکی ستادی هێزی هەوایی سوریە، محمود ئەعزەم[٣٢٣] ڕۆژی ٣٠ی ئادار ناردراوە بۆ بەغداد بۆ ئەوەی بە ڕژیمی عێراق بڵێت کە:

الف- سوریە هیوادارە کە عێراق بتوانێت بە زوترین کات کێشەی کورد چارەسەر بکات چونکە سوریە لە سەر ئەو باوەڕەیە کە لەم ساتەوەختە زۆر هەستیارەدا عەرەبەکان دەبێ بەرەیەکی یەکگرتوو دژی ئیسرائیل پێکبێنن.

ب- سوریە ئامادەیە هێزی هەوایی خۆی بخاتە خزمەتی دەوڵەتی عێراق (بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر بکات) ئەگەر ڕژیمی عێراق پێویستی پێبێت[٣٢٤].

---

323 Mahmud Azzam

٣٢٤- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق لە بروسکەیەکی دیکەدا کە لە هەمان مانگدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردوە، ڕایگەیاندوە کە حافز ئەسەدی سەرۆک کۆماری سوریە لە ڕێگای گەڕانەوە لە سەفەرەکەی لە یەکێتی سۆڤیەت، بەشێوەیەکی نهێنی سەردانێکی کورتی بەغدادی کردوە بو ئەوەی عێراق هانبدات لە سیاسەتی ئێستای سوریە سەبارەت بە سازش لەگەڵ

٢- به وتەی هەمان سەرچاوە، گەلێ لە کاربەدەستانی رژیمی سوریە لە سەر ئەو باوەڕن کە "هێزە ئیمپریالیستەکان" لە پشتی کێشەکانی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ کوردەکاندان بۆ ئەوەی عەرەبەکان پارچەپارچە بکەن و کەوابوو گوشار بخەنە سەر سوریە بۆ ئەوەی لە گفتوگۆکانی "رێکەوتننامەی سوریە — ئیسرائیل بۆ دەستێوەرنەدان لە کاروباری یەکدی لە گولانی ١٩٧٤ " لەگەڵ ئیسرائیلدا تەنازول بکات.

٣- هەڵسەنگاندن: من لە زمانی گەلێک لە دیپلۆماتەکانی سوریە و وڵاتانی عەرەبی دیکەوە ئەو شتانمە بیستوە کە لە پاراگرافی دوودا باسم کرد و هەندێ لەو دیپلۆماتانە بەتایبەتی ئاماژەیان بە دەوری ئەمریکا لەو مەسەلەیەدا دەکرد. بەهەرحاڵ بۆ من جێگای سەرسوڕمان نیە کە رژیمی سوریە بە توندی نیگەرانی کێشەی کوردەکانی عێراق بێت و پێشنیاری یارمەتیدان بە دەوڵەتی عێراقی خستبێتەڕوو چونکە عێراق لە کاتی شەڕی تشرینی یەکەم و پاش ئەوەش یارمەتی سوریەی دا و لەوانەیە سوریە لە داهاتودا پێویستی بە یارمەتی زیاتری عێراقیش بێت. جگە لەوەش رژیمی ئەسەد وەک دەوڵەتێکی ناسیونالیستی باش، هۆکاری ئیدوئولوژیکی خۆی هەیە بۆ ئەوەی یارمەتی عێراق بدات. هۆکاری گرنگی دیکەی یارمەتیدانی رژیمی ئەسەد بە عێراق ئەوەیە کە چالاکیەکانی کەمینەی کوردی عێراق پەیوەندی راستەوخۆی بە بەرژەوەندیەکانی سوریەوە هەیە چونکە ئەو چالاکیانە کاریگەری لە سەر کەمینەی کوردی سوریە دادەنیت کە هەر چەند کە کەمینەیەکی بچووکن بەڵام لە باکووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە دەژین کە ناوچەیەکی ئیستراتژیکە.

سکاتس[٣٢٥]

---

ئیسرائیل لە سەر بەرزایەکانی جەولان پشتیوانی بکات و بە دەوڵەتی عێراق بڵێت ئەگەر بەغداد پشتیوانی لەو سیاسەتەی سوریە بکات، سوریەش لە بەرامبەردا پشتیوانی لە سیاسەتی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە کوردەکان دەکات. ( وەرگێڕ)

325 Scotes

**له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە واشینگتۆن دی سی**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا**

**٢ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابەت: پەیوەندیەکانی عێراق- ئەمریکا و کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، بەیروت و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و دیمەشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٣٤١ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- دەربارەی بۆچوونەکانی جەلی ئوغڵوو[٣٢٦] کە لە پاراگرافی پێنجی تیلیگرامەکەتاندا ئاماژەتان پێکردوە، وەزارەتی دەرەوە هیچ راپۆرتێکی لە رۆژنامەکانی ئەمریکادا نەبینیوە کە تێیدا بانگەشەی ئەوە کرابێ کە دەوڵەتی ئەمریکا چەک و تەقەمەنی دەدات بە کوردەکان. ئەگەر باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئانکارا هەست دەکات کە کاربەدەستانی دەوڵەتی تورکیە شک و گومانیان لەو مەسەلەیەدا هەیە، دەبێ جەخت لە سەر ئەوە بکاتەوە کە هەر راپۆرتێک کە باسی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان بکات، راست نیە. باڵوێزخانە هەروەها دەبێ بە کاربەدەستانی تورکیە بڵێت کە ئێمە هیوادارین کە کوردەکان و دەوڵەتی عێراق بتوانن کێشە و ناکۆکیەکانیان بەشێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکەن و دەوڵەتی ئەمریکا نایەوێت لە کاروباری ناوخۆی عێراقدا دەستێوەردان بکات و یارمەتی کوردەکانی نەداوە.

---

[326] CELIOGLU

٢- دەربارەی بۆچوونەکانی جەلی ئوغلوو کە لە پاراگرافی شەشی تیلیگرامەکەتاندا ئاماژەتان پێکردوە، لە داهاتودا هەر کاتێک باسی پەیوەندیەکانی عێراق- ئەمریکاتان لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەی تورکیە کرد، باڵوێزخانەی ئەمریکا دەبێ بڵێت کە ئێمە زۆر سپاسی دەوڵەتی تورکیە دەکەین کە هەوڵ دەدات پەیوەندیەکانی عێراق - ئەمریکا باشتر بێت. دەوڵەتی ئەمریکا پێشوازی لە باشترکردنی پەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراق دەکات و ئەوەی بۆ دەوڵەتی عێراق روون کردوەتەوە بەڵام دەوڵەتی عێراق بە ئەمریکای حاڵی کردوە کە ئێستا ئامادە نیە بۆ باشترکردنی پەیوەندیە سیاسیەکانی لەگەڵ ئەمریکا هەنگاو هەلبگرێت بەڵام پێیخۆشە پەیوەندیە ئابووری و بازرگانیەکانی لەگەڵ ئەمریکا تا رادەیەک پەرەپێبدات. ئێمەش رێزمان بۆ ئەم بۆچوونەی عێراق هەیە و هەمیشە ئامادەین وەڵامی ئەرێنی بە هەموو چەشنە خواستێکی عێراق بۆ پەرەپێدانی پەیوەندی ئابووری یا سیاسی لەگەڵ ئەمریکا بدەینەوە.

روش[٣٢٧]

[327] Rush

**وەزارەتی دەرەوە، واشنگتۆن دی سی**

**یادداشتنامەی گفتوگۆکان**

**٩ی نیسانی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: داواکاری بۆ یارمەتیدانی ئەمریکا بە کورد**

بۆ زانیاری:

NEA

NEA/ARN-1

NEA/IRN

نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد،

باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بێرووت

باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران،

بەشداربوان:

محمد دۆسکی[٣٢٨]، نوێنەری مەلا مستەفا بارزانی

دەیڤید کۆرن[٣٢٩]، بەرپرسی بەشی وڵات لە NEA/ARN

بەڕێز گریگوری د ئیسترانگ[٣٣٠]، بەرپرسی بەشی کاروباری عێراق لە NEA/ARN

---

[328] Mohammad Dosky

[329] David A. Korn,

[330] Gregory D. Strong,

بەڕێز(محمد) دۆسکی کە کوردە و دیپلۆماتی پێشووی عێراق بوە وتی لەلایەن بارزانییەوە ناردراوە بۆ ئەمریکا بۆ ئەوەی بۆ یارمەتیدانی دەوڵەتی ئەمریکا بە کورد هەوڵ بدات. دۆسکی وتی کوردەکان سپاسی ئەمریکا دەکەن ئەگەر ئەمریکا لە شەڕەکەیان بۆ ئۆتونومی یارمەتیان بدات. دۆسکی وتی دەرک بەوە دەکات کە ئەمریکا نایەوێت راستەوخۆ خۆی بخاتە ناو خەباتی کوردەکان بەڵام کوردەکان هیوادارن کە ئەمریکا لانیکەم ئێران تەشویق بکات وەکو پێویست یارمەتی کوردەکان بدات بۆ ئەوەی بتوانن درێژە بە خەباتەکەیان بدەن. دۆسکی وتی سپاسی هەرچەشنە هەنگاوێکی دۆستانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات.

بەڕێز کۆڕن هیوای دەربڕی کە کێشەکانی نێوان عێراق و کوردەکان بەشێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکرێت و ئەوەی شی کردەوە کە هەرچەند کە ئەمریکیەکان زۆر دەرک بە بارودۆخی کوردەکان دەکەن و لایەنگری لە کوردەکان دەکەن بەڵام سیاسەتی ئیمە ئەوە نیە کە لە کاروباری ناوخۆی عێراق یان وڵاتانی دیکەدا دەستێوەردان بکەین. هەروەها پەیوەندیەکانی ئیمە لەگەڵ عێراق بە جۆرێکە کە ناتوانین بە نوێنەرایەتی لەلایەن کوردەکانەوە خۆمان بکەین بە ناوبژیوان لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا. بەڕێز کۆڕن جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئیمە دەمانەوێت لەگەڵ کوردەکان راستگۆ بین و نامانەوێت هیوای هەڵەیان تێدا درست بکەین.

دۆسکی وتی ئەمدوایانە نامەیەکی لەلایەن دۆستێکی کوردەوە لە لەندەن بەدەست گەیشتوە کە تێیدا نوسراوە بارزانی هەوڵیداوە پێش لە دەستپێکردنەوەی شەڕ بگرێت. هەروەها لە نامەکەدا باسی ئەوە کراوە کە دەوڵەتی عێراق پلانی بۆ ئەوە داناوە کە هێزەکانی خۆی لە شاخەکانی کوردستان بکشێنێتەوە بۆ ئەوەی سەرچاوەی ژیانی ئابووری کوردەکان بپچڕێت و بارودۆخەکە وەک خۆی بمێنێتەوە. دۆسکی وتی دەوڵەتی عێراق دەیەویت وەک چەتە لەگەڵ کوردەکاندا مامەڵە بکات. لە وەڵامی پرسیارێکی بەڕێز "کۆڕن"دا دەربارەی ئەوەی کە ئایا هیچ هیوایەک بەوە هەیە

که کێشەکە چارەسەر بێت، دۆسکی وتی زانیاریەکانی ئەو نیشان دەدات کە هیچ هیوایەک لە ئارادا نیە.

دۆسکی وتی ئیدی باوەڕی بە ئاشتی نەماوە و ئاماژەی بەوە کرد کە نە ڕۆژهەڵات و نە ڕۆژئاوا پشتیوانی لە کورد ناکەن. دۆسکی لە بەشی ئەنجامی قسەکانیدا وتی لە بەر ئەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا نایەوێت یارمەتی کورد بدات، دەیەوێت کێشەی کورد بباتە کۆنگرێسی ئەمریکا.

دۆسکی وتی نیسانی ١٩٧٢ عێراقی بەجێهێشتوە و لەو کاتەوە بارزانی نەبینیوە بەڵام دەیەوێت لە نیوەی دووەمی مانگی نیسان لە ڕێگای ئێرانەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان.

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ۹۰۱**

**۱۱ی نیسانی ۱۹۷٤**

**بابەت: پەرەسەندنی شەڕی دەروونی لە نێوان ڕێبەرایەتی کورد و ڕژێمی بەعس**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، موسکۆ، تاران و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ۱۸۳ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

۱- شەڕی دەروونی لە نێوان بارزانی و ڕژێمی بەعس درێژەی هەیە و هەر دوولا هێشتا پییانخۆش نیە دەرگای وتووێژ دابخەن و شەڕێکی نوێ بەرپا بکەن. ٦ی نیسان وەزیری بەرگری عێراق سەرجەم ئەو هاووڵاتیانەی کە لەدایکبووی ۱۹٤۷ان بانگ کرد خزمەتی سەربازی ئەنجام بدەن. ڕۆژی ۷ی نیسان ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش پێنج کوردی متمانەپێکراوی لە جێگای وەزیرە کوردە پێشوەکان دانا. دەوڵەتی عێراق پێشتر پارێزگاری سلێمانی، هەولێر و دهۆکی گۆڕیبوو. ئەم کاربەدەستانە مانگی ئادار دەستیان لە پۆستەکانیان هەڵگرتبوو و چووبوونە ریزی بارزانی. هەروەها باسی تەیارکردن و بەڕێکردنی سەربازی زیاتر بەرەو باکوور دەکرێت.

له هه‌مان کاتدا ده‌وڵه‌تی عێراق درێژه‌ به‌ پرۆپاگه‌نداکردن به‌و کارانه‌ ده‌دات که‌ له‌ کوردستان ئه‌نجامی داوه‌ و رایگه‌یاندوه‌ که‌ ۱۰۰ میلیون دولار له‌ بودجه‌ی ساڵی ۱۹۷۵ بۆ هه‌رێمی کوردستان ته‌رخان کراوه‌. رۆژنامه‌کان باسی ئه‌وه‌ ده‌که‌ن که‌ کورده‌کان گه‌ڕاونه‌ته‌وه‌ سه‌ر ماڵ و کاری خۆیان به‌ڵام زانیاری سه‌رچاوه‌کانی دیکه‌ پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌مان پێ نیشان ده‌دات بۆ نموونه‌ یارمه‌تیده‌ری "پاپ نونسیۆ" [۲۳۱] رۆژی ۹ی نیسان پێمیوت ۷۰۰ بنه‌ماڵه‌ی مه‌سیحی هه‌موو ماڵ و ژیانی خۆیان له‌ ناوچه‌ جێناکۆکه‌کانی باکوور به‌جێهێشتوه‌ و هاتوون بۆ به‌غداد. یارمه‌تیده‌ری "پاپ نونسیۆ" هه‌روه‌ها وتی هه‌ندێ له‌ مه‌سیحیه‌کان چونه‌ته‌ ریزی هێزه‌کانی بارزانی.
کاربه‌ده‌ستێکی باڵوێزخانه‌ی هیند وتی بۆ زه‌برووه‌شاندن له‌ رژیمی دیکتاتۆری به‌عس زانکۆی سلێمانی چۆڵ کراوه‌ و کورده‌کان چوونه‌ بۆ باکوور و عه‌ره‌به‌کان هاتوونه‌ته‌وه‌ بۆ به‌غداد. ته‌نها ۲۲ مامۆستای بیانی له‌ سه‌رجه‌م کۆلیژه‌کانی زانکۆ ماونه‌ته‌وه‌. کاربه‌ده‌سته‌که‌ی باڵوێزخانه‌ی هیند هه‌روه‌ها وتی ئێستا کۆنترۆلی جاده‌ی که‌رکووک — سلێمانی به‌ده‌ستی پێشمه‌رگه‌وه‌یه‌.

۲- دیپلۆماته‌ شیوعیه‌کان ( که‌ به‌رده‌وام پشتیوانیان له‌ هه‌ڵوێستی ده‌وڵه‌تی عێراق کردوه‌) هۆشداری ده‌ده‌ن که‌ ئه‌گه‌ر بارزانی له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی عێرق رێکنه‌که‌وێت، شه‌ڕێکی به‌رفراوان هه‌ڵده‌گیرسێت.

۳- رێبه‌رایه‌تی کورد تا ئێستا هیچ نیشانه‌یه‌کی بۆ سازش له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی عێراق ده‌رنه‌بڕیوه‌. رادیۆ ده‌نگی کوردستان که‌ شه‌پۆله‌کانی له‌ به‌غداد به‌هێزه‌ به‌رده‌وام له‌ کاتی ئێواراندا راپۆرتی پێکدادانه‌کان بڵاو ده‌کاته‌وه‌ و بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ ده‌کات که‌ خه‌ڵکی له‌گه‌ڵدایه‌. "ده‌نگی کوردستان" گاڵته‌ به‌ ده‌سه‌ڵاتی ئه‌و وه‌زیره‌ کوردانه‌ ده‌کات که‌ ده‌وڵه‌تی عێراق دایناون و ده‌ڵێن که‌ پارتی دیموکراتی کوردستان په‌یوه‌ست ده‌بێت به‌ به‌ره‌ی نیشتمانی.

---

[۲۳۱]- PAPAL NUNCIO به‌ نوێنه‌ری دیپلۆماتیکی پاپ له‌ وڵاتانی ده‌ره‌وه‌ ده‌گوترێت که‌ خاوه‌ن پێگه‌ی باڵوێزه‌ و به‌رپرسی کاروباری کنیسه‌ی کاتولیک له‌و وڵاته‌یه‌. وه‌رگێڕ

٤- رۆژی ٨ی نیسان، جێگری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەدام حوسەین لە دیمانەیەکدا چەند جار ئاماژەی بەوە کرد کە کوردەکان بە چەکی ئەمریکایی تەیار کراون بەڵام بە ئاشکرا ئێرانی بەو مەسەلەیە تۆمەتبار کرد. سەدام بانگەشەی ئەوەی کرد کە بارزانی ئیدی نوێنەری خەڵکی کورد نیە و ئەندامانی بنەماڵەی خۆی لە باکووری عێراق هەڵوێستیان لەگەڵ ئەو جیاوازە. سەدام وتی ئەنجوومەنی نیشتمانی (کوردستان) لە ماوەی چەند مانگی داهاتوودا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ رێبەرایەتی نوێی کورد پێکدێت.

٥- هەڵسەنگاندن: گرنگترین پێشهات بۆ ئێمە ئەوەیە کە دەنگۆی پشتیوانی ئەمریکا لە کوردەکان رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت. ئەگەر بارودۆخەکە خراپتر بێت دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە دوڵەتی عێراق بەشێوەکی راشکاوانەتر بانگەشەکانی ئەمدوایانەی سەدام حوسەین (دەربارەی پشتیوانیکردنی ئەمریکا لە کوردەکان - وەرگێڕ) دووپات بکاتەوە و راستەوخۆ و توند هێرش بکاتە سەر ئەمریکا. لەو پەیوەندیەدا پێشنیار دەکەین ئەو رێوشوێنانە کە لە برگەی ٣ی پەیامی ١٥٣ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە باس کراوە بۆ نکوڵیکردنی فەرمی ئەمریکا لەو مەسەلەیە (پشتیوانیکردن لە کوردەکان - وەرگێڕ) بگرینەبەر. من هێشتا لە سەر ئەو باوەڕەم کە سەرەڕای ئامادەکاریە سەربازیەکانی دەوڵەتی عێراق، رژیمی عێراق هێرشی بەرفراوان بۆ سەر کوردەکان وەک دوایین رێگاچارە دادەنێت. چاوەڕوان دەکرێت دەوڵەتی عێراق هێرشی سەربازی بکاتە سەر هەندێ شوێنی تایبەت وەک بنکەی رادیۆی "دەنگی کوردستان" و گوندەکانی نزیکی بارەگای سەرکردایەتی بارزانی.

لۆڤری

**له وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا**

**بۆ: نوسینگه‌ی پاراستنی به‌رژه‌وه‌ندیه‌کانی ئه‌مریکا له به‌غداد( بۆ کرده‌وه‌ی خێرا )**

**واشینگتۆن دی سی**

**١١ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابه‌ت: نکوڵیکردنی ئه‌مریکا له یارمه‌تیدانی کورده‌کان و دانیشتن له‌گه‌ڵ نوێنه‌ره کورده‌کان**

بۆ ئاگاداری خێرای باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له تاران

بۆ زانیاری: باڵوێزخانه‌ی ویلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له به‌یروت و ئانکارا

ئاماژه به:

الف- تیلیگرامی ٧٢٧٢٤ی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه

ب- تیلیگرامی ٤٢٢٢ی باڵوێزخانه‌ی ئه‌مریکا له به‌یروت

١- ئێوه ده‌بێ به شێوه‌ی فه‌رمی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه به وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی عێراق رابگه‌یه‌نن که وته‌بێژی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریکا ئه‌و بانگه‌شه‌یه‌ی ره‌ت کردوه‌ته‌وه که ده‌وڵه‌تی ئه‌مریکا چه‌ک بۆ کورده‌کان دابین ده‌کات و باڵوێزخانه‌ی ئه‌مریکا له به‌یروت ئه‌و راپۆرته‌ی رۆژنامه‌کانی به درۆ خستوه‌ته‌وه که باڵوێزی ئه‌مریکا له به‌یروت، گودلی[٣٣٢] له‌گه‌ڵ نوێنه‌ره کورده‌کان دانیشتوه.

[332] GUDLI

٢- وەزارەتی دەرەوەش ئەو شتانە کە باسکرا بە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی عێراق لە واشینگتۆن رادەگەیەنێت.

هێنرِی کیسینجێر

وەزیری دەرەوە

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩١٣**

**١٨ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابەت: کێشەی کورد لە عێراق تەشەنەدەکات**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، جەدە، کوەیت، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، تاران و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٣١ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- کورتە: دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات خۆی وا نیشان بدات کە ئارامە، سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ ئەو راستیە رووبەڕوو بوەتەوە کە بارودۆخی باکوور ئەوەندە خراپ بوە کە تەنها بە هێزی سەربازی چارەسەر دەبێت. رۆژی ٢٥ی نیسان ماوەی ئەو لێبوردنە (عەفوات) کۆتایی پێدێت کە دەوڵەتی عێراق بۆ ئەو کوردانەی کە فیناریان کردوە و چوونەتە ریزی بارزانی، دەریکردبوو. بە هۆی ئەوەی ئەنجامدانی هێرشێکی هەمەلایەنە دژی کوردەکان وەبیرهێنەرەوەی شکستی سیاسەتی ٤ ساڵی رابردووی دەوڵەتی عێراقە، وادیارە رژیمی عێراق هێزی سەربازی لە هەندێ ناوچەی تایبەت جێگیر دەکات و لە هەمان کاتدا پلانی ئۆتونومی کوردستان لەگەڵ کوردەکانی گوێڕایەڵی خۆی دەباتە پێش کە نوێنەری خەڵک نین. هەرچی بارودۆخەکە ئاڵۆزتر

دەبێت، تۆمەتبارکردنی ئێران و ئەمریکا ( بە یارمەتیدانی کوردەکان - وەرگێڕ) زیاتر دەبێت.

٢- دەوڵەتی عێراق سەبارەت بەو شتانەی کە لە کوردستانی عێراق روو دەدات، بە شێوەی فەرمی هیچ ناڵێت و هەوڵ دەدات وانیشان بدات کە بارودۆخەکە وەک خۆی دەچێتەپێش. جێگری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەدام حوسەین ١٦ی نیسان لەگەڵ ئەندامانی کۆمیتەی باڵای بەرەی نیشتمانی دیداری کردوە و رێگاکانی خێراترکردنی پێکهاتنی ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجوومەنی راپەڕاندنی (هەیئەی تەشریعی و هەیئەی تەنفیزی) هەرێمی ئۆتونومی کوردستانی تاوتوێ کردوە. شەپۆڵی هێرشکردن بۆ سەر پیلانگێڕیەکانی ئێران و ئیمپریالیزم تا دەچێت توندتر دەبێت بەڵام تەوەری تۆمەتەکان زۆر روون ناکرێنەوە. نکوڵیکردنی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان (کە لە تیلیگرامی ٧٢٧٤ی وەزارەتی دەرەوەدا باس کراوە) لە بەغداد بڵاو نەکراوەتەوە. رۆژنامە فەرمیەکان هێرشکردنی راستەوخۆ بۆ سەر بارزانیان دەست پێکردوە. ١٨ی نیسان رۆژنامەی الجمهوریە[٣٣٣] لە سەروتارەکەیدا بانگەشەی ئەوەی کرد کە بارزانی لە لێدوانێکدا بۆ رۆژنامەی "پاریس هیراڵد تریبۆن"[٣٣٤] لە ٢ی نیسان وتویەتی کە پێیباشە چەکوچۆڵ لە ئیسرائیل وەربگرێت.

٣- هەواڵی رووداوەکانی باکوور لە رادیۆی "دەنگی کوردستان" و چەند بیانیەک کە سەردانی باکووریان کردوە وەردەگرین. باڵوێزی تورکیە پشتڕاستی کردەوە کە کۆنترۆلی سنووری زاخۆ بەدەستی پێشمەرگەوەیە. وادیارە دەوڵەتی عێراق رێگا بەوە نادات بارودۆخی زاخۆ بەمشێوەیە بەردەوام بێت چونکە بە مانای ئەوەیە کە تەنها رێگای سنووری رۆیشتن بۆ تورکیا ئیدی لە دەستی دەوڵەتی عێراقدا نیە. چاوەڕوان دەکرێت پێکدادانێکی توندی سەربازی لە ناوچەی زاخۆ روو بدات. یەکێ لە ناوچە ئاڵۆزەکانی دیکە سلێمانییە کە تیکنیسیە بیانیەکان، مامۆستا و خوێندکارانی زانکۆ

---

333 -AL-JUMHURtuYA

334 PARIS HERALD TRIBUNE-

تێیدا نەماون و ئێواران هێزەکانی عێراق و پێشمەرگەکان تەقە لە یەکدی دەکەن. باڵوێزی ئیسپانیا پێمیوت کە ٧٠ تیکنیسیەنی ئیسپانیایی کە لە بینای کارخانەی شەکر لە نزیک سلێمانی کاریان کردوە ( کە ٩٠ %ی تەواو بوە) گەڕاونەتەوە بۆ ئیسپانیا. کاتێک کە وەزیری پێشەسازی عێراق گلەیی ئەوەی کردوە کە هیچ شتێک روونەداوە کە ئیسپانیایەکان کارەکەیان بەجێبێڵن، باڵویزی ئیسپانیا رایگەیاندبوو ئامادەیە تکنیسیەنە ئیسپانیایەکان بگەڕێنێتەوە بۆ سەر کارەکانیان ئەگەر دەوڵەتی عێراق رێگەی پێبدات خۆی سەردانی سلێمانی بکات. هەم جادەی بەغداد - سلێمانی و هەم جادەی کەرکووک -سلێمانی جگە لە هاتوچۆی سەربازی بە رووی هەموو هاتوچۆیەکی دیکەدا داخراوە. هەروەها کۆمەڵێکی زۆر راپۆرت دەربارەی کەمبوونی خواردەمەنی، سووتەمەنی و پێداویستیەکانی دیکە لە شارە سەرەکیەکانی باکوور بڵاو بوەتەوە.

لۆڤری

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ۹۳۳**

**۲۵ی نیسانی ۱۹۷٤**

**بابەت: جموجۆڵە سەربازیەکانی بەعس و هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی پلانی ئۆتونومی کورد**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، جەدە، کوەیت، لەندەن، پاریس، موسکۆ، تاران، تلابیب و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ۲۳۵ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

۱- دەوڵەتی عێراق درێژە بە جێبەجێکردنی پلانی ئۆتونومی کورد دەدات بێ ئەوەی گوێ لە پێکدادانە سەربازیەکان لە باکوور و لێدوانە توندەکانی بارەگای سەرکردایەتی بارزانی بۆ رۆژنامەنووسە بیانیەکان بگرێت. دوایین هەنگاوی بەرچاو کە دەوڵەتی عێراق لەو پەیوەندیەدا هەڵیگرتوە ئەوەیە کە تەها محی الدین معروف[۳۳۵] کە کوردە و باڵوێزی عێراق بوە لە رۆما لە پۆستی جێگری سەرۆک کۆمار داناوە و سەرۆکی حزبی (بەعس) نعیم حداد[۳۳۶] ۲۰ی نیسان رایگەیاند کە ئەنجوومەنی یاسادانانی هەرێمی

---

335 TAHA MUHYIDDIN MAROUF,

336 NAEM HADDAD

کوردستان بەمزوانە پێکدێت. عزیز عەقراوی کە کوردە و تازە لە پۆستی وەزارەت دانراوە، سەردانی پارێزگاری هەولێری کردوە بۆ ئەوەی دەست بە بەرێکخستنکردنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بێ بارزانی بکات. لەوانەیە عەقراوی بەمزوانە KDPی خۆیان بهێنیتە ناو بەرەی نیشتمانی. ڕۆژنامەکانی بەغداد باسی پێکدادانەکانی باکوور ناکەن بەڵا من زانیاری باوەڕپێکراوم بەدەست گەیشتوە کە هێزی هەوایی عێراق ئێستا هەندێ شوێنی هەڵبژێردراو بومباران دەکات. ٢٥ی نیسان ئەو لێبوردنە کۆتایی پێدێت کە دەوڵەتی عێراق بۆ ئەو کەسانە کە فیناریان کردوە، دەریکردوە بەڵام فەرمانبەرە کوردەکان نەگەڕاونەتەوە سەر کارەکانیان.

٢- کونسولی فەرەنسا ٢٤ی نیسان پێمیوت کە لیوایەکی سپای عێراق چوە بۆ ناوچەی سنجار. وادیارە ئەو لیوایە بۆ ئەوە ناردراوە کە سنووری سوریە دابخات و بەرەو باکوور بچێتە پێش بۆ ئەوەی بنکەی سەربازی زاخۆ ئازاد بکات و ڕێگای سەرەکی ڕۆیشتن بەرەو سنووری تورکیە بگرێتەوە دەست. کونسولی فەرەنسە هەروەها وتی زانیاری ئەوەی لایە کە زۆربەی ئەفسەرە پلەبەرزەکانی سپای عێراق نایانەوێت هێرش بکەنە سەر کوردەکان و هۆکاری ئەوەش لەوانەیە ئەوە بێت کە نایانەوێت لە ناوچە شاخاویەکاندا شەڕ بکەن چونکە شەڕە سەرنەکەوتووەکانی ١٩٦١-٧٠ دەهێننەوە بیری خۆیان. جگە لەوەش ٢٥ لە ١٠٠ی سەربازانی عێراق کوردن و ئەنجامدانی هێرشێکی نوێ لەوانەیە ببێتە هۆی هەڵاتنی (فیناری) زیاتری سەربازە کوردەکان.

٣- کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی هیند بە ناوی نایرام[٣٣٧] پێمیوت لە ٢٢ی نیسانەوە پێکدادانگەلێکی گەورە ڕوویداوە و هێزی هەوایی عێراق هێرشی کردوەتە سەر هەندێ لە گوندەکانی سەر ڕێگای کەرکووک - سلێمانی. نایرام هەروەها وتی بەتالیونێکی هێزە تایبەتەکانی سپای عێراق ٢٢ی نیسان لە بەغدادەوە چووە بۆ هەولێر.

لۆڤری

---

[337] NAIRAM

**له باڵوێزخانەی ویلایەیە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە موسکۆ**

**بۆ:وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٨٢٩٠**

**٢٦ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابەت: هێرشی رۆژنامەی پراودای سۆڤیەت بۆ سەر کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، ئەمان، بەیروت، قاهیرە، جەدە، تاران، پاریس، لەندەن، تلابیب، کۆنسولخانەی ئەمریکا لە لینینگراد، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و دیمەشق و نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان

١- کورتە: رۆژنامەی پراودا[٣٣٨] رۆژی ٢٦ی نیسان وتارێکی بڵاو کردەوە کە یەکەمین راپۆرتێکە کە ئێمە تا ئێستا بینیومانە کە تێیدا باسی ئەوە کرابێ کە کوردەکان بە ئاشکرا لە بەرامبەر پلانی ئوتونومی دەوڵەتی عێراقدا رادەوەستن. ئەو وتارە بە تەواوی پشتیوانی سۆڤیەت لە دەوڵەتی عێراقی دەربرییبوو و بزووتنەوەی کورد و دەستێوەردانی ئیمپریالیست و هێزە پاشوەرۆخوازەکانی (بێ ئەوەی راستەوخۆ ناویان بهێنێت) لۆمە وسەرزەنشت کردبوو.

٢- رۆژنامەی پراودا دەربارەی خەباتی چەکداری کوردەکان دژی دەوڵەتی عێراق نوسیبووی کە رێبەرانی کورد پلانی ئوتونومی دەوڵەتی عێراقیان قبوڵ نەکردوە هەرچەند کە ئەو پلانە "مافە نەتەوەییە دیموکراتیک و کۆمەڵایەتیەکانی کوردەکانی" لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا دەستەبەر کردوە. ئەو وتارە وێڕای ئاماژەکردن بە

---

[338] Pravda

راپۆرتی ڕۆژنامە بیانیەکان، وتبووی ڕێبەرایەتی کورد بێ دەستێوەردانی ئیمپریالیستەکان و هێزە پاشوەڕۆخوازانی دیکە ناتوانێت لە سەر خەباتەکەی بڕیار بدات و ئاماژەی بەوە کردبوو کە وڵاتانی بیانی هەوڵ دەدەن کوردەکان لە عەرەبەکان دوور بخەنەوە و ڕژیمی پێشکەوتنخوازی عێراق لاواز بکەن و یارمەتی مادی و چەکوچۆڵ دەدەن بە کوردەکان.

٣- وتارەکەی ڕۆژنامەی پراودا لە کۆتاییدا ئەو ئەنجامەی دەرخستبوو کە هێزە کوردە پێشکەوتنخوازەکان و حزبی شیوعی عێراق داوایان کردوە پێش لە دەستێوەردانی ئیمپریالیزم لە کاروباری نیوخۆی عێراقدا بگیردرێت و کێشەی کورد لە سەر بنەمای بەیاننامەی ئاداری ١٩٧٠ و یاسای ئۆتونومی کوردستان بە شێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکرێت.

٤- ڕۆژنامەی پراودا هەر هەمان ڕۆژ لە زمانی ئاژانسی دەنگوباسی TASS بڵاوی کردەوە کە ڕێکەوتننامەیەک بۆ فرۆشتنی پاپۆڕی سەربازی لە لایەن سۆڤیەت بە عێراق، لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا واژۆ کراوە. ئێمە پێمانوایە کە بڵاوکردنەوەی ئەو دوو وتارە پێکەوە لە یەک ژمارەدا، نیشانەی ئەوەیە کە سۆڤیەت دەیەوێت پشتیوانی زیاتری خۆی لە دەوڵەتی عێراق دەرببڕێت.

دوبز[339]

---

[339] Dubs

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ۰۹۲٦**

**۲۷ی نیسانی ۱۹۷٤**

**نهێنی**

**بابەت: هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ هاندانی وڵاتانی عەرەبی دژی شۆڕشی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرجەم وڵاتانی عەرەبی و ئانکارا، لەندەن، مۆسکۆ، پاریس، تاران و تلابیب.

۱- رۆژی ۲۰ی نیسان لیژنەیەکی باڵوێزی وڵاتانی عەرەبی لە بەغداد بانگهێشتی وەزارەتی دەرەوەی عێراق کران بۆ ئەوەی لەگەڵ جێگری وەزیری دەرەوە، عبدالحسین الجمالی[٣٤٠] دیدار بکەن. بە گوێرەی ئەو زانیاریانە کە کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی میسر بە ناوی بەرەکە[٣٤١] و کونسولی فرانسە لە عێراق، سەیلارد[٣٤٢] (کە ئەویش ئەو زانیاریانەی لە باڵوێزی مەغرب وەرگرتبوو) پێیاندام، ئەم شتانە لە دیدارەکەی جێگری وەزیری دەرەوەی عێراقدا خراوەتەڕوو:

---

340 ABDUL HUSSEIN AL-JAMALI.
341 BARAKA
342 SAILLARD

٢- الجمالی باسی کێشەی کوردی کردوە و وتویەتی عێراق هەر لە کۆنەوە کێشەی کوردی بە کێشەی ناوخۆیی خۆی زانیوە[٣٤٣]. الجمالی لە درێژەی قسەکانیدا وتویەتی راگەیاندننامەکانی ئەم دوایانەی کوردەکان کە تێیدا داوای سەربەخۆیی و دەستێوەردانی وڵاتانی بیانیان کردوە، کێشەکەی کردوە بە کێشەیەکی نێونەتەوەیی و ئێستا دەوڵەتی عێراق دەیەوێت وڵاتانی عەرەبی پشتیوانی لە عێراق بکەن ئەو کێشەیە چارەسەر بکات. ئەو باس و گفتوگانە دوو کاتژمێر و نیو بەردەوام بوە.

٣- نوێنەری میسر لەو دانیشتنەدا پرسیاری لە الجمالی کردوە کە ئایا هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوەیە کە نیشان بدات وڵاتانی دیکە پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن. الجمالیش وەڵامیداوەتەوە عەرەبستانی سعودی پارە و ئێران و ئەمریکا چەک بە کوردەکان دەدەن بەڵام وتویەتی ئەو وڵاتانە لەوە زیرەکترن کە بە ئاشکرا پشتیوانی لە کوردەکان بکەن و بەڵگە بە دەستەوە بدەن. باڵوێزی عەرەبستانی سعودی لەو دانیشتنەدا ئەو تۆمەتانەی رەت کردوەتەوە بەڵام هیچی دیکەی بۆ وتن پێنەبوە. باڵوێزی تونس پرسیاری لە الجمالی کردوە عێراق چۆن چاوەڕوانی پشتیوانی وڵاتانی عەرەبی دەکات لە کاتێکدا کە عێراق لە رابردوودا هێرشی کردوەتە سەر ئەو وڵاتانە و دانی بە حزبی شیوعی عێراق لە ناو بەرەی نیشتمانیدا ناوە. الجمالی وەڵامیداوەتەوە دانپێدانان بە حزبی شیوعی عێراق بە واتای دانپێدانان بە بیروبۆچونی کومونیستەکان نیە بەڵکوو ئەوە تاکتێکی پێویست بوە.

٤- باڵوێزی جەزاییر، عوسمان سەعدی[٣٤٤] وتویەتی دەیەوێت وەک جەزاییریەک، وەک بەرپەرێک[٣٤٥] و وەک شۆڕشگێرێک قسە بکات. عوسمان سەعدی وتویەتی دەوڵەتی

---

[٣٤٣]- باڵوێزی تورکیە، چوهروک ئەو بۆچوونەی الجمالی پشتڕاست کردەوە و پێمیوت ئەمدوایانە دەوڵەتی عێراق قەد کێشەی کوردی لەگەڵ ئەو یان دەوڵەتی تورکیە باس نەکردوە. چوهروک هەروەها وتی چەند مانگ لەمەوپێش جارێکیان باسی کێشەی کوردی لای کاربەدەستێکی پایەبەرزی عێراق کردوە بەڵام ئەو کاربەدەستە لە وەڵامدا وتویەتی ئەوە کێشەیەکی ناوخۆیی عێراقە.

[344] OTHMANE SAADI

جەزاییر قەد ناتوانێت پشتیوانی لە ئۆتونومی کوردەکان بکات چونکە خۆی کێشەی کەمینەی بەربەرەکانی هەیە و ئامازەی بەوە کردوە کە زۆرترین شتێک کە لە دەستی دەوڵەتی جەزاییر دیت ئەوەیە کە لە راگەیاندننامەیەکدا پشتیوانی لە یەکپارچەیی خاکی عێراق بکات. باڵوێزی سودان، موسا موستەفا ئامازەی بە کێشەی باشووری سودان کردوە و جەختی لە سەر ئەوە کردوەتەوە کە مومکین نیە کێشەی کورد بە رێگای سەربازی چارەسەر بکرێت. موسا موستەفا پرسیاری لە الجمالی کردوە ئایا عێراق بەراستی پابەندە بە چارەسەری ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد و الجمالیش پێی لە سەر ئەوە داگرتوە کە بەڵێ پابەندە. پاشان باڵوێزی یەمەن، المروانی[٣٤٦] پرسیاری کردوە مادام کە کێشەی سەرەکی ئێرانە، بۆ عێراق پوان بە ئێران نادات بۆ ئەوەی کێشەکە چارەسەر بێت. الجمالیش وەڵامیداوەتەوە عێراق ئەمدوایانە هەوڵیداوە بەڵام ئەو وتووێژانە هیچ ئەنجامێکی ئەرێنی بەدواوە نەبوە.

٥- هەرچەند کە نوێنەرانی سەرجەم ئەو وڵاتە عەرەبیانە کە لەو دانیشتنەدا بەشداریان کردەوە، وتویانە کە دەبێ لەو پەیوەندیەدا رای دەوڵەتەکانی خۆیان وەربگرن بەڵام نوێنەرانی ئەو وڵاتە عەرەبیانە لە نێو خۆیاندا باسی ئەوەیان کردەوە کە دەبێ هێرشێکی پرۆپاگەندایی دژی کوردەکان و پشتیوانەکانی کوردەکان دەستپێبکەن و رەفتارێکی هاوبەش بەنیسبەت ئێران بگرنەبەر و لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق و هەروەها لە نێوان دەوڵەتی عێراق و ئێراندا ناوبژیوانی بکەن.

٦-هەڵسەنگاندن: وڵاتانی عەرەبی بە گشتی پێشوازی لەو داواکاریەی عێراق بۆ پشتیوانیکردنی جیهانی عەرەب ناکەن و ئەمەش دەربڕی هەڵوێستی دەوڵەتانی عەرەبی بەنیسبەت رژیمی عێراقە. بەهەرحاڵ لەوانەیە میسر لەو پەیوەندیەدا هەوڵێک بە قازانجی عێراق بدات چونکە میسر لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی بەرفراوانتر سەیری

---

BERBER [٣٤٥] بەربەرەکان نەتەوەیەکی زیاتر بیاباننشینن کە لە باکووری ئەفریقا (بەتایبەت جەزاییر، مەغریب، لیبی و تونس) دەژین. بەربەرەکان بە زمانی ئامازیغی قسە دەکەن و لەگەڵ دەوڵەتی جەزاییر و مەغریبدا کێشەی سیاسیان هەیە. وەرگێڕ

[346] AL-MARWANI

ناوچه دەكات و(بە بۆچوونی من) پێیوایە كە رژیمی ئێستای عێراق باشترین رژیمێكە كە لەم بارودۆخەدا چاوڕوان دەكرێت و لە سەر ئەو باوەڕەیە كە ئەگەر دەوڵەتێكی دیكە جێگای دەوڵەتی ئێستای عێراق بگرێتەوە، بارودۆخەكە دەگەڕێتەوە بۆ بێسەروبەرەیەكەی جاران.

لۆڤری

**لە کۆنسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی**

**٢٧ی نیسانی ١٩٧٤**

**بابەت: ئێران و کێشەی کوردەکانی بارزانی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران، ئانکارا، دەمیشق، ئادانا، کۆنسولخانەی ئەمریکا لە خورەمشار و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئامارە بە: پەیامی A-5ی کونسولخانەی تەورێز، ١٠ی شوباتی ١٩٧٤

**کورتە:**

کێشەی کورد و بەعس لە عێراق لە ماوەی دوو هەفتەی رابردوودا زۆر ئاڵۆزتر بوە. ئەو راپۆرتانەی کە دەگەنە دنیای دەرەوە زیاتر لەو زانیاریانە وەردەگیردرێت کە رادیۆی کوردستان و میدیاکانی دەوڵەتی بەعس بڵاوی دەکەنەوە. بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و راپۆرتگەلی جیاواز دەربارەی یارمەتی ئێران بە کوردەکانی عێراق، کاربەدەستێکی کونسولخانە لە رۆژانی ٢٢ تا ٢٥ی نیسان سەردانی رەزائیە، مهاباد و ناوچە سنووریەکانی پیرانشار(خانێ)، سەردەشت و بانەی کرد.

هەرچەند کە وەدەستخستنی زانیاری راست و درست دەربارەی یارمەتیە چەک و تەقەمەنیەکانی ئێران بە هێزەکانی بارزانی ئاسان نیە بەڵام برادەرانی کاربەدەستی ئێران بە دڵاوەڵایی هەرچییەکیان کە دەربارەی بارودۆخی ئەودیوی سنوورتی عێراق دەزانی پێمانوت. ئەو کاربەدەستە کە ئەم زانیاریانەی ئامادە کردوە هاتوچۆیەکی

زۆری ئوتومومبیلی بۆ ژمارەی سپای ئێرانی بەرەو ناوچە سنووریەکان بینیوە و بینیویەتی کە ڕێکخراوی "شیر و خۆرشیدی "ئێران (ڕێکخراوی مانگی سووری ئێران- وەرگێڕ) هەوڵ دەدات پێشمەرگە بریندارەکان تەداوی بکات. ٢٤ی نیسانی ١٩٧٤، هێزی هەوایی عێراق شاری بۆ پاراستنی قلادزی (کە شارێکی کوردنشینی عێراقە) بومباران کردوە و ئەو کاربەدەستە کە ئەم زانیاریانەی کۆ کردوەتەوە بینیویەتی کە ژمارەیەکی زۆر ئاوارە و ئەوانەی کە برینەکانیان قورس بوە، هاتونەتە شاری سەردەشت لە ناو خاکی ئێران.

### تێڕوانینێکی گشتی بۆ کێشەی کوردی عێراق و وەڵامی ئێران

ئەو کاربەدەستەی کە ئەم زانیاریانەی کۆ کردوەتەوە، لیستێکی درێژی لە لایەن قایممەقامی سەردەشت، ژنراڵ عەزیز ئوتمیشی[٣٤٧] بەدەست گەیشتوە. ئوتمیشی کە تەمەنی ٥٢ ساڵە و کوردی خەڵکی سنەیە ژنراڵێکی پۆلیسی خانەنشینە کە ٣٠ ساڵ لە ئازەربایجان و کوردستان خزمەتی کردوە. ئوتمیشی (لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا- وەرگێڕ) لەگەڵ بارزانی و قازی محمد لە مهاباد شەڕی کردوە و لەگەڵ تودەییەکان[٣٤٨] لە میاندوئاو و تەورێز شەڕی کردوە و لە ناوەڕاستی شەستەکان تا سەرەتای هەفتاکان سەرۆکی پۆلیسی مهاباد و سنە بوە. ئوتمیشی باش بارزانی دەناسێت و گومان لەوەدا نیە کە زۆربەی ماوەی ١٨ مانگی کاری رابردووی لە سەردەشت لەگەڵ پێشمەرگەکان لەپەیوەندیدا بوە. ئوتمیشی مرۆڤێکی زۆر سەرنجڕاکێشە و وادیارە کوردێکی زۆر نەتەوەییە و لایەنگری بارزانیە و لە هەمان

---

[347] General Aziz Otmishi

[٣٤٨] تودەییەکان بە ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی تودەی ئێران دەگوترێت کە حیزبێکی کومونیستی لایەنگری حیزبی شیوعی سۆڤیەت بوو بەڵام پاش شۆڕشی ئیسلامی لەیەک هەڵوەشایەوە. مەبەستی لێرە فەداییەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانە کە بە سەرکردایەتی جەعفەر پیشەوەری کۆماری ئازەربایجانیان پێکهێنا و پاش هەرەسهێنانی کۆماری ئازەربایجان لە شاری میاندوئاو و تەورێز شەڕێکی خوێناوی لە نێوان هێزەکانی ئێران و هێزەکانی کۆماری ئازەربایجان هاتە ئاراوە. وەرگێڕ

کاتدا وەک لایەنگرێکی وەفاداری سیاسەتەکانی دەوڵەتی ئێران خزمەت دەکات. ئایا بارزانی دەتوانیت ئۆتونومی تەواو بۆ کوردەکان لە عێراق بەدەست بهێنێت؟ بیستنی وەڵامی ئەم پرسیارە لە زمانی ئۆتمیشیەوە کە لە ئێرانە، جێگای سەرسوڕمانە.

ئۆتمیشی (کە کچەکەی لە ئەمریکا خوێندوویەتی و ماوەیەک لە باڵوێزخانەی ئەمریکادا کاری کردوە) لە سەرەتای قسەکانیدا کێشەی کوردی لە کاتی پەیماننامەی "لۆزان"ەوە بە تێروتەسەلی شیکردەوە. ئۆتمیشی بەتەواوی لە سەر ئەو بیروباوەڕەیە کە کوردەکان لە سەردەمی ئیمپراتۆری عوسمانیدا سەربەخۆ بوونە و هەوڵی بەردەوامی کوردەکان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بوەتەهۆی بنبەستی ئێستای عێراق. ئۆتمیشی وتی پێشمەرگە تەسلیمی بەعس نابێت و شەڕی ناوخۆ دەبێتە هۆی رووخانی دەسەڵاتی بەعس و هاتنەئارای ئۆتونومی کورد بە رێبەرایەتی بارزانی یان تێکەڵێک لەو دوو شتە. ئۆتمیشی وتی شەڕی ناوخۆ بۆ عێراق، سوریە، تورکیە و ئێران شتێکی زۆر مەترسیدارە چونکە کەمینەی گەورەی کورد لە ناو ئەم وڵاتانەدا دەژی.

کاتێک کە باسی چۆنیەتی کاردانەوەی کوردەکانی ئێران بە نیسبەت چەسپانی ئۆتونومی بۆ کورد لە عێراق کرا ئۆتمیشی سەرەتا خۆی لە وەڵامدانەوە بەو پرسیارە بوارد و وتی کوردەکان زۆر خراپ لە تورکیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و زۆر بواری سەربەخۆیی کوردیان تێدایە. سەبارەت بە هەست و سۆزی کوردەکانی ئێران، ئۆتمیشی ئاماژەی بەوە کرد کە ناڕازیبوونی لەمێژینەی کوردەکان لە دەسەڵاتی ئێران و راکێشانیان بەرەولای بارزانی تەنها بە بازنەیەک سنووردارە کە ١٥٠ کیلۆمەترە کە باکوورەکەی پیرانشار و رۆژئاواکەی مهاباد و باشورەکەی بانەیە (لەگەڵ نیمچە بازنەیەکی دیکە کە نزیکەی ٢٥ کیلۆمەترە و دەکەوێتە باشووری مەریوان). ئۆتمیشی وتی خەڵکی ئەم ناوچەیە لە ساڵی ١٩٤٦ پشتیوانیان لە بارزانی و قازی محمد کردوە و ئەم سۆز و هەستەیان تا رۆژی ئەمڕۆ بۆ بارزانی ماوە. ئۆتمیشی وتی ناوەندی پارێزگای کوردستانی ئێران واتا سنە و سەقز لە بنەڕەتدا بە ئێران وەفادارن و وتی لەگەڵ ئەو بۆچونەی بەڕێز عەلیزادە، پارێزگاری پارێزگای کوردستان هاوڕایە کە

کوردەکانی سنە (هەرچەند کە لەوانەیە شەڕاشۆ بن) لایەنگری شەڕ نین و قەد بۆ بارزانی شەڕ ناکەن هەرچەند کە بەهەرحاڵ لەوانەیە کوردەکانی پیرانشار — مهاباد - بانە بە هۆی هاندانیانەوە یا راکێشان بەرەولای ئۆتونومی کورد لە عێراق، شەڕ بۆ بارزانی بکەن.

بە وتەی ئۆتمیشی وەڵامی ئێران بە داواکاریەکانی کوردەکان لە کاتی کۆماری مهابادەوە بە دوو قۆناخدا تێپەڕیوە: ١- قۆناخی پێش لە ١٩٦٧ و ٢- قۆناخی پاش ١٩٦٧. پێش لە ١٩٦٧ پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق گەرم بوو و کوردەکانی ئێران کە داوای ئۆتونومیان دەکرد بە توندی سەرکووت دەکران و کوردستانی ئێران لە رووی ئابووریەوە گەشەی کەمی کردبوو. ئۆتمیشی وتی ساڵی ١٩٦٧ بەعسیەکانی عێراق تا رادەیەک دزەیان کردە ناو گروپە کوردەکانی ئێران و لە لای بارزانی لایدان و بەرەو عێراق رایکێشان. پاشان دەوڵەتی ئێران زیاتر یارمەتی بارزانی دا و بە شێوەیەکی بێبەزەیانە لایەنگرانی بەعس لە ناو کوردەکانی ئێرانی سەرکووت کرد و دەستی کرد بە گەشەپێدانی خێرای ناوچەی کوردنشینی ئێران (مەبەستی پێشخستنی جادە و رێگاوبانی قیرتاو و درستکردنی بەنداو و کومپانیای کشتوکاڵی و نوێکردنەوەی مهاباد و.... یە کە هەمووی لە ١٩٦٧-٦٨وە دەستی پێکردوە). ئۆتمیشی بەتەواوی لایەنگری لە سیاسەتەکانی دەوڵەتی ئێران لە قۆناخی پاش ١٩٦٧ دەکات و ئەمەش لەگەڵ بیروبۆچونە سیاسیەکانیدا باش دێتەوە. بەهەرحاڵ ئۆتمیشی لە راستیدا نەیەویست لەگەڵ ئەو پرسیارە گەورەترەدا رووبەڕوو بێتەوە کە کوردەکانی ئێران چەندە لایەنگری دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردن.

### یارمەتیەکانی ئێران بە هێزی پێشمەرگە

هێشتا ناتوانین زانیاری دەربارەی ئەو چەکوچۆڵانە کە دەوڵەتی ئێران بۆ پێشمەرگەی دەنێریت، بەدەستبهێنین (بۆ نموونە کاتێک کە باسی ئەو مەسەلە هاتە مەیدان ئۆتمیشی خۆی لێبوارد و وتی چەکوچۆڵ و مەسەلەی پارەدانی بارزانی بە چەکوچۆڵ بۆ پێشمەرگە کێشە نیە) بەڵام شێوازەکانی دیکەی یارمەتیەکانی ئێران بە پێشمەرگە

روونە. ڕێکخراوی "شیرو خۆرشید" تیمێکی تایبەتی بە سەرپەرەشتی دۆکتۆر حەبیبی لە تارانەوە ناردوە بۆ پیرانشار و سەردەشت کە زیاترین ژمارەی پێشمەرگە بریندارەکانی تێدایە. ڕێکخراوی "شیرو خۆرشید" نەخۆشخانەیەکی گەڕۆکی ٥٠ قەرەوێڵەیی لە پیرانشار درست کردوە و ئەو کاربەدەستەی کە ئەم زانیاریانەی ئامادە کردوە لەگەڵ قایممەقامی پیرانشار بەڕێز کەمالی دیداری کردوە. بریندارەکانی دیکە (کە برینداری مەدەنیان تێدا نیە) لە بنکە تەندرستیە کاتیەکانی گەڕەکەکانی پیرانشار تەداوی کراون.

بە گوێرەی راپۆرتەکان پێشمەرگە بریندارەکان لە نەخۆشخانەی ٢٥٠ قەرەوێڵەیی شیروخورشید لە ڕەزاییە تەداوی دەکرێن. بەهەرحاڵ پزشکێکی نەشتەرگەری کە ناسراوی ئەو کەسەیە کە ئەم راپۆرتەی ئامادە کردوە، ئەو مەسەلەیەی ڕەت کردوەتەوە. لە سەردەشت نەخۆشخانەی ٦٠ قەرەوێڵەیی شیروخورشید پڕ بوە لە بریندارە کوردەکان. خودی ئوتمیشی تازە لەو نەخۆشخانەیە گەڕابوەوە و داوای لە تاران کردبوو نەخۆشخانەی گەڕۆکی زیادە و دۆکتۆر و دەواودەرمانیان بۆ دابین بکات. زیادبوونی ژمارەی بریندارەکان لە سەرلەبەیانی ٢٥ی نیسان بە هۆی هێرشێکی هەوایی عێراق لە ڕۆژی پێشتر لە قەڵادزێ بوە. ( بە وتەی ئەوانەی کە زیندوو ماون، ئەو هێرشە بە چوار فڕۆکەیSU7 کە کەڵکیان لە بومب و ناپاڵم وەرگرتوە، ئەنجام دراوە). ڕێژەی دانیشتوانی قەڵادزێ بە هۆی هاتنی ئاوارە کوردەکان لە سلێمانیەوە لە چەند هەفتەی رابردوودا زۆر زیادی کردوە. نزیکەی ٧٠ بریندار(کە زیاتر ژن و منداڵن) سەرلەبەیانی هەمان ڕۆژ گەیشتونەتە سەردەشت و چاوەڕوان دەکرێت ژمارەیەکی زیاتریش بێنە سەردەشت. قەڵادزێ ٣٥ کیلۆمەتر لە سنووری ئێران و ٥٠ کیلۆمەتر لە سەردەشت دوورە. ئوتوموبیلی ژمارەداری لاندرۆڤێری عێراقی بریندارەکانیان هێناوە بۆ سەردەشت و بە گوێرەی زانیاریەکان لە پیرانشار ژاندارمری ئێران بریندارەکانی لە سەر سنوور گوازتوەتەوە. ئوتمیشی وتی جادەی سەردەشت بۆ سەر سنوور و جادەی قەڵادزێ بۆ سنووری ئێران لە ماوەی ٦ مانگی رابردوودا چاک کراوە.

ژمارەیەکی کەم لە کوردەکانی عێراق ( بە جلوبەرگی کوردیەوە) لە ڕەزاییە، مهاباد، پیرانشار و سەردەشت بینراون. کاربەدەستانی ئێران ئەوەیان پشتڕاست کردەوە کە ئەوانە هاتوون بۆ شتکڕین. هەندێ لە شتومەکەکان لە نزیک سنوور ئەمبار کراوە، بۆ نموونە حەوشەی ویستگەیەکی فرۆشی بەنزین لە سەردەشت زیاتر لە سێ هەزار دانە گالۆنی پڕ لە گازولینی تێدا بوو. لە نزیک پیرانشار ١٥ ئوتوموبیلی سەربازی ئێران بینراون کە باریان گواستوەتەوە. هەرچەند کە ئەو ئوتومبیلانە ئوتومیبیلی سەوزی زەیتونی رووسی سپای ئێران بوون بەڵام هەموویان ژمارەکانیان لە سەر لابرابوو و شۆفێرەکانیان (کە لە شوفێری سەربازی دەچوون) جلوبەرگی مەدەنیان لەبەردابوو.

### ورەی پێشمەرگە و بارودۆخی سەربازی کورستانی عێراق

هەرچەند کە کۆڕەوی پێشمەرگە بریندارەکان (بەرەو ئێران) دەبێ زانیاری نوێ دەربارەی شەڕ لە کوردستانی عێراق بخاتە بەر دەستی ڕێکخراوە هەواڵگریەکانی ئێران، بەڵام زۆربەی کاربەدەستان نەیانەویست یان نەیاندەتوانی لەو پەیوەندیەدا هیچ بڵێن. بەهەرحاڵ ئوتمیشی خۆی لەگەڵ چەند کەسێک لە ئاوارەکان گفتوگۆی کردبوو کە دەیانگووت هێشتا بەرزایەکانی دەوروبەری موسڵ، کەرکووک و سلێمانی لە دەستی پێشمەرگەدایە و شەڕ بۆ کوردەکان باش چوەتە پێش.

ورەی (پێشمەرگەکان) تەنانەت لە ناو بریندارەکانیشدا بەرزە. ئەو کەسەی کە ئەم ڕاپۆرتەی ئامادە کردوە، زۆر پێیسەیر بوە کە چۆن کاربەدەستانی ئێران ورە و سەرکەوتنەکانی پێشمەرگەکانیان شرۆڤە کردوە و شەڕە دوورودرێژەکەی هێزی پێشمەرگە بۆ سەربەخۆیی کوردستانیان لەگەڵ هێزی " ڤییەتکۆنگ"[٣٤٩] و باکووری

[٣٤٩] ڤییەتکۆنگ ناوی ڕێکخراوی گریلایی چەکدارانی چالاکی کۆمۆنیستی ڤییەتنامی باشوور بوو کە لە کاتی شەڕی ڤییەتنام و دەستدرێژی ئەمریکا بۆ سەر ئەم وڵاتە دژی هێزەکانی ئەمریکا و ئەو دەوڵەتەی کە ئەمریکا لە ڤییەتنامی باشوور دایمەزراندبوو، شەڕیان دەکرد و ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ چەند ڕێکخراوی سەربەخۆخوازی دیکە لە بەرەی ڕزگاریدەری نەتەوەیی ڤییەتمین کۆبوونەوە و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٥ شکستێکی گرانیان سەپاند بەسەر ئەمریکادا. (وەرگێڕ)

ڤییەتنام بەراوەرد کردوە و دەیانگووت کە باڵادەستی عێراق لە رووی تەکنۆلۆژیەوە مەرج نیە ببێتە هۆی سەرکەوتنی عێراق.

ژینیراڵ ئوتمیشی نموونەیەکی ورەی بەرزی کوردەکانی بە چاوی خۆی بینیبوو و دەیگوت "ژنێکی کورد کە بە توندی بریندار بوو و لە بۆمبارانەکەی قلادزێ رزگاری بوو و لە نەخۆشخانەی سەردەشت بوو، بە شێوەی ژنانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بۆ مەرگی دوو لە منداڵەکانی ئازیەتی دەگرت و رۆڕۆی دەکرد و لە سینگی خۆی دەکوتا. پێشمەرگەیەکی کۆنی بریندار کە سەیری ئەو بیتاقەتیەی ژنەکەی دەکرد چوە پێشەوە و سەرزەنشی ئەو رەفتارە شەرماویەی ژنەکەی کرد و پێیوت هەزاران هەزار کورد لە رێگای سەربەخۆیی کوردستاندا گیانیان بەخت کردوە، تۆ بۆ وادەکەی؟ ژنەکە ئاه و ناڵەکردنەکانی راوەستاند و سەرەنجام ئارام بوەوە.

ماست[350]

---

[350] MAST

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٥٠**

**١ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: سەردانەکەی جۆزێف کرافت بۆ عێراق و وتووێژەکانی لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق دەربارەی کێشەی کورد**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قاهیرە، تاران، مۆسکۆ، بەیرووت، جەدە، پاریس و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٥٨٤٢ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مۆسکۆ

١- ڕۆژنامەنووس جۆزێف کرافت[٣٥١] بە ماوەی ٤٨ کاتژمێر لە ٢٧-٢٨ی نیسان سەردانی بەغدادی کرد. جۆزێف کرافت لە لایەن سەرۆکی بەشی پرۆپاگەندای حیزبی بەعس و تاریق عەزیز[٣٥٢] سەرنووسەری ڕۆژنامەی الثورە[٣٥٣] پێشوازیەکی گەرمی

---

٣٥١- JOSEPH KRAFT ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگی ئەمریکایی بووە کە لە ڕۆژنامەی واشینگتۆن پۆست و نیویۆرک تایمزدا کاری کردوە و نووسەری لێدوانەکانی جان ئیف کنێدی لە کاتی هەڵمەتی پرۆپاگەندای هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ١٩٦٠ بوە. جۆزێف کرافت ساڵی ١٩٨٦ کۆچی دوایی کردوە. وەرگێڕ.

352 -TARIQ AZIZ.

353 -ATH-THAWRA

لێکرا. وادیارە بە هۆی نەبوونی کات، جۆزێف کرافت نەیتوانیوە لەگەڵ سەدام حوسەین دیمانە بکات کە بە هۆی ئەوە تاریق عەزیز داوای لێبوردنی لە کرافت کردوە. ئەوکەسانە کە کرافت بینیونی و قسەوباسی لەگەڵ کردوون بریتین لە:

١- سەعدوون حەمادی[٣٥٤]، وەزیری نەوت کە ئینسانێکی تکنۆکراتی زۆر کاریگەر و سەرنجراکێشە. حەمادی زۆر بەرگری لە پلان و پرۆژە سەرەکیەکانی نەوتی عێراق کردوە چونکە ئەو پرۆژانە کە لەلایەن کۆمپانیا رۆژئاوایەکانەوە جێبەجێ دەکرێن، گرنگترن. حەمادی لە پاڵاوگەی نەوتی بەسرە کە ئەمدوایانە لە لایەن کۆمپانیایەکی وڵاتی چێکەوە تەواو کراوە، زۆر رازی و خۆشحاڵە (پیاوێکی ئەمریکایی کە لە بواری نەوتدا کار دەکات پێشتر پێمی وتبوو کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی عێراق زۆر لەوە ناڕازیە کە کۆمپانیاکەی وڵاتی چێک[٣٥٥] پرۆژەی پاڵاوگەی نەوتی بەسرەی دوو ساڵ درنگتر لەو کاتەی کە بۆی دیاری کرابوو، تەواو کردوە. ئەو پاڵاوگەیە یەکەمجار ساڵی ١٩٣٥ کەوتوەکار). حەمادی دەربارەی ئەو کۆمپانیانەی کە رێکەوتننامەکانی دەرهێنانی نەوت لە ناوچە نوێکان لەگەڵیاندا واژۆ دەکرێت وتویەتی هیچ هەڵاواردنێک دژی کۆمپانیاکانی نەوتی ئەمریکا لەوانە کۆمپانیا سەرەکیەکان لە ئارادانیە. حەمادی هەروەها وتویەیی جگە لە رێکەوتنێکی ٣٧ میلیۆن دولاری بۆ راکێشانی هێلی بۆری ٨ ئینچی لە بەغداد بۆ بەسرە کە ٣٠ی ئادار واژۆ کراوە، روسەکان پاڵاوگەی نەوتی موسڵێش درست دەکەن (وادیارە ئەم قسەی حەمادیە لەگەڵ بەشێک لەو زانیاریانە کە لە تیلیگرامەکەدا ئامازەی پێکراوە، یەکناگرێتەوە). حەمادی وەڵامی ئەو پرسیارانەی نەداوەتەوە کە ناوەرۆکەکەیان سیاسی بوە.

٢- عەزیز محمد[٣٥٦]، سکرتێری یەکەمی حیزبی شیوعی عێراق کە مرۆڤێکی زۆر جدی و خاوەن فکرە و زۆر لە خالید بەکداش[٣٥٧]، رێبەری حیزبی شیوعی سوریە کاریگەرترە. عەزیز محمد کوردە و هیچ هەوڵێک نادات بۆ ئەوەی لە جدیبوونی

---

354 -SADOUN HAMMADI
355 -CZECH
356 -AZIZ MOHAMMAD
357 -KHALID BAKHDASH

کێشەی کورد کەمبکاتەوە، بەپێچەوانەوە دان بەوەدا دەنێت کە زۆربەی کوردەکان چونەتە ریزی هێزەکانی بارزانی. عەزیز محمد هەروەها باسی ئەوەی کردوە کە سیاسەتی ئەوان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست (مەبەستی کێشەی ئێسرائیل- فەلەستینە) لەگەڵ سیاسەتی بەعس جیاوازە.

٤- عوبەیدوڵڵا بارزانی[٣٥٨]، وەزیری ناوخۆ کە وەزیرێکی شانۆیی (بێ دەسەلات) و داردەستە و لە ناو ئۆفیسێکی بەتاڵدا لە لایەن سەربازانی عێراقەوە گەمارۆ دراوە. عوبەیدوڵڵا تەنها پێیخۆش بوە دەربارەی باوکی قسە بکات و وتویەتی مەلا مستەفا رێبەرێکی عەشیرەتی دیکتاتۆرە کە تەنها ئامانجی ئەوەیە لە پێناو خەونەکەیدا کە سەربەخۆیی کوردە، درێژە بە شەڕ بدات. عوبەیدوڵڵا وتویەتی بەهەرحاڵ سەربەخۆیی کوردستان واقعبینانە نیە و ئەو ئامانجە پێش لەوەی خەڵکی کورد لە ناو ببات لەوانەیە خودی مەلا مستەفا لەناو ببات.

٥- تاریق عەزیز، کە مرۆڤێکی زۆر کاریگەرە و زۆر باش ئینگلیزی قسە دەکات. تاریق عەزیز بانگەشەی ئەوەی کردوە کە ئێران و ئەمریکا یارمەتی بارزانی دەدەن. کاتێک کە جۆزێف کرافت بۆ ئەو بانگەشەیە داوای بەڵگەی لە تاریق عەزیز کردوە، تاریق عەزیز وتویەتی کوردەکان چەکی ئەمریکایی وەکوو چەکی دژەفرۆکەیان پێیە کە ئەو چەکانە تەنها بە رەزامەندی دەوڵەتی ئەمریکا دەتوانێت بکەوێتە دەستی کوردەکان. هەروەها وتویەتی دەوڵەتی ئەمریکا ئەگەر بیەوێت دەتوانێت پێش لە یارمەتی ئێران بە کوردەکان بگرێت. تاریق عەزیز هەروەها بانگەشەی ئەوەی کردوە کە ئێران نیسانی رابردوو ویستویەتی لە عێراق نزیک بێتەوە و لە رۆژی یەکەمی دانیشتنی نهێنی وەزیری دەرەوەی ئێران و عێراق لە ژنێڤ ( لە سوئیسرا -وەرگێڕ) وتووێژەکان زۆر باش چوەتەپێش. پاشان جۆزێف سیسکۆ[٣٥٩] کە ئەو کاتە بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی COM لە تاران بوە، دەستێوەردانی کردوە و کتوپڕ دوای ئەوە هەڵوێستی ئێران سەبارەت بە وتووێژەکان سەختتر بوە.

---

358 -OBEIDALLAH BARZANI

359 -JOSEPH SISCO

٦- تاریق عەزیز و عبدالوهاب کیالی[٣٦٠] (کە ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی نیشتمانی بەعسە و خۆی فەلەستینیە و ژنەکەی ئەمریکاییە) بانگەشەی ئەوەیان کردوە کە سوریە و یەکێتی سۆڤیەت لە نزیکەوە پێکەوە کار دەکەن و لە سەر واژۆکرانی رێکەوتننامەی ئیسرائیل و سوریە رێککەوتوون. چالاکیەکانی ئێستای کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و گرۆمیکۆ[٣٦١]، وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت بۆ ئەوەیە کە سۆمعەی (حەیسیەت) سۆڤیەت و حافز ئەسەد بپارێزن لە ریگای ئەوەی کە دەمیشق بکەن بە ناوەندی جیهان و نیشان بدەن کە روسەکان دەورێکی چالاک دەگێرن. کاربەدەستانی عێراق هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە پێیانوایە رێکەوتنی ئیسرائیل و سوریە لەوانەیە واژۆ بکرێت پێیانوانیە کە کێشەی فەلەستین بەو شێوەیە کە عەرەبەکان رازی بن لە سەر بنەمای وتووێژ چارەسەر بێت. پەیوەندیەکانی عێراق و سوریە هێشتا باش نەبوە و لێژنەیەکی پایەبەرزی ئەو دوو وڵاتە مانگی نیسان پێکەوە دانیشتوون. بە وتەی تاریق عەزیز، حافز ئەسەد سەرۆک کۆماری سوریە لە رێگای گەڕانەوەی لە مۆسکۆ بۆ سوریە لە بەغداد لاینەداوە.

٧- تاریق عەزیز وتویەتی هێنانی حیزبی شیوعی عێراق بۆ ناو بەرەی نیشتمانی هاوپەیمانیەکی تاکتیکی بوە بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر بکەن چونکە ئەگەر حیزبی شیوعی لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد نەبێت، دژی بەعس دەچێتە پاڵ پارتی دیموکراتی کوردستان. تاریق عەزیز دەربارەی ئەو هۆکارانەی کە لە پشت کودتا سەرنەکەوتوەکەی ٣٠ی حوزەیرانی رابردوودا بوە، دانی بەوەدا ناوە کە ئیستیخباراتی عێراق کەڵکی خراپی لێوەرگیراوە و بانگەشەی ئەوەی کردوە کە ئێستا شتەکان زۆر باشتر بوە. تاریق عەزیز هەروەها دانی بەوەدا ناوە کە رژیمی بەعس پێش لە ساڵی ١٩٧٢ لە ناو خەڵکی عێراقدا بە گشتی خۆشەویست نەبوە بەڵام سەرکەوتنەکانی بەعس پاش ١٩٧٢ وەک بەخۆماڵیکردنی نەوت و ناردنی سەربازانی عێراقی بۆ

---

360 -ABDULWAHAB KAYYALI

361 -GROMYKO

پاراستنی دیمەشق لە شەڕی تشرینی یەکەم بوەتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی عێراق پشتیوانی لە بەعس بکەن.

٨- تێبینی: سەرەڕای ئەو راستیە کە جۆزێف کرافت سەدام حوسەینی نەبینیوە، ئەو دیدارانە کە کرافت لەگەڵ کاربەدەستانی عێراقدا کردوویەتی نیشان دەدات کە عێراق دەیەوێت وێنەی خۆی باشتر بکات و لە ئەمریکاییە دەستڕۆیشتوەکان کەڵک وەربگرێت. هەروەها ئەوە بایەخی زۆری بۆ کاربەدەستانی گۆشەگیری عێراق هەیە کە لە لایەن ئەمریکاییگەلێک وەک کرافتەوە بناسرێن. لەوانەیە لە ئەنجامی دیدارەکەی کرافت و دیدارەکەی پێشووی رۆلاند ئێوانسدا[٣٦٢] بووبێت کە تاریق عەزیز رایگەیاندوە زۆر پێیخۆشە سەردانی ئەمریکا بکات. من لە باشترین رێگا کەڵک وەردەگرم بۆ ئەوەی ئەو سەردانەی تاریق عەزیز تەشویق بکەم و ئاسانکاری بۆ بکەم.

لۆفری

[362] ROWLAND EVANS

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٤٥**

**١ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: پەرەسەندنی جموجۆڵە سەربازییەکانی بەعس دژی کوردەکان**

بۆ زانیاری:

باڵویزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، جەدە، کوەیت، موسکۆ، پاریس، تاران، تلابیب و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٥٩ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- رۆژنامەکانی بەغداد رۆژی ١ی گوڵان هەندێ شتی بچووکیان بڵاو کردەوە دەربارەی ئەوەی کە جێگری پارێزگاری دهۆک، سەردانی زاخۆی کردوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکدا دیدار بکات و پێداویستیەکانیان تاوتوێ بکات. ئەمە بە دوای ئەو راپۆرتەدا بڵاو بوەوە کە رۆژی ٢٩ی نیسان هەزار سەرباز کە لە ناوەڕاستی مانگی ئادارەوە لە ناو بنکەیەکی سەربازیدا لە لایەن پێشمەرگەوە گەمارۆ درابوون، بە سەرکەوتوویی رزگار کران.

٢- بە وتەی وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی تورکیە، کۆلۆنێل ئەردوغان، ئەو هێزەی سپای عێراق کە ئەو سەربازانەی رزگار کردوە، لە ٣ تیپ پێکهاتوە و ١٠ رۆژی خایاندوە تا دزەیان کردوەتە ناو رێگا شاخاویەکانی باشووری دهۆک و کەڵکیان

له چەکی تایبەت وەرگرتوە و بە ناپالم هێرشیان کردوەتە سەر کوردەکان. بە وتەی ئەردوغان ڕێگای سەرەکی چوون بۆ تورکیە لە نزیک زاخۆ ئێستا بە تەواوی لە دەستی دەوڵەتی عێراقدایە.

٣- کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی هیند بە ناوی نایرام کە زانیاریەکانی خۆی لە ئەفسەرێکی پایەبەرزی هیندی وەردەگرێت کە مەشق بە هێزی هەوایی عێراق دەکات، پێمیوت هێزی هەوایی عێراق لە ئامادەباشی تەواو دایە و فڕۆکەکانی MIG-21S بە موشەکی هەوا بۆ هەوا لە تکریتەوە هەڵدەسن. نایرام هیچ زانیاریەکی دەربارەی ڕێژەی زەرە و زیانەکانی هێزی هەوای عێراق پێنەبوو بەڵام کونسوڵی فەرانسە پێمیوت کە هێزی هەوایی عێراق لانیکەم دوو هیلیکۆپتەر و فڕۆکەیەکی SU7 (لە شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا) لە دەستداوە.

٤- حەوت خوێندکاری کورد ٢٩ی نیسان بە تۆمەتی بۆمبدانان لە سینەما ئەتلەس و ژوورەکانی حەوانەوەی فڕۆکەخانەی (بەغداد) دەستبەسەر کراون. ٥ کەس لەو خوێندکارانە حوکمی لەسێدارەدانیان لەسەر دراوە و دوو کەسیان بێگوناح دەرچوە. دانپێدانانەکانی ئەو ٥ کەسە ڕۆژی ٣٠ی نیسان لە تەلەڤزیونی بەغداد بڵاو کرایەوە. ئەو بوومبانەی کە ئەو خوێندکارانە دایاننابوون چەند کەسێکی بریندار کردوە بەڵام نەمانبیستوە کەسی کوشتبێت. تەنانەت پێش لە دانانی ئەو بومبانە، ڕێوشوێنی ئەمنی لە سینەماکانی بەغداد گیرابوە بەر یانی کەس ناتوانێت پێش لە کۆتاییپێهاتنی فلیمەکە لە سینەما بێتە دەرەوە.

٥- تێبینی: سەرەڕای هێرشە گەورەو و بەرفراوانەکەی سپای عێراق بۆ رزگارکردنی بنکە سەربازیەکەی زاخۆ و زیاتربوونی بومبارانەکانی هێزی هەوایی عێراق، وادیارە دەوڵەتی عێراق هێشتا دان بە خۆیدا دەگرێت و بۆ ئەنجامدانی هێرشێکی گەورە بۆ سەر کوردەکان پەلەی نیە. ئەو شوێنە کە زیاترین گرنگی بۆ سپای عێراق هەیە باکووری سنووری ئێران و عێراقە. جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەدام حوسەین ڕۆژی ٢٥ی نیسان داوای کرد بە تەواوی گەمارۆی ئابووری بخرێتە سەر هەرێمی ژێر کۆنترۆلی بارزانی. تەنیا ڕێگا بۆ گەیشتن بەو ئامانجە

ئەوەیە کە ڕێگای هاتنی پێداویستیەکانی کوردەکان لە ئێرانەوە بپچڕێت. بە هۆی ئەوەی کە ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی سەختە و لەوە ناچێت کە تێدا کەڵک لە سەرباز وەربگیردرێت، دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات ڕێگای هاتوچۆی پێداویستیەکانی کوردەکان بە هێزی هەوایی بپچڕێنێت کە بەهەرحاڵ ئەوەش مەترسی کاردانەوەی ئێرانی لێدەکەوێتەوە.

٦- رادیۆ دەنگی کوردستان شەوی رابردوو( ١ی گوڵان) رایگەیاند کە پێشمەرگەکان لە وەڵامی بومبارانی گوندەکان لە لایەن عێراقەوە، هەندێ لە دامەزراوەکانی نەوتی کەرکووکیان تەقاندوەتەوە. ئەم هێرشە هاوکات لەگەڵ بۆمبدانانەکانی بەغداد لە سەرلەئێوارەی ٢٨ی نیسان نیشانەی قۆناخێکی دیکەی تەشەنەکردنی کێشەی کوردەکان و عێراقە و وادیارە کاردانەوەی هاوشێوەی دەوڵەتی عێراقی لێدەکەوێتەوە.

لۆڤری .

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٥١**

**١ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: ئیستراتژی بەعس دژی مەلا مستەفا بارزانی**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، جەدە، کوەیت، لەندەن، موسکۆ، پاریس، تاران، تلابیب و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٧٤ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- کورتە: هەرچەند کە کێشەی عێراق لەگەڵ کوردەکان تا دەچێت زیاتر تەشەنە دەکات، رژیمی عێراق درێژە بە سیاسەتی خۆی بۆ گۆشەگیرکردنی مەلا مستەفا بارزانی لە رێگای تێکەڵکردنی گوشاری سەربازی و بەڵێنی قازانجی ئابووری بە خەڵکی کورد و جێبەجێکردنی ئۆتونومیە رواڵەتیەکە لەگەڵ کوردەکانی دژبەری بارزانی دەدات. ئیستراتژی بەعس تا ئێستا لە بواری دابڕاندنی کوردەکان لە بارزانی سەرکەوتوو نەبوە و ئێستا زیاتر پشت بە کردەوەی سەربازی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ خەباتی ئاشتنەبووی کورد دەبەسترێت. بەهەرحاڵ ئەگەر رژیمی عێراق بتوانیت بۆ شەش مانگ یان زیاتر درێژە بەم سیاسەتەی خۆی بدات( کە پێویستی بە دەسەڵاتێکی بەهێز بەسەر سپا و ئاستەنگکردنی رادیۆی کوردەکان و بەرەنگاربوونەوە

لەگەڵ هێرشە تروریستیەکان - کە لەوانەیە روو بدات - دەکات) هەندێ سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت. هیوای کوردەکان بۆ بەدەسەڵاتگەیشتنی رژیمێک کە لەگەڵ ئەوان باشتر بێت، ئێستا واقعبینانە نیە. ئەم هیوایەی کوردەکان بە پێوەر و چۆنیەتی یارمەتی دەرەکی بە کوردەکان گرێدراوە. سیاسەتی تامڵکردنی ئێستای دەوڵەتی عێراق زیاتر لە لایەن لایەنگرانی هێرشی سەربازیەوە دژایەتی دەکرێت.

٢- رۆژی ٥ی نیسان سەدام حوسەین، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (Rcc) لە کۆبوونەیەکی بەرفراوانی بەرەی نیشتمانیدا قسەی کرد و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە یاسای ئوتونومی کورد بە خێرایی جێبەجێ دەکرێت. سەدام وتی ناوی ئەندامانی ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجوومەنی راپەڕاندنی هەرێم(ی کوردستان) بەمزوانە رادەگەندرێت. سەدام داوای لە کاربەدەستانی بەرەی نیشتمانی کرد کە بۆ سەرجەم کوردەکانی روون بکەنەوە کە رژیمی عێراق بارزانی لەناو دەبات و بارزانی دەبێت پێش لەوەی زۆر درنگ بکات، خۆی تەسلیم بکات. سەدام وتی دەستپێکردنەوەی وتووێژ لەگەڵ بارزانی هەر جێگای باس نیە. سەدام رایگەیاند کە گەمارووی ئابووری دەخرێتە سەر ئەو هەرێمەی کە لە دەستی بارزانیدایە.

٣- هەر هەمان رۆژ ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریدا قۆناخی لێبووردنی کوردەکان(عەفوات) بۆ ٣٠ رۆژی دیکە درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو سەرباز و کاربەدەستە کوردانە کە چوونەتە ریزی بارزانی بێ سزادان بگەڕێنە سەر کارەکانیان. دەوڵەتی عێراق هەروەها رایگەیاند کە پارە بۆ درستکردنی ساختمانی ئەنجوومەنی یاسادان و ئەنجوومەنی راپەڕاندن لە هەولێر تەرخان دەکات. هەروەها چالاکی جێگرە کوردە نوێکەی سەرۆک کۆمار و ٥ وەزیرە کوردەکە لە لایەن راگەیاندنەکانەوە باس دەکرێت و وەک هەمیشە جەخت لە سەر پلانە ئابووریەکانی دەوڵەت لە کوردستان دەکرێت و پاش ئەگەری پەیوەستبوونی KDP بە بەرەی نیشتمانی، ئامادەکاری بۆ بەستنی کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکرێت.

٤- راگەیاندنەکان باسی ئەوەیان نەکردوە بەڵام راپۆرت دراوە کە لە پێکدادانی نێوان پێشمەرگەکان و سپای عێراق، کوردە شیوعیەکان( کە رادیۆ دەنگی کوردستان

پیاندەڵێت جاش) یارمەتی سپای عێراقیان داوە. زانیاریە بەردەستەکان لە بەغداد تا ١ی گوڵان نیشان دەدات پاش ئەوەی کە سەربازخانەی زاخۆ لە مانگی ئادار بە سەختی لە لایەن سپای عێراقەوە گیراوەتەوە، سپای عێراق زیاتر کەڵک لە هێزی هەوایی بۆ هێرشکردن بۆ سەر گوندەکانی ناوچەی زۆر دژوار( کە لە سێگۆشەی خانەقین- سلێمانی- کەرکووک پێکدێت) کەڵک وەردەرێت.

٥- سەرۆک کۆمار بەکر لە راستیدا هیچی دەربارەی کێشەی کورد نەوتوە و کاربەدستێکی باڵوێزخانەی هیند بە ناوی نایرام وتی ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە سیاسەتی بەکر و سەدام حوسەین (کە ئەندازیاری سەرەکی سیاسەتی ئێستایە) لەو پەیوەندیەدا جیاوازە. باڵوێزی جەزاییر، سەعدی ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە بەکر زیاتر لە سەدام لایەنگری سیاسەتی توندی سەربازی دژی کوردەکانە. سەعدی وتی کە سیاسەتی عێراق لەو پەیوەندیەدا لە ژێر کاریگەری زۆری بەکردا دارێژراوە و تەنها هۆکاری ئەوەی کە بەکر زۆر قسەی لە سەر نەکردوە، ئەوەیە کە بارودۆخی جەستەیی بەکر خراپە.

باڵوێزی جەزاییر وتی لەسێدارەدانی ١١ کورد لە ١٤ی نیسان لە هەولێر کە بوە هۆی ئەوەی کە کوردەکانیش ١٩ کەس لە ئەندامانی سپای عێراق لە ٢١ی نیسان لەسێدارە بدەن، نمونەی جیاوازی تێڕوانی مەدەنی و سەربازی بۆ کێشەکەیە. سەدام هەوڵیدابوو پێش لە سێدارەدانی کوردەکان بگرێت بەڵام کاربەدەستانی عێراق لە هەولێر تازە لەسێدارەی دابوون. بە وتەی کونسولی میسر کوردەکان هەوڵیان داوە لە شوێنە گشتیەکانی بەغداد و هەولێر بومب دابنێن بەڵام گیراون. کونسولی میسر هەروەها وتی ئەو ١٩ سەربازە عەرەبە کە کوردەکان لەسێدارەیان داون لەگەڵ ٩٢ ئەفسەری دیکەی سپای عێراق مانگی ئادار لە کاتێکدا کە لە رێگای رۆیشتنەوە بۆ ماڵ بوونە، لە ناو پاسێکدا بە دەستی کوردەکان گیرابوون. لەسێدارەدانی ئەو ١٩ کەسە بەتایبەت بوەتە هۆی تورەیی سپای عێراق و یەکێ لە هۆکارەکانی دەستپێکردنی بۆمبارانی بەرفراوانی گوندە کوردنشینەکان پاش ٢٢ی نیسان هەر ئەوەیە.

٦- هەڵسەنگاندن: ئەو ڕووداوانە کە لە بڕگەی ٥دا باس کران، ئەگەر ڕاست بن، نموونەیەکی باشی تەشەنەکردنی کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراقە کە دەتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی بەمزوانە هێرشێکی بەرفراوان دەستپێبکات سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەتی عێراق تەنها بە ڕێگاچارەی سەربازی پشتی نەبەستوە. ئەگەر سەدام حوسەین بتوانیت دەسەڵاتی سپا لە دەستی خۆیدا رابگرێت، بە دڵنیایەوە ئەوە بە باشتر دەزانێت کە سیاسەتی گەمارۆی ئابووری، گووشاری سەربازی و بەڵینی خۆشبژێوی مادی بە کوردەکانی دژبەری بارزانی بۆ چەند مانگێکی دیکە درێژە پێبدات بۆ ئەوەی سیاسەتەکەی بەرهەمی هەبێت. بە لەبەرچاوگرتنی هێرشی ئەمدوایانەی کوردەکان بۆ سەر دامەزراوە نەوتەکانی کەرکووک و بۆمبدانان لە بەغداد لەوانەیە سەدام ناچار بێت بەدوای ڕێگاچارەی سەربازیدا بێت. تەنها خاڵی ڕوون کە لەم وێنە ناڕوونەدا بەدی دەکرێت ئەو ڕاستیەیە کە سەدام حوسەین لە لێدوانەکەیدا لە ٢٥ی نیسان ئەو تۆمەتەی دووپات نەکردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتی بارزانی دەدات.

لۆڤری

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٩٦٩**

**٧ی گوڵانی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: کێشەی کورد پەرەدەسێنێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئەمان، ئانکارا، بەیروت، قاهیرە، جەدە، کوەیت، لەندەن، موسکۆ، پاریس، تاران، تلابیب و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له دیمەشق.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٨٠ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد ١- وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی هیند، کۆلۆنیل سوری[٣٦٣] ڕۆژی ٦ی گوڵان پێمیوت هێزی هەوایی عێراق ئێستا ئامادەیە فڕۆکەی نوێی Tu22s ( کە دەتوانێت بومبی ٥٠٠ پوندی بخاتە خوارەوە) بۆ بۆمبارانکردنی گوندە کوردەکان بەکاربهێنێت. ئێستا سپای عێراق له فڕۆکەی Mig-21sی سۆڤیەت بۆ لەناوبردنی ڕێگابەندانەکان و پاراستنی هێزە زەمینیەکان له بۆسەکاندا کەڵک وەردەگرێت. "سوری" وتی روسیە پێیخۆش نیە دەوڵەتی عێراق ئەم چەکە نوێ و پێشکەوتوانە دژی کوردەکان بەکار بهێنێت بەڵام سۆڤیەت دەسەڵاتی ئەوەی نیە پێش له بەکاهێنانی ئەو چەکانە بگرێت.

---

363 COLONEL SURI

٢- ئەم زانیاریانەی "سوری" و راپۆرتەکانی دیکە کە باس لەوە دەکەن کە شەڕ بەرفراوانتر دەبێت و سپای عێراق هەوڵ دەدات ئەو شوێنانە بگرێتەوە کە پێشتر لە دەسیداوە، نیشان دەدات کە رژێمی عێراق دەستی لە ستراتژی پارێزی سەربازی و گوشەگیرکردنی سەربازی و ئابووری بارزانی هەڵگرتوە و ئێستا دەیەوێت تەنها لەرێگای هێرشی خێرای سەربازیەوە کۆتایی بە کێشەی کوردەکان بێنێت. وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی پاکستان پێمیوت رژێمی عێراق تا ٣٠ی حوزەیران موڵەتی بە سپای عێراق داوە کۆتایی بە خەباتی بارزانی بهێنێت.

٣- زۆربەی پسپۆڕان پێیانوایە کە دەوڵەتی عێراق ناتوانێت کێشەکە بە رێگای سەربازی چارەسەر بکات و بە پێچەوانەوە بۆمبارانی بێ دەستپارێزانەی عێراق دەبێتە هۆی ئەوەی یەکێتی و ئیرادەی کوردەکان بۆ خەبات پتەوتر بێت. ئەو پسپۆڕانە هەروەها گومانیان لەوەدا هەیە کە سپای عێراق بتوانێت ناوچە شاخاویەکان کۆنترۆڵ بکات.

٤- ئەو هۆکارانە کە پاڵی بە رژێمی عێراقەوە ناوە کێشەی کوردەکان بە رێگای سەربازی چارەسەر بکات بریتین لە:

الف - "رادیۆی دەنگی کوردستان" بەتایبەت تەنگی بە دەوڵەتی عێراق هەڵچنیوە چونکە میدیاکانی بەغداد هێشتا دانیان بەوەدا نەناوە کە شەڕ دەستی پێکردوە. دەوڵەتی عێراق زۆر هەوڵیداوە لەرێگای پارازیتەوە پێش لە بڵاوبونەوەی دەنگی رادیۆ کوردستان بگرێت بەڵام سەرکەوتوو نەبوە.

ب - ئەوە فەرماندە پایەبەرزەکانی سوپای عێراقن کە خوازیاری هێرش بۆ سەر کوردەکانن چونکە لە ئەنجامی ئەو هێرشەدا سەرچاوە و دەسەڵاتی مادی و ئازادی یەکجار زۆریان دەسدەکەوێت.

ج - سەرجەم کاربەدەستانی پایەبەرزی سپا و دەوڵەتی عێراق لە سەر ئەو باوەڕە ناڕاستەن کە هێزەکانی عێراق بەو چەکوچۆڵە پێشکەوتوە کە ئێستا هەیانە، دەتوانن بگەن بەو دەستکەوتانە کە سپای عێراق لە ٦٠کاندا نەیتوانی پێی بگات. ئەڵبەتە ئەو دەسەڵاتە بەرفراوانە کە دراوە بە سپای عێراق بۆ ئەوەی ئەو هێرشە گەورانە ئەنجام

بدات، مەترسی جدی بۆ رژێمی عێراق تێدایە چونکە بەعس لەوە دڵنیا نیە کە کاربەدەستانی سپا دژی خۆی کودتا نەکەن کەوابوو هەر بە هۆی ئەو مەسەلەیەیە کە (بەو شێوەیە کە سەرچاوە پاکستانیەکە ئاماژەی پێکرد ) هەتا ٣٠ی حوزەیران مۆڵەت بە سپا دراوە کۆتایی بە کێشەی کورد بهێنێت.

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٦٢**

**٧ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: وەڵامنەدانەوەی وڵاتانی عەرەبی بە داواکاری عێراق بۆ پشتیوانیکردن لە سیاسەتی بەعس سەبارەت بە کوردەکان**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، قاهیرە، ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، جەدە، کوەیت، لەندەن، خارتوم،رەبات، تریپولی، تونس، تلابیب، مۆسکۆ، پاریس، سەنعا و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە جەزاییر و دیمەشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٥٢ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و تیلیگرامی ٢٦٠٩ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قاهیرە

١- کاربەدەستی باڵوێزخانەی میسر، بەرەکە[٣٦٤] ٦ی گوڵان پێمیوت تا ئەو شوێنە کە ئەو ئاگادارە هیچکام لە باڵوێزی وڵاتانی عەرەبی وەڵامی داواکاریەکەی ٢٠ی نیسانی دەوڵەتی عێراقیان بۆ پشتیوانیکردن لە خەبات دژی بارزانی نەداوەتەوە. بەهەرحاڵ سوریە رێگای بە لیوایەکی سپای عێراق داوە بچنە ناو خاکی سوریە بۆ ئەوەی لە نزیک سنجار لە پشتەوە هێرش بکەنە سەر هێزی پێشمەرگە و گەمارۆیان بدەن.

---

364 - BARAKA

بەرەکە وتی بە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتی عێراق ئەو داواکاریەی پێشکەش بە کۆمکاری عەرەب نەکردوە، وڵاتانی عەرەبی هەرکامیان بە جیا وەڵامی داواکاریەی عێراق دەدەنەوە ( ئەگەر بیانەوێت وەڵام بدەنەوە).

٢- بەرەکە وتی وەڵامی دەوڵەتی میسری لە پەیوەندی لەگەڵ داواکاریەی عێراق لە قاهیرەوە بەدەست گەیشتوە، بەڵام وەڵامەکە ئەوەندە لاوازە کە نەیگەیاندوەتە دەستی کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق. بەرەکە هەروەها وتی لە بنەڕەتدا، دەوڵەتی میسر نایەوێت خۆی بخاتە ناو کێشەی کوردەکان و ئەگەر بارزانی یان نوێنەرەکانی سەردانی قاهیرە بکەن بە شێوەی نافەرمی وەردەگیردرێن. ئەم مەسەلەیە ناوەرۆکی تیلیگرامەکەی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە قاهیرە پشتڕاست دەکاتەوە کە پەیوەندیەکانی دەوڵەتی میسر و عێراق هێشتا ئاڵۆزە.

٣- باڵوێزی تورکیە، جوهروک[٣٦٥] پێمیوت دەوڵەتی عێراق بەهۆی بەهەڵە بومبارانکردنی سلۆپی[٣٦٦] ( کە لە تیلیگرامی ٣٢٧٩ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا ئاماژی پێکراوە) خێرا داوای لێبۆردنی لە تورکیە کردوە و وتویەتی ئامادەیە زەرەر و زیانەکانی بنەماڵەی قوربانیانی ئەو هێرشە قەرەبوو بکاتەوە هەرچەند کە دەوڵەتی تورکیە تا ئێستا داوای قەرەبووکردنەوەی نەکردوە. سەبارەت بەو دەنگۆیە کە تورکیە داواکاری عێراقی قبووڵ کردوە بۆ ئەوەی کەڵک لە ئاسمانی تورکیە لە سەر سنووری عێراق وەربگرێت، جوهروک وتی ئەو مەسەلەیە بە تەواوی درۆیە و دەوڵەتی عێراق داوای شتێکی وای لە تورکیە نەکردوە.

---

365 -CUHRUK

366 -SILOPI

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٦٧**

**٨ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: کاریگەری کێشەی کورد لەسەر دەرچوونی باڵوێزی چین لە عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، موسکۆ، پاکستان، تاران، هۆنکۆنگ، پەکین

باڵوێزی چین لە عێراق، هوو چینگ – فانگ[٣٦٧] کە تەنها ١٤ مانگ لێرە بوو، رۆژی ١٢ی گوڵان بەغدادی بەجێ هێشت. هوو چینگ – فانگ وتویەتی کە لە پۆستی بەرزتردا دادەنرێت بەڵام بەگوێرەی زانیاریەکان دەرچوونی ناوبراو پەیوەندی بە رووداوەکانی چین یا عێراقەوە هەیە.

زانیاریەکان نیشان دەدات کە دەرچوونی هوو چینگ – فانگ لە عێراق پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە. بە وتەی سیرلێز، باڵوێزی فەرەنسا لە عێراق، نزیکەی ١٥٠ کەس لە ئەندامانی باڵی "چین"ی ICP (حیزبی شیوعی عێراق) لەگەڵ کوردەکانی بارزانی دژی دەوڵەتی عێراق شەڕ دەکەن. هەروەها باڵوێزی پاکستان لە عێراق راپۆرتێکی متمانەپێکراوی لایە کە ١٦ی نیسان ٥٠ کەس لە ئەندامانی باڵی "چین"ی ICP لە بەغداد دەستبەسەر کراون. ئەگەر ئەم رووداوانە پێکەوە تێکەڵ بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ICP (کە لەلایەن سۆڤیەتەوە رێنوێنی دەکرێت) دوابەدوای پەیوەستبوونی فەرمی خۆی بە "بەرەی نیشتمانی" دەسەڵاتداری عێراق لە تەمووزی

---

[367] HU CHENG-FANG

١٩٧٣ دەستی بەوە کردوە کە قەناعەت بە رژیمی بەعس بهێنێت دژی باڵی رکابەری شیوعی بکەوێتە گەڕ. سەرەنجام رژیمی بەعس وای کرد و کاتێک کە شەڕ دژی کوردەکان گەرموگوڕ بوو و باڵی "چین"ی ICP پشتیوانی لە بارزانی کرد، دژیان کەوتە گەڕ.

سپاستان دەکەین ئەگەر وەزارەتی دەرەوە بوچۆنی خۆیمان دەربارەی ئەوە پێڕابگەیەنێت کە ئایا دەرچوونی باڵوێزی چین لە عێراق پەیوەندی بە روداوەکانی چینەوە هەیە یا نا.

دوابەدوای دەرچوونی باڵوێزی چین لە عێراق، باڵوێزی تورکیە، جوهروک، پێمیوت کە هێزەکانی عێراق کاتێک کە زاخۆیان لە دەدستی کوردەکان سەندوەتەوە، دەستیان بە سەر هەندێ چەکوچۆڵی چینیدا گرتوە.

لۆڤری

**ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)**

**١٧ی گوڵانی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: پشتیوانی سۆڤیەت لە رژێمی بەعس و گوشارەکانی سۆڤیەت لە سەر بارزانی**

١- هاوکات لەگەڵ توندتربوونی شەڕ لە کوردستانی عێراق، گرنگە ئاماژە بە دەستێوەردانی روو لە زیادبوونی یەکێتی سۆڤیەت لە پێشهاتەکانی عێراقدا بکەین. تا ئەم چەند ساڵەی دواییە سۆڤیەت وای بە باشتر دەزانی لە نێوان بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و کاربەدەستانی عێراقدا جموجۆڵ بکات و لەگەڵ هەر دوو لادا پەیوەندی هەبێت. بەهەرحاڵ وادیارە یەکێتی سۆڤیەت ئەم دوایانە بڕیاریداوە بە تەواوی پشتی رژێمی بەعسی بەغداد بگرێت. یەکێتی سۆڤیەت، رژێمی عێراق بە یەکێ لە ئامرازە سەرەکیەکانی خۆی بۆ پەرەپیدانی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ناوچەی کەنداوی فارس دەزانێت.

٢- بەرژەوەندی تایبەتی یەکێتی سۆڤیەت لە پشتگیریکردنی رژێمی ئێستای عێراق لەوەدایە کە:

الف - سۆڤیەت بەردەوام پشتیوانی لە رژێمی بەعس دەکات، بەتایبەت پاش واژۆکرانی پەیماننامەی دوستی و هاوکاری لە نێوان عێراق و سۆڤیەت لە نیسانی ١٩٧٢ ئەو پشتیوانیە زیاتر بوە. کەوابوو سۆڤیەت پێداگری لە سەر شیوعیەکانی عێراق کردوە لەگەڵ رژێمی ئێستای عێراق هاوکاری بکەن و هەوڵ دەدات

پەیوەندیەکانی بەغداد و دیمەشق باشتر بکات و کاریگەری ئێران لە عێراق پوچەڵ بکاتەوە و پشتیوانی لە بەنیشتمانیبوونی کۆمپانیای نەوتی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٧٢ کردوە.

ب- سۆڤیەت یارمەتی سەربازی بە عێراق دەدات لەوانە سەدان تانک، چەند دانە فڕۆکەی جەنگی و موشەکی SSی داوە بە عێراق. عێراق و سۆڤیەت لە کاتی سەردانەکەی مارشال گریشکۆ بۆ بەغداد لە کۆتایی مانگی ئادار دەربارەی زیادبوونی ئەو یارمەتیانە باس و گفتوگۆیان کردوە.

ج- سۆڤیەت لە پێناو پشتیوانیکردن لە رژیمی بەغداد، گوشارەکانی لە سەر بارزانی زیاد کردوە بۆ ئەوەی بچێتە ناو "بەرەی نیشتمانی" (کە لە بەعس و حیزبی شیوعی پێکهاتوە) و رێگا بدات هێزەکانی سپای عێراق لە سەر سنووری ئێران و ناوچە کوردنشینەکان جێگیر بن و کارئاسانی بۆ چالاکی شیوعیەکان لە کوردستان بکات. شایانی ئامازەپێکردنە کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ رژیمی عێراق هەوڵیدا کوردەکان رازی بکات پێش لە چوونی سەربازانی عێراقی بۆ سوریە نەگرن. ئەو مەسەلەیە لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ لە نێوان نوێنەرانی بارزانی و نوێنەرانی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە بەغداد و هەروەها لەگەڵ بۆریس پۆنۆماریۆڤ، بەرپرسی بەشی پەیوەندیەکانی دەرەوەی کومیتەی ناوەندی حیزبی شیوعی سۆڤیەت لە کاتی سەردانەکەی بۆ بەغداد و کوردستان لە تشرینی دووەمی ١٩٧٣ باس و تاوتوێ کرا.

د- سۆڤیەت چالاکانە بەشداری لە شەڕی دەوڵەتی عێراق لەگەڵ کوردەکان دەکات. راوێژکارانی سۆڤیەت یارمەتی بە چالاکی هێزی هەوایی عێراق دەدەن و یارمەتی بە هێزەکانی عێراق دەدەن دامەزراوە لوجستیکەکانیان لە ناوچە کوردنشینەکان جێگیر بکەن و هەوڵ دەدەن پارازیت لە سەر ئیزگەی رادیۆی کوردەکان دابنێن.

٣- گرینگترین کێشەگەلێک کە کوردەکان لەگەڵی روبەڕوون، کەمبوونی تەقەمەنی، بەتایبەت گولەی تۆپ و نەبوونی پێداویستیەکانیAA وAT -ە. ئەگەر شەڕ بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بێت، زەحمەتە کوردەکان بتوانن لە بەرامبەر سپای عێراق (کە سۆڤیەت پشتگیری لێدەکات) رابوەستن. دەوڵەتی عێراق زیاتر لە ٤ فەوج

سەرباز و ٤٠٠ دانە تانکی لەو ناوچەیە جێگیر کردوە و دەیەوێت بەرگری لە بنکە کۆنەکانی خۆی لە دڵی کوردستان بکات. بەهەرحاڵ دەرفەتێکی باش بۆ کوردەکان رەخساوە جێپێی خۆیان لە شاخەکانەوە بەرەو شوێنەکانی دیکە بەرفراوانتر بکەن بەمەرجێک کە وەکوو پێویست تۆپ و تەقەمەنیAA وAT یان هەبێت.

٤- بەهەرحاڵ ئەگەر سپای عێراق بە سەر هێزە کوردەکاندا سەربکەوێت و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد وەک هێزێکی سیاسی لاواز بێت، هەم پێگەی رژیمی بەعسی عێراق و هەم پێگەی یەکێتی سۆڤیەت (وەک پشتیوانی عێراق) قایمتر دەبێت و لە ئەنجامدا ئازادی جموجۆڵی بەغداد و مۆسکۆ لە ناوچە زیاتر دەبێت و رژیمی عێراق بە پشتیوانی سۆڤیەت دەتوانێت چالاکیە خراپکارانەکانی خۆی دژی ئێران، کویت و وڵاتانی دیکەی ناوچە دەستپێبکاتەوە و پەرەیپێبدات.

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی٩٩٧**

**٣٠ی گوڵانی ١٩٧٤**

**بابەت: پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق و دەوری کێشەی کورد لەو مەسەلەیەدا**

خاتون بەکر[٣٦٨]، کە سەرچاوەی سەرەکی پەیوەندیەکانی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و وەزارەتی دەرەوەی عێراقە، بانگهێشتی کردم لە رۆژی ٢٦ی مانگەوە سێ رۆژی یەک لە دوای یەک بۆ باس و گفتوگۆ دەربارەی ئەم تەوەرانە سەردانی بکەم:

الف - سەردانەکەی ژنی سەدام حوسەین (جێگری سەرۆک کۆمار و سەرۆکی حیزبی بەعس) بۆ ئەمریکا بۆ تەداوی پزشکی ب - کێشەی عەرەب - ئیسرائیل و ج - پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق، بەتایبەت دەوری کێشەی کورد لەو پەیوەندیەدا.

٣- دەربارەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق، خاتوون بەکر بۆچوونەکانی خۆی زیاتر لە رووی کاغەزێکەوە کە لە پێشەوە ئامادە کرابوو، خوێندەوە بۆم. خاتوون بەکر وتی دەوڵەتی عێراق زۆر خۆشحاڵ بوە کە بیستویەتی کاربەدەستانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئامادە نەبوونە لەگەڵ نوێنەرانی کورد دابنیشن. وتی وەزارەتی دەرەوەی عێراق بیستویەتی کە کوردەکان پاش ئەوە چونەتە کۆنگرێس

---

[368] BAKIR

بەڵام لە روانگەی دەوڵەتی عێراقەوە، تەنها هەڵسووکەوتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکایە کە تەعبیر لە هەڵوێستی دەوڵەتی ئەمریکا دەکات[٣٦٩]. خاتوون بەکر وتی تەنیا مەسەلەیەک کە بوەتە بەربەست بۆ ئەوەی عێراق پەیوەندیە دیپلۆماتیکەکانی لەگەڵ ئەمریکا دەستپێبکاتەوە، ئەوەیە کە عێراق بە چاوی گومان سەیری هەڵوێستی ئەمریکا بەنیسبەت کوردەکان و کێشەی عەرەب- ئیسرائیل دەکات.

خاتوون بەکر دەربارەی کێشەی کورد وتی دەوڵەتی عێراق هەست دەکات ئەمریکا دەتوانێت گوشار بخاتە سەر ئێران بۆ ئەوەی ئیدی یارمەتی کوردەکان نەدات و وتی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتی عێراق دەبێ لە کردەوەکەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا مەمنون بێت. خاتوون بەکر هیچ ئاماژەیەکی بە ئەگەری سەردانەکەی کوردەکان بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان لە داهاتودا نەکرد بەڵام دەربارەی کێشەی عەرەب - ئیسرائیل وتی ئەمریکا باش دەزانێت هەڵوێستی عێراق چیە بەڵام وتی "لە دیپلۆماسیدا هەموو شتێک مومکینە" و لەو پەیوەندیەدا ئاماژەی بەوە کرد کە ئەمدوایانە عێراق پەیوەندیەکانی لەگەڵ بریتانیا و ئاڵمانیای رۆژئاوا دەستپێکردوەتەوە. من پرسیارم کرد ئایا رێکەوتنە سەرکەوتوەکەی ئیسرائیل و

---

[٣٦٩] ئاماژە بەوەیە کە محمد محمود عەبدولرحمان، موحسین دزەیی و شەفیق قەزاز لە کاتی سەردانەکەیان بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان داوایان کردبوو لەگەڵ کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دیدار بکەن بەڵام وەزارەتی دەرەوە ئەو داواکاریەی رەت کردبووەوە. لە وەڵامی" لی هامیلتۆن"، سەرۆکی کومیسیۆنی رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا کە پرسیاری کردبوو بۆ وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ نوێنەرە کوردەکان دانەنیشتوە، لینۆد هاڵتۆن، یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ پەیوەندییەکانی کۆنگرێس وتبووی هەڵوێستی وەزارەتی دەرەوە ئەوەیە کە کێشەی کورد پێش هەموو شتێک کێشەی ناوخۆیی عێراقە و وەزارەتی دەرەوە نایەوێت کوردەکان بەو باوەڕە بگەن کە ئەمریکا ئامادەیە بە ئاشکرا یان نهێنی پشتیوانی لە شۆڕشەکەیان لە عێراق بکات، هەر بۆیە نایەوێت لەگەڵ ئەو نوێنەرە کوردانە دیدار بکات. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە ئەمریکا یارمەتی شۆڕشی کوردی دەدا بەڵام وەزارەتی دەرەوە ئەو مەسەلەیەی لە کۆنگرێس دەشاردەوە. لە وەزارەتی دەرەوەش، جگە لە خودی هێنری کیسینجێر و یەک دوو کەسی دیکە هیچ کەس ئاگاداری ئەو پەیوەندییە نەبوو. وەرگێڕ

سوریه که ئەمریکا بەرنامەداڕێژەری بووه دەبێته هۆی ئەوەی هەڵوێستی دەوڵەتی عێراق ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت، خاتوون بەکر وتی وەزارەتی دەرەوەی عێراق رێگەی پێنەداوه لەو پەیوەندیەدا هیچ بڵێت و نایەوێت روانگەی شەخسی خۆی دەربارەی ئەو مەسەلەیه دەرببڕێت که کاردانەوەی دەوڵەتی عێراق به نیسبەت رێکەوتنەکەی ئیسرائیل و سوریه چی دەبێت.

٤- دەربارەی کێشەی کورد، من دووپاتم کردەوه که هەڵوێستی ئەمریکا ئەوەیه که ئەوه کێشەی ناوخۆیی عێراقه و ئەمریکا هیوادارە که عێراق بتوانێت به شێوەی ئاشتیخوازانه چارەسەری بکات بەڵام وەڵامی ئەو بۆچوونەی "خاتوون بەکر"م نەدایەوه که ئەمریکا دەتوانێت قەناعەت به ئێران بهێنێت ئیدی یارمەتی کوردەکان نەدات.

٥- دەربارەی کێشەی عەرەب - ئیسرائیل وتم دۆکتۆر کیسینجێر(وەزیری دەرەوەی ئەمریکا) ئەوپەڕی هەوڵی دیپلۆماتیکی خۆی داوه بۆ ئەوەی ئەو کێشەیه چارەسەر بێت و وتم دەبێ عەرەبەکان ئەو هەوڵانه وەک بەپیزترین پێشهاتی مێژووی کێشەی عەرەب - ئیسرائیل چاو لێبکەن و ببێت به هەنگاوێک بۆ پەیوەندی بەپیزی سەراسەری جیهانی عەرەب لەگەڵ ئەمریکا. دەربارەی دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ عێراق وتم هەڵوێستمان ئەوه بوه و ئێستاش هەر ئەوەیه که هەموو کاتێک ئامادەین بۆ دەستپێکردنەوەی ئەو پەیوەندیه گفتوگۆ بکەین. خاتوون بەکر جارێکی دیکه وتی ناتوانێت لەم پەیوەندیەدا هیچ بڵێت.

٦-هەڵسەنگاندن: کارمەندە عێراقیەکانی نوسینگەکەمان پێیانوتم دەنگۆی زۆر بڵاو بوەتەوه که کاربەدەستانی پایەبەرزی عێراق و ئەمریکا له دەرەوەی عێراق گفتوگۆیان کردوه و له ئەنجامدا باڵوێزخانەی ئەمریکا له بەغداد دەکرێتەوه. له و رۆژەوه که من لێره دەسم به کار کردوه تا ئێستا ئەو جۆره دەنگۆوانه هەیه بەڵام ئەو

هەڵسووکەوتە نزیکەی خاتون بەکر دەتوانێت لانیکەم ببێت بە دەستپێکی نیشانەیەک کە دەوڵەتی عێراق دەیەوێت پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکا دەستپێبکاتەوە[٣٧٠].

٧- سپاستان دەکەم ئەگەر ڕێنوێنیمان بکەن چۆن لە داهاتوودا وەڵامی ئەو جۆرە نزیکبونانەی دەوڵەتی عێراق بدەینەوە یا بۆمانی روون بکەنەوە کە ئەو پەیوەندیە چۆن دەستپێبکەینەوە. بەتایبەت من دەبێ هەڵوێستی ئەمریکا دەربارەی دەستبەسەرداگرتنی ماڵ و ملکی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە لایەن دەوڵەتی عێراق و هەر مەسەلەیەکی گرنگی دیکەی نێوان ئەمریکا و عێراق بزانم.

گەچ[٣٧١]

---

[٣٧٠] - نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە پەیامێکی دیکەدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٧٤ ئاماژەی بەوە کردوە کە دەوڵەتی عێراق دەیەوێت هێدی هێدی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکا ئاسایی بکاتەوە بەڵام کێشەی عەرەب ئیسرائیل و رازیبوونی ئەمریکا بە یارمەتیدانی کوردەکان لەلایەن ئێرانەوە بووە بە کەندوکۆسپ لە سەر ڕێگای ئاساییبوونەوەی پەیوەندییەکانی عێراق و ئەمریکا. لە درێژەی پەیامەکەدا هاتوە کە کاربەدەستێکی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لەگەڵ خاتوون بەکر دیداری کردوە و بەکر وتویەتی عێراق هێشتا پێیوایە کە ئەمریکا ئەگەر بیەوێت دەتوانێت پێش لە یارمەتیدانی ئێران بە کوردەکان بگرێت. کاربەدەستە ئەمریکایەکەش لە وەڵامدا وتوویەتی دەستڕۆیشتوویی ئەمریکا بەسەر شا سنووردارە و شا لەو بوارەدا سەربەخۆیە. بەکر لە کۆتاییدا وتویەتی دەوڵەتی عێراق مەمنوونی ئەمریکایە کە لەگەڵ نوێنەرانی شۆڕشی کورد لە ئەمریکا هەڵسوکەوت ناکات. وەرگێڕ

[371] GATCH

**لە کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٧٩**

**٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: شەڕی کورد لە عێراق و یارمەتیەکانی ئێران**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، عەدەن، بەیروت، تاران، کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خوڕەمشەهر و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی A10ی ٢٧ی نیسانی ١٩٧٤ی کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەورێز

کورتە: هەتا ئەو شوێنە کە زانیاری و نیشانە پلە یەکەکانی ئێران دەریدەخات، سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بۆ ملکەچکردنی کوردەکانی مەلا مستەفا بارزانی لەرێگای گەمارۆی ئابووری و هێرشە هەوایەکان وادیارە بە تەواوی شکستی هیناوە. خەڵکی مەدەنی کورد ئاوارەی ئێران بوونە و چەک و تەقەمەنی لە ئێرانەوە دەچێت بۆ کوردستانی عێراق. ئەو شتانە کە باس کرا، ئەنجامە سەرەکیەکانی سەفەری جێگری کونسول لە ٤-٦ی حوزەیران بۆ سنووری ئێران و عێراقە.

زانیاریەکانی ژینیراڵ ئوتمیشی: ژینیراڵ ئوتمیشی، قایمەقامی سەردەشت زانیاری وردی زیاتری دەربارەی شەڕ و پشتیوانی ئێران لە کوردەکان لابوو. ئوتمیشی وتی بارزانی شێلگیرە تا گەیشتن بە ئوتونومی و بەدەستگرتنی کۆنترۆلی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکووک درێژە بە شەڕ بدات. هەروەها وتی بارزانی ئەو یەکێتی و هێز و

توانایه هەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژ، درێژە بە خەباتەکەی بدات بەڵام لە بەرامبەردا دەوڵەتی عێراق ئەو یەکێتی و پێگەی بارزانیە نیە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەوە دەتوانێت لە درێژخایەندا ببێتە هۆی روخانی دەوڵەتی بەغداد.

ژینیراڵ ئوتمیشی دەیگوت بڕیاری عێراق بۆ بومبارانکردنی هەرێمی کوردنشین هەڵە بوە چونکە لە ئەنجامدا قوتابخانەکان، نەخۆشخانەکان و خانووی خەڵکی ئاسایی رووخاوە و زەوی و مەزرای خەڵک بە ناپالم بۆمباران کراوە. زۆربەی بنەماڵەکان خزم یا دوستاکانیان کوژراون و لە ئەنجامدا کوردە خوێندەوار و شارنشینەکان چونەتە ریزی بارزانی کە ئێستا خاوەن پرستیژ و هەیبەتێکی یەکجار زۆر لە سەراسەری کوردستانە. ژمارەیەکی رۆژ بە رۆژ زیاتری خەڵکی ئاسایی بۆ رزگارکردنی گیانیان ئاوارەی ئێران دەبن.

بە وتەی ژینیراڵ ئوتمیشی، شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لەم هەفتانەی دواییدا کەم بوەتەوە. هەموو شارەکان لە دەستی هێزەکانی عێراقدایە بەڵام شارۆچکەکانیان لە دەستدا نیە. هێزەکانی بارزانی هێشتا بەرزایی شاخەکان و رێگاکانی یەک یان دوو کیلۆمەتری دەرەوەی شارگەلێک وەک سلێمانیان لە کۆنترۆڵدایە. بە وتەی ژینیراڵ ئوتمیشی، قایممەقامی سەردەشت، هێزەکانی عێراق شەوانە لە دەرەوەی هێڵی خۆیان پاسەوانی ناکەن. جادەکان بۆ هاتوچۆی ئوتوموبیلەکان کراوەیە بەڵام بە تەواوی ئەمن نیە. تا ئێستا زۆربەی کوژراو و بریندارەکانی کوردەکان بە هۆی هێرشە هەواییەکان بوە. قایممەقام ئوتمیشی بە ئاشکرا وتی کوردەکان لە ماوی سێ حەوتووی رابردوودا چەکی نوێی دژە فڕۆکەیان بەدەستگەیشتوە بەڵام دەیگوت باش نازانێت ئەو چەکانە چی جۆر و چەندە بوە بەڵام بە روونی وتی ئێران ئەو چەکانەی داوە بە کوردەکان.

کونسولخانە راپۆرتێکی لە کارمەندێکی کومپانیایەکی ئەمریکایی بە دەست گەیشتوە کە تێیدا هاتوە سێ هەفتە لەمەو پێش لە نزیکی خانێ (پیرانشار) ژمارەیەک چەکی دژە فڕۆکەی لە ناو زنجیرەیەک ئوتوموبیلی بارهەڵگردا بینیوە کە بەرەو سنووری عێراق چوە. ئەم راپۆرتە قسەکانی ئوتمیشی پشتڕاست دەکاتەوە. ژینیراڵ ئوتمیشی

بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە چەکە نوێیە دژەفڕۆکەکان فڕۆکەکانی عێراقیان ناچار کردوە لە بەرزایی زیاتردا بفڕن و بۆمباران بکەن و لە ئەنجامدا رێک لە ئامانجەکانیان نادەن. ئوتمیشی دەیگوت لە کاتی دوایین سەردانەکەی کاربەدەستانی کونسولگری تا ئێستا ژمارەی بریندارەکان لە سەردەشت کەمتر بوە و نەخۆشخانەی سەردەشت ئیدی پڕ لە بریندار نیە. هەروەها ئاماژەی بەوە کرد کە ئەوانەی کە برینەکانیان گرانە لەرێگای زەمینیەوە رەوانەی نەخۆشخانەی رەزائیە و مهاباد دەکرین و وتی بۆ ئەو مەبەستە کەڵک لە هێلیکۆپتر وەرناگیردرێت بەلام چەند بریندارێک بە فڕۆکە لە رەزائیە گوازراونەتەوە بۆ تاران.

ژینیراڵ ئوتمیشی لە درێژەی قسەکانیدا دەربارەی پێداویستیە سەربازیەکانی کوردەکان وتی کوردەکان هەندێ هاوەنی قورس (هاوەنی ٨١ و ١٢٠ میلیمتری) یان هەیە و دابینکردنی گولەی ئەو هاوەنانە زەحمەت نیە. شوفێری ئەو ئەتەموبیلیە بارهەڵگرە کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد بە کاربەدستانی کونسولخانەی وت ئەو تەقەمەنیە بە ئوتوموبیلە بارهەڵگرەکانی سپای ئێران دەگوازرێتەوە بۆ سنوور و ئاماژەی بەوە کرد کە شوفێری ئەو ئوتوموبیلانە کوردن و کارمەندی سپای ئێرانن بەلام جلوبەرگی مەدەنیان لە بەرە. ئێمە ئوتوموبیلگەلێکی وەهامان بینی بەلام نازانین چیان تێدابوو. وادیارە گواستنەوەی ئەو تەقەمەنیە بۆ ئەودیوی سنوور لە ئەستۆی خودی کوردەکانە. ئەو شوفیرە هەروەها بانگەشەی ئەوەی کرد کە ٦٠-٦٥ کەس لە سیخوڕانی سپای عێراق لە ناو سنووری ئێران لە نزیکی سەردەشت دەستبەسەر کراون.

**دیتنە گشتیەکان:** دەوڵەتی عێراق گەمارۆی ئابووری هەرێمی کوردنشینی راگەیاندوە. نابێ پیمانوابێت سنووری ئێران ئارامە، سنوور جمەی دیت. میوانخانەکانی رەزایە، مهاباد و سەردەشت سەر بە پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا بە تەواوی پڕە لە کوردەکانی بارزانی. خاوەن هوتیلەکان، کاسبکارەکان و چین و توێژەکانی دیکە هەموویان دەڵێن کوردەکانی عێراق پارەی چاکیان پێیە و بە کەیفی خۆیان خەرج دەکەن و دەنگۆی ئەوە بڵاو بوەتەوە کە هەندێ لە کوردەکان حیساب بۆ پارەی ١٠٠

هەزار و ١٥٠ هەزار قرانی ئێران ناکەن. لەوانەیە لەو قسانەدا زیادەڕۆیی کرابێت بەڵام ئەمە بۆ خۆی نیشانەی ئەو بڕە پارە زیادەیە کە لە ناوچە سنوریەکان خەرج دەکرێت. ئەو کەسانە کە باش پارە خەرج دەکەن، زۆرتر گەنجە سەلتەکانن کە ئازادانە دەڵێن کوردی عێراقن بەڵام جلوبەرگی ئاسایان لە بەرە و هاتوون٣-٤ رۆژ بۆ خۆیان بگەڕێن و پاشان بگەڕێنەوە بۆ ناو شەڕ. ئوتوموبیلەکانیان بێ ژمارە و بە ژمارەی عێراقیەوە هەتا رۆژهەڵاتی رەزائیە دەبێنرین.

رێژەی هاوکاری ئێران لەگەڵ کوردەکانی عێراق لە سەردەشت بە تەواوی دیارە. ئێستا زیاتر لە ٦ هەزار گالۆنی بەنزین لە بەنزینخانەکان دانراوە و نزیکەی ٥٠ ئوتومبیلی عێراقی لە ناو شاری سەردەشتدا دەبێنرێن کە زۆربەیان لاندیوەر و جیپی ئەمریکایی و روسین. شوفێری ئوتوموبێلێکی بارهەڵگری بچووک کە لە جادەی کورتی نێوان سەردەشت و سنووری عێراقدا کاردەکات دەیگوت ئێران ئەمدوایانە ٢٥ دانە جیپی روسی داوە بە کوردەکان بەڵام نابێ هەروا باوەڕ بەو قسەیە بکەین چونکە ئێستا دەنگو زۆر و زوو بڵاو دەبێتەوە.

لە کاتی دوایین سەردانی کاربەدەستانی کونسولخانەی بۆ ناوچە لە مانگی رابردوو تا ئێستا ئوردوگایەکی چەند هەزار کەسی بۆ ئاوارەکان لە سەردەشت درست کراوە. ژینیراڵ ئوتمیشی دەیگوت دوو ئوردوگای گەورەتری دیکە کە هەر کامیان جیگەی ٧-٨ هەزار کەسی تێدا دەبێتەوە، لە نزیک خانێ و رەزائیە درست کراوە. دەوڵەتی ئێران خواردەمەنی زۆر و جلوبەرگ دەدات بەم ئاوارانە. ئوردوگای سەردەشت (کە ئەو کاربەدەستە کە ئەم راپۆرتەی ئامادە کردوە، سەردانی کردوە) زیاتر لە ١٠٠ دانە خێوەتی بنەماڵەیی تێدایە کە بەشێوەیەکی سەربازی ریکوپێک دانراون و پاک و خاوینە. خێوەتی رێکخراوی "شیروخورشیدی ئێران" (مانگی سوری ئێران) لە پاڵ ئوردوگاکەدایە و خزمەتگوزاری تەندرستی پێشکەش بە ئاوارەکان دەکات. دوو سەرچاوەی زۆر باش لە تەورێز ئەوەیان پشتڕاسَت کردوەتەوە کە دۆکتۆرەکانی رێکخراوی "شیروخورشید" موچەیەکی زیادە بۆ یەک یا دوو مانگ کارکردن لە نەخۆشخانەکانی سەر سنوور وەردەگرن. بەگوێرەی دەنگۆی خەڵکی ناو کۆلان و بازاڕ

ژمارەی ئاوارەکان لە ئێران گەیشتوەتە ١٨ هەزار کەس و ئەو ئامارە لە هەڵسەنگاندنەکەی ژینیراڵ ئوتمیشی نزیکە.

ژینیرال ئوتمیشی لە ئەنجامی قسەکانیدا وتی بارزانی شێلگیرە تا گەیشتن بە ئوتونومی و بەدەستگرتنی کۆنترۆلی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکووک درێژە بە شەڕ بدات. هەروەها وتی بارزانی ئەو یەکێتی و هێز و توانایە هەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژ، درێژە بە خەباتەکەی بدات بەڵام لە بەرامبەردا دەوڵەتی عێراق ئەو یەکێتی و پێگەی بارزانی نیە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەوە دەتوانێت لە درێژخایەندا ببێتە هۆی روخانی دەوڵەتی بەغداد.

ئەنجام: بەگوێرەی ئەو شتانەی کە نەتەنیا بیستوومانە بەڵکووو بە چاوی خۆمان بینیومانە، پشتیوانی ئێران لە کوردەکانی بارزانی لە مانگی رابردوودا زیاتر بوە. چەک و تەقەمەنی زیاتر لە سەر سنوورە و ژمارەیەکی زیاتر ئوتوموبیلی عێراقی ئامادە کراون بۆ ئەوەی ئەو چەک و تەقەمەنیە بگوازنەوە بۆ بەرەی شەڕ. ئوردوگای نوێ بۆ ئاوارەکان درست کراوە و کارەکانیان بێ گیروگرفت دەچێتەپێش و ژمارەیەکی زیاتر لە کوردەکانی عێراق بە پارەی زیاترەوە لە شارەکانی ئێراندا دەسوڕێنەوە. ئەگەر راست بێت، تەسلیمکردنی چەکی نوێی دژەفڕۆکە بە کوردەکان، نیشانەی ئەوەیە کە ئێران هەنگاوی زیاتری بۆ یارمەتیدانی کوردەکان هەڵگرتوە. لە هەمان کاتدا ئەمە ئەو رێژە زۆرە چەک و تەقەمەنیە نیە کە بتوانێت هاوسەنگی هێز لە نێوان بارزانی و سپای عێراقدا بگۆڕێت. کەوابو بەگوێرەی ئەو شتانەی کە بینیومانە و بیستومانە، پێمانوایە کە ئێران ئەوەندە یارمەتی بارزانی دەدات کە دەوڵەتی عێراق نەتوانێت لە رووی ئابووری یان سەربازیەوە بەسەریدا زاڵ نەبێت نە ئەوەندە کە بارزانی بتوانێت پێی سەربکەوێت[٣٧٢].

---

[٣٧٢]- هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پەیامێکدا بۆ نوسینگەی هێزە هاوبەشەکانی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا لە مانگی حوزەیران بە پشتبەستەن بەم بروسکەیەی کونسولگەری ئەمریکا لە تەورێز، نوسیویەتی: "کونسولگەری ئەمریکا لە تەورێز راپۆرتی داوە کە دەوڵەتی عێراق نەیتوانیوە لەرێگای گەمارۆی ئابووری و هێرشی بێ سنووری هەوایی بە سەر کوردەکاندا زال بێت و

**لە نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ١٠٠٥**

**١٠ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: بارودۆخی کورد بۆ دەوڵەتی عێراق دژوارتر دەبێت**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، بەیرووت، بۆن، قاهیرە، جەدە، کوەیت، لەندەن، پاریس، موسکۆ، تاران، تلابیب، ڤیەنا و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢١٨ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد ( نەنێردراوە بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بۆن و ڤیەنا)

کورتە: بەپێچەوانەی ئەو شتەی کە دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات نیشانی بدات، وادیارە بارودۆخی کورد بۆ دەوڵەتی عێراق دژوارتر بوە. نیشانەکانی ئەو بارودۆخە دژوارە ئەوەیە کە دەوڵەتی عێراق ئەفسەرە یەدەکەکانی بانگ کردوە بۆ خزمەتی سەربازی و دەوڵەتی عێراق نیگەرانی سەربازە بریندارەکانیەتی. هاوکات لەگەڵ کۆتاییپێهاتنی وادەی (چارەسەر کردنی کێشەی کورد) لە ٣٠ی حوزەیران، وادیارە

---

بۆمبارانەکان تەنها بوەتە هۆی ئەوەی خەڵک زیاتر روو لە ریزەکانی بارزانی بکەن. هێزەکانی عێراق سەرجەم شارەکانیان لە دەسدایە بەڵام کۆنترۆلی ناوچە بەرزە شاخاویەکان و رێگاکانی نزیک شارەکان لە دەستی بارزانی دایە. ئێران رۆژ بە رۆژ زیاتر یارمەتی بارزانی دەدات و بارزانی ئەوەندە ورەی بەرزە و ئەوەندە چەکوچۆڵی هەیە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن شەڕ بکات". وەرگێڕ

دەوڵەتی عێراق ناتوانێت کێشەکە بە ڕێگای سەربازی چارەسەر بکات. پەیوەندیدانی کێشەی کورد بە ئەمریکا لە عێراق کەم بوەتەوە بەڵام دەوڵەتی عێراق هێشتا بە چاوی گومان سەیری نیاز و مەبەستەکانی ئەمریکا دەکات.

٢- ڕۆژنامەکانی عێراق بەردەوام مەلا مستەفا و پێشمەرگە وەک گروپێک مرۆڤکوژی تەریکخراو نیشان دەدەن کە هەوڵ دەدەن زۆربەی کوردەکانی عێراق لە خزمەتی یاسای ئوتونومی خۆیاندا بەکاربێنن. ڕۆژنامەکانی عێراق باسی ئەوە ناکەن کە شەڕێکی جدی (لە باکوور) لە ئارادایە.

٣- لە لایەکی دیکەوە ڕۆژنامەکانی عێراق بڵاویان کردەوە کە ئەو ئەفسەرە یەدەکانە کە لادایکبووی پاش ١٩٤٩ن بۆ خزمەتی سەربازی بانگ کراون و گەلێ کەس ئاماژەیان بەوە کردوە کە ڕۆژ بەڕۆژ پێداویستی سەربازی زیاتر لە ڕێگای قیتارەوە دەنێردرێت بۆ باکوور. رادیۆ نهێنیەکەی کوردەکان باسی ئەوە دەکات کە بەردەوام شەڕیکی قورس لە ئارادایە. گرنگترین شتێک کە شایانی سەرنجپێدانە ئەوەیە کە دەوڵەتی عێراق داوای لە باڵوێزی فەرەنسە و نەمسا (ئوتریش) و کاربەدەستانی ئاڵمانیای ڕۆژئاوا و بریتانیا کردوە کە بۆ تەداویکردنی ئەفسەران و هێزەکانی عێراق کە لە شەڕی کورددا بریندار بوونە، یارمەتی دەوڵەتی عێراق بدەن. جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق هەفتەی رابردوو خۆی ئەم داواکاریەی تەسلیم بەو باڵوێزانە کردوە. باڵوێزی نەمسا، نۆربێرت[٣٧٣] ئاگاداری کردمەوە کە تاقا (جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق -وەرگێڕ) پێوتوە نەخۆشخانەی عێراق پڕە لە بریندار. تاکا هەروەها نۆربێرتی دڵنیا کردوەتەوە کە دەوڵەتی عێراق سەرجەم پارەی تێچووی گوازتنەوەی برینداەکان بۆ ئەو وڵاتانە و تەداویکردنیان دابین دەکات. هەم نۆربێرت و هەم کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی بریتانیا پێمیانوت کە دەوڵەتی نەمسا و بریتانیا لە سەر بنەمای مرۆڤدۆستانە ڕەزامەندی خۆیان بۆ یارمەتیدانی عێراق دەربڕیوە و پێموایە فەرەنسا و ئاڵمانیای ڕۆژئاواش بە هەمان شێوە یارمەتی عێراق دەدەن.

---

[373] NORBERT

٤- شەواهیدە زۆرەکان نیشان دەدات کە بارودۆخەکە زۆر لەوە خراپترە کە بە شێوەی سەربازی یا سیاسی چارەسەر بێت. رۆژنامەکانی عێراق بەردەوام ئێران و "ئیمپریالیستەکان" وەک سەرکردەی شەڕارەتی بیانی ناو دەبەن بەلام لەم مانگانەی دواییدا راستەوخۆ ناوی ئەمریکایان نەهێناوە.

وەزارەتی دەرەوەی عێراق بانگی کردم و پێیانڕاگەیاندم کە دەولەتی عێراق مەمنوونە کە کاربەدەستانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا نوێنەرانی شۆڕشی کوردیان لە واشینگتۆن ورنەگرتوە بەلام لە هەمان کاتدا وتی دەولەتی عێراق پێیوایە کە ئەمریکا دەتوانێت و دەبێت گوشار بخاتە سەر ئێران بۆ ئەوەی ئیدی یارمەتی کوردەکان نەدات. هیچ گومان لەوەدا نیە کە لە روانگەی دەولەتی عێراقەوە، کێشەی کورد ئێستا بەقەد کێشەی عەرەب - ئیسرائیل کاریگەری خراپی لە سەر ئاساییبونەوەی پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا هەیە.

**وەزارەتی دەرەوە**

**یادداشتنامەی گفتوگۆکان**

**١٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: کوردەکان داوای یارمەتی لە ئەمریکا دەکەن**

بەشداربووان:

دۆکتۆر شەفیق قەزاز، بەرپرسی بەشی راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP)

بەڕێز ستیڤان ئی وارد[٣٧٤]، بەڕێوەبەری بەشی کاروباری وڵاتان لە NEA/ARN

بەڕێز گریگوری د ئیسترانگ[٣٧٥]، کاربەدەستی بەشی عێراق لە NEA/ARN

بۆ زانیاری:

NEA

NEA/Algal

NEA/IRN

EUR/TUR

نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد، باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت، تاران، ئانکارا، کونسوولخانەی ئەمریکا لە تەورێز و نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویورک

---

374 Mr. Stephen E. Ward,

375 Mr. Gregory D. Strong

**کورته:** شەفیق قەزاز، بەرپرسی بەشی راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان[٣٧٦] رۆژی ١٨ی حوزەیران سەردانی وەزارەتی دەرەوەی کرد بۆ ئەوەی داوای یارمەتی ئەمریکا بۆ کوردەکان بکات. قەزاز وتی کوردەکان هیوایان بە وتوویژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەیان نەماوە و لە ئەنجامدا کێشەکەیان بردوەتە کومیسیونی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتوەکان. قەزاز وتی خاڵی سەرەکی ناڕازیبوونی کوردەکان لە پلانی بەعس بۆ ئوتونومی کورد ئەوەیە کە ئەو ناوچانە کە هەر لە کۆنەوە زۆربەی دانیشتوەکانی کوردن نەکەوتوونەتە ناو هەرێمی کوردستان.

قەزاز وتی کێشەی کورد ئیدی نابێ وەک کێشەیەکی ناوخۆی عێراق سەیر بکرێت چونکە نزیکەی ٨٠ هەزار ئاوارەی کورد لە ئێرانن. قەزاز وتی کوردەکان بە باشی دەتوانن لە بەرامبەر بەعس رابوەستن و ئەوەی بە سەر قسەکانیدا زیاد کرد کە هەموو حکومەتەکانی عێراق کە لەگەڵ کورد شەڕیان کردوە رووخاون.

بەرێز "ستیڤان وارد" وتی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکان ئەوەیە کە لە کاروباری ناوخۆی عێراقدا دەستێوەردان نەکات و وتی هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە گەلێ لە خەڵکی ئەمریکا لایەنگری لە کوردەکان دەکەن، بەڵام ئیمە ناتوانین کوردەکان بەوە دڵخۆش بکەین کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوەی فەرمی پشتیوانی لە دۆزەکەیان لە عێراق بکات.

قەزاز(کە ئەمدوایانە لە کوردستانی عێراق بوە و دەیەوێت بەمزوانە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق) کۆپیەک لە راگەیاندننامەیەکی دەربارەی پێشیلکاریەکانی مافی کوردەکان بەدەستی دەوڵەتی عێراق دا بە بەڕێز وارد. نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان رۆژی ١٠ی حوزەیران ئەو راگەیاندننامەیەی تەسلیمی کومیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتوەکانی کردوە. قەزاز وتی ئەوە دەزانیت کە کارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان زیاتر هۆکاری سیاسی لەپشتە تا مرۆڤدۆستانە بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان لەوە بێ هیوا نەبوە کە "وڵاتێکی سیحراوی" دۆزی کورد لە نەتەوە

---

[٣٧٦]- مەبەستی لە بەشی راگەیاندن (ئیعلام)، کاروباری رۆژنامە و رادیۆ و چاپەمەنییە کە ئەو کاتە دۆکتۆر شەفیق قەزاز بەرپرسی بوو لە شاخ. وەرگێڕ

یەکگرتوەکان بخاتەڕوو و هیوای دەربڕی کە ئەو وڵاتە، ئەمریکا بێت. قەزاز لە درێژەی قسەکانیدا وتی کوردەکان ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەدەن چونکە ئیمکانی ئەوە لە ئارادا نەماوە کە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق ڕێکبکەون و وتی پاش ئەو کردەوە دڵڕەقانە کە دەوڵەتی عێراق ئەنجامیداوە ئیدی ئیمکانی ئەوە نیە کە درێژە بە وتووێژێکی واتادار لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بدرێت.

لە وەڵامی پرسیارێکی بەڕێز وارد دەربارەی ئەو پلانەی کە عێراق ١١ی ئادار بۆ ئۆتونومی کورد رایگەیاندوە قەزاز وتی خاڵی سەرەکی ناڕازیبوونی کوردەکان لەو پلانە ئەوەیە کە تەنها دوو لە سێی خاکی کوردەکانی لە خۆ گرتوە و ئەو ناوچانەی کوردستانی لە خۆ نەگرتوە کە خاوەن سەرچاوەی نەوتن. قەزاز وتی مەسەلەکە تەنها مەسەلەی نەوت نیە بەڵکوو مەسەلەی خاک و خەڵکەکەیەتی و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان بەتەواوی باوەڕی بەوەیە کە زۆربەی دانیشتوانی کەرکووک کوردن.

قەزاز وتی کێشەکانی دیکەی پلانەکەی ئۆتونومی بەعس ئەوەیە کە هیچ ئامارەیەکی بە بەشداربوونی کوردەکان لە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا نەکردوە کە هەموو دەسەڵاتەکانی لە بەغداد بەدەستەوەیە. قەزاز وتی لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردوودا کوردەکان کۆنترۆڵی لانیکەم نیوەی ئەو خاکەیان بەدەستەوە بوە کە ئێستا داوای دەکەن و لە کردەوەدا دەوڵەت کەمتر لەو خاکەیان دەداتێ کە پێشتر لە دەستیاندا بوە.

لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ئاستی شەڕ، قەزاز وتی هەتا ١٥ی نیسان شەڕەکە لە چوارچێوەی پێکدادانی بەربڵاودا بوە بەڵام پاش ١٥ی نیسان بوە بە شەڕێکی بەرفراوان و توند و ١٥٠٠ کوردی سڤیل کوژراون و بریندار بوونە. قەزاز وتی ئێستا دەوڵەتی عێراق ٧ لەشکەر لە کۆی ٩ لەشکەرەکەی دژی کوردەکان ئامادە کردوە و وتی هێرشی عێراق بۆ سەر خەڵکی سڤیل بەسەر کێشەکانی دیکەدا زیاد بوە.

قەزاز دەربارەی ئیمکانی پشتیوانی ئەمریکا لە کوردەکان پرسیاری کرد. بەڕێز وارد لە وەڵامدا وتی شانسی ئەوە زۆر کەمە کە ئەمریکا بە شێوەی فەرمی پشتیوانی لە

کوردەکان بکات و وتی ئەگەر شتێک بەدەر لەوە بڵێت راستی نەکردوە. بەڕێز وارد ئەوەی شیکردەوە کە پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا بە جۆرێکە کە ئێمە ئەگەریش پێمانخۆش بیت ناتوانین بە شێوەیەکی کاریگەر لە بواری دیپلۆماسیدا لە کێشەی کورددا دەستێوەردان بکەین. بەڕێز وارد ئەوەی شیکردەوە کە هەرچەند کە گەلێ لە ئەمریکیەکان زۆر باش لە بارودۆخی دژواری کوردەکان تێدەگەن و لایەنگریان لێدەکەن، بەڵام سیاسەتی ئێمە ئەوەیە کە لە کاروباری ناوخۆی عێراق یا وڵاتانی دیکە دەستێوەردان نەکەین و نامانەوێت کارێک ئەنجام بدەین کە لەوانەیە وەک کاری تێکدەرانە لێکبدرێتەوە. بەڕێز وارد لە ئەنجامی قسەکانیدا وتی هیچ هیوایەکی بەوە نیە کە ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت.

قەزاز وتی تاڕادەیەک دەرک بە هەڵوێستی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات بەڵام هێشتا هیوادارە کە نەتەوە یەکگرتوەکان پشتیوانی لە کوردەکان بکات. قەزاز دەربارەی سیاسەتی ئێمە سەبارەت بە عێراق پرسیاری کرد و وتی عێراق لە رووی دیپلۆماسیەوە وڵاتێکی گۆشەگیرە و چاوی تەماحی بڕیوەتە کوەیت و پەیوەندی لەگەڵ ئێران باش نیە. قەزاز وتی رژیمی بەعس گۆشەگیرە و هەم لە ناوخۆ و هەم لە ئاستی نێونەتەوەییدا بێزلێکراوە و وتی روسەکان دەستیان زۆر لە عێراق دەڕوات و وتی فڕۆکەوانە روسەکان بۆ دەوڵەتی عێراق لە ئاسمانی کوردستاندا چالاکی دەکەن. قەزاز وتی مەعقول نیە وا بیر بکەینەوە کە رژیمی ئێستای عێراق هەر وا لە دەسەڵاتدا بێت چونکە هەموو ئەو دەوڵەتانەی عێراق کە لەگەڵ کورددا شەڕیان کردوە رووخاون. قەزاز وتی دەوڵەتی عێراق نیازی ئەوە بوە رێبەرایەتی کورد گۆشەگیر بکات و خۆی نەخاتە ناو شەڕێکی بەرفراوان لەگەڵ کورددا بەڵام پلانەکەیان سەرکەوتوو نەبوە. قەزاز لە ئەنجامی قسەکانیدا وتی سەدام حوسەین (لە سەرنەکەوتنی پلانەکەیان) زۆر زۆر توڕە بوە.

بەڕێز وارد دووپاتی کردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت کارێک ئەنجام بدات کە وەک کردەوەی تێکدەرانە لێکبدرێتەوە و وتی ئێمە هیوادارین کە دەوڵەتی عێراق و کوردەکان کێشەکانیان بە شێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکەن.

قەزاز جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە کێشەی کورد ئیدی ناکرێت وەک کێشەیەکی ناوخۆیی سەیر بکرێت چونکە ئیستا نزیکەی ٨٠ هەزار ئاوارەی کورد لە ئێرانن. قەزاز وتی کوردەکان کۆنترۆلی سەرجەم سنووری ئێران و عێراق جگە لە سنووری ئێران و عێراق لە باشوریان لە دەستدایە و وتی کوردەکان پەیوەندی باشیان لەگەڵ ئێراندا هەیە و تەنانەت هێدی هێدی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ تورکیە دەستی پێکردوە. قەزاز وتی تورکیە ئێستا لانیکەم دان بەوەدا دەنێت کە لە تورکیە کورد هەیە و وتی کوردەکان دەتوانن بە باشی لە بەرامبەر بەعسدا رابوەستن.

لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ئەوەی کە ئەگەر رژیمی ئێستای عێراق بڕوخێت چی بەدوایدا روو دەدات قەزاز دانی بەوەدانا کە ئەوە کێشەیە و وتی تەجروبەی رابردوو نیشانیداوە کە گۆڕینی رژیم لە عێراق هەمیشە نابیتە هۆی گۆڕینی سیاسەتی عێراق بەڵام جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە بەهەرحاڵ هیچ دەوڵەتێک لە دەوڵەتی ئێستا بۆ کورد خراپتر نابێت. قەزاز دەربارەی پارسەنگی سەربازی وتی ئێران هەندێ یارمەتی کوردی داوە لەوانە چەکی دژەفڕۆکەی کۆنی داوە بە کوردەکان. قەزاز وتی دەوڵەتی عێراق نەیتوانیوە جگە لە وەدەستخستنی کۆنترۆلی هەندێ جادەی سەرەکی هیچ سەرکەوتنێکی دیکە بەدەست بهێنێت.

قەزاز پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەر بنەمای مرۆڤدۆستانە لە نەتەوە یەکگرتوەکان شتێک بۆ کوردەکان دەکات؟. بەڕێز وارد لە وەڵامدا وتی زۆر گومانی لەوەدا هەیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شتێکی سەرەکی لەو پەیوەندیەدا ئەنجام بدات و ئەوەی بەسەر قسەکانیدا زیاد کرد کە ناتوانیت پێشبینی ئەوە بکات کە هەڵوێستی دەوڵەتی ئەمریکا چی دەبێت ئەگەر مەسەلەکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان بخرێتە دەنگدان.

قەزاز پرسیاری کرد ئایا ئەمریکا چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە پەیوەندییەکانی عێراق و ئەمریکا باشتر بێت. بەڕێز وارد وتی نە دەیەوێت پێشبینی ئەوە بکات و نە دەیەوێت دەربارەی پێشهاتێکی وەها بڕیار بدات بەڵام ئاماژەی بەوە کرد کە شتەکان لە

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زوو دەگۆڕدرێت و وتی پەیوەندیە بازرگانیەکانی عێراق و ئەمریکا ئەمدوایانە باشتر بوە.

لە وەڵامی پرسیارێکی قەزاز دەربارەی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی رێکخراوە نێونەتەوەیەکان ( بە کوردەکان) بەڕێز وارد وتی ئەم رێکخراوانە لە دەوڵەتی ئەمریکا سەربەخۆن و چاوەڕوان دەکرێت بەو شێوەیە کە شایانیەتی لەگەڵ کێشەی کورددا هەڵسوکەوت بکەن.

تێبینی: قەزاز لە لابەلای قسەکانیدا وتی کوردەکان زانیاری ئەوەیان لایە کە براکەی سەدام حوسەین، کە مرۆڤکوژێکی بەئەزموونە، لە نیویۆرک بوە. قەزاز ئەوەی بەسەر قسەکانیدا زیاد کرد کە دوڵەتی عێراق پێشتر هەوڵیداوە چالاکیەکانی کوردەکان لە ئەمریکا تێکبدات.

**له نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٤٤٩٣**

**١٩ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: هەوڵی کوردە ناسیونالیستەکان بۆ پشتیوانیکردنی ئەمریکا لە دۆزی کورد لە نەتەوە یەکگرتوەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، ئانکارا، دەمیشق، مۆسکۆ، تاران و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد (لەڕێگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت)

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٧٩٧ی نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان

**کورتە:** سێ کاربەدەستی کوردی پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP) ڕۆژی ١٩ی حوزەیران سەردانی نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان کرد بۆ ئەوەی چالاکیەکانیان لە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئێمە شی بکەنەوە و پشتیوانی ئەمریکا بەدەستبهێنن. ئێمە بەشێوەیەکی خەمخۆرانە گوێمان لە قسەکانیان گرت بەڵام بۆمان شیکردنەوە کە بۆ ئەمریکا ناتوانێت خۆی بخاتە ناو کێشەی کوردەکان لە عێراق.

١- کاربەدەستانی KDP کە لەلایەن "نوێنەرایەتی کوردەکان لە دەرەوە" نامەیەکیان بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ناردبوو، ڕۆژی ١٩ی حوزەیران داوایان کرد

لەگەڵ بەرپرسی نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دیدار بکەن بەڵام نوێنەری ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڕێز سکالی[٣٧٧] وتی سەرقاڵە و ناتوانێت لەگەڵیان دیدار بکات. وتەبێژی گروپی کوردەکان، محمد محمود عەبدولڕحمان[٣٧٨]، ئەندامی مەکتەبی سیاسی KDP بوو کە مرۆڤیکی لەسەرخۆ و تێگەیشتوو بوو. دوو کاربەدەستەکەی دیکەی KDP بریتیبوون لە محمد دزەیی[٣٧٩]، ئەندامی مەکتەبی ناوەندی KDP و چالاک جوانڕۆیی[٣٨٠] کە دوکانێکی لە نیویۆرک کردوە بە "نوسینگەی هەمیشەیی نوێنەرایەتی کورد لە دەرەوە". چالاک جوانڕۆیی تەمەنی لە ٢٠ کاندایە و ئەمدوایانە لە کالیفۆرنیا هاتوە بۆ نیویورک.

٢- محمد محمود عبدالرحمان لە سەرەتای قسەکانیدا بارودۆخی دژواری کوردەکانی لە عێراق شیکردەوە و وتی ئامانجی سەرەکی رژیمی دیکتاتۆری عێراق ئەوەیە کە گەلی کورد قەلاچۆ بکات. عبدالرحمان وتی KDP هەوڵ دەدات مەسەلەی کۆمەڵکووژی کوردەکان لە دانیشتنی رۆژی ٢٩ی تەموزی کۆڕی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکاندا بخاتەڕوو. عبدالرحمان وتی دەزانێت ئەمریکا "کۆنڤانسیۆنی پێشگیری لە ژینۆساید"ی واژۆ نەکردوە بەڵام هیوادارە کە هەندێ لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتوەکان پشتیوانی لەو مەسەلەیە بکەن ( هەرچەند کە هیچ وڵاتیک تا ئێستا دەستپێشخەری نەکردوە).

٣- عبدالرحمان بە توندی رەخنەی لە یارمەتیدانی سۆڤیەت بە شەڕی عێراق دژی کورد گرت و بانگەشەی ئەوەی کرد کە سۆڤیەت گازی کیمیایی داوە بە عێراق و دەوڵەتی عێراقیش ئامادەیە هەر کاتێک بیەوێت کەڵکی لێوەربگرێت. عبدالرحمان هەروەها وتی جگە لەوەش هەموو هێرشە هەواییەکانی عێراق دژی کوردەکان لە ژێر چاودێری ئەفسەرێکی روسی بە ناوی ئەلیکساندیر واسیلۆف[٣٨١] جێبەجێ دەکرێت.

٤- عبدالرحمان وتی هەوڵی سەرەکی کوردەکان لە نیویورک لە کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەبێت و بەتایبەت هەر لەو چوارچێوەیەدایە کە داوای

---

377 SCALI
378 M.M. ABDUL RAHMAN,
379 M. DIZAYEE,
380 CHALAK JEWANROYEE
381 ALEXANDER VASILEF

پشتیوانی ئەمریکا دەکەن. عبدالرحمان ئاماژەی بەوە کرد کە سکاڵانامەی کوردەکان ئێستا خراوەتە بەردەم کومیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتوەکان کە لە وڵاتانی فرانسە، ئوروگوئی، پاکستان، یەکێتی سۆڤیەت و غینا پێکدێت. ئەگەر کۆمیتەی مافی مرۆڤ بە پێویستی بزانێت، سکاڵانامەکە تەسلیم بە "نیمچە کومیتەی پێشگیری لە هەڵاواردن دژ بە کەمینەکان" دەکرێت و لەوێوە دەنێردرێت بۆ کومیسیۆن. عبدالرحمان داوای لە ئێمە کرد لەگەڵ ئوروگوئی، پاکستان و فەرانسە قسە بکەین بۆ ئەوەی سکاڵانامەکەی کوردەکان لە کۆمیتەی مافی مرۆڤدا رەت نەکرێتەوە.

٥- ئێمە لە وەڵامدا وتمان هەرچەند کە ئەمریکا زۆر هاوخەمی بارودۆخی کوردەکانە بەڵام یارمەتیەکی ئەوەندەی لە دەست نایێت و بەهۆی ئەوەی کە ئەمریکا پەیوەندی دیپلۆماتیکی لەگەڵ عێراق نیە، دانوستانمان پێکەوە زۆر زۆر کەمە. هەروەها وتمان لەم قوناخەدا کە ئەمریکا بەدوای چەسپانی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە (مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی ئیسرائیل و فەلستینە) ئەمریکا ناتوانێت شتێک بخاتەڕوو کە دەوڵەتی عێراق هان بدات چونکە عێراق دەتوانێت رەوتی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێکبدات.

عبدالرحمان وتی لەم سیاسەتەی ئەمریکا تێدەگات بەڵام بەهەرحاڵ زۆر هیواداره کە ئەمریکا ئەوە کە لە دەستی دێت بیکات بۆ ئەوەی کێشەی کورد بەو شێوەیە کە شایانیەتی بخریتەڕوو و سۆڤیەت لە باری نەبات.

٦- عبدالرحمان وتی دەیەوێت رۆژی ٢٠ی حوزەیران بچێت بۆ واشینگتۆن بۆ ئەوەی لە مانگی تەموز لەگەڵ نوێنەرانی هەندێ لە وڵاتانی ئوروپایی دیدار بکات و پاشان لەرێگای ئێرانەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستانی عێراق.

شۆفێڵ[٣٨٢]

382 — SCHAUFELE

**له نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ١٠٥٤**

**٢٥ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: دەوڵەتی عێراق داوای یارمەتی سەربازی لە بریتانیا بۆ روبەڕوبونەوە لەگەڵ هێزی پێشمەرگە دەکات**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیرووت، قاهیرە، لەندەن، تاران و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دەمیشق

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٤٨ی نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- کاربەدستی سەربازی باڵوێزخانەی بریتانیا لە عێراق، مەیجیر سەندێرز[٣٨٣] لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو لە ناو سپای عێراقدا بیستوویەتی کە بارودۆخی سەربازیی دەوڵەتی عێراق لە بەرامبەر کوردەکان لە باکووری عێراق باشتر نەبوە. سپای عێراق بەدوای ئەوەدایە کە دەوڵەتی بریتانیا لە رووی هەندێ تاکتیکی تایبەتی سەربازیەوە یارمەتی بدات و بۆ چۆنیەتی روبەڕوبونەوە لەگەڵ هێرشی پێشمەرگەکان لە ناوچە شاخاویەکان مەشق بە هێزەکانی عێراق بکات. دەوڵەتی عێراق هەروەها لە رێگای بریتانیاوە داوای یاسا و رێوشوێنە سەربازیەکانی ئەمریکای کردوە.

---

383 - MAJ. SANDERS

٢- کونسولی میسر، بەرەکە[384]، وتی باڵوێزخانەی میسر لە ڕێگای ئەو دۆکتۆرانەوە کە لە نەخۆشخانە دەوڵەتیەکانی عێراقدا کار دەکەن پێیڕاگەیەندراوە کە بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی فەرمی نەخۆشخانەکان، ژمارەی قوربانیە بریندارەکانی سپای عێراق ڕۆژانە لانیکەم ١٠ کەسە.

384 BARAKA

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٧٠٦٥**

**٢٦ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: کاریگەری کێشەی کورد لە سەر پەیوەندییەکانی ئێران و عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئیسلام ئاباد، جەدە، کابول، مۆسکۆ، نیودلهی، قاهیرە، ئەمان، مەسقەت، ئەبوزەبی، مەنامە، دۆحە، تلابیب، دەمیشق، داکا، خارتوم، پەکین، لەندەن، کووەیت، نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- کورتە: زیادبوونی بەرچاوی داهاتی نەوتی ئێران ئەم دوایانە کۆمەڵێک ئامرازی نوێی خستوەتە بەر دەستی ئێران بۆ ئەوەی بگات بە ئاواتی لەمێژینەی خۆی کە ئەوەیە دەورێکی کاریگەرتر لە گۆڕەپانی جیهان، بەتایبەت لە کاروباری ناوچەدا بگێڕێت. شا بەشێوەیەکی لێزانانە لەم داهاتە ئابووریە کەڵکیوەرگرتوە بۆ ئەوەی ئامانجە سیاسی و ئیستراتژیکەکانی ئێران بەرەوپێش ببات و وڵاتی ئێران ئێستا شانازی بە پێگە و دەسەڵاتی نوێی خۆی دەکات.

٨- سەرەڕای دەستپێکردنەوەی پەیوەندی دیپلۆماتیک لە نێوان ئێران و عێراق، دەوڵەتی ئێران هێشتا بە چاوی گومان و وەک یەکێ لە دژمنە هەرە سەرسەختەکانی خۆی سەیری عێراق دەکات. هۆکاری ئەو جۆرە روانینەی ئێران تەنها ناکۆکیە ئەتنیکی، ئایینی و سیاسیەکان و ناکۆکیە سنوریە لەمێژینەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە

نیه بەڵکوو ئەوەشە کە شا پێیوایە کە عێراق بوە بە داردەستی سۆڤیەت بۆ ئەوەی سۆڤیەت دزە بکاتە ناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کردەوە خراپکارانەکانی لە سەراسەری ناوچە جێبەجێ بکات. لە ئەنجامدا، شا پێیخۆش نیە کە هەنگاوبەهەنگاو پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق باشتر بێت و بۆ نمونە کێشەی سنوریی ئەو دوو وڵاتە چارەسەر بێت چونکە پێیوایە کە ئەوە کێشە بنەڕەتیەکان چارەسەر ناکات بەڵکوو تەنها پێش لە توندڕەوییەکانی عێراق دەگرێت.

شا روونی کردوەتەوە کە تەنیا بۆ ئەوە لەگەڵ عێراق وتووێژ ناکات کە کێشە سنوریەکان و کێشەی "شەتولعەرەب" چارەسەر بێت بەڵکوو ئەوەشی دەوێت کە دەستێوەردانی عێراق لە کاروباری وڵاتانی دیکە کۆتایی پێبێت[٣٨٥]. یەکێکی دیکە لەو شتانەی کە بوەتە هۆی ئەوەی ئەمدوایانە پەیوەندیەکانی عێراق و ئێران ئاڵۆزتر بێت ئەوەیە کە دەوڵەتی عێراق بەتوندی خەڵکی کورد بومباران دەکات. شا ئەو کردەوەیەی عێراق وەک کۆمەڵکوژی گروپێکی ئەتنیکی کە هاوڕەگەزی ئێرانن، شەرمەزار دەکات. بێ گومان ئێران هەم بە هۆکاری مرۆڤدۆستانە و هەمیش بۆ ئەوەی هاوسەنگی هێز لە ناو دەوڵەتی عێراق رابگیردرێت، درێژە بەو سیاسەتە دەدات کە وەکوو پێویست یارمەتی کوردەکان بدات بۆ ئەوەی دەوڵەتی عێراق بە سەر

---

[٣٨٥] بە گوێرەی پەیامێک کە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران لە ٢٩ی نیسانی ١٩٧٤ بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردوە، باڵوێزی سۆڤیەت لە تاران رۆژی ٢٧ی نیسان سەردانی شای کردوە و داوای کردوە ئێران لە کاروباری عێراقدا دەستێوەردان نەکات. شاش لە وەڵامدا وتویەتی کە عێراق سیاسەتێکی کۆلۆنیالیستی کۆنی سەبارەت بە سنووری شەتولعەرەب گرتووەتەبەر و ئاماژەی بە دەستێوەردانەکانی عێراق لە کاروباری ئێران و پشتیوانیکردنی عێراق لە گروپە نەیارەکانی ئێران، بەتایبەت بزووتنەوەی ئازادی خوزستان و بزووتنەوەی ئازادی بەلوچستان و داڵدەدانی تەیموور بەختیار کردوە و وتویەتی ئەگەر عێراق درێژە بە سیاسەتی دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دراوسێکانی بدات، نابێ چاوەڕوانی ئەوە بێت کە ئێران هەمان سیاسەت بە نیسبەت عێراق نەگرێتەبەر. شا لە کۆتایی قسەکانیدا وتویەتی هەتا کاتێک عێراق کۆتایی بە کردەوە خراپکارانەکانی دژی وڵاتانی ناوچە نەهێنێت، سیاسەتی خۆی بەنیسبەت عێراق ناگۆڕێت. وەرگێڕ

کوردەکاندا زاڵ نەبێت. هەروەها ئامانجی درێژخایەنی شا ئەوەیە کە دەسەڵاتی سۆڤیەت کەم بێتەوە و دەوڵەتێک بێتە جێگای رژێمی بەعس کە لەگەڵ ئێراندا هاوکاری بکات.

هێڵمز

**ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)**

**بە تەواوی نهێنی**

**٢٧ی حوزەیرانی ١٩٧٤**

**بابەت: زانیاریە سەربازیەکانی دەزگای هەواڵگری کوردەکان و ساواک**

١- سپاستان دەکەین کە ئەو زانیاریە هەواڵگریە گرنگەتان بەو رێکوپێکیە پێداین. هیلمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران تا رۆژی ٢٩ی حوزەیران لە تاران نابێت.

٢- شا لە رێگای SAWAKو کوردەکانەوە زیانیاری هەواڵگری دەربارەی ئەو چەکوچۆلانە پێگەیشتوە کە سۆڤیەت بۆ عێراقی دابین کردوە. کەوابوو چاوەروان دەکرێت زانیاری دەربارەی گەیشتنی فرۆکەی SCUDی سۆڤیەت بە عێراق گەیشتبێتە دەستی شا. کاردانەوەی شا (هەروا کە لە پەیامەکەدا ئاماژەی پێکراوە) ئەوە دەبێت کە داوای سیستمی چەکی دژە SCUD (لە ئەمریکا) بکات بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ فرۆکەکانی سۆڤیەت.

٣- هێوربوونەوەی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق ( کە لە پەیامەکەدا ئاماژەی پێکراوە) زیاتر لە خەیاڵ دەچێت تا واقیع. شا ئێستاش هیچ متمانەیەکی بە رژیمی بەعس نییە و ئەو پشتیوانییە زۆرە کە شا لە کوردەکانی دەکات باشترین بەڵگەیە کە نیشان دەدات هەڵوێستی راستەقینەی شا ئەوەیە کە نایەوێت پەیوەندی دیپلۆماتیکی لەگەڵ عێراق هەبێت و پێکدادانی راستەوخۆی سەربازی لە نێوان هێزەکانی ئێران و عێراق لە ناوچە سنووریەکان رابوەستێت. هەڵوێستی راستەقینەی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە شا زیاتر لە ناوەرۆکی ئەو بەرنامە نهێنیانەدا دیار دەبێت کە لە

رادیۆکانی نزیک لە دەوڵەتی عێراقەوە پەخش دەکرێت نە لە گفتوگۆ دیپلۆماتیکەکانی کاربەدەستانی عێراق لەگەڵ باڵویزی ئێران. ئێران و عێراق بە چاوی دوژمن سەیری یەک دەکەن(کە هەرواشە) بەڵام لەوانەیە لە سەر بنەمای هۆکارگەلی تاکتیکی و دیپلۆماتیک ئەو راستیە بشارنەوە. لانیکەم شا لە دیمانەیەکدا لەگەڵ رۆژنامەی لۆمۆند[٣٨٦] لە پاریس لە ٢٥ی حوزەیران گۆشەیەک لەو کارتەی نیشان داوە کە بەدەستەوەیەتی.

٤- شا دەزانێت کە میسر فڕۆکەی SCUDی هەیە و لەوانەیە سوریەش هەیبێتی. کەوابوو لە روانگەی شاوە ئاساییە کە عێراقیش هەیبێتی چونکە پێیوایە کە عێراق باشترین ئامرازە بۆ سۆڤیەت بۆ ئەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە نیمچە دورگەی عەرەب بەرەوپێش بەرێت.

---

386 LE MONDE

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ١١٢٩**

**٩ی ئابی ١٩٧٤**

**بابەت: سەرنەکەوتنی دەوڵەتی عێراق لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، بۆن، قاهیرە، هلسینکی، لەندەن، مسکۆ، پاریس، ستۆکهۆلم، تاران و ڤیەن.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٤٨ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- سەرەڕای ئەوەی کە دەوڵەتی عێراق ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدات بۆ ئەوەی وا نیشان بدات کە بارودۆخی باکوور ئارامە و پێشکەوتنی لە پێکهێنانی بەرەی نیشتمانیدا بەدەستهێناوە، دەوڵەتی بەغداد هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نیە بۆ ئەوەی بسەلمێنێت کە لە چارەسەرکردنی کێشەی کوردەدا پێشکەوتنی بەدەستهێناوە. بەپێچەوانەوە لێژنەیەکی پایەبەرزی عێراق بە سەرۆکایەتی ڕێبەری حیزبی بەعس، نەعیم حەداد هاوڕێ لەگەڵ وەزیرە کوردەکان، عوبەیدولا بارزانی (کوڕی گەورەی مەلا مستەفا) و عەزیز عەقراوی بە پەلە پێکهات و ڕۆژی ٧ی ئاب ڕەوانەی باڵوێزخانەی لوبنان، میسر، نەمسا، فەنلاند، بریتانیا، ئاڵمانیا، فەرانسە و سویید کرا بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەو وڵاتانە لە سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بەنیسبەت

کورد بەدەسبهێنێت بەلام ئەو بالوێزخانانە کەمتر لە ٢٤ کاتژمیر پێشتر ئاگادار کرابوونەوە، کەوابوو نەیانتوانی لەگەڵ ئەو کەسایەتیە سیاسیانە دابنیشن.

٢-هەنگاوی گەورەی دەوڵەتی عێراق بۆ پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی ئەوە بوو کە RCC (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) رۆژی ٣٠ تەموز بڕیارێکی دەرکرد و ناوی ٦٠ کەس لە ٨٠ ئەندامەکەی ئەنجومەنی یاسادانانی هەرێمی کوردستانی دیاری کرد کە هەموویان لایەنگری دەوڵەت بوون. بە وتەی رۆژنامەکان، ٢٠ کورسی دیکە تەرخان کراوە بۆ ئەو کەسانە کە لە بارزانی دابڕاون.

٣- لە راستیدا دەربارەی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق هیچ زانیاریەک لێرە بەردەستدا نیە. وابەستەی سەربازی بالوێزخانەی هیند پێمیوت سپای عێراق شەش حەوتوو لەمەوپێش لە هەوڵێکدا بۆ گرتنی رێگای ئیستراتژیکی "گەلی عەلی بەگ" ٣٠٠ کەسی لێکوژراوە و بریندار بوە و لەو کاتەوە ئیدی هیچ هێرشێکی نوێی ئەنجام نەداوە. دەوڵەتی عێراق بانگەشەی ئەوە دەکات کە بارودۆخی سلێمانی گەڕاوەتەوە بۆ دۆخە ئارامەکەی جاران و زانکۆکەی سەرلەنوێ کراوەتەوە. هاوکات رێوڕەسمی بەخاک سپاردنی بەرپرسی کوژراوی لقی سلێمانی حیزبی شیوعی عێراق لە بەغداد بەڕێوەچوو.

٤- رۆژنامەی کوردی "تەریقەلشەعب"، لە ئاداری رابردووەوە تا ئێستا راستەوخۆ و ئاشکرا لە پاڵ سیاسەتی دەوڵەتی عێراقدا شت بلاو دەکاتەوە. تەلەفزیۆنی عێراق جارجار وێنەی ئەو کوردانە بلاو دەکاتەوە کە بە قسەی خۆی لە بارزانی دابڕاون بەلام شکڵ و قیافەیان لەوە ناچێت کە وابێت. بە کورتی دەوڵەتی عێراق نەیتوانیوە بە بەلگە قەناعەت بە خەڵک بهێنێت کە کێشەی کوردی لە کۆنترۆڵدایە.

لۆڤری

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٧٨٠٣**

**١٩ی ئابی ١٩٧٤**

**بابەت: روانگەکانی شا دەربارەی وتووێژەکانی ئێران و عێراق و کێشەی کورد**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئادیس ئابابا، قاهیرە، جەدە، موگادیشۆ و مۆسکۆ

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٦٨٦١ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- شا لە میانەی کۆبوونەوەیەکدا لە ١٥ی ئاب وتویەتی هەرچەند کە نوێنەرەکانی دەربارەی ناکۆکیەکانی عێراق و ئێران دەستیان بە وتووێژ لەگەڵ وەفدێکی عێراق لە ئیستانبول کردوە بەڵام نازانێت ئەنجامی ئەو وتووێژە چی دەبێت. شا هەروەها وتویەتی ناتوانێت وتووێژ لەگەڵ عێراق بە تەواوی رەت بکاتەوە بەڵام بە پارێزەوە هەنگاو هەڵدەگرێت چونکە متمانەی بە رژێمی بەعس نیە کە لە کۆمەڵێک خراپکار و مرۆڤکوژ پێکهاتوە. شا جەختی لە سەر ئەوە کردوەتەوە کە نە داواکاریەکانی ئێران سەبارەت بە شەتولعەرەب نەرمتر دەکاتەوە و نە یارمەتیدان بە کوردەکان رادەوەستێنێت.

شا وتویەتی خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات کە ئەم زستانە یەک میلیون ئاوارەی کوردی عێراقی بەخێو بکات ئەگەر دەوڵەتی عێراق درێژە بە بومبارانکردنی گوندە کوردنشینەکان بدات. شا هیوادارە کە بتوانێت پێداویستیەکانی زیاتر لە ٣٠٠ هەزار

ئاوارە بۆ زستانی ئەمساڵ ئامادە بکات بەڵام باری یەک میلیۆن ئاوارە زۆر گرانە، هەربۆیە شا دەیەوێت داوا لە IRC (کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور) و کۆمیسارییای باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران بکات لەو پەیوەندیەدا یارمەتی ئێران بدەن.
شا هەروەها وتویەتی لەوە نیگەرانە کە ئەمریکا و میسر بەو قەناعەتە بگەن کە رژیمی بەعس دەیەوێت پشتبەستنی خۆی بە سۆڤیەت کەم بکاتەوە. شا لەوە بەدگومانە کە ئەوە تاکتیکی عێراق بێت بۆ ئەوەی کۆتایی بە گۆشەگیری خۆی بهێنێت و لە رێگای ئەوەی کە خۆی وانیشان بدات کە سیاسەتگەلی نوێتر پەیڕەو دەکات، لە رێژەی گوشارەکانی دنیای دەرەوە لە سەر خۆی کەم بکاتەوە.
هێڵمز

**له ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی**

**بۆ: هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران (تەنها هێڵمز ببینێت)**

**٢٢ی ئابی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: زیادکردنی یارمەتییەکانی ئەمریکا بە مەلا مستەفا بارزانی مەترسی لێدەکەوێتەوە**

پەیامەکەتان بارودۆخەکە و پێشهاتەکانی بە روونی شیکردوەتەوە. هەروا کە خۆتان دەزانن ئەمدوایانە ئێمە پەیامێکمان لەلایەن مەلا مستەفا بارزانییەوە پێگەیشت کە داوای یارمەتی زیاتری لێمان کردبوو. کاتێک کە یارمەتیەکەمان بە گشتی زیاتر کرد و میلیۆنێک دولارمان بەتایبەت بۆ ئاوارەکان تەرخان کرد، بەو ئەنجامە گەیشتین کە هەوڵەکانمان گەیشتوتە قۆناخێک کە لەوە زیاتر ناتوانین یارمەتی بارزانی بدەین چونکە مەترسی ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە مەسەلەکە ئاشکرا بێت. لە سەر بنەمای پەیامەکەی ئێوە و داواکاریەکەی بارزانی ئێمە جارێکی دیکە بارودۆخەکەمان هەڵسەنگاند بەڵام بە هەمان ئەو ئەنجامە گەیشتین کە پێشتر پێیگەیشتبووین. ئێمە نابێت لەوە زیاتر بچینە پێش چونکە مەترسی ئەوە لە ئارادایە کە سەرجەم ئەو شتانە کە تا ئێستا (بۆ بارزانی) کردوومانە، ئاشکرا بێت.

ئێمە باش دەزانین کە کوردەکان پێویستیان بە یارمەتیە و دەمانەوێت ئەوە لەدەستمان بێت بیکەین بۆ یارمەتیدانیان. ئامانجیشمان لەو کارە تەنها ئەوە نیە کە

بەردەوام گوشار بخەینە سەر دەوڵەتی بەعس بەڵکوو ئەوەشە کە پشتیوانی خۆمان لە شا نیشان بدەین. هەروا کە خۆتان ئاگادارن لە کاتی دیدار لەگەڵ "ژنراڵ نەسیری"دا ئێمە لە سەر ئەوە رێککەوتین کە بەرنامەکەمان بۆ دابینکردنی چەکی کلاشینکۆڤ و تەقەمەنی بۆ کوردەکان بگۆڕین و لە باتی ئەوە میلیۆنێک دولارمان بۆ دابینکردنی چەکی دژەتانک بۆ کوردەکان تەرخان کرد.

CIAیارمەتی ئێران دەدات بۆ ئەوەی ئەو چەکانە لە شوێنی خۆی بکڕدرێت. بەڵام بەهەرحاڵ ئێمە ناتوانین یارمەتی بە دابینکردنی چەکی دژە فڕۆکە بۆ کوردەکان بدەین. ئەو چەکانە کە کوردەکان بۆ بەرەنگاربونەوە لەگەڵ فڕۆکە زۆر بەرزەفڕەکانی عێراق پێویستیانە زۆر گەورەن (گوازتنەوەیان زەحمەتە)، بەکارهێنانیان زۆر زەحمەتە و نرخەکەشیان زۆر گرانە. ئێمە هەوڵ دەدەین زیاتر سەرنجی میدیاکان بەرەولای شەڕەکە و کاریگەریەکانی لە سەر کوردەکان رابکێشین. هەروەها هیوادارین کە بتوانین زیاتر یارمەتی ئاوارە کوردەکان بدەین و لەم پەیوەندیەدا پشتیوانی لە ئێران بکەین. پێشنیارەکانی ئێوەش لەم پەیوەندیەدا بەکاردێنین.

بمبورە کە درنگ وەڵامم دایتەوە. هەروا کە خۆت دەزانیت لەم ماوەیەدا زۆر زۆر سەرقاڵم بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە کە دەرک بە نیگەرانیەکانتان دەکەم و هەوڵی بۆ دەدەم. "دیک کینیدی"ش [٣٨٧] لە نزیکەوە بەدواداچوون بۆ مەسەلەکە دەکات.

---

[387] DICK KENNEDY

**لە ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی**
**بۆ: هێلمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**
**٢٤ی ئابی ١٩٧٤**
**بەتەواوی نهێنی، هەستیار**
**بابەت: ئامادەبوونی ئیسرائیل بۆ دابینکردنی چەک و تەقەمەنی بۆ کوردەکان**

هێنرێ کیسینجێر، وەزیری دەرەوە بەم شێوەیە وەڵامی پەیامەکەی ئێوەی "بڕیاری ئەو مەسەلەیە لە بنەڕەتدا لە دەستی ئێراندایە. دەبێ چاوەڕوان بکەین بزانین ئێران بڕیار دەدات ئەوە بکات یا نا."
لەم ڕۆژانەی دواییدا کۆمەڵێک پەیاممان لەلایەن ئیسرائیلەوە بەدەست گەیشتوە کە تێیدا نیگەرانی خۆیان سەبارەت بە بارودۆخی کوردەکان دەربڕیوە. ئیسرائیلیەکان

---

[٢٨٨]-هێلمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران ڕۆژی ٢٣ی ئاب پەیامێکی کورتی ناردوە بۆ ژنێراڵ سکۆکرافت و داوای لێکردوە لە هینری کیسینجێر، وەزیری دەرەوە پرسیار بکات بیروڕای چیە سەبارەت بەوەی کە سەربازەکانی ئێران بچنە ناو خاکی عێراق بۆ یارمەتیدانی کوردەکان. ئەم پەیامە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا ئامادە کراوە. لەم پەیامەدا کیسینجێر دەڵێت بڕیاری ئەو مەسەلەیە لەدەستی ئێراندایە بەڵام کیسینجێر لە کتێبەکەیدا دەڵێت کە لە دانیشتنی ڕۆژی ٢٦ی ئاب لەگەڵ جیراڵد فۆرد، سەرۆک کۆماری نوێی ئەمریکا سەبارەت بەو بیرۆکەیە هۆشداریداوە. لەوانەیە کیسینجێر لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا بیروڕای گۆڕابێت. وەرگێڕ

وێڕای ئاماژەکردن بە ئاکام و ئەنجامە زۆر مەترسیدارەکانی سەرکەوتنی دەوڵەتی عێراق بەسەر کوردەکاندا، کۆمەڵێک پێشنیاریان لەو پەیوەندییەدا خستوەتەڕوو.

کاربەدەستانی ئیسرائیل ئاماژەیان بەوە کردوە کە کوردەکان زۆر پێویستیان بە تۆپی دوورهاوێژ و چەکی دژەتانک هەیە و پێشنیاریان کردوە ئێران یارمەتیدەر بێت بۆ دابینکردنی ئەو چەکانە بۆ کوردەکان. ئیسرائیلییەکان هەروەها ئەو پێشنیارە تایبەتەیان خستوەتەڕوو کە ئەمریکا لە ڕێگای ئێرانەوە چەکیTOW و LAW بگەیەنێتە دەستی کوردەکان و ڕایانگەیاندوە ئامادەن ڕاکێتی دژە تانکی SS10و SS11 بدەن بە کوردەکان ئەگەر ئەمریکا دڵنیایان بکاتەوە کە لە بەرامبەردا ڕاکێتی TOW دەدات بە ئیسرائیل.

وەزیری دەرەوە سپاستان دەکات بۆچوونەکانی خۆتان سەبارەت بەم داواکاریە دواییەی ئیسرائیل بنێرن بۆمان و باسی ئەوە بکەن کە چۆن دەتوانین بە باشترین شێوە ئەم داواکاریە جێبەجێ بکەین. کاربەدەستانی ئیسرائیل هەروەها ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بۆ ئەوەی کوردەکان فێر بکەن چۆن تۆپی مۆدێرن و چەکی دژەتانک بەکاربێنن.

ئەوپەڕی ڕێزم

**له لایەن هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: ژێنیراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی**

**بە تەواوی نهێنی، هەستیار**

**٢٥ی ئابی ١٩٧٤**

**بابەت: رێوشوێنەکانی گەیاندنی چەک و تەقەمەنی بە کوردەکان لە رێگای ئیسرائیلەوە**

ئاماژە بە: WH 42555-

١- وەڵامەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا رۆژی ٢٥ی ئاب تەسلیمی ژنێراڵ نەسیری کرا.[٣٨٩]

٢- باش دەبێت ئەگەر ئیسرائیل موشەکی دژە تانکی SS10وSS11 بۆ کوردەکان دابین بکات بۆ ئەوەی لە بەرامبەردا موشەکی دژە تانکی TOW بدەین بە ئیسرائیل چونکە بڕیاربوە ئەمریکا راستەوخۆ یان لە رێگای ئێرانەوە موشەکی TOW یان چەکوچۆڵی ئەمریکایی دیکە بۆ کوردەکان دابین بکات. خۆتان باشتر لە ئێمە دەتوانن رێوشوین و چۆنیەتی دابینکردنی موشەکی TOW هەڵبسەنگێنن.(رەش کراوەتەوە) دەتوانێت یارمەتی تایبەت بە بەکارهێنانی تۆپخانەی مودێرن و چەکی دژە تانک بدات.

---

[٣٨٩] - ژنێراڵ نیعمەتوڵڵا نەسیری سەرۆکی ساواک (رێکخراوی هەواڵگری و ئاسایشی ئێران) بوو کە پاش رووخانی رژێمی شا دەستبەسەر کرا و لەسێدارە درا. وەرگێڕ

٣- ئیسرائیل و ئێران هێڵێکیان هەیە بۆ دابینکردنی چەک و تەقەمەنی کە لە ڕێگای ئەو هێڵەوە چەک و تەقەمەنی گواسراوەتەوە بۆ کوردەکان. ژینیراڵ نەسیری ڕۆژی ٢٤ی ئاب وتی لە ماوەی ٨ ڕۆژدا ٣٠٠ تۆن چەک و تەقەمەنی دەگاتە ئێران. هەرچەند کە هاتوچۆی دەریایی زۆر لە نێوان بەندەری ئیلات[٣٩٠] و بەندەرەکانی ئێراندا نییە بەڵام ئێران ژمارەیەکی بەرچاو کەشتی فڕۆکەهەڵگری C-130 هەیە.

---

[٣٩٠] ELATH شارێکی ئیسرائیلە کە دەکەوێتە باکووری دەریای سوور-وەرگێڕ

**لە هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا**

**بۆ: هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران، ئێران**

**بە تەواوی نهێنی، هەستیار**

**٢٦ی ئابی ١٩٧٤**

**بابەت: پێشنیارەکانی ئیسرائیل بۆ گەیاندنی چەک بە کوردەکان**

١- سپاستان دەکەم کە زوو وەڵامی پرسیارەکانی منتان[٣٩١] دەربارەی چۆنیەتی دابینکردنی موشەکی دژە تانک بۆ کوردەکان دایەوە.

٢- کاربەدەستانی ئیسرائیل پێشنیارێکی بەرفراوانتریان خستوەتە بەردەستمان. ئیسرائیلیەکان رایانگەیاندوە ئامادەن جگە لەو چەک و تەقەمەنیە کە لە پەیامی پێشوودا ئاماژەمان پێکرد، چەکی دژە تانک و دژە فرۆکەی سۆڤیەت (کە دەستیان بەسەردا گرتوە) بۆ کوردەکان دابین بکەن ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەرامبەردا چەکی ئەمریکایی بدات بە ئیسرائیل. بە گوێرەی پێشنیارەکەی ئیسرائیل، ١٠٠ تا ١٥٠ دانە لە هەر جۆرە چەکێک بدەین بە کوردەکان و کوردەکان فێر بکەین چۆن ئەو چەکانە بەکاربێنن.

---

[٣٩١] مەبەستی ئەو وەڵامەیە کە باڵوێزی ئەمریکا لە تاران لە ٢٥ی ئاب ناردوویەتی بۆ ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت ( بەڵگەنامەی پێشوو). وەرگێڕ

٣- ئیمە ڕەزامەندیمان دەربڕیوە بۆ ئەوەی ئەو چەکانە کە ئیسرائیل پێشنیاری کردوە بخەینە شوێنی چەکەکانی پێشوو. هەروەها لەوانەیە بەیانی زانیاری زیاترمان دەربارەی پلانە تایبەتەکانی ئیسرائیل بەدەست بگات.

ئەوپەڕی ڕێزم

هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوە

**له کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٢**

**٤ی ئەیلوولی ١٩٧٤**

**بابەت: رەهەندەکانی شەڕی کوردەکان لە عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، تاران، بەیروت، کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدانا، خورەمشار، فەرماندەیی هێزی بەشی ئورووپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە واینگینی ئاڵمانیا[٣٩٢] و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد (لە رێگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیرووت).

کورتە: هێرشە بەرفراوانەکەی دەوڵەتی عێراق بۆ سەر هەرێمی ژێر دەسەڵاتی بارزانی کە لە پێشەوە راگەیەندرابوو، دەستی پێکردوە. وادیارە ئیستراتژی دەوڵەتی عێراق ئەوەیە کە لەپاڵ لێواری دەشتەکانی هاوتەریب لەگەڵ سنووری ئێران بچێتەپێش تا بگاتە سنووری تورکیە و پاشان پێگەی خۆی قایم بکات بۆ ئەوەی پێش لە هاتنی پێداویستیەکانی کوردەکان لە ئێران و هاتوچۆی کوردە سڤیلەکان بگرێت. پاشان خەڵکی سڤیل ناچار دەبن لە باتی ئەوەی بچنە ئێران، بەو خواردەمەنیە کەمەی کە لە دەستی کوردەکاندایە و رۆژبەرۆژ کەمتر دەبێتەوە بژین. کوردەکان بە دەستی نەبوونی چەکی دژە تانک و دژە فڕۆکەوە دەناڵێنن کەوابوو ستراتژی شەڕ و زەبروەشاندنی کتوپڕیان گرتوەتە بەر و هاوکات درێژە بە هێرشکردن لە پشتی بەرەی شەڕ دەدەن و هیوادارن کە سپای عێراق ئەوەندە تەنگاو بکەن کە ئیدی پێیان

---

392 VAIHINGEN GER

تەحەمووڵ نەکرێت و کەمکەم ببیتە هۆی ئەوەی یا دەوڵەتی ئێستای عێراق بڕوخێت یا سیاسەتی دەوڵەتی عێراق بگۆڕێت. هێرشە سەرەتاییەکانی عێراق پاش شەڕێکی گران سەرکەوتوو بووە و یەکێ لە دوو ڕێگا سەرەکییەکانی هاتنی پێداویستییەکانی کوردەکان لە ئێرانەوە گیراوە. شەپۆلی ئاوارەکان زیادی کردوە و بە دڵنیاییەوە لە ماوەی چەند هەفتەی داهاتوودا لەوەش زیاتر دەبێت. سەربازانی ئێران لە سەر سنوور لە ئامادەباشیدان بەڵام نیاز و بەرنامەیان روون نیە. ئەم خاڵانە کە ئاماژەیان پێکرا ئەنجامە سەرەکییەکانی دواپین گفتوگۆکانمان لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران، هەواڵنێرە بیانییەکان و کوردەکانی بارزانیە کە لە ڕۆژئاوای ئێران لە نزیک بەرەی شەڕ بینیومانن.

١- کونسولی ئەمریکا لە تەوریز لە ٢٥ تا ٢٨ی ئاب لە ئازەربایجانی ڕۆژئاوا بوە و لەو چەند ڕۆژەدا لەگەڵ ئەم کەسانە پەیوەندی گرتوە: پیتێر ستورکان[٣٩٣]، ڕۆژنامەنووسی بریندارى ئەمریکایی کە لە نەخۆشخانەی پیرانشار تەداوی کراوە، دوو ڕۆژنامەنووسی فەرەنسەیی کە تازە لە بەرەی شەڕ گەڕابوونەوە، ژمارەیەک لە ئەفسەرانی پێشمەرگە، دارا تۆفیق، سکرتیری گشتی بەشی زانیاری، کولتور و لاوانی KDP و ژمارەیەک لە کاربەدەستانی ئێران کە لە نێویاندا ژێنیراڵ ئوتمیشی، قایمەقامی سەردەشت زۆرترین یارمەتی داین.

٢- **سوپای عێراق:** بە وتەی کوردەکان، عێراقیەکان ٦ تیپی تەکوزمەند و ٢ تیپی تایبەت (کە یەکێکیان تایبەتە بە هێزی شاخ) و چەند بەتالیونی سەربەخۆی زیادەی دیکەیان بۆ شەڕ دژی کوردەکان تەیار کردوە. ئەو چەکوچۆڵانەی کە سپای عێراق ئەمجارە لە شەڕدا کەڵکی لێوەردەگرێت زۆر لە چەکوچۆڵی شەڕی پێشوو پێشکەوتووترە و بە تەواوی کەڵک لە فڕۆکەکانی سۆڤیەت (زۆرتر فڕۆکەی مودێلی کۆنی MIG و فڕۆکەی نوێی T-22 و تانکی نوێی T-55 کەڵکوەردەگرێت. سپای عێراق تاکتیکی هێرشکردن بە ژمارەیەکی زۆر سەرباز و بەکارهێنانی ئەو یەکینانەی کە کەم جموجۆڵ دەکەن، بەکار دەهێنێت. سپای عێراق بەدەگمەن لە دژەهێرش لە

393 PETER STURKEN

بەرامبەر بۆمبارانی قورس کەڵک وەردەگرێت هەرچەند کە ژمارەیان لە کوردەکان زۆر زیاترە و پشت بە بۆمبارانی هەوایی و تۆپباران پێش لە دەستپێکردنەوەی هێرشەکانیان دەبەستن. سپای عێراق بە رێکوپێکی مووچەی هێزەکانی دەدات و ئێستا رێژەی هەڵهاتن لە سپا لە رابردوو کەمتر بوەتەوە. کوردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە سپای عێراق راوێژکاری سۆڤیەتیان لە بنکەی رادیۆکەیاندا هەیە و لە سەر ئەو باوەڕەن کە فڕۆکەوانە سوفیەتیەکان فڕۆکەی T-22ی عێراق بەکاردەهێنن بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان بۆ سەلماندنی ئەو بانگەشەیە پێنیە. کوردەکان دەڵێن هێزەکانی عێراق ئەمجارە لە جەنگەکانی پێشوو سەختر و باشتر شەڕ دەکەن و لە جەنگەکانی پێشوو وانەیان وەرگرتوە.

٣- ئامانجی دەوڵەتی عێراق ئەوەیە کە لە رێگای کردنەوەی هێڵێک لەپاڵ سنووری ئێران، رێگای هاتنی پێداویستیەکانی کوردەکان لە ئێرانەوە بگرێت. ٢٢ لیوای سپای عێراق هێرشیان کردوەتە سەر ناوچەکانی باکووری سلێمانی و گەیشتوونەتە قلادزێ و هەفتەی رابردوو قلادزییان گرت. بە وتەی ژنراڵ ئوتمیشی، قایممەقامی سەردەشت، گیرانی قلادزێ بوەتە هۆی ئەوەی رێگای چوونی پێداویستیەکانی کوردەکان لە سەردەشتەوە بگیردرێت. ئێستا تەنها پێداویستیەکانی ١٠ هەزار ئاوارە کە لەو دیوی سنوور کۆبوونەتەوە و چاوەڕێن بێنە ناو خاکی ئێران، لە سەردەشتەوە بۆ کوردەکان دەچێت.

٤- بەشی دووەمی هێزەکانی عێراق کە لە سێ لیوا پێکهاتوە هێرشی کردوەتە سەر ناوچەکانی باکووری رۆژهەڵاتی رواندووز و سەرنجام پاش دوو هەفتە شەڕی بەردەوام لە دەوروبەری شاخە بەرزەکانی زاڵ بەسەر گەلی عەلی بەگ لە دەرەوەی رواندووز رۆژی ٢٣ی ئاب ئەو ناوچانەی گرت. بە وتەی بەڕێز ستورکان، کوردەکان لە شەڕی دواییدا پێگەی خۆیان راگرتوە و زەبری توندیان لە هێزەکانی عێراق وەشاندوە و دوو جار بەرپەرچی هێرشەکانی عێراقیان داوەتەوە و بە چەکی ئاسایی راستەوخۆ هیرشیان کردوەتە سەر تانکەکانی عێراق. کوردەکان تەنها ٧٠ مەخزەن فیشەکیان پێبوە و کاتێک کە فیشەکیان تەواو بوە ناچار بوونە بنکەکانیان بەجێ بێڵن.

هیزەکانی عێراق بە درستکردنی سەنگەر لە هەر نیو مایلێک یان کەمتر لەوەش ڕێگای هاتوچۆی خۆیان قایمتر کردوە و پێگەی خۆیان بە چاندنی مینی دوو سەرەی سۆڤیەتی و درکی ئاسنی قایم کردوە و لە کاتی هێرشی شەوانەدا بە خێرایی یارمەتی هەواییان پێدەگات و نورئەفکەن هەڵدەکەن. پلانی دواتری هێزەکانی عێراق ئەوەیە بەرەو بارزان بچن. ئێستا کوردەکان لە ڕێگای وڵاخەوە پێداویستیەکانیان لە ئێرانەوە بۆ ڕۆژئاوای ناوچەی کوردنشین دەگوازنەوە.

٥- **یارمەتیەکانی ئێران:** ئەو کوردانە کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ گرتن ئەوەیان پشتڕاست کردەوە کە سنووری تورکیە بە تەواوی داخراوە بەڵام پێداویستیەکانیان لە ئێرانەوە بە ئازادی بەدەست دەگات. پێداویستیەکان زیاتر خواردەمەنی، دەواودەرمان و جلوبەرگ لە خۆ دەگرێت هەرچەند کە هەندێ چەکوتەقەمەنی، بڕێکی کەم چەکی دژە فڕۆکە و دژە تانک ئەمدواییە بە دەستی کوردەکان گەیشتوە. پیرانشار(کە لە سەر هەندێ نەخشەدا بە خانێ دەنووسرێت) شوێنی سەرەکی دابینکردنی پێداویستیەکانی کوردەکان لە ئێرانە. لە یەک ڕۆژدا من لە دەوروبەری پیرانشار ١٢ دانە لۆری دوو و نیو تەنی، ١٥ ئوتوموبیلی لاندرۆڤەر و ٦دانە ئوتومونیلی بچوکم بینی کە هی کوردەکانی بارزانی بوو. دەڵێن یارمەتیە سەربازیەکانی ئێران بە بارزانی زیاتر دەبێت بەڵام چەکوتەقەمەنی بە شێوەی سنووردار بە بارزانی دەدرێت.

٦- کوردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئێستا ٧٠ هەزار ئاوارە لە ئێرانن و ٢٠ هەزار ئاوارەی دیکە لە سەر سنوور چاوەڕوانن بێنە ناو خاکی ئێران. ڕۆژنامەکانی ئێران ئامارێکی هاوشێوەیان بڵاو کردوەتەوە. منیش بەگوێرەی ئەو شتانە کە خۆم بینیومە و کاربەدەستانی دیکەی ئێران وەک ئوتمیشی، قایممەقامی سەردەشت پێیان وتووم گومانم لەوەدا هەیە کە ژمارەی گشتی ئاوارەکان لە ٤٠ تا ٥٠ هەزار کەس زیاتر بێت و پێموایە کە بەمزوانە ١٠ هەزار کەسی دیکە بەسەریاندا زیاد دەبێت. بەهەرحاڵ ئەگەر شەڕ هەروا بەم شێوەیە بەردەوام بێت لەوانەیە ژمارەی ئاوارەکان پێش لە زستان بگاتە ٧٠ هەزار کەس یان زیاتریش. ئاوارەکان زیاتر ژن و منداڵ و پیرەپیاوەکانن.

ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەکان لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و عێراق دەسوڕێنەوە بەڵام لە ناو ئوردوگاکاندا نامێننەوە. سەرجەم ئاوارەکان لە نێو ئوردوگاکانی ڕێکخراوی "شیر و خورشید"ی ئێران (مانگی سووری ئێران) جێگیر کراون. کوردەکان خۆیان دۆکتۆر و مامۆستایان تێدایە. بەڕێوەبەری ئیدارەی پەروەردەی ڕەزائیە دەیگوت کوردەکان خۆیان بە زمانی کوردی پەروەردە بە خۆیان دەدەن و ئەوان تەنها بڕێک پێداویستی خوێندن و نووسینیان لەگەڵ دوو مامۆستا (کە خودی کوردەکان بۆ فێرکردنی زمانی فارسی بە مامۆستا کوردەکان داوایان کردوە) بۆ کوردەکان دابین کردوە. دوو ئوردوگای نوێ لە ڕۆژئاوای ئازەربایجان بۆ زستان خەریکە دروست دەکرێت و هەر دیوێکی دەدرێت بە بنەماڵەیەک. هێشتا دۆکتۆرە ئێرانی و پێشمەرگەکان پێکەوە لە نەخۆشخانەکاندا کار دەکەن. ڕوونە کە ئێرانییەکان پێیانخۆش نیە ئەوەندە خۆیان بخەنە ناو کێشەکە. بۆ ڕۆیشتن بۆ ناو ئوردوگاکان مۆڵەت پێویستە و کوردەکان دەڵێن ڕێگایەیان پێنادرێت لای ڕۆژئاواوە زیاتر لە شاری ڕەزائیە بسوڕێنەوە.

٧- سوپای ئێران لە سەر سنوور لە ئامادەباشیدایە. یەکینەکانی سوپا لە ناو بنکەکاندا دەمێننەوە بەڵام ئوتوموبیلەکانیان بەملاولادا دەسوڕێنەوە و چەکی دژەهەوایی و چەکی سووک لە دەوروبەری بنکەکاندا دانراوە. بنکەی هەوایی تەورێز لە ئامادەباشی ٥٠%دایە و فڕۆکەکان بە تەقەمەنیەوە بە شێوەی ئاسایی دەفڕن. دەنگۆکان باس لەوە دەکەن کە سەربازی زیادە لە زەنجان و قەزوینەوە بۆ ناوچەی سنووری بەڕێ کراون. ئامانجی ئێران تەنها بەرگریە چونکە پێکدادانەکانی نێوان کوردەکان و هێزەکانی عێراق لای باشوورەوە ڕووی لە زیادبوونە و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی عێراق ئێستا لە نزیک سنوور چالاکی دەکەن. لە ئێستادا هیچ نیشانەیەک بۆ هێرشکردنی ئێران بەدی ناکرێت و ئامادەباشی هێزەکانی ئێران تەنیا ئامانجی بەرگرییە.

٨- بەلەبەرچاوگرتنی دەسکورتی کوردەکان لە ڕوی چەکوتەقەمەنیەوە، کوردەکان ئەوە دەزانن کە ناتوانن لە بنکەی هەمیشەییدا بمێننەوە. یەکێ لەو کەسانەی کە من

پەیوەندیم لەگەڵدا هەبوو دەیگوت بە فەرماندەکانی هێزی بارزانی گوتراوە کە بۆ ڕاگرتنی هەر بنکەیەک دەبێ ئەوپەڕی چەندە قوربانی بدەن و هەرچی هێزەکانی عێراق زیاتر بەرەو باکوور دێنەپێش کوردەکان زیاتر گرنگی بە بەرگری دەدەن. لە هەمان کاتدا کوردەکان ژمارەیەکی بەرچاو لە هێزەکانیان لە پاڵ جادەکاندا کە عێراق گرتوونی، هێشتوەتەوە و درێژە بە هێرشە سوکەکانیان دەدەن بۆ ئەوەی هێزەکانی عێراق واهەست نەکەن لە هەموو شوێنێکی کوردستان لە ئاسایشدان و ناچار بن ژمارەیەکی زۆرتر لە هێزەکانیان بۆ پاسەوانی دابنێن. کوردەکان هیوادارن کە ڕۆژێ لانیکەم ٣٠ کەس لە هێزەکانی عێراق بکژن ( ٩ هەزار کەس لە ساڵێکدا و ژمارەیەکی زیاتریش بریندار بکەن) و پێیانوایە ئەمە کەم کەم وورەی هێزەکانی عێراق بۆ شەڕ کەم دەکاتەوە و دەبێتە هۆی ڕووخانی دەوڵەتی عێراق.

٩- هەواڵنێرە بیانیەکان، ئێرانیەکان و خۆیشم (بە گوێرەی ئەو شتانەی کە بینیومە) پێمانوایە کە وورەی کوردەکان لە ڕادەبەدەر بەرزە. بە وتەی دۆکتۆرەکان و قایممەقام ئوتمیشی، کوردەکان بە زووترین کات کە بتوانن لە نەخۆشخانە دێنە دەرەوە و دەگەڕێنەوە بۆ بەرەی شەڕ. ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەیانەویت بچنە ڕیزی پێشمەرگەکان لە ژمارەی ئەو چەکانی کە لە دەستی کوردەکاندایە زیاترە. کوردەکان ئێستا زیاتر لە ڕابردوو یەکگرتوون و کوردە خوێندەوارە شارنشینەکان بە لێشاو دەچنە ڕیزی بارزانی. ئەمە یەکێ لە نمونەکانیەتی: لە شەڕی ڕابردوودا پێشمەرگەکان ١٢ دوکتۆریان هەبوو بەڵام ئێستا دەڵێن ٩٢ دۆکتۆر لە کوردستان خزمەت بە پێشمەرگە دەکەن و ٨ تا ١٠ دۆکتۆری دیکە لە نەخۆشخانە و ئوردوگاکانی ئێران خزمەت بە ئاوارەکان دەکەن. ئەو چەکانە کە لە ڕواندوز بۆ هێزە کوردەکان باش کاری کردوە، بە دەستی ٦ ئەفسەری تۆپخانە بەکارهێنراون کە پێشتر لە سپای عێراقدا بوونە. لە سەرەتای شەڕدا هەموو کەسێک هەرچی لە دەستیهات بۆ شۆڕشی کورد کردی و دای لە شاخ. تەنانەت گروپێک لە پولیسە کوردەکانی بەندیخانەی سلێمانی بەندکراوەکانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە بۆ شاخ و بە هۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر بۆ ئازادبوونیان ماوە، ئێستا ماوەی زیندانەکەیان لە بەندیخانەی کوردەکاندا

تێدەپەڕێنن. بەڕێز تۆفیق (دارا) دەیگوت شیوعیەکان ئیدی بۆ (شۆڕشی کورد) هەڕەشە نین و ژمارەیەکی زۆر لە شیوعیە کوردەکان ئێستا شان بە شانی کوردە مەسیحیەکان لەپاڵ بارزانیدا شەڕ دەکەن. من ژمارەیەک لەو کوردە مەسیحیانەم بینی.

١٠- چەک و تەقەمەنی کێشەی سەرەکی کوردەکانە

کوردەکان هەندێ چەکی کۆن، چەکی دژە تانک و دژە فڕۆکە و چەکی دژە تانکی مەوداکورتی RPG-7 یان هەیە. تەقەکردن بە چەکی دژەفڕۆکە، فڕۆکەکانی عێراقی ناچار کردوە لە بەرزایەکی زۆردا بفڕن بەڵام بە هۆی ئەوەی کاری ئەو فڕۆکانە سووتاندنی خەلەوخەرمان و خاپورکردنی گوندەکانە، تەقەکردن لە فڕۆکەکان زۆر گرنگ نیە. هەم هەواڵنێرە بیانیەکان و هەم کوردەکان بانگەشەی ئەوەی دەکەن کە راپۆرتەکانی رادیۆی دەنگی کوردستان راستە دەربارەی ئەوەی کە کوردەکان فڕۆکە و تانکەکانی عێراقیان لە ناو بردوە (ئەو زانیاریانە لە مانگەکانی سەرەتای شەڕدا راست نەبوو بەڵام ئێستا راستە) و ژمارەی کوژراو و بریندارەکانی کوردەکان زۆر لەوەی هێزەکانی عێراق کەمترە. کوردەکان زیاترین قوربانیان لە ناو خەڵکی مەدەنیدا داوە. هەم دۆکتۆرێک لە پیرانشار و هەم بەڕێز دارا تۆفیق دەیانگوت ژمارەی قوربانیانی مەدەنی ئەم شەڕە لە شەڕەکانی پێشوو زۆر زیاترە. کوردەکان ئێستا ٢٠٠ عێراقیان بە دیل گرتوە و دەڵێن سەرجەم دیلەکان لە خاکی عێراقدان و باش هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێت و داوایان لە رۆژنامەنووسەکان کردوە سەردانی دیلەکان بکەن و بە چاوی خۆیان ئەو راستیە ببینن. بە وتەی هەموو ئەو کەسانە کە من قسەم لەگەڵ کردن هیچ کوردێکی ئێران لە عێراق شەڕ ناکات و کوردەکانی بارزانی رایانگەیاندوە کوردەکانی ئێران قبوڵ ناکەن.

١١- **دەرەنجام:** شەڕ بە ئاشکرا پێی ناوەتە قۆناخێکی جدیتر. لەوانەیە هێزەکانی عێراق نەتوانن پێش لەوەی کە زستان فڕۆکە و تانکەکانیان زەمینگیر بکات بە تەواوی بگەنە ئامانجەکەیان. لەوانەیە کوردەکان بتوانن هەندێ لەو شوێنانە بگرنەوە کە لەدەستیان داوە بەڵام ناتوانن تا هاوینی داهاتوو ئەو شوێنانە بپارێزن مەگەر ئەوە

که بڕێکی زۆر چەکی نوێیان بەدەست بگات. لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە جاری پێشوو بۆ ئەوەی پێداویستی تازەیان بەدەست بگات شەڕیان کردوە و درێژە بەشەڕەکەیان دەدەن و بۆیان گرنگ نیە کە چەند شوێنی ئیستراتژیکیان لە دەست داوە و چەندە پێداویستیەکانیان کەمە. کوردەکان هەرچیان پێباش بێت دەیکەن و کارنامەکەشیان تا ئێستا هەر وای نیشان داوە. بەڵام پرسیارێک کە دێتە ئاراوە ئەوەیە کە ئایا دەوڵەتی عێراق، تەنانەت بە پشتیوانی سوڤیەت، دەتوانێت بەردەوامبوونی شەڕ تەحەمول بکات.

نئومان[٣٩٤]

[394] NEUMANN

**له کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٤**

**١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٤**

**بابەت: داواکاریەکی زۆر جیاوازی رێبەرایەتی کوردی عێراق لە ئەمریکا**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، دەمیشق، بەیروت، تاران، کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خورەمشەهر و نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی٠٠٢٠ی کونسولگری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تەورێز

١- مڵکدارێکی کوردی ئێران (کە کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز لە ناوەڕاستی ١٩٥٠کانەوە دەیناسێت) ئەم دوایانە سەردانی کونسولخانەی کرد کە داواکاریەکی زارەکی لە لایەن"کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان"وە پێبوو بۆ ئەوەی ئەمریکا لەرێگای دیپلۆماتیکەوە پشتیوانی لە کوردەکان بکات. ئەو داواکاریە لە داواکاریە پێشووەکانی کوردەکان جیاواز بوو چونکە تێیدا داوای یارمەتی سەربازی یا پشتیوانی راستەوخۆی سیاسی لە ئەمریکا نەکرابوو بەڵکوو تەنها داوای ئەوە کرابوو کە دەوڵەتی ئەمریکا هەوڵ بدات قەناعەت بە دەوڵەتانی عەرەبی، بەتایبەت میسر، بهێنێت دەوڵەتی عێراق رازی بکەن شەڕ لەگەڵ کوردەکان رابوەستێنێت و بە نیازپاکیەوە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان وتووێژ بکات. لەو داواکاریەدا جەخت لە سەر لایەنە مرۆڤدۆستانەکانی شەڕ و مەسەلەی ئاوارەکان، گوندە رووخاوەکان و کوژران و برینداربوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەدەنی کورستان کرابوو. هەروەها

به هەمان شێوە کە لە داواکاریەکانی پێشووی کوردەکاندا باس دەکرا، ئەم داواکاریەش جەختی لە سەر تایبەتمەندی دژە کومونیستی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق کردبووەوە.

٢- منیش هەر وەک جاران لە وەڵامدا وتم دەوڵەتی ئەمریکا خۆی ناخاتە ناو کاروباری ناوخۆیی وڵاتێکی دیکە بەڵام وتم پەیامەکەیان دەنێرم بۆ کاربەدەستانی ئەمریکا. داواتان لێدەکەین ڕێنوێنیمان بکەن چۆن وەڵامی ئەم داواکاریەی کوردەکان بدەینەوە، چونکە ئەم داواکاریە لە داواکاریەکانی پێشووتری کوردەکان زۆر جیاوازە. لەوانەیە ئەو بابەتە تەنیا یەکجار بخرێتەڕوو بەڵام ئەگەر ڕۆژنامەکان گەورەی بکەنەوە، سیاسەتی ئێمە بۆ دەستێوەرنەدان لەو مەسەلەیە لە سەر بنەمای مرۆڤدوستانە باش ناچیتە پێش، هەروەها کە لە مەسەلەی بیافرا[٣٩٥] و بروندیدا[٣٩٦] بینیمان.

٣- هەڵسەنگاندنی کونسولخانە: پێش ئەوەی وەڵامی کوردەکان بدەینەوە، لەوانەیە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە قاهیرە بیەوێت بۆچوونی خۆی بەنیسبەت ئەو مەسەلەیە دەرببڕێت. ئێمە نازانین دەوڵەتی میسر چەندە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق تێکەڵە، تەنانەت لە ڕووی کاروباری مرۆڤدۆستانەشەوە. کاربەدەستانی ئێران بە نیسبەت دەستڕۆیشتوویی وڵاتانی عەرەبی لە عێراق بەدگومانن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر وەزارەتی دەرەوە پێیوایە کە ئێمە دەبێ هەندێ هەنگاوی ئەرێنی بۆ وەڵامدانەوە بە داواکاریەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵبگرین، بە بۆچوونی من دەبێ دەوڵەتی ئێران ئاگادار بکەینەوە کە دەمانەوێت چی بکەین. ئەگەر وا بکەین، دەتوانین ئەوەش تاقی بکەینەوە کە دوستایەتیە نوێکەی عێراق و میسر لە چی ئاستێکدایە.

نئۆمان[٣٩٧]

---

395 BIAFRA
396 BURUNDI
397 NEUMANN

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران بۆ:**

**وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٨٣٧٣**

**٢٧ی ئەیلولی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: لێدوانی ڕێبەرە کوردەکان دەربارەی یارمەتی نێونەتەوەیی بە کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، مۆسکۆ و تلابیب

١- فرانک هاڤکینز[٣٩٨]، هەواڵنێری بەشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی AP هاوڕێ لەگەڵ جەیمس کلاریتی[٣٩٩]، هەواڵنێری ڕۆژنامەی "نیویورک تایمز"، ڕۆژی ٢٢ی ئەیلول لە سەفەرە سێ ڕۆژیەکەی لە بەرەی شەڕی کوردستان گەڕایەوە. هاڤکینز بە باڵوێزخانەی وت ئیدریس بارزانی و مەحوود عوسمان، وەزیری تەندرستی[٤٠٠]، هاتون بۆ تاران بۆ ئەوەی بەرواڵەت لەگەڵ کاربەدستانی (ڕێکخراوی)"شیروخورشید" راوێژ

---

398 FRANK HAWKINS

399 JAMES CLARITY OF NYTIMES

٤٠٠- شۆڕشی ئەیلوول وەزارەتێکی بە ناوی وەزارەتی تەندرستی نەبوە تا دۆکتۆر مەحموود عوسمان وەزیری بێت بەڵام لە ناوچە ئازادکراوەکان بەڕێوەبەرایەتی کاروباری کۆمەڵایەتی هەبوە کە یەکێ لە ئەرکەکانی چارەسەرکردنی نەخۆشی خەڵک و دابینکردنی دەواودەرمان بووە. وەرگێڕ

بکەن. سەرچاوەکانی دیکە تا ئێستا هیچ وردەکاریەکی دیکەیان لەم پەیوەندیەدا بڵاو نەکردوەتەوە.

٢- هاڤکینز سەرەتا چوار راپۆرتی لە رۆژی ٢٥ی ئەیلوول ناردوە و ئاماژەی بە زانیاریەکانی کوردەکان دەربارەی یارمەتیە بەرفراوانەکانی سۆڤیەت بە هێرشەکانی سپای عێراق دژی کوردەکان کردوە. کوردەکان بە هاڤکینگیان وتوە: "سۆڤیەت بە فرۆکەی پێشکەوتووی Su- 20 و Tu- 22 کوردەکان بومباران دەکات چونکە فرۆکەوانەکانی عێراق هێشتا لەو ئاستەدا نین کە بتوانن ئەو فرۆکانە بەکار بێنن. بنکەی چالاکیە هەوایەکانی عێراق لە بەغداد لەلایەن ژینیراڵ ڤلادیمیر نیکۆلای[٤٠١] روسییەوە بەرێوەدەبردرێت".

کوردەکان هەروەها وتویانە کە کۆلۆنیل ئالیکساندیر واسیلیڤ[٤٠٢] وەک راوێژکاری (بنکەی هەوایی) کەرکوک گەلێ هێرشی هەوایی دژی کوردەکان ئەنجام دەدات. لە راپۆرتەکەی "فرانک هاڤکینگ"دا هاتوە کە کوردەکان داوای پشتیوانیان لە ئەمریکا کردوە و ئاماژەی بە لێدوانەکانی مەلا مستەفا بارزانی دەربارەی یارمەتیدانی ئێران بە ئاوارەکان کردوە کە وتویەتی: "شا بۆ ئێمە باش بوە بەڵام ئێمە پێویستمان بە چەکی زیاترە". راپۆرتەکەی هاڤکینز رۆژی ٢٦ی ئەیلول لە رۆژنامەی "تهران" بڵاو بوەوە (سەیری تیلیگرامی ٧٤/٩/٩ بکەن) بەڵام هیچ ئاماژەیەک بە هەڵسەنگاندنەکانی خۆی و مەسەلەی یارمەتی ئێران بە کوردەکان و داواکاری کوردەکان بۆ یارمەتیدانی ئەمریکا نەکرابوو.

٣- ئاندرۆ مورای[٤٠٣]، هەواڵنێری رۆژنامەی "ساندی تایمز[٤٠٤]"، سێ راپۆرتی دەربارەی شەڕی کوردەکان ئامادە کردوە کە لە رۆژنامەی "کەیهان بین المللی"دا بڵاو بوەوە. لە راپۆرتەکەی رۆژی ٢٤ی ئەیلوولی "ئاندرۆ مورای"دا ئاماژە بە لێدوانەکانی مەسعود بارزانی کرابوو کە وتبووی: "ئامریکا تەنانەت وەڵامی داواکاری ئێمەشی نەداوەتەوە،

---

401 GEN.VALDIMIR NIKOLAI.
402 COL. ALEXANDER VASILEV
403 ANDREW MURRAY
404 SUNDAY TIMES

ئیسرائیل هیچمان پێنادات، کاشکای ئەو شتانە کە رادیۆ بەغداد دەربارەی یارمەتی مادی سەهیونیست و ئیمپریالیستەکان بە ئێمە دەیڵێت، راست بوایا بەڵام راست نیە." هاڤکینگ دەڵێت مەسعود بارزانی روانگەیەکی جیاوازی دەربڕیوە و پێیوتوە:" ئێران بێ رەزامەندی ئەمریکا چەک بە ئێمە نادات. تەنانەت ئیسرائیلیش دەبێ بە رەزامەندی ئەمریکا یارمەتیمان بداَت".

هەڵسەنگاندن: زیادبوونی ژمارەی کوژراو و برینداراەکانی شەڕ و سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ تێکشکاندنی کوردەکان، جارێکی دیکە رۆژنامەنووسەکانی هان داوە سەردانی ناوچەی کوردنشینی عێراق بکەن. مەسەلەی یارمەتی نێونەتەوەیی بە کوردەکان، خاڵی هاوبەشی ئەو وتارانەیە کە بڵاو بوەتەوە و چاوەڕوان دەکرێت ئەو مەسەلەیە بەردەوام بێت.

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی١٢٦٥**

**٢٠ی ئەیلولی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: دوایین هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد و بارزانی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، مۆسکۆ، تاران و کونسولخانەی ئەمریکا لە ئەدانا و تەورێز

دەمەوێت ئەم هەڵسەنگاندنانەی خوارەوە دەربارەی تیلیگرامە زۆر باشەکەی کۆنسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز(کە باشترین و تەواوترین راپۆرتێکە کە من دەربارەی هێرشەکەی مانگی ئابی عێراق دژی کوردەکان بینیومە) بهێنمە بەرباس:

١- زانیاریەکانی سەرچاوە سەربازیەکانی بەغداد نیشان دەدات کە تەواوی سپای عێراق(جگە لە دوو برێگاد لە بەغداد و سێ برێگاد لە بەسرە) لە هێرشی عێراق بۆ سەر کوردەکان بەشدارن بۆ ئەوەی پێش لە زستان بارزانی بە تەواوی لە ناو ببەن. بەهەرحاڵ بەردەوام کۆمەڵێک راپۆرت بڵاو دەبێتەوە کە کوردەکان دیسان قڵادزێیان گرتوەتەوە و دەیانەوێت رواندوزیش بگرن بەڵام هێرشەکەیان راوەستێنراوە. زانیاریە نوێە مەترسیدارەکان ئەو مەسەلەیە پشتڕاست دەکەنەوە کە هێزەکانی سپای ئێران رەوانەی ناوچەی سەر سنووری قڵادزێ کراون و بە تۆپی ١٧٥ میلیمیتری بە توندی پشتیوانی لە کوردەکان دەکەن.

٢- کاربەدەستێکی هەواڵگری باڵوێزخانەی هیند کە بەردەوام زانیاری باشی لایە، پێیوایە کە ئێستا عێراق بەشێوەیەکی بەرفراوان کەڵک لە فڕۆکەی Tu-22s وەرناگرێت چونکە روسەکان ئێستا بەو فرۆکانە فڕۆکەوانەکانی عێراقی لە بنکەی هەوایی حەبانیە رادەهێنن. ئەو کاربەدەستە هیندیە هەروەها وتی هێزی زرێپۆشی عێراق ئێستا نە تەنها تانکیT-55s بەڵکوو تانکی مودیلی نوێی T-62ی سۆڤیەتیش بەکار دەهێنێت و ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم دوایانە رێکەوتنێکیان لەگەڵ عێراق واژۆ کردوە بۆ ئەوەی بە پەلە پێداویستی جلوبەرگی زستانانەی ١٥٠ هەزار کەس بۆ عێراق دابین بکەن. کاربەدەستە هیندیەکە وتی عێراق ئامادەیە کەشتیەکی تایبەت بۆ گوازتنەوەی ئەو پێداویستیانە رەوانە بکات. ئەو رێژە زۆرە پێداویستیانە کە عێراق داوای کردوە، راستبوونی ئەو راپۆرتە زیاتر دەسەلمێنێت کە دەوڵەتی عێراق رۆژ بە رۆژ کەڵکی زیاتر لە عەشیرەتەکانی باشووری عێراق وەک هێزێکی نیمچە سەربازی وەردەگرێت.

٣- وادیارە رژیمی عێراق رۆژ بە رۆژ زیاتر ترسی ئەوەی لێدەنیشێت کە کوردەکان بە ئەنجامدانی هێرش لە بەغداد وەڵامی دەوڵەتی عێراق بدەنەوە. ئەو رێگانەی کە دەچن بۆ شوێنی سەرچاوەکانی ئاوی خواردنەوە بە تەواوی داخراون و پاسەوان لە شوێنی نوێ، لەوانە لە نیو ئەو ئاپارتمانانە کە تیکنیسیەنە روسیەکان و بنەماڵەکانیان تێیاندا دەژین، دانراوە. بازرگانێکی ئەمریکایی کە رۆژی ١٦ی ئەیلوول سەردانی کەرکوکی کردبوو، دەیگوت ژمارەیەکی زۆر سەرباز لە پاڵ رێگا سەرەکیەکان دانراون و ژمارەی هێزەکانی عێراق لە دەوروبەری سەرچاوەکانی نەوت زیاتر کراوە.

٤- هەڵسەنگاندن: زۆربەی شارەزایانی ئێرە پێیانوایە هێرشەکانی عێراق پێش لە زستان ناگات بە ئامانجی خۆی. شەڕ هێور دەبێتەوە و هێزەکانی عێراق ناچار دەبن لەو شوێنانەی کە گرتویانە پاشەکشە بکەن (هەروەها کە پاش هێرشەکانی ٦٠کاندا وایان دەکرد) و بەهاری داهاتوو دەست بە هێرشەکانیان بکەنەوە. چاوەڕوان دەکرێت لە وەرزی زستاندا عێراق بۆ ئەوەی تەنگ بە بارزانی هەڵچنێت، هەوڵ بدات پێش لە هاتنی پێداویستی و چەکی قورس لە ئێرانەوە بۆ لای بارزانی بگرێت و هێزە

کوردەکانی نەیاری بارزانی زیندوو بکاتەوە. من ناتوانم ئەو راپۆرتانەی رۆژنامەکانی بەیروت پشتڕاست بکەمەوە کە دەڵێن وتوویژ لە نێوان بارزانی و دەوڵەتی عێراقدا دەستپێکردوەتەوە.

ه- ئەگەر راپۆرتی کەڵکوەرگرتن لە توپخانەی ئێران راست بێت، ئەوە نیشان دەدات کە پشتیوانی ئێران لە کوردەکان بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەیسەندوە و شەڕ لە سەر سنوورەکانی ئێران و عێراق زیاتر بوە.

لۆڤری

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی١٢٩٧**

**٣٠ی ئەیلوولی ١٩٧٤**

**بابەت: خۆشبینی سۆڤیەت بە چارەسەربوونی کێشەی کورد لە عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەدەنە، ئانکارا، بەیروت، مسکۆ، تاران و کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٦٣١و ٦٥١ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- ئەو راپۆرتە کە باسی لەوە دەکرد کە کوردەکان کەڵک لە تۆپخانەی قورسی ئێران وەدەگرن یا لەلایەن توپخانەی قورسی ئێرانەوە پشتیوانیان لێدەکرێت( کە لە تیلیگرامی ٦٣١ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە ئاماژەی پێکرا) ئێستا لە هەموو شوێنێک بڵاو بوەتەوە. باڵوێزی پاکستان لە عێراق رۆژی ٢٩ی ئەیلوول پێمیوت وەزیری ناوخۆی عێراق، سەعدون خەیدان[٤٠٥] باڵوێزی سومالی ئاگادار کردوەتەوە کە کوردەکان ئێستا تۆپی ١٥٠ میلیمیتریان هەیە[٤٠٦].

---

[405] SADOUN GHAIDAN

[٤٠٦]- هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە تیلیگرامێکدا بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران لە تشرینی دووەمی ١٩٧٤ ئاماژەی بەوە کردوە کە جیم هۆگلەند، هەواڵنێری رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست" لە ژمارەی رۆژی ١٥ی تشرینی دووەمی ئەو رۆژنامەیەدا بڵاوی کردوەتەوە کە

٢- کاربەدەستێکی باڵوێزخانەی هیند لە عێراق پێمیوت کە ئامانجی سەرەکی سەفەرەکەی وەزیری دەرەوەی عێراق، تاقا[٤٠٧] بۆ مسکۆ ئەوەیە کە دەربارەی شەڕی کورد (بەتایبەت پشتیوانیکردنی ڕوولەزیادبوونی ئێران لە بارزانی) لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەت گفتوگۆ بکات. وەزیری دەرەوەی عێراق دەیەوێت سۆڤیەت گوشار بخاتە سەر ئێران کۆتایی بە پشتیوانیکردن لە بارزانی بهێنێت. تاقا هەروەها لەوانەیە بواری سەفەری سەدام حوسەین، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، بۆ موسکۆ لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەم خۆش بکات.

٣- کاربەدەستانی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە عێراق دەربارەی سەفەرەکەی تاقا بۆ مۆسکۆ هیچ ناڵێن. بەرپرسی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە عێراق، پۆپۆڤ[٤٠٨] ڕۆژی ٢٩ی ئەیلوول پێمیوت ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بە چارەسەربوونی کێشەی کورد خۆشبین دەبێت چونکە دەوڵەتی عێراق ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی کوردستانی دامەزراندوە و کوردەکان بۆ یەکەم جار لە مێژوودا دەبن بە خاوەن ئیدارە. بەهەرحاڵ ئەم هەڵسەنگاندنەی پۆپۆڤ لە ڕادەبەدەر خۆشبینانەیە چونکە ئەندامە کوردەکانی ئەو دوو ئەنجومەنە نوێنەرایەتی گەلی کورد ناکەن و هەموویان لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە هەڵبژێردراون. بەگوێرەی زانیاریەکان حیزبی شیوعی عێراق گوشاری زۆری هیناوە بۆ ئەوەی لەناو سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی کوردستان نوێنەری هەبێت. دەوڵەتی عێراق تا ڕادەیەک ملکەچی ئەو گوشارانەی حزبی شیوعی بوە و سەرچاوەیەکی هەواڵگری هیندی پێمیوت ٨ کەس لەو ١٤ ئەندامەی ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی کوردستان کە ڕۆژی ٢٤ی ئەیلول هەڵبژێردراون، شیوعین.

---

"بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی زۆر باوەڕپێکراو، ئێران موشەکی دژەتانکی دووربیندار و هەروەها تۆپی قورسی داوە بە کوردەکان. لە وتارەکەی ڕۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست"دا هەروەها هاتوە کە ئێران خاوەن موشەکی SS11-SS12 ی فرانسە و موشەکی TOW ی ئەمریکاییە". (وەرگێڕ)

407 TAQA
408 POPOV

٤- دەوڵەتی عێراق ١٠٥ ڕۆژنامەنووسی بیانی بانگهێشت کردوە لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان (ئەنجومەنی نوێنەران) لە هەولێر لە ڕۆژی ٥ی تشرینی یەکەم بەشداری بکەن و بەمشێوەیە ڕژیمی عێراق دەیەوێت پرۆپاگەندای خۆی دەست پێبکات.

**لە کونسولخانەی ئەمریکا لە تەوریز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی**

**٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤**

**بـــابەت: دوایـــین زانیارییەکـــان دەربـــارەی سیاســـەتە ناوخۆییەکـــانی PDK و پەیوەندیەکانی شا و بارزانی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران، بەیروت، دەمیشق، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و کونسولخانەی ئەمریکا لە خورەمشار و ئادانا

**کورتە**: بە وتەی سەرچاوەیەکی کوردی دانیشتووی بەیرووت، ئێران مانگێ ١٠ میلیون دولار یارمەتی بە شۆڕشەکەی مەلا مستەفا بارزانی دەدات. شا بەڵێنی بە بارزانی داوە ئەوەندە پشتیوانی لێبکات کە عێراق بە سەریدا زاڵ نەبێت و بەڵێنەکەی خۆیشی بە گشتی بردوەتە سەر بەڵام پێیخۆشە کۆنترۆڵی شەڕەکەی زیاتر لە دەستدا بێت. هەوڵەکەی ئەمدوایەی عەشیرەتێکی کورد بۆ دژایەتیکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) بە تەواوی شکستی هێناوە و بارزانی هەروا لە سەرووی هەموو رێبەرەکانی دیکەی کوردەوەیە. لە هەمان کاتدا کوڕەکانی مەلا مستەفا، ئیدریس و مەسعود رۆژبەرۆژ زیاتر رێبەرایەتی شەڕ دەگرنە دەست و لە ئەگەری کۆچی دوایی باوکیاندا دەتوانن بێ هیچ ململانێیەکی رێبەرایەتی جدی، کۆنترۆلی تەواوی (خەبات) بەدەستەوە بگرن.

ئەمانە کە باس کرا تەوەرە سەرەکیەکانی دوو گفتوگۆی ئێمە لە بەیرووت لەگەڵ ئەندامی بنەماڵەیەکی ناسراوی شیعەی[409] عێراقە کە واسیتەی سەرەکی ئەو رۆژنامەنووسە بیانیانەیە کە دەیانەوێت سەردانی کوردستانی عێراق بکەن. باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیرووت کە بۆ ئەم گفتوگوانە ئاسانکاری کردوە، بەو ئەنجامە گەیشتوە کە ناوبراو سەرچاوەیەکی زۆر باوەرپێکراوە. ئەمە دەقی وتووێژەکەی ئێمە لەگەڵ ئەو سەرچاوەیەیە:

---

409 – Shiite

**یادداشتنامەی گفتوگۆکان**

**٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤**

**بەشداربوان:**

**- سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو**

**- ڕۆناڵد نئومان، کونسولی ئەمریکا لە تەورێز**

**کات و شوێنی گفتوگۆ: ٢٥ و ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٤، بەیرووت**

**بابەتی گفتوگۆ: شەڕی کورد و عێراق و بەشداری ئێران لەو شەڕەدا**

هەمووی ئەو شتانەی خوارەوە لە لایەن سەرچاوەکەوە خراوەتەڕوو مەگەر ئەو شتانە کە دیاری کراوە.

**پەیوەندیەکانی کوردەکان و ئێران**

١١ی ئاداری ١٩٧٤ خودی بارزانی لەگەڵ شا دیداری کردوە و شا بەڵێنی پێداوە ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتی عێراق شەڕ بکات، ئەوەندە یارمەتی دەدات کە دەوڵەتی عێراق بەسەریدا زاڵ نەبێت. لە کردەوەدا ئێستا شا مانگانە ١٠ میلیون دولار یارمەتی بارزانی دەدات جگە لە خەرجی یەکجار زۆری بەخێوکردنی ئوردوگای ئەو ٨٠ هەزار ئاوارە کوردەی عێراق کە لە ئێرانن. بارزانی ئەو ١٠ میلیۆن دولارە بە پارەی نەخت لە ئێران وەردەگرێت و لە بەرامبەردا پارەی هەموو ئەو شتومەکانەی پێدەدات کە لە ئێران دەیکرێت. سەرجەم پارەکە ڕاستەوخۆ دەدرێت بە بارزانی و هیچ پارەیەک نادرێت بە کۆمیتەی ناوەندی PDK یا سەرۆکی عەشیرەتەکان.

کوردەکان دەزانن کە ئێران هەوڵ دەدات بەکاریان بهێنێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مەمنوونی ئێرانن. هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە بارزانی بە تەواوی متمانەی بە شا نیە بەڵام ئەوە دەزانێت کە تەنانەت ئەگەر کوردەکان بە ئۆتونومی یان تەنانەت سەربەخۆییش بگەن، بە پشتیوانی ئێران گرێدراو دەبن و پێویستیان بە پشتیوانی ئێران بۆ هەناردەکردنی نەوتی کوردستان بۆ دەرەوە دەبێت. کەوابوو بوونی پەیوەندی باش و درێژخایەن لە نێوان کوردەکان و ئێران هەم مەسەلەیەکی بنەڕەتیە و هەمێش دەلویَ (ئیمکانی هەیە). بە قبوڵکردنی ئەم پەیوەندییە، نیگەرانیەکانی شا سەبارەت بە کوردەکانی ئێران دەتوانێت کەمتر بێتەوە چونکە ئەوە بە قازانجی کوردەکانی عێراقە کە کوردەکانی ئێران بێدەنگ بن.

لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان و شا لە سەر هەندیَ مەسەلە ناکۆکن. شا پێیخۆشە زیاتر کۆنترۆلی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراقی لە دەستدا بیت و دەیەوێت بە شێوەیەک یارمەتیەکانی بە کوردەکان دابەش بکات کە بتوانێت بە شێوەیەکی خۆڕسک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی دیکە پشتیوانی بکات بەڵام بارزانی ئەمەی ڕەت کردوەتەوە هەروەها کە پێشی لە هەوڵەکانی دەزگای هەواڵگری ئێران (SAWAK) بۆ درستکردنی تۆڕی سیخۆڕی لە ناوچەی کوردنشین گرتوە. ئێران سەرەتا داواکاری بارزانی بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بۆ پێکهێنانی دەزگای ئیداری مەدەنی چرپپرتری PDK لە ناوچە کوردنشینە دابڕاوەکان ڕەت کردوەتەوە.

**تێبینی**: باڵوێزخانەی بەیرووت کۆمەڵێک ڕاپۆرتی لە سەرچاوەکانی دیکەوە بەدەستگەیشتوە کە نیشان دەدات ئەو شتانە کە لەم دوو ڕستەی دواییەدا باسکرا، ڕاستە.

## سیاسەتە ناوخۆییەکانی کوردەکان

کوردەکان لە ڕادەبەدەر یەکگرتوون. تەنها هەوڵێکی جدی کە ئەمدوایانە بۆ تێکدانی دەسەڵاتی بارزانی درا، لە لایەن بەشێک لە عەشیرەتی هەرکیەوە بوو بەڵام ئەو هەوڵە بە تەواوی شکستی هێنا و بە ڕێبەرایەتی یەکیَ لە دوو براکانی (سەرۆکی

عەشیرەتی هەرکی) ۳ تا ٤ هەزار کەس لە ئەندامانی عەشیرەتی هەرکی ناچار بوون بچن بۆ تورکیە و لەوێوە بە دەوروبەردا بڵاو ببنەوە و بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی عێراق. ماباقی ئەندامانی عەشیرەتی هەرکی بە ڕێبەرایەتی برایەکی دیکەی (سەرۆکی عەشیرەتی هەرکی) ئێستا درێژە بە شەڕکردن لەگەڵ بارزانی دەدەن.

**هەڵسەنگاندن:** بە هۆی ئەوەی کە ئەو ناوچەیە کە هەرکییەکان تێدا دەژین لەپاڵ سنووری ئێراندایە، ئەم سەرپێچیە سەرکەوتوەی ئەوان دەیتوانی هەڕەشەی جدی بۆ هاتوچۆی شتومەک لە ئێرانەوە بۆ هێزەکانی بارزانی دروست بکات بەڵام شکستهێنان و دابەشبوونی عەشیرەتی هەرکی لە کاتێکدا کە بارزانی لەگەڵ هێرشێکی گەورەی عێراق ڕووبەڕوویە نیشانەی یەکگرتوویی گشتی کوردەکانە.

## پێکهاتەی ڕێبەرایەتی PDK

هاوکات لەگەڵ ئەوەی مەلا مستەفا خۆی سەرجەم بریارە سەرەکیەکان دەردەکات بەڵام دەسەڵاتی شەڕی داوە بە ئیدریس و مەسعودی کوڕی. ئیدریس ئۆپەراسیونە سەربازیەکان فەرماندەیی دەکات و مەسعود دەزگای هەواڵگری بەڕێوەدەبات و سەرکەوتنی زۆر باشی لە کاری خۆیدا تۆمار کردوە کە یەکێ لەوانە ئەوەیە کە بە تەواوی دەستی بە پلانی هێرشی ئەمساڵی عێراق گەیشتوە و پارساڵ مەسەلەی ناردنی چەکوتەقەمەنی لەلایەن پاکستان بۆ عێراق ئاشکرا کرد (باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت ئەو داستانەی لە سەرچاوەیەکی دیکە وەرگرتوە). ڕێژەی ئەو دەسەڵاتە کە ئیدریس و مەسعود هەیانە نیشان دەدات کە ئەگەر هاتوو بارزانی کۆچی دوایی بکات، ئەوان دەتوانن بێ کێشەیەکی ئەوتۆ ڕێبەرایەتی تەواوی (خەبات) بەدەستەوە بگرن.

لە دەرەوەی بنەماڵەی بارزانی، هیچ ڕێبەرێکی دیکە خاوەن دەسەڵاتی ڕاستەقینە نیە. جەلال تاڵەبانی کە ماوەیەک پشتیوانیەکی باشی لێدەکرا، زۆربەی هاوڕێکانی دەستیان لێکێشا و خۆی ئێستا لە بەیروتە. جەلال تاڵەبانی وەک واسیتەی سەرەکی پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ عەرەبە چەپەکان کار دەکات بەڵام لە ڕاستیدا نە کارێکی

ئەوتۆ دەکات و نە دەسەڵاتێکی راستەقینەشی هەیە. دارا تۆفیق، سەرنووسەری پێشووی رۆژنامەکەی PDK لە بەغداد (مەبەستی رۆژنامەی التاخی یە - وەرگێڕ) و سەرۆکی ئێستای بەشی زانیاریی PDK متمانەیەکی ئەوتۆی پێناکرێت چونکە وەک لایەنگری پێشووی بەعس سەیر دەکرێت و تا کاتی دەستپێکردنی ( هێرشی دەوڵەتی عێراق) پێداگری دەکرد کە دەوڵەتی عێراق درێژە بە وتووێژ لەگەڵ کوردەکان دەدات و هێرش ناکاتە سەر خەڵکی مەدەنی.

**رەوتی شەڕ:**

ئەو سەرچاوەیە پێداگری لە سەر ئەوە دەکات کە کوردەکان رواندوزیان گرتوە و هێشتا شاخە ئیستراتژیکەکانی دەوروبەری شاریان بەدەستەوەیە هەرچەند کە سەربازانی عێراق لە لێوارەکانی خواری شارەوە جێگیر بوونە. هێرشی عێراق رووی لە کۆتاییە و کوردەکان خۆیان ئامادە دەکەن لە کەشوهەوای زستان کە زوو دەست پێدەکات کەڵک وەربگرن.

**تێبینی:** ئەو زانیاریانە کە ئێستا لە ئێران دەست دەکەوێت کۆنترۆڵی کوردەکان بەسەر شاری رواندوز پشتڕاست ناکەنەوە.

**کوردەکان داهاتوو چۆن دەبینن؟**

کوردەکان هێشتا لە سەر ئەو باوەڕەن کە بەردەوامبوونی شەڕ کەمکەم دەبێتەهۆی رووخانی رژیمی ئێستای عێراق و لەوانەیە ببێتە هۆی هەڵوەشانەوەی تەواوی پێکهاتەی بەعس. کوردەکان ئاماژە بە کۆمەڵێک رووداوی بچووک دەکەن (وەک سەرهەڵدانی یاخیبوونی بچوک - بچووک لە ناو یەکینەیەکی سپای عێراق، تۆڕەبوونی ژنراڵەکان لە دیدار لەگەڵ سەدام حوسەین و لەسەرکارلابرانی سەرۆکی دەزگای هەواڵگری عێراق) بۆ ئەوەی نیشان بدەن کە ناکۆکی و درزێک لە نێوان دەسەڵاتدارانی عێراقدا هەیە. کوردەکان ناتوانن پێشبینی ئەوە بکەن کە چەندە کات بۆ رووخانی رژیمی ئێستای عێراق پێویستە بەڵام پێیانوایە کە دەتوانن درێژە بە

خەباتی خۆیان بدەن تا ئەو کاتە کە رژیمی عێراق دەڕووخێت و توندبوونی شەڕ دەیسەلمێنێت کە هەر رژیمێکی عێراق کە لە بەرامبەر ئاشتی لە پێناو پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی و پێشخستنی وڵاتدا خۆی بە بەرپرسیار بزانێت پێویستە بە شێوەی راستەقینە لەگەڵ کوردەکان سازش بکات.

هەرچەند کە شتێکی لۆژیکییە کە وابیر بکەینەوە کە کوردەکان بۆ کۆتاییپێهاتنی ئەم هەموو خوێنڕژتنە داوای سەربەخۆیی بکەن بەڵام ئەو سەرچاوەیە کە ئەم زانیاریانەی داپێمان دەڵێت بارزانی وەک رێگاچارەیەکی راستەقینە سەیری سەربەخۆیی ناکات. بارزانی بەردەوام داوای ئۆتونومیەکی راستەقینە لە ناو عێراق و داهاتی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکووک (یان لانیکەم بەشێک لەو داهاتە) و بەشداریکردن لە دەوڵەتی نوێ بەغداد دەکات و هەتا کاتێک کە ئەم ئامانجانە بەدی نەهاتوە، شەڕ درێژەی دەبێت.

نئومان

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی١٣٨٧**

**٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤**

**بابەت: ناڕەزایەتی توندی دەوڵەتی عێراق لە یارمەتیدانی ئێران و ئیسرائیل به کوردەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئەمان، ئانکارا، بەیروت، قاهیره، مۆسکۆ، دەمیشق، لەندەن و تاران.

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٦٦٦ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- رۆژی ٥ی تشرینی دووەم، باڵوێزی بریتانیا له عێراق، گراهام[٤١٠] بۆ وەزارەتی دەرەوەی عێراق بانگهێشت کراوه و ژورێکیان پێنیشانداوه که پڕ بووه لەو چەک و پارچە تەقەمەنیانە که هی ئێران، ئەمریکا و ئیسرائیل و وڵاتانی دیکه بووه. جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق، حەدیسی[٤١١] وتوویەتی ئەو چەکانه له بەرەی شەڕ لەگەڵ کوردەکاندا دۆزراونەتەوه و ئەوه دەسەلمێنێت که ئێران بەشێوەیەکی بەرفراوان یارمەتی کوردەکان دەدات. حەدیسی بەتایبەت ئاماژەی به گوله تۆپی 175 MMی درستکراوی ئەمریکا کردووه و وتوویەتی تۆپخانەی ئێران له دەوروبەری قلادزێ به

---

410 GRAHAM
411 HADITHI

توندی هێزەکانی عێراقی تۆپباران کردووە. حەدیسی داوای هیچی لە بریتانیا نەکردووە و دەوڵەتی ئەمریکاشی تۆمەتبار نەکردوە کە یارمەتی کوردەکان دەدات.
٢-باڵوێزی میسر لە عێراق، النجار، پێمیوت نوێنەری وڵاتانی عەرەبیش ئەم حەوتویە بانگهێشت کراون ئەو پێشانگایە ببینن. النجار وتی هەندێ لەو چەکانە کە ئیسرائیل لە کاتی شەڕ لەگەڵ میسر لە ١٩٦٧دا دەستی بەسەردا گرتوە، لە ناو ئەو پێشانگایەدا هەیە. النجار بەتایبەت زۆر لە هێرشەکانی تۆپخانەی ئێران تورە بوو چونکە پێیوابوو کە دەربڕی دەستێوەردانی راستەوخۆی ئێران لە مەسەلەکەدایە.
٣- النجار وتی یەکێتی عەرەب کومیتەیەکی بۆ "تاوتوێکردنی پەیوەندیەکانی عێراق - ئێران و بارودۆخی کەنداو" لە کۆبوونەوەی ئەو رێکخراوەیە لە رەبات (پایتەختی مەغریب) دامەزراندوە کە لە نوێنەری عەرەبستانی سعودی، ئوردون، مەغریب و میسر پێکدێت. النجار چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کە ئەو کۆمیتەیە کردەوەی خێرا ئەنجام بدات.
لۆڤری

**لەلایەن هێڵمز، باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (لە ڕێگای ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت لە کۆشکی سپی، تەنها ژنیراڵ سکۆکرافت بیبینێت)**

**بە تەواوی نهێنی، هەستیار**

**١٣ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤**

ئامارژە بە:

تیلیگرامی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران،
WH-42553
WH-42555
WH-42 5 5 7

**بابەت: پەیامی شا بۆ هێنری کیسینجێر بۆ دابینکردنی چەک بۆ کوردەکان لە ڕێگای ئیسرائیلەوە**

١- زەحمەت نەبێت ئەم پەیامە بگەیەنن بە کیسینجێر، وەزیری دەرەوە

٢- ڕۆژی ١٢ی تشرینی دووەم شا بە بەڕێز( ناوەکەی ڕەش کراوەتەوە[٤١٢])ی وت هیوادارە کە کیسینجێر، وەزیری دەرەوە بتوانێ هەنگاو هەڵبگرێت بۆ ئەوەی لە

---

[٤١٢]- ئەو کەسە کە کاربەدەستێکی باڵای CIA بووە لە ئێران دەقی گفتوگۆکەی خۆی لەگەڵ شا ناردوە بۆ هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران و هێڵمزیش ناردوویەتی بۆ ژنێراڵ سکۆکرافت لە کۆشکی سپی بۆ ئەوەی بیگەیەنێت بە دەستی کیسینجێری وەزیری دەرەوە. دەقی قسەکانی شا لەگەڵ کاربەدەستەکەی CIA هەر ئەو شتانە لە خۆ دەگرێت کە لەم پەیامەدا باس کراوە. وەرگێڕ

ڕێگای ئیسرائیلەوە چەک بۆ کوردەکان دابین بکات (وادیارە مەبەستی شا ئەو لیستە بوو کە خۆتان بە شا نیشانتان داوە). شا وتی ئەو پشتیوانییە کە تۆپخانەی ئێران لە کوردەکان کردوویە زۆر کاریگەر بوە و کوردەکان ئیدی پاشەکشە ناکەن بەڵکوو بە توندی لەگەڵ هێزەکانی عێراق شەڕ دەکەن. شا دەیەوێت درێژە بە پشتیوانیکردن لە کوردەکان بدات. شا وتی نە عێراق و نە سۆڤیەت هیچیان دەربارەی پشتیوانی تۆپخانەی ئێران لە کوردەکان نەوتوە هەرچەند کە بە دڵنیاییەوە دەزانن کە ئێران پشتیوانی لێکردوون.

ب- بەڕێز( ناوەکەی رەش کراوەتەوە) بە شای وت کە کیسینجێر، وەزیری دەرەوە تازە گەڕاوەتەوە بۆ واشینگتۆن و نامەکەی ژنێراڵ بارزانی و ئەو نووسراوانە کە هاوپێچی نامەکە کرابوو بەدەستی گەیشتووە و بە دڵنیاییەوە وەکوو پێویست بەدواداچون بۆ مەسەلەکە دەکات. ناوبراو ئاماژەی بەوە کرد کە بودجەی ئاژانسەکەی خۆی بۆ پشتیوانیکردن لە کوردەکان بەو بڕە یارمەتیە کۆتایی پێهاتوە کە کە بڕیاربوە هەتا کۆتایی مانگی شوباتی ١٩٧٥ جێبەجێ بکرێت.

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی١٣٩٨**

**١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤**

**بابەت: شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق بەرفراوانتر دەبێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئانکارا، بەیروت، بۆن، قاهیرە، هلیسینکی، لەندەن، مسکۆ، پاریس، ستۆکهۆلم، تاران و ڤیەن

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٧٨٢ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- دەوڵەتی عێراق هەوڵەکانی خۆی زیاتر کردوە بۆ ئەوەی وانیشان بدات کە هەموو شتێک له باکووری عێراق باش دەچێتە پێش واتا بارزانی و "گروپی خائینان" له خەڵک دابڕاون و شەڕ تەنها له شاخە دووردەستەکاندا هەیە و شوێنەکانی دیکەی کوردستان گەڕاوەتەوە بۆ بارودۆخی ئاسایی خۆی و ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنی کوردستان خۆیان ڕێکخستوە بۆ ئەوەی له هەوڵیری پایتەختەوە، هەرێمی ئۆتونومی کوردستان بەڕێوە ببەن. دەوڵەتی عێراق هەروەها دەڵێت هەفتەی ڕابردوو گەمارۆی ئابووری له سەر کوردستان هەڵگرتوە چونکە ئیدی پێویست بەو گەمارۆیە نیە و پرۆژەی گەشەپێدانی ئابووری بە خێرایی له باکوور جێبەجێ دەکرێت.

٢- هەروەها کە ڕاپۆرتی میدیا بیانیەکان و زانیاریەکانی پسپۆڕە سەربازیە بیانە دۆستەکانمان له بەغداد نیشان دەدات، ڕاستیەکانی باکووری عێراق زۆر لەو شتانە

دوره كه دەوڵەتی عێراق دەیڵێت. شەڕ به توندی له ناوچەكانی دەوروبەری رواندوز، رانیه و قەڵادزێ بەردەوامه. به وتەی وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی بریتانیا، هێزەكانی عێراق توانیویانه بەرزاییەكانی رۆژهەڵاتی رواندوز بگرنەوه كه به وتەی ئەو سەرچاوەیه، ئەوه سەركەوتنێكی گەوره بۆ سپای عێراقه. وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی میسر راپۆرتی داوه كه ئێران به تۆپی ١٧٥ میلیمیتری له ناوچەی قەڵادزێ بەشێوەیەكی بەرفراوان یارمەتی كوردەكان دەدات و هێزه كوردەكان له رۆژەكانی دەوروبەری ١٠ی تشرینی دووەم دیسان چونەتەوه ناو ئەو شاره.

ئەو پسپۆڕه سەربازیەی بریتانیا هەروەها راپۆرتی داوه كه هێزەكانی ئێران بۆ پشتیوانیكردن له كوردەكان له ناو خاكی عێراقدا چالاكی دەكەن.

٣- وەزارەتی بەرگری عێراق بەڵێنی داوه رۆژی ٢٦ی تشرینی دووەم پسپۆڕه سەربازیەكانی باڵوێزخانەكانی وڵاتانی بیانی ببات بۆ بەرەی شەڕ. ئەگەر ئەو سەفەره جێبەجێ بێت، پسپۆڕه سەربازیەكانی بیانی بۆ یەكەمجار زانیاری پله یەكی باشیان دەستدەكەوێت.

لۆڤری

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ: نووسینگەی پەیوەندیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پەکین (چین)**

**٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: گفتوگۆی شا و سەرۆک کۆماری سۆڤیەت دەربارەی هۆکاری یارمەتیدانی کوردەکان**

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٩٩٣٥ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- وەزیری دەرباری ئێران، عەلەم، رۆژی ٢٥ی تشرینی دووەم هەندێ روونکردنەوە و زانیاری دەربارەی سەردانەکەی شا بۆ موسکۆ پێدام. بە وتەی عەلەم لە رۆژی یەکەمی ئەو سەردانەدا شا و برژینف (سەرۆک کۆماری یەکێتی سوڤیەت) دەربارەی ئەم تەوەرانە گفتوگۆیان کردوە:

٢- برژنێف پرسیاری لە شا کردوە بۆ چەکوچۆڵ دەدەی بە کوردەکان و یارمەتی سەربازیان دەدەیت. "شا"یش وەها وەڵامی داوەتەوە:

"ئەو پرسیارەی جەنابتم پێسەیرە. ئێوە خۆتان هەمان شت لە باکووری ڤیەتنام دەکەن بەڵام بە تۆزێ جیاوازییەوە. دەوڵەتی عێراق کوردەکان بە کۆمەڵ دەکوژێت و پێشکەوتووترین چەکەکان دژیان بەکار دەهێنێت و دەیەوێت بە تەواوی لە ناویان بەرێت. کوردەکان ئەو جۆرە چەکە پێشکەوتویانە نیە. جگە لەوەش (دەوڵەتی) باکووری ڤیەتنام، باشووری ڤیەتنامی داگیر کردوە بەڵام ئێوە هێشتا یارمەتیان

دەدەن. ئێران یارمەتی گەلێکی چەوساوە دەدات بەڵام ئێوە یارمەتی هێزێکی چەوسێنەر دەدەن".

بە وتەی عەلەم دوابەدوای ئەو وەڵامەی شا، کاربەدەستانی سۆڤیەت تەوەری گفتوگۆکەیەکان گۆڕیوە[٤١٣].

ئینگیرسۆل بە وەکالەت لە لایەن هێڵمز

---

[٤١٣]- بە گوێرەی پەیامێک کە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران لە ١٥ ئەیلوولی ١٩٧٤ بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردووە رۆژی ١٣ی ئەیلوول ئەنجوومەنی سەرکردایەتی سۆڤیەت نیگەرانی خۆی بە نیسبەت پشتیوانی ئێران لە کوردەکان بە شا راگەیاندوە و وتوویەتی لەوە زیاتر ناتوانێت بەنیسبەت ئەو شتانە کە لە باشووری سنوورەکانی روودەدات بێدەنگ بێت. شاش وتویە گوێ لەو هۆشداریەی سۆڤیەت ناگرێت و درێژە بە پشتیوانیکردن لە کوردەکان دەدات.. وەرگێڕ

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لەندەن**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٦٣٤٤**

**٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: هەڵسەنگاندنی بریتانیا دەربارەی شەڕی ئێستای کوردەکان لە عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، جەدە، کووەیت، مۆسکۆ، پاریس، تاران، تلابیب، دەمیشق، قاهیرە و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٨٣٥ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- باڵوێزخانە وێنەیەکی تیلیگرامەکەی کۆلۆنیل ساندیرز[٤١٤] بۆ وەزارەتی دەرەوە و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغدادی بەدەست گەیشتوە. دوایین هەڵسەنگاندنی بریتانیا دەربارەی بارودۆخی کوردەکان، ناوەرۆکی ئەو تیلیگرامەی بەرچاو گرتوە. دەوڵەتی بریتانیا لەگەڵ ئەوە هاوڕایە کە هێرشەکەی ئێستای عێراق سەرکەوتووترین هێرش لە مێژوودا بووە چونکە دەوڵەتی عێراق ٧٠ %ی ئەو خاکەی گرتوەتەوە کە کوردەکان بانگەشەیان دەکرد لە ژێر دەستیاندایە.

[414] COL SANDERS'

بەهەرحاڵ ئەمە بە واتای ئەوە نیە کە دەوڵەتی بریتانیا پێشبینی ئەوە بکات کە هێزەکانی عێراق بەتەواوی سەردەکەون.

٢-هەروەها کە لە تیلیگرامەکەی کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز ئاماژەی پێکراوە، بریتانیا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بێ دەنگکردنی کوردەکان شتێکی واقعبینانە نیە و بۆ دەوڵەتی عێراق دەست نادات و پێیوایە کە عێراق شتێکی باشی دەستدەکەوێت ئەگەر بتوانێ کوردەکان ناچار بکات ئاگربەست قبووڵ بکەن و دەستڕاگەیشتنی کوردەکان بە شاخەکان سنووردار بکات. راپۆرتەکەی ساندیرز دەڵێت کاربەدەستانی پایەبەرزی عێراق دان بەوەدا دەنێن کە تەنیا رێگاچارەی کێشەی کورد، رێگاچارەی سیاسیە و پارەی عێراق بە شێوەی رەها بۆ رێگاچارەی سیاسی سەرف دەکرێت.

٣- بریتانیا هەروەها پێیوایە دەستێوەردانی ئێران لەو کێشەیەدا مایەی نیگەرانیە. ئێران دوو بەتالیونی هێزی تۆپخانەی لە عێراق هەیە و لەوانەیە بە پێویستی بزانێت پاش زستان و ساڵی داهاتوش پشتیوانی لە کوردەکان بکات. ئەگەر ئێران لە باتی ئەوەی گوشار بخاتە سەر کوردەکان بۆ ئەوەی ئاگربەست قبوڵ بکەن، رێگای پشیتیوانیکردنی بەرفراوانتری کوردەکان هەڵبژێرێت ئەگەری پێکدادانی راستەوخۆی ئێران و عێراق زیاتر دەبێت.

٤- لە راپۆرتەکەی ساندێرزدا هاتوە کە کۆمپانیای نەوت ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە ئەمساڵ کوردەکان هەندێ خەساریان گەیاندوەتە هێڵی نەوتی کەرکووک بەڵام لە مانگی ئاب بەرەوئەملا هیچ خراپکارییەکیان ئەنجام نەداوە. بۆ پێشگرتن لە کردەوەگەلێکی وەها دەوڵەتی عێراق ئاسایشی بنکەکانی نەوت زیاتر دەپارێزێت.

سپییرز[٤١٥]

---

[415] SPIERS

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ١٤٨٦**

**٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: هەڵوێستی ئەمریکا سەبارەت بە رێبەرایەتی بزووتنەوەی کورد و دەوڵەتی بەعس**

بۆ زانیاری:

- بەڕێز سیسکۆ، جێگری وەزیری دەرەوە
- بەڕێز ئەسیرتۆن، یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە
- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- هەروەها کە دەزانن کەوتنەخوارەوەی دوو فڕۆکەی عێراق (بە دەستی کوردەکان) بە موشەکی ئێران تەنها یەکێ لە نموونە هەرە گەورەکانی دەستێوەردانی بەرفراوان و راستەوخۆی ئەم دوایانەی ئێران لە کاروباری عێراقدایە. وادیارە ئەگەر ئەو دەستێوەردانەی ئێران نەبوایا هێزە چەکدارەکانی عێراق ئەمساڵ بە سەر بارزانیدا سەردەکەوتن. لە روانگەی منەوە ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە دەوڵەتی ئەمریکا ئەوپەڕی گوشار بخاتە سەر شا بۆ ئەوەی کۆتایی بەم دەستێوەردانە بهێنێت کە نەتەنها لە بەرژەوەندی ئێراندا نیە بەڵکوو لە بەرژەوەندی سەقامگیری ناوچەشدا نیە.

٢- ئامانجی شا ئەوەیە کە دەوڵەتێک لە عێراق بەدەسەڵات بگات کە مەترسی کەمتری بۆ ئێران هەبێت. راستیەکەی ئەوەیە کە رژیمی بەکر-سەدام حوسەین

دەیەوێت ئەمجارە بە تەواوی بەسەر کوردەکاندا زاڵ بێت، ئەگەر تا شەڕ هەروا درێژە بکێشێت لەوانەیە رژێمێکی دیکە بێتە جێگای رژیمی ئێستا. بەهەرحاڵ ئەمە بە واتای ئەوە نیە کە ئەو رژیمە کە جێگای رژیمی ئێستا دەگرێتەوە، بتوانێت بارودۆخەکە باشتر بکات. هەندێ لە پسپۆڕان، لەوانە پسپۆڕانی فەرانسە و بریتانیا لە سەر ئەو باوەڕن کە هەر دەوڵەتێک کە جێگای رژیمی ئێستای عێراق بگرێتەوە، لە رژیمی ئێستا توندئاژۆتر و تێکدەرتر دەبێت و لەوانەیە ناچار بێت بە تەواوی پشت بە سۆڤیەت ببەستێت. ئەگەری دیکە ئەوەیە کە سوپا بگات بە دەسەڵات و لەوانەیە دژی کومونیسم بێت بەڵام لە مێژووی عێراقدا لە ئەنجامی دەسەڵاتی سەرجەم رژیمە سەربازیەکاندا، عێراق لە ناوخۆدا ناسەقامگیر بوە و ئەگەری ئەوە هەیە کە هەمان ئەنجام دووپات بێتەوە. لەوانەیە ئەم جۆرە رژیمە سەربازیە بۆ شا باش بێت بەڵام زەحمەتە بزانین ئەو رژیمە چۆن لە پێناو سەقامگیری ناوچەدا خزمەتی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا یا رۆژئاوا دەکات.

٤- رژیمی بەعس سەرەڕای هەموو خراپیەکانی، لە شەش ساڵی رابردوودا عێراقی سەقامگیر کردوە. جگە لەوەش، ئێستا دەیەوێت بەشێوەیەکی چڕوپڕ گەشە بە ئابووری وڵات بدات و بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدات لە وڵاتانی رۆژئاوای ئوروپا و وڵاتە عەرەبە محافزەکارەکان نزیک بێتەوە (هەروەها کە لە تیلیگرامی ٨٥٧دا ئاماژەمان پێکردوە). هەر ئامانجێک لە پشتی ئەم دوو سیاسەتەی عێراقدا بێت (گەشەی ئابوری و نزیکبوونەوە لە وڵاتانی دیکە) و لە هەر لەحنێکی توندئاژۆ بۆ شاردنەوەی ئەو ئامانجە کەڵک وەربگیردرێت، رژیمی بەعس (ئەگەر باش سیاسەت بکات) دەتوانێت تایبەتمەندیەکانی خۆی بە تەواوی بگۆڕێت کە تا ئێستا وەک مشکیکی گۆشەگیر بوە.

٤- رێبەرایەتی کورد بۆ خەباتێکی بێ هیوایانە شەڕ دەکات. هیچ لایەنێک پێیخوش نیە کوردەکان سەربکەون. تەنانەت ئێرانیش دەڵێت ئەوەندە یارمەتی کوردەکان نادات کە بتوانن هێرش بکەنە سەر دەوڵەتی عێراق. کەوابوو تەنها هیوای کوردەکان روخانی رژیمی بەغدادە بەڵام هیواداربوون بەوە کە دوای رژیمی ئێستا رژیمێک لە عێراق

بەدەسەڵات دەگات کە سیاسەتی بە نیسبەت کوردەکان باشتر دەبێت، لە هیواکەی شا خەیاڵاویترە. تا ئەو شوێنە کە من دەزانم هەموو رژیمەکانی پێشووی عێراق، لەوانە رژیمی بریتانیا، پاشایەتی و سەربازی، ئەو جۆرە ئۆتونومیانە نەداوە بە کوردەکان کە کوردەکان داوای دەکەن. هەروەها بە بۆچوونی من بیرۆکەی لەمێژینەی "هاوپەیمانی کورد و شیعە" هەم خەیاڵە و هەمیش ناڕاستە. نە کۆمەڵگای کورد و نە کۆمەڵگای شیعە هیچکامیان خاوەن ئەو دامەزراوە یان کەسایەتیانە نین کە بتوانن حکومەت بەڕێوە ببەن و درێژە بە رەوتی مودیرنیزاسیۆن بدەن. زۆربەی خەڵکی ئەو دوو کۆمەڵگایە هێشتا بە شێوەی عەشیرەتی دەژین و وەک کۆمەڵگاکانی سەردەمی ناوەڕاستن.

٥- باڵوێزی بریتانیا لە عێراق، گراهام بەشێوەیەکی زۆر نهێنی پێمیوت وەزیری دەرباری ئێران، عەلەم ئەمدوایانە بە دەوڵەتی بریتانیای راگەیاندوە کە ئێران دەیەوێت شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراق بەردەوام بێت و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ئێران نەتەنها ئەوەندە پێداویستی بە بارزانی دەدات کە بتوانێت لە وەرزی زستاندا لە بەرامبەر رژیمی عێراق رابوەستێت بەڵکوو ئەوەندە چەکوچۆڵیشی دەداتێ کە بتوانێت لە بەهاردا هێرشە بەرفراوانەکانی دەستپێبکاتەوە. ئەگەر شا ئاوا بیر بکاتەوە، بە دڵنیایەوەوە ئێمە (ئەمریکا) بەرەو شەڕێکی بەرفراوانی ناوچەیی پاڵپێوەدەنرێن. کەوابوو بە بۆچونی من ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە دەوڵەتی ئەمریکا ئەوپەڕی گوشار بخاتە سەر شا بۆ ئەوەی شا تێبگات کە بەرژەوەندی ئێران و ئەمریکا لەو مەسەلەیەدا یەکناگرێتەوە و پێی نیشان بدات کە بەرژەوەندی هاوبەشی ئێران و ئەمریکا لەو مەسەلەیە لە چیدایە. هەروەها کە پێشتر باسم کرد بە بۆچونی من باشترین هەنگاوێک کە ئەمریکا لەم پەیوەندیەدا دەبێ هەڵیبگرێت ئەوەیە کە مۆچیاری شا بکات لە باتی ئەوەی پێداگری لەسەر ئەوە بکات کە رژیمی بەعس دژمنی سەرسەختی ئێرانە، جدیبونی خواستی عێراق بۆ نزیکبونەوە لە ئێران تاقی بکاتەوە.

لۆڤری

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٥٨٩**

**٣٠ی کانونی یەکەمی ١٩٧٤**

**نهێنی**

**بابەت: سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە کوردەکان و کێشەی ئێران- عێراق**

بۆ زانیاری:

- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت

- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد (لە رێگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت)

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٨٩٨ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

هەرچەند کە بێگومان لەوانەیە روانگەی وەزارەتی دەرەوە دەربارەی سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت کێشەی ئێران - عێراق لەگەڵ روانگەی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد و باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران جیاواز بێت، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئەو هەڵسەنگاندن و نیگەرانی و ئەنجامانەدا نین کە لە تیلیگرامەکەی (وەزارەتی دەرەوە) ئاماژەی پێکراوە. هۆکارەکانی ئێمە بریتین لە:

١- شا وەک کۆمەڵێک هەرزە و مرۆڤکوژ سەیری کاربەدەستانی رژیمی بەکر و سەدام دەکات کە دژمنی خۆی و دژمنی رۆژئاوا بەگشتین. شا بەردەوام پێیوایە کە

هەوڵەکانی دەوڵەتی عێراق بۆ هاتنەدەرەوە لەو گۆشەگیریەی ئێستا تەنها جموجۆڵێکی تاکتیکیە بۆ ئەوەی لە گوشارە ناوخۆیی و دەرەکیەکان رزگاری بێت.
شا لە ناخی دڵەوە پێیوایە کە رژیمی ئێستای بەعس هێشتا لە رووی سیاسی و ئیدوئولۆژیکیەوە بە توندئاژۆیی عەرەبی پابەندە و داردەستی پەرەسەندنی دەسەڵاتی سۆڤیەتە و لە هەر شوێن و کاتێک کە سۆڤیەت بیەوێت، بڕیارەکانی سۆڤیەت جێبەجێ دەکات.
شا هیچ گومانی لەوەدا نیە کە عێراق کردەوەی خراپکارانە لە نیمچە دورگەی عەرەبستان، بەلوچستان و خودی ئێران ئەنجام دەدات و دەوری تێکدەرانە دەگێڕێت و پشتیوانی لە بەرەی بەرەنگاربوونەوەی فەلەستین دژی ئیسرائیل و هێزە عەرەبە توندئاژۆکانی شوێنەکانی دیکە دەکات. سەرەنجام شا پێیوایە کە دەوڵەتی عێراق بە شێوەی بێبەزەییانە خەڵکەکەی خۆی سەرکووت دەکات و دەیەوێت کوردەکان، شیعەکان و هەر کەسیکی دیکە کە لە سەر رێگای خۆی ببینێت، لە ناو ببات.
٣- دەربارەی کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی بەغداد، پێمانوانیە کە شا هەست بەوە بکات کە کوردەکان لە پێناو شەڕێکی بێ هیوایانە خەبات دەکەن. لە کاتێکدا کە شا پێیخۆش نیە کە کوردەکان لەو شەڕەدا ئەوەندە سەربکەون کە بتوانن وڵاتێکی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆ لە سەر سنووری ئێران دابمەزرێنن، بەڵام پێیشی خراپ نیە کە کوردەکان لە چوارچێوەی ئەو رێکەوتننامەیە کە بارزانی و دەوڵەتی بەغداد لە ئاداری ١٩٧٠دا واژۆیان کرد، ببن بە خاوەن کیانێکی نیمچە ئەتونومی. بەهەرحاڵ تا ئێستا لانیکەم لە بواری سەربازیدا پێشکەوتنێکی وەها هاتوەتە ئاراوە چونکە کوردەکان تەنیا بەو یارمەتیە سنووردارەی ئێران توانیویانە لە بەرامبەر سپای پۆشتەی عێراقدا رابوەستن و لەوانەیە ئەم زستانە بتوانن زۆربەی ئەو خاکەی کە لە دەستیان داوە بگرنەوە و زیاتر زەبر لە ورەی دەوڵەتی عێراق بوەشێنن. کوردەکان پێویستیان بەوە نیە کە بە تەواوی بەسەر دەوڵەتی عێراقدا سەر بکەون بەڵکو تەنها ئەگەریش بتوانن بە سەر دەوڵەتی بەعسدا زاڵ بن یان لانیکەم ناچاری بکەن لەگەڵیان رێکبکەوێت، دیسان کوردەکان سەرکەتوو دەبن. راستە هیچ کەس نازانێت

ئەو دەوڵەتەی کە دێتە جێگای بەعس، چی جۆرە دەوڵەتێک دەبێت بەڵام هەم شا و هەم کوردەکان پێیانوایە کە هەر چی بێ لە رژیمی ئێستای عێراق خراپتر نابێت و بە تەواوی ئامادەن بەختی خۆیان لەگەڵ رژیمی نوێی عێراق تاقی بکەنەوە.

٤- ئێمە نابێت وا بیر بکەینەوە کە "بیگومان دەکەوینە ناو کێشەیەکی بەرفراونی ناوچەیەیی" ئەگەر ئێران ئەوەندە یارمەتی کوردەکان بدات کە کوردەکان بتوانن لەسەر پێی خۆیان رابوەستن. بە دڵنیاییەوە دەوڵەتی بەغداد دەبێ بزانێت کە ئەگەر راستەوخۆ هێرش بکاتە سەر ئێران، سۆڤیەت (کە بەرژەوەندی زۆری لە ئێران و هەروەها عێراق هەیە) بێ دەنگ دەبێت و ئێرانیش لە وەڵامدا زەبری زۆرتر لە عێراق دەوەشێنێت. تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە ئێرانەوە هەیە، ئێران تەنها دەیەوێت کوردەکان هەر بمێنن و هەوڵەکانی دەوڵەتی بەغداد بۆ لەناوبردنی هەتاهەتایی کوردەکان پوچەڵ بکاتەوە.

٥- دەربارەی ئەو پرسیارە کە ئایا بەرژەوەندیەکانی ئێران و ئەمریکا لە سەر ئەو مەسەلەیە لە یەک دوورە، ئێمە تەنها دەمانەوێت ئاماژە بەو تێگەیشتنەی خۆمان بکەین کە گوشاری کوردەکان و ئێران، دەستی ٨٠٪ سپای عێراقی لە سەر سنووری ئێران - عێراق بەستوەتەوە، کەوابوو سپای عێراق ناتوانێت لە شوێنەکانی دیکە ماجراجوویی بکات. روونە کە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نیە ناوچە ناسەقامگیر بێت، بەڵام پرسیارێکی گرنگ کە لە ئارادایە ئەوەیە کە ئایا رژیمی بەغداد لە بارودۆخی جیاوازدا، دەبێت بە هێزێکی تێکدەری سەقامگیری. ئەمە لە کاتێکدایە کە رژیمی ئێستای عێراق، رێکەوتننامەکەی ئاداری ١٩٧٠ لەگەڵ بارزانی جێبەجێ نەکردوە و هەوڵە سەربازیەکانی خۆی دەستپێکردوەتەوە بۆ ئەوەی بارزانی و هاورێکانی لە ناو ببات. هەر ئەم رژیمەی ئێستای عێراق بووە کە بەردەوام وتووێژ و رێکەوتن لەگەڵ ئێرانی رەت کردوەتەوە کە دان بە پەیماننامەی کۆنی ١٩٣٧دا دەنێت کە سنووری هاوبەشی ئێران و عێراقی لە شەتولعەرب پێناسە کردوە و هەر ئەم رژیمەی ئێستای عێراقە کە تا ئێستاش پشتیوانی لە لایەنە توندئاژۆکانی جیهانی عەرەب، لەوانە تروریستەکان دەکات و یارمەتیان دەدات.

٦- لەوانەیە بەرژەوەندی ئێمە و ئێران سەبارەت بە عێراق بە تەواوی یەکنەگرێتەوە و هەڵسەنگاندنەکانمان (دەربارەی بوار و سنووری کردەوەکانمان بۆ ئەوەی چۆن عێراق لەگەڵ بەرژەوەندیەکانمان لەناوچە رێکبخەین)، بە تەواوی یەکنەگرێتەوە بەڵام ئێمە هەست دەکەین کە بەرژەوەندی و هەڵسەنگاندنەکانمان لە یەک دوور نین. جگە لەوەش ئێمە پێمانوایە کە ئەگەر موچیاری شا بکەین کۆتایی بە یارمەتیدانی بارزانی بهێنێت، ئەو موچیارییە جێبەجێ نابێت و لە راستیدا خزمەت بە بەرژەوەندی گشتی ئەمریکا ناکات.

٧- بە گشتی ئێمە پێمانوایە کە ئەوە دەوڵەتی عێراقە کە دەبێ لەرێگای رێکەوتن لەگەڵ کوردەکان و ئێران و گرتنەبەری رەفتارێکی بەرپرسیارانە بە گشتی، بۆ کەمکردنەوەی کێشەکانی خۆی هەنگاو هەڵبگرێت. ئەگەر عێراق وابکات، ئەوکاتە ئەرکی ئێرانە کە هەنگاوی دواتر هەڵبگرێت و ئێمەش لە بارودۆخێکی زۆر باشتردا دەبێن بۆ ئەوەی لە پەیوەندی لەگەڵ رێکەوتنی ئێران و عێراقدا، لەگەڵ ئێران باس و موناقشە بکەین.

میکلوس

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ١٥١٠**

**٤ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥**

**بابەت: دەوڵەتی عێراق، ئێران و ئیسرائیل بە یارمەتیدانی کوردەکان تۆمەتبار دەکات**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت، قاهیرە، ئانکارا، جەدە، کوەیت، مۆسکۆ، تاران و کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٨٩٧ و ٩١٩ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- سەرجەم راگەیاندنە گشتیەکانی عێراق باسی راگەیاندنامەکەی رۆژی ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ی سپای عێراق دەکەن کە تێدا هاتوە توپخانەی ئێران بە تۆپ و هاوەنی ١٧٥ میلیمیتری ئەمریکایی رۆژی ٢٩ و ٣٠ی کانوونی یەکەم هێرشی کردوەتە سەر ناوچەی قلادزێ. لەو راگەیاندننامەیەدا ئاماژە بەوە کراوە کە: "ئێمە بۆ دوا جار هۆشداری بە کاربەدەستانی ئێران دەدەین و سەرنجی ئێران بەرەولای ئاکامە مەترسیدارەکانی ئەم دەستدرێژیەی رادەکیشین". [٤١٦]

---

[٤١٦] باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت لە ٢٧ی شوباتی ١٩٧٥ واتا ١٠ رۆژ پێش لە نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول پەیامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و ئاماژەی بەوە کردوە کە : "رۆژنامەکانی لایەنگری رژێمی عێراق کە لە بەیروت چاپ دەبن دوێنی هێرشیان کردوەتە سەر سوریا و تۆمەتباریان کردوە

٢- ڕۆژی ٣٠ کانوونی یەکەم "بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سپای عێراق" وابەستە سەربازیەکانی باڵوێزخانەکانی وڵاتانی بیانی لە بەغدادی بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی بارودۆخی باکوری عێراقیان لە مانگی رابردودا بۆ شی بکاتەوە. بە وتەی وابەستەی سەربازی باڵوێزخانەی بریتانیا، سەرۆکی "بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سپای عێراق" وتویەتی:

"هێزەکانی دەوڵەتی عێراق بەرزایەکانی رۆژهەڵاتی رواندوزیان گرتوە و ئێستا بۆ لەناوبردنی هێزە کوردەکان لەو ناوچەیە چالاکی دەکەن. چالاکی پێشمەرگە کوردەکان لە پشتی سنووری عێراق بەردەوامە. ورەی پێشمەرگە کوردەکان زۆر نزمە بەڵام لە ترسی ئەوەی ئەندامانی بنەماڵەکانیان سزا بدرێن ناوێرن خۆیان تەسلیم بکەن. بەشداری ئێران لە شەڕدا رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێت چونکە سەرکەوتنەکانی سپای عێراق رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت. داردەستەکانی ئیسرائیل و ئەمریکا وەک راوێژکار خزمەت بە کوردەکان دەکەن و ئێران خاوەن موشەکی HAWKی ئەمریکاییە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمریکا حاشا لەو مەسەلەیە دەکات".(بەرپرسە عێراقیەکە وێنەی دوو لەو موشەکانەی نیشانداوە کە لە سانێکدا لە تاران لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم نیشاندراوە).

---

کە بە نهێنی یارمەتی بارزانی دەدات و بەو شێوەیە خزمەت بە ئیمپریالیزم و خیانەت بە جیهانی عەرەب دەکات. رۆژنامەکان نووسیویانە کە سوریا چەک و تەقەمەنی دەدات بە کوردەکان و لە ناو خاکی سوریە داڵدەیان دەدات و ئاسانکاری دەکات بۆ ئەوەی لە رێگای سوریاوە کوردەکان لەگەڵ دنیای دەرەوە پەیوەندیان هەبێت. ئەم بانگەشانەی رۆژنامەکانی لایەنگری عێراق دوای ئەوە بڵاو بوەتەوە کە چەند رۆژ لەمەو پێش سەدام حوسەین لە دیمانەیەکدا لەگەڵ رۆژنامەی "الاهرام" بانگەشەی ئەوەی کردوە کە دەوڵەتێکی تایبەتی عەرەب یارمەتی کوردەکان دەدات. وادیارە دەوڵەتی عێراق ئێستا بەیروت وەک بنکەیەک بەکاردێنیت بۆ تۆمەتبارکردنی سوریە و شەرمەزارکردنی رووداوەکانی سنوری عێراق و سوریە". وەرگێڕ.

٣- هەڵسەنگاندن: دەوڵەتی عێراق بانگەشەی ئەوە دەکات کە ورەی کوردەکان نزمە بەڵام زۆربەی ئەو زانیاریانیە کە من ئەمدوایانە لە زمانی راگەیاندنەکانەوە بیستومە نیشان دەدات کە بەپێچەوانەی بانگەشەی عێراق، ورەی کوردەکان بەرزە.
لۆڤری

**لە باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لەندەن**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٧٧٣٥**

**٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥**

**بابەت: لۆبی پشتیوانی لە کوردەکان لە بریتانیا بەهێزتر دەبێت**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، مۆسکۆ، پاریس، تاران، تلابیب، نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە نیویورک و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- بەگوێرەی ئەو زانیاریانە کە پێمانگەیشتوە، وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا لە پەرەسەندنی لۆبی کوردەکان لە نیو کاربەدەستانی دەوڵەتی بریتانیا نیگەرانە. ژمارەیەکی زۆر لە رێکخراوە خۆویستەکانی بریتانیا سەردانی کوردەکانیان کردوە و لە کاتی گەڕانەوەدا بۆ راگەیاندنە گشتیەکان باسی ئەوەیان کردوە کە کوردەکان نەهامەتی زۆر دەکێشن و بە نوێنەرایەتی لەلایەن کوردەکانەوە بەردەوام داواکاری بۆ دەوڵەتی بریتانیا دەچێت بۆ ئەوەی کاری زیاتر بۆ کوردەکان بکات.

٢- کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیا دەڵێن ئەو داواکاریانەیان رەت کردوەتەوە چونکە دەوڵەتی بریتانیا نایەوێت لە کاروباری دەوڵەتی عێراقدا دەستێوەردان بکات و ئەگەریش دەستێوەردان بکات ئەنجامەکەی بەپێچەوانەی ئەو شتە دەبێت کە لایەنگرەکانی کوردەکان داوای دەکەن بەڵام بەهەرحاڵ دەوڵەتی بریتانیا دەتوانێت بەگوێرەی دوو پێشنیار لەو پەیوەندیەدا کار بکات:

الف- داوا له توركیه (كه هاوپه‌یمانی بریتانیایه له ناتۆدا) بكات سنوره‌كانی به‌ڕووی كورده‌كاندا بكاته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ئازاره‌كانی كورده‌كان تۆزێ سارێژ بێت. سنوری توركیا و عێراق هه‌ر چه‌ند به شێوه‌ی فه‌رمی كراوه‌یه به‌ڵام له كرده‌وه‌دا داخراوه.

ب- داواكاریه‌ك ته‌سلیم به نه‌ته‌وه یه‌كگرتوه‌كان بكات و بلێت كه ده‌وڵه‌تی عێراق چه‌كگه‌لی "نامرۆڤانه" وه‌ك فوسفۆری، ناپاڵم و وه‌ك ئه‌وانه دژی كورده‌كان به‌كارده‌هێنێت له كاتێكدا كه هه‌ندێ له بڕیارنامه‌كانی نه‌ته‌وه یه‌كگرتوه‌كان به‌كارهێنانی ئه‌و جۆره چه‌كانه‌یان قه‌ده‌خه كردوه.

٣- كاربه‌ده‌ستانی وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی بریتانیا له به‌رامبه‌ر ئه‌م گوشاره‌ی لایه‌نگرانی كورده‌كان راده‌وه‌ستن به‌ڵام دیار نیه ئه‌نجوومه‌نی وه‌زیرانی بریتانیا تا كه‌ی بتوانێت له به‌رامبه‌ر ئه‌و گوشاره‌دا رابوه‌ستێت.

٤- هه‌ڵسه‌نگاندن: باڵوێزخانه‌ی ئه‌مریكا له بریتانیا به‌رده‌وام ئاماژه‌ی به زیادبوونی ده‌نگدانه‌وه‌ی راپۆرته دڵته‌زینه‌كانی رۆژنامه‌كانی بریتانیا ده‌رباره‌ی كورده‌كان كردوه. ئه‌و راپۆرتانه له زمانی ئه‌و هه‌واڵنێرانه‌وه بڵاو ده‌بێته‌وه كه به شێوه‌ی خۆویست سه‌ردانی ئێران و به‌ره‌ی شه‌ڕ له ناوچه كوردنشینه‌كانیان كردوه.

سپییرز

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا**

**بۆ: نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێڤ**

**٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥**

**بابەت: هەڵوێستی دەوڵەتی تورکیە سەبارەت بە بزووتنەوەی کوردەکانی عێراق**

بۆ زانیاری:

- وەزارەتی دەرەوە
- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت
- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٤٣٤ی نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێڤ

١- بەرپرسی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوەی تورکیە، جەلیل ئوغلوو، رۆژی ٢٩ی کانوونی دووەم بە کاربەدەستانی باڵوێزخانەی ئەمریکای راگەیاند کە تورکیە سنووری خۆی لەگەڵ عێراق نە کردوەتەوە و نە دایخستوە بەڵام رێگە بەوە نادات کە یارمەتی فریاگوزاری نێونەتەوەیی لە خاکی تورکیاوە بچیت بۆ کوردەکان. جەلیل ئوغلو وتی هۆکاری سەرەکی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە تورکیە نایەوێت یارمەتی بە گروپێک بدات کە دژی دەوڵەتێکی دۆست واتا عێراق خەبات دەکات. جەلیل ئوغلو هەروەها وتی ئەگەر دەوڵەتی عێراق داوا بکات ئەو یارمەتیانە بنێردرێت بۆ کوردەکان، ئەوکاتە بارودۆخەکە جیاواز دەبێت. جەلیل ئوغلو هەروەها جەختی

لەسەر ئەوە کردەوە کە یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی یارمەتینەدانی تورکیە بە کوردەکانی عێراق، ئەوەیە کە تورکیا بۆ خۆی کوردی تێدایە.

٢- ئێوە (نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێف) ئەو مەسەلەیە لەگەڵ کومیسارییای باڵای نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کاروباری پەنابەران () UNCHRو رێکخراوی نێونەتەوەیی خاچی سوور(IRC) باس بکەن[٤١٧].

مەکۆمبێر

---

[٤١٧] - کیسنجێری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا مانگی شوباتی ١٩٧٥ تیلیگرامێکی ناردوە بۆ نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێف و تێیدا رایگەیاندوە: "وەزارەتی دەرەوە پێیوانیە کە دەوڵەتی تورکیە رێگە بەوە بدات لە رێگای تورکیەوە یارمەتی نێونەتەوەیی بچێت بۆ کوردەکان. هەڵوێستی دەوڵەتی تورکیە بەنیسبەت کێشەی کورد لە عێراق ئەوەیە کە نایەوێت خۆی بخاتە ناو ئەو کێشەیە بەڵام هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە دەوڵەتی تورکیە نیگەرانی کێشەی کوردەکانی خۆیەتی. کەوابوو ئێمە پێمانوایە کە کومیسارییای باڵای نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کاروباری پەنابەران بە زەحمەت دەتوانێت لە رێگای تورکیاوە پێداویستی بنێرێت بۆ کوردەکان".

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٩٤**

**٥ی شوباتی ١٩٧٥**

**بابەت: بارودۆخی تەندرستی مەلا مستەفا بارزانی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، موسکۆ و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٠٤٠ی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئەو زانیاریانە کە باڵوێزی میسر لە عێراق داویەتی بە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد کە گوایا مستەفا بارزانی نەخۆشە یان تەنانەت کۆچی دوایی کردووە، راست نیە[٤١٨]. دەوڵەتی عێراق ساڵی پار بانگەشەی ئەوەی کرد کە بارزانی کۆچی دوایی کردووە و ئەو بانگەشەیە لە رۆژنامەی "لسان الحال"[٤١٩]

---

٤١٨- لۆڤری، بەرپرسی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە هەمان مانگدا پەیامێکی ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و لە زمانی النجار، باڵوێزی میسر لە عێراق رایگەیاندوە کە مەلا مستەفا بارزانی نەخۆشە و لە تاران لە نەخۆشخانەدایە. لەو پەیامەدا هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە ئیدریس بارزانی، کوڕی مستەفا بارزانی فەرماندەیی هێزە کوردەکانی وەئەستۆ گرتوە. (وەرگێڕ).

419 "Lisan Al-Hal"

چاپی بەیروت و رۆژنامە بیانیەکانی دیکەدا بڵاو بوەوە بەڵام دوابەدوای ئەوە کە گروپێکی تەلەڤزیۆنێکی ئاڵمانیای رۆژئاوا لەگەڵ بارزانی دیمانەی کرد و وێنەی بارزانی بڵاو کردەوە، ئەو رۆژنامانە کە هەواڵی مردنی بارزانیان بڵاو کردبوەوە توشی سەرسوڕمان بوون. کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران دەڵێن بارزانی زیندوەوە و تەندرستی باشە و لە کوردستان دەژی (نە لە ئێران). لە کاتی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لە مانگی نیسانی ١٩٧٤ تا ئێستا، ئیدریسی کوڕی مستەفا بارزانی بووە بە فەرماندەی هێزی پێشمەرگە.

میکلۆس[٤٢٠]

---

[420] Miklos

**وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا**

**نووسینگەی وەزیر**

**٢٢ی شوباتی ١٩٧٥**

**نهێنی، هەستیار**

**بابەت: نامەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ مەلا مستەفا بارزانی**

ژینیراڵ بارزانی عەزیزم

زۆر خۆشحاڵ بووم کە پەیامەکەی ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥ی جەنابتم بەدەستگەیشت[٤٢١]. من ستایشی دەوڵەتی ئەمریکا بە ئێوە و گەلەکەتان رادەگەیەنم و دەسخۆشی لە تێکۆشانە قارەمانانەکەتان دەکەم. ئەو گیروگرفتانە کە ئێوە لەگەڵی رووبەڕوون، زۆر دژوارە. من تێبینیەکانی ئێوە دەربارەی بارودۆخی سیاسی و سەربازی زۆر بەرز دەنرخێنم. دڵنیابن کە پایەبەرزترین کاربەدەستانی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەجدی سەرنج بە پەیامەکەی جەنابتان دەدەن چونکە ئەو مەسەلەیە بۆ ئێمە گرنگە.

---

[٤٢١] لەو پەیامەدا مەلا مستەفا بارزانی بارودۆخی سەربازی هێزی پێشمەرگە و هێزەکانی عێراقی شیکردوەتەوە و داوای لە کیسینجێر کردوە لە رووی سەربازی و مادییەوە زیاتر یارمەتی شۆڕشی کورد بدەن. بارزانی هەروەها لە پەیامەکەدا داوای کردووە لەگەڵ خودی کیسینجێر دیدار بکات. وەرگێڕ

ئەگەر بتانەوێت نوێنەرێکی باوەڕپێکراو بنێرن بۆ واشینگتۆن بۆ ئەوەی زانیاری زیاتر دەربارەی بارودۆخەکەتان بدات بە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێمە شانازی پێدەکەین و بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێدەکەین.

بە بۆچونی من، نهێنیپارێزی گرنگیەکی لەرادەبەدەری لە مەسەلەی توانایی ئێمە بۆ یارمەتیدانی ئێوەدا هەبوە، تەنها بەهۆی ئەو مەسەلەشە (سەرباری نیگەرانی ئێمە سەبارەت بە ئاسایشی گیانی خۆتان) کە من ناتوانم لێرە لەگەڵ ئێوە دیدار بکەم. چاوەڕوانی بیستنی بۆچوونەکانی جەنابتم.

ئەوپەڕی رێزم قبووڵ بفەرموون

هیوای باشترینەکانتان بۆ بە ئاوات دەخوازم

هێنری کیسینجێر[٤٢٢]

وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

٢٢ی شوباتی ١٩٧٥

---

[٤٢٢]- ئەوە دوایین نامەی کیسینجێر بۆ مەلا مستەفا بارزانی بوو. کیسینجێر هیچ وەڵامێکی بەو نامەیە نەدایەوە کە رێبەرایەتی شۆڕشی ئەیلوول چەند رۆژ پاش نسکۆی شۆڕش بۆ کیسینجێری نووسی و ئاماژەی بەوە کرد کە گەلی کورد لەگەڵ مەترسی کۆمەڵکوژی دەوڵەتی عێراق رووبەڕوو بووەتەوە و داوای کرد ئەمریکا لە مەسەلەکەدا دەستتێوەردان بکات. (وەرگێڕ)

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ١٧٢٩**

**٧ی ئاداری ١٩٧٥**

**بابەت: ناتەبایی سیاسەتی عێراق و سۆڤیەت سەبارەت بە بزووتنەوەی کوردی عێراق**

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، بەیروت، تاران، قاهیرە، لەندەن، مۆسکۆ و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە دیمەشق

١- رۆژی ٤ی ئادار، کونسولی سۆڤیەت لە عێراق، ئاوینیر خانۆف[423] زۆر راشکاوانە ئاماژەی بە ناتەبایی سیاسەتی سۆڤیەت و دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە کێشەی کورد کرد. ئەوە یەکەمجارە کە بەو راشکاوییە مەسەلەی ناتەبایی سیاسەتی عێراق و سۆڤیەت بە نیسبەت کوردەکان لە زمانی کاربەدەستێکی سۆڤیەتەوە ببیستم.

٢- خانۆف وتی لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ ئەو دەرفەتە هەبوو کە دەوڵەتی عێراق و کوردەکان دەربارەی ئۆتونومی پێکەوە وتووێژ بکەن و یەکێتی سوڤیەت پێداگری لە سەر کوردەکان و دەوڵەتی عێراق دەکرد پێش ئەوەی شەڕ هەڵبگیرسیتەوە ناکۆکیەکانیان لەرێگای وتووێژەوە چارەسەر بکەن بەڵام هەم کوردەکان و هەم دەوڵەتی عێراق ئەو موچیاریەی سۆڤیەتیان رەت کردەوە و شەڕێکی بەرفراوان

---

[423] Avenir Khanov

هەڵگیرسایەوە. خانۆڤ وتی سۆڤیەت پێیخۆش نیە چەکی سۆڤیەت دژی بزوتنەوەیەکی "ناسیونالیست" بەکارببردرێت تەنانەت ئەگەر ئەو بزووتنەوەیە، پاشوەرۆیش بێت بەڵام سۆڤیەت کە چەکی بە دەوڵەتێک فرۆشت ئیدی مافی بە سەر ئەوە چەکانە نامێنێت. خانۆڤ هێشتاش لە سەر ئەو باوەڕەیە کە کوردەکان بە زۆری چەک ملکەچ نابن. خانۆڤ وتی باڵوێزخانەی سۆڤیەت لە عێراق ئیدی باسی مەسەلەی کورد لای دەوڵەتی عێراق ناکات، تەنانەت ئەگەر لە ئاستی باڵوێزخانەشدا بێت.

٣- خانۆڤ هەروەها وتی هێرشی رێبەرایەتی نەتەوەپەرەستی بەعس بۆ سەر سوریە بە هێرشێک بۆ سەر سیاسەتی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێکدەداتەوە و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەو مەسەلەیە دەبێ لەرێگای وتووێژ چارەسەر بێت.

٤- هەڵسەنگاندن: ئەوە کە خانۆڤ بەو راشکاویە ناکۆکیەکانی عێراق و سۆڤیەتی شیکردەوە و لە هەمان کاتدا ئاماژەی بە واتای سەفەرەکەی راکفیلێر[٤٢٤] و چالاکییەکانی دیکەی ئەمریکا کرد، نیشان دەدات کە پەیوەندیەکانی سۆڤیەت و عێراق گەیشتوەتە ئاستی پەیوەندیە سارد و بێ وتووێژەکانی عێراق لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەدا[٤٢٥]. یەکێتی سۆڤیەت درێژە بەو سیاسەتە دەدات کە وەک شەریکێکی ئابووری

---

[٤٢٤] مەبەستی نیلسۆن راکفلێر، جێگری سەرۆک کۆماری ئەو کاتی ئەمریکایە. وەرگێڕ

[٤٢٥]-باڵوێزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ رۆژی ١٨ی نیسانی ١٩٧٥ واتا مانگێک دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول تیلیگرامێکی لە ژێر ناوی "سەردانە ٢٤ کاتژمیریەکەی سەدام حوسەین بۆ مسکۆ" ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و باسی ئەوەی کردوە کە پەیوەندیەکانی عێراق و سۆڤیەت سارد بووەتەوە و وەکوو پێویست لە مۆسکۆ پێشوازی لە سەدام نەکراوە و سەدام هیچ رێکەوتننامەیەکی بازرگانی گرنگیشی لەگەڵ سۆڤیەت واژۆ نەکردوە. لەو تیلیگرامەدا هاتوە کە باڵوێزی ئوردون لە مۆسکۆ پێیراگەیاندین کە ئامانجی سەرەکی سەفەرەکەی سەدام حوسەین بۆ مۆسکۆ ئەوە بوە کە چۆنیەتی رێکەوتنی ئێران و عێراق لە جەزایێر بۆ سۆڤیەت شی بکاتەوە و سۆڤیەتیش بە رواڵەت خۆشحاڵی خۆی بەنیسبەت ئەو رێکەوتننامەیە دەربڕیوە. لە تیلیگرامەکەدا هاتوە کە هەرچەند کە لە راگەیاندنامەکەی سۆڤیەت دەربارەی ئەنجامی سەفەرەکەی سەدامدا هیچ ئاماژەیەک بە کێشەی

و فرۆشیاری چەکوچۆڵ بە عێراق و وەک هاوپەیمانێکی سیاسی، لە ئاستی گەلێ لە مەسەلە نێونەتەوەیەکاندا دەورێکی گرنگ لە عێراق بگێڕێت. بەهەرحاڵ لە کردەوەدا وادیارە کە سەدام حوسەین دەیەوێت لەرێگای نزیکبوونەوە لە رۆژئاوا و داهاتی زۆری نەوتی عێراق و زاڵبوونی بەعس بە سەر هەموو گۆرەپانی سیاسی عێراقدا، کاریگەری و دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراق تا ئەو ئاستە کە بتوانێ کۆنترۆلی بکات، کەم بکاتەوە.

لۆڤری

---

کورد نەکراوە بەڵام بێگومان کۆیسینگین، وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت ئەو مەسەلەیەی لەگەڵ سەدام باس کردوە. کویسینگن ئاماژەی بە کێشەی کوردەکان کردوە و پشتیوانی خۆی لە رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی عێراقدا دەربڕیوە بەڵام سەدام حوسەین ئەوەی پێناخۆش بوە و وێڕای ئاماژەکردن بە دەستەواژەی" خەڵکی کوردی خۆمان" ناڕاستەوخۆ وتویەتی دەستێوەردانی وڵاتانی دیکە لە کاروباری ناوخۆیی عێراق قبووڵ ناکرێت. (وەرگێڕ)

**لە هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: ژنێراڵ برێنت سکۆکرافت، کۆشکی سپی، واشینگتۆن**

**١٠ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی**

**بابەت: نامەیەکی بەپەلەی ژنێراڵ مەلا مستەفا بارزانی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا**

بەڕێز جەنابی دۆکتۆر هێنری کیسینجێر
وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی
جەنابی وەزیر،

ئێمە هەمیشە باوەڕیمان بە چارەسەربوونی ئاشتیخوازانەی ناکۆکیەکان، لەوانە ناکۆکیەکانی نیوان ئێران و عێراق هەیە و ئێستا خۆشحاڵین کە ئەم دوو وڵاتە لە جەزاییر پێکەوە ڕێکەوتوون. بەڵام بەهەرحاڵ دڵمان پڕ لە خوێنە کە دەبینین ئەنجام و ئاکامی ڕاستەوخۆی ئەو ڕێکەوتنە، تێکشکانی بێ وێنەی خەڵکی نەپارێزراوی ئێمەیە چونکە ئێران سنوری خۆی داخستوە و بە تەواوی کۆتایی بە یارمەتیدانی ئێمە هێناوە لە کاتێکدا کە دەوڵەتی عێراق گەورەترین هێرشی دژی ئێمە دەستپێکردوە کە ئێستاش بەردەوامە. گەلەکەمان و بزووتنەوەکەمان بە شێوەیەک کە کەس ناتوانێت باوەڕ بکات تێکدەشکێندرێت و هەموو کەس بێدەنگە.

جەنابی (وەزیر)،

ئێمه پێمانوایه که ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا له رووی ئەخلاقی و سیاسیەوه لەبەرامبەر گەلەکەمان بەرپرسیاره چونکه ئێمه باوەڕمان به سیاسەتی ولاتەکەی ئێوه کردبوو. بەلەبەرچاوگرتنی ئەم بارودۆخه داوا له جەنابتان دەکەین به زووترین کات ئەم دوو هەنگاوه هەڵبگرن:

١- هێرشی عێراق رابوەستێنن و ڕێگا خۆش بکەن بۆ وتووێژی ئێمه لەگەڵ عێراق بۆ گەیشتن به ڕێگاچارەیەک بۆ ئەوەی لانیکەم خەڵکەکەمان تووشی کۆمەڵکوژی نەبێت.

٢- دەوڵەتی ئێرانی دۆستمان رازی بکەن لەم کات و ساته مێژووییه خەمبار و دڵتەزێنەدا یارمەتی خەڵکەکەمان بدات و ڕێگا بەوه بدات لانیکەم خەڵکەکەمان و پێشمەرگەکان ژیانی خۆیان بکەن و لانیکەم کۆمەڵێک چالاکی پێشمەرگایەتیانه له کوردستانی عێراق ئەنجام بدەن تا ئەو کاته که کێشەکەمان له چوارچێوەی ڕێکەوتنه گشتیەکەی ئێران و عێراقدا چارەسەر دەبێت.

جەنابی وەزیر،

ئێمه به دڵگرانیەوه چاوەڕوانی وەڵام و کردەوەی خێرای جەنابتانین و دڵنیاین که ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم کات و ساته هەستیار و چارەنووسسازەدا بێدەنگ نابێت.

هەروەها ئێمه ئەم داواکاریانه به تێروتەسەلی تەسلیم به شاهەنشای ئێران دەکەین.

جەنابی وەزیر،

ئەوپەڕی رێز و پێزانینمان قبووڵ بفەرموون و هیوای باشترینەکانتان بۆ بەئاوات دەخوازین.

مستەفا بارزانی

**تێبینی باڵوێز:** روونه که ئێران شتێکی بەدەستەوەیه و ئێمەش به رێژەیەکی کەمتر شتێکمان بەدەستەوەیه، بارزانیش دەستپاچه و نیگەرانه. لەوانەیه باش بێت ئێوه پەیامێکی دڵنیاییدانەوەی بۆ بنێرن وەگەرنا لەگەڵ کۆمەڵێک جاڕوجەنجاڵی نەخوازراو رووبەڕوو دەبینەوه که بەمشێوەیه دەتوانین پێشی پێبگرین. من و بەڕێز(رەش

کراوەتەوە - وەرگێڕ) پێشنیار دەکەین یارمەتیەکانمان بە کوردەکان وەک خۆی بەردەوام بێت بۆ ئەوەی زانیاری هەواڵگری سەربەخۆمان دەربارەی بارودۆخی کوردەکان و هەروەها عێراق بەدەست بگات. ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە دەمانەوێت لە ڕۆژانی داهاتوودا بیبینین.

**لە هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کۆشکی سپی**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تاران**

**١٠ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی**

**بابەت: پەیامی وەزیری دەرەوە بۆ شای ئێران دەربارەی ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ عێراق لە جەزاییر**

خاوەن شکۆ محمد رەزا پەهلەوی شاهەنشا ئاریامیهر

زۆر سپاستان دەکەم کە لە ڕێگای باڵوێز "هێڵمز"ەوە وردەکارییەکانی ڕێکەوتنەکەتان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بەدەستم گەیشت.

سەبارەت بە کێشەی کورد، شتێکی ئەوتۆم نیە بە سەر ئەو بۆچوونانەدا زیادی بکەم کە لە کاتی دوایین دیدارە دووبەدووەکەماندا پێموتی. روونە کە ئێوە مافی خۆتانە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەتان بڕیار بدەن. سیاسەتی ئێمە بەردەوام ئەوەیە کە پشتیوانی لە ئێران وەک دۆستێکی نزیک و وەفاداری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەین. ئەڵبەتە من بە پەرۆشەوە سەیری پەرەسەندنی پەیوەندیەکانی ئێران - عێراق و سیاسەتی عێراق لە ناوچەکەتان بەگشتی و سۆڤیەت بە تایبەتی دەکەم".

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا

هێنرى کیسینجێر[٤٢٦]

---

[٤٢٦] ئەم پەیامەی کیسینجێر بۆ شا ساردییەکی پێوە دیارە و کیسینجێر پیرۆزبایی رێکەوتنی جەزاییری لە شا نەکردووە. ئەسەدوڵا عەلەم، وەزیری دەرباری ئێران لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت پەیامەکەی کیسینجێر ئەوەندە سارد بوو کە شا وتی پێویست ناکات وەڵامی بدەنەوە و سپاسی بکەن. عەلەم هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە کیسینجێر رێکەوتنی جەزاییری پێناخۆش بوو. بۆ زانیاری زیاتر لەم پەیوەندییەدا بنواڕن بۆ پێشەکی ئەم کتێبە. وەرگێڕ

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ: نووسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە ئەسوان، میسر**

**١٣ی ئاداری ١٩٧٥**

**بابەت: هۆکارەکانی رێکەوتنی ئێران و عێراق لە جەزاییر و نسکۆی شۆڕشی کورد**

بۆ زانیاری: وەزارەتی بەرگری

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٩٦٨ و ٢٢٣٧ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران

١- هێرشە بەردەوامەکانی هێزەکانی عێراق دژی کوردەکان، رێکەوتنەکەی شا لەگەڵ عێراق لە جەزاییر دەخاتە ناو مەترسیەوە. وەڵامی ئەو پرسیارە کە بۆ شا ئەو قومارەی کرد و خۆی خستە ناو ئەم بارودۆخە شڵەژاوە ئەوەیە کە:

٢- هەروەها کە لە تیلیگرامەکانی پێشووتردا ئاماژەمان پێکردوە، شا چوار ساڵ کاتی دەویست بۆ ئەوەی شەرتومەرجەکانی پەیماننامەی ١٩٣٧ دەربارەی شەتولعەرەب هەڵبوەشێنێتەوە. ئەو مەسەلەیە بۆ شا زۆر گرنگ بوو و لەو پەیوەندییەدا شا تەنیا بە گوێی خۆی دەکرد. پاشان کە جێگری سەرۆک کۆماری عێراق، سەدام حوسەین، بە شێوەی فەرمی لە دانیشتتنی گەلێک لە سەرۆک کۆمارەکانی وڵاتانی عەرەبیدا بەوە رازی بوو کە سنووری شەتولعەرەب سەرلەنوێ لە سەر بنەمای هێڵی "تالوێگ"[٤٢٧] پێناسە بکرێتەوە، ئەو پوانە ( کە تەنانەت نوری سەعیدیش بەردەوام

[427] Thalweg

ڕەتی دەکردەوە بیدات بە ئێران) بوو بە تەوەری ڕێکەوتنێکی نێونەتەوەیی. ئەو مەسەلەیە پێگەی یاسایی ئێران بەهێزتر دەکات تەنانەت ئەگەر ئەو کاتەش کە باسی وتووێژی ڕاستەقینە بۆ پێکهێنانی پەیماننامەیەکی نوێ هاتە ئاراوە، سەدام حوسەین نەچیتە ژێر باری ئەو مەسەلەیە.

هەروەها ڕژیمەکانی دیکەی عێراق لە داهاتوودا لە پێگەیەکی باشتردا دەبن بۆ ئەوەی هێڵی "تالوێگ" وەک مافی سنووری قبووڵ بکەن چونکە ئەو پرەنسیپە پێشتر لە لایەن دەوڵەتێکەوە کە ناسیۆنالیستە توندئاژۆ عەرەبەکان دەسەڵاتدارینی، قبوڵ کراوە. بۆ گەیشتن بەو پوانە شا "کارتی کورد"ی فڕێدا چونکە بێ گومان ئیدی کەڵکی بۆی نیە. لەوانەیە شا پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە سەدام حوسەین بە دەرکردنی بڕیاری هێرشی هەمەلایەنە بۆ سەر کوردەکان، کتوپڕ شەرتومەرجەکانی ڕێکەوتنەکەی جەزاییر پێشیل بکات. شا هەرچۆنێک لای خۆی بیریشی کردبێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەو ڕاستیە ڕووبەڕوو بووەوە کە ناچارە ئەو بانگەشەیەی دەوڵەتی عێراق قبووڵ بکات کە هێزەکانی عێراق تەنیا بەرگریان لە هێرشەکانی کوردەکان کردوە. بە واتایەکی دیکە سەدام حوسەین بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە فێڵی لە شا کردوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستیە کە شا بڕیاری داوە ئیدی ڕاستەوخۆ خۆی نەخاتە ناو کێشەی عێراق، هەر بۆیە خۆی ناخاتەوەشک کە دەوڵەتی عێراق بە ئەنقەست ڕێکەوتنەکەی جەزاییری پێشێل کردوە.

ڕوونە کە شا بە پارێز و دیقەتەوە هەنگاو هەڵدەگرێت بەڵام وادیارە لەو مەسەلەیەدا پەلەی کردوە. بە وتەی ئوری لوبرانی[٤٢٨]، نوێنەری ئیسرائیل لە ئەمریکا، کاربەدەستانی سیاسی و سەربازی ئێران یەکەمجار کاتێک ئاگاداری ڕێکەوتنەکەی شا و سەدام حوسەین بونەتەوە کە شا لە جەزاییر گەڕاوەتەوە بۆ ئێران و هەر کە پێی گەیشتوەتە تاران، دەستی کردوە بە دەرکردنی فەرمان. وەزیری دەرباری ئێران، عەلەم ڕۆژی پێنجشەمە لە گفتوگۆیەکدا جارێکی دیکە جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە شا پێداگرە کە دەربارەی شەتولعەرب لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت. ڕوونە کە

---

[428] Uri Lubrani

دەوڵەتی ئێران ئێستا لەگەڵ هەموو جۆرە رەفتارێکی سەدام حوسەین رووبەڕوو بوەتەوە چونکە بە قسەی ئەو کەسانەی کە شێوەی بیرکردنەوەی بەعس دەناسن، سەدام حوسەین هەموو شتێکی لێ دەوەشێتەوە. ئەو کەسانە کە بەعس دەناسن، پێیانسەیرە چۆن شا (کە خۆی باش عەرەبەکان دەناسێت) ئاوا بەم سانایيە کەوتوەتە ناو داو. ئەو کەسانە دەڵێن مەسەلەی شەتولعەرەب ئەوەندەش گرنگ نەبوو بەڵام وادیارە هەروا کە ئاماژەمان پێکرد بۆ شا گرنگ بوو.

لوبرانی ئێوارەی رۆژی چوارشەمە پرسیاری لێکردم رام چیە دەربارەی هەڵسووکەوتەکانی شا بە نیسبەت عێراق. من سەرباری خستنەڕووی ئەو شتانە کە لە سەرەوە باسکرا، ئاماژەم بەوە کرد کە هیچ شتێک لە ئارادا نیە کە نیشان بدات ئێران لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا لە عەرەبە توندئاژۆکان یا وڵاتە عەرەبیەکان نزیک بووبێتەوە. شا لەم رۆژانەدا بە خۆشحاڵیەوە ئەو وتەیەی ئەشرەف مەروان[٤٢٩]، راوێژکاری سادات، سەرۆک کۆماری میسری دەگێڕایەوە کە لە کاتی سەردانەکەی ئەمدوایانەی بۆ ئێران وتبووی: " ئێمەی میسری لە لایەن عەرەبەکانەوە بەخێو دەکرێین". هەروەها هیچ شتێک لە ئارادا نیە کە نیشان بدات شا ئێستا لە چاو جاران متمانەی بە دەوڵەتی عێراق زیاتر بووبێت بەڵکوو تەنها دەیەوێت دەربارەی شەتولعەرب لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت.

لوبرانی بیری لەم شرۆڤانەی من دەکردەوە، پاشان وتی لە رووی دەروونیەوە ئەو شتانە کە باستکرد لە شا دەوەشێتەوە. دواتر وتی پێیوانیە کە دەوڵەتی عێراق بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی لە بەرەی شەڕ لەگەڵ کوردەکان بکشێنێتەوە و لە ئەنجامدا هاوسەنگی سەربازیی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیل تیکناچێت. لوبرانی هەروەها وتی دەوڵەتی عێراق هەوڵ دەدات بە خێراترین شێوە هەرێمی کوردنشین تەعریب بکات بەڵام جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەو سیاسەتە کاتی دەوێت. لوبرانی زیاتر نیگەرانی ئەوە بوو کە ئێران لە نەتەوە

---

[429] Ashraf Marwan

توندئاژۆ عەرەبەکان نزیک بووبێتەوە بەڵام وادیارە دوای ئەوەی بۆچوونەکانی منی بیست ئەرخەیانتر بوەوە.

ئینگیرسۆل بە وەکالەت لە لایەن هێڵمز

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ: کونسولخانەی ئەمریکا لە ئۆرشەلیم**

**١٤ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی، بەپەلە**

**بابەت: دوایین پەیامی بارزانی بۆ شا و وردەکاریەکانی رێکەوتنی ئێران و عێراق لە جەزاییر**

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٩٦٨ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوە

١- سەر لە ئیوارەی ٨ی ئادار لەگەڵ شا دیدارم کرد و لەو دیدارەدا شا باسی ئەو شتانەی کرد کە لە کاتی وتووێژەکانی لەگەڵ جێگری سەرۆک کۆماری عێراق، سەدام حوسەین لە جەزاییر رویدابوو. شا لە سەرەتای قسەکانیدا وتی:

"پێش ئەوەی تاران بەرەو جەزاییر بەجێبێڵم، پەیامێکم لەلایەن ژنراڵ بارزانیەوە بەدەست گەیشت کە تێیدا بارزانی وتبووی ئیدی موومکین نیە کوردەکان بتوانن لەم بارودۆخەدا لەگەڵ هێزەکانی عێراق شەڕ بکەن و ئەگەر شتێک نەکرێت، خەڵکی کورد کۆمەڵکوژ دەبێت. ژنراڵ بارزانی هەروەها رایگەیاندبوو کە هێزە کوردەکان پێویستیان بە پێشکەوتووترین چەکوچۆڵ و پشتیوانی سەربازی زیاتری ئێران هەیە، کەوابوو یا دەبێ لەو پەیوەندیەدا یارمەتی کوردەکان بدرێت یان دەبێت رێگە بە کوردەکان بدرێت سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن بە هەمان شێوە کە قوبرس سەربەخۆیی راگەیاندوە ".

پاشان شا وتی:" ئەوکاتە دەرکم بەوە نەدەکرد چۆن ئێران بتوانێت یارمەتیە سەربازیەکانی بە کوردەکان زیاد بکات بێ ئەوەی خۆی بخاتە ناو شەڕێکی ئاشکرا لەگەڵ هێزەکانی عێراقدا. دواتر لە ٢ی ئادار ئەشرەف مەروان، راوێژکاری سادات، سەرۆک کۆماری میسر سەردانی کردم کە تازە لە بەغداد هاتبوو بۆ تاران. ئەو دانیشتنە رۆژێک دوای ئەوە بەڕێوەچوو کە من دواجار ئێوەم بینی. مەروان ئەو پەیامەی دووپات کردەوە کە پێشتر لەرێگای کۆمەڵێک کەسی دیکەوە بەدەستم گەیشتبوو واتا سەدام حوسەین وتبووی ئامادەیە عێراق لە بازنەی سۆڤیەت بکشێنێتەوە ئەگەر ئێران ئەو گوشارە سەربازیە لە سەر عێراق لا ببات کە عێراقی ناچار کردوە لەگەڵ سۆڤیەت رێکبکەوێت[٤٣٠]. مەروان هەروەها وتی دڵنیایە کە سەدام حوسەین هەروا کە بەڵێنی داوە، خۆی لە سۆڤیەت دوور دەخاتەوە".

شا وتی ئاگاداری ئەوەیە کە ساڵی پار سۆڤیەت لەگەڵ عێراق رێکەوتوە بۆ ئەوەی برێکی زۆر چەکی بەهێز بدات بە عێراق و وتی کە گەیشتمە جەزایر، سەرۆک کۆماری جەزایر بۆمیدیەن[٤٣١]، کەوتە جموجۆڵ و وتی زۆر پێیخۆشە من و سەدام پێکەوە دیدار بکەین. دانیشتنی یەکەمی من و سەدام هیچ ئەنجامێکی نەبوو و سەدام هەمان ئەو شتانەی دەگوت کە کاربەدەستانی عێراق دە ساڵە دەیڵێن و منیش ئەوەم بە بومیدیەن وت بەڵام لە دانیشتنی دووەمدا گۆڕانکاریەکی گەورە هاتە ئاراوە کە ئەنجامەکانی لە لایەن راگەیاندنەکانەوە بڵاو کرایەوە.

---

[٤٣٠] مەبەستی ئەوەیە کە سەدام ناچار بوە بۆ وەرگرتنی چەکوچۆڵی سەربازی بۆ سەرکوتی شۆڕشی کورد لەگەڵ سۆڤیەت رێکبکەوێت. نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد لە پەیامێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ئاداری ١٩٧٥ رایگەیاندوە کە سەدام لە دانیشتنی کۆمکاری عەرەبیدا بە باڵوێزی مەغریبی وتووە کە دەوڵەتی عێراق سۆڤیەتی تەنها بۆ ئەوە دەوێت کە یارمەتی بدات کێشەی کورد لە ناو ببات و پاش ئەوە کە کێشەی کورد لەئارادا نەما عێراق ئیدی هیچ پێویستیەکی بە سۆڤیەت نامێنێت و پەیوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤیەت دەپچڕێنێت. وەرگێڕ

[431] Boumediene

شا وتی سەبارەت بە کوردەکان، من دوو بەڵێنم لە سەدام وەرگەرت: یەکەم ئەوە کە یەک حەوتوو کات بە بارزانی و هاوڕێیانی بدرێت بۆ ئەوەی بڕیاری خۆیان بدەن کە دەیانەوێت لە عێراق بمێننەوە یان بێ شەڕ و خوێنڕشتن بەرەو ئێران پاشەکشە بکەن و ژیانێکی باش لە ئێران دەستپێبکەن. شا وتی بارزانی و هاوڕێیانی تا کۆتایی ئەم مانگە (پێموابێ مەبەستی مانگی ئێرانی بوو کە ٢٠ی ئادار کۆتایی پێدێت) کاتیان لە بەردەستدایە بەرەو ئێران پاشەکشە بکەن. شا وتی بەڵێنی دووەم کە سەدام پێمیدا ئەوە بوو کە هێزەکانی ئاسایشی ئێران و عێراق پێکەوە هاوکاری بکەن و بە یەکدی بڵێن کە کام کورد باشە و کام کورد خراپە (مەبەستی لە کوردە خراپەکان، کوردە کومونیستەکان بوو). شا وتی هیوادارە کە لە ئەنجامی ئەو هاوکاریەی ئێران و عێراقدا، پێش لەوە بگیردرێت کە کۆمەڵگایەکی کوردی کومونیستی لە سەر خاکی بارزانی دابمەزرێت. شا لە درێژەی قسەکانیدا وتی ئەڵبەتە دەوڵەتی عێراق عەفوات بە کوردەکان دەدات و ئاماژەی بەوە کرد کە دەوڵەتی عێراق ئەمدوایە پڕۆپاگەندا دژمنکارانەکەی دژی ئێران راوەستاندوە.

شا وتی هەموو ئەو شتانە بە ئامادەبوونی بومیدیەن ڕێکەوتنی لە سەر کراوە و بومیدیەن هەمووی پەسەند کردوە. شا جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە کەس نازانێت ئەو ڕێکەوتنە چۆن دەچێتەپێش بەڵام هەست دەکات کە ناچارە لەو هەلە کەڵک وەربگرێت و ئەگەر وانەکات هیچ هیوایەک نامێنێت بۆ ئەوەی کوردەکان لە داهاتوویەکی نزیکدا بگەن بە ئاماجی خۆیان و خۆیشی بەوە تۆمەتبار دەکرێت کە ئەو هەلەی لە کیسداوە کە عێراق لە بازنەی سۆڤیەت بێنێتە دەرەوە. شا وتی بەهەرحاڵ بومیدیەن زۆر ئەو ڕێکەوتنەی پێیخۆش بوو و سەرجەم بەشدارانی کۆنفرانسی OPECیش خۆشحاڵ بوون.

شا هەروەها وتی لەوانەیە بۆ من ( هێڵمز) سەرنجڕاکێش بێت کە سەدام حوسەین دەیەوێت بە زووترین کات هەنگاو هەڵبگرێت بۆ ئەوەی پەیمانێکی ئاسایشی ناوچەیی بۆ کەنداوی فارس پێکبێت بەڵام من وتم هێشتا کاتی ئەوە نەهاتوە و ئەو پیشنیارەم رەت کردەوە. شا وتی ئەو پێشنیارەی سەدامم بۆ ئەوە باسکرد کە پێت بڵێم سەدام

که سەرەتا زۆر دژی ئەو پەیمانە بوو، ئێستا چەندە بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ ئێران ئامادەیە. شا وتی ژنراڵ بارزانی ئێستا لە تارانە و بڕیارەکانی منی پێڕاگەیندراوە بەڵام بارزانی هێشتا پێینەوتووە بڕیاری چیە.

٢- لە وەڵامی پرسیارێکی مندا شا وتی لە کاتی وتووێژ لەگەڵ سەدامدا، ئەو و بومیدیەن پێکەوە بە زمانی فەرەنسی قسەیان کردوە و وەرگێڕێک ئەو قسانەی کردوە بە عەرەبی بۆ سەدام. شا وتی سەدام پێش ئەوەی بگات بە دەسەڵات تروریست بوو، هیچ خوێندەوارییەکی تایبەتی نیە و تا ئەو شوینە کەمن دەزانم تەنها زمانی عەرەبی دەزانێت. پاشان شا زەردەخەنەیەکی کرد و پێمیوت ئایا دەتوانی تەسەوری ئەوە بکەیت کە چەندە ئەو کاتەم پێناخۆش بوو کە لە بەرچاوی سەرجەم بەشداربوانی کۆنفرانسیOPEC ، تروریستێکی وەک سەدامم لەباوەش گرت.

٣- شا ئاماژەی بەوە کرد کە کتوپڕ دوای ئەوەی کە پەیماننامەکە لە جەزاییر مۆر کرا، دەوڵەتی عێراق فەرمانی بە هێزەکانی خۆی دا هێرش بکەنە سەر کوردەکان و وتی من ئەوەم وەبیری بومیدیەن هێناوەتەوە کە ئەو کارەی عێراق پێشێلکردنی تێگەیشتنی هەر دوو لا دەربارەی ڕێکەوتنەکەیە بەڵام وتی نازانێت ئایا ئەو ناڕەزایەتی دەربڕینە هیچ کاریگەرییەکی لە سەر دەوڵەتی عێراق بوە یا نا.

٤- پاشان شا دەستی کرد بە فەلسەفەبافی دەربارەی بنەماڵەی پەهلەوی و وتی هەرچەند کە هەموو کەس دان بە وەدا دەنێت کە ڕەزاشای باوکم وڵاتپەرەستێکی گەورە بوە بەڵام ڕەخنەی دوو شتی لەسەرە: یەکەم ئەوە کە نەوتی ئێرانی نیشتمانی نەکرد و دووەم ئەوە کە پەیماننامەی ١٩٣٧ دەربارەی سنووری شەتولعەرەبی قبووڵ کرد[٤٣٢]. پاشان شا وتی بەڵام ئێستا ئێمە بە تەواوی سەرچاوەکانی نەوتی وڵاتەکەمان نیشتمانی کردوە و سەرەنجامیش بەوە گەیشتین کە پرەنسیپی "تالوێگ" ببێت بە

---

[٤٣٢] مەبەستی ئەو پەیماننامەیەیە کە ساڵی ١٩٣٧ بە گوشاری بریتانیا لە نێوان ئێران و عێراقدا واژۆ کرا و ئێران بەوە ڕازی بوو کە بە قازانجی عێراق دەست لە شەتولعەرەب هەڵبگرێت. وەرگێڕ

بنەمای پێناسەکردنی سنووری روبارەکانمان. بە واتایەکی دیکە شا لە بەدەستهێنانی ئەو دوو شتە، بەتایبەت ئەوەی شەتولعەرەب خۆشحاڵە.

٥- یادداشتی ئینگیرسۆل[٤٣٣]: خاڵە سەرەکیەکانی ئەم پەیامە رۆژی ٨ی ئادار ناردراوە بۆ وەزیری دەرەوە و رۆژی ٩ی ئاداریش گەیشتوەتە دەستی من.

ئینگیرسۆل بە وەکالەت لە لایەن هێڵمز

---

[٤٣٣]-روبیرت ئینگیرسۆل لە ١٠ی تەموزی ١٩٧٤ تا ٣١ی ئاداری ١٩٧٥ واتا لە کۆتایی سەرۆک کۆماری نیکسۆن و سەرەتای سەرۆک کۆماری جێراڵد فۆرد، جێگری یەکەمی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو. (وەرگێڕ).

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٣٣٥٩**

**١٥ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی**

**بابەت: کۆتاییپێهاتنی یارمەتیەکانی ئێران بە کوردەکان و دوایین دیداری بارزانی لەگەڵ کاربەدەستانی ئێران**

بۆ زانیاری:

- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران
- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- لەوانەیە ئەم زانیاریانە بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران شتێکی نوێ نەبێت بەڵام سەرچاوەیەکی دانیشتوی لوبنان کە پەیوەندی راستەوخۆی لەگەڵ بارزانی و مەکتەبی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە هەیە، پێمانیوت سەرۆکی SAWAK، ژینیراڵ نەسیری رۆژی ٥ی ئادار لە تاران لەگەڵ مستەفا بارزانی دیداری کردوە. ژینیراڵ نەسیری بەشێوەیەکی راشکاوانە و گوستاخانە بە بارزانی وتوە کە:

الف - سنوری ئێران و عێراق بە رووی هەموو کەسێک و هەموو هاتوچۆیەک دادەخرێت.

ب- کوردەکان نابێ لەوە زیاتر چاوەڕوانی یارمەتی ئێران بن.

ج - بارزانی دەبێ بەگوێرەی هەر شەرتومەرجێک کە دەتوانێت، کێشەکەی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق چارەسەر بکات

د- تەنها بە مەرجێک ڕێگا بە هێزەکانی پێشمەرگە دەدرێت پەنا بۆ ئێران بێنن کە ببن بە گروپگەلی بچووک بچووک و چەکەکانیان تەسلیم بە سپای ئێران بکەن.

بە وتەی ئەو سەرچاوەیە، بارزانی بەشێوەیەکی ئارام و لەسەرخۆ وەڵامی قسەکانی ژینیراڵ نەسیری داوەتەوە بەڵام مەحمود عوسمان بە توندی وەڵامی ئەو گوستاخیەی نەسیری و خیانەتی شا بە کوردەکانی داوەتەوە و بەو هۆیەوە شا و نەسیری سەرزەنش کردوە. مەحمود عوسمان سوێندی خواردوە کە کوردەکان دەست لە خەباتەکەیان دژی هێزەکانی عێراق هەڵناگرن و بە توندی هەڕەشەی ئەوەی لە دەوڵەتی ئێران کردوە کە کوردەکانی ئێران کێشە و گیروگرفت بۆ شا درست دەکەن. بارزانیش سەری لەقاندوە و ئەو قسانەی مەحمود عوسمانی پشتڕاست کردوەتەوە[٤٣٤].

پاش ئەوە کە ژینیراڵ نەسیری چوەتە دەرەوە، بارزانی بە هاوڕێکانی وتوە پەیامێک بنێرن بۆ حاجی عومران بۆ ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان "پلانی ئامادەیی" جێبەجێ بکات کە چەند مانگ لەمەوپێش بۆ ئەگەرێکی وەها ئامادە کراوە.

٣- بە وتەی ئەو سەرچاوەیە پلانی ئامادەیی بارزانی کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی گرنگ لە تاکتیکەکانی کوردەکان دژی سپای عێراق لە خۆ دەگرێت. بە پێی ئەو پلانە لە باتی شەڕی بەرەیی لە باکوری عێراق، هێزی پێشمەرگە بە سەر گروپگەلی بچوک بچووکی گەڕۆکدا دابەش دەبن و لە چیاکانەوە دزە دەکەنە ناوچەکانی خوارەوە و شەڕێکی پێشمەرگایەتیانەی بەرفراوان دژی بنکەکانی هێزەکانی عێراق لە شار و شارۆچکەکاندا دەستپێدەکەن و ڕێگا سەرەکیەکان دەبڕن و هێرش دەکەنە سەر دامەزراوە نەوتیە گرنگەکانی عێراق. ئەو سەرچاوەیە بانگەشەی ئەوەی کرد کە بارزانی ئەمدوایانە پێیوتوە کە هێزی پێشمەرگە چەک و تەقەمەنی پێویستی هەیە بۆ ئەوەی بە ماوەی چەند ساڵ بەمشێوەیە هێرشگەلی بەرفراوان بکاتە سەر هێزەکانی عێراق.

---

[٤٣٤] دۆکتۆر مەحمود عوسمان لە کاتی دوایین دیداری ڕێبەرایەتی شۆڕش لەگەڵ شا لە ١٢ی ئادار ئەو قسانەی بە خودی شا وتووە نە بە ژنێراڵ نەسیری. بۆ دەقی قسەکانی دۆکتۆر مەحمود عوسمان لای شا و قسەکانی ژنراڵ نەسیری لەو دانیشتنەدا بنواڕن بۆ پێشەکی ئەم کتێبە (وەرگێڕ).

ئەو سەرچاوەیە وتی ئەو زانیاریانەی سێ ڕۆژ لەمەو پێش بەدەست گەیشتوە بەڵام سەرلەبەیانی ئەمڕۆ(١٣ی ئادار) بیستویەتی کە بارزانی سەرەڕای هەڕەشەکانی پێشووی ژنراڵ نەسیری گەڕاوەتەوە بۆ کوردستانی عێراق. بارزانی پێش گەرانەوە بۆ کوردستان پەیامێکی لە لایەن شاوە بەدەست گەیشتوە کە تێیدا شا بە هۆی "هەڵسووکەوتە خراپەکەی" ژنراڵ نەسیری داوای لێبوردنی لە بارزانی کردوە[٤٣٥]. ئەو سەرچاوەیە هەروەها وتی شا لە هێرشە گەورە نوێکانی سپای عێراق دژی پێشمەرگەکان لە ٥ی ئادار تورە بوە و ئەو کردەوەیەی عێراق بە پێشیلکردنی ڕێکەوتنەکەی خۆی و سەدام حوسەین لە جەزاییر دەزانێت.

ئەو سەرچاوەیە هەروەها وتی لەوانەیە شا لەمەوبەدوا بە چاوی گومانەوە سەیری شەرتومەرجەکانی ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق بکات. سەرچاوەکە هەروەها بانگەشەی ئەوە کرد کە دەوڵەتی سوریە، عەرەبستانی سعودی و تەنانەت لیبی ئەوەیان پێناخۆشە کە شا کتوپڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق ڕێکەوتوە و لەوانەیە عەرەبستانی سعودی لە ڕێگای باکووری سوریەوە پێداویستیەکانی بارزانی دابین بکات.

گودلی[٤٣٦]

---

[٤٣٥] بە وتەی دۆکتۆر مەحمود عوسمان، هەڵسوکەوتی ژنراڵ نەسیری خراپ نەبوە و تەنیا بڕیارەکانی شای بەوان ڕاگەیاندووە. هەروەها مامۆستا هەژار( کە خۆی لەو دانیشتنەدا ئامادە بووە) لە لاپەڕەی ٥٥٣ی کتێبی "چێشتی مجێور"دا دەڵێت کە نەسیری هەر کە هاتوەتە ژورەوە وەک هەمیشە مەلا مستەفای ماچ کردوە و هەڵسوکەوتی لەگەڵیان دۆستانە بووە. وەرگێڕ

436 Godley

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٦٦٢**

**١٧ی ئاداری ١٩٧٥**

**بابەت: كاریگەری رێكەوتننامە سنووریەكەی ئێران و عێراق لە سەر كوردەكان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ئەبوزەبی، جەزاییر، ئانكارا، دۆحە، كووەیت، مەنامە، مەسقەت، دەمیشق و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەكانی ئەمریكا لە بەغداد

١- وەک هەنگاوێكی بچووک بۆ جێبەجێكردنی رێكەوتننامەی جەزاییر، وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عێراق كاتژمێر ٨ی سەرلەبەیانی رۆژی ١٧ی ئادار رێكەوتننامەیەكی سنوریان واژۆ كرد. ئەو رێكەوتننامەیە بە ئامادەبوونی وەزیری دەرەوەی جەزاییر، بوتەفلیقە[٤٣٧] واژۆ كرا كە هەر ئەو رۆژە تارانی بەجێهێشت و دوای ئەویش، حەمادی[٤٣٨]، وەزیری دەرەوەی عێراق تارانی بەجێهێشت. بەوتەی ئاژانسی هەواڵنێری ئێران هەندێ لە خاڵەكانی رێكەوتننامەی جەزاییر لە رێكەوتنە سنوریە نوێكەدا دووپات كراوەتەوە. لە راگەیاندننامەی ئەو رێكەوتنەدا هاتوە كە سێ كۆمیتەی پسپۆری لە سێ وڵات پێكهاتوە بۆ ئەوەی:

الف- سنوری زەمینی ئێران و عێراق تاوتوێ بكەن.

---

[437] Algerian Fonmin Bouteflika
[438] Iraqi Fonmin Hammadi

ب- سنووری دەریایی ئێران و عێراق بەگوێرەی هێڵی "تالویگ" دیاری بکرێت.

ج- ئاسایشی سنووری ئێران و عێراق بپارێزرێت.

ئەو سێ کومیتانە لە ٥٠ پسپۆڕی سەربازی و سیاسی پێکدێت کە لە تاران پێکەوە دادەنیشن و بۆ دیداری دواتری وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عێراق ئامادەکاری دەکەن. بەگوێرەی ئەو سەرچاوەیە، راپۆرتی کاری ئەو سێ کومیتەیە تەسلیم بە وەزیرانی دەرەوەی ئێران، عێراق و جەزاییر کراوە بەڵام بۆ رای گشتی بڵاو نەکراوەتەوە.

٢- شەماڵ کەریم[439]، کاربەستی پارتی دیموکراتی کوردستان بە باڵوێزخانەی وت کە کوردەکان زۆر پێیانناخۆشە کە چارەنوسیان لە دانیشتنگەلێکدا دیاری دەکرێت کە خۆیان تێیدا بەشدار نین. شەماڵ کەریم وتی کوردەکان عەفواتەکەی عێراقیان قبوڵ نیە و هەتا کاتێک کە ئێران رێگەیان پێ بدات لە ئێران دەمێننەوە. هێشتا دیار نیە کە ئێران و عێراق لە سەر چی سیاسەتێک بۆ هەڵسووکەوتکردن لەگەڵ کوردەکان رێککەوتوون.

٣- هەر هەمان رۆژ وەزیری دەرەوەی ئێران، خەلعەتبەری[440] لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ رادیۆی ئێران وتی چاوەڕوان دەکرێت سەرۆک وەزیرانی ئێران، هوەیدا[441] مانگی فەروەردینی ئێران کە لە رۆژی ٢٢ی ئادارەوە دەستپێدەکات، بچێتە بەغداد. خەلعەتبەری لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی چارەنووسی کوردەکان وتی جموجۆڵەکانی کوردەکان بۆ تێپەڕکردنی سنوور کێشەیەکە کە دەبێ پاشان تاوتوێ بکرێت بەڵام کوردەکان بە دڵنیایەوە ناچار ناکرێن ئێران بەجێبێڵن. خەلعەتبەری هەروەها وتی چاوەڕوان دەکرێت دانیشتنی دواتری وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عێراق لە بەغداد بەڕێوە بچێت.

٤- هەڵسەنگاندن: ئەو رێکەوتنە سنوریەی ئێران و عێراق جگە لە دووپاتکردنەوەی شەرتومەرجەکانی رێکەوتننامەی جەزاییر، شتێکی ئەوتۆی دیکەی تێدا نیە. دیار نیە

---

[439] Shamal Karim مەبەستی حەبیب محمد کەریمە. وەرگێڕ.

[440] Khalatbary

[441] Hoveyda

بۆ گفتوگۆکانی ئەو دانیشتنە دوو رۆژی خایاندوە چونکە هێشتا خاڵی ناکۆکی لە سەری زۆر ماوە کە دەبێ کۆمیتەکان هەمووی تاوتوێ بکەن بەڵام لانیکەم وادیارە گفتوگۆکانی ئێران و عێراق دۆستانە و گەرم بووە و هەر دوولا جارێکی دیکە دوپاتیان کردوەتەوە کە دەیانەوێت سەرجەم کێشە سنوریەکانی ئێران و عێراق بە تەواوی چارەسەر بێت.

بە دڵنیاییەوە ئاڵۆزترین گیروگرفت لە نێوان ئەو رێکەوتنانە، کێشەی کوردەکانە. هەرچەند کە کوردەکان لە میانەی شەڕە گرانەکانی ٧-١٤ی ئادار توشی نسکۆ هاتن بەڵام بەگوێرەی زانیاریەکانی ئێران، ئاگربەستەکەی ١٣ی ئادار بەگشتی بێ کێشە بەرەوپێش دەچێت. هەر لەم پەیوەندیەدا شا رۆژی ١٧ی ئادار بە باڵوێزی ئەمریکای وت کە ئاگربەستەکە هەتا رۆژی ١ی نیسان درێژ دەکرێتەوە و رەزامەندی خۆی بەنیسبەت رەوتی وتووێژەکانی نێوان ئێران و عێراق دەربڕیوە. ئەگەر دەوڵەتی عێراق جارێکی دیکە بریار بدات لە ماوەی دوو حەوتووی داهاتوودا کێشەی کورد بۆ هەمیشە چارەسەر بکات، ئێران پێیخۆش نیە کە ئەو مەسەلەیە ببێتە هۆی تێکچوونی وتووێژەکانی ئێران و عێراق. ئێران دەیەوێت هەتا رۆژی کۆتایی ئاگربەستەکەی عێراق واتا ١ی نیسان رێگە بە کوردەکان بدات لە سنوور تیپەڕ بن چونکە لەو رۆژەوە داخستنی سنوری ئێران و عێراق بە شێوەی فەرمی دەست پێدەکات و لەو رۆژە بەدواوە ئیدی ئێران ناتوانێت پێش لە جموجۆڵەکانی عێراق دژ بە کوردەکان بگرێت.

هێلمز

## تیلیگرام لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت

## بۆ: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی، ٣٤٩١

## ٢٢ی ئاداری ١٩٧٥

## بابەت: بارودۆخی شڵەژاوی بارەگای سەرکردایەتی بارزانی و دوایین داواکاری بارزانی لە ئەمریکا

بۆ ئاگاداری خێرای: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

بۆ زانیاری:

باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئەمان، ئانکارا، قاهیرە، دەمیشق، کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز، نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد.

١- هەواڵنێری ڕۆژنامەی واشینگتۆن پۆست، جیم هۆگلەند[٤٤٢] ڕۆژی ٢٢ی ئادار سەردانی باڵوێزخانەی کرد بۆ ئەوەی داواکاریەکی زۆر بەپەلەی ڕێبەری کورد، مستەفا بارزانی بگەیەنێتە دەوڵەتی ئەمریکا. جیم هۆگلەند شەوی ١٩-٢٠ی ئادار لە

---

[٤٤٢] جیم هۆگلەند دەربارەی ناوەڕۆکی ئەم تیلیگرامە بە وەرگێڕی وت: "پاش ئەوەی کە لە ٢٠ی ئادار بارزانی لە حاجی عومران داوای لێکردم پەیامەکەی بگەیەنم بەدەستی کاربەدەستانی ئەمریکا، دەستبەجێ چووم بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروتی لوبنان بۆ ئەوەی داواکاریەکەی بارزانیان پێڕابگەیەنم و پێیانموت کە بارزانی ئەو داواکاریەی تەنها بە من وتوە چونکە متمانەی بە من بوە بەڵام دوای من چەند ڕۆژنامەنووسێکی دیکە چووبوون بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و وتبوویان بارزانی داوای هیچی لە ئەمریکا نەکردوە". وەرگێڕ

کوردستان لەگەڵ بارزانی دیمانەی کردوە. بارزانی بە هوگلەندی وتوە هیچ هیوایەک بۆ درێژەپێدان بە خەباتی کورد لەئارادا نەماوە [٤٤٣] و لە ئەنجامی گوشاری ئێراندا فەرمانی بە پێشمەرگەکان داوە چەکەکانیان دابنێن بۆ ئەوەی لەوە زیاتر خوێن بێ کەڵک نەڕژێت. بارزانی لە هەمان کاتدا زۆر بەپەلە داوای لە دەوڵەتی ئەمریکا کردوە لە بەرامبەر دەوڵەتی ئێران و عێراقدا ئەوە لە دەستی دێت بیکات بۆ ئەوەی گەلەکەی کۆمەڵکوژ نەبێت. بارزانی هەروەها داوای لە ئەمریکا کردوە مافی پەنابەری بدات بە خۆی و بنەماڵەکەی و هاوڕێ نزیکەکانی.

٢- هۆگلاند دەیگوت کەشوهەوای بارەگای سەرکردایەتی بارزانی لەڕادەبەدەر خەمگین و شڵەژاو بووە و ئیدریس بارزانی، مەسعود بارزانی و مەحمود عوسمان لە پێشهاتەکانی ئەم دوایەی باکووری عێراق بە تەواوەتی بێ هیوا بونە بەڵام بەپیچەوانەوە خودی مەلا مستەفا بارزانی ئارام و لە سەرخۆ بوە. هۆگلەند دەیگوت هەندێ لە پێشمەرگەکان هاتونەتە ئێران و چەکەکانیان تەسلیمی سپای ئێران کردوە

---

٤٤٣- جیم هۆگلەند لەو پەیوەندییەدا بە وەرگێڕی وت: "مەبەستی بارزانی لەو قسەیە ئەوە بوو کە بێ یارمەتی سەربازی بیانی، پێشمەرگە ناتوانێت لە بەرامبەر فڕۆکە و تانکی عێراقدا رابوەستێت و لە ئەنجامدا تەنها خەڵک بەکۆمەڵ دەکوژرێت. بارزانی لە کۆمەڵکوژبوونی خەڵکی سڤیل دەترسا. بارزانی جارێکیان پێیوتم دڵنیام کە نەوەی کورد لە داهاتوودا کوردستانی سەربەخۆ دەبینێت هەرچەند لەوانەیە من بە چاوی خۆم نەبینم مەگەر ئەوە کە ئەمریکا بێتە یارمەتیمان.(دیمانەی وەرگێڕ لەگەڵ جیم هۆگلەند، پاریس، ١٠ی تەموزی ٢٠١٢). هەروەها بە وتەی دۆکتۆر مەحمود عوسمان، مەلا مستەفا هەمیشە وتویەتی: "ئێمە ئەوە لە دەستمان هات کردمان و مافەکانی کوردمان لە بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠دا چەسپاند. لەوانەیە دەوری من کۆتایی پێهاتبێت بەڵام نەتەوەی کورد هەر ماوە و پاش ئێمە شتی زیاتر دەکەن". کریس کوچراش لە کتێبی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا نووسیویەتی کە مەلا مستەفا بارزانی لە کۆتایی مانگی ئادار لە دیمانەیەک لەگەڵ رۆژنامەی کەیهان، چاپی تاران وتویەتی "لەوانەیە دەوری من کۆتایی پێهاتبێت بەڵام نەتەوەی کورد هەر زیندووە و رۆڵەی گەورە لە نێو نەتەوەی کورددا هەڵدەکەوێت کە درێژە بە خەباتی ئێمە بدەن." وەرگێڕ.

بەڵام ژمارەیەکی دیکە لە پێشمەرگەکان سەرپێچیان لە فەرمانەکەی بارزانی کردوە و داویانە لە شاخ بۆ ئەوەی دژی سپای عێراق خەبات بکەن.

٢- بارزانی بە هۆگلەندی وتوە لە هەموو شتێک زیاتر نیگەرانی بارودۆخی دژواری خەڵکی مەدەنی کوردستانە چونکە پێیوایە کە بەمزوانە توشی برسێتی، نەخۆشی و سەرماوسۆڵە دەبن و لەگەڵ رەفتاری بێ بەزەیانەی کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق رووبەڕوو دەبنەوە. هۆگلەند پرسیاری کردوە ئەمریکا چی کارێکی تایبەتی لە دەست دێت بیکات بۆ ئەوەی بارودۆخەکە ئارام بێتەوە، بارزانیش لە وەڵامدا وتویەتی ئەمریکا دەبێ گوشار بخاتە سەر دەوڵەتی عێراق بۆ ئەوەی ئاگربەستەکە لانیکەم بۆ مانگێکی دیکە واتا تا کۆتایی مانگی نیسان درێژ بکاتەوە.

٣- هۆگلەند دەیگوت پێیوایە بارزانی و هاوڕێ نزیکەکانی تا ئێستا باکوری عێراقیان بەجێهێشتوە و پەنایان بۆ ئێران هێناوە. هۆگلەند لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بارزانی و هاوڕێکانی نایانەوێت ئیدی دەست لە پێشهاتەکانی داهاتووی کوردستانی عێراق وەربدەن بۆ ئەوەی ئەو رێبەرە کوردانە کە لە عێراقدا ماونەتەوە بتوانن لەگەڵ رژێمی بەغداد رێکبکەون و نەهێڵن دەوڵەتی عێراق تۆڵە لە خەڵکی کورد بە گشتی بسێنێتەوە.

٤- زۆربەی ئەو شتانە کە باسکرا، بەیانی، دوبەیانی لە رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست" بڵاو دەبێتەوە بەڵام جیم هۆگلەند نیگەرانی کوردەکانە و دەیەوێت داواکاریەکەی بارزانی بە زووترین کات بگەیەنێتە گوێی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەمریکا[٤٤٤].

---

[٤٤٤] وتارەکەی جیم هۆگلەند لە ژێر ناوی" رێبەری کورد داوای پەنابەری لە ئەمریکا دەکات و سەبارەت بە کۆمەڵکوژی خەڵکی سیڤیل هۆشداری دەدات" رۆژی ٢٣ی ئادار لە رۆژنامەی واشنگتۆن پۆست بڵاو بوەتەوە. لە وتارەکەدا جیم هۆگلەند وێڕای ئاماژەکردن بەو شتانە کە لەم تیلیگرامەدا باس کراوە، تیشکی خستوەتەسەر بارودۆخی کوردستانی عێراق لە دوایین رۆژەکانی شۆڕشی کورد و کۆمەڵێک زانیاری دەربارەی مێژووی شۆڕشی ئەیلوول خستوەتەڕوو. جیم هۆگلەند هەروەها لە ٢٥ی ئادار وتارێکی بە ناوی" تەسلیمبوونی کوردەکان: چیرۆکی خیانەت و پیلانگێڕی" و لە ٦ی

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ:**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**٢٢ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی، بە پەلە**

**بابەت: تاوتوێکردنی ئەگەری کۆمەڵکوژی کوردەکان و داواکاری بارزانی**

بۆ زانیاری:

- کونسولخانەی ئەمریکا لە ئورشەلیم

- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت

- نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەککگرتووەکان لە نیویۆرک و ژنێڤ

ئامارژە بە: تیلیگرامی ٣٥٤٧ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت

١- سپاستان دەکەین بە پەلە بۆچوون و پێشنیارەکانتان بەگشتی و بەتایبەت دەربارەی ئەم تەوەرانەی خوارەوە بۆمان بنێرن:

---

نیسان وتارێکی زۆر تێروتەسەلی بە ناوی" مەرگی گەلێک" لە رۆژنامەی واشینگتۆن پۆست بڵاو کردوەتەوە. وەرگێڕ

الف- مەترسی کۆمەڵکوژی کوردەکان تا چە ئاستیک لە ئارادایە؟
ب- ئایا پێویستە بۆ پاراستنی گیانی خەڵکی بێ گوناح ئاگربەست بە ماوەی یەک مانگ درێژ بکرێتەوە و ئەگەر پێویستە، دەوڵەتی ئەمریکا چۆن دەتوانێت بە باشترین شێوە هاندەربێت بۆ درێژکردنەوەی ئەو ئاگربەستە؟
ج- تا چە ئاستیک یارمەتی مرۆڤدۆستانە بۆ کوردەکان پێویستە (خواردەمەنی، خێوەت و بەتانی) و ئایا دەبێ رێکخراوە نێونەتەوەییەکان ئەو یارمەتیانە بگەیەننە دەستی ئەوانەی کە پێویستیان پێیەتی؟
هەروەها بیروبۆچونتان سەبارەت بەوە چییە کە دەوڵەتی ئەمریکا پەنابەری بە بارزانی و هاوڕێیانی بدات؟ و ئایا هیچ کێشەیەک لە ئارادایە بۆ ئەوەی بارزانی و هاوڕێیانی لە ئێران ببن بە پەنابەر؟.
ئینگیرسۆل



**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی١٧٨٥**

**٢٤ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی، بەپەلە**

**بابەت: دژایەتی لەگەڵ داواکاری پەنابەری بارزانی و هاوڕێکانی لە ئەمریکا**

ئاماژە بە:

- تیلیگرامی ٣٥٤٧ی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە بەیروت
- تیلیگرامی ٦٥٤٥٨ی وەزارەتی دەرەوە

١- من بە تەواوی دژی ئەوەم کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەنابەری بدات بە بارزانی و هاوڕێکانی. لەوانەیە سەرەنجام کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بگەنە ئەو قەناعەتە کە دەوڵەتی ئەمریکا یارمەتی کوردەکانی نەداوە و شای رازی کردوە کە کۆتایی بە شەڕ لەگەڵ عێراق بهێنێت (کە راستیش نیە). ئێستا کەندوکۆسپە سەرەکیەکانی سەر رێگای دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان عێراق و ئەمریکا نەماون بەڵام ئەگەر پەنابەری بە بارزانی و هاوڕێیانی بدەین، ئەم دەستکەوتانە لە کیس دەدەین و بوونی رێبەرانی کورد لە ئەمریکا بۆ هەمیشە دەبێت بە کوندوکۆسپ لە سەر رێگای ئاساییبونەوەی پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا. بارزانی، بە تەشویقی شا، خەڵکەکەی خۆی بەرەو شەڕێکی بی ئەنجام پاڵ پێوەنا و من هیچ هۆکارێک نابێنم کە دەوڵەتی ئەمریکا خۆی بخاتە ناو کێشەکەی بارزانی. بەهەرحاڵ رۆژنامەنووسانی ئەمریکا بەشێوەیەکی رومانتیک سەیری خەباتەکەی بارزانی دەکەن.

٢- من پێموانیه که دەوڵەتی عێراق بیەوێت خەڵکی کورد سزا بدات. سیاسەتی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی رابردوو لە ئەنجامی ئەو پارەیە کە (دەوڵەت بۆ کڕینی کوردەکان خەرجی کرد) سەرکەوت. بەهەرحاڵ سپای عێراق بەهایەکی زۆری بۆ ئەو سەرکەوتنە دا و دەوڵەتی عێراق تۆڵەی خۆی لە هەندێ لە پێشمەرگە ناسراوەکان و کوردە بێ گوناحەکان دەسێنێتەوە.

پێشنیار بە وەزارەتی دەرەوە دەکەین ژمارەیەکی زۆر لە هەواڵنێران تەشویق بکات لەرێگای بەغدادەوە سەردانی کوردستان بکەن. دەوڵەتی عێراق ئەگەر لەرێگای بەغدادەوە نەبێت ناهێڵێت هیچ هەواڵنێرێک سەردانی کوردستان بکات.

٣- ئەگەر کوردەکان درێژە بە شەڕ بدەن، دەبێ ئاگربەست درێژ بکرێتەوە بۆ ئەوەی گیانی خەڵکی بێ گوناح بپارێزرێت. دەوڵەتی ئەمریکا دەتوانێت پێداگری لە سەر شا بکات بۆ درێژکردنەوەی ئاگربەست هەوڵ بدات بەڵام بە بۆچونی من نابێت دەوڵەتی ئەمریکا بە شێوەی راستەوخۆ نزیکی دەوڵەتی عێراق بێتەوە، چونکە دەوڵەتی عێراق ئێستا لەخۆباییە و ئەو نزیکایەتیە بێ ئەنجام دەبێت.

٤- هیچ گومان لەوەدا نیە کە کوردەکان پێویستیان بە یارمەتی مرۆڤدۆستانە هەیە. دەوڵەتی عێراق تا ئێستا ئەو یارمەتیانەی رەت کردوەتەوە و دژی ئەو لایەنانە راوەستاوە کە لەرێگای ئێرانەوە یارمەتی ئاوارەکانیان داوە (تەنانەت ئەوانەی کە تەنها بەتانیان بۆ ئاوارەکان ناردوە). تا ئەو شوێنە کە من ئاگادارم دەوڵەتی عێراق داوای یارمەتی لە رێکخراوە نێونەتەوەیەکان نەکردوە. عێراق پێویستی بە یارمەتی مادی نیە بەڵکوو کێشەی عێراق لۆجستیک و دابەشکردنی پێداویستیەکانە. پێموانیە دەوڵەتی عێراق هیچ چەشنە یارمەتیەکی بیانی، بەتایبەت یارمەتی پرسونیلی بیانی قبووڵ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە وەزارەتی دەرەوە، ICRC (کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور) ئاگادار بکاتەوە کە ئێمە ئامادەین یارمەتی بە هەر پرۆگرامێک بدەین کە ئەوان لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا جێبەجێی بکەن.»

گراهام[٤٤٥]

---

445 Graham

**له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٧٦٨**

**٢٥ی ئاداری ١٩٧٥**

**نهێنی**

**بابەت: کۆتاییپێهاتنی شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق لە ئەنجامی ڕێکەوتننامەی جەزاییر**

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٦٨٤ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

**کورتە:** پێنج هۆکاری سەرەکی کە پاڵی بە ئێرانەوە نا لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت بریتین لە:

الف- قبوڵکردنی پرەنسیپی "تالویگ" لە لایەن عێراقەوە کە ئیمتیازێکە بۆ ئێران.

ب- ئەگەری بنکەوتنی کوردەکان لە نەبوونی یارمەتی زیاتری ئێراندا.

ج – گیروگرفتەکانی بەردەم ئێران بۆ ئەوەی سەرۆکایەتی OPEC بگرێتە دەست.

د- کێشە ناوخۆیەکانی ئێران.

ی-هاندانی گۆڕینی سیاسەتی عێراق لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

بە بۆچوونی ئێمە ئەم هۆکارانە ئەوەندە بەهێزن کە بتوانن پاڵ بە ئێرانەوە بنێن بۆ درێژخایەن ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ عێراق جێبەجێ بکات. هەروەها هێما و نیشانەکان،

---

راستبوونی ئەم هەڵسەنگاندنەی ئێمە سەبارەت بە هەڵوێستی ئێران بەرامبەر بە بارزانی و هاورێکانی پشتڕاست دەکاتەوە.

٦- ڕێکەوتنی ئێران و عێراق یەکێ لە گرنگترین پێشهاتەکانی دیپلوماسی ئێران لەم ساڵانەی دواییەدایە بەڵام دوو پرسیاری سەرەکی سەبارەت بەو ڕێکەوتنە لە ئارادایە: پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە بەلەبەرچاوگرتنی دژمنایەتیەکانی ئێران و عێراق، ئەو ڕێکەوتنە چەندە دەخایەنێت. پرسیاری دووەم ئەوەیە کە ئایا ئەو ڕێکەوتنە ئاڵوگۆڕێکی بەرچاو لە سیاسەتی ئێران سەبارەت بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێکدەهێنێت. لە پەیوەندی لەگەڵ وەڵامدانەوە بەو پرسیارانە بە بۆچونی ئێمە پێنج هۆکاری سەرەکی پاڵی بە ئێرانەوە نا لەگەڵ عێراق ڕێکبکەوێت کە بریتین لە:

١- پرەنسیپی "تالوێگ"

ڕوونە کە ئێران لەمێژە بە دوای ئەوەدا بوو هێڵی "تالوێگ" بکرێت بە بنەمای پێناسەکردنی سنووری شەتولعەرب. لە ڕووی دەروونیەوە ئەو مەسەلەیە بۆ ئێران گرنگ بوو و کاتێک کە عێراق ئەو پوانەی دا بە ئێران، ئێران نەیدەتوانی ئەو پێشنیارەی عێراق، بەتایبەت لە دانیشتنی OPECدا ڕەت بکاتەوە. بەهەرحاڵ پێشتر هێڵی "تالوێگ" بە ئێران پێشنیار نەکرابوو و پوانێکی بەرچاویشی پێنەدرابوو بۆ ئەوەی کۆتایی بە یارمەتیدانی کوردەکان بهێنێت. کێشەی کورد بە هۆی ئەو بەها مرۆڤیە زۆرەی کە بۆ عێراق هەیبوو، کێشەگەلی جدی بۆ بەعسیەکان دروست کردبوو. ئێران لە شەتولعەرب پێگەیەکی دوفاکتۆی هەبوو کەوابوو ئەو هۆکارە کە شای هاندا دەست لە ئامانجە سەرەکیەکەی واتا سوککردنی ڕژیمی بەعس هەڵبگرێت، دەبێ لە ئیمتیازی هێڵی "تالوێگ" بەهێزتر بووبێت، بە واتایەکی دیکە ئێمە پێمانوایە کە ئیمتیازی "تالوێگ" تەنها هاندەری شا بۆ ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ عێراق نەبووە بەڵکوو تەنها یەکێ لە مەرجەکانی بوە. بێ ئیمتیازی "تالوێگ" ئێران و عێراق ڕێکنەدەکەوتن بەڵام ئەوە تەنها هۆکاری ڕێکەوتنە سنوریەکەی ئێران و عێراق نەبوو.

ب- کۆتاییپێهاتنی شەڕی کوردەکان:

سەرەڕای هێرشە تا رادەیەک سەرکەوتوەکەی دەوڵەتی عێراق دژی کوردەکان لە سالانی رابردوودا و سەرەڕای ئەوە کە چاوەڕوان دەکرا بەهاری ئەمساڵ دەوڵەتی عێراق هێرشێکی دیکە بکاتە سەر کوردەکان، ئێران لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنە دژوارە روبەڕوو بوەوە کە یا دەبێ سەیری بنکەوتنی کوردەکان بکات یان یارمەتیە سەربازیەکانی بە کوردەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زیاتر بکات و خۆی لەگەڵ ئەو مەترسیە روبەڕوو بکاتەوە کە توشی شەڕێکی ئاشکرا لەگەڵ عێراق بێت. ئێمە پێمانوانیە کە شا ویستبێتی لەوەزیاتر خۆی بخاتە ناو کێشەی کوردەکان و خۆی توشی شەڕێکی ئاشکرا لەگەڵ عێراقدا بکات، چونکە بەتەواوی متمانەی بە توانای سپای ئێران نەبوو و خۆیشی پێشتر وتبووی کە متمانەی بەوە نیە کە کوردەکان بتوانن لە بەرامبەر دەوڵەتی عێراقدا رابوەستن. کەوابوو شا بە هۆی بارودۆخی ئێران، دەربارەی کێشەی کورد لەگەڵ عێراق رێککەوت.

٢- ئەگەر ئەو هەڵسەنگاندنانەی ئێمە راست بێت، دەبێ چاوەڕوانی ئەم ئەنجام و ئاکامانە بکەین:

الف - ئێران کۆتایی بە سیاسەتە سەرسەختەکەی سەبارەت بە عێراق بهێنێت و سیاسەتێکی نەرمونیانتر سەبارەت بە عێراق بگرێتەبەر بۆ ئەوەی عێراق ئەرک و بەرپرسیارەتیەکانی جێبەجێ بکات. هەروەها بە هۆی هۆکارگەلی ناوچەیی و ناوخۆیی، بۆ ئێران گرنگە کە خۆی وانیشان بدات کە لەو رەوتەدا هاوکاری دەکات. ئەگەر ئیمتیازی "تالوێگ" تەنها هاندەری ئێران بۆ ئەو رێکەوتنە ببایا، دوای قبوڵکردنی پرەنسیپی "تالوێگ" لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە، ئێران رێکەوتننامەکەی هەڵدەوەشاندەوە چونکە گەیشتبوو بە ئامانجی خۆی.

ب - گیروگرفتی سەرەکی ئێران و عێراق، شێوەی هەڵسووکەوتی عێراق لەگەڵ کوردەکان دەبێت. ئێران بە هۆی دەستبەرداربوون لە کوردەکان، رەخنەی نێونەتەوەیی زۆری هاتوەتە سەر کەوابوو ئێمە پێمانوایە کە ئێران لانیکەم لە هاوینی

ئەمسالدا هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ ئەوەی لەگەڵ عێراق رێکبکەوێت بۆ ئەوەی ئەو کوردانە کە لە عێراق ماونەتەوە خۆیان بڕیاری خۆیان بدەن. ئارامبوونی سنوری ئێران و عێراق لە ماوەی ٦-٨ مانگی داهاتوودا لە قازانجی ئێراندایە چونکە ئەگەر لە هاوین یا پێش لە هاوین پێکدادانێک روو بدات دەتوانێت ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی جدی و کار بکاتە سەر گفتوگۆکانی OPEC و هاوکات لەگەڵ نزیکبونەوە لە هەڵبژاردنەکانی ئێراندا بارودۆخی ناوخۆی ئێران تێکبدات. بڕیارە تەنها حزبێکی نوێ (مەبەستی حیزبی رەستاخیزە -وەرگێڕ) لە هەڵبژاردنەکانی ئێراندا هەڵبژێردرێت.

٣- هێماکان وا نیشان دەدات کە ئێران بە جدی دەیەوێت ئەو رێکەوتننامەیە بەرەوپێش بچێت. هوەیدا، سەرۆک وەزیرانی ئێران دەیەوێت حەوتووی داهاتوو سەردانی بەغداد بکات. راگەیاندنەکانی ئێران خۆشبینانە سەیری سەفەری ئێرانیەکان بۆ عێراق بۆ زیارەتکردنی شوێنە پیرۆزکانی شیعەکان دەکەن و کوردەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، شتێکی دڵخۆشکەریان دەستنەکەوتوە. بەگشتی ئێرانیەکان پێشوازی لە ریکەوتننامەکەی ئێران و عێراق دەکەن و وەک دەستکەوتێکی ئەرێنی بۆ رژیمی ئێران سەیری دەکەن.

٤- وەزارەتی دەرەوە دەتوانی ئەم پەیامە بەوشێوەیە کە پێیخۆشە بەکار بهێنێت بەڵام ئەگەر دەیەوێت هەڵسەنگاندنەکانی ئێمە دەربارەی هاناکانی ئێران بۆ ریکەوتن لەگەڵ عێراق بدات بە دەوڵەتانی بیانی، بە بۆچوونی ئێمە دەبێ باش پێداچوونەی تێدا بکات چونکە پێمانخۆش نیە بەهەڵە تێگەیشتنێک دەربارەی هاناکانی ئێران درست بێت و بگاتەوە گوێی کاربەدەستانی ئێران.

هێڵمز

**له نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا له نەتەوە یەکگرتوەکان- نیویورک**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە- واشینگتۆن دی سی ٩٦٧٣**

**٢٧ی ئاداری ١٩٧٥**

**بابەت: جموجۆڵەکانی نوێنەرە کوردەکان لە نەتەوە یەکگرتووەکان**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران و بەیروت و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- وتەبێژی نەتەوە یەکگرتووەکان رۆژی ٢٦ی ئادار رایگەیاند کە کوردەکانی عێراق داواکاریەکیان تەسلیم بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەوکان کردوە کە تێدا داوا کراوە نەتەوە یەکگرتووەکان لە کوردستانی عێراقدا دەستێوەردان بکات بۆ ئەوەی پێش لە کۆمەڵکوژی خەڵکی کورد بگیردرێت چونکە دەوڵەتی عێراق هەڕەشەی لە کوردەکان کردوە ئەگەر خەباتەکەیان هەتا ١ی نیسان کۆتایی پێنەیێت، کوردەکان کۆمەڵکوژ دەکات. وتەبێژی نەتەوە یەکگرتووەکان وتی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان ئێستا خەریکی تاوتوێکردنی ئەو داواکاریەی کوردەکانە و ئاماژەی بەوە کرد کە "سکرتێری گشتی تەنها بەگوێرەی پرەنسیپە مرۆڤدۆستانەکان، لەگەڵ دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان، واتا ئێران و عێراق، لەپەیوەندیدا دەبێت".

٢- وتەبێژی نەتەوە یەکگرتووەکان وتی کومیسارییای باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران نوێنەری لە ناوچە هەیە بۆ ئەوەی یارمەتی مرۆڤدۆستانە

بگەیەننە خەڵک لەوانە گەڕانەوەی دڵخوازانەی ئەو پەنابەرانە کە ئێستا لە ئێرانن و خۆیان دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

٣- لە هەمان کاتدا، نوێنەری کوردەکان لە نیویۆرک، چالاک جوانڕۆیی لە کۆنفرانسێکی چاپەمەنیدا لە "نوسینگەی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان" رایگەیاند کە دەوڵەتی عێراق بەرنامەی ئەوەی دارِژتووە کە پاش کوتاییپێهاتنی ئاگربەست لە ١ی نیسان، هەڵمەتێکی بەرفراوان بۆ کۆمەڵکوژی کوردەکان دەست پێبکات. چالاک جوانڕۆیی هەروەها وتی ژینیراڵ بارزانی لە سەر ئەو باوەڕەیە کە درێژەدان بە شەڕ بۆ ئۆتونومی بێ یارمەتی بیانی هیچ ئەنجامێکی بۆ کورد نابێت". (ژێرۆم) شیستاک[٤٤٦]، بەرپرسی نوسینگەی نیونەتەیی (مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتوەکان)، پشتیوانی لە قسەکانی چالاک جوانڕۆیی کرد و وتی: "زۆر پێیناخۆشە کە دەوڵەتی ئەمریکا هیچ کارێکی لەم پەیوەندیەدا نەکردوە. ئەمریکا بەنیسبەت ئەم پێشێلکاریانەی مافی مرۆڤ بێ دەنگ بوە".

٤- چالاک جوانڕۆیی لەو کۆنفرانسە چاپەمەنیەدا وتی لە نامەکەیدا بۆ (کورت) والدهەیم[٤٤٧]، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای لێکردوە گوشار بخاتە سەر دەوڵەتی عێراق بۆ ئەوەی ئاگربەستەکەی ١٥ی نیسان تا ٣٠ی نیسان درێژ بکاتەوە بۆ ئەوەی ئاوارەکان بتوانن بچنە ئێران یا تورکیە.

وایت[٤٤٨]

446 Shestack
447 Waldheim
448 white

**له کونسولخانەی ویلایەیە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له تەوریز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ١١٣**

**٣١ی ئاداری ١٩٧٥**

**بابەت: چارەنووسی کوردەکان دوای ڕێکەوتننامەکەی ئێران و عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەیە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئانکارا، بەیروت، دەمیشق، تاران، کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له عەدەن و خورەمشەهر، نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا له نەتەوە یەکگرتووەکان له نیویورک و ژنێف، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد و فەرماندەیی هێزی بەشی ئوروپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له واینگینی ئاڵمانیا

**کورتە:** ڕێکەوتننامەی جەزاییر کە ئەمدوایانە له نێوان ئێران و عێراقدا واژۆ کرا، وادیارە کۆتایی بە شەڕی کوردەکان هێناوە. دەیان هەزار ئاوارە، لەوانە ژمارەیەکی زۆر له پێشمەرگەکان بە کۆمەڵ هاتونەتە ئێران و ژمارەیەکی کەمیان دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق. لێژنەیەکی ڕێکخراوی مانگی سوری عێراق ڕۆژی ٢٦ی ئادار سەردانی ئوردوگا سەرەکییەکانی ئاوارەکانی کردوە بەڵام نەیتوانیوە قەناعەت بە ژمارەیەکی زۆر له ئاوارەکان بهێنێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

دەوڵەتی ئێران هەوڵ نادات کوردەکان ناچار بکات بگەڕێنەوە بۆ عێراق و هیچ پلانێکی نیە بۆ ئەوەی ئاوارەکان له ئوردوگانەوە بگوازێتەوە بۆ شوێنەکانی دیکە. هەندێ له کاربەدەستانی ئێران چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە ئەگەر دەوڵەتی عێراق ئازاری ئەو ئاوارانە نەدات کە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق، ژمارەیەکی زۆر له ئاوارەکان

پاش چەند مانگی دیکە بگەڕێنەوە بۆ عێراق. کوردەکان لە ئێران توڕەن و دەڵێن ئێران خیانەتی پێکردوون بەڵام ئیمکانی ئەوەیان نیە درێژە بە شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بدەن. هەموو هێماکان نیشان دەدات کە ئێران رێز لە رێکەوتنەکەی لەگەڵ عێراق دەگرێت و تا کۆتایی جێبەجێی دەکات.

٦- کوردەکان لە خیانەتی دەوڵەتی ئێران زۆر توڕەن. سەرۆکی SAWAK لە پاریزگای "کوردستان" دەیگوت ئەو کوردانە کە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق نفرەت لە هەموو (کاربەدەستانی) ئێران، لەوانە خودی شا دەکەن. ئاوارەیەکی کورد دەیگوت بەرپرسی (دەزگای) پاراستنی پارتی دیموکراتی کوردستانیش هەمان هەستی بە نیسبەت شا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکان هەست دەکەن کە بارودۆخی عێراق ئەوەندە مەترسیدارە کە دەبێ جارێ هەر لە ئێران بمێننەوە. سەرۆکی SAWAK لە پاریزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا دەیگوت بەگوێرەی ئەو زانیاریانە کە بەدەستی گەیشتوە، بارزانی و هاوڕێ نزیکەکانی نیازیان نیە بچن بۆ ئەمریکا.

٧- من لە ٢٤ تا ٢٧ی ئادار لەگەڵ کاربەدەستانی سنووری ئێران لە پارێزگای کوردستان، کرماشان و ئازەربایجانی رۆژئاوا قسەم کرد. سەرۆکی SAWAK لەو ناوچانە و نوێنەرانی رێکخراوی "شیروخۆرشید"ی ئێران دەڵێن ژمارەیەکی کەم لە ئاوارەکان دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق و چاوەڕوان دەکرێت تا ١ی نیسان تەنها ٥ تا ١٠ هەزار پەنابەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق. کوردەکان لەوە دەترسن کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق دەوڵەتی عێراق ئازاریان بدات. داستانی ئەو کوردانە کە لە رواندوز لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە گەمارۆدراون و لەسێدارە دراون بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ناو ئوردوگاکاندا بڵاو بوەتەوە و ئەو مەسەلەیە لە لایەن سەرۆکی SAWAK لە پارێزگای کوردستان و سەرۆکی رێکخراوی "شیروخورشید" لە پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا ئاماژەی پێکراوە.

بە وتەی سەرۆکی SAWAK لە رەزائیە لە ماوەی ٣ هەفتەی رابردوودا دەیان هەزار ئاوارە هاتونەتە ئێران و سەرۆکی رێکخراوی شیروخورشید دەڵێت ١٠ تا ١٥ هەزار ئاوارە هاتونەتە ئێران و پێشبینی دەکەن تا ١ی نیسان ٣٠ هەزار ئاوارەی دیکە

بێنە ئێران و بەوشێوەیە ژمارەی گشیی ئاوارەکان لە ئێران بگاتە ١٦٠ هەزار کەس. ئەو ئاوارانە کە تازە هاتونەتە ئێران ژمارەیەکی زۆریان ئەو پێشمەرگانەن کە چەکەکانی خۆیان تەسلیمی ئێران کردوە. من ژمارەیەکی زۆر لەو پێشمەرگانەم لە ئۆردوگاکانی (پارێزگای) کوردستان بینی. سەرۆکی رێکخراوی "شیروخۆرشید" دەڵێت پێشمەرگەکان لە ناوچەکانی نزیک لە شەڕ دوور دەخەنەوە و من نزیکەی ٤٠٠ پێشمەرگەم بینی کە بە ئوتوموبیلی بارهەڵگری سەربازیەوە لە پارێزگای کوردستان بەرەو کرماشان دەبردران. ئەوانی دیکە کە تازە گەیشتونەتە ئێران، لە پارێزگای ئازەربایجانی رۆژئاوا دەمێننەوە.

٤- لێژنەیەکی رێکخراوی مانگی سووری عێراق سەردانی ٤ ئۆردوگای سەرەکی ئاوارەکانی کردوە و هەوڵیداوە قەناعەت بە ئاوارەکان بهێنێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق بەڵام لە ئۆردوگاکانی ئازەربایجانی رۆژئاوادا هیچ سەرکەوتنێکیان بە دەست نەهێناوە و تەنانەت کاتێک کە ویستویانە لەگەڵ ئاوارەکان قسە بکەن، نائارامی لە یەکێک لە کەمپەکاندا هاتوەتە ئاراوە. سەرجەم هێماکان نیشان دەدات کە ئێران دەیەوێت رێکەوتننامەکەی لەگەڵ عێراق جێبەجێ بکات و رۆژی ١ی نیسان سنووری ئێران و عێراق دابخات. زۆربەی سەربازانی ئێران لە سەر سنوور بۆ شوێنەکانی پێشووی خۆیان پاشەکشەیان کردوە. هەرچەند کە لەوانەیە ژمارەیەک لە کوردەکان درێژە بە شەڕ لەگەڵ هێزەکانی عێراق بدەن، بەڵام شەڕی راستەقینە لە نێوان کوردەکان و هێزەکانی عێراق کۆتایی پێهاتوە.

نئومان

**لە کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ١١٤**

**١٠ی نیسانی ١٩٧٥**

**بابەت: چارەنووسی شۆڕشی کورد و داواکاری کوردەکانی عێراق لە زمانی نوێنەری بارزانییەوە**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئانکارا، دەمیشق، بەیروت، تاران، جەزاییر، قاهیرە، کونسولخانەی ئەمریکا لە خورەمشەهر، لێژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێڤ و نیویورک، فەرماندەی هێزە هاوبەشەکانی ئەمریکا لە ئوروپا و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- دۆکتۆر ئیسفەندیار[449] کە دۆکتۆرێکی کوردی نەشتەرگەریکارە کە من لەمێژە دەیناسم رۆژی ٥ی نیسان هات بۆ کونسولخانە و وتی بە نوێنەرایەتی لەلایەن ژینیراڵ بارزانیەوە هاتوە کە ئێستا دانیشتوی "نەغەدە"یە. دۆکتۆر ئیسفەندیار جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە سەرجەم چالاکیە سەربازیەکانی کوردەکان کۆتایی پێهاتوە و وتی زیاتر لە ٥ هەزار پێشمەرگە خۆیان تەسلیمی دەوڵەتی عێراق کردوە و ژمارەیەکی زیاتریان هاتونەتە ئێران. دۆکتۆر ئیسفەندیار ئاماژەی بەوە کرد کە هەرچەند کە لەوانەیە هەندێ لە پێشمەرگەکان چەکەکانیان شاردبێتەوە و هیوادار بن

---

[449] Dr Asfandiar

که شەڕ دەست پێبکاتەوە بەڵام پارتی دیموکراتی کوردستان هیچ پلانێکی بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ نیە و هیچ چەکێکیشی لە دەستدا نەماوە. هەروەها وتی تەواوی چەکە قورسەکانی کوردەکان لە ناوچە سنوریەکان لە لایەن لێژنەیەکی سەربازی هاوبەشی عێراق و جەزاییر( کە بە یارمەتی ئێران لە پیرانشار لە ڕێگای هامیلتۆنەوە هاتونەتە عێراق) کۆ کراوەتەوە و لە حاجی عومراندا ئەمبار کراوە.

٢- دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی کوردەکان هەست دەکەن ئێران دەستیکردوە بە سیاسەتی گوشارخستن لە سەر ئاوارەکان بۆ ئەوەی یان بگەڕێنەوە بۆ عێراق یا ئەو ئاوارانە کە تیکنیسیەنن و شارەزای کارن ناوچە سنورییەکان بەجێ بێڵن و لە ئێران کار بکەن. دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی یەکێ لە نیشانەکانی ئەو گوشارە ئەوەیە کە ئێستا بەڕێوەبەرایەتی زۆربەی ئوردوگاکان لە دەستی سپای ئێراندایە و چەند جار خواردەمەنی و ئاوی خواردنەوەی هەندێ لە ئوردوگاکان بە ماوەی ١-٢ ڕۆژ کەمکراوەتەوە یان بە تەواوی بڕاوە.

٣- دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی بارزانی و ڕێبەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەر بنەمای دوو هۆکار دەیانەوێت خەڵکی ناو ئوردوگاکان پێکەوە رابگرن: یەکەم ئەوە کە لەو راستیە دەترسن کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق، دەوڵەتی بەغداد شتێکیان بەسەر بهێنێت چونکە دەنگۆی ئەوە زۆر بڵاو بوەتەوە کە ئەوانەی کە گەڕاونەتەوە بۆ عێراق لەسێدارە دراون و دەوڵەتی عێراق نەیهێشتوە جوتیارەکان بگەڕێنەوە سەر زەوی و مەزرای خۆیان. دووەم ئەوە کە کوردەکان لە سەر ئەو باوەڕن( یان کەم کەم ئەو باوەڕەیان تێدا درست دەبێت) کە مانگی هەنگوینی پەیوەندیە باشەکانی ئێران و عێراق کورتە و دەوڵەتی ئێران کەم کەم دەیەوێت جارێکی دیکە کوردەکان بخاتەوە ناو جموجۆڵ دژی دەوڵەتی عێراق. دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی هەرچەند کوردەکان هیچ هیوایەکیان بە دەستپێکردنەوەی شەڕی چەکداری نیە بەڵام پێیوایە کە بارودۆخێکی وەها لەوانەیە قورسایی سیاسی ئەوان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق زیاتر بکات.

٤- دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی بەلەبەرچاوگرتنی ئەو هۆکارانە کە باس کرا، ژینیراڵ بارزانی داوای لە دەوڵەتی ئەمریکا کردوە گوشار بخاتە سەر ICRC (کومیتەی نێونەتەوەی خاچی سور) یارمەتی ئاوارەکان بدات و سەردانی ئوردوگاکان بکات و جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە ئەگەر وا نەکرێت کوردەکان لەگەڵ گۆشەگیری زیاتر و دابڕان لە دنیای دەرەوە و هەڵسوکەوتی خراپی ئێران روبەڕوو دەبنەوە. دۆکتۆر ئیسفەندیار وتی کوردەکان پێیانوایە کە ئێران بە ICRCای وتووە ئیدی پێویست بە کاری ئەو رێکخراوەیە لە ئێران نیە و دەبێ ئێران بەجێبێڵێت.

٥- منیش بە دۆکتۆر ئیسفەندیارم وت هەروا کە خۆت دەزانێت دەوڵەتی ئەمریکا پەیوەندی بە شەڕی کورد و دەوڵەتی عێراقەوە نەبوە و ئێستاش کە ئاشتی دەگەڕێتەوە بۆ ناوچە، ئەمریکا پێی خۆش نیە لە رووی سیاسیەوە خۆی بخاتە ناو ئەو کێشەیە. هەروەها وتم لەهەمان کاتدا مەسەلە مرۆڤدۆستانەکان بۆ ئێمە گرنگە و بەڵێنم پێدا کە داواکاریەکەی کوردەکان دەنێرم بۆ وەزارەتی دەرەوە.

٦- **هەڵسەنگاندن:** لەڕوانگەی کونسولخانەی ئەمریکا لە تەورێز، بەردەوامبوونی دەستێوەردانی ICRC لە کێشەی کوردەکان، سودمەند دەبێت (هۆکاری ئەو سودمەندبوونە تەنها ئەو شتانە نییە کە کوردەکان باسی دەکەن). ئەگەر کوردەکان لە هەڵسووکەوتی خراپی ئێران دەترسن و لە ژێر گوشاری ئێراندان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ عێراق، راگەیاندنە گشتییەکان ئێران تۆمەتبار دەکەن لەگەڵ گەلێکی لێقەوماو و داماو خراپ هەڵسووکەوت دەکات و لەوانەشە ئەمریکا تۆمەتبار بکرێت چاوی خۆی لە حەنای ئەو بارودۆخە گرتوە. جگە لەوەش ئەگەر دەوڵەتی عێراق بەشێوەیەکی زۆر خراپ و سەرکووتکارانە لەگەڵ ئاوارە گەڕاوەکان هەڵسووکەوت نەکات، ICRC دەتوانێت قەناعەت بە ژمارەیەکی زۆر لە ئاوارەکان بهێنێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

ئەگەر وەزارەتی دەرەوە پێیوایە کە دەستێوەردانیَ ICRC (کومیتەی نێونەتەوەیی خاچی سور) لەم پەیوەندیەدا سودمەند دەبێت لەوانەیە باشترین رێگا بۆ گۆڕینی سیاسەتی عێراق بەنیسبەت ئاوارەکان ئەوە بێت کە داوا لە میسر و جەزاییر بکەین

قەناعەت بە دەوڵەتی عێراق بهێنن رێگە بەوە بدات لیژنەیەکی چاودێری کومیتەی نێونەتەوەیی خاچی سور هەنگاوی مرۆڤدۆستانەی گونجاو هەڵبگرێت و ئەو بانگەشەیە پشتڕاست بکاتەوە کە عێراق کوردەکان ژینوساید ناکات.

هەڵسەنگاندنی باڵویزخانە: ICRC لە بەیاننامەیەکی فەرمیدا رایگەیاندوە کۆتایی بە یارمەتیدانی کوردەکان دەهێنێت، کەوابوو قەناعەتهێنان بە ICRC زۆر زەحمەتە بۆ ئەوەی یارمەتی مرۆڤدۆستانەی زیاتر بە کوردەکان بدات. هەروەها کە جاری پێشوو باڵوێزخانە پێشنیاری کرد سادات (سەرۆک کۆماری میسر) و بومیدیەن (سەرۆک کۆماری جەزایير) یارمەتی بە درێژکردنەوەی ئەو ماوەیە بدەن کە دەوڵەتی عێراق بۆ هاتوچۆی ئاوارەکان لە سنووری ئێران و عێراقدا دیاری کردوە، ئێستاش باڵوێزخانە لەگەڵ ئەوەدا هاوڕایە کە جەزایير یا میسر پێداگری لە سەر دەوڵەتی عێراق بکەن رێگا بەوە بدات ICRC بەشێوەیەکی سنوردار پلانی خۆی جێبەجێ بکات.

نیئۆمان

## تیلیگرام له باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له لەندەن

## بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٠٤٩٥

## ٢٤ی نیسانی ١٩٧٥

## بابەت: شرۆڤەیەکی نافەرمی کاربەدەستێکی ئێران دەربارەی ڕێکەوتنی ئێران و عێراق

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له جەزاییر، بەیروت، قاهیرە، دەمیشق، جەدە، کوەیت، تلابیب، تاران و نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد

١- "هێشتا ڕێکەوتننامەی جەزاییر واژۆ نەکرابوو کە کاربەدەستانی ئێران بەو ئەنجامە گەیشتبوون کە کوردەکان ٢ یا ٣ حەوتوو زیاترە لەوبەری سنووری ئێرانەوە لەگەڵ هێزەکانی عێراق شەڕ دەکەن، کەوابوو مەترسی ئەوە له ئارادابوو کە ئێران ڕاستەوخۆ تێوەگلێتە ناو ئەو شەڕە". ئەمە قسەی دۆکتۆر عەباسی ئەمیری[٤٥٠]، بەڕێوەبەری "ئینیستیتۆی توێژینەوە نێونەتەوەیی، سیاسی و ئابووریەکان" له تارانە کە سەردانی بریتانیای کردوە.

٢- دۆکتۆر ئەمیری هەروەها ڕۆژی ٢٤ی نیسان له ئینیستیتۆی نێونەتەوەیی توێژینەوە ئیستراتژیکەکان له لەندەن بە گرووپی لانچیئونی[٤٥١] وت کە ڕێکەوتنی ئێران - عێراق بە ڕوونی لایەنی عێراقی بەرپرسیار دەکات دەست له هاندانی لایەنە

---

[450] DR. ABBAS AMIRIE

[451] Luncheon Group

خراپکارەکان لە کەنداو هەڵبگرێت. بەهەرحاڵ دۆکتۆر ئەمیری نەیتوانی روونکردنەوەی زیاتر دەربارەی ئەو هەڵسەنگاندنە بخاتەڕوو[٤٥٢].

٤٥٢ لە تیلێگرامێکی دیکەدا لە ژێر ناوی "هاناکانی ئێران بۆ رێکەوتن لەگەڵ عێراق" کە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئەمانی پایتەختی ئوردون بۆ وەزارەتی دەرەوەی ناردووە، هاتوە کە دەوڵەتی ئوردون زۆر پێیخۆشە بزانیت هاناکانی شا بۆ ریکەوتن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق لە جەزاییر چی بوە و شەرتومەرجەکانی ئەو رێکەوتنە بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکاندا چین. باڵوێزخانە هەروەها داوای کردوە وەزارەتی دەرەوە یا باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران راپۆرتێک لەو پەیوەندیەدا (هاناکانی شا و کاریگەری ئەو رێکەوتننامەیە لە سەر کوردەکان) ئامادە بکەن بۆ ئەوەی بە شێوەی خسوسی بنیردرێت بۆ کاربەدستانی دەوڵەتی ئوردون. (وەرگێڕ)

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA)

وەزارەتی دەرەوە

ئاژانسی هەواڵگری بەرگری (DIA)

١ی گوڵانی ١٩٧٥

نهێنی

بابەت: راپۆرتێک دەربارەی ئاکام و ئەنجامەکانی رێکەوتننامەی ئێران و عێراق لە جەزاییر بۆ کوردەکان و وڵاتانی ناوچە[٤٥٣]

## پێشەکی

ئێران لەمێژبوو هەوڵی بۆ ئەوە دەدا عێراق رازی بکات داواکاری ئێران بۆ پێناسەکردنی سنووری نێوان ئەو دوو وڵاتە، بەتایبەت سنووری شەتولعەرەب قبوول بکات. خولیای شا ئەوە بوو کە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەدا بسەپێنێت و هەوڵی بۆ ئەوە دەدا کە دەستڕۆیشتوویی و چالاکیە نهێنیەکانی عێراق لە ناوچە سنووردار بکات و کاریگەری هێزە بیانیە چەپەکان لە بەغداد کەم بکاتەوە. رێکەوتننامەی جەزاییر کە لە سەرەتای مانگی ئادار لە نێوان ئێران و عێراقدا واژۆ کرا، وادیارە کە شای گەیاندوەتە ئامانجی یەکەمی خۆی، هەرچەند کە جێگای گومانە کە شا گەیشتبێتە ئامانجەکانی دیکەی. عێراق لە گیرۆدەبوون بە شۆڕشی کوردەوە رزگاری

---

٤٥٣ — رەشنووسی ئەم راپۆرتە لە لایەن CIA ئامادە کراوە و وەزارەتی دەرەوە و ئاژانسی هەواڵگری بەرگری (DIA) هاوکاریان کردوە.

بوو و جاریَ بەدەست بەربەرەکانی لەگەڵ ئێران رزگاری بوە. هەروەها دەستی عێراق لە گۆڕەپانی سیاسەتی دەرەوە بە شێوەیەکی بەرچاو ئاوەڵا بوە. ئێمە ئەنجام و ئاکامەکانی رێکەوتننامەی جەزاییر بۆ بەشدارانی ئەو رێکەوتننامەیە، وڵاتانی دیکەی ناوچە و زلهێزەکان بەم شێوەیە پێشبینی دەکەین:

١- شای ئێران و پیاوی بەهێزی عێراق، سەدام حوسەین تەکریتی رۆژی ٦ی ئادار رێکەوتننامەیەکیان بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشە سنووریە درێژخایەنەکانیان واژۆ کرد کە بە هۆی ئەو ناکۆکیانەوە کۆمەڵێک پێکدادانی جدی لە ساڵی رابردوودا لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا رووی دابوو. دەوڵەتی ئێران و عێراق کۆمەڵێک دەستکەوتی گرنگیان لەو رێکەوتنە بەدستهێنا و ئەو لایەنە سەرەکییەی کە لە ئەنجامی ئەو رێکەوتنەدا دۆڕاندیان، کوردە شۆڕشگێڕەکانی عێراق بوون. رێژەی دانیشتوانی کوردستانی عێراق دوو ملیۆن کەسە کە دەکاتە ١٨%ی دانیشتوانی عێراق. سێ میلیۆن کورد لە تورکیە، ملیۆنێک و نیو لە ئێران و چەند سەد هەزار کەس لە سوریە هەیە.

٢- ئەو رێکەوتننامەیە کۆمەڵێک شەرتومەرجی گشتی و کۆمەڵێک بەرپرسیارێتی دوو لایەنە لە خۆ دەگرێت کە گرنگترینیان بریتین لە:

- دیاریکردنی سنووری زەمینی و دەریایی نێوان ئەو دوو وڵاتە
- کۆنترۆلکردنی توندی سنوور و پێشگرتن لە هاتوچۆی لایەنە خراپکارەکان لە نێوان سنووری ئەو دوو وڵاتەدا

ئێران و عێراق ئەو رێکەوتنەیان بە ئاشکرا قبووڵ کردوە و جەختیان لە سەر ئەوە کردوەتەوە کە پێشێلکردنی یەکێ لە شەرتومەرجەکانی ئەو رێکەوتننامەکەیە بە واتای پێشێلکردنی تەواوی رێکەوتننامەکەیە.

لێدوانەکان و کردەوەکانی ئێران و عێراق لە ٦ی ئادارەوە نیشان دەدات کە تێگەیشتنێکی نهێنی لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا لە ئارادایە و شەرتومەرجە راستەقینەکانی ئەو رێکەوتنە هێشتا دیار نین. شا بە ئاشکرا بەڵێنیداوە کە یارمەتی سەربازی بە کوردەکان نەدات. ئەم مەسەلەیە لە ناو رێکەوتننامەکەدا ئاماژەی

پێنەکراوە چونکە ئێران بەردەوام حاشای لەوە کردوە کە یارمەتی سەربازی بە کوردەکان دابێت. هەروەها بارودۆخی ئاوارە کوردەکان لە ئێران باس و تاوتوێ کراوە و هەر دوو لا بە روونی لە سەر ئەوە رێککەوتوون کە کۆتایی بە پرۆپاگەندای دژمنکارانە بێنن.

هەروەها چالاکییەکانی هێزە بیانیەکان لە کەنداو لە نێو رێکەوتننامەی جەزاییردا تاوتوێ کراوە، ئەو مەسەلەیە لە جۆری لێدوانی کاربەدەستە فەرمیەکانی ئەو دوو دەوڵەتە و میدیاکانی ئەو دوو وڵاتە لە کاتی واژۆکرانی رێکەوتننامەکە تا ئێستا دیارە.

ئەو پوانە (ئیمتیازە) سەرەکییە کە عێراق بە ئێرانی دا ئەوە بوو کە رێوشوێنەکەی ئێرانی قبووڵ کرد بۆ ئەوەی سنووری باشووری شەتولعەرەب بە گوێرەی هێڵی تالوێگ دیاری بکرێتەوە.

### کاریگەری کێشەی کورد لە سەر رێکەوتنەکەی ئێران و عێراق

ئەنجامی سەرەکی ئەو رێکەوتننامەیە ئەوە بوو کە کۆتایی بە یارمەتی سەربازی ئێران بە کوردەکان هێنا. ئەوە ئامانجی سەرەکی عێراق بوو و ئەو پوانە سەرەکییە بوو کە ئێران دای بە عێراق. پچڕانی یارمەتی ئێران، کوردەکانی ناچار کرد دەست لە چالاکیە پێشمەرگایەتیەکەیان هەڵگرن و یەکێ لەم دوو رێگایە هەڵبژێرن: یا خۆیان بە دەوڵەتی بەغداد تەسلیم بکەن یان بچن بۆ ئێران. کەوابوو رێکەوتننامەکە دەوڵەتی بەغدادی لە کێشەیەکی ناوخۆیی کە عێراقی فەلەج کردبوو رزگار کرد و دەستی عێراقی ئاوەڵا کرد بۆ ئەوەی سەرچاوەکانی بۆ گەشەپێدانی وڵات تەرخان بکات.

کۆتاییپێهاتنی شۆرشی کورد سەدام حوسەین بەهێزتر دەکات. دەوڵەتی ئێستای بەعس ( کە لە ساڵی ١٩٦٨ بەدەسەڵات گەیشتوە) لە ئیئتیلافی دژواری کۆتلە سەربازی و مەدەنیەکان پێکهاتوە. سەدام حوسەین کە بڕیاری ئەوەی دا کێشەی کورد بە شێوەی سەربازی چارەسەر بکات، باڵی مەدەنی حیزبی بەعس رێبەری

دەکات. سەرۆک کۆمار بەکر کە نوێنەری سەربازی لە ناو رێبەرایەتی بەعسدایە و بەتەواوی نەخۆش و لە کارکەوتوە، لە رێکەوتنەکەی جەزاییر رازییە.

هەندێ بەڵگە نیشان دەدات کە شا وایدەزانی کە سەدام حوسەین بە گوێرەی رێکەوتنەکەی لەگەڵ ئێران، لە بەرامبەر ئەوەدا دەروەسە کە کۆتایی بە بارودۆخی سەربازی لە عێراق بهێنێت و لەگەڵ کوردەکان وتووێژ بکات بەڵام بەهەرحاڵ کتوپڕ دوای مۆرکرانی رێکەوتننامەکە دەوڵەتی بەغداد فەرمانی هێرشی هەمەلایەنە بۆ سەر کوردەکانی دەرکرد و ئەو هێرشە نزیکەی هەفتەیەک بەردەوام بوو تا لە کۆتاییدا شا توانی دوو رۆژ پێش لە دانیشتنی وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عێراق لە ١٥ی ئادار لە تاران ئاگربەستێک بە ئەنجام بگەیەنێت. دانیشتنی وەزیرانی دەرەوەی ئێران و عێراق لەپێشەوە بەرنامەی بۆ داڕێژرابوو بۆ ئەوەی رەوتی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە تاوتوێ بکەن. ئەو ئاگربەستە لەپاڵ عەفواتی دەوڵەتی بەغداد بۆ کوردەکان لە ١ی نیسان کۆتای پێهات و دەوڵەتی عێراق دەسەڵاتی سەربازی خۆی بەسەر سەراسەری کوردستاندا سەپاند. ئەو داگیرکاریە لەگەڵ بەربەرەکانیەکی ئەوتۆدا رووبەڕوو نەبوەوە. دەوڵەتی بەغداد (بەهاندانی ئێران) عەفواتەکەی تا کۆتایی مانگی نیسان ( و پاش ئەوەش بۆ ٢٠ رۆژی دیکە) درێژ کردەوە بۆ ئەوەی ئاوارە کوردەکان لە ئێران بگەڕێنەوە بۆ عێراق.

بە هۆی ناکۆکیە ئەتنیکی، ئایینی و سیاسیەکانەوە، لەمێژ بوو عێراق ببوو بە ئامانجی دژمنایەتی و بەدگومانی توندی ئێران. شا وەک داردەستی زیادەخوازییەکانی سۆڤیەت لە کەنداو و سەرچاوەی خراپکاری لە سەرتاسەری ناوچە سەیری دەوڵەتی عێراقی دەکرد. بۆ ماوەیەک شا کوردەکانی عێراقی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی سەرنج و سەرچاوەکانی دەوڵەتی عێراق لە رێچکەی دەستێوەردان لە سیاسەتی کەنداو بگۆڕێت و ناسەقامگیری سیاسی هان بدات و بە شێوەی ناڕاستەوخۆ عێراق ناچار بکات داواکاری ئێران بۆ سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی سنووری (شەتولعەرەب) قبوڵ بکات. بەهەرحاڵ شا یارمەتیدانی کوردەکانی بە بەرپرسیارێتی بێ کۆتایی خۆی نەدەزانی.

شا پشتیوانی له ئامانجی ئوتونومی کوردەکانی عێراق نەدەکرد چونکە لەوە دەترسا کە ئەو مەسەلەیە هەست و سۆزی کوردەکانی ئێرانیش هان بدات.

کێشەی کورد لە هاوینی ساڵی رابردووەوە چەند رەهەندێکی نوێی بە خۆوە گرت واتا ئەو کاتە کە دەوڵەتی عێراق بڕیاریدا سوپای خۆی (کە بە چەکوچۆڵی سۆڤیەتەوە پۆشتە کرابوو) بەکار بهێنێت بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە کۆتایی بە کێشەی کورد بهێنێت. دەوڵەتی عێراق هێرشی کردە سەر ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کوردە شۆڕشگێڕەکان و کەمکەم ٨٠% هێزەکانی سوپای خۆی دژی کوردەکان بەکارهێنا. لە مانگی ئاب شا بۆ ئەوەی کەندوکۆسپ لە سەر هێرشەکەی عێراق دروست بکات و کارتە" کورد"یەکەی لە دەستنەچێت یەکینەکانی تۆپخانە و هێزی هەوایی بەرگری ئێرانی راستەوخۆ ئاراستەی ناو خاکی عێراق کرد. ئەو دەستێوەردانەی ئێران ( لەگەڵ خراپبوونی کەشوهەوا) کەمکەم هێرشەکەی عێراقی راوەستاند بەڵام بەهەرحاڵ کوردەکان بە پێچەوانەی ساڵانی رابردوو نەیانتوانی لە زستاندا بستێک لەو خاکەی کە لە دەستیاندابوو، بگرنەوە.

سەرنەکەوتنی کوردەکان، سوپای عێراقی لە پێگەیەکی باشدا هێشتەوە بۆ ئەوەی لەم بەهارەدا درێژە بە هێرشەکەی بدات. شا لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا رووبەڕوو بوەوە کە ئەگەر بیەوێت کوردەکان شەڕەکە نەدۆڕێنن دەبێ یارمەتیە سەربازیەکانی بە کوردەکان زیاد بکات. شا لەوە نیگەران بوو کە بکەوێتە ناو بەربەرەکانیەکی بەرفراوانی سەربازی لەگەڵ عێراقدا و لەگەڵ ئەنجام و ئاکامە هەمەلایەنەکانی ئەم سیاسەتە رووبەڕوو بێتەوە، هەر بۆیە بڕیاریدا لەوە زیاتر خۆی نەخاتە ناو ئەو کێشەیە. ئەم بڕیارەی شا بە واتای ئەوە بوو کە یارمەتیەکانی ئێران تەنها هەتا کاتی دەستپێکردنی هێرشە پێشبینیکراوەکەی عێراق لە بەهاردا بەشی کوردەکان دەکات. کەوابوو شا ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا بۆ ئەوەی لە جەزاییر شتێک وەدەست بخات. ئەو پوانە کە عێراق لە سەر شەتولعەرەب بە ئێرانی دا خۆی لە خۆیدا شتێکی بچووک نەبوو بەڵام لە روانگەی شاوە کەمترین شتێک بوو کە لە سەر بنەمای ئەوە

شا دەیتوانی پاساو بۆ رێکەوتنە لەناکاوەکەی لەگەڵ نەیارە سەرسەختەکەی بهێنێتەوە.

شا بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەگەر لەوە زیاتر خۆی بخاتە ناو شەڕی کورد، ئامانجە گەورەترەکەی دیکەی ئێران کە هاوکاریکردن لەگەڵ دەوڵەتانی میانەڕەوی عەرەبە، دەکەوێتە ناو مەترسییەوە. زیاتربوونی دەستێوەردانی سەربازی ئێران لەو کێشەیەدا، کۆمەڵێک کێشەی لە سەراسەری جیهان عەرەب بۆ شا درست دەکرد، لە کاتێکدا کە شا هەوڵی دەدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ سادات، سەرۆک کۆماری میسر و رێبەرە میانەڕەوەکانی دیکەی عەرەب پەرەپێبدات.

دەوڵەتانی عەرەب لە ژێر گوشاری دەوڵەتی عێراقدا بوون بۆ ئەوەی دەستێوەردانی ئێران لە کێشەی کورد کۆتایی پێبێت. بەتایبەت میسر دەیگوت کە کۆتاییپێهاتنی بەربەرەکانی عێراق و کوردەکان، یارمەتی بەوە دەدات کە عێراق زیاتر روو لە گۆڕەپانی سیاسی جیهانی عەرەب بکات و لە پشتبەستنی بە یەکێتی سۆڤیەت کەم بکاتەوە. شا لە زیادبوونی دەسەڵاتی سۆڤیەت لە عێراق نیگەران بوو و لەوانەیە بۆچوونەکەی میسر کاری کردبێتە سەر شا.

بەردەوامبوونی بەربەرەکانی چەکداری لەگەڵ کوردەکان مەترسی بۆ سەدام حوسەین بە دواوە بوو و لەوانەیە ببایەهۆی رووخانی دەسەڵاتەکەی. هەر وەک ساڵانی رابردوو، سیاسەتی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە کوردەکان ببووە هۆی ئەوەی کە درزێک بکەوێتە نێو گروپی دەسەڵاتدارانی عێراق. پیاوە بەهێزەکەی عێراق (سەدام حوسەین) بەرپرسیارێتی تاکەکەسی لە ئەستۆ بوو بۆ ئەوەی بە شێوەی سەربازی کێشەی کورد چارەسەر بکات و پرستیژی سەدام پەیوەندی بەو مەسەلەیەوە هەبوو. سوپای عێراق بە هۆی زۆربونی ژمارەی کوشتە و بریندارەکانی و دەوڵەتی عێراق بە هۆی ناتوانایی بۆ وەڵامدانەوەی کاریگەر بە دەستێوەردانی ئێران، لەگەڵ رەخنە رووبەڕوو ببونەوە. سەرنجی عێراق بەگشتی بەرەولای بەربەرەکانی سەربازی لەگەڵ کێشەی کورد راکێشرابوو. هەروەها عێراق پێویستی بە سەرچاوە و پێداویستی سەربازی سۆڤیەت بوو و ئەوە وایلێکردبوو کە نەتوانێت بە ئازادی لەگەڵ سۆڤیەت هەڵسوکەوت بکات.

سەدام حوسەین هەستی دەکرد ناتوانێت کۆتایی بە بەربەرەکانیە سەربازیەکەی لەگەڵ کێشەی کورد بهێنێت و دان بە شکستی خۆیدا بنێت. سەدام بڕیاریدا بەهای پێویست بدات و داواکاری ئێران دەرباری شەتولعەرەب قبووڵ بکات چونکە ئەوە خێراترین هەنگاو بوو بۆ ئەوەی ئێران بێدەنگ بکرێت.

بەهەرحاڵ کێشەکان هێشتا بە تەواوی چارەسەر نەکراوە. شا داوای کردوە کە عێراق ئەو بەڵێنانە کە لە جەزاییر داویەتی جێبەجێ بکات بەڵام زەحمەتە عێراق بیەوێت سەرجەم ئەو بەڵێنانە جێبەجێ بکات کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە ئەستۆی گرتوە.

لەو کاتەوە کە ئێران هێزەکانی خۆی لە عێراق کشاندوەتەوە و کۆتایی بە یارمەتیدانی کوردەکان هێناوە و سنوورەکانی داخستوە، ناکۆکییەکانی ئێران و عێراق بە رێژەیەکی بەرچاو کەمی کردووە. ئەگەر دەوڵەتی عێراق بیەوێت رێز لە رێکەوتننامەکە بگرێت، ئێران بە ئاسانی ناتوانێت بزووتنەوەی کورد لە ناو عێراق بە شێوەیەکی کاریگەر زیندوو بکاتەوە. ئێمە گومانمان لەوەدا هەیە کە ئەم ئاشتبوونەوەی ئێران و عێراق زۆر بخایەنێت.

شا پێش ئەوەی کوردەکان زیندوو بەچاڵ بکات، راوێژی لەگەڵ کەسێکی ئەوتۆ نەکردبوو. زۆربەی راوێژکارەکانی شا هەرچی شا بڵێت دەڵێن وایە، و لە راستیدا دەربارەی مەسەلە سیاسیەکان ئاڵوگۆڕی بیروڕا نەکرابوو. بڕیارەکەی شا لە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکاندا کۆمەڵێک ئاکام و ئەنجامی بۆ ئاسایشی ناوخۆی ئێران بەدواوە دەبێت. گەلێک لەو ١٥٠ هەزار ئاوارە کوردە کە لە ئێرانن، لە خیانەتی ئێران تورەن و هەندێ لە کوردەکانی ئێران (ژمارەی دانیشتوانی کوردی ئێران میلیۆنیک و نیوە) لە پچڕانی پشتیوانی ئێران لە خزمەکانیان لە عێراق دڵسارد بوونەتەوە.

ئێمە پێمانوایە کە هێزەکانی ئاسایشی ئێران دەتوانن هەر کێشەیەک کە لە نێو کوردەکانی ئێران یا عێراقدا روو بدات، کۆنترۆڵ بکەن. ئێران سەرجەم ئەو پێشمەرگە کوردانەی بێچەک کردوە کە پێش لە داخستنی سنوور هاتونەتە ئێران و لە ئاوارە سڤیلەکان جیای کردونەتەوە. دەوڵەتی ئێران نایەوێت ئاوارەکان لە ناو ئۆردوگاکاندا

بمێننەوە و هەوڵ دەدات بیانهێنێتە ناو کۆمەڵگای ئێران ( ئەگەر بکرێت لە دەرەوەی ناوچەی کوردنشین). لەوانەیە هەندێ لە ئاوارەکان لە بەرامبەر هەوڵەکانی ئێران بۆ نیشتەجێکردنیان لەو ناوچانەی کە لە ناوچە کوردنشینە شاخاویەکانی خۆیاندا جیاوازە، رابوەستن.

به داوای ئێران، دەوڵەتی بەغداد هەندێ کەسی ناردوە بۆ ناو ئوردوگاکان بۆ ئەوەی ئاوارەکان دڵنیا بکەنەوە کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق، دەوڵەتی عێراق لێیان دەبووریت. ئەو هەڵسەنگاندنانەی کە دەربارەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ عێراق بە ئێمە گەیشتوە، زۆر لە یەک جیاوازن. دەوڵەتی عێراق (بە هەمان شێوەی دەوڵەتی ئێران) دەزانێت کە کوردەکان بۆ ئاسایشی ئێران کێشەن و ئەوەندە بەپەرۆش نییە کە ئەم بارەی شا سووک بکات.

شا هەوڵ دەدات رێکەوتننامەکە بەکار بهێنێت بۆ ئەوەی سیاسەتەکانی دەوڵەتی عێراق نەرمونیانتر بکات (بە یارمەتی رێبەرانی دیکەی عەرەب). شا بە کۆتاییهێنان بە یارمەتیدانی کوردەکان و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق، پێگەی ئەو رێبەرە عەرەبانەی بەهێزتر کردوە کە سەدام حوسەینیان هان دەدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ سۆڤیەت کەم بکاتەوە. رێکەوتننامەکە هەروەها تا رادەیەک ئەو بانگەشەیەی عەرەبە توندئاژۆکانی کەمتر کردوە کە ئێران دوژمنی سەرسەختی عەرەبەکانە.

**کاریگەری رێکەوتننامەکە لە سەر وڵاتانی ناوچە**

کاربەدەستانی دەوڵەتی تورکیە پێشوازیان لە رێکەوتنەکەی ئێران و عێراق کردوە چونکە کۆتایی بە یارمەتیدانی ئێران بە کوردە جیاییخوازەکان هێناوە. دەوڵەتی تورکیە لەوە دەترسێت کە شەڕی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق پەرەبسێنێت یان سێ میلیۆن کوردی تورکیە بکەونە جموجۆڵ و داوای ئۆتونومی بکەن.

مەلک حوسەین، پادشای ئوردون زۆر لە رێکەوتنەکەی ئێران و عێراق نیگەرانە. مەلک حوسەین هیوادار بوو کە عێراق هەڵوێستی خۆی سەبارەت بە کوردەکان نەرمونیانتر بکات و کێشەی کورد بە شێوەیەک چارەسەر بکرێت کە بارزانی بتوانێت پێگەی خۆی وەک رێبەری کۆمەڵگای کورد رابگرێت. مەلک حوسەین ئێستا لە هەوڵە

خراپکارانەکانی عێراق دەترسێت و دەیەوێت بزانێت کە ئایا رێکەوتننامەکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە عێراق هەرچی کە پێیخۆشە بیکات یا نا.
دەوڵەتی سوریە پێشوازی لە رێکەوتنەکەی ئێران و عێراق نەکردوە. سوریە وای پێباشترە کە دەوڵەتی عێراق بەردەوام بە کێشەی کوردەوە سەرقاڵ بێت. سوریە پێشبینی دەکات کە عێراق پروپاگەنداکانی دژی سوریە بەهۆی بەشداریکردن لە وتووێژەکانی ئاشتی ئیسرائیل - فەلەستین توندتر بکات و بە شێوەیەکی ئاشکراتر خوازیاری رووخانی رژیمی سوریە بێت.

### ئاکامەکانی رێکەوتننامەکە بۆ کوردەکان

سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کوردەکان، دەستی دەوڵەتی عێراق تا رادەیەک ئاوەڵا بووە بۆ ئەوەی خواستی خۆی بەسەر کوردەکاندا بسەپێنێت. جگە لە ئەنجومەنی یاسادانان و ئەنجومەنی راپەڕاندن کە هاوینی رابردوو دامەزران، دەوڵەتی عێراق هیچ پوانێکی دیکە بە کوردەکان نادات. دەوڵەتی عێراق هەوڵیداوە لە رێگای نیشتەجێکردنی عەرەبەکان، کوردستان تەعریب بکات و لەوانەیە وەک بەشێک لە رێگاچارەیەکی درێژخایەن سەیری ئەم مەسەلەیە بکات.
بەردەوامبوونی خەباتی چەکداری کورد وەک ئەوەی ١٩٧٤ ئێستا بە هیچ شێوەیەک لە ئارادا نیە. لە سەرەتادا نزیکەی ١٠ هەزار کەس لە هێزی ٣٠ هەزار کەسی پێشمەرگە دەیانەویست بە کەڵکوەرگرتن لە تاکتیکگەلی پێشمەرگەیانە درێژە بە شۆڕشەکەیان بدەن. دەڵێن پێش لە هێرشی عێراق لە مانگی ئادار، کوردەکان برێکی زۆر چەک و تەقەمەنیان لە شاخەکاندا شاردوەتەوە. هەروەها لەوانەیە پێش لە داخرانی سنوور لە ١ی نیسان، کوردەکان چەک و تەقەمەنی زیادەیان لە ئێرانەوە بەدەستهێنابێت. لەوانەیە کوردەکان هەوڵ بدەن لە سنووری سوریاوە پێداویستیەکانیان دابین بکەن. دەوڵەتی سوریە هەرچەند کە لە کردەوە خراپکارانەکانی رکابەرەکەی واتا رژیمی بەعسی عێراق توڕەیە بەڵام کەرەستەی زیاتری بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی بێ چەکدارکردنی کوردەکانی عێراق، گوشار بخاتە سەر دەوڵەتی عێراق.

هەندێ لە کوردەکان هیوادارن کە سوپای ئێران دەست بە یارمەتیدانی کوردەکان بکاتەوە، ئەگەر بێت و رێکەوتننامەی جەزاییر وەک خۆی جێبەجێ نەکرێت. ئەگەرێکی وەها دوورە هەرچەند کە بە گوێرەی هەندێ زانیاری، ئێران هەندێ لە کوردەکان بۆ ئەگەری تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق رادەهێنێت. هەرچەند کە کۆمەڵێک بەدگومانی قووڵ لە پەیوەندیەکانی ئێران و عێراقدا هەیە بەڵام بەرژەوەندی هەردوو لا لەوەدایە کە پەیوەندیە نوێکەیان لانیکەم لە کورخایەندا بپارێزن.

مەلا مستەفا بارزانی ئێستا لە سەرەتای تەمەنی ٧٠ ساڵیدایە و سەمبولی بزووتنەوەی ئۆتونومی کوردە. ئێستا هیچ رێبەرێکی دیکەی شۆڕشی کورد ئەو پێگەیەی نیە کە بتوانێ جێگای بارزانی بگرێتەوە، هەرچەند کە رێکەوتننامەی جەزاییر کاریگەری نەرێنی زۆری لە سەر دەسەلات و پرستیژی بارزانی هەبوە. لەوانەیە رێبەرایەتی کورد بە ئاسانی لە ناو بچێت و ژمارەیەک لە گروپە شۆڕشگێڕە سەربەخۆکان هەوڵ بدەن دژی دەوڵەتی عێراق خەبات بکەن. روونە کە بێ پشتیوانیەکی بەرچاو، خەباتی کوردەکان دژی عێراق تەنها بە لەناوبردنی هێزەکانی عێراق و هێرشکردنە سەر دامەزراوە ئابوورییەکان سنووردار دەبێت. تەنانەت لەوانەیە کوردەکان هێرش بکەنە سەر دامەزراوە نەوتیەکانی عێراق.

**کاریگەری رێکەوتننامەکە لە سەر پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا و سۆڤیەت**

کۆتاییپێهاتنی شۆڕشی کورد یەکێ لە کەندوکۆسپەکانی سەر ئاساییبوونەوەی پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکای لە ناو بردوە. لەوانەیە عێراق پێیوابێت کە ئەمریکا لەگەڵ ئێران و ئیسرائیل بۆ دابینکردنی یارمەتی سەربازی بۆ کوردەکان هاوکاری کردوە. بەهەرحاڵ ئەوەی کە بوەتە کەندوکۆسپ لە سەر ئاساییبونەوەی پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا، رێکەوتننامەی جەزاییر نییە بەڵکوو ئەوەیە کە عێراق وەک پشتیوانی سەرەکی ئیسرائیل سەیری ئەمریکا دەکات.

تا ئەو شوێنە کە ئێمە ئاگادارین، یەکێتی سۆڤیەت هیچ دەورێکی لە نزیککردنەوەی ئێران و عێراقدا نەگێڕاوە. لە راستیدا سۆڤیەت کۆمەڵێک بۆچوونی تێکەڵاوی

دەربارەی ئاکام و ئەنجامەکانی ڕێکەوتننامەی جەزاییر هەیە هەرچەند کە یەکێتی سۆڤیەت بەردەوام پشتیوانی لە چارەسەربوونی ناکۆکیەکانی ئێران و عێراق و ئوتونومی بۆ کورد کردوە. ئێستا سۆڤیەت بەنیسبەت کاریگەریەکانی ڕێکەوتننامەی جەزاییر لە سەر پەیوەندییەکانی عێراق و یەکێتی سۆڤیەت نیگەرانە.

## کاریگەری ڕێکەوتننامەکە لە سەر ئیسرائیل

لە ناوەڕاستی دەیەی ١٩٦٠وە ئێران ئیسرائیلی هانداوە یارمەتی بە شۆڕشی کورد بدات و خۆیشی لەو یارمەتیدانەدا بەشداری کردوە. ئیسرائیل یارمەتی مادی کوردی داوە و پێداویستیەکانی کوردەکانی دابین کردوە و پسپۆڕی سەربازی و هەواڵگری ناردوە بۆ ئەوەی لە کوردستانی عێراق و ئێران مەشق بە پێشمەرگە کوردەکان بکات. هەروەها لەوانەیە لە ئیسرائیل مەشق بە کۆمەڵێک لە کوردەکان کرابێت. یارمەتیدانی ئیسرائیل بە کوردەکان بە هۆی یارمەتیەکانی ئێران بوو ئەگەرنا بێ یارمەتیەکانی ئێران، دەرفەتی ئەوە کەم بوو کە ئیسرائیل درێژە بە یارمەتیدانی کوردەکان بدات. هەڵوەشانەوەی شۆڕشی کورد و کەمبوونەوەی ناکۆکیەکانی ئێران و عێراق دەستی عێراق ئاوەڵاتر دەکات بۆ ئەوەی هێزەکانی دژی ئیسرائیل بەکاربێنێت ئەگەر بێت و شەڕێکی دیکە دەستپێبکات.

سەرەڕای ئەوەی کە ئێران و عێراق ئێستا هاوکاری یەکدی دەکەن، دەوڵەتی عێراق هێشتا وەک یەکەمین هەڕەشەی سەربازی سەیری ئێران دەکات و هێزەکانی (لە سەر سنووری ئێران) جێگیر کردوە و هێزەکانی عێراق دەگەڕێنەوە بۆ بنکەکانی پێشوویان لە سەر سنووری ئێران. لە ساڵەکانی شەڕی دەوڵەتی عێراق و کوردەکاندا، ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی عێراق بوون بە قوربانی و زەرەر و زیانێکی مادی زۆر لە سپای عێراق کەوت بەڵام عێراق بەبێ گرفتێکی ئەوتۆ دەتوانێت هێزەکانی خۆی دژی ئیسرائیل تەیار بکات.

له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی

بۆ:

- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد
- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت و تاران

١٩ی گوڵانی ١٩٧٥

بابەت: دەنگۆی لەسێدارەدانی بەندکراوانی کورد لە لایەن دەوڵەتی عێراقەوە

١- وەزارەتی دەرەوە سپاستان دەکات ئەگەر زانیاری یا هەڵسەنگاندنی خۆتانمان دەربارەی وتارەکەی جیم هۆگلەند پێ رابگەیەنن کە ڕۆژی ١٦ی ئادار لە ڕۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست"دا بڵاو بوەوە[٤٥٤]. ئەو وتارە دیسان بانگەشەی ئەوەی کردوە کە

---

[٤٥٤]- لە وەڵامی ئەو داواکاریەی وەزارەتی دەرەوە، باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران لە تیلیگرامێکدا نوسیویەتی: ١-جیم هۆگلەند لە وتارەکەیدا سەرەتا باسی ئەوەی کردوە کە هێزەکانی عێراق کوردەکانیان گەمارۆ داوە و کوشتوە. ئاوارە کوردەکان لە ئێران پێشتر باسی ئەوەیان کردبوو کە دەوڵەتی عێراق هەم لە کاتی شەڕدا کوردەکانی گەمارۆ داوە و کوشتوە و هەمیش پاشان لە بەندیخانەکاندا لەسێدارەی داون بەڵام ئەوە کە لە ماوەی ٦ هەفتەی ڕابردوودا نزیکەی ٦٠ هەزار ئاوارەی کورد بە کەیفی خۆیان گەڕاونەتەوە بۆ عێراق، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە دەوڵەتی عێراق لە ناوچە کوردنشینەکاندا بەشێوەیەکی مرۆڤانە هەڵسوکەوت دەکات و نوێنەری کومیسارىای باڵای نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ کاروباری پەنابەرانیش لە کاتی سەردانەکەی بۆ ناوچە لە ناوەڕاستی مانگی گوڵان وتویەتی کە هیچ زانیاریەکی بەدەست نەگەیشتوە کە باس لەوە بکات

٣٩ بەندکراوی کورد بە دەستی دەوڵەتی عێراق لەسێدارە دراون. هۆگلەند لە زمانی هەندێ سەرچاوەی باوەڕپێکراو لە بەغدادەوە ئاماژەی بەوە کردوە کە دەوڵەتی عێراق ٣٨ بەندکراوی کورد و فەرماندەیەکی هێزی پێشمەرگەی لەسێدارە داوە. ئەو فەرماندەیە لە ئێرانەوە گەڕابوەوە عێراق بۆ ئەوەی لە عەفواتەکەی دەوڵەتی عێراق سود وەربگرێت. بەگوێرەی ئەو راپۆرتەی رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست"، کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بانگەشەی ئەوەیان کردوە کە ئەو کەسانە کە لەسێدارە دراون جینایەتکار بوونە و بە هۆی سوچی سیاسی لە سێدارە نەدراون.

کیسینجێر

---

رەفتاری دەوڵەتی عێراق لەگەڵ ئاوارەکان توندوتیژانە بوبێت. ٢–سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، شەماڵ کەریم کە لە ئێران دەژی لە وەڵامی پرسیاری باڵوێزخانەدا وتی کە هیچ شتێکی لەو پەیوەندیەدا نەبیستوە و پێیوایە ئەو فەرماندە سەربازیە کە باس دەکرێ لە بەندیخانە لەسێدارە دراوە، ئەفسەرێکی هێزی پێشمەرگە بوە کە لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە دەستبەسەر کراوە و لە شەقامەکانی شاری سلێمانیدا گەڕاندراوە. شەماڵ کەریم وتی لە ئاوارەکان پرسیار دەکات بۆ ئەوەی بزانێت زانیاریەکانی جیم هۆگلەند چەندە راستە. (وەرگێڕ)

**له کونسولخانەی ئەمریکا له تەورێز**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی، ۱۲۷**

**۸ی تەموزی ۱۹۷۵**

**بابەت: گوشاری ئێران له سەر ئاوارەکان و مەلا مستەفا بارزانی**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ئانکارا، بەیروت، دەمیشق،تاران، کونسولخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له خورەمشەهر، نوسینگەی نوێنەرایەتی ئەمریکا له نەتەوە یەکگرتوەکان له نیویورک و ژنیف، نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا له بەغداد و فەرماندەی هێزی بەشی ئوروپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له واینگینی ئاڵمانیا

۱- دۆکتۆرێکی کورد [٤٥٥] که بەردەوام واسیتەی نێوان کونسولخانه و بارزانیه رۆژی ٦ی تەموز هات بۆ کونسولخانه بۆ ئەوەی دەربارەی ئیمکانی رۆیشتنی خۆی بۆ ئەمریکا پرسیار بکات و ئەو شتانه که بارزانی پێی وتوه به ئێمه بڵێت. خاڵه سەرەکیەکانی قسەکانی ئەو دۆکتوره ئەوەبوو که:

الف- ئێران گوشاری خستوەته سەر کوردەکان بۆ ئەوەی یا بگەڕێنەوە بۆ عێراق یا خۆیان لەگەڵ کۆمەڵگای ئێراندا بگونجێنن.

---

[٤٥٥] مەبەستی دۆکتۆر ئیسفەندیارە که پێشتر ئاماژەی پێکرا. دۆکتۆر ئیسفەندیار ماوەیەک پاش ئەوە رۆیشت بۆ ئەمریکا و ئێستاش هەر لەوێ دەژی. وەرگێڕ.

ب - ئێران هەوڵەکانی چڕتر کردوەتەوە بۆ ئەوەی بارزانی لە کۆمەڵگای ئاوارەکانی ناو ئێران جیا بکاتەوە.

ج - لە ماوەی سێ هەفتەی رابردوودا دەوڵەتی ئێران هەوڵەکانی زیاتر کردوە بۆ ئەوەی پێش لە هاتنی ئاوارە کوردەکان بۆ ئێران بگرێت.

٢- ئێران بەم شێوەیە گوشار دەخاتە سەر ئاوارەکان: گوشتی خواردنی ئوردوگاکانی کەم کردوەتەوە، درنگ بەتانی دەدات بەو ئاوارانە کە تازە هاتونەتە ناو ئوردوگاکان، گروپێک لە ئاوارەکان گوازراونەتەوە بۆ ئوردوگایەکی نزیک شیراز کە خێوەتی بە قەد ژمارەی ئاوارەکان تێدا نیە و ئاوی خواردنی کەمە. ئامانجی ئێران لەو گوشارانە ئەوەیە کە ئاوارەکان یا بگەڕێنەوە بۆ ناو شارەکان یا کۆچ بکەن بۆ شارەکانی دور لە سنوور بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی گروپگەلی بچوکدا کار بدۆزنەوە.

٣- گوشاری دەوڵەتی ئێران لە سەر بارزانی رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێت بۆ ئەوەی لە شوێنی ئێستای خۆی(کە نزیکی رەزائیەیە) بۆ دەوروبەری تاران کۆچ بکات. کوردەکان دەڵێن ئێران سەرەتا وتوویەتی دە هەزار کەس لە ئەندامانی عەشیرەتی بارزانی و هاوڕێ نزیکەکانی دەتوانن لەگەڵ بارزانی بڕۆن بۆ دەوروبەری تاران بەڵام ئێستا ئەو پێشنیارەی گۆڕیوە و دەڵێت ئەو شوێنە تەنیا جێگای ١٥٠٠ کەسی تیدا دەبێتەوە. هەروەها هاتوچۆی کوڕەکانی بارزانی، ئیدریس و مەسعود بۆ ناو ئوردوگاکانی شوێنە جۆراوجۆرەکانی ئێران رۆژبەرۆژ ئەستەمتر دەبێت. کوردەکان هەست دەکەن کە هەوڵەکانی کاربەدەستانی ئێران رۆژبەرۆژ زیاتر دەبێت بۆ ئەوەی دەوری رێبەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناو ئوردوگاکاندا کەم بکەنەوە و پێ لە سەر ئەوە دادەگرن کە ئەو کوردانەی کە لە ئێران دەمێننەوە دەبێ ببن بە ئێرانی.

٤- بەپێچەوانەی قسەکانی پێشویان، کوردەکان ئێستا دەڵێن دەوڵەتی ئێران سنووری بە سەر ئاوارەکاندا داخستوە. ئەو دۆکتۆرە کوردە دەیگوت ئەمدوایانە گروپێک لە ئاوارەکان هەوڵیانداوە بێنە ناو خاکی ئێران بەڵام هێزەکانی ئێران تەقەیان لێکردوون

و له ئەنجامدا دوو کەسیان لێکوژراوە و کەسێکیان لێ بریندار بوە کە ئێستا له نەخۆشخانەی رەزائیە ( کە دۆکتۆرە کوردەکە ئیشی تیدا دەکات) تەداوی دەبێت.

٥- کوردەکان هەروەها دەڵێن کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق ١٠ رۆژ مۆڵەتیان بە کوردەکانی دانیشتوی کەرکووک و دهۆک داوە ئەو ناوچەیە بەجێ بێڵن وەگەرنا دەوڵەتی عێراق دەیانگوازێتەوە بۆ باشوری عێراق. وادیارە ئامانجی دەوڵەتی عێراق لەو سیاسەتە، تەعریبی ناوچەکانی دەوروبەری سەرچاوەکانی نەوتە.

٦- هەڵسەنگاندن: ئامانجی دەوڵەتی ئێران لە سیاسەتی گوشارهێنان بۆ ئاوارەکان ئەوەیە کە کوردەکان لەگەڵ کۆمەڵگای ئێراندا بگونجێنێت و یەکرێزی ئەو گروپە کوردانە تێکبدات کە بە ئێران وەفادار نین.

نێئومان

**له باڵویزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٣٠٤٣**

**١٩ی ئابی ١٩٧٥**

**نهێنی**

**بابەت: نیگەرانی ئێران و عێراق لە ئەگەری نزیکبوونەوەی سۆڤیەت لە کوردەکان**

بۆ زانیاری:

- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە بەیروت
- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە موسکۆ
- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٣٥٣٨ی باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

١- لە دیدارێکدا لەگەڵ شا لە رۆژی ١٨ی ئاب، شا پێمیوت کە بەکر، سەرۆک کۆماری عێراق داوای لێکردوە لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق دیدار بکات کە بەمزوانە سەردانی تاران دەکات. شا وتی نازانێت وەزیری دەرەوەی عێراق دەیەوێت دەربارەی چی لەگەڵی گفتوگۆ بکات. لە وەڵامی پرسیارێکی مندا، شا وتی دڵنیایە کە ئەوە سەرۆک کۆمار بەکر بوە (نە سەدام حوسەینی جێگری سەرۆک کۆمار) کە داوای کردوە من لەگەڵ وەزیری دەرەوەی عێراق دیدار بکەم.

٢- دەربارەی پەیوەندیەکانی ئێران و عێراق، شا ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە لە هەوڵەکانیدا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ کاربەدەستانی عێراق بە ئامانجی نەهێشتنی

کومونیستەکان لە ناو بزووتنەوەی کورد، بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشتوە. شا هەروەها وتی بەگوێرەی ئەو زانیاریانە کە پێی گەیشتوە، سەدام حوسەین زۆر نیگەرانی هەوڵەکانی سۆڤیەت بۆ نزیکبوونەوە لە کوردەکانە بەڵام هیچ پێشنیارێکی تایبەتی بۆ هاوکاریکردنی ئێران و عێراق لەو پەیوەندییەدا لە لایەن سەدامەوە بە دەست نەگەیشتوە.

من پرسیارم لە شا کرد لە دەرەوەی ئێران و عێراق و تورکیا، بزوتنەوەی کورد لە چی شوێنێکی دیکە بەهێزە، شاش وەڵامی دایەوە: "هەرچەند کە کوردەکان لە هەموو شوێنێکی ئوروپا و سەراسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەن، بەڵام پێموایە گەورەترین گروپی کوردەکان لە پاریسن". روونە کە شا هەست بەوە دەکات کە نەیتوانیوە هاوکاری دەوڵەتی عێراق بۆ پاککردنەوەی بزوتنەوەی کورد لە کومونیستەکان بەدەستبهێنێت بەتایبەت لە ساتەوەختیکدا کە کاربەدەستانی عێراق نیگەرانی پەرەسەندنی بزووتنەوەیەکی کوردی کومونیستین.

هێڵمز

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ:باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**٣ی تشرینی دووەمی ١٩٧٥**

**نهێنی، بەپەلە**

**بابەت: دیداری جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی لە ئەمریکا**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کوەیت، دوحە، مەنامە، ئەبوزەبی، مەسقەت، جەدە و نووسیگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد

١- جگە لە راپۆرتەکەی دان شۆر[٤٥٦] دەربارەی یارمەتیە سەربازیەکانی ئەمریکا بە کوردەکان کە شەوی شەممە و سەرلەبەیانی ئەمڕۆ لە تەلەڤزیۆنی CBSدا بڵاو بوەوە، ئەو مەسەلەیە رۆژی یەکشەممە لە لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست"یشدا بڵاو بوەوە. هەروەها دانا ئادامز شمیدس[٤٥٧] رۆژی دوشەمە ئەو راپۆرتەی

---

[456] Dan Schorr

[٤٥٧] Dana Adams Schmidt یەکەم رۆژنامەنووسی رۆژئاوایی بوو کە لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا سەردانی کوردستانی کرد و لە ساڵی ١٩٦٣ تا ١٩٧٥ بەردەوام راپۆرتی دەربارەی شۆڕشی کورد لە رۆژنامەی "نیویۆرک تایمز" و "لۆس ئانجلێز تایمز" بڵاو دەکردەوە. دانا ئادامز بیرەوەریەکانی خۆی دەربارەی کوردستان لە کتێبێکدا بە ناوی " سەفەرێک بە ناو پیاوە ئازاکان" بڵاو کردەوە و ساڵی ١٩٦٣ خەڵاتی "کۆمەڵەی جۆرج پۆلک"ی بە هۆی بڵاوکردنەوەی رووداوەکانی

له رۆژنامەی "کریستیەن ساینس مانیتۆر"[٤٥٨] بڵاو کردەوە کە بارزانی بە خانەخوێیCIA بۆ تەداوی پزشکی هاتوە بۆ ئەمریکا و جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، سیسکۆ لەگەڵ بارزانی دیداری کردوە و بارزانی پێیخۆش نیە بگەڕێتەوە بۆ ئێران.

مەسەلەی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان و سەردانەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا لە کۆنفرانسە رۆژنامەوانیەکەی ٣ی تشرینی دووەم لە وەزارەتی دەرەوە نەخرایەڕوو بەڵام بە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەمان وتوە ئەگەر دەربارەی سەردانەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا پرسیاری لێکرا بەمشێوەیە وەڵام بداتەوە: "لە کاتی سەردانەکەی بارزانی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە مەبەستی تەداوی پزشکی، بەڕێز سیسکۆ بە شێوەی تاکەکەسی لەگەڵ بارزانی کە لە ئێران دەژی دیداری کردوە. ئێمە زۆر رێزمان بۆ بارزانی هەیە".

هەروەها بە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەمان وتوە ئەگەر دەربارەی مەسەلەی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان پرسیاری لێکرا بەمشێوەیە وەڵام بداتەوە: "من نامەوێت دەربارەی ئەو بانگەشانە هیچ بڵێم. پاشان روانگەی خۆمان دەردەبڕین".

هێنری کیسینجێر

---

کوردستان پێبەخشرا. دانا ئادامز ٢٥ی ئابی ١٩٩٤ لە تەمەنی ٧٨ساڵیدا لە ئەمریکا کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

[458] Christian Science Monitor

**تیلیگرام لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی ٢٤٩٣**

**٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٥**

**بابەت: بڵاوبوونەوەی هەواڵی یارمەتی سەربازی ئەمریکا بە کوردەکان لە عێراق**

بۆ زانیاری: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران و کوەیت

١- رۆژنامەی الثورە، زمانحاڵی حیزبی بەعس و رۆژنامەکانی دیکەی بەغداد رۆژی ٣ی تشرینی دووەم لە زمانی هەواڵنێری CBSی ئەمریکاوە بڵاویان کردەوە کە:

"نیکسۆن، سەرۆک کۆماری پێشووی ئەمریکا بایی میلیونها دولار چەکوچۆڵی بە نهێنی داوە بە گروپە داردەستەکەی واتا بارزانی. ئەو مەسەلەیە لەلایەن کومیتەی هەواڵگری تایبەتی کوشکی سپێیەوە ئاشکرا کراوە و شەوی رابردوو لە لایەن رادیۆ و تەلەڤزیونی کۆلۆمبیاوە بڵاو کرایەوە. شرۆڤەکاری رادیۆ و تەلەڤزیۆنی کۆلۆمبیا[٤٥٩]، دانییل شۆر[٤٦٠] وتی داوا لە CIA و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کراوە وردەکاریەکانی ئەو مەسەلەیە بخەنەڕوو و سەرۆک کۆماری ئەمریکا فەرمانی بە CIA داوە لێژنەیەک بۆ تاوتوێکردنی ئەو مەسەلەیە پێکبێت بەڵام زانیاری زیاتری لەو پەیوەندیەدا ئاشکرا نەکرد ".

---

[459] Columbia
[460] Daniel Shore

هەڵسەنگاندن: هەر چەند کە ئەو مەسەلەیە بە وردەکاری زیاترەوە لە لایەن هەواڵنێری VOA و BBC بڵاو کرایەوە بەڵام وادیارە دەوڵەتی عێراق بڕیاریداوە زۆر لە سەری نەچێت. ڕۆژنامەکانی عێراق باسی ئەوەیان نەکرد کە CBS بڵاوی کردوەتەوە کە شا داوای لە نیکسۆن کردوە ئەو چەکوچۆڵانە بنێرێت بۆ کوردەکان. ڕۆژنامەکانی عێراق هەروەها تەنها نیکسۆن بە هۆی ئەو مەسەلەیە سەرزەنش دەکەن نە دەوڵەتی ئەمریکا. وادیارە دەوڵەتی عێراق نایەوێت ئەو مەسەلەیە کاریگەری لە سەر نزیکبونەوەکەی لەگەڵ ئێران دابنێت یان ببێت بە هۆکارێکی نوێ بۆ ئەوەی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاڵۆز بێت.

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ:**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**١٣ی نیسانی ١٩٧٦**

**بابەت: تاوتوێکردنی کاردانەوەی ئێران سەبارەت بە مانەوەی بارزانی لە ئەمریکا**

١- بۆ باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران: محمد دۆسکی، بەڕێوەبەری کۆمەڵەی کورد لە ئەمریکا پێمانی ڕاگەیاندوە کە بارزانی لەگەڵ سێ هاوڕێی دیکەی دەیەوێت بۆ تەداوی پزشکی زیاتر سەردانی کلینیکی مایۆ[٤٦١] بکات. دۆسکی جەختی لە سەر ئەوە کردوەتەوە کە لە کاتی سەردانەکەی بارزانیدا هیچ چەشنە چالاکیەکی سیاسی ئەنجام نادرێت.

٢- سپاستان دەکەین ئەگەر بێ پرسیارکردن لە دەوڵەتی ئێران پێمان رابگەیەنن کە ئایا دەوڵەتی ئێران ڕێگە بەوە دەدات بارزانی و هاوڕێکانی لە ئێران بێنە دەرەوە و دیسان بگەڕێنەوە بۆ ئێران یا نا؟ [٤٦٢]

---

[461] Mayo Clinic

[٤٦٢]- ریچارد هێلمز، باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران ڕۆژی ٢٨ی نیسان لە پەیامێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە لە وەڵامی کیسینجێردا نوسیویەتی بە تەواوی دڵنیا نیە کە هەڵوێستی دەوڵەتی ئێران بەنیسبەت هاتنی بارزانی بۆ ئەمریکا بۆ تەداوی پزشکی چیە و ئاماژەی بەوە کردوە کە کێشەی

٣- هەرچەند کە بارزانی داوای پەنابەری لە UNHCR (کومیساریای باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران) نەکردوە و بە وتەی دۆسکی، بارزانی نایەوێت پلانی نێونەتەوەیی ئێستا بۆ نیشتەجێکردنی ئاوارە کوردەکان تێکبچێت یا بارودۆخی ئەو ئاوارە کوردانە کە ئێستا لە ئێرانن بخاتە ناو مەترسیەوە، بەڵام لەوانەیە بارزانی هەر کە گەیشتە ئەمریکا هەوڵ بدات لە ئەمریکا بمێنێتەوە و بنەماڵە گەورەکەشی بهێنێت بۆ لای خۆی. ئەگەر ئێمە رێگە بە بارزانی بدەین لە ئەمریکا بمێنێتەوە، کاردانەوەی ئێران چی دەبێت؟ ئایا دەوڵەتی ئێران رێگە دەدات بنەماڵەی بارزانی بێن بۆ لای بۆ ئەمریکا؟ بارزانی لە ئەمریکا دەتوانێت داوای پەنابەری سیاسی لە دەوڵەتی ئەمریکا یا UNHCR لە نیویۆرک بکات. UNHCR رایگەیاندوە بەگوێرەی پەیمانی ۲۷۳۹ی ژنێڤ ئاوارە کوردەکان ئەو مافەیان بە تەواوی هەیە کە لە لایەن UNHCR وە بپارێزرێن.

٤- بۆ نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد: سپاسی ئێوەش دەکەین بۆچونی خۆتانمان لەو پەیوەندیەدا پێڕابگەیەنن.

کیسینجێر

---

سەرەکی هەڵوێستی ئێران نیە بەڵکو ئەوەیە کە ئایا CIA و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا پێیانباشە بارزانی بێت بۆ ئەمریکا، بەتایبەت ئەگەر بیەوێت پاش تەداوی پزشکیش لە ئەمریکا بمێنێتەوە. ( وەرگێڕ)

**لە نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ:**

**- وەزارەتی دەرەوە، واشینگتۆن دی سی، ٣٣٢٦**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لەندەن**

**٤ی تەموزی ١٩٧٦**

**نهێنی**

**بابەت: کاریگەری مانەوەی بارزانی لە ئەمریکا لە سەر پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا**

ئامارە بە: تیلیگرامی ١٦٢٨١٩ی وەزارەتی دەرەوە

١- دەوڵەتی عێراق کاردانەوەیەکی ئەوتۆی لە بەرامبەر دیدارەکەی بەڕێز سیسکۆ[٤٦٣] و بارزانی نیشان نەداوە و پێموانیە دانیشتنی کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ بارزانی (ئەگەر ئاستی ئەو کاربەدەستانە بەرز نەبێت) کێشەی جدی بۆ پەیوەندیەکانی عێراق و ئەمریکا درست بکات. بە بۆچونی من تەنها بە مەرجێک

---

[٤٦٣]- مەبەست دیدارەکەی جۆزیف سیسکۆ، جێگری هینری کیسینجێرە لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٥. بۆ ناوەڕۆکی ئەو دیدارە بنواڕن بۆ پێشەکی ئەم کتێبە. وەرگێڕ

لەگەڵ بارزانی دیدار بکەن کە بارزانی هەواڵی ئەو دیدارانە بڵاو نەکاتەوە و ئەگەر بکرێت تەنها دەوڵەتی ئەمریکا و ئێران ئاگاداری ئەو دیدارانە بن.

٢- ئەگەر بارزانی بیەوێت بۆ هەمیشە لە ئەمریکا بمێنێتەوە من پێموایە کاردانەوەی توندی دەوڵەتی عێراقی بەدواوە دەبێت. رژێمی عێراق بەنیسبەت هاوکاری ئەمریکا و سوریە لە لوبنان بەدگومانە و ئاگاداری ئەوەیە کە دەوڵەتی سوریە پشتیوانی لە چالاکیەکانی کوردەکان دژی عێراق دەکات، کەوابوو ئەگەر دەوڵەتی ئەمریکا رێگا بە مانەوەی هەمیشەیی بارزانی لە ئەمریکا بدات دەوڵەتی عێراق بەو ئەنجامە دەگات کە دەوڵەتی ئەمریکا و سوریە دەسیان خستوەتە ناو دەسی یەک بۆ ئەوەی لە کوردەکان وەک چەکێک دژی رژێمی عێراق کەڵک وربگرن.

٣- ئەگەر رێگا بە بارزانی بدریت بۆ هەمیشە لە ئەمریکا بمێنێتەوە، دەوڵەتی ئەمریکا زۆر بە زەحمەت دەتوانێت پێش لە چالاکیە سیاسیەکان و لێدوانە گشتیەکانی بارزانی بگرێت. دەوڵەتی عێراق لە سیستمی ئەمریکا تێناگات و قەد باوەڕ بەوە ناکات کە دەوڵەتی ئەمریکا ناتوانێت لەوە زیاتر بارزانی کۆنترۆل بکات، کەوابوو بەبۆچونی من بۆ ئەوەی خۆمان توشی ئەم کێشانە نەکەین باشتر ئەوەیە بارزانی بنێرینەوە بۆ ئێران، هەروەها کە رۆژی یەکەم بریار بوە بچێتەوە بۆ ئێران[٤٦٤].

ویلی

---

[٤٦٤]- نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد رۆژی ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٧٦ پەیامێکی هاوشێوەی دیسان ناردوەتەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و پێشنیاری ئەوەی کردوە کە دەوڵەتی ئەمریکا پێش لە چالاکیە سیاسیەکانی بارزانی بگرێت چونکە دەوڵەتی عێراق پێیوایە کە بارزانی بە رەزامەندی ئەمریکا ئەو چالاکیانە ئەنجام دەدات. لەو پەیامەدا هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە " بەخۆشیەوە ئێستا بواری ئەوە هەیە کە دەوڵەتی ئەمریکا و بارزانی پێکەوە رێکبکەون واتا ئەمریکا ئەو شتانە جێبەجێ بکات کە بارزانی لە ئەمریکا داوای دەکات و لە بەرامبەردا بارزانیش چالاکی سیاسی ئەنجام نەدات. (وەرگێڕ)

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن**

**بۆ: باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**٢١ی تەمووزی ١٩٧٦**

**بابەت: دوایین پێشهاتەکانی پەیوەندیدار بە سەردانەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ ئەمریکا**

بۆ زانیاری: نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە بەغداد

ئاماژە بە: تیلیگرامی ١٦٢٨١٩ی وەزارەتی دەرەوە

١- بەرێوەبەری بەشی NEA/ARN [٤٦٥] رۆژی ٩ و ١٠ی تەموز لە رۆچێستێر، مینیسوتا[٤٦٦] لەگەڵ بارزانی قسەی کردوە. بارزانی وتویەتی پێیخۆشە بۆ ٧ یا ٨ مانگ لە ئەمریکا بمێنێتەوە بەڵام لە رووی ناچارییەوە ئەو ئامۆژگارییەی ئێمەی قبووڵ کردوە کە باشتر ئەوەیە پاش تەواوبوونی تەداویە پزشکیەکەی بە خێرایی بگەڕێتەوە بۆ ئێران. ئێمە بە بارزانیمان وت تەنها بۆ تەداوی پزشکی ڤیزای هاتن بە ئەمریکامان پێداوە و دەوڵەتی ئێران لەو پەیوەندیەدا ئاسانکاری بۆ کردوە و زۆر باش دەبێت ئەگەر بەو رێوشوێنانە پابەند بێت. ئەو پیاوەی SAWAK کە لە تاران لەگەڵ

---

٤٦٥- NEA/ARN بە ئۆفیسی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا و ئۆفیسی کاروباری لوبنان، سوریە، ئوردون و عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەوترێت. وەرگێڕ

٤٦٦- Rochester شارێکە سەر بە ویلایەتی نیۆیۆرک و Minnesota ویلایەتێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە دەکەوێتە باکووری ئەو وڵاتەوە. وەرگێڕ

بارزانیدا هاتوە، لەو دانیشتنەی بەڕێوەبەری NEA/ARN لەگەڵ بارزانیدا ئامادە بوو و هەروەها گوێی لەم داواکاریانەی بارزانی بوو.

٢- بەهەرحاڵ ئێمە بڕیارماندا کە مل بە داواکاریەکی دیکەی بارزانی بدەین ئەویش ئەوە بوو کە ڕێگەی پێبدەین پێش ئەوەی بڕواتەوە بۆ ئێران بۆ چەند ڕۆژێک لە واشینگتۆن بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێک کەس کە پێشتر لایەنگریان لە دۆزی کورد کردوە دیدار بکات و بۆ چەند ڕۆژێک بۆ ئیسراحەتکردن بچێتە شاخێکی ئێرە. ئەو کەسانە کە پێشتر لایەنگرییان لە دۆزی کورد کردوە و بارزانی دەیەوێت بیانبینیت بریتین لە سناتۆر جەکسۆن، کۆنگرێسمەن ویلسۆن، نوێنەری تیگزاس و جۆرج مینی[٤٦٧]. بارزانی هەروەها وتی دەیەوێت لەگەڵ داگلاس، دادوەری پێشوو[٤٦٨] دیدار بکات بەڵام ئێمە پێمانوت کە ناوبراو لە واشینگتۆن نیە. ئێمە پێمانوایە کە ئەم شێوە هەڵسوکەوتەی ئێمە لە سەربەرزی و شانازیبەخۆکردنی بارزانی کەم دەکاتەوە و ئەوەمان بۆ ئاسانتر دەکات کە بارزانی بۆ ئامانجی یەکەممان کە گەڕانەوەیەتی بۆ ئێران، کێشەمان بۆ ساز نەکات و هەروەها پێش لە دووپاتبوونەوەی ئەو بەزمە بگرین کە حیزبەکەی بارزانی جاری پێشوو بۆی درست کردین. ئێمە هەروها ئەوپەڕی هەوڵی خۆمان دەدەین کە بە ڕاوێژکردن لەگەڵ جەکسۆن، مینی و ویلسۆن، پێش لەوە بگرین کە لە کاتی دیداری بارزانی لەگەڵ ئەو کەسانەدا هەرایەکی پرۆپاگەندایی نەخوازراو بە دژمان ساز بێت.

٣- ئەگەر سەرەڕای هەموو هەوڵەکانمان مەسەلەی سەفەری بارزانی بۆ واشینگتۆن بڵاو بوەوە، هەڵوێستی ئێمە لەو کاتەدا ئەوە دەبێت کە:

الف- ئەڵبەتە کە ئێمە هاوکاری بارزانیمان کردوە بۆ ئەوەی لەلایەن ئەو پزشکانەوە کە پێشتر تەداویان کردوە و شارەزای فایلی نەخۆشیەکەینی، تەداوی بۆ بکرێت.

ب - ئێستا کە تەداویەکەی تەواو بوە، بارزانی پێش لە گەڕانەوە بۆ ئێران بۆ ماوەیەکی کورت لێرە ئیسراحەت دەکات و سەردانی چەند کەسێک دەکات.

---

467 – SENATOR JACKSON, CONGRESSMAN WILSON OF TEXAS, AND GEORGE MEANY.

468 - FORMER JUSTICE DOUGLAS

٤- به لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانە کە باسمان کرد، کاربەدەستانی ئێران ئاگادار بکەنەوە کە ئێمە بڕیارمان داوە ڕێگە بە بارزانی بدەین بۆ چەند ڕۆژێک بێت بۆ واشینگتۆن. ئێمە پێمانوایە کە ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی مەسەلەکە بکەین چونکە نوێنەری بارزانی لە واشینگتۆن پێشتر لەگەڵ ئەو کەسانە کە بارزانی دەیەوێت بیانبینێت، لە پەیوەندیدا بوە. ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە پێش لەوە بگرین کە دیداری بارزانی لەگەڵ ئەو کەسانە ببێتە پڕۆپاگەندایەکی نەخوازراو لەلایەن ئەو کەسانەوە و هەروەها پڕۆپاگەندای دۆست و لایەنگرە نزیکەکانی بارزانی بە دژی ئێمە. ڕاگەیاندنە گشتیەکان تا ئێستا ئاگاداری سەفەرەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا نەبوونەتەوە.

٥- سپاستان دەکەم وەڵامی کاربەدەستانی ئێرانم لەم پەیوەندییەدا بۆ بنێرن.

کیسینجێر

**لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ:**

- **باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**
- **نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**تەنها هێڵمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران و کیلۆگ، بەرپرسی نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد بیبینن**

**٢٤ی ئابی ١٩٧٦**

**نهێنی**

**بابەت: کێشەکانی بارزانی و هاوڕێکانی لە ئەمریکا**

١- وادیارە بارزانی کۆمەڵێک پەیامی لەلایەن کاربەدەستانی ئێرانەوە بە دەستگەیشتوە کە نیشان دەدات کاربەدەستانی ئێران ئیدی پێداگری لە سەر بارزانی ناکەن زوو بگەڕێتەوە بۆ ئێران. یەکێ لە هاوڕێیانی بارزانی پێیراگەیاندین کە شا لەرێگای SAWAKەوە بە بارزانی وتوە هەر کاتێک کە پێیخۆش بێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئێران و ئەگەر پێیخۆش بێت لە داهاتودا بۆ تەداوی پزشکی بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا، ئێران هیچ کەندوکۆسپیکی بۆ درست ناکات. ئەو کارمەندەی SAWAK کە لەگەڵ بارزانی بوە و لە تاران لەگەڵیدا هاتوە گەڕاوەتەوە بۆ تاران.

٢- هاوكات بارزانی و هاوڕێكانی گوازراونەتەوە بۆ هۆتێلێكی ناو گەڕەكێكی هەرزان قیمەتی واشینگتۆن و بەگوێرەی زانیاریەكان ئێستا بە دوای بەكرێگرتنی خانوویەک لە دەوروبەری واشینگتۆندان.

٣- لانیكەم سێ كەس لە هاوڕێیانی بارزانی، لەوانە یەكێ لە كوڕەكانی، پێیانخۆشە بگەڕێنەوە بۆ ئێران یان لە شوێنێكی دیكە لەگەڵ بنەماڵەكەیاندا یەک بگرنەوە. بۆ نموونە پزشكی تاكەكەسی بارزانی، دۆكتۆر عومرانی[٤٦٩] پێمانیوت دەیەوێت بەمزوانە بڕوات بۆ لەندەن بۆ ئەوەی لەوێ بگات بە ژن و منداڵەكەی كە بەمزوانە بە پاسپۆرتی ئێرانیەوە دێن بۆ لەندەن. لەوانەیە عومرانی و بنەماڵەكەی پاشان بۆ ماوەیەک بگەڕێنەوە بۆ واشینگتۆن بەڵام پێیانخۆشە بۆ هەمیشە لە لەندەن نیشتەجێ بن بۆ ئەوەی دۆكتۆر عومرانی درێژە بە خویندنی پزشكی بدات و ئەگەر بكرێت دەست بە كاری دوكتۆری بكات.

٤- سەرەڕای ئەم نیشانە ناسەقامگیرانە، ئێمە پێمانوایە كە سەرجەم هاوڕێیانی بارزانی بە تەواوی بە رێبەرەكەیان وەفادار دەبن و هەتا هەر كاتێک بارزانی پێی خۆش بێت لای بارزانی دەمێننەوە.

٥- ئامانجەكانی بارزانی ( جگە لەوەی كە دەیەوێت جارێ لە ئەمریكا بمێنێتەوە) بە تەواوی دیار نین. بارزانی بە بەرپرسی NEA/ARN ( بەشی كاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشوری ئاسیای وەزارەتی دەرەوە) وتوە كە ویستویەتی پشتگیری لەو عەفواتە بكات كە دەوڵەتی عێراق دەریكردوە بۆ ئەو كوردانە كە لە ئێران ماونەتەوە بەو مەرجە كە رێگە بە كوردەكان بدرێت لە ناوچە كوردنشینەكانی باكوور كە لە كۆنەوە تێیدا ژیاون (جگە لە ناوچە سنوریەكان) نیشتەجێ ببنەوە. بارزانی هەروەها

---

[٤٦٩] DR. OMRANI. وادیارە مەبەستی دۆكتۆر نەجمەدین كەریم عومەر، پارێزگاری ئێستای كەركووكە كە ئەو كاتە پزشكی تایبەتی مەلا مستەفا بووە وەگەرنا مەلا مستەفا هاوڕێیەكی بە ناوی دۆكتۆر عومرانی نەبوە. دۆكتۆر نەجمەدین كەریم ساڵی ١٩٧٦ بە یەكجاری لە ئەمریكا مایەوە و درێژە بە خوێندنەكەی دا و بڕوانامەی پزشكی پسپۆڕی نەشتەرگەری دەماری لە زانكۆی جۆرج واشینگتۆن بەدەسهێنا. وەرگێڕ

به شێوەی ناڕاستەوخۆ وتویەتی باشترین کارێک کە لەم بارودۆخەدا دەتوانێت بیکات بۆ ئاوارە کوردەکانی نێو ئێران ئەوەیە کە پشتگیری لەو عەفواتە بکات. بارزانی هەروەها وتویەتی لەمەوبەدوا هەوڵ بۆ ئەوە دەدات سەرنجی رژیمی عێراق بەرەولای شتێک وەک رێکەوتننامەکەی ئاداری ١٩٧٠ رابکێشێت.

٦- بۆچوونی ئێمە ئەوەیە کە جارێ سیاسەتی" بنوارە و چاوەڕوان بکە" بەنیسبەت ئەم بارودۆخە بگرینەبەر. هەندێ راپۆرت دەربارەی بارودۆخی بارزانی لە ئەمریکا لە لایەن رۆژنامەکانەوە بڵاو بوەتەوە بەڵام سەرنجێکی ئەوتۆ بەو راپۆرتانە نەدراوە. ئێمە پێمانوایە کە نابێت ئەوەندە گوشار بخەینە سەر بارزانی کە ناچاری بکەین داوای یارمەتی لە هەندێ لە دۆستەکانی لێرە بکات یان مەسەلەکە لە ناو راگەیاندنە گشتیەکاندا بتەقێتەوە. ئەنجامی کۆتایی ئەو مەسەلەیە ئەوەیە کە بارزانی داوای پەنابەری سیاسی لە ئەمریکا بکات کە بۆ ئەوەش فایلێکی بەهێزی بەدەستەوەیە و ئێمە بە ئاسانی ناتوانین داواکاریەکەی رەت بکەینەوە.

٧- لەئەنجامدا ئێمە داوامان لە ئیدارەی کاروباری کۆچبەران کردوە ماوەی مانەوەی بارزانی و هاورێکانی لە ئەمریکا بۆ سێ مانگی دیکە درێژ بکاتەوە و رێگە بە هەندێ لە هاورێیانی بارزانی واتا دۆکتۆر عومرانی و موحسین دزەیی بدات سەردانی لەندەن بکەن و بگەرێنەوە بۆ ئەمریکا.

٨- سپاستان دەکەین ئەگەر بۆچوون و پێشنیارەکانی خۆتان دەربارەی چونیەتی هەڵسووکەوتکردن لەگەڵ کێشەی بارزانی بۆمان بنێرن بەڵام لە پلەی یەکەمدا گرنگی بە هەڵوێستی کاربەدەستانی عێراق و ئێران سەبارەت بەو مەسەلەیە بدەن.

بۆ هێلمز، باڵوێزی ئەمریکا لە تاران: سپاست دەکەین ئەگەر بۆمان روونی بکەیتەوە کە هەڵوێستی شا و دەوڵەتی ئێران چی دەبێت ئەگەر بارزانی لەمە زیاتر لە ئەمریکا بمێنێتەوە و داوای پەنابەری سیاسی لە ئەمریکا بکات.

کیسینجێر

**له نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**بۆ: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی، ٣٥٤١**

**٣٠ی ئابی ١٩٧٦**

**بابەت: ئاکام و ئەنجامەکانی مانەوەی بارزانی لە ئەمریکا**

بۆ زانیاری: باڵویزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران

ئاماژە بە: تیلیگرامی ٢٠٩٨٩٧ی وەزارەتی دەرەوە

١- من پێموایە کە دەوڵەتی عێراق وەک هێزێک سەیری بارزانی دەکات کە ئیدی ناتوانێت ڕێبەرایەتی خەباتێکی دیکە لە داهاتودا بکات یان ئیلهام بەو خەباتە بدات مەگەر ئەوە کە بارودۆخێک بڕەخسێت ( کە ئەویش دوورە) کە ئێران و عێراق شەڕ بکەن و شا بریار بدات جارێکی دیکە کەڵک لە بارزانی وەربگرێت و پشتیوانی لێبکات بۆ ئەوەی دەستی بەشێک لە سپای عێراق ببەستێتەوە.

٢- دەوڵەتی عێراق بۆی گرنگ نیە بارزانی لە کوێیە، مەگەر ئەوە کە ئەو دەوڵەتە کە خانەخوێی بارزانیە بەشێوەیەکی کاریگەر بارزانی تەشویق بکات لە عێراق خراپکاری بکات.

٣- بارزانی بێ پشتیوانی دەرەکی ناتوانێت ببێت بە هێزیکی کێشەخولقینەر بۆ دەوڵەتی عێراق. بارزانی کێشە بۆ دەوڵەتی عێراق دروست ناکات بەڵکوو کێشە بۆ دەوڵەتی ئەمریکا دەخولقێنێت بەتایبەت لە ئێستادا کە پەیوەندیە دیپلۆماتیکەکانی نێوان عێراق و ئەمریکا وردە وردە دەست پێدەکاتەوە و ئەگەری ئەوە هەیە کە بارزانی گفتوگۆکانی داهاتووی ئەمریکا و عێراق بۆ دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانیان

لەبار ببات. دوور نیە بارزانی لۆبی بکات یان لەرێگای ئەو لایەنگرە جۆراوجۆرانە کە لە ناو راگەیاندنە گشتیەکاندا هەیەتی هەوڵ بدات کۆمەڵێک ئیمتیاز بۆ کوردەکان وەدەست بخات کە لە ئەنجامی ئەوەشدا دەستپێکردنەوەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراق لە بار دەچێت یان بۆ ماوەیەکی درێژ پێش لەوە دەگرێت کە ئەمریکا و عێراق لە بواری کڕین و فرۆشتنی نەوت و فڕۆکەی مەدەنی یا چەکوچۆڵی سەربازی یا شتانی دیکە پێکەوە رێکبکەون.

٤ - ئامارەکردن بەم دوو خاڵە گرنگە: الف - دەوڵەتی عێراق سیاسەتی خۆی بەنیسبەت کورد بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی لەقەڵەم دەدات. ب - ئەو پێشنیارە کە دەوڵەتی عێراق دەربارەی ئوتونومی کورد خستیەڕوو و بارزانی رەتی کردەوە، پێشنیارێکی نائینسانی نەبوو. دژوارترین خاڵەکانی ئەو پێشنیارە ئەوە بوون کە یەکەم کوردەکان ناچارن وەک زمانی دووەم فێری زمانی عەرەبی بن و دووەم داهاتی نەوتی کەرکووک بۆ وڵاتی عێراق تەرخان بکرێت نەتەنها هەرێمی ئوتونومی کوردستان[٤٧٠]. ئایا هیچ دەوڵەتێکی دیکە لە عێراق بە کەمتر لەوە رازی دەبێت؟ پێش لە دەستپێکردنی شۆڕشی بارزانی، دەوڵەتی عێراق هیچ پلانێکی نەبوو بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان بە زۆر لە دەشتەکانی میزۆپۆتامیادا نیشتەجێ بکات.

٥- ئەگەر هاتوو بارزانی بڕیاری دا ئەمریکا بەجێ نەهێڵێت، نابێ ناچاری بکەین لە ئەمریکا بچێتە دەرەوە چونکە ئەو کاتە لەوانەیە بارزانی بیروڕایەکی گشتی کاریگەر لە ناو ئەمریکا بەرەولای ئەو مەسەلەیە رابکێشێت بۆ ئەوەی لە ئەمریکا بمێنێتەوە.

---

[٤٧٠] ئەو بۆچوونە راست نییە چونکە هۆکاری رێکنەکەوتنی بزووتنەوەی کورد و دەوڵەتی عێراق ئەو شتانە نەبوو بەڵکوو ئەوە بوو کە دەوڵەتی عێراق هیچکام لە خاڵەکانی رێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ی جێبەجێ نەدەکرد و تەنها دەیەویست کات بە فیڕۆ بدات و خۆی بەهێز بکات بۆ ئەوەی بە هێرشی سەربازی کۆتایی بە کێشەی کورد بهێنێت. کورد قەد داوای ئەوەی نەکردوە کە داهاتی نەوتی کەرکووک بەس بۆ هەرێمی کوردستان بێت بەڵکوو کێشەکە ئەوە بوو کە دەوڵەتی عێراق کەرکوکی نەدەخستە ناو هەرێمی ئوتونومی کوردستان و هاوکات سیاسەتی تەعریبی کەرکووک و ناوچە دابڕاوەکانی جێبەجێ دەکرد. وەرگێڕ

ئەگەر شتێکی وا هاتەپێش دەوڵەتی ئەمریکا دەبێ خۆی لەگەڵ بارودۆخەکەدا بگونجێنێت و کۆمەڵێک سنوور بۆ چالاکیە سیاسیەکانی بارزانی لە ئەمریکا دابنێت. ئەگەر بارزانی بەوە رازی بوو کە بەنیسبەت بارودۆخی کوردستان بێ دەنگ بێت یان تەنانەت لەگەڵ دەوڵەتی عێراق سازش بکات، ئێمە دەتوانین لە سەر ئەو مەسەلەیە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق مامەڵەیەک بکەین.

٦- بە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندیە درێژخایەنترەکانی ئەمریکا و عێراق، پێشنیار دەکەم چاوێک بە پەیماننامەی ٧ی حوزەیرانی ١٩٣٤ی ئەمریکا و عێراق بۆ گۆڕینەوەی تاوانبارانداا بخشێنین (نوسینگەکەمان ئەو پەیماننامەیەی لانیە) بۆ ئەوەی بزانین ئایا ئەو پەیماننامەیە هێشتا لە جێی خۆیدا ماوە یان نا و ئەگەر هاتوو پەیوەندیەکانمان لەگەڵ عێراق دەستی پێکردەوە و ئەو پەیماننامەیە کەوتەوە کار، چی رودەدات ئەگەر دەوڵەتی عێراق داوا لە دەوڵەتی ئەمریکا بکات بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە بارزانی تەسلیم بە عێراق بکاتەوە بۆ ئەوەی لە عێراق دادگایی بکرێت؟

کیلۆگ[٤٧١]

471 Killough

**له وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، واشینگتۆن دی سی**

**بۆ:**

**- باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە تاران**

**- نوسینگەی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە بەغداد**

**١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٦**

**نهێنی**

**بابت: کێشەی چوونی بارزانی بۆ ئوروپا و هاتنەوەی بۆ ئەمریکا**

١- مەلا مستەفا بارزانی دەیەوێت ئەم هەفتەیە بچێت بۆ ئوروپا و دوو مانگ لەوێ بمێنێتەوە و پاش هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا. بارزانی پێی لە سەر ئەوە داگرتوە کە ئەگەر ئێمە ویزای هاتنەوە بۆ ئەمریکا بە خۆی و هاوڕێکانی نەدەین لە ئەمریکا دەرناچێت چونکە دەیەوێت لە وە دڵنیا بێت کە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا.

٢- بارزانی پێشتر داوای لە ئێمە کردبوو هاوکاری بکەین بۆ ئەوەی هەندێ لە هاوڕێکانی لە ئوروپاوە بێن بۆ ئەمریکا بۆ سەردانی، بەڵام ئێمە ئەو داواکاریەمان رەت کردەوە چونکە ئەو کارە دەبوە هۆی ئەوەی چالاکیە سیاسیەکانی بارزانی لە خاکی ئەمریکا پەرە بسێنێت.

٣- روونە کە بارزانی دەیەوێت بۆ پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ تۆڕی لایەنگرە کوردەکانی سەردانی ئوروپا بکات و پاشان بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا بۆ ئەوەی بزانێت ئایا ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەبێتە هۆی ئەوەی کە

ئەمریکا پشتیوانی لێبکات. لە کۆتاییدا لەوانەیە بارزانی هەوڵ بدات بۆ هەمیشە لە ئەمریکا بمێنێتەوە. ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە نوێنەری بارزانی لە واشینگتۆن دەیەوێت خانوویەک لە ویرجینیا بۆ ماوەی ٥ ساڵ بە کرێ بگرێت.

٤- ئێمە دەمانەوێت ڤیزای هاتنەوە بۆ ئەمریکا بدەین بە بارزانی[٤٧٢] و سەیر بکەین بزانین لە دوو مانگی داهاتودا بارودۆخەکە چۆن بەرەوپێش دەچێت چونکە ئەگەر ڤیزا نەدەین بە بارزانی هەڵمەتی پشتیوانی لە بارزانی لە لایەن راگەیاندنەکانەوە بەرێدەخرێت و دوای ئەوەش لەوانەیە بارزانی داوای پەنابەری لە ئێمە بکات و ئێمەش ناتوانین ئەو داواکاریە رەت بکەینەوە. ئەو کاتە مەسەلەکە ئەوە دەبێت کە ئایا بارزانی دەتوانێت بە سلامەت بگەرێتەوە بۆ وڵاتەکەی واتا عێراق (نە ئێران).

ئێوە دەبێ بیروبۆچونی کاربەدەستە پەیوەندیدارەکانی ئێران دەربارەی داواکاریەی بارزانی وەربگرن و بۆیان شی بکەنەوە کە دەمانەوێت ویزای هاتنەوە بۆ ئەمریکا بدەین بە بارزانی هەرچەند کە هێشتا بە تەواوی بریاری خۆمانمان لەو پەیوەندیەدا نەداوە. هەروەها سپاستان دەکەین ئەگەر بۆچوونەکانی خۆتانمان لەو پەیوەندیەدا بۆ بنێرن.

رابینسۆن[٤٧٣]

---

[٤٧٢] وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا رۆژی ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦ پەیامێکی ناردوە بۆ باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و پێیراگەیاندووە کە وەزارەتی دەرەوە لە کۆتایی مانگی ئەیلوولدا ویزای هاتنەوە بۆ ئەمریکای داوە بە مستەفا بارزانی، رێبەری پێشوی کورد و ٤ کەس لە هاوڕێکانی. لە پەیامەکەدا ئاماژە بەوە کراوە کە بارزانی و هاوڕێکانی رایانگەیاندوە دەیانەوێت بچن بۆ لەندەن. وەرگێڕ

[473] Robinson

## راپۆرتێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی پەیوەندییەکانی ئەمریکا، ئێران و عێراق و هۆکارەکانی یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکان

لە ساڵی ١٩٦٩ تا ١٩٧٢ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک یەکێ لە دۆستە وەفادارەکانی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەیری ئێرانی دەکرد و وەک نەیارێکی مەترسیدار سەیری عێراقی دەکرد و بە هۆی ئەوەی کە ئێران و عێراق رکابەر بوون، پەیوەندییە نزیکەکانی ئەمریکا و ئێران تەنها درزی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و عێراقی زیاتر دەکرد.

سەرۆک کۆمار ریچارد نیکسۆن هەروەک سەرۆک کۆمارەکانی پێشووی ئەمریکا وەک یەکێ لە کۆڵەکە قایمەکانی ئاسایشی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەیری ئێرانی بن رێبەرایەتی "محمەد رەزا شا"ی پەهلەوی دەکرد. تەنها خاڵی سەرەکی جیاوازی لە پەیوەندییە گەرموگۆڕەکانی ئێران و ئەمریکا ئەوە بوو کە شا بەپەرۆش بوو چەکی زۆر تکنولۆژیک بە بەهایەکی گران وەدەست بخات (کە پێویست نەبوو). کاربەدەستانی ئەمریکا کە نیگەرانی ئەوە بوون زیادبوونی مەیلی چەکخوازیی شا لە وانەیە ببێ بە مەترسی بۆ سەقامی ناوخۆی ئێران، لە نێوان رازیکردن و کونترۆڵکردنی شادا گیریان کردبوو. لە پەیوەندی لەگەڵ عێراق، ئیدارەی نیکسۆن بە چاوی گومان (ئەگەر نەڵێین دوژمنایەتی) سەیری رژیمی بەعسی عێراقی دەکرد کە تا ساڵی ١٩٦٧پەیوەندی زۆر نزیکی لەگەڵ ئەم دەوڵەتە هەبوو.

حکوومەتی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٦٧وە لە رێگای باڵوێزخانەی بەلژیکا کۆمەڵێک پەیوەندی زۆر کەمی لەگەڵ حکوومەتی عێراق هەبوو و کاتێک مەسەلەیەکی زۆر

هەستیار رووی دەدا لە ڕێگای لایەنێکی سێیەمەوە کۆمەڵێک گفتوگۆی دیکەی لەگەڵ دەکرد. بە هەرحاڵ بە پێچەوانەی حکوومەتی ئێران، ئیدارەی ئەمریکا وا سەیری بەعسی دەکرد کە ئەوەندە لەرزۆک و لاوازە کە ناتوانێت هەڕەشەیەکی جیدی دروست بکات بۆ ناوچەی کەنداو، و هەوڵە یەک لە دوای یەکەکانی نەیارانی بەعس بۆ کودیتا ئەم بیروڕایەی بەهێزتر دەکرد .

بەریانی ئیدارەی نیکسۆن بەرەولای ئێران بووە هۆی گۆڕانێکی گرنگ لە سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٧٢: یەکەم ئەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستی لە هەوڵە جارناجارەکانی بۆ کونترۆڵکردنی خەرجە سەربازییە یەکجار زۆرەکانی ئێران هەڵگرت. لە میانەی سەردانەکەی بۆ ئێران لە ١٩٧٢ نیکسۆن بەڵێنی دا هەموو جۆرە چەکێکی ئەمریکایی (جگە لە چەکی ناوکی) کە شا دەیەوێت بفرۆشێت بە ئێران. دووەم ئەوە کە لە هەمان دانیشتندا سەرۆک کۆماری ئەمریکا لەگەڵ ئەو ڕوانگەیەی شا هاوڕا بوو کە عێراق (کە ببوو بە هاوپەیمانێکی نزیکی سۆڤیەت) مەترسییە بۆ ئاسایشی ناوچەی کەنداو.

حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەگەڵ ڕژیمی بەعس لە تەموزی ١٩٧٢ەوە دەستی کرد بە پشتیوانیکردن لە شۆڕشی کوردەکانی عێراق بە ڕێبەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی. هەرچەند کە شا چەندین ساڵ بەر لەوەش یارمەتی ماددی دەدا بە بارزانی، بەڵام ئەو کاتە حکوومەتی ئەمریکا لە سەر بنەمای پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتانی دیکە داواکاری یارمەتیخوازانەی کوردەکانی ڕەت دەکردەوە. بەهەرحاڵ پاش ئەوەی کە عێراق لە نیسانی ١٩٧٢ پەیماننامەیەکی لەگەڵ سۆڤیەت مۆر کرد، کاربەدەستانی ئەمریکا (بەتایبەت کاربەدەستانی CIA) گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە دەبێ سەرنج بە هەڕەشەکانی عێراق بدەن.

دوابەدوای پچڕانی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و عێراق لە میانەی شەڕی ١٩٦٧ی عەرەب و ئیسراییل، لە ڕێگای بەلژیکاوە تۆزی پەیوەندی لە نێوانیاندا دروست بوو بەڵام ئەمریکا لە عێراق بوونی نەبوو و کەم دەستی لەم وڵاتە دەڕۆیشت. لە ١٩٦٩

حکوومەتی بەعس "بە بیانووی ئەمنی" چاوی تەماحی بڕیبووە مڵکی باڵوێزخانەی پێشووی ئەمریکا لە بەغداد و سەرەنجام هەروەها کە پێشبینی دەکرا پاش چەند ساڵ وتووێژی بێ سوود لە گوڵانی ١٩٧١ دەستی بە سەردا گرت. ئەم رووداوە ئیدارەی نیکسونی هاندا تا لە ساڵی ١٩٧٢ نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندی ئەمریکا لە باڵوێزخانەی بەلژیکا لە بەغداد بکاتەوە، هەروەها کە عێراق نووسینگەی پاراستنی بەرژەوەندی خۆی لە ١٩٦٧ لە واشنگتۆن کردبوووەوە.

رێژەی دەستنەرۆیشتویی ئیدارەی نیکسۆن لە سەرەتای ١٩٦٩ لە عێراق زیاد بوو واتا ئەو کاتە کە هەوڵیدا پێش لە تۆڵەسەندنەوەی ئیسراییل لە دەوڵەتی عێراق بگرێت چونکە دەولەتی عێراق دەستیکردبوو بە شەپۆلی گشتی لە سێدارەدانی جولەکەکانی عێراق و ئەو کەسانە کە تاوانی سیخوڕی بۆ ئیسراییلیان خرابووە پاڵ. بۆ ئارامکردنەوەی ئیسراییل، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە بەیاننامەیەکدا لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم کردەوەیەی عێراقی (لە سێدارەدانی جولەکەکان) شەرمەزار کرد. هەروەها کاربەدەستانی ویلایەتە یەککرتووەکان بەرنامەیەکیان داڕشت بۆ ئەوەی جولەکەکانی عێراق بتوانن کۆچ بکەن بۆ ویلایەتە یەککرتووەکان. بەهەرحاڵ ئەمریکا دەرکی بەوە دەکرد کە هاوکاریی بنەڕەتی عێراق دەستەبەر نابێت ئەگەر واشنگتۆن بکەوێتە ناو کێشەکە، هەربۆیە وەزارەتی دەرەوە ئەندامانی کۆنگریسی پەشیمان کردەوە کە مەسەلەی لەسێدارەدانی جولەکەکان لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بخەنەڕوو.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ باڵوێزخانەی بەلژیکا راپۆرتیدا کە بارودۆخەکە باشتر بووە بۆ جولەکەکانی عێراق، هەرچەند کە ئەو راپۆرتانە کە پاشان دەربارەی دەستگیرکرانی جولەکەکان (کە ویستوویانبوو لە عێراق کۆچ بکەن) بڵاو بووەوە دەوڵەتی ویلایەتە یەککرتووەکانی لە ئاداری ١٩٧١ هاندا تا داوا لە کومیسیونی باڵای نەتەوە یەککرتووەکان لە کاروباری پەنابەران بکات تاوتوێی ئەم مەسەلەیە بکات. ئەم کومیسیونە لەپاڵ هاوپەیمانەکانی دیکەی ئەمریکا (کە ئەمریکا داوای لێکردبوون) توانی لە لایەن جوولەکەکانی عێراقەوە سکاڵایەک تەسلیم بە حکوومەتی عێراق بکات،

بەهەرحاڵ مەسەلەکە جارناجار سەری هەڵدەدایەوە. کاربەدەستانی ئەمریکا ئازاردانی جولەکەکانی عێراقیان وەک هەوڵێک بۆ راکێشانی پشتیوانی خەڵک بەرەولای رژیمی بەعس لە رێگای کایەکردن بە هەڕەشەی سەربازی ئەمریکا لێکدایەوە. بە وتەی INR لاوازبوونی عێراق لە ناوخۆ لە رووی سیاسییەوە بووە هۆی ئەوەی کە رژیمی عێراق سیخۆڕە جولەکەکان لە سێدارە بدات.

تا ماوەیەکی کورت پاش ئەوەش کاربەدەستانی ئەمریکا دەوڵەتی عێراقیان زیاتر بە سەرئێشە دەزانی تا هەڕەشە. ئەم لاوازییەی عێراق تێگەیشتنی سیاسەتمەدارانی ئەمریکای لە ساڵەکانی سەرەتای ئیدارەی نیکسۆن پێکدەهێنا. سەرەڕای هەوڵی شا بۆ ئەوەی هەڕەشەی هێرشی عێراق یا خراپکاری سۆڤیەت لە رێگای عێراقەوە گەورە بگات، حکومەتی ئەمریکا نەگەیشتبووە سەر ئەو قەناعەتە کە عێراق ئەوەندە بەهێز بێت کە دژی ئێران هەنگاو هەڵبگرێت و سۆڤیەت وەک هاوپەیمانێک پشتی پێببەستێت یان سۆڤیەت بیەوێت پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران بکات بە قوربانی پەیوەندیەکانی لەگەڵ عێراق. کاربەدەستانی ئەمریکا دەیانزانی رەوتی تەیاربوونی عێراق بە چەکی مودێرن رەوتێکی هێواشە و هەرچەند کە سوپای عێراق دەتوانێت ئاسایشی ناوخۆی وڵات و هەروەها سنوورەکانی خۆی دژی وڵاتانی دیکەی عەرەبی بپارێزێت بەڵام ناتوانێت وەڵامی هێرشی تورکیا یا ئێران بداتەوە. شێلگیربوونی رژیمی بەعس بۆ زاڵبوون بە سەر سوپا بووە هۆی ئەوەی بارودۆخیکی لاوازی هەبێت.

دەوڵەتی ئەمریکا ئاگاداری ئەوە بوو کە سۆڤیەت کەرەستە و پێداویستی هێزی دەریاوانی لە بەندەری "ام القسر" دامەزراندووە و هەروەها کۆمەڵێک زانیاری دەست کەوت دەربارەی ئەوەی کە سۆڤیەت لە هاوپەیمانە عێراقییەکەی بێ هیوا بووە چونکە نەیتوانیوە لەگەڵ کوردە راپەڕیوەکان لە باکوور ئاشت بێتەوە و ئەو قەرزانەی کە لە مۆسکۆ وەریگرتووە بداتەوە بە سۆڤیەت. کاربەدەستانی ئەمریکایی ئەوەیان دەزانی کە راوەستانی دوژمنایەتی نێوان رژیمی بەعس و کەمینەی کورد دەتوانی ببێتە هۆی بەهێزبوونی عێراق و دەستی ئاوەڵا دەکات تا روو بکاتە کەنداو.

بەهەرحاڵ تەنانەت پاش ئەوە کە دەوڵەتی عێراق پەیماننامەی ئاگربەستی لەگەڵ کوردەکان لە ئاداری ١٩٧٠ واژۆ کرد، بەشدارنەکردنی کوردەکان لە دەسەڵات لە لایەن بەعسییەکانەوە نیشانیدا کە راپەڕینی کورد بەردەوام دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە کاربەدەستانی ئەمریکا حەزیان لە رژیمی بەعس نەبوو بەڵام زۆریش بە پێویستیان نەدەزانی یارمەتی کوردەکان بدەن..

لە ساڵی ١٩٦٩ەوە رێبەری کوردەکانی عێراق، مەلا مستەفا بارزانی بۆ راپەڕینەکەی دژی بەعس چەند جار داوای یارمەتی لە ئیدارەی نیکسۆن کردبوو بەڵام کاربەدەستانی ئەمریکا ئەم داواکارییەیان رەت دەکردەوە لە سەر بنەمای ئەوە کە ئەمریکا نایەوێت لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتانی دیکەدا دەستێوەردان بکات و ئامانجی ئەوە نییە کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد دابمەزرێت. کاربەدەستانی ئەمریکا هەروەها وا هەستیان دەکرد کە بێ لەبەرچاو گرتنی گلە و گازندەی کوردەکان دەربارەی ئەوەی کە وەکوو پێویست یارمەتی نادرێن، کوردەکان دەتوانن ئەو یارمەتییە لە ئێران و ئیسراییل وەربگرن. ئەم دوو وڵاتە بۆ ماوەیەکی درێژ پشتیوانیان لە بارزانی کردبوو بۆ ئەوەی دوژمنەکەیان واتا دەوڵەتی عێراق ناسەقامگیر بکەن. لە سەراسەری ساڵی ١٩٧١ سەرەڕای ئەوەی کە بارزانی پێی لە سەر ئەو دادەگرت کە تەنها راپەڕینی کورد دەتوانێت رژیمی بەعس بڕوخێنێت، ویلایەتە یەکگرتووەکان یارمەتیدانی کوردەکانی رەت کردەوە. دەوڵەتی ئەمریکا چاوەڕوانی ئەوە بوو کە رژیمی بەعس بۆ خۆی بڕوخیت لەوانە لە رێگای کودیتایەکەوە.

لە ئاب و کانوونی یەکەمی ١٩٦٩ هەندێ لە نەیارانی رژیمی بەعس لە دەرەوەی وڵات هەوڵیاندا پشتیوانی ئەمریکا بۆ کودیتا دژی رژیمی بەعس بە دەست بهێنن بەڵام ئەمریکا پشتیوانی لێنەکردن. کودیتایەکی دیکەش بە پشتیوانی SAWAKلە رێگای هێزەکانی نەیاری بەعس لە کانوونی دووەمی ١٩٧٠ هەرەسی هێنا. کاربەدەستانی ئەمریکا هەروەها کۆمەڵێک هەواڵیان بە دەست گەیشت دەربارەی ئەوەی کە پلانی کودیتای سێیەم لە ئەیلوولی ١٩٧٠ لەلایەن محمد جعفر النمیری (کە مسڵمانیکی

شیعە بووە کە لە هەڵاواردنی موسلمانە سوننە بەعسیەکان وەزاڵە هاتبوو) دارێژراوە.
کاربەدەستانی ئەمریکا هەروەها هەوڵیاندا ناکۆکی بخەنە ناو خودی حیزبی بەعس کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ بووە هۆی ئەوەی کە هاردان تکریتی، وەزیری بەرگری بە هاندانی سەدام حوسەین، جیگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەرکەنار بکریت. بە گشتی کاربەدەستانی ویلایەتە یەکگرتووەکان وای بۆ دەچوون کە عێراق بە تیپەڕبوونی کات خۆی ناسەقامگیر، لەرزۆک و سەرگەردان دەبێت.
بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا رژیمی عێراق خۆی بەهێزتر کرد و تا ساڵی ١٩٧٢ هەندێ لە کاربەدەستانی ئەمریکی گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە حکوومەتی بەعس سەرەڕای تەنگ و چەڵەمە ئابوورییەکان و ناڕازیبونی کوردەکان دەتوانی بۆ ماوەیەک درێژە بە دەسەڵاتی خۆی بدات. وادیار بوو کە ناسەقامگیری ناوخۆیی رێگە بەوە نادات رژیمی بەعس کاریگەری و دەستڕۆیشتووی سیاسی خۆی بنێرێتە دەرەوەی عێراق.
بەهەرحاڵ دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق زۆرتر بوو و ئەم مەسەلەیە لە رێککەوتننامەی سۆڤیەت و عێراق بۆ دابینکردنی ٢٥٠ میلیون دولار پێداویستی سەربازی و یارمەتی زۆرتر بە عێراق لە لایەن سۆڤیەتەوە رەنگی دایەوە. سۆڤیەت سەرمایەگوزاری لە عێراقی کردبوو بە بنەمایەک بۆ ئەوەی پێگەی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهێزتر بکات.
بەهەرحاڵ ئەوە کە بوو بە مەترسییەکی جیدیتر بۆ ئەمریکا ئەوە بوو کە سەدام حوسەین بە سەرۆکایەتی لیژنەیەک کە لە کاربەدەستانی بەعس پێکهاتبوو لە شوباتی ١٩٧٢ سەردانی موسکۆی کرد و لە ئەنجامدا راگەیاندننامەیەکی هاوبەشیان واژۆ کرد بۆ ئەوەی پاشان پەیماننامەیەک پێکەوە مۆر بکەن. پێشمەرجی ئەم پەیماننامەیە ئەوە بوو کە دەوڵەتی بەرەی نیشتمانی لە عێراق پێکبێت کە شیوعی و کوردەکان تێیدا بەشدار بن. هاوکات لەگەڵ ئەوە کە سۆڤیەت بارزانی هان دەدا تا پەیوەست بەم بەرە نیشتمانییە بێت، کوردەکان جارێکی دیکە لە رێگای CIAوە لە حکوومەتی ئەمریکا نزیک بوونەوە و پێیان لە سەر ئەوە داگرت کە ئەگەر لە لایەن ئەمریکاوە یارمەتی نەدرێن ناچار دەبن لەگەڵ حکوومەتی عێراق رێکبکەون. "شا"ش پشتیوانی

لەم داواکاریەی بارزانی کرد و هۆشداریدا کە عێراق کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت.

لەگەڵ ئەمەشدا لە ئاداری ١٩٧٢ کۆشکی سپی بە رەزامەندی CIA و وەزارەتی دەرەوە جارێکی دیکە داواکارییەکەی کوردەکانی رەت کردەوە و دووپاتی کردەوە کە ئێران و ئیسراییل دەتوانن یارمەتی کوردەکان بدەن کە بەهەرحاڵ ئەم دوو دەوڵەتەش پێیانخۆش نەبوو کوردەکان سەرکەوتن بە دەست بهێنن. ئەمریکا هەروەها پێیخۆش نەبوو دەست بە کارێ بدات کە سۆڤیەت وەک دژکردەوەیەک لە بەرامبەر خۆی لێکی بداتەوە.

لە کۆتایی نیسانی ١٩٧٢ وەزارەتی دەرەوە هەستی کرد پشتیوانیکردن لە کوردەکان هاوسەنگی هێزەکان تێکدەدات و وای بۆ دەچوو کە هاوپەیمانی عێراق و سۆڤیەت گۆرینی رژیمی عێراق وەدوا دەخات و بڵاوبوونەوەی هەواڵی یارمەتی ئەمریکا بە کوردەکان زیان بە پەیوەندییەکانی ئەمریکا و وڵاتانی دیکەی عەرەبی دەگەیەنێت. لەمە زیاتر یارمەتیدانی ئەمریکا بە کوردەکانی عێراق هیوا و ورەی کوردەکانی ئێران و تورکیای بۆ "کوردستانێکی سەربەخۆ" بەرز دەکردەوە، کەوابوو دەبووە هۆی لاوازبوونی هاوپەیمانەکانی ئەمریکا.

لە هەمان مانگدا عێراق و سۆڤیەت پەیماننامە چاوەڕوانکراوەکەی "دۆستی و هاوکارییان" پێکەوە واژۆ کرد کە بەرەوپێشچوونە دوابیەکانی سۆڤیەتی لە عێراق سەمبولیزە کرد و دەسەڵاتی بەرچاو و رووڵە زیادبوونی سۆڤیەتی لە عێراق مسۆگەر کرد. ماددەی ٩ی ئەم پەیماننامەیە دەیوت هەر دوو وڵات لە بواری بەرگرییەوە پێکەوە هاوکاری دەکەن و رێگای خۆش دەکرد بۆ بەرفراوانبوونی هێزی سەربازی سۆڤیەت لە عێراق و پشتیوانی سەربازی سۆڤیەت لە عێراق لە کەنداوەوە. ئەم پەیماننامەیە کە بە هۆی سەرمایەگوزاری سۆڤیەت لە عێراق دەبووە هۆی پتەوبوونی سەقامی ناوخۆی عێراق، سیاسەتمەدارانی ئەمریکای نیگەران کرد.

بە بیروبۆچوونی کاربەدەستانی ئەمریکا، عێراق ئەو پوتانسییەلەی تێدابوو کە لە کەنداو کێشە بخولقێنێت ( ئەگەر بە جوانی کەڵک لە پشتیوانی سۆڤیەت وەربگرێت)

و ئەگەر بەم شیوازە بچێتەپێش ئاسۆی سۆڤیەتیش روونتر دەبێت بۆ ئەوەی دەسەڵات و دەسترۆیشتوویی خۆی زیاد بکات. سەرۆک نیکسۆن مانگی دواتر لە تاران لە گفتوگۆ لەگەڵ شا بەڵێنیدا کە یارمەتی بە کوردەکان بدات بۆ سەربەخۆبوون لە بەعسیەکان. ئیدارەی ئەمریکا هیوادار بوو کە لە رێگای یارمەتیدان بە کوردەکان عێراق ناسەقامگیرتر بکات و پیلانی سۆڤیەت بۆ بەهیزترکردنی پێگەی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست پووچەڵ بکاتەوە و ئاسایشی ئێران، ئوردون و ئیسراییل زامن بکات. لەروانگەی حکوومەتی ئەمریکاوە بەدیهاتنی ئەم ئامانجانە مەترسی جێبەجێبوونی ناوەرۆکی گفتوگۆکانی کۆبوونەوەی ۱۹۷۲ی مۆسکۆ لە نێوان عێراق و سۆڤیەتی کەم دەکردەوە.

ویلایەتە یەکگرتووەکان هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە لە پشتیوانیکردنی راستەوخۆ لە کوردەکان خۆی دەبوارد بەڵام بەڵێنیدا لەگەڵ لایەنە ناوچەییەکانی دیکە هاوکاری بکات کە یارمەتیان بە کوردەکان دەدا. لە سەرەتای مانگی حوزەیران، بەڕێوەبەری CIA، "ریچارد هیلمز" پشتیوانی لە داواکارییە فەرمییەکەی شا کرد بۆ ئەوەی هێنری کیسینجێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەگەڵ دوو نوێنەرەکەی بارزانی لە واشنگتۆن دیدار بکات. شا وەبیری ئەمریکای هێنابووەوە کە کوردەکان لە ژێر گوشاری سۆڤیەتدان بۆ ئەوەی لەگەڵ دەوڵەتی بەعسی عێراق ئاشت ببنەوە، کەوابوو دەبێ کوردەکان لە بەرامبەر کاریگەری کومونیزم بپارێزرێن.

" هیلمز" بە پێی گفتوگۆکانی لەگەڵ نوێنەرەکانی بارزانی لە ۲۸ی تەموز پێشنیارێکی بۆ کۆشکی سپی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بە نهێنی یارمەتی کوردەکان بدرێت و سەرەنجام سەرۆک کۆماری ئەمریکا پێشنیاری تەرخانکردنی ساڵانە ۳ میلیون دولار یارمەتی ماددی و ۲ میلیۆن دولار یارمەتی سەربازی بە کوردەکان پەسەند کرد. سەرۆک کۆمار هەروەها بەوە رازی بوو کە بەرپرسانی کومیتەی ٤٠ ئاگادار بکرێنەوە بەڵام لە سەر ئەم مەسەلەیە کۆبوونەوە نەگرن. ئەمریکا دەیویست مەسەلەکە نهێنی بێ و لە رێگای لایەنەکانی دیکەوە کە هاوکاری ئەم ئۆپەراسیونە بوون، یارمەتی

کوردەکان بدات. بەگوێرەی راپۆرتەکان قۆناخی یەکەمی ئەم ئۆپەراسیونە بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بووە.

ئیدارەی هەڵسەنگاندنی هەواڵگری نیشتمانی CIA لە راپۆرتێکدا دەربارەی دەوری عێراق لە کێشە ناوچەییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە پەیوەندی لەگەڵ روانگەکانی ئەمریکا بەنیسبەت رژیمی بەعسی عێراق دەڵێت:

"عێراق دۆستی سۆڤیەتە، دوژمنی دراوسێکانیەتی (بەتایبەت ئێران)، پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبەکان ساردە، دژی ئاشتی عەرەب - ئیسرائیلە و دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، کەوابوو لە روانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە هەوڵدان بۆ ناسەقامگیرکردنی حکوومەتێکی کێشەخولقێنەری وەها شتێکی رەوایە".

# شۆڕشی ئەیلوول لەئەجینداى كۆنگرێس
# ( ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی پیرانی )
# ئەمریكادا

## دەوڵەتی عێراق گازە کیمیاییەکانی یەکێتی سۆڤیەت دژ بە کوردەکان بەکاردەهێنێت

## ئەنجوومەنی نوێنەران

## ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣

کۆنگریسمەن "هابز":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، لەم ڕۆژانەی دوایی دەوری یەکێتی سۆڤیەت وەک کێشەخولقێنەرێک لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست جارێکی دیکە ئاشکرا بووە. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەلێ نیگەرانە لەو برە زۆرە چەکەی کە یەکێتی سۆڤیەت داویەتی بە دەوڵەتە عەرەبەکان. تا ئێستا بێباکی یەکێتی سۆڤیەت لەم بوارەدا بۆ هەمووان ئاشکرا بووە.

لەم پەیوەندییەدا وتارێک لە رۆژنامەی "دیترۆیت نیوز" لە ٤ی ئەیلوولی ١٩٧٣ بڵاو بۆتەوە کە تێیدا هاتووە سۆڤیەت گازی ژەهراوی داوە بە عێراق، کە رەنگە لە دژی کەمینەی کوردی عێراق بەکاری بهێنێ. ئەمە تراژیدیایە بەڵام ئەمە یەکەم جار نییە کە سۆڤیەت کاری وا دەکات. ئەگەر لە بیرمان بێت لە ساڵی ١٩٦٧، یەکێتی سۆڤیەت، میسری بە گازی ژەهراوی تەیارکرد تا لە دژی لایەنگرانی پاشایەتی یەمەن بە کاری بهێنێت. کۆمیتەی نێونەتەوەیی خاچی سوور بەڵگەکانی ئەمەی لە دەست دایە. کەوابوو ئەم بابەتە شایانی ئەوەیە هاوکارانم سەرنجی زۆری پێبدەن.

## کوردەکانی عێراق لە هێرشی کیمیایی دەترسن

نوێنەرانی کورد لە واشنگتۆن دوێنێ بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە دەوڵەتی بەغداد گازی کیمیایی لە یەکێتی سۆڤیەت کڕیوە و خۆی ئامادە دەکات تا کوردەکانی پێ قەلاچۆ بکات. سەرچاوەکان دەڵێن ڕژێمی بەعس لە بەغداد ٦٠ هەزار دەمامکی دژە گازی لە یەکێتی سۆڤیەت کڕیوە بۆ سەربازانی عێراق. هەروەها بە وتەی سەرچاوەکان، سۆڤیەت ٨ پسپۆڕی گازە ژەهراوییەکانی ناردووە بۆ عێراق تا سەربازە عێراقییەکان رابهێنن.

کوردەکان کە ژمارەیان نزیکە ١٠٠هەزار کەسە لە عێراقدا، خەڵکێکی عەشیرەتی غەیرە عەرەبن کە لە شاخەکانی عێراقدا دەژین و داوای دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمی کوردی دەکەن. ئەوان لە سەدەی رابردوودا چەندجار لەگەڵ حکوومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق شەڕیان کردووە کە دوایینیان لە ١٩٧٠ کۆتایی پێهات. ئەوکاتە بە پێی رێککەوتننامەیەک، بەغداد بەڵێنی دا بە کورد کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی هەتا ئاداری ١٩٧٤ دامەزرێنێت، بەڵام نوێنەرانی کورد ئێستا دەڵێن عێراق نکوڵی لەو رێککەوتننامەیە دەکات و هێرشەکانی بۆ سەر هێزە کوردەکان دەست پێکردوەتەوە. بە وتەی بەرپرسانی کورد کە لێرەن، دوایین هێرش لە ناوەڕاستی ئاب لە ناوچەی سنجار رووی داوە. لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا ٣٠ سەربازی عێراق کوژراون و چەند کەسیش لە کوردەکان بریندار بوونە.

سەرچاوەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە عێراق لەو شەڕەدا تۆپ و فڕۆکەی MIG بەکارهێناوە. کوردەکان دەڵێن هیواداربوونە بەرپەرچدانەوەی هێرشی عێراق، کۆتایی بە هەوڵەکانی دەوڵەتی بەغداد هێنابایا بۆ پێشێلکردنی رێککەوتننامەی ١٩٧٠ بەڵام هەرحاڵ ئێستا کڕینی گازی ژەهراوی لە سۆڤیەت نیشان دەدات کە بەغداد هەوڵ

دەدات دوایین ڕێگاچارەی کێشەی کورد جێبەجێ بکات، بە هەمان شێوە کە هیتلێر جوولەکەکانی قەڵاچۆ کرد.

بە وتەی وتەبێژی کوردەکان، گازی کیمایی لە کەمپی لەشکری "تاجی"، هەڵکەوتوو لە ڕۆژئاوای بەغداد و ناوەندی فەرماندەیی ٢ی سۆپا لە کەرکووک و ناوەندی فەرماندەیی ٤ی سۆپا لە مووسڵ رادەگیرێت. وتەبێژەکە وتی تەنها بیرورِای گشتی دەتوانێت پێش لە بە کارهێنانی گازی ژەهراوی دژ بە کورد بگرێت و خوازیاری ئەوە بوو کە داوا لە سۆڤیەت بکرێت گازی کیمیایی و پسپۆڕەکانی خۆی لە عێراق بباتە دەرەوە.

## ناڕەزایەتی کۆنگرێس لە سیاسەتی وەزارەتی دەرەوە سەبارەت بە شۆڕشی کورد

## ئەنجوومەنی نوێنەران

## ١١ی تەموزی ١٩٧٤

کۆنگرێسمەن " هامیلتۆن":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران، ئەوەی کە لەم رۆژانەی دواییدا لە رۆژنامەکاندا سەرنجی پێدراوە شەڕێکی دیکەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەم شەڕە لە نێوان هێزە کوردەکان و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان لە لایەک و هێزەکانی سوپای عێراق لە لایەکی دیکەیە. ئەم شەڕە لە سەر ئەوەیە کە کوردەکان داوای جۆرێک ئۆتۆنۆمی ناوچەیی دەکەن لە ناو وڵاتی عێراقدا. ئەم شەڕە شەڕێکی نوێ نییە و لە ماوەی ١٣ساڵی رابردوودا پەیتاپەیتا بەردەوام بووە.

لەم دوایيانەدا من و کۆنگریسمەن "فرایزێر" لە سەر داواکاری خۆیان لەگەڵ نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK) دیدارمان کرد تا سەبارەت بەم شەڕە و کاریگەرییەکانی لە سەر ئاشتی و سەقامگیری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست قسەو باس بکەین. بۆ ئەوەی بیروڕای خۆمان سەبارەت بە شایانبوونی کێشەی کورد و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەم شەڕانەی دواییدا و کێشە ناوخۆیی و بنەڕەتییەکانی دیکەی عێراق دەرببڕین، ئێمە پێمانوایە کە پێویستە بیروڕای نوێنەرە کوردەکان بە

هەند وەربگیردرێت و بۆ ئەم مەبەستە ئێمە داوامان لە وەزارەتی دەرەوە کردووە کە بە شێوازی غەیرە فەرمی لە گەڵ ئەم نوێنەرانەی PDK دابنیشێت، بەڵام وەزارەتی دەرەوە قبووڵی نەکردووە.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە من لە سەر ئەو بڕوایەم کە نابێت هیچ چەشنە یارمەتییەکی نهێنی و ئاشکرا بە کوردە راپەڕیوەکان بدرێت، بەڵام پێمناخۆشبوو کە بەرپرسانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە نەیانویست بە شێوازی غەیرە فەرمی لەگەڵ دوو وەزیری پێشووی عێراق کە ئەندامی PDK ـ ن دیدار بکەن. کەوابوو هەلێکی سوودمەندمان لە دەست چوو بۆ ئاگاداربوون لە یەکێ لە روانگەکانی ئەم شەڕە کە لە ۲ مانگی رابردوودا پەرەیەکی بەرچاوی سەندووە. ئەمە دەقی ئەو نامەیەیە کە من و بەڕێز "فرایزێر" ناردوومانە بۆ وەزارەتی دەرەوە:

کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران

واشنگتۆن دی سی، ۱۳ی حوزەیرانی ۱۹۷٤

بەڕێز " هێنری کیسینجێر "، وەزیری دەرەوە، واشنگتۆن دی سی

بەڕێز جەنابی وەزیر، ئێمە دەمانەوێت داواتان لێ بکەین نوێنەری پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە، جێگری وەزیری دەرەوە، جۆزێف سیسکۆ یا یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە، ئاڵفرێد ئەسێرتۆن لە گەڵ "م م عەبدولڕحمان" و "م دزەیی"، وەزیرانی پێشوی دەوڵەتی عێراق و "شەفیق قەزاز "دیدار بکەن کە هەموویان ئەندامی پایەبەرزی پارتی دیموکراتی کوردستانن و ئێستا لە ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکان بۆ ئەوەی لە کۆبوونەوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەشداری بکەن.

بێ ئەوەی رای خۆمان لە سەر داخوازییەکانی ئەو ئەندامانەی PDK دەرببڕین، ئێمە لە سەر ئەو بڕوایەین کە مەسەلەی ئەم نوێنەرانە شایانی ئەوەیە لەلایەن نوێنەرانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە گوێی لێبگیردرێت. شەڕی ناوخۆی عێراق کە تا ئێستا نزیکەی ۱۳ ساڵی خایاندووە، ئەم دوایانە بووە بە شەڕێکی جیدی تر و خوێناویتر و ژمارەیەکی بەرچاو تێیدا کوژراون. ئێمە لەو بڕوایەداین کە بە هۆی ئەوەی کە ئەم شەڕە دەتوانی کار بکاتە سەر بارودۆخی هەستیاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، و هەندێ

له دراوسێکانی عێراقی سەرقاڵی خۆی کردووە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبێ ئاگاداری هەموو لایەنەکانی ئەم شەڕە بێت.
ئێمە سپاستان دەکەین ئەگەر بەزووترین کات سەرنج بەم بابەتە بدەن.
لەگەڵ ڕێزماندا
" لی ە هامیلتۆن"، سەرۆکی کومیسیۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا
"دۆناڵ م فرێزێر"، سەرۆکی کومیسیۆنی ڕێکخراو و بزووتنەوە نێونەتەوەییەکان
ئەمەش دەقی وەڵامەکەی وەزارەتی دەرەوەیە:
وەزارەتی دەرەوە
واشنگتۆن دی سی، ٣ی تەموزی ١٩٧٤
بەڕێز لی هامیلتۆن
سەرۆکی کومیسیۆنی ڕۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیا، ئەنجوومەنی نوێنەران، واشنگتۆن دی سی
بەڕێز جەنابی سەرۆک
جەنابی وەزیر داوای لێمکردووە وەڵامی نامەکەی ١٣ی حوزەیرانی ئێوە بدەمەوە کە سەرۆک "فرایزێر"یش واژۆی کردووە و داواتان کردووە جێگری وەزیر، "سیسکۆ" یا یارمەتیدەری وەزیر، "ئەسێرتۆن" لەگەڵ نوێنەرانی پایەبەرزی پارتی دیموکراتی کوردستان ( PDK) دیدار بکات.
ئێمە چەند داواکارێکمان لە لایەن نوێنەرانی کوردەوە بۆ چاوپێکەتن بە دەست گەیشتووە. لە ساڵی رابردوودا پەیوەندی ئێمە لەگەڵ PDK لە ئاستێکی نزمدا بووە. ئەگەر ئێستا ئەم سیاسەتە بگۆڕین لەوانەیە هەم کوردەکان و هەم دەوڵەتی بەغداد بەهەڵە تێبگەن. هەروا کە ئێمە سەرنجمان پێداوە، لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەی ئێمەدا، بانگەشەکانی عێراق دەربارەی ئەوە کەم بوەتەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە ڕاپەڕینی کورد دەکات.
لە کاتێکدا کە گەلێ لە ئەمریکاییەکان هاوسۆزی کوردەکانن، هەڵوێستی وەزارەتی دەرەوە ئەوەیە کە ئەم ململانێیە پێش هەموو شتێک کێشەی ناوخۆیی عێراقە و ئێمە

نامانەوێت کوردەکان بەو باوەڕە بگەن کە ئێمە ئامادەین بە ئاشکرا یان نهێنی پشتیوانی لە ڕاپەڕینەکەیان لە عێراق بکەین. کەوابوو ئێمە هەموو هەلێک بە نوێنەرانی کورد دەدەین تا باسی کێشەی خۆیان بکەن، بەڵام نە لەو ڕوانگەیە کە ئێمە پشتیوانی لە کێشەکەیان دەکەین. ئەڵبەتە پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ PDK بۆ یارمەتیدەری وەزیر، بەڕێز "ئەسیرتۆن" و جێگری وەزیری دەرەوە ڕاپۆرت دەدرێت.

ئەگەر ئێمە سیاسەتی پێشووی خۆمان بگۆڕین و لە ئاستێکی بەرزتردا لەگەڵ نوێنەرانی PDK دیدار بکەین، بێگومان ئەمە سەرنجی دەوڵەتی عێراق و وڵاتانی عەرەبی دیکە ڕادەکێشێت و لە وانەیە وەک دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی عێراق شرۆڤە بکرێت و خەسار لە باشتربوونی پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و عێراق بدات. هەر چەشنە یارمەتییەک کە ئێمە بە خەباتی کەمینەیەک بۆ ئۆتۆنۆمی دژی دەوڵەتێکی عەرەبی بیدەین، لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی کە جیهانی عەرەب سەبارەت بە نیازەکانی ئێمە گومانی لا دروست بێت.

لە ئاکامدا، من پێموانییە کە بەرزکردنەوەی ئاستی دیدارەکانمان لە گەڵ نوێنەرانی PDK خزمەت بە ئامانجەکەمان بکات. ئەوە کە باس کرا، بە واتای ئەوە نییە کە ئێمە لە گەڵ سیاسەتی دەوڵەتی عێراق سەبارەت بە کورددا‌ین یا دەمانەوێت بایەخی ئامانجە نەتەوەییەکانی خەڵکی کورد کەم بکەینەوە. هەڵوێستی ئێمە لە بنەڕەتدا ئەوەیە کە سەبارەت بە هەر ناکۆکیەکی ناوخۆیی بێ لایەن بین کە هەست دەکەین نابێت خۆمانی تێوەبگلێنین.

لە کاتێکدا کە ئێمە لە سەر ئەو باوەڕە نین کە گۆڕینی سیاسەتەکەمان سەبارەت بە PDK لەم کاتەدا زۆر بە قازانجمان بێت بەڵام خۆشحاڵ دەبین بەڕێز "عەبدولڕەحمان "، بەڕێز "دزەیی" و نوێنەرێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کاتێکی گونجاودا پێکەوە دیدار بکەن.

بەڕێز شەفیق قەزاز، نوێنەری PDK لە ٩ی حوزەیران لە وەزارەتی دەرەوە وەرگیراوە و سێ نوێنەری کوردی دیکە هەمان ڕۆژ بۆ لێژنەی نوێنەرایەتی ئەمریکا لە نەتەوە

یەکگرتووەکان بانگێهشت کراون. ئەگەر بەڕێزت یا سەرۆک "فرایزێر" کورتەیەکی غەیرە فەرمی لە بارەی سیاسەتی ئێمەتان سەبارەت بە کێشەی کوردی عێراق دەوێت، ئاگادارم بکەنەوە.

لە گەڵ ڕێزمدا

لینۆد هاڵتۆن

یارمەتیدەری وەزیری دەرەوە بۆ پەیوەندییەکانی کۆنگرێس

## ناڕەزایەتی کۆنگرێس لە شێوەی هەڵسوکەوتی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ کێشەی کورد
## ئەنجوومەنی نوێنەران
## ١٧ی نیسانی ١٩٧٥

کۆنگرێسمەن" کۆچ ":

بەڕێز سەرۆکی ئەنجوومەن، لە ساڵی رابردوودا کوردەکان بۆ مافی رەوای ئۆتۆنۆمی شەڕێکی خوێناوییان دژی دەوڵەتی عێراق کردووە. رێبەری کورد، مستەفا بارزانی بە رەتکردنی ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمییە سیاسییە کە عێراق بەڵێنی دابوو، داوای لە خەڵکەکەی کرد لەگەڵ سوپای عێراق شەڕ بکەن کە لەلایەن سۆڤیەتەوە پۆشتە دەکرێت. کوردەکان ئازایانە شەڕیان کرد و هەندێک سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەشێک لەم سەرکەوتنە بە هۆی ئەو چەک و تەقەمەنییە بوو کە شای ئێران ناردبووی بۆ کوردەکان. هاندەری شا بۆ ئەم یارمەتیدانە ئەوەیە کە شا هەوڵ دەدات دوژمنە سەرسەختەکەی خۆی واتا عێراق لەرێگای کوردەکان لاواز بکات. پەیماننامەی جەزایير کە ئەم دواییانە لە نێوان ئێران و عێراق واژۆ کرا، هەڵوێستی بێ بەزەییانەی شای بە نیسبەت کوردەکان خستەڕوو. شا لە سەر ئەوە رێککەوت کە کۆتایی بە هەموو یارمەتێک بە کورد بهێنێ و لە ١ی نیسانی ئەمساڵدا، سنوورەکانی بە رووی ئاوارە کوردەکان داخست. لە ئاکامدا، شا حوکمی مەرگی ئەو کوردانەی واژۆ کرد کە لە وڵاتی خۆیاندا مابوونەوە.

تراژیدیای ئەم خیانەتە لەگەڵ بێدەنگی نەتەوە یەکگرتووەکان تێکەڵ بووە. لە کاتێکدا کە نەتەوە یەکگرتووەکان زۆر بە باڵای یاسر عەرەفاتدا دەیخوێند، بە ساردی لە گەڵ کوردەکان هەڵسوکەوتی کرد و بەتووندی نوێنەرە کوردەکانی رەت کردەوە، چونکە نوێنەری بزووتنەوەیەکی بێ دەوڵەت بوون، ئەمە دووڕووییە.

کوردەکان تەنها ئەوەیان دەوێت بە ئاشتی و بەو شێوازە کە خۆیان پێیان باشترە بژین بەڵام کۆمەڵگای نێونەتەوەیی لە بەرامبەر هەوڵەکانی ئەواندا راوەستاوە. ئێمە دەبێت هەرچی لە دەستمان دێت یارمەتی مرۆڤدۆستانە بە کوردەکان بدەین، چ ئەوانە کە ئاوارەی ئێران بوونە و چ ئەوانەی کە لە ژێر دەستی دەوڵەتی عێراقدان. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بە پەناگای دوورخراوە سیاسییەکان ناسراوە، دەبێت داواکارییەکەی رێبەری کورد، مەلا مستەفا بارزانی قەبووڵ بکات، ئەگەر بێت و داوای مافی پەنابەری بکات.

کورد کە گەلێکی شاخنشینی زمووختە، هەزاران ساڵە لە سەر خاکی خۆی دەژی. ئەم خاکە هی خودی کوردەکان بوو، پێش ئەوەی نەوت خاکەکەیان ئەوەندە گرنگ بکات. لە راستیدا چەندە ناخۆشە کە لای هەندێ لە دەوڵەتەکان، نەوت لە چارەنووسی ئەم خەڵکە ئازایە و مافی ژیانیان گرنگترە.

لەم بەسەرهاتەدا، خاڵی کۆتایی کە زۆر کاری کردۆتە سەر من ئەوەیە کە پێشمەرگەکانی بارزانی قەد دەستیان نەبردووە بۆ تیرۆریزم و ئەمە لە نێو ئەو بزووتنەوانەی کە خەبات بۆ رزگاری نەتەوەیی دەکەن، بێ وێنەیە. لەم شەڕەدا بارزانی لیستی دیلە عێراقییەکانی بڵاو کردووەتەوە و ئیزنی بە رێکخراوی خاچی سوور داوە سەردانیان بکات، سەرەڕای ئەو هەڵسوکەوتە خراپەی دەوڵەتی عێراق لە گەڵ دیلە کوردەکان. کوردەکان ئەوەندە جورئەت و جەسارەتیان هەیە داکۆکی لە ئازادی خۆیان بکەن، بێ ئەوەی دەست بۆ ئەم تاکتیکە سەرنجڕاکێش و دزێوانە ببەن. چەندە شەرمە بۆ شارستانییەت کە ئەوانەی کە دەست بۆ تیرۆریزم نابەن، تووشی کارەسات دەبن، بەڵام ئەوانەی کە دەستی بۆ ئەبەن، بە فەرمی دەناسرێن.

